**ناوی کتێب: دوا وەسوەسەی کریست**

- نووسینی: کازانتزاکی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: کەریم دەشــتی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- پیتچنین: سامان
- بەرگ: سەیوان
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن: ٢٣٢
- بەرگی یەکەم
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ٥٩- (١٦٢)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن : 2260311**

www.mukiryani.com



**پێشکەشە بە:**

**هــەموو ئەوانــەی بەرهەمــەکانیان دەکــەن بــە ســەر مەشــقی ئــازادیی نەتەوەکەیان.**

**ک. دەشتی**

# پێشەکی

رۆمانی دوا وەسوەسەی کریست، ژیننامەی هەموو ئەو مرۆڤە ئازایانەیە، کە ویستوویانە بگەن بە مەداری عیرفانو عەشقو ئاگر. خودی کریست بە هەمان ئەو سێ مەدارەدا رەت بووەو لەم رێیەدا بەرجەستەی خەباتێکی دوورو درێژی کردووە، سەرەتا هەوڵیداوە خودی خۆی لە هەموو کۆتو پێوەندێك رزگار بکاتو لە دیلی پاك ببێتەوە، هەر بۆیەش خۆی لە هەموو پەیوەندییەکان رزگار دەکاتو هەموو بەختەوەرییەك دەکاتە قوربانیی بڕیارەکانی خۆیو پاشان باڵادەستیی خۆی پیشانی ئارەزووەکانی جەستە دەداتو خەفەیان دەکات.

ئەوسا وەکو ئازاترین مرۆڤ لە پێناوی ئەوەی کە مرۆڤایەتی لە هەموو ژەنگو ژارێکی نەهامەتی پاك بکاتەوە. بڕیاری مەرگی خۆی دەداتو بۆ سەر خاچ هەڵدەکشێتو خۆی دەکاتە قوربانیی مرۆڤایەتی، ئەمە رۆمانی (دوا وەسوەسەی کریست)ە.

تاکە مەبەستی من لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، سەرەڕای ئەوەی کە شاکارێکی گەورەی ئەدەبییە، ئەوەیە کە بۆ خوێنەرانی روون بکەمەوە چۆن میللەتانی دنیا بە مەبەستی رزگارکردنی نەتەوەی خۆیان ئایین بەکاردەهێنن نەك بۆ سڕکردنی ...چۆن چۆنی میللەتان خۆیان بەهۆی سیمبولەکانی ئایینەوە لە کۆتو پێوەندی داگیرکەران رزگار دەکەن، کە تەواو لەم شاکارەدا رەنگی داوەتەوە..

هیوادارم کارێکم کردبێت نەوەکانی داهاتوو بە عیشقەوە باوەشی بۆ بکەنەوە.

**کەریم دەشتی**

**هەولێر: پاییزی ٢٠٠٥**

# بەشی یەکەم

شنەییێکی فێنكو بەهەشتی سەراسەری بوونی ئەوی داگرت.

لە بەرزاییەوە، ئاسمان ئەستێرە باران بوو، لە خوارەوە بە سەر زەوییەوە بەردەکان کە لەبەر گەرمای سوتێنەری رۆژدا گڕیان گرتبوو، هێشتا هەر گەرم بوون، ئاسمانو زەوی ئارامو دڵنەوازبوونو تژی بێدەنگی قووڵی هاتو هاوارو بێ زەمانی شەو بووبوون، بێدەنگ تر لە خودی بێدەنگی، هەوا تاریك بوو، پێدەچوو نیوەشەو بێ، مانگو خۆری چاوانی خودا داخرابوونو لە خەودا بوون، پیاوە جەوانەکە کە شنەییێکی نەرم هزری دوور دوور بردبوو، غەرقی جیهانی بێ هەستیو خەڵوەت بوو بوو، بەڵام لەکاتێکا کە هزری ئەو لە خەڵوەتگەدا ئەندێشەی باغی بەهەشتی دەکرد، لەناکاو باکە گۆڕاو توندتربوو، ئیدی ئەو بایە بایێکی بەهەشتی نەبوو، بەڵکو هەڵمی چەند هەناسەییێکی گرانو سەنگین بوو، وەك بڵێی لە بێشەییێکی چڕی یا باغێکی تەڕو نمناك لەژێرەوەی قاچی ئەودا دەوارێکی بە هانکە هانك یا گوندێ بۆ خەوتن لە هەوڵێکی بێهودە دابوو، هەوا سەخت بێ ئارام بووبوو، هەناسەی بە هەڵماوی مرۆو ئاژەڵو پەرییەکان بەرز دەبۆوە لەگەڵ عەتری ئارەقەی توندی لەشی مرۆڤدا تێکەڵ بە یەك دەبوون، نانی تازە لە تەنورا دەردەهێنرانو ژنان رۆنی درەختی هەڤرسیان لە پرچیان هەڵدەسوی، بۆنت هەڵدەکێشاو، هەستت دەکرد، تێ رادەمای، بەڵام هیچت بەدی نەدەکرد، هێدی هێدی چاوەکانت خووی بە تاریکییەوە دەگرت دەتتواتی سەرونیازییێکی بالابەرز کە رەشتر بوو لە شەو، دەگەڵ دەستەیەك لەدرەختی خورما کە وەك کانیێ سەریان لەبەر یەك نابوو، درەختی کەم گەلای زەیتوون، کە لە تاریکیدا



وەك زیوێ دەدرەوشانەوەو لەبەر با کەوتبوونە خشەخش دەستنیشان بکەی، لەو جێیەی لە خالێکی سەوزی زەوی چەند کوختەییێکی پەڕپوتت دەبینی کە زەمانێ لەگەڵ یەكو زەمانێ تاك تاك بە سەر زەمیندا هاویشترابوون، لە شەبو گلو خشت دروست کرابوونو بە دۆی قسلێ سپی کرابوون، بۆن کردن چرکی تۆی بەخەرج دەدا، کە پەیکەری مرۆیی هەندێکی بە تاراو هەندێکی بێ تارا بە سەرپشتی بانەکانەوە خەوتبوون. بێدەنگی رایکردبوو، پیرۆزی شەوی نامەسکون تژی شڵەژان بوو بوو، دەستو پێی مرۆڤی تێکدەئالاندو هەڵیدەسووڕاندە ناو یەكو نەیدەتوانی قەرارگایەك بدۆزێتەوەو، دڵی مرۆڤ ئاهیان هەڵدەکێشا... ناڵەیێکی نائومێدەارو نەفرین ئالود لەسەدان دەمدا دەهاتە دەرەوەو لەم گەرمەسێرەدا بە ئارامی بۆ دڵ پێکدان لە نەبەرد دابوون، تەواوی هەوڵو تەقەلایان بۆ ئەوەبوو قسەیێ بدۆزنەوە تا حەسرەتی دڵیان بگێڕێتەوە، بەڵام نەیاندەتوانی، ناڵینەکان دادەپچڕانو لە ناو قیلو قالی نابالانسدا ون دەبوون، لە هیکەوە زەناییێکی دڵتەزێن لە بەرزترین بانەوە لە ناوەندی دێدا بەرزبۆوە، سینەییێکی پارچە پارچە بوو (خوداوەندی سراییل... خوداوەندی سراییل- ئەدونیا- تاکەی؟) ئەو ناڵەیە ناڵەی یەك تاکە نەفەر نەبوو، هی تەواوی دێ بوو کە خەونی دەبینیو هاواری دەکرد، تەواوی خاکی سراییل لەگەڵ ئێسقانی مردوەکانو رەگو ریشەی درەختەکانی، ئازاری دەچەشتو نەیدەتوانی بزێو هەراو زەنای دەکرد. دوای بێدەنگییێکی درێژو لە هیکەوە دووبارە بانگێ فەزای بەپانتایی زەمینو ئاسمان شەق کرد، بەڵام ئێستا بە تووڕەییو ئازارێکی زۆرترەوە ((تاکەی تاکەی؟)) سەگەکانی دێ بێداربوونەوەو دەستیان کرد بەحەپە حەپو رابردن، لەپشت بانە پانو گلیەکانەوە ژنان بە ترسو لەرزەوە سەریان کردە باوەشی مێردەکانیان. پیاوە جەوانەکە خەونی دەبینیو لە خەوی خۆی هاواری دەبیست تەکانێکیدا، خەوی ئەو ئالۆز بوو راپەڕی، کێو بە ناسکی کەوتە خەیاڵو ناو دەروونی بەدیارکەوت، ئیدی کێو تەختەتاوێر نەبوو، بەڵکو لە خەوو گێژی دروست کرابوو، دەستەیێ لە مرۆڤی دێوپەیکەرو رووخسارکێوی بە ریشو پەشمو برۆو دەستی قەبەوە پێی خۆیان بەتووڕەیی لە کێو دەکوتا، باریكو نەرم بوونەوە، درێژبوونەوە، پان بوونەوە، شێوەیان دەگۆڕا، ئەوکاتە وەکو چەند پەلە هەورێ کە لەناو بایێکی توندا پەرشو بڵاودەبوونەوە، شۆڕدەبوونەوە

ناو تانو پۆییێکی جوان. به راکردنو رەوینەوەی خەون تەواوی دیمەنەکە گەرەکی بوو، لەبەر زەینی ئەو ون ببێ، یەکسەر سەری سەنگین بوو، سەر لەنوێ چووە خەوێکی قوولەوە، کێوەکە دووبارە بووە تەختەتاوێرو هەورەکان وەکو هەوەڵیان لێهاتەوە، سەدای هەناسەی توندی کەسێکی بیست، ریش سوورەکە ئەوکاتە بە هەنگاوی خێراو بە کراسی کراوەو پێ پەتیو رووخساری سوورو ئارەقەرێژەوە، لە ترۆپکی کێوەوە دووبارە بەدیار کەوتەوە، هاورێیانی بێ شوماری ئەو لەپشتی سەریەوە لەمیانی تاشەبەردی سەختدا خۆیان شاردبۆوە، هەناسەبڕکێیان بوو، لە بالآی سەرەوە، هەیوانی ئاسمان دووبارە تاقێکی زیبای بەرجەستە دەکرد، بەلآم ئێستا تەنها تاقە ئەستێرەییێکی گەورە وەك گۆییێکی ئاگرین لە ئاسۆی رۆژهەلآتەوە هەلۆاسرابوو، خۆر لەحالەتی هەلآتن دابوو، کابرای گەنج بەسەر تەختە خەوی خۆیەوە کە لە تیشەداربوو راکشا، سەدای هەناسەی سەنگینی ئەو حیکایەتی کاری دژواری رۆژانەی ئەوی دەکرد، پیلۆەکانی بۆ ساتێ تەتەلەی کرد، وەك بلێی ئەستێرەییێکی سیحراوی بە سەر ئەواندا هەلآتبێ، بەلآم بێدار نەبۆوە، خەون دووبارە بە چالاکی خۆی بە دەوری ئەودا سوورایەوە، لەخەودا بینی ریش سوورەکە وەستاوەو ئارەقە لەژێر هەنگلو پێو هەنیەی باریكو لۆچخواردووی سەرەوژێر دەبۆوە، لە حالێکا لەبەر زۆری هەولو تەقەللآو توورەیی، هەلم لەدەمی دەهاتە دەرەوە، لە حالەتێ کە جوێنی دەدا، دانی بە خۆیا گرتو جوێنی قورتداوە، بە مڕومۆچیەوە گوتی: تاکەی ئەدونیا تاکەی؟ بەلآم توورەیی ئەو پەنگاوەی نەدایەوە. سەنگرایەوەو بەخێرایی تریشقە کلآفەی رێپوانێکی دوورو درێژ لە دەروونیدا ئەو لەبەریەك بۆوە، کێوەکان تاوانەوە، مرۆڤەکان ون بوون، خەون بۆ شوێنێکی دیکە چوو، جەوانەکە بینی سەرزەمینی کەنانە وەك هەواییێکی سیمی ئارموش رەنگاو رەنگو پر زینەتو جوانی، لەسەرەوەی ئەوداو لەسەر بانە نەویەکەی قامیشی کوختەکە خۆی هەلخستبوو، لای باشور بیابانی لەرزیوی ئەدومیە بوو کە لە پشتی پلنگێ دەچوو، دوورتریش دەریای مردوو بوو، بە رەقیو ژەهراوی خۆیەوە، نوورێ هەلدەکشایە دەروونیەوەو هەلیدەقوڕاند، لەپێشو لەدوایەوە ئورشەلیمی زالم قەراری گرتبوو، لە هەموو لاییێکەوە بە فەرمانی- یەهوە- خەندەق هەلکەنرابوو، خوێنی قوربانیانی خوداو بەرخو پەیامبەران، بەسەر شەقامە



بەردرێژکراوەکانیدا هەلڕژابوو، ئەو کاتە سامیرای پۆخلو پێکوتی بت پەرستان لەگەل چالێك لە نێوەندو ژنێك بە سووراوو سپیاوەوە ئاوی لەبیر هەلدەکێشا بەدیارکەوت، پاشان لە کۆتایی باکووردا- جەلیل- ی تابناكو میهرەبانو سەوزەلآن- بەدیارکەوت لە لێوارەوە بۆ ئەوبەری لێواری خەون رووباری ئوردن هەلدەڕژا، رووبارێ کە شارەگی خودایەو لە کەناری زێخاوی باخو باخاتی پڕ میوە- یەحیای پاکشورو بیدعەت گێڕەکانی سامریو تەرەسو ماسیگرەکانی- گنسارت- رادەبردن بەبێ جیاوازی هەموویانی تێر ئاو دەکردن، کابرای گەنج بەدیتنی ئاوو خاکی پیرۆز هاتبووە وەژدەوە، دەستەکانی درێژکرد تا دەستیان پێدابهێنێ، بەلآم سەرزەمینی موژدەهێن کە بەشەونمو باو ئارەزووی کۆنی مرۆیی رسکا بوو، وەك گولێکی سوور لەسپێدە دەماندا دەدرەوشایەوە لەپڕێکا لەتاریکی ئەنگوستەچاودا خامۆش هەلگەڕا، بە نەمانی سەرزەمینی موژدەهێن سەدای نالەو نەفرین کەوتە بەرگوێ، دەستەییێکی بێ ژمێری خەلك لەپشت تاوێرە نوك تیژەکانو درەختە تیغدارەکانی هەرمێی کێوی دووبارە بەدیارکەوتنەوە، بەلآم ئەمجارە تەواو شێوابوونو دەستنیشان دەکران، ئەو دێوانە چەند لوولدراوو لەڕو بچووك بووبوونەوە، چەند شەمولەیەك بوون، هانکە هانکیان بوو، بەچکە هەرماسەکان هەناسەبڕکێیان بوو، ریشیان گەسکی لە زەویدا، هەریەك لەوان وەسیلەییێکی ئەشکەنجەدانی غەریبی هەلگرتبوو، هەندێکیان کەمەربەندی چەرمینی بە ئاسن نیشانکراوو خوێناویان لەدەست دابوو، هەندێکیشیان خەنجەرو سوژن، هەندێکیشیان بزماری سەرپانی درشت، سێ کورتە بالآ کە دامەنیان نزیکەی سەرزەمینی گسك دەدا، خاچی قەبەو سەنگینیان هەلگرتبوو، ناشیرنترینی ئەوان یەکێکی خەپلەی لوچی بوو، کە لە دوای هەموویانەوە دەهات، تاجێکی لە دڕكو دال لە دەست دابوو، ریش سوورەکە لە پێشەوە پالیدایەوەو کەوتە تەماشا کردنیان، سەری زلی خۆی لە رووی نەفرەتەوە راتەکاند، خەونبینەکە گوێی لە بیرکردنەوەکانی خۆی بوو ((ئەوان بێ باوەڕن، لەبەر ئەوەی کە بە کەمی خولقاون هەر لەبەر ئەوەشە کە من ئەشکەنجە دەدرێم... ئەوان باوەڕیان نییە... ریش سوورەکە دەستی زلو توکنی درێژ کردو بە هێما کردن بۆ دەشتی داپۆشراو لەناو پەردەی شەونمەوە گوتی:

- سەیرکەن!

- سەرۆك، ئێمە هیچ نابینین؟ هەوا تاریکە...

- شتێ نابینن کەواتە باوەڕتان بە قسەی من نییە؟

- سەرۆك باوەڕ دەکەین، هەر لەبەر ئەوەشە کە بەدوای تۆ کەوتین، بەڵام هیچ نابینین.

- دوبارە سەیرکەنەوە.

دەستی خۆی وەك شمشێرێ دابەزاند، شەونمی سپی شەقکردو دەشتی بە دیارخست، دەریاچەییێکی شین لە خەو هەڵدەسا، لە کاتێکا کە تارای شەونمی لادەدا، بزەییێکی کردو درەوشاوە، هێلکەی مەلە گەورەکان- دێهاتو گوندەکان- لە ژێر درەختی خورماو دەوربەری کەناری زێخینی دەریاچە لە ناوەندی مەزرای گەنمدا بەرەنگێکی سپی کەوتە درەوشانەوە. سەر دەستەی گروپەکە بە هێماکردن بۆ گوندێکی گەورە کە بە چەند چەمەنێکی سەوز دەورە درابوو، گوتی: (ئەو لەوێیە) سێ ئاشی بایی، بەبێ ئەوەی بایەخ بە دێ بدەن، سەر لە بەیانی زوو پەروانەکانیان کردنەوەو سووراندیان، وەحشەتێك لە هیکەوە هەڵڕژایە سەر رەنگی رەشو گەنماوی خەونبین، خەون بەسەر پێلوەکانیدا چەقبەست بوو هەڵڕژایە ناو ئەندێشەیەوە، بۆ ئەوەی خۆی لەو خەوە رەهابکا دەستی بە پێلوەکانی داهێناو بە سەختی هەوڵیدا ببێتەوە، لەگەڵ خۆیدا کەوتە ئەندێشەوە، (ئەوە خەونێکە دەبێ بێدار ببمەوەو خۆم نەجات بدەم). بەڵام کورتە باڵاکان بە نەنگییەوە بە دەوری ئەودا دەسوورانەوە، خەیاڵی رۆیشتنیان نەبوو، ریش سووری وەحشی رووخسار قسەی لەگەڵ ئەوان دەکردو ئەنگوستەکانی بەشێوەییێکی هەڕەشەئامێز بەلای دێی گەورەدا رادەتەکاند، ((لەوێیە بەدزیەوە دەژیت، بەپێی پەتیو جلی کۆنینە رۆڵی نەجارِ دەبینێ، واخۆی بەدیار دەخات کە کریست نییە، دەیەوێ قورتار بێت، یاڵلا کوڕینە بە دوایدا بگەڕێن))، ریش سوورەکە قاچی خۆی بەرزکردەوەو نیشانەکەی بە خۆ هەڵواسی، بەڵام کورتە باڵاکان خۆیان هاوێشتە سەردەستو پێی ناچار پێیەکانی خۆی دووبارە هێنایە خوارەوە.

- سەرۆك ئەو کۆنەپۆشو پێ پەتیو دارتاشانە زۆرن، ئاخر نیشانەیەك، شتێك وەك ئەوەی کە بزانین ئەو کێیە، چۆن مرۆڤێکە لە کوێ دەژی تا بەم جۆرە بتوانین ئەو



بناسین، دەنا حەرەکەت ناکەین، باشترە ئەوە بزانین سەرۆك، ئێمە تەکان نادەین خەریکە لەبەر ماندووبوون وێران دەبین.

- من ئەو لە باوەش دەکەمو ماچی دەکەم - ئەوە بۆ ئێوە دەبێتە نیشانە ئێستا بەرەوپێش یاڵلاّ، بەڵام لەسەرخۆ، هاوار نەکەن، هەر ئێستا خەوتووە ئاگاداربن بێدار نەبێتەوەو لە چنگمان رابکات، بە ناوی خودا، تاقیبی بکەن.

کورتە باڵاکان هەموو بەیەکەوە هاواریان کرد ((سەرۆك تاقیبی بکەین)) بە بەرزکردنەوەی پێی قەبەوە ئامادەی رۆیشتن بوون، بەڵام یەکێ لەوان، هەمان قەمبورو ئیسقانێکی خێل بوو کە خۆی بە بنە دڕکێکەوە گرتبوو، تاجە دڕکینەکەی لە دەست دابوو، بنە دڕکینەکەی چەسپاندو سەرپێچی لەرۆیشتن کردو هاواری کرد ((من بە تەما نیم بێم ئیدی گەیشتە سەر لێوم ئەوە چەندین شەوە ئێمە تاقیبی دەکەین؟ زەمینو زەمانمان نایەژێر پێم دەڵێن نا، بژمێرن لە بیایانی ئەدومیە، دێری ئەسناس یەك لە دوای یەکمان پشکنیوە، لەمیانی (ئنیا)دا رابردین، کەلە هەمان جێدا ئیلیازری بێچارەمان بەبێ سوود کوشت، کە گەیشتینە ئوردن، پاکشور ئێمەی بەدوای کلاّوی بابردوو رەوان کردو گوتی: ((ئەو کریستەی کە ئێوە بە دوایدا دەگەڕێن من نیم یاڵلا چارەتان ونکەن)) ئەوێمان جێهێشت چووین بۆ ئورشەلیم، پەرستگاو کۆشکی حەنناو قافیا، کوختەکانی (کاتیان)و (فریسیان) (ریاکاران)مان هەموو پشکنی، بەڵام جگە لە فێڵبازوو درۆزنو دزو بەدکارو بکوژ کەسمان نەدۆزیەوە، دووبارە کەوتینەوە رێ، بەنێوان (سامیرە ی دوورخراوە) رەت بووین گەیشتینە جەلیل، مەجدەل، کانا، کفرناحوم، (بیت سەدامان) یەکجێ بەجێ هێشت، خانوو بە خانوو، قایغ لەدوای قایغ بەدوای بەفەزل ترینو لەخوواترساو ترین مرۆڤ گەڕاین هەرکات کە ئەومان بینیوە هاوارمان کردوە ((تۆ کریستیانوی بۆ خۆت شاردۆتەوە؟ راپەڕەو سراییل رزگار بکە ((بەڵام هەرکات ئامێری شکەنجەی لە دەستی ئێمەدا دەبینی، رەنگو رووخساری دەپەڕیو دەکەوتە هەڵبەزو دابەزو هاواری دەکرد ((من نیم... من نیم)) بۆ رزگارکردنی گیانی، خۆی دەهاویشتە بەردامەنی شەرابو قومارو ژنەوەو خۆی مەست دەکرد کوفری دەکرد، فاحیشەبازی دەکرد تا ئێمە بەچاوی خۆمان ببینین کە

تاوانبار ئەو کریستە نییە کە ئێمە بە شوێنی دادەگەڕێین، بەداخەوە سەرۆك، بەڵام لێرەش رووبەڕووی هەمان شت دەبینەوە، بێهودە تاقیبی دەکەین، وەدەستی ناهێنین هێشتا نەهاتۆتە دنیاوە، ریش سوورەکە پشتی ملی بەچنگ گرتو بۆ ماوەیەك لە میانی زەویو ئاسماندا سەیری کرد، لە حاڵەتێکدا کە پێدەکەنی گوتی: ((ئەی تۆماسی گوماندار تۆم خۆشدەوێ))، ئەو کاتە رووی لەوانی دیکە کرد، ((ئەو رزگارکارە سیخورمەیەو ئێمەش ئاژەڵی بارهەڵگر، لێگەڕێن با نەقیزەمان لێبدات تا هیچ کاتێ ئاسودە نەبین))، توماسی کۆسە لەبەر ئازار هاواری دەکرد، ریش سوور ئەوی دانایەوە سەر زەوی لە کاتێکدا، دووبارە پێکەنیو چاوەکانی وەرسووڕاندە لای هاوڕێ لەگەڵ یەك نەگونجاوەکانی خۆیو پرسی ((چەند کەسین؟ دوازدە نەفەر، یەك نەفەر لە هەر هۆزێکی سراییلی، هەرماسو فریشتەکان، بەچکە هەرماسەکان، کورتە باڵاکان: تەواوی زادو رووباری خودا، بەشی خۆتان هەڵگرن!)) ریش سوور کەیفی کۆك بوو چاوی خڕو بازئاسای بروسکی دەدا. بە درێژکردنی دەستی قەبەی لەتووڕەییان لە هەمان کاتدا بەهێوری شانی هاوڕێکانی دەگرتە چنگ، لە کاتێکا لە سەرەوە تا بنەوە لێیان ورد دەبۆوە دەکەوتە قاقاوە، یەك یەکی ئەوانی بۆ هەوا بەرزدەکردوە، بە رەهاکردنی هەر یەکێکیان ئەوی تری دەگرت.

- سەڵاو، ئەی لەئیمی فس خۆری سودگەڕ، کوڕی ئیبراهیم، تۆی تەمبەڵو چەنەبازی زۆرخۆر... تۆ شیری پاکت خواردوەو نەکەس دەکوژیو نەدزی دەکەیو نە زینا، چوونکە دەترسی، تەواوی باشیەکانی تۆ زادەی ترسە، تۆی کەڕی گەمژە کەلە ژێر باری کوتەك پشتت دەچەمێتەوە، لەگەڵ بوونی برسیەتیو تێنوێتیو سەرماو قامچی بەردەوام بە لە رێگەی خۆت، تۆ بە کەرباریو بێ ئەوەی ئاگات لە عیزەتی نەفسی خۆت بێو بنی قاپان دەلێسییەوەو تەواوی باشییەکانی تۆ زادەی ترسە، تۆ ئاگری بن کا لە لانەی شێرو لانەی (یەهوە) راوەستەو مەیە ژوورەوەو، تۆ مەڕی بێ گوناهی باعەباع بکە، بکەوە دوای خودایێ کە دەویەوێت تۆ بخوات، تۆ نەوەی (یاکوب)ی درۆزنی گەڕۆك کە وردەوردە خودا دەفرۆشیو لە قاپی ماڵەوەت ئەوەندە شەراب دەخۆیتەوە تا مەست ببیت، بۆ ئەوەی لەکاتی شلکردنەوەی سەری کیسەی خۆیان رازی دڵی خۆیان بە تۆ بڵێن، ئەی رەزیلترین مرۆڤ. تۆ ئەی زاهیدی پیسو



راسیسزمی سەرسەخت ئێستاکە لەبەردەم ئەودا دەکەویە سەرخاکو سوژدەی بۆ دەبەی، چوونکە لە خۆت دەچێ، تۆ کە رۆحی فەنا ناقەبوڵت کردۆتە مەغازەی سەڕڕافیو لە ئاستانەی دەرگادا دادەنیشیو دەستت دەبەیتە ناو کیسەو سەدەقە دەدەی بە هەژارانو قەرزیش دەدەیتە خوداو لە ناو دەفتەری حسابت دەنووسی، کە ئەوەندە زەکاتە بە فلانو فلان کەسو لە رۆژی فلانو لەهەمان سەعاتدا دراوە، وەسیەتنامەی خۆت دەنووسی تا دەفتەری حسابت لە ناو تابوتت دابنێنو لە بەردەم خودا دا بیکەیتەوەو وێنەی حسابکاری خۆت پێشکەش بکەیت، تا رۆژانە پارەو پول کۆکەیتەوە، تۆی درۆزنی فشەباز، تەواوی فەرموودەکانی خودا لە ژێر پێ دەنێیو پیاوکوژی دەکەی، دزیو زینا دەکەی پاشانیش سەردەکەیتە گریان، لەسینەی خۆت دەدەیو گیتارەکەت هەڵدەگریو گوناهەکانت دەکەیتە ئاهەنگ، ئەی هەرماسی بەدخوو تۆ چاك دەزانی خودا لە نەواژەنەکان دەبورێ، گوایە هەر هەڵەیەکیش بکەن، چوونکە خودا کوشتەی ئاهەنگێکە...و تۆ تۆماس ئەی سیخورمەی تیژی ناو ئێمە... من بەڵێ، منی گەمژەڵی بێ بەرپرسێتی کە کەللەم پڕ لە با بوو، ژنو منالم لە گەڕان بەدوای کریستیانو رەها کردوەو بوونی ئێمەو هەرماسو فریشتەو بەچکە هەرماسو کورتە باڵاکان لەو ئامانجە گەورەیەی کە هەمانە زەروریە، کەواتە یاڵڵا تاقیبی بکە. ریش سوورەکە پێکەنیو تف دەستێکی کردو قاچە قەبەکانی کەوتە جولە، دووبارە هاواری کرد یاللا تاقیبی بکەن)) بە درێژی زەوییە سەرەونشێوکەی (ناصیرە)ەوە کۆتایی دەهات بەرەو پێشەوە کەوتەڕێ. مرۆڤ و کێوەکان بوون بە دووکەڵو نەمان، چاوەکانی خەونبین پڕ بوون لە تیرو تاری، ئێستاکە لە خەوی بێ پایانی ئەودا، جگە لە دەنگی داکشانو کوتانەوەی کێو بە قاچی زڵو سەنگین، هیچ شتێکی دیکە بەرگوێ نەدەکەوت. دڵی ئەو وەك ئاژەڵێکی کێوی سەری لە قەفەزی سینەی ئەو دەکوتا، لە دەروونی خۆیا گوێی لە سەداو دەنگێکی گوێ کاسککەر دەبوو ((وادێن، وادێن)) بە هەڵبەزینەوەیەك لە جێی خۆی هەڵقۆزیەوە (لە خەودا وای دەهاتە بەرچاو) مێزی کارکردنی خۆی خستە بەردەرگاو دایخست، تەواوی ئامێرەکانی دارتاشی خۆی کە بریتی بوو لە رەندەو دارو مشارو جەگو تەپشوو چەکوشو درێل، لەگەڵ خاچێکی قەبە کە شەوانە کاری لەسەر دەکرد بەسەر مێزەوەی دانان، ئەو

کاتەش خۆی لەناو ئاردەداری تاشراودا شاردەوەو چاو لەرێ بوو، بێدەنگییێکی عەجیبو نائارامو شلۆق کە ناخۆشهێن بوو فەرمانڕەوا بوو، هیچ دەنگێ نەدەکەوتە بەرگوێ نەدەنگی هەناسەی خەڵکی دێ، نەهەناسەی خودا، هەموو شتێ هەتا هەرماسی شەوی زیندەداریش کەوتبووە ناو دەروونی چاڵی تاریكو بێ کۆتاییو وشك... ئەوە خەونێك بوو یا مەرگی جاویدانی خودا؟ کابرای گەنج کەوتبووە وەحشەتەوە، مەترسی دەبینی، بە تەواوی هێزەوە هەولیدەدا تا بگاتە ناواخنی زەینی غەرق بووی خۆیو خۆی نەجات بدات- بێداربۆوە. شەلاڵی ئارەقەبوو بوو، هیچ شتێکی لەخەونەکە لەبیر نەمابوو، تەنها ئەوەیە کە کەسێ تاقیبی دەکا... کێیە؟ یەك نەفەر... زۆر؟ خەڵکان؟ هەرماسەکان؟ نەیدەتوانی وەبیر خۆی بهێنێتەوە، گوێکانی خۆی تیژکردەوەو گوێی هەڵخست... لەسکوتی شەودا ئێستاکە سەدای هەناسەدانی خەڵکی دێ دەگەیشتە گوێ، هەناسەهەڵکێشانی سینەو گیانێکی زۆر، سەگێ تازیەدارانە دەوەڕی: جار جارە درەختێ لە بادا خشەخشی دەکرد، لەخوارەوەی دێ دا دایکێك بۆ خەواندنی منالەکەی بە ئارامیو هەستدارییەوە لای لایەی دەچڕی، شەو تژی بوو بوو لە رازو ئاهەئاهێ کە ئەو پێی دەزانیو حەزی لێدەکرد.

زەوی قسەی دەکرد، خودا قسەی دەکرد، کابرای تولاژ ئارامی گرتو بۆ ساتێ ترس دایگرت، لەو دنیایەدا تاكو تەنها ماوەتەوە، دەنگی هەناسەی توندی باوکی لە ژووری تەکیەوە دەبیسترا، پیاوە بێچارەکە نەیدەتوانی بکەوێتە خەوەوە، دەمی خۆی کەچ دەکرد بە کردنەوەو داخستنی لێوەکانی هەولیدەدا بخەوێ، سالانێك بوو بەجۆرە خۆی ئەشکەنجەدابوو، تەواوی هەولی ئەو ئێستاکە ئەوە بوو کەسەداییێکی مرۆیی لەدەمیدا هەڵبچێ، بەلام هێشتاکەش بەبێ هەست بەسەر تەختە خەوی خۆیدا رونیشتبوو، زمانی خۆی لە دەست نەبوو، لە حالێکا کە ئاو لە لچو لێوی سەرەوژێر دەبۆوە، هەولیدەداو ئارقەی هەڵدەڕشتو جارجارە دوای کێشمە کێشمێکی وەحشەتناك دەیتوانی وشەیەك بە نەواییێکی جیاوازی سێلاوی هەڵڕژێنێتە سەر زمانییەوە، یەك وشەو هەمیشە هەمان شت:



ئە-دۆ- نی- یا ((ئەدۆنیا تەنها ئەدۆنیا هیچ شتێکی دیکە نا، زەمانێکە ئەم وشەیە بە تەمامو کەماڵەوە ئەدا دەکات، یەك دوو سەعات بە ئارامی بەسەر جێگەوە دەمینێتەوە تا دووبارە تەقەللا وجودی دابگرێو جارێکی دی کردنەوەو داخستنی دەمی دەست پێبکاتەوە. پیاوە گەنجەکە چاوەکانی فرمێسکاوی بووبوون... بە زەمزەمەوە گوتی: ((کەمتەرخەمی منە... کەمتەرخەمی منە... لەسکوتی شەودا کوڕە ئازاری باوکی بیستو ئەویش لە ژێر دەسەلاتی ئازاردا بەبێ ویستی خۆی دەستی کرد بە ئارەقە هەڵڕشتنو کردنەوەو داخستنی لێوەکانی، چاوەکانی داخستو گوێی هەڵخست تا ببینێ ئاخۆ باوکی چی دەکات، بۆ ئەوەی ئەویش وەکو ئەو بکات، لەگەڵ پیرمێردەکە ئاهی هەڵکێشاو نالەییێکی بێ ئومێدانەو نامەفهومی سەردا، لەو حالەتە ئیدی جارێکی دی چووە خەوەوە. بەلام هەرکە خەو غەلەبەی کرد، دووبارە مالەکە تەکانێکی توندی خوارد، مێزی کارکردن سەرنگون بوو، ئامێرەکانی دارتاشیو خاچەکە کەوتنە ناو ژوورەکەوە، دەرگا کرایەوە ریش سوورەکە، بەقەلافەتێکی نەناسو خەندەییێکی وەحشیانە بازووی خۆی کردەوە، ئاستانەی دەرگای داپۆشی کابرای جحێل هاواری کردو لەخەو بێداربۆوە.

## بەشی دووەم

کوڕەی جحێل بە سەر ئاردەدارەکانەوە هەڵسایەوەو پشتی خۆی دابەدیوار، قامچییێکی نەخشین بەدوو ڕێز بزماری تیژ بەسەر سەریەوە هەڵواسرابوو، هەموو شەوێ پێش خەو ئەوەندەی بە قامچی لە خۆی دەدا، کە هەموو گیانی شەلاڵی خوێن دەبوو، تا بەدرێژایی شەو بەئارامی بمێنێتەوەو تووشی گوناهکردن نەبێ، لەرزینێکی سوك دایگرتبووە چەنگاڵی خۆیەوە، نەیدەتوانی وەبیرخۆی بهێنێتەوە کە چ وەسوەسەیەك لەخەوندا هاتبووە سۆراغی ئەوەوە، بەلاّم هەستی دەکرد بە سەلامەتی لە مەترسییێکی گەورە رزگاری بووە، لە حالێکدا چاوی بڕیبووە ئاسمانو ئاخی هەڵدەکێشا، لەگەڵ خۆی کەوتبووە چپەوە ((زیاتر لەوە تاقەتم نییە ئیدی بەسە)) ڕۆشنایی تازە هەلاّتوو، بەنادڵنیاییو کەم رەنگیەوە لە درزی دەرگاوە خزیە ژوورەوە، لەگەڵ قامیشەلاّنەکانی بنمیچی ژوور بە خۆو بە رەنگی زەردی سازگاریان تیشکێکی غەریبو دڵنەوازی عاجیان دەبەخشی، لەکاتێکا تووڕەییان ددانەکانی بەسەریەکدا دەقرمسان، لەبەرخۆ کەوتە ورتەوە ((زیاتر لەوە تاقەتم نییە ئیدی بەسە)) چاوەکانی بڕیە هەواوەو لەپڕێکا تەواوی ژیانی ئەو بە بەرچاویدا گوزەری کرد: گۆچانی باوکی کە لە رۆژی ناولێنانی ئەو شکۆفەی کردبوو، ئەو کاتە بروسکەییێکی لێ هەڵسابوو پەکی خستبوو، لەمە بەدوا کە دایکی لەو- کوڕەی خۆی- رادەما هیچی نەدەگوت، بەلاّم ئەو گلەییە لالەی دایکی دەبیست، هەق بە دایکی بوو گوناهەکانی ئەو شەوو رۆژە وەك خەنجەرێ دادەبەزیە سەر دڵییەوە، ئەو چەند ساڵەی ئاخیری بەبێ هوودەوە کەوتبووە جەنگەوە تا بە تەنها ئەو هەرماسەی بە تەنها لە بوونی ئەودا مابوو، واتە



ترس ببەزێنێ، هەرماسەکانی دیکەی تووشی نابوودی کردبوو: هەژاری، هەوەسی ژنان، لەززەتی گەنجێتی، کۆنترۆڵی تەواوی هەرماسەکانی کردبوو، تەنها هەرماسی ترس نەبێ، چی دەبوو کە غەلەبەشی کردبایە سەر ئەویشەوە، چ دەبوو ئەگەر بیتوانیبایە... ئەو ئێستا پیاو بوو... کاتی هاتبوو. کەوتە زەمزەمەوە لەگەڵ خۆیدا ((پەککەوتنی باوکم خەتای من بوو... خەتای من بوو کە مەجدەلیە کەوتە بەدکارییەوە، خەتای منە کە سراییل ئێستاکەش لەژێر کۆت... دەناڵێنێ، کەلەشێرێ- کە دەبێ لە ماڵە هاوسێکەدا بێ کە خاخامی مامی تیا دەژیا، باڵەکانی بەسەربانەوە لێکداو یەك لەدوای یەك بەتووڕەیی قوقاندی، وادیاربوو لە شەوی درێژخایەندا ماندووببوو، بانگی خۆرەتاوی دەکرد بە دیارکەوێ، مەردی جەوان پشتی خۆی بەدیوارداو گوێی قولاّغ کرد، رووناهی هەڵهاتە سەرماڵ، دەرگاکان کرانەوە، کوچەو کۆلاّن ڕۆحیان هاتەبەرو (ناصیرە) خەریك بوو بێداربێتەوە، لەپڕێکا ناڵەییێکی عەجیب لە ماڵەکەی هاوسێ بەرزبۆوە، لەپاش ئەمە یەك دوای یەك نەعرەتەی خاخام دەبیسترا، خوای سراییلی بێدار دەکردەوە ئەو وادەیەی وەبیر دەهێنایەوە کە بە سراییلی دابوو، ((خودای سراییل، خودای سراییل تاکەی؟)) کابرای گەنج دەنگی ئەژنۆی خۆی دەبیست کە بە تەختەی ناو ژووری وەتاغ دەکەوت، سەری خۆی بەتوندی راتەکانو لەگەڵ خۆی کەوتە وەرتەورتەوە ((وا وادەپاڕێتەوە سەر لە ئاستانەی خودا دەکوتێو هانای بۆ دەبات، ئێستا وا دیوار دەکوتێتەوە تامنیش دەست بەدوعای خۆم بکەم)) رووی گرژ کردو بەردەوام بوو ((ئێستا ناکرێ بتوانم بەبێ هاوخەمی خەڵکان سەروکارم لەگەڵ خودادا هەبێ)) مشتی خۆی بەتوندی بەدیوار داکوتی تا بەخاخام نیشان بدات کە ئەویش بێدارەو خەریکی دوعا دەبێت. کابرای گەنج هەڵبەزیەوەو کەوتە سەر قاچەکانیەوە، کراسی درێژو پینەپینەی بەسەر شانەکانیەوە خزیو جەستەی لەڕولاوازی لەبەر رۆژ سووتاوی لەگەڵ شوێن برینە سوورو رەشەکانی ئەوی بە دیارخست، بە شەرمنیو بە پەلە جلی خۆی گل دایەوەو لەدەوری جەستەی رووتیدا پێچایەوە، نوری رەنگ پەڕیوی سوبحەگاهان لە کلاّوڕۆژنەی بنمیچ هەلاّتە ژوورەوە، کەوتە سەر ئەوو رووخساری بە نەرمی رۆشن کردەوە، هەمووی بێباكو غرورو شەڕخوازی گەڕەکی... مووی دەوری چەناگەیو گۆناکانی رەش داگەڕابوونو گڵوازە

بووبوو، لوتی بازئاساو لێوەکانی ئەستوور بووبوون، لەبەر ئەوەی لێوەکانی تۆزێ کراوەبوون، ددانەکانی لەبەر رووناهیدا سپی دەچوونەوە، رووخساری جوان نەبوو، بەلاّم جوانییێکی شاراوەو پەرێشانسازی هەبوو، پێلوەکانی بوون کە شایستەی سەرزەنشت بوون، پێلوی قەبەو درێژ کە سێبەرێکی شینی عەجیبی دەخستە سەر رووخساریەوە؟ یا کاری چاوەکانی بوو؟ کە گەورەو رەش بوون، تژی رۆشنایی، تژی رەشایی، هەمووی تژی شیرینی، دەبجریواند، وەك چاوەکانی مار لەنێوان پێلوی درێژ، سەیری تۆیان دەکردو سەری دەخستیە سوورڕەوە، ئەو ئاردەدارە تاشراوانەی داتەکاند، کە بەژێر هەنگلۆ بەڕیشیەوە نووسابوون داتەکاند، دەنگی چەند قاچێکی سەنگینی بەرگوێ کەوتبوو، هەنگاوەکان وەنزیك دەکەوتنەوە، ئەوانی ناسی لە نەفرەتەوەکەوتە زەمزەمەوە ((ئەمە ئەوە، دووبارە وادێ، چی لەگیانی من دەوێ؟ خۆی کێشایە لای دەرگا تا گوێ قولاّغ بکات، بەلاّم لە هیکەوە بەوەحشەتەوە لە شوێنی خۆیدا مایەوە، چ کەسێ مێزی کارکردنی ئەوی لەپشت دەرگا داناوەو خاچو ئامێرەکانی ئەوی بەسەرا بارکردنو کەی؟ چ کات؟ شەو پڕە لە رۆحی پیسو خەونەکان، کە دەچینە خەو ئەوان کە دەرگا بە کراوەیی دەدۆزنەوەو بەمەیلّی خۆیان هاتوچۆ دەکەنو ماڵ مەغزمان سەروەژێر دەکەن. بەبنی لێویەوە لەگەڵ خۆی کەوتە زەمزەمەوە ((دوینێ شەو کە خەوتبووم کەسێك هاتۆتە ژوورەوە، وەك بلّێی ترسێکی هەبوو کە ئەو کەسە ئێستاکەش هەر لە وێیە قسەکانی ئەو ببیستێ ((کەسێ حەتمەن هاتۆتە ئێرەوە خودابووە، خودا، یا هەرماس؟ کێ دەتوانێ بەجیاوازی نێوانیان قایل بێت؟ ئەوان رووخساریان دەگۆڕنەوە، خودا هەندێ جار تەواو دەبێتە تاریکیو هەرماسیش نور، زەینی مرۆڤ لە نادیاریدا دەخزێتە خوارەوە)) لەرزی، دوو رێگە لەبەردەم قاچەکانی دابوو، بەکامیان دا بڕواتو کامیان هەلّبژێرێ؟ هەنگاوی قورس تا دەهات نزیکتر دەبۆوە، پیاوە گەنجەکە بە نیگەرانیەوە سەیری دەوربەری خۆی دەکرد، وا دیاریدەدا کە بەدوای شوێنێکدا دەگەڕێ بۆ خۆشاردنەوەو راکردن، لەو پیاوە دەترساو حەزی نەدەکرد بێتە ماڵەکەیەوە، چوونکە لەقوولاّیی بوونیدا کۆنە برینێکی سارێژنەبوو هەیە، لە دەورانی منداڵیدا جارێکیان لەکاتی یاری کردندا، ئەویتر کە سێ ساڵ لەو گەورەتربوو ئەوی بەزەوی دادابوو، بێ ئەوەی قسەیێ بکات، قیت بوو بۆوە، بەلاّم



لەوە بەدوا هیچ کات لەگەڵ منداڵان یاری نەکردبوو، شەرمنو ترسنۆك بوو بوو، بە تەنها لەحەوشی ماڵدا سەری لەبەر خۆدەناو، لەزەینی خۆیدا بەرجەستەی کردبوو کە رۆژی بەلێدانی ئەو داغە نەنگە چاکتری خۆی بۆ ئەوان دەسەلمێنێ، دوای رابردنی ئەو هەموو ساڵە برینەکە نە تەنها سارێژ نەبوو بوو، بەڵکو بە بنی دابۆو، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((هێشتا بەدوامەوەیە؟ هێشتا؟ چی لەگیانی من دەوێ؟ لێناگەڕێم بێتە ژوورەوە، لەقەیێ بە دەرگا کەوت، پیاوە گەنجەکە وەکو تیرێ خۆی گەیاندە دەرگا بە وەبەرهێنانی تەواوی قودرەتی خۆی مێزەکەی هەڵگرتو دەرگەی کردەوە، لەئاستانەی دەرگادا دێوێ بە ردێنی سوورو ئالۆزو بەکراسێکی کراوەو پێ پەتیو چەهرە گوڵگونو شەلاّلّی ئارەقەوە وەستابوو، لەحالێکا، قەپی لەو گەنمە شامیە دەدا کە لە دەستی دابوو، نیگای خۆی هەڵخستە سەر دەوروبەری کارگەکەو، خاچەکەی دیت کە بە دیوارەوەیە، برۆی تێکهەڵگلوفا، ئەو کاتە پێی بەرزکردەوەو هاتە ژووروەوە بێ ئەوەی وشەیێ بهێنێتە سەر زمان چووە گۆشەییێکەوەو وەحشیانە قەپی لەگەنمە شامی دەدا، گەنجەکە هێشتا بەسەر پێوەبوو، نیگای خۆی لەودا وەرسووراندو لە درزی دەرگای کراوەدا نیگای کردە کۆلاّنە تەنگو ناوەخت بێداربووەکەوە، هێشتا گەردو تۆز بەرز نەبووبۆوە، زەوی نمناكو عەتراوی بوو، شەونمی شەوانەو نوری سیحر لەگەلاّی دەرختی زەیتوندا رووبەڕوو دەتکایەوە، درەخت بەتەواوی قامەتیەوە پێدەکەنی، پیاوە گەنجەکە کەوتبووە شەوقەوە، لە دنیاییێکی سپێدە دەمیدا هەناسەی هەلّدەکێشا، بەلاّم ریش سوورەکە گەڕایەوە لای ئەوو بە رووگرژیەوە گوتی: ((دەرگا داخە قسەم لەگەڵ تۆ هەیە)) بەبیستنی ئەو دەنگە وەحشیە گەنجەکە لەرزیو دەرگای داخست بەسەر لێوی مێزەکەوە دانیشتو لە چاوەڕوانیدا مایەوە ریش سوورەکە گوتی: (من هاتووم هەموو شتێ ئامادەیە؟ گەنمە شامیەکەی تورڕ هەلّدا چاوە زبرو شینەکانی خۆی دووریەگەنجەکەو ملی قەڵەو وچین چینی درێژکرد: ((تۆ چۆن، تۆش ئامادەی؟)) روونـاکی زیاتر بوو بوو، پیاوە گەنجەکە، ئێستا دەیتوانی رووخساری زبرو رەنگینی ریش سوورەکە ئاشکراتر ببینێ، رووخساری ئەو یەك رووخساری نەبوو، نیوەی پێدەکەنی نیوەکەی دیکە تووڕەو توند، کاتێ کە نیوەییێکی ئازارئامێز دەبوو، نیوەکەی دیکە سەختو بێ حەرکەت لە شوێنی خۆی دەمایەوە، هەتا ئەو کاتەی کە

هەردوو نیوەی بۆ ساتێ هەمەجۆر دەبوون، لە ژێر لێوی هاوجۆری، هەستت دەکرد کە خوداو هەرماس، بەقبوڵ نەکردنی سازشەوە لەگەڵ یەك لەجیدال دابوون، کابرای گەنج وەڵامی نەدایەوە ریش سوور سەیرێکی تووڕەو توندی کردە ئەوەوە.

دووبارە پرسی ((ئامادەی؟)) ئەوخۆی ئامادەی هەڵسانەوە کردبوو تا بازووی پیاوە جەوانەکە بگرێو رایتەکێنێ تا بێدار بێتەوەو وەڵام بداتەوە، بەڵام لە هەمان ئەو بگرەو بەردەیە شەیپور لێدراو سوارەی نیزامی بە تاودانەوە هاتنە ناو کۆڵان لەدوای ئەمە دەنگی پێی قەبەو باڵانسی سەربازانی رۆمی بەرزبۆوە، ریش سوورەکە مشتی خۆی کردە گرێو بەلای بنمیچی ژوورەوە زۆری بەرزی کردەوەو نەڕڕاندی ((خودای سراییل زەمانی هاتووە ئەمڕۆ نەك سبەی، ئەمڕۆ!)) دووبارە بۆلای گەنجەکە گەڕایەوەو جارێکی تر پرسی ((حازری؟)) بەڵام هێشتا بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێ بێ بەردەوام بوو ((نا... نا تۆ خاچ ناهێنی، هەمان شتە کە گوتم! خەڵك گردبوونەوە، باراباس لەگەڵ پیاوانی خۆی لەکێو هاتۆنەتە خوارەوە- ئێمە زیندان دەشکێنین، (جانباز) بەرەڵلا دەکەین، ئەو کاتە روداوێ روودەدات- سەرت رامەتەکێنە- ئەو کاتە پەرجوییێ روودەدات، لەمامت خاخام بپرسە- دوێنێ هەموو ئێمەی لە کلێسا کۆکردەوە- جەنابت بۆ ئامادەنەبووی؟ هەڵسایەوە سەرپێو قسەی بۆ کردینو گوتی: ((مادامەکێ دەستمان لەسەردەست داناوە کریست بەدیار ناکەوێ، بۆ بە دەرکەوتنی کریست خواو خەڵك دەبێ لە تەك یەکەوە بجەنگن)) بۆ ئاگاداری جەناب عالی بوو، ئەو شتە بوو کە بە ئێمەی گوت، خودا بە تەنها بەس نییە، هەروەها دەبێ لەتەك یەك بجەنگن، گوێت لێیە؟ بازووی پیاوە گەنجەکەی گرتو بەسەختی رایتەکاند ((گوێت لێیە؟ حەواست لەکوێیە؟)) تۆ دەبوایە لەوێ بوای گوێت لە قسەکانی مامت بوایە شایەد دەهاتیەوە سەر ئەقل، منالۆکە. مامت گوتی: (جانباز) ئەمڕۆکە هەموو کافرەکانی رۆمی دەیانەوێ لەخاچی بدەن لەوانەیە کریستێ بێ کە نەوە لەدوای نەوە چاومان لەرێی بووە، ئەگەر ئەو بە بێ یارویاوەر رەها بکەین، ئەگەر بۆ رزگارکردنی پەلە نەکەین، بە بێ ئەوەی ناونیشانی خۆی ئاشکرا بکات دەمرێ، بەڵام ئەگەر بۆ رزگارکردنی خێرا کەین ئەوە پەرجوییێ روودەدات، پەرجو چییە؟ ئەو جلی کۆنی خۆی تورهەڵدەداو تاجی شاهانەی داود بەسەر هەنیەییدا دەدرەوشایەوە! هەربە تەنها بە



ئاگاداربوونی جەنابعالی... ئەوە مامت بە ئێمەی گوت بە بیستنی قسەکانی هەموو کەوتینە گریانەوە، خاخامی پیر دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردو هاواری کرد ((پەروەردگاری سراییل هەمان ئەمڕۆکە نەك سبەی هەمان ئەمڕۆکە!)) هەریەك لەئێمە دەستی بەرزکردوەو بە گریانەوە دەستی بەرەو ئاسمان کردەوەو کردمان بەزەناو هەڕەشەمان کرد، فرمێسکمان هەڵڕژت، ((هەمان ئەمڕۆ نەك سبەی، ئەمڕۆ، گوێت لێیە کوڕی دارتاش یا من لەگەڵ دیوار قسە دەکەم؟)) کوڕە گەنجەکە لەکاتێکدا چاوی نیوەکراوەی دووری بووە سەر قامچیو بزمارە تیژەکانی کە بە دیواری بەرامبەرەوە هەڵواسرابوو، بەدیقەتەوە لە حاڵەتی گوێگرتنی شتێ بوو، لەژێر سەدای زبرو هەڕەشەئامێزی ریش سوورەکە هەستی بە کشمە کشمی نهێنیاوی باوکی پیری دەکرد لە وەتاغی تەکیەوە کە چۆن چۆنی بە کردنەوەو داخستنی لێوەکانی بێهودە هەولێدەدا تاقسە بکات، ئەم دوو دەنگە لەدڵی کابرای گەنج تێکەڵ بە یەك بوون، لە پڕێکا هەستی کرد کە تەواوی هەولو تەقەلای مرۆڤ جگە لە مەسخەرەیەك هیچی دیکە نییە، ریش سوور شانی ئەوی گرتو بۆ پێشەوە رایدا ((ئاهای هەپرە حەواست لە کوێیە؟ نەتبیست شەمعونی مامت چی بە ئێمە گوت؟ پیاوە گەنجەکە بە زەمزومەوە گوتی: ((کریستیانو بەمجۆرە بەدیار ناکەوێت)) چاوی بڕیە ئەو خاچە تازە دروست کراوەی کە لە نورێکی ئارامو سوورفامی سیحر غەرق بوو بوو ((نا کریست بەمجۆرە بەدیار ناکەوێت ئەو هەرگیز واز لە جلی جینگوڕی خۆی ناهێنێو تاجی شاهانە لەسەر نانێ، نەخەڵك نەخودا بۆ رزگارکردنی ئەو نایەن بە هانایەوە، هەر بەجلی کۆنو جینگوڕیەوە دەمرێت، هەتا بەوەفاترین مرۆڤ بە تەنهایی جێدەهێڵێ، تەنهاو تەنها بەسەر ترۆپکی کێوێکی وشكو بێ بەرهەم، بەخۆو بە تاجێ لە دڕك بەسەر سەریەوە دەمرێت. ریش سوور گەڕایەوەو بەسەر سامییەوە روانیە ئەوەوە، نیوەی رووخساری دەدرەوشایەوەو نیوەی دیکەی بە تەواوی تاریك مابۆوەو پرسی ((چۆن دەزانیو چ کەسێ بەتۆی گوتووە؟)) بەڵام کابرای گەنج وەڵامی نەدایەوە. ئێستا کە هەوا تەواو رۆشن بووە، بەسەر تەختی خوارەو هەڵبەزیەوەو بە هەڵگرتنی چەکوشیو مشتێ بزمار بۆ لای خاچەکە کەوتەرێ بەڵام ریش سوورەکە پێشی لێ گرتو بەهەنگاوی درشت خۆی گەیاندە خاچەکەو وەك بڵێی مرۆڤ بێ دەستی کرد بەراوەشاندنی مشتو

تف کردنە خاچەکە. گەڕایەوە ریش‌و سمێڵ‌و برۆکانی لە رووخساری کابرای گەنج خشی هاواری کرد. ((شەرم ناکەی؟ تەواوی بازرگانانی تامێرو کاناو کفر ناحوم بۆ دروست کردنی خاچ بۆ (جانباز) سەرپێچیان کردو تۆ شەرم ناکەی؟ ناترسی؟ وادابنێ کە کریست بەدیارکەوێ‌و تۆ لەکاری دروستکردنی خاچ ببینێ... فەرزکە (جانباز) ئەمڕۆ لە خاچ دەدرێ خودی کریستیانو بێ... بۆ وەکو ئەوانی دیکە شەهامەتی ئەوەت نییە کە بە یوزباشی بڵێی ((من بۆ قارەمانانی سراییل خاچ دروست ناکەم؟)) ئەو کاتە شانی دارتاشی پەرێشان حەواسی بەچنگ گرت‌و گوتی: ((بۆ نەتگوت؟ لەچ رامای)) ئەوی بەدیوار داداو بە قێزەونکردنێکەوە گوتی: ((تۆ ترسنۆکی- هەمان ئەوەی کە گوتم! هەموو زیندەگیت بەربادە)) سیرڕەی سەدایێ هەوای شەق کرد، ریش سوور بە رەهاکردنی گەنجەکە... رووخساری بۆلای دەرگا وەرسوڕاندو گوێی خۆی راگرت، لەدەرەوەدا، غەڵبە غەڵبێ بەر پابوو بوو، خەڵکێکی زۆر لەژن‌و مێردان هاواریان دەکرد ((جارچی جارچی!)) ئەوکاتە جارێکی دیکە سیرڕەی سەدا بەسەر هەموو شوێنێکدا فەرمانڕەوابوو))

- کوڕو کچانی ئیبراهیم، ئیسحاق‌و یا کوب، بەفەرمانی ئیمپراتۆری دەبێ مەغازەو مەیخانەکانی خۆتان داخەن‌و نەچنە مەزراوە، دایکان منالانی خۆتان هەڵگرن وپیرەمێردەکان گۆچانی خۆتان بگرنە دەست‌و وەرن! ئەی ئەو کەسانەی کە گۆجن یا کەڕن یا کەشەنگن وەرن تاببینن چۆن چۆنی ئەوانەی کە دەستی خۆیان لە دژی ئەربابی ئێمە (ئیمپراتۆر) کە خودا عومری درێژکات بەرزدەکەنەوە، ئاگادار دەبنەوە، تاببینن ئەو یاخییە پۆخڵە ئەو جانبازە دەمرێت. ریش سوورەکە دەرگەی کردەوەو ئەو ئاپۆڕەی بینی کە هەراو زەنایان بوو ئەوسا کە بێدەنگ بوو بوون، گوێیان رادەگرت، جارچی بەسەر تاوێرێکەوە بینی، ئێسقانێکی بێ کلاو بەملی درێژو پێی باریك‌و تەشی ئاسای تفێکی رووکرد، هاواری کرد ((ئەی خائین عەزاب‌و دۆزەخی خودات بەنسیب بێت)) لەحاڵێکدا کە بە تووڕەییەوە، دەرگەی بوشتوکدا، کوڕە گەنجەکە گەڕایەوەو نەڕڕاندی ((شانازی بە سیمۆنی برای ناپاك خۆت بکە)). گەنجەکە بە پەشیمانیەوە گوتی: ((خەتای ئەونییە خەتای منە)) دوای ساتێ وەستان پێداچوو گوتی: ((لەبەر خاتری من بوو کە دایکم لەماڵێی دەرکرد، لەبەر خاتری من- ئێستا



ئەو..)) نیوەی تەبەشی ریش سوور رەنگی میهرەبانی گرت‌و بۆ ساتێ وەك بڵێی لەگەڵ کوڕە گەنجەکە هاودڵی بکات رۆشن هەڵگەڕا پرسی: ((چکۆڵەی خۆم، چۆن دەتوانی قەرزی ئەو هەموو گوناهانە بدەیتەوە؟))، کوڕە گەنجەکە بۆ ماوەیەك بێدەنگ مایەوە، لێوەکانی جولا بەلاّم زمانی بەسترابوو، کەچی لە ئاخیری توانی بڵێی: (براکەم یەهودا، لەگەڵ ژیانم)) ریش سوورەکە راجفری، ئەوکاتە رووناهی لەکلاورۆژنەو کەلێنی دەرگاوە هەلاّتبووە ناو کارگەکەوە، چاوانی درشت‌و رەشی گەنجەکە دەدرەوشایەوە، سەدای پڕبوو لە ناخۆشی‌و ترس، ریش سوور بەگرتنی چەنەگەی ئەو گوتی: ((لەگەڵ ژیانت؟ رووخسارت لەمن وەرمەگێڕە تۆ ئێستا بۆ خۆت پیاوی، سەیری چاوەکانی من بکە... (بە ژیانت) مەبەستت چییە؟ پیاوە گەنجەکە وەلاّمی دایەوە: ((هیچ مەبەستێکم نییە))، سەری خۆی هێنایە خوارەوەو بێدەنگ بوو، بەلاّم لە پڕێکا گوتی: ((برام یەهودا، لەمن مەپرسە... مەپرسە)). یەهودا رووخساری کابرای گەنجی گرتە میانی دەستەکانی، بەرزی کردەوە بۆ ماوەیەکی درێژ بێ ئەوەی قسەیێ بکات سەیری کرد، ئەوکاتە بە ئارامی ئەوی رەهاکردو بەرەو دەرگا چوو، لەپڕێکا دڵی کەوتە خورپەوە، هەراو زەنای دەرەوە، هەموو دەمێ توندتر دەبوو، خشەخشی پێ پەتییەکان‌و جیڕەجیڕی سۆلەکانیان، هاوڕێ لەگەڵ چڕینگە چڕینگی دەستبەندە برۆنزییەکان‌و خڕخاڵە قەبەکانی ژنان بەرزدەبوونەوە هەوا، ریش سوور لەحاڵێکدا رەق‌و تەق لەئاستانەی دەرگادا وەستابوو، سەیری ئاپۆڕەکەی دەکرد کە هەموو ساتێ هەڵدەڕژانە کوچەکانەوە، ئەوان بەرەو لای تەپۆلکەی نەفرەت لێکراو کە مەراسیمی لەخاچدانی بەسەردا ئەنجام دەدرا سەردەکەوتن، کە کەوتبووە ئەوبەری دێکەوە، پیاوان هیچیان نەدەگوت ئەوان بەبنی لێوەکانیانەوە جوێنیان دەداو گۆپاڵی خۆیان لە بەردڕێژ دەکوتا هەندێکیان بەدزیەوە لەژێر کراسیان چەقۆیان لەمشت گرتبوو، ژنان قیژەقیژیان بوو، زۆریان لەچەگی خۆیان هاوێشتبووە سەرشان‌و قژیان کردبۆوەو دەستیان کردبوو بە چڕینی سەردولکەو پرسە، قۆچی سەردەستەی ئەم مێگەلە (شمعون) خاخامی ناصیرە بوو، پیرەمێردێکی داتەکیوو، قامەت چەمیو، خۆی‌و داغی نەخۆشی سیلی نێو تان‌و پۆی، بەستەدارێکی ئێسقانی وشك‌و برینگ بوو، کە رۆحی جاویدانی ئەوی بەسەر پێیەکانییەو راگرتبوو، پێشی لەدارمانی خۆی

دەگرت، دوو دەستی وەك ئەسکلتی ئەو لەگەڵ نینۆکی عەفریتی پەرەندە ئاسای‌و گۆچانێکی پیرۆزی پێبوو، کە نەخشی جووت ماسییێکی جمکی بەسەرەوە بوو، دەیکوشی‌و تاوێرە بەردەکانی دەکوتایەوە، هەستت دەکرد تەواوی جەستەی باریك‌و لاوازی ئەو لە گۆشت‌و ئێسقان‌و موو هەمووی لە ئاگردا دەسوتێن، لەو کاتەی کە دەمی دەکردەوەو هاواری دەکرد: ((خودای سراییل)) دووکەڵی لەسەر بەرزدەبۆوە، لەدوای ئەوەوە بە ڕیزە، ریش سپیە قامەت چەمیوەکان‌و ئێسقان درشتەکان بەگۆچان‌و بڕۆی چڕو ریشی دووفلیقانەیان، لەدوای ریش سپیەکان، خەڵکی بەهێزو پاشان ژنان لەحەرەکەت دابوون، منالاْن ستوونی کۆتاییان پێك هێنابوو هەریەکەو بە بەردێ لەدەست‌و هەندێ خۆیان‌و قۆچەقانەکانیان لەشان، ئەوان لەگەڵ یەك وەك دەریا دەهاتنە پێش‌و ئارام‌و لەسەرخۆ وەلوەلەیان بوو. یەهودا! هێشتا کە پشتی بەچووارچێوەی دەرگان دادابوو، سەیری ژن‌و پیاوانی دەکرد، دڵی گران بوو، لەحالێکدا خوێن هێرشی کردبووە مێشکییەوە کەوتە ئەندێشەوە: ((ئەوانەن... بەڵی ئەوانەن کە هاوڕێ لەگەڵ خودا پەرجو دروست دەکەن هەمان ئەمڕۆ نەك سبەی؟!)). ژنێکی پیاوانەی هەیکەلداری کەفەڵ زل کەنارەی لەئاپۆڕەکەوە گرتبوو شێت بووبوو، جلەکانی لەشان دەهاتنەخوارەوە، خۆی لارکردەوە، بەردێکی هەڵگرت بە هەموو هێزییەوە بۆ ماڵی دارتاشەکەی راوەشاندو هاواری کرد: ((ئەی خاچ ساز دۆزەخ‌و نەفرەتت لێبێ)). بە یەکجار هاوارو جوێن لەم لاوە تا ئەولای کۆلاْن پەڕی هەڵکشا، کوڕان بەردەقانیەکانیان لەشانیان هێنایە خوارەوە، ریش سوور دەرگای بەیەك داداوا، هاواری کرد: ((خاچ ساز... خاچ ساز لە هەموو لایەکەوە بەرزبۆوە، رێژنەی بەردان بۆلای دەرگا کەوتە بارینەوە. پیاوە گەنجەکە، لەحالەتێکدا لەبەردەم خاچدا کەوتبووە سەر ئەژنۆو چەکوشی بۆلای سەرو بۆلای خوار دەبردو ئەوەندە بەسەختی لەبزمارەکانی دەکوتا کە دەتگوت دەیەوەیست هاوارو جوێنەکان لە میانی سەدای چەکوش گوم بکات. سینەی دەکولاْ، تەڵەزمی ئاگر بەبەرزی لوتی ئەو هەڵدەزۆقینەوە، شێتانە چەکوشی دەوەشاندو ئارەقە لەنێو چاوانی هەڵدڕژایەخوارەوە ریش سوور کەوتە سەر ئەژنۆ، بازووی ئەوی گرت‌و بەتوڕییەوە چەکوشی لەدەستی ئەو دەرهێنا ئەوکاتە لەقەیێکی وای لەخاچەکەداو کەوتە سەرزەویەوە.



- نەکا بتەوێ ئەوەببەی؟

- بەڵێ

- شەرمەزاریش نیت؟

- نە

- لێ ناگەڕێم، ئەوخاچە وردوخاش دەکەم

سەیرێکی دەوروبەری کرد، بۆ دۆزینەوەی تیشەیێ کەوتە گەڕان‌و سووڕانەوە، کوڕە گەنجەکە لەسەرەخۆو بە پاڕانەوەوە گوتی: ((یەهودا... یەهودا برام سەرەڕێ لەمن مەگرە))، لەپڕێکا دەنگی قووڵ‌و تاریك هەڵگەڕاو دەستنیشان نەدەکرا، ریش سوور نیگەران هەڵگەڕاو لەسەرخۆ پرسی: ((کام رێگا؟))و لەحالێکدا بە پەرێشانی دەیڕوانیە کوڕە گەنجەکە لەچاوەڕەوانیدا مایەوە، رووناکی ئێستاکە راستەوخۆ لە جەستەو هەیکەلی وردیلەی دارتاشەکەی دەداو لێوەکانی پێچیان خواردبوو بەیەکەوە دوورابوون، وەك بلێی هەولێدەدا پێش لە هاوارێکی گەورە بگرێ، ریش سوور بە رەنگ پەڕیوی ئەوی بینی، دڵی دژ بە مرۆڤایەتی ئەو کەوتە بەزەییەوە... دڵۆپ دڵۆپ لەحالەتی تاوانەوە دابوو، گۆناکانی هەموو رۆژێ قوڵتر دەبوون، دواجار کە ئەوی بینی بوو، چەند وەخت تێپەڕی بوو؟ تەنها چەند رۆژێ، چووبووە دێ تا سەرکێشی لەگەڵ (گنسارت) بکات، کاری ئاسنگەری ئەو وای دەخواست بەچەکوش لێدان لە ئاسن، شێوەیێکی بداتێ‌و ئەسپەکان نالْ بکات‌و کولێنگ‌و پاچ‌و داس دروست بکات، بەلاْم بەپەلە گەڕابۆوە (ناصیرە)، چوونکە پەیامی پێگەیشتبوو کە دەیانەوێ (جانباز) لە خاچ بدەن، بەبیری هاتەوە کە چۆن هاوڕێی کۆنینەی خۆی جێهێشتووە، ئێستا سەیرکە کەوتۆتە چ رۆژێکەوە، چاوەکانی چۆن هەڵمساوەو لاجانگەکانی چۆن هەڵتەکیوە! ئەو هەموو تفت‌و تالێ دەورەی دەمی چی بوو؟ پرسی: ((چیت بەسەر هاتووە؟ بۆ دڵۆپ دڵۆپ دەتاوێیتەوە؟ چ کەسێ ئازارت دەدات. کابرای گەنج بەبێ تاقەتی پێکەنی، دەیەویست وەلاْمی بداتەوە کە ئەوە مایەی ئازاری

خودایە، بەڵام خۆی بەدوورگرت، ئەوە هاواری بەرزی دەروونی بوو نەیدەیویست لە لێوەکانیدا رابکات وەڵامی دایەوە (لەحاڵەتی کێشمە کێش دام)

- لەگەڵ کێ؟

- نازانم... لەحاڵەتی کێشمەکێش دام

ریش سوورەکە چاوی دووریەوە چاوی گەنجەکەو پرسیارپێچی کرد لێی پاڕایەوەو هەڕەشەی لێکرد، بەڵام چاوانی رەش‌و بێ ئۆقرەو ترساوی وەڵامیان نەدایەوە. لەپڕێکا سەری یەهودا کەوتە سووران، لەکاتێکاکە بەسەر ئەو دوو چاوەڕەشەوە لاربوو بۆوە، وای هاتە بەرِ چاو کە درەختی پڕشکۆفەو ئاوێکی شین‌و ئاپۆرەیێ لەخەڵك دەبینی، لە دەروونەوە لەقولایی رەشێنەی شەفافی چاو، ئەوپەڕی درەختە پڕ شکۆفەکان‌و ئاوو ئادەم خاچێکی سەس‌و گەورەیە سەرتاسەری گلێنەی داپۆشی. یەهودا بەچاوی لە کاپێلك دەرپەریوەوە، لەجێوە پەڕی دەیوست بکەوێتە قسەوە پرسی: ((نەکا تۆ... تۆ)) بەڵام لێوەکانی بەستابوو، دەیویست پیاوە گەنجەکە لەباوەش گریێ‌و ماچی کات، بەڵام بازووەکانی لە هەوادا کراوەیە لەپڕێکا وەك دار وشك هەڵگەڕا، ئەو کاتە کە گەنجەکە ئەوی بەبازووی کراوەو موی وەك شیش زیك بوو چاوی لە قەپێلك دەرپەڕیەی بینی هاوارییێکی کرد، کابوسێکی ترسناك بە زیندانی زەینیدا دەرپەڕی- گروپی کورتە بالاکان بە ئامێری تایبەت بە لە خاچ دان‌و هاواری کوڕان: (تاقیبی بکەن). ئێستاش. سوور ریشی سەرۆکی گرۆپیشی ناسی: یەهودا... یەهودای ئاسنگەر کە رابەری گروپ بوو، وەحشیانە کەوتە قاقاوە لێوەکانی ریش سوورەکە تەڵەی کرد ((نەکاتۆ... تۆ؟))

- من... کێ

ئیدی وەڵامی نەدایەوە لە حاڵێکدا سمێڵی خۆی دەجوویەوە، چاوی بڕیبووە ئەوەوە، نیوەی رووخساری، سەرلەنوێ کراوەو رۆشن بوو نیوەکەی دیکەی تاریکی بوو، لە زەینیدا ئەو ئاسەوارو نیشانەیەی کە ئەو گەنجە لە کاتی لە دایك بووناو هەتا بەر لەوەش گرتبوویە خۆی، کەوتە ورچە ورچەوە، ئەوە لە جەرەیانی خوازیاری مێرێ لەو



کاتەی کە داخوازیکەرانی مێرێ کۆبوونەوە، گۆچانی یووسف تاکە داربوو کە شکۆفەی کرد، هەر لەبەر ئەمە بوو خاخام مێرێی پاکیزەی کە وەقفی خودا بوو کردبووە دیاری ئەوەوە، ئەوە لەدابەزینی بروسکەیێ کە دەستگیرانی لە رۆژی بوکێنییەوە بەر لە ویسالێ ئیفلیج کرد، ئەو لە گرێبەستی تۆوی کوڕێ لە رەحمی بووکدا، پاش بۆن کردنی جیوەی سپی، ئەوە لە جەرەیانی پێش لە دایك بوون، زاوای لە خەودابینی کە دەرگای ئاسمان کرایەوەو فریشتەکان وەك چۆن مەلەکانی سەربانی ماڵی قێزەونی ئەو هاتنە خوارەوە، هێلانەیان چێ کردو کەوتنە چڕین، هەندێ لە فریشتەکان خۆیان پەردەدار کرد، هەندێکیان چوونە ناو ماڵ‌و ئاگریان هەڵگیرساندو ئاویان گەرم کرد، تا منالە موژدەبەخشەکە بشۆن، هەندێکی تریش بۆ ژنە زاوەکە ئاشیان بەسەرنا، ریش سوور لەسەرخۆو بێ دوودڵی‌و نزیك کەوتەوەو بەسەر پیاوە جەوانەکە لار بۆوە، ئیستا دەنگی پڕ لەتاسوق‌و تەمەناو ترس بوو، دیسانەوە پرسی (نەکا کە تۆ: تۆ؟) بەڵام دیسان زاتی نەکرد کە پرسیارەکەی خۆی تەواو بکات.

گەنجەکە لە ترسا لەرزی‌و بە گرژیەوە گوتی: (من؟ مەگەر نابینی کە ناتوانم قسە بکەم من شەهامەتی چوونە کلێسام نییە، لە بینینی مرۆڤ را دەکەم، لە بەبێ شەرمی سەرپێچی فەرموودەکانی خوا دەکەم، رۆژانی شەممە کار دەکەم)، ئەو کاتە خاچەکەی هەڵگرت‌و پێی لەسەر پێی داناو چەکوشی گرتە دەست‌و (مەگەر نابینی خاچ دروست دەکەم‌و پیایا دەکێشم)، ریش سوور شڵەژا، بەڵام قسەیەکی نەکرد، دەرگای کردەوە شەپۆلی لە دێهاتیە هەڵچووەکان لەکۆتاییە کوچەدا بەدیار کەوتن، پیرێژنە پرچ پەرێشانەکان‌و پیرمێردە رەنجورەکان‌و گۆجەکان‌و کوێرە جوزامیەکان بوون، ئەوان بە هەناسەبڕکێوە بۆ سەرەوە هەڵدەکشان‌و خۆیان دەکێشایە لای تەپۆڵکەی لە خاچدان، سەعاتی موژدەبەخش دادەهات، سوور ریش لەگەڵ خۆی کەوتە ئەندێشەوە (ئیستا کاتی ئەوەیە کە ئێرە جێبهێڵم‌و خۆم بگەیەنمە ئاپۆڕەکە ئێستا کاتی ئەوەیە هەموومان بە یەکەوە تاو بدەین‌و جانباز قوتار بکەین ئەو کاتە ئاشکرا دەبێ کە ئاخۆ ئەو رزگارکەرە یان...) بەڵام دوودڵ بوو لە پڕێکا شنەیێکی فێنك لە بەرزایی سەریەوە گوزەری کرد، کەوتە ئەندێشەوە ((نا ئەو پیاوە کەبڕیارە ئەمڕۆ لە خاچ بدرێ، کریستیانویی نییە کە قەومی سراییل چەندین سەدەیە چاویان بڕیوەتە رێی

ئەوەوە، سبەی سبەی سبەی! خودای ئیبراهیم، چەندین ساڵە کە ئەو سپێدەیە بەسەر سەری ئێمە دادەکوتێ، باشە، بەلاّم کەی؟ ئاخر ئێمە مرۆڤینو تاقەتی چاوەڕوانی زیاترمان نییە.

ریش سوورەکە تووڕە بوو، لە حاڵێکدا کە سەیرێکی غەزەبداری کردە پیاوە گەنجەکە کە لە کاری بزمار رێژکردنی خاچ بوو، لە لەرزینی ناو گیانی لە خۆی پرسی ((نەکا خاچسازە هەمان کریستیانو بێ؟

ئێمە سەرەدەر لە کاری خوا دەرناکەین، ئایا دەبێ هەمان کریستیانو بێ؟))

لە پشت سەری پیرەژنو گۆجەکانو سەربازانی گەشتی رۆمی بە سوپەرو خودەو رمی برۆنزی بەدیارکەوتن ئەوان خوێن ساردو لەسەرخۆ بوون، شوانی مێگەلی مرۆیی بوون بە بێزاریو قێزەوەنی سەیری یەهوودەکانیان دەکرد، ریش سوورەکە خوێنی هاتبووە کوڵینەوە، وەحشیانە دەیڕوانیە ئەوانەوە، گەڕایەوە لای کابرای گەنج، حەزی دەکرد سەر لەبەر سەری نەنێ، تەواوی کەمتەرخەمییەکە لە گەردەنی ئەو دابوو، لە حاڵێکدا کە مشتی خۆی داپڵۆست هاواری کرد:

(من دەڕۆمو تۆ، تۆی دروستکەری خاچ هەر قۆڕڕیەك دەیکەی بیکە! تۆ ترسنۆکی تۆ خائینی، زیاتر لە مێشولەیەکی قێزەوەن نیت دروست وەکو برا جارچییەکەت، بەلاّم خودا ئاگر بەسەرتۆ دادەبارێنێ، وەك چۆن نازیلی سەر باوکتی کرد، دەتکا بە زوخاڵ، ئەوە لە منی وەرگرە..



# بەشی سێیەم

کابرای گەنج بە تەنها لەگەڵ خۆیدا مایەوە، پشتی بە خاچداو ئارەقەی هەنیەی خۆی سڕیەوە، هەناسەی لەبەر بڕابوو، سەرهەڵنەدەگەڕا،بۆ یەك سات دونیای دەوری سەری سووڕاو پاشان ئارامی گرت، دایکی ئاگری گەش دەکردەوە، تا زوو نانی سپێدان ئامادە بکاتو وەکو ئەوانی دیکە بۆ بینینی مەراسیمی لە خاچدان، خۆی بگەیەنێتە شوێنەکە، هاوسێکانی پێشترێ چووبوون، مێردەکەی دەینالاّند، هەولیدەدا زمانی بجولێنێ،بەلاّم تەنها قوڕگی گیانی تێدابوو، جگە لە چەند دەنگێکی وشك هیچی دیکەی لێ نەدەهاتە دەرەوە، دیسانەوە سەر لە نوێ شەقامەکان خاڵی بووبوون، بەلاّم لە کاتێکا گەنجەکە بە چاوانی داخراوەوە پشتی بە خاچ دابوو، جگە لە سەدای دڵی هیچی دیکەی نەدەبیست، جگە لە خورپەی دڵی بیری لە هیچ شتێ نە دەکردەوە، لەپڕێکا ئازارێك چنگی لە گیانی گیر کرد، جارێکی دی لە قولاّیی سەریەوە هەستی بە چەنگاڵە نادیارەکانی خەرتەڵ کرد، بە چپەوە گوتی: (دووبارە هاتووە، دووبارە هاتووەو کەوتە لەرزەوە،) هەستی کرد چەنگاڵەکان زێتر دەچنە خوارەوە،کەللەی سەریان شەق دەکردو دەگەیشتنە ناو مێشکی، ددانەکانی کلیل دا، نەوەکا هاوار بکات، نەیدەویست دیسانەوە، دایکی هەراسان بکاتو بکەوێتە دادو بێدادەوە، سەری بە توندی لەناو لەپی دا حەپس کرد،وەك بلّێی دەترسا رابکات. لە کاتێکا دەلەرزی، بەژێر لێویەوە گوتی: (دوبارە هاتۆتەوە، دووبارە هاتۆتەوە)

بۆیەکەمین جار بوو کە لەگەڵ ریش سپیەکاندا لە کلێسا دانیشتبوو بە ئارەقە هەڵڕشتنو ئاخ هەڵکێشانەوە قسەکانی خودایان راڤە دەکرد، ئەو گوێی رادەگرت، هەستی بە نەوازشی نورێکی میهرەبان دەکرد بەسەر سەریەوە، چەند خۆش بوو دانیشتن بەسەر باڵی بەفرو گەیشتن بە ئاسمانی هەفتەم ! لەبەر خۆیەوە گوتبووی کەئێرە دەبێ بەهەشت بێ"! شەکرە خەندەییێکی قوڵو بێ کۆتا لەدەمی نیوەکراوەو ژێر پیلوەکانی بنەوەی هەڵبەزەی کردو گوڵ خەندەیێ بە تاسوقێکی زۆرەوە تەواوی تەبەشی ئەوی نوقمی ماچ کرد، پیرەمێردەکان ئەو بزە راز دارو مرۆ خۆرەیان بینیو گومانیان کردبوو کە دەبێت خودا ئەو کوریژگەیەی بەچەنگاڵی خۆی رفاندووەو بۆ بالأی هەڵکێشاوە.

ساڵاْن رابردن، جەوانکیلە هەرچەند لە چاوەڕوانیدا روونیشتبوو، ئەو نەوازشە میهرەبانە نەهاتبووە سەروسۆراغییەوە، ئەو کاتە رۆژێکیان لە کاتی جەژنی- پسح- دا لە ژێر هەوای شکۆمەندی بەهاریدا چووبووە (کانا) کە زادگای دایکی بوو، تا بە دوای هاوسەری خۆی بگەڕێ، دایکی ناچاری ئەو کارەی کردبوو، دەیویست بووکی کوڕی خۆی ببینێ، بیست ساڵ دەبوو، موی درشتو بەگلوازە گۆناکانی داپۆشتبوو خوێنی وا بە تووڕەیی لە ناو دەمارەکانیدا دەجۆشا، کە ئیدی نەیدەتوانی شەوانە بخەوێ، دایکە بە هەلی زانیو سوودی لەو قەیرانەی گەنجێتی ئەو وەرگرتو بە پیلە کردنەوە داوای لێ کردبوو بچێتە کاناو هاوسەرێ بۆ خۆی هەڵبژێرێ، ئێستا ئەو لەوێ وەستاوەو گوڵێکی سووری لە دەستەو کەوتبووە حەیرانی ئەو کچانەی کە لە ژێر سپینداره تازەو بالاْ بەرزو تازە گەلاْ دەرکردووەکان دا سەمایان دەکرد، لەحاڵێکدا دەیڕوانینێو سوكو سەنگینی دەکردن، هەموانی دەویست بەلاّم شەهامەتی هەڵبژاردنی نەبوو، لەپڕێکا گوێی لە دەنگی قاقایێ بوو لە پشتی سەریەوە: کانییێکی فێنك بوو، لە قولاّیی زەویدا دەجۆشاو سەر هەڵدەگەڕا، گەڕایەوە. مەجدەلیە، تەنها کچی خاخام ی مامی، بەخۆ بە سۆڵە قرمزیەکانو پرچی پەرێشانو کەل وپەلی تەواوو دەستبەندو گوارە بەرەو لای ئەو دادەبەزی، زەینی گەنجەکە کەوتە تەکانێکی سەختەوە، هاواری کرد (ئەمە هەمان ئەو کەسەیە کە دەمەوێت) دەستەکانی بۆ پێشەوە برد تا گوڵەکەی پێشکەش بکات، بەلاّم دوو باڵ بەسەر سەریەوە قولابیان

خواردوو بە تووڕەییێکی شێتانە وێککەوتن‌و تێکچڕژان، کەوتە هەراوزەناو بەسەر دەمدا بەربۆوە سەرزەمین‌و کەفی لە دەم هاتە دەرەوە، دایکی بێچارەی، لە حالێکا لە شەرمان خۆی دەپێچیەوە، چەفیەکەی خۆی کردە سەریەوەو گرتیە ناو بازووەکانی‌و ئەوێ ی جێ هێشت،

هەر لەو زەمانەوە بەدوا هەموو شتێکی لەدەست چوو بوو، بە درێژایی تەواوی مانگێ کە لە مەزرادا پیاسەی دەکرد، یا بە درێژایی خەوتن لەبێدەنگی شەودا، زیاتر لە کاتی بەهاردا ئەو کاتە کە تەواوی دنیا غەرقی عەترو شکۆفە دەبوو، ئەو هێرشە دەهاتە سۆراغیەوە چەنگی لە هەر هەولێك کە بۆخۆشحالی‌و چەشتنی سادەترین لەززەتی مرۆیی بوو وەك خواردن، خەوتن، موعاشەرەتی دۆستان‌و پێکەنین، لەڕێگەی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کچان وەبیرکەوتنەوەی ئەشق، ئەوە دەچەنگاڵ بێ چەندووچوون لە گیانی گیردەبوون‌و هەوەسەکانی ئەویان لەناودەبرد.

بەلاّم هیچکات چەنگاڵەکان وەکو سپێدەی ئەمڕۆکە بەم جۆرە ئازایەتیەوە دانەبەزیبوونە گیانی ئەوەوە،لەژێر مێزی کاردا خۆی کۆ دەکردەوەو سەری لەناو یەخەی خۆی حەشاردا بوو زەمانێکی درێژ لەم حاڵەتەدا مایەوە.

دونیای لە پێش چاو تیرو تار هەڵگەڕا،شتێکی جگە لە هەمهەمەی دەروونی‌و وێککەوتنی تووڕەیی باڵەکان بەسەر سەریەوە هیچی دیکەی نەدەبیست — کەم کەم، یەك یەك- هێدی هێدی چەنگاڵەکان لە گەڕان‌و سووران کەوتن‌و لێکبوونەوەو رەهایان کرد، یەکەم جار مێشکی پاشان ئێسقان‌و دەستو لە دوایشدا پێستی سەری لە پڕێکا ئارامییێکی قووڵ‌و ماندووبوونێکی لە رادەبەدەری هەست پێکرد، بە هاتنە دەرەوە لەژێر مێزەکەوە، دەستی لەسەر سەری خۆی دانا، بە پەلە بۆ پشکنینی کەللەی خۆی ئەنگوستەکانی خۆی بردە ناو قژیەوە..

وادیاری دەدا کە سەری کون کون بووە، بەلاّم ئەنگوستە پشکنەرەکانی یەك برین چیە نەیاندۆزیەوە، ئاسودە خاتر بوو، بەلاّم لەو کاتەی کە دەستی دەرهێناو لە روناکایی دا سەیری کرد،لەرزە کەوتە ئەندامەکانیەوە،خوێن لە نووکی پەنجەکانیەوە دەچکا، بەبنی لێوەیەوە گوتی: (خودا توڕیە، هەڵپژانی خوێن دەستی پێکرد)و چاوەکانی بۆ بالاّ بەرز



کردەوەو سەبری گرت (کەسێ لەسەرەوە نەبوو، بەلاّم بۆنی پێکەری جانەوەرێکی وەحشی بەرلووت کەوت، بە هەراسانیەوە کەوتە ئەندێشەوە: ((ئەو دیسان هاتۆتەوە .... لە دەوروبەرو ژێرەوەی قاچ‌و سەرسەری منەوەیە)) سەری خۆی لار کردەوەو لە چاوەڕوەانیدا مایەوە، هەوا خەفەو بێ جووڵە بوو، رۆشنایی بە وەدەرکەوتنێکی پاك‌و بێ گەزین بەسەر دەرو دیواری رووبەرو بنمیچی بەکا سواخدراو — یاری دەکرد. لەبەر خۆیەوە گوتی: دەمم دەکەمەوە، وشەیەك ناخەمە سەر زمانم، لەوانەیە بەزەیی پێما بێت‌و رەهام کات..بەلاّم بەو ئارەزووەوە لێوەکانی لێك بۆوەو قسەی کرد، دەنگی تژی لە خەم بوو، (بۆ خوێنم هەڵدەمژی؟ بۆ تووڕەی؟ تاکەی دەتەوێ بە دوامەوە بیت؟) دیسانەوە لە قسەکردن وەستا، بە دەمی کراوەو قژی زیك بوو چاوانی پڕ لە ئەشکەوە گوێی خۆی قولاغ کرد، سەرەتا شتێ نەبوو، هەوا بێ جووڵەو ئارام بوو، پاشان لە پڕێکا کەسێ لەو لایەوە قسەی لەگەڵ ئەو دەکرد، گوێیەکانی هەڵخست‌و .. گوێی لێ بوو سەری بە توندی یەك لە دوای یەك رادەتەکاند وەك بڵێی دەیگوت نا...نا.. نا لە پڕێکا ئەویش دەمی کردەوە، ئیدی دەنگی نەدەلەرزی (ناتوانم من نەخوێندەوارم، بیکاری ترسنۆك، خواردنی چاك‌و شەراب‌و خەندەم حەز لێیە، دەمەوێ زەماوەند بکەم‌و منداڵ‌و نەوە بخەمە ئاراوە، بەحالی خۆم رەهام کە!)

دووبارە بێدەنگ مایەوەو گوێی هەڵخست

–ئەوە چی دەڵێی؟ ناتوانم بیبیستم.

لە پڕێکا ناچار بوو دەستی بخاتە سەر گوێچکەکانی تا بەم جۆرە دەنگی کابرا وەحشیەکە بەسەر سەریەوە رونتر بیبیستێ، لە حالێکدا تەواوی رووخساری تێکچڕژا بووە ناویەکەوە هەناسەی لە سینە حەپس کردبوو، بیستی‌و وەلاّمی دایەوە (بەڵێ.. بەڵێ دەترسم .. تۆ دەتەوێ من راپەڕم‌و ئاژیریان پێ بدەم. مەگەر وانیە؟ بەلاّم چی بڵێم.. چۆنی بڵێم؟ ناتوانم .. وتم من بێ سەوادم .. چیت گوت؟ مەلەکوتی ئاسمان؟ لە مەلەکوتی ئاسماندا؟ تەقەی سەرم دێ؟ حەزم لە زەوییە.

دەمەوێ ژن بهێنم، وا پێت دەڵێم مەجدەلیەم دەوێ هەرچەندە بەدکارە، خەتای منە کە بەدکارە، خەتای منە، من نەجاتی دەدەم تەنها ئەو! نەزەمین نەمەلەکوتی ئەو دونیایە، دەمەوێ مەجدەلیە رزگاربکەم ئەوە بۆ من بەسە!..)

دەستی کردە سایەبانی چاوی، روناکبیێکی گونجاو کە لە کلاۆرۆژنەی بانەوە دەدرەوشایە ژوورەوە، چاوانی رادەماو چاوی لە بنمیچ دووری بوو چاوەڕوانی دەکرد، بە حەپس کردنی هەناسەی گوێی خۆی قولاغ دەکرد، هەرچەند زیاتری دەبیست رووخساری بە رەزامەندیو لە هەمان کاتدا بەهەرماسی بروسکی دەهاوێشت، لێوە قەبەو تفتەکانی لە بێ هەستیدا زەقەی بوو.

لە پڕێکا کەوتە قاقاوە، بە ژێر لێوەیەوە گوتی: (بەڵێ.. بەڵێ تەواو تێدەگەی، ئارەزووی ئەو کارەمە، دەمەوێ لەمن بێزار بیتو بچیە سۆراخی کەسێکی دیکەوە، دەمەوێ رزگارم بێ لە تۆ!) لە حاڵێکدا کە زاتی بەبەرز قسەکردنی هاتبووەبەر بەردەوام بوو: بەڵێ..بەڵێ، مەبەستم تەواوی ژیانم تەرخان بکەم بۆ دروستکردنی خاچ تا ئەو کریستە موژدەهێنەی هەڵیاندەبژێریێ لە سیدارە بدرێن. بە ئەدای ئەو وشانەوە قامچیە بزمار نیشانەکانی لە قولاب کردەوەو لە دەوری کەمەری بەستا، سەیری کلاۆرۆژنەی کرد، عاقیبەت خۆرەتاو سەر هەڵگەڕابوو،ئاسمان وەکو پۆلا سەختو شین بوو، دەبوایە پەلە بکات، مەراسیمی لە خاچدان لە کاتی نیوەڕۆ لە ژێر تووڕەیی تەواوی خۆرەتاودا ئەنجام دەدرا.

کەوتە سەر ئەژنۆ، شانی خۆی خستەژێر خاچەکەو دەستەکانی توند پێوەنووساند، یەکێ لە ئەژنۆکانی بەرز کردەوەو بالانسەکەی بەرقەرار کردو بەملاو بەملا داهاتو بەرەو دەرگا هەنگاوی نا، وای هاتە بەرچاو کە خاچەکە بەشێوەیەك کە باوەڕ ناکرێو سەنگینەو ناکرێ بەرز بکرێتەوە، لە حاڵێکدا هەناسە بڕکێ بوو بوو. دووجار شەقاوی هەڵنا،شەقاوی سێهەمو ئیدی گەیشتە دەرگا، بەلاّم لە پڕێکا ئەژنۆکانی شل بوو، سەری سووراو لە ئەنجامدا لە ئاستانەی دەرگادا کەوتە سەر زەویو خاچەکە کەوتە سەریەوە.



سەدای ئەو دەنگە لە ماڵە بچکۆلەکەدا پێچی خواردەوە، دادو هاوارێکی ژنانە لە ژوورەوە بیسترا، دەرگا کرایەوە، دایکی بە دیارکەوت، ژنێکی بالاّبەرز بوو بە خۆو بە چاوانی رەشو درشتیو پێستی گەنم رەنگی، هەوەڵێن قۆناغی گەنجێتی بەجێهێشتبوو پێی نابووە دونیای پڕ شەهدو شەرەنگی خەزانەوە، چەند چینو لۆچێکی شین لە ژێر چاوی رەشماڵیان هەڵدابوو، دەمی وەکو دەمی کوڕەکە موحکەم بوو، بەلاّم چەناگەی بەهێزتروو پڕ لە تاسووق تر بوو، چەفیەییێکی وەنەوشەیی کەتان رەنگی بەسەریەوە بوو، دوو گوارەی نوقرەیی پان کە تەنها زێڕو زیوی ئەو بوو بە گوێچکەکانیەوە بوو.

لەگەڵ دەرگا بوونەوە، باوکی پیر لە پشت دایکیەوە دەبینرا، بەسەر دۆشەگەوە رونیشێنرابوو، تا کەمەری رووت بوو، پێستی بێ هێزی زەردو کەمڕەنگ بوو چاوەکانی بریقەدارو بێ حەرەکەت بوون، ژنە تازە خۆراکی پێدابوو، هێشتاکەش خواردنەکەی کە بریتی بوو لە نانو زەیتونو پیاز بە کولەمەرگی دەجووی، موی سپیو تێکئالۆزاوی سینەی شەلاڵ بە ئاوی دەمو پارچە نانەکان بوو بوو، لە کەنار نوێنی خەوەوە، گۆچانییێکی پیرۆز بوو کەوا موقەددەر بوو تا رۆژی ناونانیشی هەر شکۆفە بکات. ئێستاکەش وشكو پەژموردە بووبوو، ئەو کاتە کە دایك هاتە ژوورەوەو کوڕەکەی خۆی دیت لە ژێر خاچدا کەوتۆتە پەلەقاژەوە، بێ ئەوەی بۆ هەڵسانەوەی ئەو کارێ بکات، بەچنگی رووخساری خۆی رنیەوە، لە دەست بێهۆشی یەك لە دوای یەکی ئەوو پیاسەکانی ئەو، لە نێو مەزراو خەڵوەتگاو و برسیەتی چەشتنی شەوو رۆژیو بەسەعات دانیشتنو چاو لە هەوا بڕین- وەرەس بوو بوو، لە دەست ئەو شەوگەردە خەوناویەوە کە ژیانی خاڵی بوو لە سەرکەوتن کەوتبووە فەلاکەتەوە، بەلاّم ئەو رۆژە کە راسپاردەی خاچێکیان دەکرد هەر ئەو کاتانە بوو کە بە گیانو بەدڵ کاری دەکرد. شەوو رۆژ بەشێوەیەك لە کاردا بوو، کە سەرو پێی خۆی نەدەناسیەوە، ئیدی نەدەچووە کەلێساوە. بۆچوونە (کانا)و یا بەشداری کردن لە جەژنو شادی پێی لەسەر پێ دانەدەنا، بەدرێژایی مانگێکی تەواو ئەفسون دەبوو، دایکی بەدبەختی دادو هاوارو هوڕێنەی ئەوی دەبیست، وەك بڵێی لەگەڵ هەرماس لەڕووبەڕوبوونەوەدابوو. چەندین جار خۆی هاوێشتبووە سەر پێی برای هاوسەرەکەی، کە خاخامی پیر بوو لە جنگری دا وەستابوو. ئەو نەخۆشانەی کە لەوسەری دونیاوە

دەیانهێنا بۆلای ئەو چاکی دەکردنەوە، هەمان رۆژی پێشوو کەوتبووە سەر پێیەکانیەوە بەشکۆ مەندییەوە پێی گوتبوو: ( تۆ بێگانەکان چاك دەکەیتەوە، بەلاّم ناتەوێ شەفای کورم بدەی .. خاخام سەری هەلّتەکاندبوو گوتبوی (مێرێ ئەوە هەرماس نییە کە ئازاری کوڕەکەت دەدات، نا هەرماس نییە، خودایە. لەم حالّەتەدا بلّێ چی بکەم؟

دایکی بەلەنگاز پرسی ( هیچ رێگە چارەیەك نییە؟)

–گوتم کاری خودایە نا هیچ رێگەیەك نیە

–بۆ خودا ئازاری دەدا

جنگری پیر ئاهێکی هەلّکێشا، بەلاّم وەلاّمی نەدایەوە

دایکە دووبارە پرسی بۆ خودا ئازاری دەدا؟ خاخامی پیر لە کۆتاییدا وەلاّمی دایەوە ( چوونکە خۆشی دەوێ)

مێرێ بە هەراسانیەوە سەیری ئەوی کرد، دەمی کردەوە تا دووبارە پرسیار بکات. بەلاّم خاخام بەو قسەیەی کە کردی ( مەپرسە، یاسای خودا وایە) لێوەکانی ئەوی داخست، لە حالّێکدا کە برۆکانی وەبەریەك دەنایەوە فەرمانی رۆیشتنی بەودا.

سالاّنێك بوو کە ئەم نەخۆشیە بەردەوام بوو، مێرێ سەرەڕای بە دایکبوونی، ئەن ئاخیری وەگیان هاتبوو، ئێستاش کە کوڕەکەی دەبینی بە هەنیەی نوقمی خوێنەوە تەکان ناخوات، تەنها ئاهێکی بەر جگەری هەلّکێشا، بەلاّم نەك بۆ کوڕەکەی بەلّکو بە خاتری سەرنویشتی خۆی، ژیان لەگەلّ ئەودا ناسازگار بوو، لە لایەن مێردو کوڕەکەی بەختی نەبوو بەر لەوەی ببێ بە بووك ببووە بێوە، بێ ئەوەی ببێتە خاوەن منالّێ ببوو بە دایك، لەگەلّ ئەوەش رۆژ بە رۆژ بە زیادبوونی موی سپی پیرتر دەبوو، هیچ کاتێ تامی جحێلّی هەست پێ نەکردبوو، عاقیبەت کاتێ چاوەکانی وشکی کردبوو، تەواوی ئەو ئەشکەی کە خودا بە نەسیبی ئەوی کردبوو، هەلّڕژشتبوو بە چاوانی وشکەوە سەیری کوڕو مێردەکەی‌و سەیری مەزرای سەوزی عەتراوی درەختە



پڕ شکۆفەکانی دەکرد، لە چاوەکانیدا دەچوونە خوارەوە، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا نەبۆ مێردەکەی نەبۆ کوڕەکەی بەلّکو بۆ ژیانی لە دەست چووی خۆی دەگریا.

جوانمەردەکە هەلّسایەوە سەرپێ خوێنەکەی بە گۆشەی چاکەتەکەی پاکدەکردەوە، گەڕایەوە، دایکە بینی بە زەوقەوە سەیری ئەو دەکات‌و تووڕە بووە، ئەو نیگایەی دەناسیەوە کە مایەی لێبووردن نەبوو لەو، ئەو لێوە بەسەریەکدا قرمساوەی کە ناگەواری چەشتوە،حەوسەلّەی پەڕیە سەر، ئەویش لەو مالّەدا بێزار بووبوو، لەگەلّ ئەو ئیفلیجە پەککەوتووە، ئەو دایکەی هەرگیز هێور نەدەبۆوەو تۆپ‌و تەشەرەی رۆژانەی، بخۆ، کاربکە، ژن بهێنە، بخۆ، کاربکە، ژن بهێنە، دایکی لێوە بەسەریەك داڕساوەکانی خۆی کردەوە، بەشێوەییێکی سەرکۆنە ئامێز گوتی: ( کریست ئەمرۆ بەم بەیانیە زووە شەڕت لەگەلّ کێ کردووە؟

کوڕە لێوەکانی خۆی گەستەوە تا نەوەکا قسەیێکی توندی لە دەم بێتە دەرەوە دەرگای کردەوە، خۆرەتاو هاتە ژوورەوە بایەکی سوتێنەرو پڕ گەرد هەروا تۆزی دەشتیش، بێ ئەوەی قسەیێ بکات خوێن‌و ئارەقەی هەنیەی پاك کردەوە جارێکی دیکەش خاچەکەی هەلّگرت‌و نایە سەرشانیەوە.

دایکە دەستی کێشا بە ناو پرچی پەرشەوە بووی خۆیەوەو نایە ژێر سەریەوە، هەنگاوێکی بۆ لای کورەکەی هەلّگرت: هەر کە لە رۆشنایی دا ئەوی بە روونی بینی لەسەر سامییان کەوتە لە رزینە، رووخساری بەبێ پچڕان دەگۆڕا؟ وەکو ئاو چەند ساف‌و روون بوو هەر رۆژەی کە ئەوی دەبینی بۆ یەکەمین جار نورێکی غەیبی بەسەر نێو چەوان‌و دەم‌و چاوەکانیڕا دەدۆزیەوە، بزەییێك جار جارە شادوو جارەجارەش پڕ لە ئازار، لێوەکانی ئەو باق‌و بریقەی کە بەسەر هەنیەو چەناگەو گەردنیەوە نێلّەی دەداو هەلّدەچوو ئەوی دەخوارد، ئەمڕۆ چەند مەشخەلّێکی رەشی گەورە لە چاوەکانیدا بروسکەی دەدا، بە هەراسانیەوە، بۆ ساتێ خواستی لێی بپرسێ ( تۆ کێی؟) بەلاّم خودداری کرد، بەلێوەلەرزەوە گوتی: ( کوڕەکەم! )! بەبێ دەنگی مایەوە، چاوەڕوان بوو تا ببینێ کە ئایا ئەو مرۆڤە بالیغە بەڕاستی کوڕیەتی؟ ئایا تیچاوێ لەو دەکات؟ قسە دەکات؟ نەگەڕایەوە، بە هەناسەهەلّکێشانێکی قوولّ خاچەکەی لەسەر پشتی خۆی جێ کردەوەو بە هەنگاوی چەسپاو لەمالّ چووە دەرەوە. دایکەکە پشتی

به چووارچیوەی دەرگا دابوو،بە ئارامی سەیری ئەوی دەکرد، بە هەما شێوە کەبەسەر گردەکە هەڵدەگەڕا پێی لە بەردێکەوە بەسەر بەردێکی دیکەوە دەنا، تەنها خودا دەیزانی کە ئەو قودرەتەی لەکوێ هێنابوو، پشتی ئەو خاچ نەبوو، بەڵکو دووباڵ بوو هەڵیاندەفڕاند دایکە بە پەرێشانیەوە بەژێر لێوەکانیەوە گوتی: (ئەی پەروەردگار ئەو کێیە؟ ئەو کێیە.. ئەو کوڕە کێیە؟ بە باوکی ناچێ، بەهیچ کەسێ ناچێ، هەموو رۆژێ دەگۆڕێ، یەك نەفەر نییە، چەند نەفەرێکە، ئاخ رشتەی فیکرم لە بەریەك داپچڕاوە.

دوای نیوەڕۆی هێنایەوە یاد، کە لە حەوشەی بچووکی ماڵدا لە نزیك بیری ئاو شیری پێدەدا، هاوین بوو، بەسەر بالآی سەریەوە ترێ داری مێویان لار کردبۆوە، لە حاڵێکا ساواکە مەمکی هەڵدەمژی چووە خەوێکی سەنگینەوە، ئەوەندەی نەبرد کە خەونێکی بێ دیماهی بینی، وای هاتە بەرچاو لە ئاسماندا بە خۆیو ئەستێریەك بە دەستیەوە، ئەستێرەیێ هەروەك چرا هاتو زەوی رووناك کردەوە، جادەیێکی بە پێچو پەنای زۆرەوەش هەبوو، کە لە تاریکیدا وەك کلپەی هەورە تریشقەیەك دەدرەوشایەوە، جادە بۆ لای ئەو هەڵخزیو لە کەناری قاچەکانی ئەودا کۆتایی هات، لە حاڵێکدا کە بە پەریشانیەوە، دەیڕوانیێ، لەخۆی دەپرسی دەبێ دەستپێکردنی ئەو جادەیە لە کوێ دەست پێ بکا؟ بۆ لە کەناری پێکانی ئەودا کۆتایی هات؟ چاوەکانی لە زەمین کردەوە، وەی لەو عەجەبە، ئەستێرە بەسەر بالآی سەریەوە وەستابوو سێ تەن ئەسپ سوار لە کۆتایی جادەوە نوقرەفامەکەدا بە دیارکەوتن، سێ تاجی زێڕینیان بەسەر سەریەوە دەدرەوشایەوە، ساتێك وەستان سەیری ئاسمانیان کرد، وەستانی ئەستێرەیان بینی، ئەو کاتە ئەسپەکانی خۆیان دا بەر قامچیو بەتاودانەوە هاتن بۆلای ئەوەوە، دایکە ئێستا دەیتوانی بەڕوونو ئاشکرایی رووخساریان ببینێ، نەفەرەکەی ناوەندێ وەکو گڵێکی سپی وابوو، گەنجێکی جوانو خودان پرچێکی جوان بوو، گۆناکانی هێشتاکە بە مووی نەرم داپۆشرابوو، لە لای راستەوە ئەو جەوانمەردەو زەرد رەنگە بەخۆو بەڕیشی زیكو رەشو چاوانی کراوە وەستابوو. رەشپێستێکیش لە لای چەپەوە بوو کە پرچی سپیو بە گڵوازە بە خۆ بە گوارەیەکی زێڕینەوە ددانەکانی بریقەی دەدایەوە،بەلآم بەر لەوەی کە دایکی بتوانێ لێیان ورد بێتەوە یاخود چاوەکانی



کوڕەکەی داپۆشێ تا سەیری رونایی توندی ئەوان نەکات، سێ هەسپ سوار هاتنو، لە ئەسپ هاتنە خوارەوە، لەبەر پێی ئەودا کەوتنە سەر ئەژنۆ. شازادەی سپی یەکەمین نەفەرێ بوو کە هاتە پێش، ساواکە مەمکی دایکی بەرداو بەسەر ئەژنۆکانی دایکیەوە بەتەواوی قامەتەوە وەستابوو، شازادە تاجی خۆی هەڵگرتوو بە خاکەڕاییەوە لەبەر پێی ساواکەی دانا، ئەو کاتە رەشپێستەکە، بەسەر ئەژنۆوە بۆ پێشەوە خزیو لەژێر کراسەکەیەوە مشتێ زومەڕدو یاقوتی هێنایە دەرەوە، بە میهرەبانییێکی زۆرەوە داینایە سەر سەری بچووکی ساواکە، پیاوە تەبەش زەردەکە دەستەکانی خۆی هێنایە پێشو دەستەیێکی پەڕی درێژی تاووسی لە ژێر پێکانی ساواکە دانا تا یاریان پێ بکات، مناڵەکە سەیری هەرسێکیانی کردو بزەیەکی بۆ کردن، بەلآم دەستە بچووکەکانی بەرەو لای دیارییەکان درێژ نەکرد.

لە پڕێکا سێ سوار ون بوونو شوانێکی گەنج بە دیار کەوت کە پێستەی بزنی لەبەر کردبوو جامێ شیری گەرمی گرتبووە ناو دەستی، هەر کە ساواکە شیرەکەی بینیو بەسەر ئەژنۆکانی دایکیەوە کەوتە پێکوتەوە،سەری بردە ناو جامەکەو بە شادومانیو تێرنەبوونەوە کەوتە نوشینیەوە.

دایکی لە حاڵێکا پشتی بە چووارچیوە دابوو، ئەو خەونە بێ سنوورەی هێنایەوە یادو ئاخێکی هەڵکێشا، ئەوە چ ئومێدێك بوو ئەو تاکە کوڕە بەوی بەخشیبوو، ئەوە چ سەرسامییێك بوو کە سیحربازەکان پێشبینیان بۆ ئەو کردبوو، مەگەر خاخامی پیر لەوی نەڕوانی بوو بە کردنەوەی کتێبی پەیامبەرانو موژدەی پەیامبەران، لە گەڕان بەدوای ئەو میهرەی پەیامبەرێتی، لە سینەو چاوو هەتا لە نوکی پێی ساواکە وەبەرهاتبوو.

بەلآم ئەفسوس! بە رابردنی گەشتی زەمانە ئومێدەکانی ئەو هەمووی بە با چوو کوڕەکەی رێگەیێکی ناڕاستی هەڵبژارد، رێگەیێ کە تا دەهات زۆرترو زۆرتر لە رێی مرۆڤەکانی وەدوور خستەوە، دایکەکە چەفیەکەی توند کردو دەرگای جووت بەند کرد، ئەو کاتە ئەویش دەستی کرد بە هەڵگەڕان بۆ سەر گردەکە، بۆ کوشتنی کات دەچووە مەراسیمی لە خاچدان.

## بەشی چووارەم

دایکە بە پەلەپرۆزییەوە ڕێی دەبڕی تا خۆی لەناو ئاپۆڕەی خەڵکەکەدا ون بکات، دەنگی قیلو قالی ژنان لە پێشەوە دەبیسترا، لە دوای ئەوانیشەوە پیاوان کەوتبوونە هەڵچوونەوە بە هانەسەبڕکێو پرچی ئالۆزو جەستەی داکەوتوو ئەو خەنجەرانەی کە لە ژێر کراسەکانیاندا پەنهانیان کردبوو بە پێ پەتی ڕێیان دەکوتایەوە، دوای ریزی پیرەمێردەکانو دواتری هەموویان گۆجەو کوێرو ئیفلیجەکان بوون، زەوی لە ژێر پێی مرۆڤدا دەلەرزی، ستوونی تۆزو گەرد بۆ ئاسمان بەرزبوو بۆوە، هەوا تێکەڵی هەڵم بووبوو، لە باڵای سەرەوەش خۆرەتاو وەکو کورەی ئاگر دەسووتا.

پیرەژنێ سەیری دەوروبەری دەکرد، مێرێی بینیو نەفرەتی بۆ رەوانە کرد، دوو نەفەر لە هاوسێکانی مێرێ، رویان لێ وەرگێڕاو بۆ دەفعی بەلاّ تفیان رووکردە زەوی، تازەبووك بەرودامەنی جلەکانی بەترسو هەرسانییەوە گل دایەوە تا نەبادا دایکی دروستکەری خاچ بەسەریا تێپەڕێ، مێرێ بە هەڵکێشانی ئاخێك چەفیە وەنەوشەییەکەی بەشێوەیێ لێکرد کە جگە لە چاوە بادامیو سەرزەنش ئامێزو دەمی داخراوو تەڵخی هیچ جێگایێ لە تەبەشی دیار نەبێ.

لە حاڵێکدا بەسەر بەردەکانەوە هەڵدەخزی بە تەنها بۆ پێشەوە دەچوو، بۆ خۆ پەنهان کردن لە میانی خەڵکەکە پەلەی کرد، لە هەموو لایێکەوە پسەپس هەڵسا، بەڵاّم ئەو بە دڵێکی قورسەوە بۆ پێشەوە دەچوو، لەبەر خۆ دەیگوت: سەیرکە کوڕم بە چ ئەنجامێ گەیشتووە، بەڵێ کوڕەکەم، ئازیزی دڵم..!) بۆ پێشەوە دەچوو بۆ قورت دانەوەی گریانی شاڵەکەی سەری دەجوی.



گەیشتە ئاپۆڕەی خەڵکان، خەڵکەی لە پشت خۆی جێ هێشتبوو خۆی لە میاتی ژنەکانەوە پەنهان کرد، دەستی لەسەر دەمی دانا بوو، ئێستا تەنها چاوی دیار بوو، لەبەر خۆیەوە گوتی:

((هیچ یەك لە هاوسێکانم شوێنێ بۆ من ناهێڵنەوە))و ئارامی گرت.

لە پڕێکا هەمهەمەیێ لە پشت سەری ئەوەوە بەرز بۆوە، پیاوانی بەبڕست لە میانی ئاپۆڕەی ژنانەوە ڕێی خۆیان کردەوە، تا بەرەو پێشەوە بچن، ئەو قەلاّیانەی کە جانبازیان تێدا لە زنجیر کێشابوو کرانەوەو پیاوان بۆ شکاندنی دەرگاو ئازادکردنی دیلەکە بێ تاقەت بووبوونو حەوسەڵەیان لێ بڕابوو،مێرێ خۆی بۆ لایەك کشاندەووە، لە ژێر دەروازەی سەرپۆشدا خۆی قایم کردو گریا: ریشی درێژو چەور، پرچی درێژی چەور، دەمی کەف کردو خاخام بەسەر شانی زەبەللاحێکی وەحشی خوو، بازووی خۆی بۆ لای ئاسمان دەجولاندو هاواری دەکرد، مێرێ گوێکانی خۆی تیژکردبوو تا گوێی لە قسەکانی ئەو بێ:

-کوڕانی من، باوەڕتان هەبێ بە خەڵکی سراییل، لەگەڵ یەك بەرەو پێشەوە بڕۆن، هەراسانی نەکەن بە دڵێ مەترسن، ڕۆحەکان دوکەڵن خودا بە پفێ هەموویان بۆ هەوا دەنێرێ، - مەکاب- یەکان وەبیرخۆتان بهێننەوە کە چۆن چۆنی یۆنانیەکان فەرمانڕەواکانی تەواوی جیهانیان روخاند چۆن چۆنی ئابڕویان بردن، بە هەمان شێوە، ئێمەش ڕۆمیەکان دەڕوخێنینو ئابڕویان دەبەین ((یەهوە سەبایوت) تەنها یەکەو خودای ئێمەیە.

خاخامی پیر سەرمەست لە نەشئەی خودایی، بەسەر شانە پانەکانی زەبەللاحی وەحشی خوو، هەڵدەبەزیەوە هەواو سەمای دەکرد، پیر بوو بوو، ڕۆژو و پەرستنو ئومێدی گەورە وەکو خەرتەلێ کەوتبوو گیانەوەو قودرەتی راکردنی نەبوو، کێوبڕی زەبەللاح بە بەسەرشانی ئەوەوە بەبەردەم خەڵك رایدەکردو وەك ئالاّیێ بۆ پێشو پاشەوە حەرەکەی دەکرد.

خەڵك هاواریان دەکرد: ((ئاهای باراباس دایمەبەزێنە) بەلاّم باراباس بەبیٚ کەمترین نیگەرانی، لە حالێکدا کە پیرەمێردی بۆ ئەملاو ئەملا تاودەدا بۆ پێشەوە دەچوو.خەڵك خەریك بوو هاواری خوایان دەکرد، هەوای بالاّی سەریان گڕی گرتبوو، مەشخەڵەکان نێلەیان سەردەداو ئاسمانیان دەچەسپاندە زەوی، زەینیان تێکهەڵدەچڕژا، ئەو جیهانەی بەردو تاوێر، دەبوو بە گیاو شتی ناسكو روون دەبۆوە، جیهانێکی دیکە کە لە مەشخەڵو فریشتەکان بوو بە وجود دەهات.

یەهودا ئاگری گرت، بۆ پێشەوەبردنی بازووەکانی خاخامی لەسەر شانەکانی باراباسی فڕاندو خستیە سەر شانەکانی خۆیو هاواری کرد ( هەمان ئەمڕۆکە...نەك بەیانی، ئەمڕۆکە!) خاخامیش بە نۆبەی خۆی، ئاگری گرتبوو سرودی سەرکەوتنی بە هاوارێکی بەرز سەردا، هاواری پیاویٚ پیٚ لەسەر لێوی گۆڕ، درێژەی نەکێشا کە تەواوی خەڵکەکە هەمان ئاوازیان دەگوتەوە:

((تەواوی نەتەوەکان بە دەورمدا ئەلقەیان بەستاوە، بەناوی خودای من، ئەوان پەراگەندە دەکەین!

تەواوی نەتەوەکان وەك نقێمی ئەنگوستیلە منیان گرتۆتە خۆ بەناوی خودای من..

ئەوان پەرش وبلاّو دەکەین)).

ئەوان وەك هەنگ بە دەوری مندا ئەلقەیان بەستووە بە ناوی خودای من ئەوان پەراگەندە دەکەین، بەلاّم لە هەمان کاتدا کە سرودیان دەچڕیو لە زەینی خۆیان نەتەوەکانیان پەراگەندە دەکرد، لە پڕێکا قەلاّی دوژمن لە دلّی (ناصیر)دا لەبەر چاوی ئەوان بەدیارکەوت، توونـدوتۆل، چووار گۆشەی چووار بورجو چووار هەلّۆی برونزی مەزن، لە پارچە پارچەی ئەو قەلاّیە هەرماس دزەی کردبوو، لە سەرەوە لە بەرزایی بورجەکان، پەرچەمی هەلّۆی نیشانەی زەردو رەشی رۆحی بوون، لەبنەوەی ئەوان

-روفوس- ی یوزباشی خوێن خۆری (ناصیره) لەگەڵ لەشکری خۆی دابوو، خوارتر، سەگو ئەسپو وشترو بەندییەکان بوون، دیسان خوارتر، جانباز بوو، کە فرێیان دابووە ناو چالێکی قووڵو وشکەوە، بە خۆیو پرچی ئارایش نەکراوو لێوانی شەراب



نەچەشتوو بەدەنی ژن نەدیتەی، ئەو جانبازە دەیتوانی تەنها بەیەك تەکانی سەر پیاوانو کۆیلەکانو ئەسپو بورجەکان کە بەسەر سەریەوە قەراریان گرتبوو هەمووان هەلّفڕێنی، حیکمەتی خودایی ئەوە وایە، لە قولاّیی بناغەی کوختەکانی زولّم هاوارێکی بچووکی عەدالەت شاردراوەتەوە.

ئەو جانبازە دوا پاشماوەی ئەلّقەی مەکابیەکان بوو، خودای سراییل ئەوی پاراستووەو تۆوی پیرۆزی لەنابودی بوون پاراستووە، شەوێکیان (هرودیس) پاشای پیری یەهودیە، ئەو خائینە پیسو نەفرەتیە، چل نەوجەوان کە هەلّۆی زێڕینیان لەسەر دەرگای پەرستگا هێنابووە خوارەوە وەك مەشخەڵ ئاگری تێبەردابوون، لە چلو یەك کودێتا چی، هەر چل نەفەریان گیرانو یەك نەفەریان رایکردبوو، خودای سراییل پرچی سەری ئەوی گرتبوو نەجاتی دابوو، ئەوەی کە نەجات بووە هەمان جانباز بوو نەبرەی مەکابیەکان بوو، ئەو کاتە نەوجەوانێکی خۆش سیمابوو کە تازە موی لەبەر چەنەگە هاتبوو.

چووار ساڵ دوای ئەو واقیعە لە کێوەکان سەرگەردان بوو بۆ ئازادی سەرزەمینی موقەددەس کە خودا کردبوویە دیاری بۆ سراییل، دەجەنگی، هەمیشە دەیگوت (ئێمە تەنها یەك سەروەرمان هەیە، ئەدونیا، پارەو پول مەدە بە میرەکانی زەمین، ئازاری خۆت مەدە چوونکە بتی هەلّۆئاسای ئەوان پەرستگای خودایان پیس کردوە، گاو گۆلك بەناونیشانی قوربانی بۆ ئیمبراتۆری ستەمگەر سەرنەبڕی، تەنها یەك خودا هەیە، خودای ئێمە، تەنها یەك قەوم هەیە، ئەویش قەومی سراییلە، تەنها یەك مێوە بەسەر تەواوی درەختانی جیهانەوەیە ئەویش کریستیانو)یە.

بەلاّم لە پڕێکا خودای سراییل دەستی لەسەری ئەو بەرداو لە لایەن (روفوس)ەوە رەوانەی زیندانیان کرد، جوتیاران، کارگەرانو مولکدارەکان لە تەواوی دێهاتە نزیکەکانو ماسیگرەکان لە دەریاچەی (گنسارت) کۆبوونەوە. ئێستا چەند رۆژیٚ بوو کە پەیامێکی نادیارو خێڵو دوولا ماڵ بە ماڵو قایغ بە قایغ، وەك چۆن قاسیدۆکەیەك، کەوتبووە فڕینەوەو رێبوارانی ئاگادار دەکردەوە (جانباز لە خاچ دەدەن. ئەویش نابودکراو — تەواو بوو!)

بەلاّم زەمانێکی تر پەیام ئەوە بوو:

((برادەران درود، رزگار کەر هاتووە! گەلاّی گەورەی خورما هەلّگرن هەموو بەیەکەوە بە خێراتنی ئەو بکەن بۆ ناصرە!))

خاخامی پیر بەرەو لای قەلاّکان بەسەرشانی ریش سوورەوە بەسەر ئەژنۆکانیەوە وەستاو جارێکی دیکەش هاواری کرد.

-ئەو هاتووە... ئەو هاتووە، لەو چالّە وشکەدا کریستیانویە کە بە قامەتی راستەو چاو لەڕێ راوەستاوە، چاو لەرێی کێ؟ چاو لە رێی ئێمە، کوڕانی سراییل! بۆ پێشەوە، دەرگا بشکێنن، ئەو رزگارکەرە رزگار بکەن، تا بتوانێ نەجاتمان بدات، باراباس بە دەنگێکی وەحشی هاواری کرد (بەناوی خودای سراییلو بە داسێ کە لە دەستی دابوو، بۆ بەرزایی سەری بەرز کردەوە، خەلّك خرۆشان، خەنجەرەکان لەژێر کراسەکانیاندا راتەکان، منالاّن بەردیان نایە ناو قۆچەقانەکانیانەوە، بە لە پێشەوە بوونی باراباس دەرگای ئاسنینیان کردەوە، بەلاّم هەموو چاوەکان بە نوری خودای مەزن نابینا بووبوونو کەسێك دەرگای بچووكو کۆتایی لە قەلاّکە نەبینی کە گۆشەکەی کرایەوەو مەجدەلیە بە رووخسارێ کە لە رەنگی رووخساری مردوو دەچوو، لە حالّێکدا چاوانی ئەشکئامێزی خۆی دەسڕیەوە، بەدیارکەوتو ئاشکرابوو، رەحمی بە خەلّکە مەحکومە کرد، شەوەنگاوان چوو بووە سووراغیەوە تادوا لەززەت، شیرنترین لەززەتێ کە دونیا دەتوانێ بەنسیبی مرۆڤی بکات هەرزانی ئەوی بکات، بەلاّم ئەو لە جانبازانی سەرسەخت بوو کە سوێندی خواردبوو تا نەجاتی سراییل، پرچو خواردنەوەی شەرابو گەڕانو سووران بە دوای خۆشی لە خۆی حەرام بکات، مەجدەلیە تەواوی رۆژێ رووبەڕووی دانیشت و سەیری ئەوی کرد، بەلاّم چاوی ئەو لە ئورشەلیم بوو، کە لە وان دەوراندا لە پشت کەزی رەشی ژن دانیشتبوو، ئورشەلیم ی ژێر دەسەلاّتو بەدکاری مالّ گەیشتە ئەوان، رۆژان نالّێم کە ئورشەلیمی پیرۆزی ئایندە خۆیو حەوت دەروازەی پیرۆزمەندی قەلاّکەی، بە حەوت فریشتەی پاسدارو هەفتاو هەفت میللەتی دونیا لە پێشگایدا کەوتبوونە سەرخاکەوە، لە هەمان کاتدا کە مەحکوم مەمکی تەڕو فنێکی ئورشەلیمی ئایندەی لەمس دەکرد، مەرگ



نەدەماو جیهانی دەوروبەری ئەو تامی شیرین دەکرد، مەمکی ئورشەلیمی گرتە ناو لەپی، تەنها ئەندێشەی شتێکی دەکرد، خودای سراییل، خودایێ کە نە قژی ئارایشتێکی بەخۆوە بینی بوو، نەلێوەکانی بەشەراب بوو، نەجەستەی بەجەستەی ژنێ کەوتبوو، جانباز شەو هەموو شەو، ئورشەلیمی بەسەر ئەژنۆکانیەوە دادەناو مەلەکوتی ئاسمانی لە قاچی خۆی پەنا دەکرد، نە لەگەلّ فریشتەو هەورەکان، بەلّکو بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەویست: گەرم لە زستانو فێنك لە هاوینو دروستکراو لە خاكو مرۆڤ.

خاخامی پیر، کچی خۆی بینی کە لە قەلاّکان دێتە دەرەوە، رووی لێ وەرگێڕا، کچەکەی وەکو داغێك وابوو بەهەنیەیەوە، ئا بەڕاستی لە تۆوی پاكو لە خودا ترساوی ئەودا ئەم زاتە چۆن هاتۆتە کایەوە؟ کامە هەرماس، کام دەستی ناپاك، ئەوی بردۆتە سەر رێی چەوتیەوە؟، رۆژێ بەر لە گەڕانەوە لە جەژنی کانا گەڕابۆوەو ئارەزوی مەرگی کردبوو، پاشان وەکو دیوانە کەوتبووە شەقامەکانەوە ئەو کاتە مالّی باوکی بەجێهێشتبوو، لە مەجدەلدا کە کەوتبووە سەر رێی کاروانەکان، گیرسابۆوە، بەدکار مالّێکی دروست کردبوو، بەسینەی کراوە، بێ باکانە بەرەو ئاپۆڕەکە دەهاتە پێش، سووراری بەسەر لێوو گۆناکانی سڕی بۆوە، چاوەکانی ئەو کە بە درێژایی شەو دوورابووە چاوانی جانبازەوەو فرمێسکیان لێ سەرەو ژوور بۆوە، ئێستاکە تارو بێحالّ بووبوون، کاتێ بینی باوکی خاتر ئازاردراوی روو لەو وەردەگیرێ، بزەیێکی تالّ بەسەر لێوەکانیدا نەخشی هەلّبەست، لە پێشدا، ئابڕوو، ترس لە خودا، خۆشەویستی باوكو بایەخدان بە نەرێتی کۆمەلّگە هەمووی واز لێ هێنابوو وا بلاّوبووەوە، کە حەوت هەرماس چوونەتە ناو جەستەی ئەوەوە، بەلاّم وانەبوو بەلّکو حەوت خەنجەر لەناو دلّیدا شاردرابۆوە.

خاخامی پیر دووبارە کەوتە هاوار کردنەوە، دەیویست خەلّك راستەوخۆ سەیری ئەو بکەن تا نەبادا خەلّك چاوی بەکچەکەی بکەوێت، خودا ئەوی بینی بوو هەر ئەوەش بەس بوو خۆی داوەری کرد، لە حالّێکدا بەسەرشانەکانی ریش سوورەکەوە هەلّدەسووڕا، هاواری کرد (چاوی دلّ بکەنەوەو سەیری ئاسمانان بکەن، خودا بەسەر

سەری ئێمەوە وەستاوە، فەلەك بوونەتەوە، سوپاو فریشتەكان هاتوونەتەوە پێشەوە، هەوا بە باڵی سوورو شین داپۆشراوە)

ئاسمان هەڵگیرسا، خەڵكی چاوانی خۆیان هەڵبڕی، سەیری هەورازی سەری خۆیان كردو خودایان بینی، غەرقی چەك بووەو لە حاڵی دابەزیندایە، باراباس داسی خۆی بەرز كردۆتەوە دەنەڕڕێنیَ ( هەمان ئەمڕۆكە نەك سبەی، ئەمڕۆكە) ئاپۆڕەی خەڵك كەوتنە گیانی قەڵاوە، ئەوان بە گیان لە دەرگای ئاسنینیاندا، دەیلەمیان بەكارهێنا، پەیژەیان بە دیوار هەڵنا، ئاگرپژێنیان هێنا تا ئاگر لەو شوێنە بەردا، بەڵام لە پڕێكا دەرگای ئاسنین بۆوە، دوو سوار ئەسپ بە دیاركەوتن، ئەوان تا ژێر لوتیان چەكدار بوون، تەبەشیان لەبەر هەتاو سووتا بوو، باشیان خواردبوو لە خۆیان دڵنیا بوون، خۆیانو قەڵافەتی عەبوسیان، ئەسپەكانی خۆیان دەدا بەر قامچی، ڕۆحەكانی خۆیان بەرزكردەوە، بەیەكجار سەرو سەدای پاشە كشەو راكردن بەرەو تەپۆلكەی لە خاچ دان لە شەقامەكاندا دەنگی دایەوە. ئەو تەپۆلكە نەفرەت گەشتە، جگە لە تاوێرەبەردی ئاسنو دڕكو داڵ هیچی دیكەی نەبوو، هەر بەردێكی كە هەڵتدەگرت، دڵۆپە خوێنی وشكەوەبووی لە ژێرەوە بەدیار كەوت، هەر كاتیَ كە یەهودییەكان دەستیان بەڕووی ڕۆمیەكان بڵند دەكرد تا ئازادی وەدەست بهێنن. ئەو تەپۆلكەیە پڕدەبوو لە خاچ، بەسەر باڵای خاچەوە شۆڕشگێڕان خۆیان دەپێچایەوە ناویەكو دەیاننالاند، شەو كاتیَ چەقەل دەگەیشتن، قاچی ئەوانیان دەخواردو ڕۆژی دووەمیش نۆبەتی قەڵەكان بوو دابەزن، چاوەكانی ئەوانیان دەخوارد خەڵك لە بناری گردەكەوە بەهەناسە بڕكێوە لە شوێنیَ وەستان، ئەسپ سواران زیاتر ئەوانیان شڵەژاند، بۆ سەر هەڵكشانو داكشانی ئەسپەكان ئاپۆڕەی یەهودیەكانیان لەیەك شوێندا كۆكردەوە، بەدەوری ئەواندا هێڵی وێستەگەكانیان وێنەكرد، ئێستا نزیكی نیوەڕۆ بوو، خاچ هێشتا نەگەیشتبوو، لە بەرزایی گردەوە دوو بیابانگەڕ بە چەكوشو بزمار چاوەڕوان بوون، سەگەكانی دیَ بە مكوڕیو تاسوقەوە گەیشتن، خەڵكی بە رووخساری سووتاوەوە، لەژێر ئاسمانی ئاگرڕێژدا بەسەر گردەكەوە دەكەوتن، ئەوە چ بوو، چاوانی رەشو لووتی هەڵسووڕاوو رووخساری سووتاوو قۆپاوو خەتی ردێنی چەورین بوو، ژنانی قەڵەو بوون خۆیانو بن هەنگڵی ئارەق كردویانو قژی ئارەق ڕێژیان، كە لە ژێر هەتاودا دەتوانەوەو هەڵم لە



جەستەیان بەرز دەبۆوە، لە دەریاچەی (گنسارت)دا دەستەیەك لە ماسیگران، بە چاوانیَ كە لە سەرسامیاندا زەق دەبوونەوە، ئەوانیش وەكو ئەوانی دیكە هاتبوون تا پەرجوەكە ببینن، پەرجو بەم جۆرە رووی دەدا: وەك چۆن كافرانی رۆمی، جانبازیان بەرەو كوشتارگا دەبرد، جلی داڕزاوی دەهاوێشتە كەنارێكو لە ژێرپشتیەوە فریشتەییَ، بە دەستێكەوە شمشێری دەوەشاند.... ماسیگرەكان بەتەبەشو سینەو بازووی خۆرەتاو سووتو باكردوویان شەوی پێش، خۆیانو سەبەتیَ پڕ لە ماسی لە رێوە گەیشتوون، دوای فرۆشتنی ماسی، چوونە مەیخانەو خۆیان مەست كرد، بیریان چوو كە بۆ هاتوونەتە (ناصیرە) كەوتنە گۆرانی گوتنەوە، ئەو كاتە لەگەڵ یەك كەوتنە جەنگو دووبارە لەگەڵ یەك چاك بوونەوەو لە كاتی دەركەوتنی خۆرەتاوی سپێدە، لە پڕێكا هاواری خودای سراییلیان كرد، خۆیان شوشتو نیوە خەوو نیوە بێدار، هاتبوون پەرجو ببینن.

هەموویان لە چاوەڕوانیدا دانیشتبوونو هەرزووش ماندوو بووبوون، تەنها وەشانی رمیَ پێویست بوو تا لە هاتنی خۆیان هەست بە پەشیمانی بكەن، یەكیَ لەوانە كە ریشێكی گڵوازەو خۆڵەمێشی هەبوو گوتی: ((كوڕینە بە رای من بگەڕێینەوە بۆ لای قایغەكان) ئەو سەبارەت بە تەمەنیەوە پەیكەرێكی بەهێزی هەبوو، هەنیەی هەروەكو صەدەف وابوو (ئیدی جانبازیش وەكو هەموو ئەوانی دیكە لە خاچ دەدریَ، گویَ لە من بگرن دەرگای ئاسمان ناكرێتەوە، تووڕەیی خودا بیَ دیماهیە، زوڵمی مرۆڤیش كۆتایی نییە، كوڕی (زوبەدی) تۆچی دەڵێی؟

هاوڕێكەی كە ماسیگرێكی چاوكراوەی ردێن تیژ بوو، بەخەندەوە گوتی: ((بە رای من گەمژەڵی (پەترۆس) كۆتایی بۆ نییە، لێم ببوورە، بەڵام ئەقڵی تۆ لەگەڵ ریشی سپیت ناگونجیَ. وەكو دەنكە ئەسپەند هەڵدەبەزیەوەو لە هەمان سەعاتیش دەسوتێی، مەگەر تۆ نەبووی ئێمەت هەڵگرتو بۆ ئێرەت هێناین؟ وەكو دێوانە لە بەلەمێكەوە بۆ بەلەمیَ بازت دەداو هاوارت دەكرد: (برایان، ئەگەر ئاوتان لە دەستە هەڵبڕێژنە سەر زەوی، مرۆڤ تەنها یەكجار لە تەمەنیدا پەرجو دەبینیَ، یاڵڵا هەڵسن بابچینە ناصیرەو پەرجوەكە ببینین!) تا ئێستاش كە یەك دووجار رم بە پشتت كەوتووەو

مێشکت پەریشان بووە، ڕەزمەکەت گۆڕیوەو هاوار دەکەی ( ئەگەر ئاوتان لە دەستایە داینێنە سەر زەوی‌و بگەڕێنەوە ماڵەوە!) بیهودە نییە کە بە (میزاج دەمدەمی) بانگت دەکەن دووسێ نەفەر لە ماسیگرەکان کەوتنە خەندەوە، شوانەکە کە بۆنی بزنی لێدەهات گۆپاڵەکەی بەرز کردەوەو گوتی:

یاکوب لەگەڵ هەموو میزاجی دەمدەمیشی تۆ نابێ سەری بکوتیەوە، ئەو لە هەموو ئێمە باشترەو دڵێکی زێڕینی هەیە) هەموویان بەرێکەوتن قسەی (فیلیب)یان تەئکید کردو دەستیان درێژ کرد تا (پەترۆس) کە بە توونی تووڕە بووبوو، ئارام بکەنەوە، لەبەر خۆیەوە دەیگوت (لێگەڕێ هەرچی دڵیان دەخوازێ با بە منی بڵێن، میزاجی دەمدەمی سانایە، لە وانەیە میزاج دەمدەمی بم و وەکو بی بە بایێ بلەرزم، بەلاّم ئەوە لەڕووی ترسەوە نییە، بەڵکو لەبەر خاتری خۆشدڵی منە، یاکوب قەلاّفەتی (پەترۆس)ی بینی تێکچوو، لەوەی کە بێ پێوانە قسەی لەگەڵ لە خۆ گەورەتر کردبوو، پەشیمان بۆوە، بۆ ئەوەی بابەتی قسە بگۆڕێ پرسی ((ئەرێ (پەترۆس) ئەندریاسی برات چ کاردەکات؟ ئێستاش هەر لە بیابانی ئوردنە))؟

(پەترۆس) بە ئاخ هەڵکێشانەوە وەلاّمی دایەوە ((بەڵێ هێشتا لەوێیە دەڵێن کاری پاکشوریشی دۆزیوەتەوەو دروست وەکو مەولاکەی کلۆو هەنگوینی کێوی دەخوات. خوابکات قسەم راست دەربچێت، وەلێ مەرج دەکەم کە هەرزوو ئەو، وەکو ئەوانی دیکە دێهاتەکان دەگەڕێ‌و هاوار دەکات (تۆبە بکەن، مەلەکوتی ئاسمان دێتە دێ، مەگەر ئێمە شەرم‌و حەیامان نییە؟)

یاکوب سەری راتەکاندو برۆکانی تێکهەڵکێشاو گوتی: (هەمان ئەو مەسەلەیە بەسەر (یۆحەننا)ی برام هات‌و چوو تا لە دێرێ لەبیابانی گنسارت تەرکی دونیا بکات، وا هاتە بەرچاو کە بۆ ماسیگری دروست نەکرابوو، لەم رووەوە منی لەگەڵ دوو ریش سپی‌و پێنج کەشتی بەتەنها جێهێشت‌و تا سەرم لەدیوار بکوتم.

فیلیب ی شوان پرسی (ئەو پیاوە پیرۆزە مەگەر لە چی کەم بوو؟) لە تەواوی نیعمەتەکانی خودادا بەهرەمەند بوو، لە بەهاری جەوانی خۆی چی بەسەر هات؟ بەلاّم لە بنی دڵەوە خۆشحاڵ بوو کە کرم دەکەوێتە گیانی دەوڵەمەندەکانیش‌و دەیانخوات،



یاکوب وەلاّمی دایەوە (هەر بەم شێوەیە یەکدەفعە بێ قەوارە بوو، بە درێژایی شەو لە جلی خەودا وەکو نەوجەوانێ نیازمەند بەژن خۆی هەڵو گێڕ دەکردو نەدەحەوایەوە)

- دەیەویست ژن بهێنێ، قاتی بوو، نەبوو!

- دیگوت نایەوێ لەگەڵ ژنێ زەماوەند بکات.

- ئەدی چی؟

- لەگەڵ مەلەکوتی ئاسمان دروست وەکو ئەندریاس

ئەوانیش کەوتنە پێکەنینەوە، ماسیگرێکی پیر کە دەستی زبری خۆی بەشەیتەنەتەوە لەیەك دەخشاند هاواری دەکرد.

(خودایە کە بە پێوە پیر بن!) (پەترۆس) دەمی کردەوە، بەلاّم بەر لەوەی بتوانێ قسەیێ بکات، هاواری تووڕە هەوای پڕ کرد (سەیرکەن! سەلیبساز... سەلیبساز!) هەموو بەیەکەوە سەری خۆیان بەحیرەتەوە وەرسووراند، لە خواروی جادەکە، کوڕی دارتاش، لە حاڵێکا کە بە پێی لەرزۆکەوە سەر هەڵدەگەڕاو لەژێر باری خاچدا هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو دەبینرا، ئاپۆڕەکە هلواریان دەکرد:

(سەلیبساز.. سەلیبساز هەی خائین!) دوو بیابانگەڕەکە لە بالاّی گردەوە سەیری خوارەوەیان کرد بە دیتنی خاچ لە خۆشحاڵیان هەڵبەزینەوە.

خۆرەتاو وەکو وەکو مریشکی سوورەوەکراوی لێکردبوون، تف دەستیان کردو کوڵێنگەکانیان هەڵگرت‌و خەریکی هەڵکەندنی چاڵ بوون، بزماری قەبەو سەرپانیان بەسەر بەردێك لە نزیك خۆیانە دانا، لە جێی سێ بزماری سەفارش کراو پێنج بزماری فلز کراو بوو. ژن‌و پیاو دەستیان لەگەڵ یەك ئەڵقەکردو زنجیرەیەکیان دروست کرد، تا پێش لە سەلیبساز بگرن، مەجدەلیە خۆی لەناو ئاپۆڕەکە هاوێشتە دەرەوە، چاوی بڕیە کوڕی مێرێ کە سەر هەڵدەگەڕاو، کەوتەوە یادی دەورانی منالّیان، کاتێ کە خۆی چووار ساڵە بوو ئەو سێ ساڵان‌و دڵی پڕ بوو لە خەم چ کەیفێکی قووڵ‌و ئاشکرانەبوی ئەزموون کردبوو، چ شیرینییێك کە وەسف ناکرێ، بۆ یەکەمین جار ئەو

واقیعە رەشەی هەست پێ کردبوو کە یەکیان پیاوەو ئەویتر ژن، دوو تەن کە زەمانێك وا بەدیار کەوتبوو یەکن، بەلاّم خودای بێ رەحم ئەوانی لەیەك جیا کردەوە، ئێستەش تکە پارچەکان یەکتریان دۆزیوەتەوە. لە کاری بەیەکگەیشتنو دووبارە یەکبوونەوەیان دان،هەرچیەك لە تەمەنیان زیاد دەبوو، ئەو هەستە زۆرتر لە وجودیان هەڵدەچوو، کە جیاوازی خولّقانیان موجیزیە، لەوەحشەتێکی لاڵدا سەیری یەکتریان دەکرد، وەکو دوو دڕندە لە چاوەڕوانی دا دادەنیشتن تا برسیەتیان زێتر ببێو ئەو سەعاتە بێ کە یەکتر لە ئامێز بگرن ئەوەی کە خودا جیای کردبۆوە پێکەوەی پەیوەند دەنەوە، بەلاّم پاشان رۆژێکی عەسر لە جەژنێکی کانا دا زەمانێ کە عاشق دەستی درێژ کردبوو تا بەدیاری گوڵی سووری مارەییان سەر بە مۆر بکەن، خودای بێ رەحم تاوی دابووە سەریانو جارێکی تر لە یەکتری جیای کردبوونەوە هەر لەو زەمانەوە بەدوا، چاوانی مەجدەلیە بەسەر ئەو لار بوو بۆوەو پرچی بۆن گولاّوی کەوتبووە سەر شانی رووتو خوێناوی ئەوەوە، بە دەنگێکی زبرو کپ لە حالێکدا دەلەرزی هاواری کرد سەلیبساز گەنجەکە چاوانی هەلّگرتو چاوانی درشتو رەنجوری بۆ ساتێکی گوزەرا بڕیە مەجدەلیە، ئاسەواری رەعشەت بەدەوری لێوانیەوە نەخشی بەستا، دەمی شلّەژا، بەلاّم بێ چەندو چوون چاوەکانی داگرتو مەجدەلیە هەڵی بۆ نەڕەخسا کە دەستنیشانی بکات، ئەو شلەژانە ئایا لەبەر ئازار بوو یا ترس یا بزە؟ لەحالێکدا هێشتا بەسەر ئەوەوە لار بووبۆوە، بە هەناسەبڕکێوە گوتی: ( تۆ مەگەر غروورت نییە؟لە بیرت چوو؟ چۆن دەتوانی تا ئەو رادەیە خۆت سستو لاواز بکەی؟) دوای ساتێ وەك بلّێی سەدای ئەو وەلاّمی دایەوە (نا... نا بێچارەی زبون، ئەوە خودا نییە. هەرماسە!

ئاپۆڕەکە لە هەمان کاتدا تاوی دابووە پێشەوە تا رێی ئەو بگرن،پیرەمێردێ گۆپالّەکەی بەرز کردەوەو تێی سرەواند، دوو گاوان کە لە کێوی تابورەوە هاتبوون بۆ دیتنی پەرجو، کە پەیوەندیان بەوانی دیکە کردبوو، سیخورمەی خۆیان لە جەستەی ئەودا بردەخوارەوە، باراباس هەستی دەکرد داسی دەستی بەرزو نەوی دەبێتەوە، بەلاّم لە هەمان ئەو کاتەدا خاخامی پیر مەترسی بینی، لەسەر شانەکانی ریش سوور دابەزیو پەلەی کردە کۆمەك کردنی برازاکەی هاواری لەبەر هەلّسا ( (کوڕانی من، بەس کەن، گرتنی رێگەی خودا گوناهێکی گەورەیە، ئەو کارە مەکەن، هەرچیەك



موقەدەر بووبێ، دەبێ ئەنجامی قبولّ بکەن، رێگرمەبن، رێ ی خاچ بکەنەوە، کە خودا ناردویەتی، لێگەڕێن قەرەجەکان  بزماری خۆیان ئامادەکەن، لێگەڕێ پەیامبەری دونیا بچێتە سەرخاچەوە، ترسی مەخەنە دلّ، باوەڕتان هەبێ، دەنا هیچ پەرجویێ روونادات، گوێ لە خاخامی پیرتان بگرن.. کوڕانی من..من وا حەقیقەت بە ئێوە دەلّێم مرۆڤ ناتوانێ بفڕێ، مەگەر ئەوەی کە بگاتە لێواری پەرستگا! گاوانەکان سیخورمەی خۆیان کێشایەوە، بەردەکان لە ناو مشتی گرێ خواردودا کەوتنە خوارەوە، خەلّك بەرکەنار بوون، تا رێگەی خودا هەموار بکەن، کوڕی مەریم بەخاچ بەسەر شانیەوە بۆ پێشەوە گلۆر دەبۆوە، دەنگی کلۆ لە باخی زەیتوندا دەگەیشتە گوێ، سەگێکی برسی لە بەرزایی گردەکەوە بە خۆشحالّیەو دەوەڕی، دوورتر، لەناو ئاپۆڕەی خەلّکدا، ژنێ بە شالّێکی وەنەوشەیی هاواری دەکردوو بورایەوە

(پەترۆس) ئێستا بەدەمی کراوەو چاوانی دابەزیوی وەستاوەوە چاوی بڕی بووە کوڕی مەریەوە، دەیناسیەوە، مالّی باوکی مێرێ لە کانادا بەرامبەر مالّی ئەوان بوو، دایكو باوکی پیری مێرێ، (یەواکیمو ئانا) یارغاری دایكو باوکی ئەو بوون، ئەوان مرۆڤی پیرۆز بوون، هەمشە فریشتەکان لە هاتوچۆی کوختەی پەڕپوتی ئەواند بوو، شەوێکیان هاوسێکانی خودای خودایان بینی بوو،کە بە جلی بەدەلّ بووی گەدایێ لەحالّەتی تێپەڕین لە ئاستانەی دەرگای ئەوان دابوو، چوونکە کوختەکە وەك بلّێی لەبەر ئاسەواری زەمین لەرزە کەوتبووە لەرزینەوە، پاش نۆ مانگی دوایی پەرجویێ روویدا، ئانا پیرەژنی شەستو چەند سالّە مێرێی هێنایە دونیاوە، پەترۆس ئەو کاتە پێنج سالاّن دەبوو، بەلاّم تەواوی ئەو جەژنو شادیەی کە ئەو رووداوەی بەدواوە بوو بە چاکی بە بیردەهاتەوە:

تەواوی دێکە کەوتبووە جونبو جۆشەوە، پیاوانو ژنان بۆ پیرۆزبایی پەلەیان دەکرد.. هەندێکیان ئاردو شیرو هەندێ خورماو هەنگوین، هەندێکی دی جلی منالّییان بەناونیشانی دیاری بۆ ژنە زاوەکەو مندالّەکە دەهێنا . دایکی (پەترۆس) مامانی کردبوو، ئاوی گەرم کردبوو خوێی تێ کردبوو مەلۆتکەکەی شوشتبوو، ئێستا کوڕی مێرێ، خاچ بەسەرشانەوە، لە حالّێکدا هەموو تفیان لێ دەکردو بەردیان تێدەگرت بە

پێش ئەودا تێدەپەڕی (پەترۆس) لە کاتێکا سەیری دەکرد، هەستی کرد کە دڵی کەوتۆتە خورپەوە، بەراستی کوڕی مێرێ سەرنویشتێکی شوومی هەبوو، خودای سراییل بە بێ رەحمی ئەوی هەڵبژاردبوو سەلیب دروست بکات تا پەیامبەران لە خاچ بدەن، پەترۆس کەوتە ئەندێشەی لەرزینی گیانیەوە (ئەو گەورەو بەهێزە دەیتوانی من بۆکارێکی وا دابنێ، بەلاّم لە باتی ئەو کوڕی مێرێی هەڵبژاردووەو من رزگاریم بوو)

لە پڕێکا دڵی پڕ جۆشی پەترۆس ئارامی گرتو لە ناخی دڵەوە سوپاسی کوڕی مێرێی کرد کە گوناهەکەی گرتو خستیە سەرشانی خۆیەوە، پەترۆس لە گێرۆدەی ئەو گرفتە دا بوو کە خاچدار لەبەر زۆر ماندوو بوونی وەستا: لەژێر لێوەیەوە گوتی: (ماندووبووم) سەیری دەوروبەری کرد تا مەگەر بەردێ یا مرۆڤێ بدۆزێتەوە، پشتی پێ بدات.

بەلاّم شتێکی نەبینی جگە لە چەند مستێکی بەرز بۆوەو چەند چاوێکی پڕ نەفرەت کە دەیانڕوانیە ئەوەوە، ئەو کاتە شتێ وەکو سەدای چەند باڵێ لە ئاسماندا گەیشتە گوێ ی‌و دڵی پڕ کرد لە شادی. رەنگە خودا دوورست لە دوا ساتدا رەحمی بەو کردبێ‌و فریشتەکانی ناردبێتە کۆمەگی ئەوەوە، سەری بەرز کردەوە، بەڵی،بەسەر بەرزایی سەری ئەوەوە چەند باڵێك هەبوو، قەلەکان تووڕە بوو بوون، سەرسەختی وجودی ئەوی داگرتبوو بۆ سەر هەڵگەران بەسەر گردەکەوە قاچەکانی بە مکوڕیەوە بەرز کردەوە، بەلاّم بەردەکان لە ژێر پێی دەرپەڕین، خلیسکی بردو کەم مابوو بەزەمین بکەوێت، بەلاّم پەترۆس لەکاتی خۆی گەیشتە کۆمەگیەوە، سەلیبی گرتو داینایە سەر شانەکانیەوە، گوتی: لێگەڕێ با کۆمەگت بکەم تۆ ماندووی، کوڕی مێرێ گەڕایەوە، چاوی بڕیە ماسیگر، تەواوی ئەو سەفەرە بەرای ئەو زیاتر لە خەونێك نەبوو، شانەکانی لە پڕێکدا سووك بوونەوەو ئێستا لە هەوا هەڵدەفڕن، دوورست بە هەمان شێوە کە مرۆڤ لە خەوندا دەکەوێتە فڕینەوە، لەبەر خۆیەوە گوتی: (ئەوە ناکرێ خاچ بێ حەتمەن دەبێ دوو جووت باڵ بێت) لە حاڵێکا خوێن‌و ئارەقەی لە سەرو ریشی دەسڕیەوە بە هەنگاوی دڵنیا بەدوای پەترۆس کەوتە رێگاوە.. هەوا ئاگرین بوو سێبەری هەڵدەخستە سەر بەردەکانەوە، سەگەکانی مێگەل کە لە لایەن بیابانگەڕەکانەوە، بۆ لستنەوەی خوێن هێنابوویان، کەڵەشی خۆیان لە پای تاوێرە



بەردەکانی کەنار ئەو چالاّنەی کە خاوەنەکانیان هەڵیانکەندبوو وەراندبوو، هانکە هانکیان بوو، ئارەقە لە زمانی هەڵواسراویان هەڵدەڕژایە خوارەوە، کەللەی مرۆڤ لەو کورە دۆزەخەدا دەیفیکاندو مێشکیان هاتبووە جۆش، لەو گەرمایەدا هەموو مەرزبەندیەکان دەگۆڕان، سەلامەتی نەفس‌و گەمژەڵی، سەلیب‌و باڵ، خوداو مرۆڤ هەموویان تێکەڵ بەیەك بوون، چەند ژنێکی بە بەزەیی مێرێیان هێنایەوە هۆش، مێرێ چاوەکانی کردەوەو کوڕی لاوازو پێخواستی خۆی بینی کە عاقیبەت لە حاڵی گەیشتنە بەرزایی گردەکەوە بوو، لە پێشەوەی ئەودا پیاوێکی دیکە خاچەکەی هەڵدەگرت، بەهەڵکێشانی ئاهێك، بە دەوروبەردا سووڕایەوە، وەك بڵێی لە باری داواکردنی کۆمەك بوو، بەدیتنی هاوشارو ماسیگران، بەهرەمەند بوو سەبارەت بەوەی کە ئەوان دەیانپاراست، بەلاّم درەنگ بوو، دەنگی شەیپور لە قەلاّکانەوە بەرز بۆوە، ئەسپ سواری زۆرتر، بەکلاّوی خودەی برۆنزییەوە هاتنە دەرەوە لەسمی هێستران گەردو تۆز بەرزی هەوا بۆوە، خەڵك دووبارە هاتنە بەریەك‌و بەرلەوەی مێرێ هەڵێ وەدەست بهێنێ‌و بچێتە سەر بەردێکەوە بۆ سەیرکردن، ئەسپ سواران بەکلاّوی خوزەی برۆنزی بەسەر نیو تەنەی سووری سەرپشتی ئەسپەکانەوە قەراریان گرت، ئەسپی مەغرورو باش لەوەڕ یەهوودیەکانیان لەقە کوت دەکرد.

جانبازی شۆڕشگێر، بە بازدان‌و لە قۆڵنج بەدواوە بەستراوو بە جلی پارچە پارچەو خوێناوی‌و ریشی درێژو لە شان چەسپیو لەبەر ئاسەواری خوێن‌و ئارەقە، ریشی خۆڵەمێشی چڕو تیغ تیغی، چاوانی بێ حەرەکەت کە هەمیشە دەیڕوانیە پێشەوە، مرۆڤ لە بینینی ئەو دیمەنە هەراسان بوون، ئایا ئەو مرۆڤێ بوو، یا لە ناو جلی کۆن‌و دژونی فریشتەیێ یا هەرماسێ شاردرابۆوە لە لێوانی بەستراویدا رازێکی سەرسام‌و سەربەرخۆ پاسەوانی کرد؟ خاخامی پیرو خەڵك لەگەڵ یەك بڕیاریان دابوو کە بەمەبەستی دڵدان بە جانباز هەر بە تەنها لەکاتی بە دیارکەوتنی دەنگ لە دەنگ بدەن‌و سروودی جەنگ بچڕن:

((لێگەڕێ دوژمنانم پەڕاگەندەبن)) بەلاّم ئێستا وشەکان لەناو گەروویاندا ئەلقەی بەستابوو، هەموو هەستیان دەکرد کە ئەو مرۆڤە نیازی بەوە نییە زاتی وەبەرنێین،

ئەو چۆتە ئەو پەڕی شەهامەتەوە: نە تیروتەشەنە قبوڵ دەکات ونەتەسلیم بوون، ئازادی دەوری دەستە لە پشت بەستراوەکانی دابوو، هەموو بەوەحشەتەوە سەیری ئەویان دەکرد بە بێ دەنگی لە شوێنی خۆیاندا مابوونەوە، یۆزباشی بەخۆو بەپێستێ کە هەتاوی خۆرهەلاّت. کردبووی بە بریانی، لە پێش جانبازەوە لە حەرەکەت دا بوو، بەکندرێ کە بەپشتی زینی ئەسپەوە بوو، ئەوی لە دوای خۆیدا رادەکێشا، ماوەیەك لەمەوپێش لە یەهودیان بێزار بوو بوو، دە ساڵی تەواو بە بەرپاکردنی سەلیب بەداریان هەڵواسی بوو دەساڵی تەواو دەمیان بەبەردو پیسی پڕکردبۆوە، تا ئارامیان بکاتەوە، بەلاّم ئەنجامێکی بۆ نەهاتبووەبەر، بە لەخاچ دانی یەکێك، بێ چەندو چوون هەزاران کەسی تر رێزیان دەبەستا، لە حاڵەتێکدا کە سروودی یەکێ لە پادشای خۆیان دەچڕی، بە نۆبەی خۆیان بە شورو هەڵچوونەوە، لە چاوەڕوانیدا دادەنیشتن، ئەوان خودای خوێنخۆری خۆیان هەبوو، کە خوێنی یەکەمین تازە لە دایکبووی هەڵدەمژی، یاسای تایبەتی خۆیان هەبوو، دڕندەییێکی ئادەمخۆر بە دە قۆچ چۆن دەیتوانی لە ژێر وشەی ئەوان قورتاری بێ؟ چۆن دەیتوانی لە ژێر رابەرایەتی ئەواندا دەربچێ، ئەوان هیچ واهیمەییێکیان لە مەرگ نەبوو، کەسێ کە باکی بەمەرگ نەبێ، جاویدانی دەبێ، یۆزباشی لێرە لە خۆرهەلاّت زۆربەیان ئەندێشەی ئەو بابەتەیان دەکرد، یوزباشی جڵەوی ئەسپی راکێشاو ئەسپەکەی راگرت، سەیری کردە لای یەهوودیان:

ڕووخساری پەژموودە، چاوانی مەشخەڵدار، ریشی تەڕ، قژی چەور لە رووی بێزاریەوە تفی هەڵدا،چ دەبوو لێرە بڕوات! بریا دەیتوانیت خۆرهەلاّت بە جێ بهێڵێ، جارێکی دیکە بگەڕێتەوە رۆما، لەبەر گەرماوەکانو نمایشی ماڵەکانو دانیشتنگای تیاترۆکانو ژنە جوانەکان، لە رۆژهەلاّت بێزار بوو، لەبەر بۆگەنی یەهودییەکانی. بیابانگەڕان بەردەوام ئارەقەیان هەڵدەڕشتە سەر بەردەکانو قاچیان بەسەر بەرزایی گردەوە چەقاندبوو، کوڕی مێرێ بەسەر تاوێرەبەردێ دانیشتبوو، سەیری ئەوانی دەکردو سەیری خاچو خەڵكو یوزباشی، کە لە پێشەوەی ئاپۆڕەکەدا، لە ئەسپ دابەزی بوو دەکرد، بەلاّم شتێکی جگە لە ئۆقیانووسی کەللەکان لە ژێرئاسمانی ئاگرناکدا نەدەدی، پەترۆس هاتە نزیكو لار بۆوە، تا قسە لەگەڵ ئەو بکات، قسەی خۆی کرد، بەلاّم کلاّوی ئاگرڕێژی ئاسمان هەڵخسترابووە سەر گوێچکەی گەنجەکەو هیچی گوێ لێ



نەدەبوو، بە هێماییێکی سەری یوزباشی، کۆتیان لە دەستی جانباز هەڵگرت، ئەویش بە ئارامی خۆی هەڵکێشایە گۆشەیەکەوە تا بەدەنی بەرزبێتەوە، ئەو کاتە کەوتە لەبەرکردنەوەی جلەکانی، مەجدەلیە، لە نێوان پێی ئەسپەکاندا خزیە پێشەوەو بە دەستی کراوە لەو نزیك کەوتەوە، بەلاّم بەتەکانێ دەستی مەجدەلیەی لە خۆ کردەوە، پیرەژنێکی ئەشراف بێ ئەوەی قسەیێ بخاتە سەر زمان، رێی لە میانی ئاپۆڕەکەدا کردەوەو جانبازی لە باوەش گرت، جانباز سەری خۆی لار کردەوەو ماچێکی درێژی لە دەستی پیرەژن کردو بە توندی کوشیە سینەی خۆی، پاشان رووی وەرگێڕا پیرەژن خامۆشو بەچاوانی بێ فرمێسکی، بۆ چەند ساتێکی دی لە جێی خۆیدا مایەوەو سەیری ئەوی کرد عاقیبەت بە زەمزەمە کردنەوە گوتی: ((دوعای من لە مالاّوایی رێی تۆدا بێ))و رێی گرتەبەرو پشتی بەو تاوێرەبەردەدا کە لەبەر پێی سەگەکانی گەلە بیابانیڕەکاندا دەرکەوتبوونو هانکە هانکیان بوو.

یوزباشی کە پێی لە زەمین دەکوتا، پەڕیە سەر زینی ئەسپ تا هەموو ئەو ببیننو گوێیان لە قسە ی بێ، لە حاڵێکدا قامچیەکەی بەسەر سەری ئاپۆڕەکەوە خستبووە حەرەکەتەوە، تا بێدەنگی فەرمانڕەوا بێت بەمجۆرە دەستی بە قسە کرد:

- ئەی قەومی یەهود گوێ لە قسەم بگرن، رۆما قسە دەکان بێدەنگ بن، ئەو کاتە بە هێما بۆ جانباز کە جلی کۆنو دڕاوی لەبەر کردبۆوەو لەژێر خۆرەتاودا بەچاوەڕوانی دا مابۆوەو راوەستابوو، بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی خۆی، تا ئالاّکە بەرز کاتەوە، بەئێوەی دەگوت رۆژێ موژدەبەخش هاتووە، تا کریستی ئێوە بە خاچی ئێوە هەڵواسراوێو رۆما نابوود بکات،... لەوێ چ خەبەرە، بێدەنگ بن، دادو بێدادی راگرن، تاوانی ئەو بریتیە لە یاخی بوون، کوشتار، خەیانەت، ئێستا ئەی قەومی یەهود گوێ بگرن، بەوەی کە پرسیار لە ئێوە دەکەم گوێ بگرن، لە ئێوەم دەوێ بڕیاردەری حوکم بن، ئەو پیاوە موستەحەقی چییە؟

یوزباشی نیگای خۆی بەسەر ئاپۆڕەکەوە کردەوە ژێر پێ یو لە چاوەڕوانی دا مایەوە، خەڵك لە جۆشو خرۆشدا بوون، هێرشیان کردە لای یوزباشی، بەلاّم هاواریان کرد، پاڵیان بەیەکترەوە دەنا هێلی سنووداریان تێپەڕ کرد بۆلای یوزباشی هێرشیان کرد،

بەلاّم یەکسەر کەوتنە وەحشەتەوە، وەکو شەپۆل بۆ لای پێچەوانە پاشەکشەیان کرد، یوزباشی کەوتە رقو قینەوە، ئەسپی خۆی رێ کرد بەرەو لای ئاپۆڕەکەی رادا، هاواری کرد ((من لە ئێوە دەپرسم چ سزایەك بۆ ئەم یاخیو پیاوکوژەدا دەنێن؟

ریش سوور کە هێزو بڕستی تاق بوو بوو، شێتایەتی خۆی وەکو تیرێ بۆ پێشەوە رەها کرد، هەولیدەدا هاوار بکات ((بژی ئازادی)) لێوەکانی خۆی کردەوە باراباسی هاوڕێی دەستی لەسەر دەمی داناو نەیهێشت، بۆ ساتێکی درێژ جگە لە دەنگێ وەك ورتە ورت کە لە ورشە ورشی دەریا دەچوو، هیچی دیکە نەبوو، هیچ کەس جورئەتی قسەکردنی نەبوو، بەلاّم هەموو لەسەرخۆ دەخرۆشانو ئاخیان هەڵدەکێشاو هەناسەبڕکێیان بوو، لە پڕێکا هاوارێ لە بەرزایی ئەو هەمهەمەیە بەرز بۆوە، هەموو بەترسو شادییێکی جمکەوە گەڕانەوە،خاخامی پیر دووبارە چووبووە سەر شانی ریش سوورەوە لەحاڵێکا هەردوو دەستی وەك ئێسقاندبەندی بۆ دوعا یا نەفرەت بەرز کردبۆوە بە تەمبەڵیو خاویەوە هاواری کرد: ((چ سزاییێ، ؟ تاجی شاهانە!))

خەڵك هەولیاندا قسەی ئەو ببیستن، بەڵێ لەبەر چاوی جەنجاڵەکە نەیانتوانی، یوزباشی نەیبیست، لە حاڵێکدا دەستی خۆی نابووە بەرگوێ ئەسپی خۆی رادەداو گوتی:

خاخام چی دەڵێی؟

خاخام بە تەواوی قودرەتەوە دووبارەی کردەوە (تاجی شاهانە!) رووخساری بریقەی دەداوە، تەواوی بەدەنی گڕی گرتبوو تەکانی دەدا، هەڵدەبەزیەوە، بەسەر بالاّی ئاسنگەر سەمای دەکرد، وەك بڵێی دەیەویست باڵ بگرێو هەڵفڕێ، دووبارە هاواری کرد ((تاجی شاهانە)) شادومان بوو، کە ببووە زمانحاڵی خەڵكو خودای خۆی، بازووەکانی بە هەموو لایەکدا درێژ دەکردو وەك بڵێی لە هەوادا لە خاچ بدرێ، یوزباشی کەوتە کفریەوەو لەئەسپەکەی دابەزیو دەستی دایە قامچییەکەی سەر قولابی زینو بە هەنگاوی گران بەرەو ئاپۆڕەکە چووە پێشەوە، بە پەڕینی بەرد لەژێر هەنگاوەکانیو هاوڕێ لەگەڵ لەسەرخۆ چوونە پێشەوەی، ئەوی وەکو جانەوەرێکی سەنگین پەیکەری وەك گا یا بەرزایێکی وەحشی لێ کردبوو، ئاپۆرەکە بە بێ حەرەکەت لە جێ وە وەستابوونو هەناسەیان لە سینەیان حەپس کردبوو، جارێکی دی دەنگێ جگە لە دەنگی کلۆی ناو درەختەکانی زەیتوونو قەلەکان بێ حەوسەڵە نەبوو.



یوزباشی دوو پێ چووە پێشەوەو پاشان پییێکی دیکە، بۆنی گەنیوی دەمەکراوەکانو جەستە ئارەقاویو پۆخڵەکان، لوتی ئازار دەدا، کەلیمە پۆخڵەکان! بۆ پێشتر رۆیشتو گەیشتە بەردەم خاخامی پیرەمێرد، بەسەر شانی ئاسنگەر بە گوڵ خەندەیێ کە سەراسەری جەستەی گرتبووە خۆوە، سەیری ئەوی دەکرد، لە تەواوی ژیانیدا لە ئارەزووی ساتێکی وا دابوو، ئێستاش ئەو ساتە گەیشتبوو، ساتێ ئەویش دروست وەکو پێغەمبەران دەکوژرێ، یوزباشی سەیری چاوانی نیوە کراوەی ئەوی کرد، بازووێ کە بۆ کوتانی سەری یاخی بووی پیری بەرز کردبووە، بەزەحمەتەوەی گونجاند، تووڕەیی خۆی خواردەوە، لەبەرژوەندی رۆمادا نەبوو پیرەمێرد بکوژن، ئەو خەڵکە گۆڕبەگۆڕو تەسلیم ناقبوڵە دوبارە هەڵسانەوە، دەستیان بە جەنگێکی چەریکی کرد، لەبەر ژەوەندی رۆمادا نەبوو کە جارێکی دیکە دار لە کونە زەنگە سوورە وەربدات لەبەر ئەوە قامچییەکەی لە بازووی خۆیدا وەرپێچاو رووی لە لای خاخام کرد بە دەنگێکی تووڕەوە گوتی: ((خاخام تۆ ئەگەر شایستەی رێزی تەنها لەبەر ئەوەیە کە من رێزت لێ دەگرم، من واتە رۆما، دەمەوێ نرخ بدەمە ئەوەوە، دەنا خۆت ئەوەندە نرخت نیە، لەبەر ئەمەیە کە دەستم بەڕووی تۆدا بەرز ناکەمەوە، بیستم چیت گوت، بڕیاری خۆتدا ئێستا منیش هەمان کار دەکەم، ئەوکاتە لە لای قەرەجەکان  کە لە کەناری خاچ دا لە چاوەڕوانیدا بوون وەستا، گەڕایەوەو هاواری کرد (لە خاچی بدەن!) خاخام بە دەنگێکی ئارامەوە گوتی: ((ئەی یوزباشی من بڕیارمداو تۆش هەمان کارت کرد، بەلاّم کەسێکی تر لە هەمووان بە بایەختر دەبێ حوکم بدات))

- ئیمبراتۆر

- نە خودا

یوزباشی پێکەنی، من زمانی ئیمبراتورم، لە ناصیرە، ئیمبراتۆریش زمانی خودایە لە جیهان، خودا، ئیمبراتۆر، روفوس حوکمی داوە. بەم قسەیە، قامچی لە بازووەکانی کردەوەو لە حاڵێکدا بەردو دڕکی ی شێتانە دەدایە بەر قامچی، رێی خۆی بۆ بەرزایی گردەگە گرتەبەر، پیرەمێرد بازووەکانی بۆ لای ئاسمان بەرز کردەوە ((ئومێدەوارم کە خوداوەند عەزابی خۆی دابەزێنێتە سەر منالّو نەوەکانو تۆ ئەی هەرماس!)) .

لەو کاتەدا، ئەسپ سوارەکان بازنەییێکیان بە دەوری خاچەکە دروست کردبوو، خەڵك کە لە توڕییان دەیاننەڕاند، بەسەر ئەنگوستی پێ وەستابوون و تا ببینن، بە دڵەوڕەوە دەڵەرزین، ئایا پەرجو روودەدات؟ زۆریان نیگای شایەدییان رەوان کردبوو، ئاخۆ کەی دەروازەی ئاسمان دەکرێتەوە؟ ژنان لە پێشەوە ئاگاداری باڵی رەنگاوڕەنگ بوون لە ئاسمان، خاخام لە حاڵێکدا بەسەر شانی پانو پۆڕی ئاسەنگەردا ئەژنۆی دابوو، هەوڵیدەدا تا لە میانی سمی ئەسپان، نیوتەنەی سووری ئەسپ سواران ببینێت، دەیویست وێ کەوێ کە چ شتێ لە سەرەوەدا لە دەوروبەری خاچەکە روو دەدات، سەیری میعراجی ئومێدو میعراجی نا ئومێدی دەکردو قسەییێکی نەکرد، لە چاوەڕوانی دا بوو، خاخامی پیر ئەوی- خودای سرائیل- ی باش دەناسی، بێرەحم بوو یاساو فەرموودەی تایبەتی خۆی هەبوو، وادەی دەداو جێبەجێشی دەکرد، بەلاّم پەلەی نەبوو، زەمانی بە پێوانەی خۆی دەپێوا، چەندین، نەوە بە نەوە، قسەکانی بە بێ هاتنەدییەوە لە ئاسمان دەمایەوە، دانەدەبەزیە سەر زەویەوە، بەلاّم کاتێ کە عاقیبەت نازیل دەبوو، ئەوە بەد بە حاڵی ئەوکەسەی کە ئەمانەتی ئەو قسەیە دەبوو، لەسەر تاسەری نامەی پایەمبەران کە دەگەڕێ ی، دەبینی چەند لە هەڵبژێردراوەکانی خودا کوژراون، بەلاّم ئایا خودا هیچ کاتێك سەری ئەنگوستی بۆ نەجاتدانی ئەوانە بەرز کردۆتەوە؟ بۆ بۆ؟ مەگەر ئەوانە جێبەجێکەری ویستی ئەو نەبوون؟ نەکا ئیرادەی ئەو بووبێ کە تەواوی هەڵبژێردراوەکانی بکوژرێن؟ خاخام ئەو پرسیارەی لە خۆ دەکرد؟ بەلاّم جورئەتی نەبوو لەوە زیاتر بە دوای بیرۆکەکانی خۆی بکەوێ، لەبەرەخۆی کەوتە ئەندێشەوە ((خوداوەند رەشەبایێکی ترسناکە باشتر وایە هەر نزیکی نەکەومەوە))

کوڕی مێرێ هێشتا بەسەر لێوی بەردەوە دانیشتبوو، ئەژنۆی لەرزیوی خۆی بە دوو دەست گرتبوو سەیری دەکرد، قەرەجەکان جانبازیان گرتبوو پاسەوانانی رومیش دەهاتنە پێش بە هێزو بەری جوێنو خەندە، خێڵی چڕی خەڵکیان، بۆ پێشو بۆ پاش رادەدا، ئەوان هەوڵیاندەدا کە جانباز بەرز کەنەوە سەر خاچ، سەگانی مێگەڵ بە بینینی هەوڵو تەقەلاّی پاسەوانان، لە رووداوەکان واگا هاتن، قیت بوونەوە سەر لەپی خۆیان.

دایکی پیرو بەرێزی جانباز، ئەو تاوێرە بەردەی پشتی پێ کردبوو جێ ی هێشتو هاتە پێش هاواری کرد ((کوڕم، ئازابە، مەنالێنە، نەوەکا رووڕەشمان بکەی)) خاخام بە زەمزەمە



کردنەوە ((دایکی جانبازە، دایکی بەڕێزی ئەو، لە پشتی مەکابیەکانە ئێستا کە دوو گووریسی قەبە لە بن هەنگڵی جانباز وەرپێچراوە، قەرەجەکان پەیژەکانیان بەسەر لاباڵی خاچەوە ئەلقە کرد، لەسەرەخۆ دەستیان کرد بە بەرزکردنەوەی، بەدەنێکی قەبەو سەنگینی هەبوو، لە پڕێکا، خاچەکە بەلادا هاتو زۆر نەمابوو بکەوێ، یوزباشی لەقەیەکی لە کوڕی مێرێ دا کە بەسەر قاچە لەرزیوەکاندا وەستابوو، کوڕی مێرێ کولێنگی گرتە دەست تا خاچەکە بە بەردوو تاوێر توند بکات.

ئەو هەمووە لە تاقەتی مێرێ بەدەر بوو، بەشەرمنیەوە لە بینینی کوڕی خۆشەویستی لە کەنار سەلیبی کوژراوەکان دڵی خۆی دەدایەوەو لە میانی ئاپۆڕەکەدا ڕێگەی خۆی کردەوە، ماسیگرەکانی ((گنسارت)) دڵیان پێ سووتا، بەلاّم وا خۆیان بەدەرخست کە ئەو نایبینن، مێرێ بۆ دوورکردنەوەی کوڕەکەی لەو ناوە، لە میانی ئەسپەکاندا دەستی کرد بە پێشڕەوی، بەلاّم یەکێ لە هاوسێ پیرەکانی بەزەیی پێداهاتەوەو بازووەکانی گرت گوتی: ((مێرێ ئەو کارە مەکە.. بۆ کوێ دەچی؟ دەتکوژن))

مێرێ وەلاّمی دایەوە ((دەمەوێ کوڕەکەم لەو ناوە دەربهێنم)) کەوتە گریانەوە.

پیرێژن گوتی: ((مەگری مێرێ سەیری دایکی جانباز بکە، ببینە چۆن چۆنی بە گرانو سەنگینی وستاوەو سەیری لە خاچدەرانی کوڕەکەی خۆی دەکات، سەیری بکەو بەهێز بە))

–هاوسێ من بەتەنها بۆ کوڕەکەی خۆم ناگریم بۆ ئەو دایکەش دەگریم. پیرێژن کە بە دڵنیاییەوە تفتیو تاڵیەکی زۆری لە ژیاندا چەشتووە. سەری نیوە تاسی خۆی راتەکاندو بەزەمزەمەوە گوتی: ((باشتر وایە دایکی لە خاچدەر بیت نەك دایکی لە خاچدرارو.)).

بەلاّم مێرێ بە پەلە بوو نەیبیست، بەرەو گردەکە کەوتە رێ، دیدی فرمێسکاوی خۆی بە هەموو شوێنێکدا لە گەڕانو سووڕاندا بوو، تەواوی جیهان دەستی بەگریان کرد جیهان تارو تیرە بوو، لەناو تەمتومانێکی چڕدا دایکە تێبینی ئەسپەکانو چەکی برۆنزی کرد بینی کە خاچێکی هێجگار گەورەو تازە دروست کراوە کە لە زەمینەوە بۆ ئاسمان هەڵچوو بوو، ئەسپ سوارێ گەڕایەوە ئەوی بینی، بەبەرز کردنەوەی نێزە هێمای بۆ کرد،دایکە لە جێوە وەستاو لار بۆوە، لەژێر ئەشکەوە سەیری ئەسپەکانی دەکردو کوڕەکەی خۆی بینی کە بەسەر

ئەژنۆکانی دانیشتووەو بۆ توندکردنی خاچ دەوروبەری بەردەکانی دەکۆڵیەوە، هاواری کرد ((کوڕەکەم کریست!))

هاواری دایکە واگوێ کاسکەر بوو کە لە بەرزایی قیلو قالّی مرۆکاندا ئەسپو سەگەکانی خستە لورە لورەوە، کوڕە گەڕایەوەو دایکی خۆی بینی، رووخساری رەش داگەڕا، زەربەکانی خۆی تووڕەتر لە جاران کوتایەوە،.

قەرەجەکان لەسەر هەڵگەڕان بەپەیژەی کندڕین، جانبازیان بەسەر کندڕەوە درێژ کردبوو بۆ بەرگرتن لە خزینی بۆ خوارەوە ئەویان بە توندی (بەگوریس) بەستایەوە، ئێستا وا بزمارەکان هەڵدەگرن دەستیان کرد بە میخکۆب کردنی دەستەکانی، دڵۆپەی دڕشتی خوێن پەرشو بلاّوی سەر رووخساری کریست بۆوە، کولێنگی لەدەست بەردا بەوەحشەتەوە پاشەکشەی کرد پاشاوپاش چوو خۆی لەکاناری دایکی پیاوێ بەمزوانە دەمرد دۆزیەوە، لە حالێکدا دەلەرزی، چاوەڕوانی بیستنی هەڵپاچینی گۆشت بوو تەواوی خوێنی بەدەنی هێرشی کردە ناو لەپی ئەوەوە، دەمارەکانی هەڵسا بە توندی دەستیان کرد بە لێدان کەم مابوو پارچە پارچە بێ، خالێ لە ناو لەپی دەستەکانی کەوتە ئازارەوە، ئەوخالّە وەك سەری بزمار خڕبوو.

دەنگی دایکی جارێکی دی دەنگی دایەوە ((کوڕم کریست!)) هاوارێکی قووڵ لە بەرزایی خاچەوە گەیشت، هاوارێکی وەحشی کە لە دلّی یەك نەفەردا هەڵنەدەستا بەلّکو لە قوولاّی زەویدا بوو ((ئەدۆنیا!)) خەلّك ئەو هاوارەیان بیست، هاوار بەتانو پۆی وجودیاندا رەت بوو، ئایا ئەوە خودی خەلّك بوون کە هاواریان کردبوو، یا هی زەمین بوو؟ یا هی پیاوەکەی سەرخاچ بوو، کە لەگەڵ چوونە خوارەوەی یەکەمین بزمار بەناو جەستەیا هاواری کردبوو.

هەموویان یەك بوون، هەموو لە حالّەتی لە خاچداندا بوون، پیاوان، زەمینو جانباز هاواریان دەکرد.خوێن فوارەی کردو پەرش وبلاّوی سەر ئەسپەکان دەبوو، دلّۆپێکی دڕشتی کەوتە سەر لێوی کریستەوە، گەرمو سوێر بوو، سەلیبساز تلو تلوی خوارد، بەلاّم دایکی لە کاتی خۆی رێی کردە پێشەوەو بەلە باوەشکردنی نەیهێشت بەربێتەوە، بە زمزەمە کردنەوە گوتی: ((کوڕم کریست))



بەلاّم چاوەکانی ئەو داخرابوون، هەستی بە ئازارێك دەکرد لە ناو دەستو پێو دلّیەوەیە کە تامل نەدەکرا، ئەو ئافرەتە پیرەی ئەشراف بەبێ جولّە لە جێی خۆی وەستابوو، بەلاّم پاشان لە دوای خۆیەوە، دەنگی سەلیبسازو دایکی بیست تووڕەیی وجوودی ئەوی داگرتو گەڕایەوە، ئەوە هەمان یەهوودی کافر بوو کە سەلیبی دروست دەکردو ئەویش دایکێ کە ئەوی بۆ پاش رادابوو، بۆ دەبێ کوڕێکی واخیانەتکار بێتە دونیاوە! بۆ دەبێ ئەو بمێنێ لەحالێکا کوڕی ئەو بەسەر خاچەوە خۆی هەڵپێچێو هاوار بکات. لەبەر زۆر پەرێشانی، دوو دەستی خۆی بۆ لای کوڕی نەجاڕ درێژ کرد، هاتە نزیکترو رووبەڕووی وەستا، کوڕی نەجار سەری هەڵبڕیو ئەوی بینیو سەری لەبەر خۆی نایەوە، لێوانی ژنە جولاّ بە دڕندەییو زبریەوە گوتی: ((نەفرەت لە تۆ بێ، کوڕی نەجاڕ، ئومێدەوارم کە رۆژێ تۆش لە خاچ بدەن)) ئەوکاتە رووی لە مێرێ کرد ((تۆش مێرێ ئومێدەوارم کە تۆش هەم داغی کوڕەکەت بینی)) بەتەواوکردنی قسەکەی یەکسەر سەری خۆی وەرسووڕاندو چاوەکانی جارێکی دی دووریە کوڕەکەیەوە، ئینجا مەجدەلیە پایەی خاچی لە باوەش گرتوو بۆجانباز کەوتە سرووودو سەردولکە، دەستو پێی ئەوی لە مس کردو پرچی سەرو بازووەکانی بەخوێن داپۆشران. قەرەجەکان چەقۆکانیان گرتو دەستیان کرد بە پارچە پارچەکردنی جلی لە خاچدراوەکە، تا لە میانی خۆیاندا دابەشی بکەن، پاش دابەشکردنی پارەو پوولەکانی ئەو شتێ جگە لە دەستمالّی سپی ئەو کە دلّۆپی گەورە گەورەی خوێنی لێ نیشتبوو، نەمایەوە، گوتیان ((چۆنە، دەسمالّەکە بدەینە کوڕی دارتاشەوە. بێچارە کاری خۆی بەچاکی ئەنجامدا)) ئەویان لەژێر هەتاودا دۆزیەوە کە هەلّکورمابوو دەلەرزی. یەکێ لەوان لە حالێکدا پارچە خوێناویەکەیان رادەوەشان گوتی: ((دارتاش، ئەوە بەشی تۆیە، بۆ سەرکەوتنی تۆ ئارەزوومەندی لە خاچدانی زۆرترم.

قەرەج جارێکی دی بەخەندەوە گوتی: ((ئەوەش بۆ لە خاچدانی خۆت))

شانی ئەویان بە گەرمی راتەکاند.

# بەشی پێنجەم

خاخامی پیر لە حاڵێکدا بازووەکانی بۆ خڕکردنەوەی ئاپۆڕەی سەرسام بووی پیاوانو ژنانی نائومێد کردبۆوەو هاواری کرد "بابڕۆین! ڕۆڵەکانم ،دەبێ رازێ بۆ ئێوە ئاشکرا بکەم، ئازابن" خەڵك لە میانی کوچەو کولانە باریکەکان دەستیان کرد بە راکردن، لە دوایانەوە ئەسپ سواران تاویان دەداوە وەکو مێگەلی بزن بۆ پێشەوەیان رادەدان ژنان دەیانقیژاندو دەرگای ماڵەکانی خۆیان داخست: خوێنێکی زیاتر لە حاڵەتی رشتن دا بوو، خاخامی پیر لە حاڵی راکردندا دووبارە کەوتە سەر زەویەوە، دیسان کەوتە کۆخینەوەو خوێنی تف دەکرد، یەهوداو باراباسیان لە باوەش کرد، خەڵکی فەوج فەوج دەگەیشتنو بە هانکە هانك خۆیان لە ناو کلێسا پەنهان دەکرد، حەوشەی کەلێساش پڕ بوو، دەروازەیان جوت کرد، لە کاتێکا چووارچاو لێوەکانی خاخامیان بەسەر دەکردەوە، لە چاوەڕوانی دا وەستان، لە ناو ئەو هەموو رەنجو تاڵیەدا، ئایا پیرەمێرد دەیتوانی چ رازی بۆ ئەوان بدرکێنێ، تا دڵشادیان بکات؟ چەندین ساڵ بووکە بەد بەختی لە دوای بەدبەختی دەهات، ئازارو لە خاچ دان لە دوای ئازارو لەخاچ دانەوەیە، پەیامبەران ی خودا رێك لە ئورشەلیم، ئوردن، بیاباندا، دەپشکوێن، خۆیانو جلی دڕاوو کۆنیانو زنجیر لە دەست، کەفیان کەوتبووە سەر لێوان، لە کێوەکانەوە سەرەو ژێر دەبوونەوە تاك تاکی ئەوان لە خاچ دەدران.



سەدای چپەچپێکی تووڕە بەرز دەبۆوە، درەختو گەلای خورما کە دیواری کەلێسایان جوان دەکرد، تابلۆی پێنج گۆشە، کتێبی پیرۆز بەسەر کتێبگردا بە وشەی پڕ بە دەم ( خەڵقی هەڵبژێردراو، سەر زەمینی موعود،مەلەکوتی ئاسمان، کریستیانو) هیچ یەك لەوانە ئیدی ئەوانی کپ نەدەکردەوەو دڵی نەدەدانەوە، ئومێد بە لەمێژینەی خۆیەوە، خەریك بوو دەبوو بە نائومێدی، خوداوەند سەبری هەیە بەلاّم مرۆڤ سەببور نییە، ئیدی نەیاندەتوانی زیاتر لەوە لە چاوەڕوانی دا بمێننەوە، هەتا ئەو ئومێدە نەخش کراوەی سەردیواری کەلێساش ئیدی نەیدەتوانی ئەوان هەڵخەڵەتێنێ، جارێکیان لە کاتی خوێندنەوەی سەر گوزەشتەی _ئیزکیل- ی پەیامبەر خاخامی پیر وا لە خودادا غەرق بوو بوو هەڵدەبەزیەوە، هاواری دەکرد، دەگریاو سەمای دەکرد بەلاّم دیسان ئارام نەبۆوە، وشەکانی (ئیزکیل) بوو بووە پارچەیەك لە جەستەی، بۆ تەسکین کردنەوەی خۆی قەڵەمی پەڕەموچو رەنگی گرتە دەست، خۆی لە ناو کەلێسا بەند دەکرد، بەشێتایەتییێکی خودایی، دیواری خەونی پڕ لە پەیامبەران دەکرد: کەللەسەرو ئێسقان، کێوێ لە ئێسقانبەدیمرۆیی، بەسەر بەرزایی ئەوانەوە، ئاسمانێکی سوور وەك ئاسنی داغکراو، دەستێکی دێو ئاسا لە ناوەوەی ئاسمان دەهاتە دەرەوە پشتی ملی ئیزگیلی دەگرتو لە هەوادا رایدەگرت، ئەو خەونە بە دیوارێکی دیکەدا دەچکایەوە، لێرە ئیزکیل کەتا ئەژنۆکانی لە نێوان ئێسقانەکاندا رۆچوو بوو، دەمی سەوزو رۆشنو کراوە بوو، لەناویا نەوارێ بە پیتی قورمز هاتبووە دەرەوە ((ئەی بەنی سراییل کریستیانو هاتووە!)) ئێسقانەکان بەیەکەوە چەسپ دەبوون، کەللەسەرەکان پڕ لە ددانو گوڵەوە بەرز دەبوونەوەو دەستێکی بە هەیبەت لە حاڵێکا کە ئورشەلیمی تازە لەناو لەپی دابوو، لە ئاسمان دەهاتە دەرەوە، ئورشەلیمی نوێ: تازە دروست کراوو نورانی، هەموو زومەڕڕەدو یاقوت، خەڵکی سەیری ئەم نەخشانەیان دەکرد، لە کاتی راتەکاندنی سەریان، کەوتبوونە پسە پسەوە، ئەو شتە خاخامی پیری تووڕە دەکرد، بەسەر سەریانەوە هاواری کرد، ((بۆ پسە پس دەکەن؟ مەگەر باوەڕتان بۆ خودای باوانتان نییە؟ نەفەرێکی دیکە لە خاچدراوە،پێی رزگارکەر نزیکتر بۆتەوە، ئەی ئێوە کەباوەڕتان کەمە، مانای لە خاچدان هەمان ئەو شتەیە!))

ئەو کاتە کتێبی بەسەر کتێبگرەوە هەڵگرتو بەتەکانێکی توند کردیەوە، خۆرەتاو لە میانی پەنجەرەکان دووبارە هاتە ژوورەوە، لەقلەقێ لە ئاسمان هاتە خوارەوە بەسەر بانی بەرامبەرەوە هەڵنیشت، وەك بڵێی ئەویش دەیەویست گوێ بگرێ، لە سینەی بەدبەختی خاخامدا هاوارێکی خۆشبەخشو سەرکەوتوانە هاتە دەرەوە:

((شەیپوری سەرکەوتن لە سەهیۆندا بخەنە دەنگەوە، بانگەشەی ئەو هەوڵە شادی بەخشە بکەن لە ئورشەلیم دا، هاوار بکەن! یەهودا بۆ لای قەومی خۆی هاتووە، ئەی ئورشەلیم راپەڕە دڵێکی بەهێزت هەبێ، سەیربکە لە خۆرهەڵاتەوە تا خۆراوە، پەروەردگار دەبێتە شوانی کوڕانی تۆ، کێوەکان راستو رەوان بووینە، گردەکان لەناوچوونو نەمان، تەواوی درەختەکانی عەتری خۆیان کردۆتە قوربانی، چەكو شمشێرو تیرو کەوانت بەخۆتەوە هەڵواسە ئەی ئورشەلیم، بەختەوەری بۆ هەمیشە بۆ کوڕانی سراییل هاتووە!)) دەنگی (کەی...کەی؟) لە ئاپۆڕەکەدا دەبیسترا، هەموو گەڕانەوە، پیرەمێردێکی لاواز ئەندام بە رووخساری پەژمووردەوە بەسەر سەری پەنجەی پێ وەستاو هاواری دەکرد ((کەی باوە کەی؟))

خاخامی پیر لە رووی توڕبوونەوە کتێبەکەی کۆکردەوە پرسی ((ماناسیس بەپەلەی؟))

پیرەمێرد وەڵامی دایەوە ((بەڵێ، ئەشك لە رووخساریدا هەڵدەڕژا، ماوەم نییە ئەجەلم هاتووە)).

خاخام بە هێمای دەستی بە (ئیزگیل)ی گوت کە لەناو ئێسقانەکاندا شاردرابۆوە ((سەیرکە ماناسیس دووبارە رادەبیەوە))

- من پیرەمێردێکی نابینام ناتوانم ببینم

پەترۆس هاتە نێوەوە، رۆژ خەریك بوو کۆتایی دەهات، شەوان لە دەریاچەی — گنسارت- ماسیگری دەکردو لە مەزەقەت دابوو گوتی: ((باوە، وادەی گێڕانەوەی رازێکت بەئێمە دابوو بۆ تەسکینی دڵمان، ئەو رازە چییە؟))

خەڵك بەحەپس کردنی هەناسەیان لە سینەدا، بەدەوری خاخام کۆبوونەوە تا ئەو رادەیەی کە کەلێسا جێی هەبوو، لەحەوشە هاتنە ژوورەوە، گەرماییێکی توند بوو،



بۆنی توندی ئارەقە هەوای پڕ کردبوو، خزمەتکارانی کەلێسا بۆ بۆندارکردنی هەوا بخوریان هەڵدەڕشتە ناو مەنقەڵەکانەوە کە لە شێوەی دڵۆپەی ئەشکدا بوون

خاخام بۆ خۆ پاراستن لە هەناسە تەنگی چووە سەر مێزێکەوەو لە کاتێکا ئارەقەی خۆی پاك دەکردەوە، گوتی:( رۆڵەکانی من دڵی ئێمە لێوانلێوی خاچە، ماوەیەك لەمەوبەر ریشی رەشم بووە خۆڵەمێشیو پاشان سپی بۆوە، ددانەکانم وەرین، ئەوەی کە ماناسیسی پیر هاواری بۆ کرد منساڵەهای ساڵ هاوارم بۆ کردوە، چەندین جار پرسیومە (تاکەی تاکەی ئەی خودا؟ ئایا ئارەزووی دیتنی کریست بۆ گۆڕ دەبەین..؟)) شەوێکیان پەرجویەك روویدا! خودا وەڵامی دامەوە، نا، پەرجوییێ نەبوو، هەر کاتێ کە پرسیار لەو بکەین وەڵام دەداتەوە. بەڵام لە تەختەبەندی لەشدا دیلین کەڕینو نابیستین، بەڵام ئەوشەوە من بیستم... ئەوەش پەرجو بوو)).

پەترۆسی بانگ کرد ((چیت بیست؟ بابە، هەمووشتێ بە ئێمە بڵێ)) لە میانی ئاپۆڕەدا رێی خۆی کردەوە لەبەردەم خاخام وەستا، پیرەمێرد لاربۆوەو سەیری پەترۆسی کردو گرژیەوە.

پەترۆس خودا وەکو تۆ ماسیگرێکە ئەویش شەوانە لەکاتی مانگەشەوی تەواودا دەچێتە ماسیگریەوەو ئەو شەوە مانگ بەدری تەواو بوو، وەکو سپیاتی شیر لە ئاسماندا ئەوەندە میهرەبانو دلۆڤان سەولی لێدەدا کە نەمدەتوانی چاوەکانی خۆم داخەم، چووار دیواری ماڵ بۆ من تەنگ بووە، بەکوچە باریکەکانەوە کەوتمە رێ (ناصیر)ەم لە دوای خۆمەوە جێهێشت، بەرز بووبوومەوە، پشتم بەتەختە بەردێ داو سەیری لای باشوورم دەکرد، بەرەو ئورشەلیمی پیرۆز، مانگ تەکی بە پێشەوە داو وەك مرۆڤێ سەیری منی کردو گرژیەوە: سەیری ئەوم کرد سەیری دەمو گۆناو گۆشەی چاوەکانیو ئاخم هەڵکێشا، هەستم کرد کە لە میانی کپی شەودا قسە لەگەڵ من دەکا، بەم حاڵەوە نەمتوانی ببیستم مەلێك لەسەر زەوی باڵی لێك نەدەدا، مەزرای سەوزی فەلەك بۆنی نانی لێدەهات، شیر لە کێوەکانی دەوروبەر من- تابور، جلبوع، کرمل- وەکو تاڤگە هەڵدەڕژا، لەبەرخۆمەوە کەوتمە ئەندێشە: ((ئەمشەو شەوی خودایە، قورسی تەواوی مانگ، سیمای شەوانەی خوداوەند لە ئورشەلیمی

ئایندە، شەوەکان وەك ئەمشەو دەبیّ)) بە ختووورەکردنی ئەو بیرۆکانە لە زەینم دا چاوەکانم پڕ لە ئەشك بوون، بیّچارەییو ترس وجوودی داگرتم، هاوارم کرد ((من پیر بوویم، ئایا بەر لەوەی چاوەکانم بەجوانی کریستیانو رۆشن بیّتەوە، دەمرم؟))

بەسووك بەزینیّکەوە هەستامەوە، رقی پیرۆز دیسان وجوودی داگرتمەوە، جلم لەبەرکردەوە، وەك تازە لە دایك بوویێ لەبەردەم خودا وەستام، دەمویست ببینیّ کە چۆن چۆنی پیر بوویم، چۆن وەك گەلاّی درەختی هەنجیر لە پاییزدا، وەکو قەدی بیّ گەلاّو لەرزیوی هیّشوە تریّکان کە بەدەستی پەرەندەکانەوە بەتاراج چوو بوون، وشكو چرمسیو کالّ بوونەوە، دەمویست ببینیّو دلۆڤانیم پیّ بکاتو زوو بجولیّ، لە هەمان کاتدا کە رووتو قووت لەبەرابەر خودا وەستا بووم هەستم کرد کە نووری مانگ لە جەستەمدا دەچیّتە ژوورەوە، گویّم لە دەنگی بوو، لە دەرەوە یا لە بەرزایی سەرم نەبوو، لەناو دەروونم بوو بە تەواوی بووبوومە رۆح لەگەلّ خوداو بووم بە یەك، بەلیّ لە ناو دەروونمدا، صەدای حەقیقی خودا هەمیشە لە ریّگەی دەروونەوە دەگاتە گویّی ئیّمەوە.

گویّم لیّ بوو ((شەمعون...شەمعون، تۆ بەر لەمەرگ دیداری کریست دەکەی، گویّت لە دەنگی دەبیّ دەستت دەگریە ناو دەستی.)).

ئەوەندە زەوقم هەبوو، کە روت وقوت لەژیّر مانگدا کەوتمە هەلّپەڕینو چەپلّەوە، ساتیّك دریّژەی کیّشا یا هەزار سالّ، نازانم، بەلاّم چەند دریّژەی کیّشا بەشی کردمو ئارام بوومەوە، جلەکەم کردەبەرو بۆلای ناصرە سەرەو ژیّر بوومەوە، ساتیّ کەلەشیّرەکان لە لانەکانیان بەسەرپشتی بانەکانەوە منیان دیت، دەستیان کرد بە خویّندن، ئاسمان پیّکەنی، مەلەکان بیّدار بوونەوە، دەرگاکان کرانەوە سەلاّویان لیّ کردم، کوختە قیّزەوەنەکەم لەسەرەوە تا خوارەوە دەدرەوشایەوە، دەرگاکان پەنجەرەکان هەموو شتیّ لە رەنگی یاقووت بوون، جەنگەلّو تەختەبەردەکانو خەلّكو هەموو بۆنو بەرامەی ئامادەیی خودایان لە دەوروبەرم پەرش بلاّودەکردەوە خودی یۆزباشی بە هەموو خویّنخۆری خۆیەوە، بەسەرسامی لە جیّی خۆیەوە وەستاو پرسی ((خاخام



ئەوە چی رویداوە لە تۆ؟ وجووی تۆ بۆتە مەشخەلّیّکی هەلّگیرساو ئاگاداربە ئاگر لە ناصیرە بەرنەدەی)) بەلاّم شتیّکم نەگوت، نەمدەویست هەناسەم پیس ببیّ.

سالّەهای سالّە کە ئەو رازەم لە سەرای دلّ پاراستووە، بە تەعەصوبو غروری خۆم لەززەتم لیّ چەشتووە لە چاوەڕونیدا دانیشتووم، بەلاّم ئەمڕۆ ئەو رۆژە رەشە کە بینەری کوتینەوەی خاچیّکی تازە بووین بەسەر دلّی ئیّمەوە، ئیدی توانای پاسداری کردنی رازم لە دەستداوە، دلّم بە حالّی قەومی سراییل دەسووتیّ، لەبەر ئەمە ئەو هەوالّە خۆشی بەخشە بۆ تۆ ئاشکرا دەکەم، ئەوە خەریکە دیّت، نابیّ دووربیّ، رەنگە لەسەر ریّگای خۆی لە مالّیّکی نزیك بۆ خواردنەوەی قومیّ ئاو یا لە کەنار تەنوریّ کە نانی تازەی لیّ هاتۆتە دەرەوە، بۆ خواردنی لوقمەییّ نان وەستابیّ، بەلاّم لەهەر کوێیەك بیّ هەر زووبەدیار دەکەویّ، چوونکە خودا وای گوت، خودا قسەی خۆی ناکیّشیّتەوە، ((شەمعون تۆبەر لە مەرگ کریستیانو دەبینی، گویّت لە دەنگی دەبیّت،دەستت لە ناو دەستی دەنیّی))

ڕۆژ بە رۆژ بیّ تواناتر دەبم، بەلاّم بە هەمان ریّژە کە توانابیم لە دەست دەدەم دەنگی هەنگاوەکانی رزگارکەر دەبیستم کە نزیکترو نزیکتر دەبیّتەوە، ئیّستا تەمەنم ٨٥ سالّ زیاترە لەمە زیاتر دواکەتن رەوا نییە.

پیاوە سەرکەچەلّو لوچی بە پوزەییّکی تیژو ناسك لە جیّوە بزاوت وەك بلّیّی کاتی سوورشتەبوونی مایەکەی لەبیر کردبوو،

–بەلاّم باوکە تۆ ئەدی ئەگەر هەزار سالّی دیکە بەزیندوویی مایەوە؟ ئەگەر هیچ کات نەمردی هەینیّ چی؟ ئیّمە شاهیّدی ئەو جۆرە رووداوەین (خنوخ- ئەلیاس) زیندوون، چاوانی وردو کەچو خواروخیّچی رەشکەو پیّشکەی دەکرد، خاخام خۆی کەڕ کرد، بەلاّم وشەکانی ئەو پیاوە لوچە وەك خەنجەریّ بەدلّی داچووە خوارەوە، وەکو کەسیّ ئەمر بکات ئاوا دەستی بلّند کردو گوتی: ((دەمەویّ لەگەلّ خودادا تەنها بم، هەموو ئیّرە جیّ بهیّلّن)) کەلیّسا خالّی بوو، ئاپۆڕەکە پەرتەی لیّ کردو خاخام لەگەلّ خۆی بەتەنها مایەوە دەرگای داخستو پشتی بە دیواریّ دا کە ((ئزگیل)) لە میانی نەخشەکاندا لە هەوا پیاسەی دەکرد، لە ئەندیّشەییّکی قوولّدا غەرق بوو، لەبەرخۆوە

کەوتە ئەندێشەوە ((خوداوەند بەتواناو بەرزە: ئەنجامی هەر کارێ تواناییە. نەکا تۆماسی پیس راستی گوتبێ؟ وای لەمن ئەگەر خوداوەند ئیرادەی خۆی لەسەر ئەوە بەستبێ کە هەزار ساڵ بەزیندوویی بمێنمەوە، ئەگەر ئیرادەی ئەوەبێ کە بۆ تا هەتا بمێنمەوە.

– ئەو کاتە کریستیانۆ... ئایا ئومێدەکانی گەورەی کوڕانی سراییل هەمووی بەبا دەچێ؟ ئەو قەومە هەزاران ساڵە فەرموودەی خوداوەندیان لەناو دەروونیان پاراستووە.

وەکو چۆن دایکێ تۆوی لە دەروونی رەحمی دا گەشە دەکا گۆشتو ئیسقانەکانمان لەناوچوون، تواینەوەو تەنیا بۆ ئەم کوڕە دەژین، بەلاّم ئەم هۆزە تووشی دەردی زایمان بووە. نوتفەی ئیبراهیم هاواری دەکرد: پەروەردگارا، رەهای بکە، تۆ خوداوەندگاری، تۆ دەتوانی بەرگە بگریت_ ئێمە ناتوانین، بەزەییت بە ئێمەدا بێتەوە!

حاخام لە کلێسادا دەهاتو دەچوو، رۆژێك خەریك بوو شتو مەکی خۆی دەپێچایەوە، سێبەر نەخشەکانی سەر دیواری ون دەکردو ((ئیزگیل)) یان قووت دەدا، خاخام سەیری سایەی رۆشنی دەوروبەری کرد، لە پڕێکا تەواوی ئەوەی کە بە درێژایی ژیانی بینی بووی‌و ئەو ئازارەی کە بەرگەی گرتبوو، هێرشیان کردە سەر زەینی، بە چ شەوق‌و شورێکەوە چەندین جار لە جەلیلەوە بۆ ئورشەلیم‌و لە ئورشەلیمەوە بۆ بیابان لە گەڕانو سووران بە دوای کریستیانۆ پەلەی کردووە!

بەلاّم هەموو جار خاچێ ئومێدەکانی کردوە بە نائومێدی‌و بەشەرمەزاری گەڕاوەتەوە ناصیرە، لەگەڵ هەموو ئەوەش، ئەمڕۆکە سەری گرتە میانی دوو دەستو بەوەحشەتەوە لەبەر خۆ کەوتە زەمزەمەوە (نا......نا قەت وا نابێ)

ئێستا ئەوە چەندین شەوو رۆژە کە مێشکی فیتەی لێدەداو ئامادەی لەبەر یەك ترازان بوو، ئومێدێکی تازە رووی لەو کردبوو، ئومێدێ کە بۆ مێشك زۆر گەورە بوو، شێتییەك‌و ئەجندەیەك ئەوی دەخوارد، بەلاّم ئەوە یەکەمین جار نەبوو، سالاّنێك بوو کە ئەم شێتایەتیە، چەنگالّی خۆی لە مێشکی سەری ئەو بردبووە خوارەوە لە خۆی دەکردەوە بەلاّم دووبارە دەهاتە سۆراغیەوە، بەلاّم هیچ کات لەکاتی رۆژدا جورئەتی



ئەوەی پەیدا نەکردبوو خۆی ئاشکرا بکات هەمیشە لە تاریکی شەو یا لە کاتی خەوندا دەهاتە سۆراغیەوە، بەلاّم ئەمڕۆکە.. بەڵێ ئەمڕۆکە لە کاتی نیوەڕۆدا، لە رۆشنایی تەواوی رۆژیش- ئایا ئەو کریستیانۆ بوو؟

پشتی بە دیوار داو چاوەکانی خۆی داخست... یەکجار لە پێشەوەی ئەودا بەهانکە هانکەوە خاچی بەسەر پشتی خۆی دادەنا، لە دەوروبەرییەوە هەوا، بەهەمان شێوە لای فریشتە دەلەرزی،... سەیرکە! سەری بەرز کردۆتەوە، خاخامی پیر هیچ کاتێ ئەو هەمووەی لە ئاسمان لە ناوی چاوی کەسێ نەبینیوە، ئایا ئەو کریست بوو؟ خاخام بە پاڕانەوە گوتی: ((پەروەردگارا.... پەروەردگارا بۆ ئەوەندە عەزابم دەدەی؟ بۆ وەلاّم نادەیەوە؟)) پێشبینی وەك چۆن هەورەتریشقە لە زەینیدا سایەدی کرد، بۆ ساتێ سەری لەمێژ سالّی لە رۆشناییدا پڕ دەبێ‌و ساتێکی دیکە بەبێ هیچ ئومێدێ دەخزێتە دەروونی تاریکی‌و خاچەکەی دەکرێتەوەو گەورەکانی قەوم دێنە پێش.

لە دەروونیا زێدی نەژادی سەرسەختو پارێزراوی بەبرین داپۆشرابوو سەردەستەشی موسا بوو، بەرانەکێوی بەشاخی پێچاوپێچ، سەفەری بێ کۆتایی، دووبارە دەستی پێکردەوە، لەسەر زەمینی بەندێتییەوە بۆ سەر زەمینی کەنانە، ئەو کاتە سەفەرەکەی لەسەر زەمینی کەنانە بۆ ئورشەلیم خەتم دەکرد، بەلاّم لەو رێپێوانەدا.... ئەوە حەزرەتی مووسا نەبوو، کە مورشیدی ئەو بوو، بەڵکو یەکێکی دیکە ... زەینی خاخام تیرەتر بوو، یەکێکی دیکە بەخاچی سەرشانی،

خاخام بە بازێك خۆی گەیاندە دەروازەو کردیەوە، با لە رووخساریدا باڵندەکان بەمەبەستی خەوتن خەریکی گەڕانەوە بوون بۆ لانەکانیان، هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا خۆرەتاو ئاوا بوو بوو، دەرگای قفلداو کلیلە سەنگینەکەی نایە بەر کەمەری، بۆ ساتێ ئازایەتی خۆی لە دەست دا، بەلاّم بەیەکجار بڕیاری خۆیدا، بەسەری لاریەوە بەرەو مالّی مێرێ کەوتە رێ.

مێرێ لە حەوشەی مالّی خۆی بەسەر مێزێکی بەرزەوە دانیشتبوو تەشی دەڕست، هەوا هێشتان رۆشن بوو، رۆشنایی هاوین هێدی هێدی بەسەر زەویەوە، لینگی لە دوای خۆی رادکێشا و مەیلی رۆیشتنی نەبوو، خەڵك خۆیانو گایەکان لە مەزرادا

دەگەڕانەوە، ژنان بۆ پوختو پەزی شەوانە ئاگریان دەکردەوە، عەتری دارەکان لە کاتی سووتاندا هەوای عەسرانەی دەوروەدا بوو، مێریێ خوری دەڕستو زەینیشی وێڕای ... سەری تەشی کە زەمانێ بەملاو زەمانێ بەملادا دەسوورا، ختوراتو خەیاڵ تێکەڵ بەیەك بوو بوون، ژیان نیوە حەقیقەت نیوە ئەفسانە دەهاتە بەرچاو، دەوری بچووکی وەزیفەی رۆژانەی بەدرێژایی سالاّن ئەنجام دابوو.... پاشان لە پڕێکا تاووسی سەرسامهێن پەرجوی سەرداو هاتە ژوورەوەو بوونی ئازاراوی بە باڵە درێژەکانی خۆی داپۆشی بوو.

–پەروەردگار، هەر شوێنێ کە دەتەوێ لەگەڵ خۆتم بەرە، هەر چۆنێکت دەوێ رەفتارم لەگەڵدا بکە،خۆت مێردی منت هەڵبژارد، کوڕەکەمت کردە دیاری، تۆ خۆت ئازاری منتدا، پێم بڵێی هاوار بکەمو هاوار دەکەم، بڵێی بێدەنگ، بێدەنگ دەبم، خوداوەندا بەڕاستی من چیم؟ مشتێ گڵ لە دەستەکانی تۆدا هەر چۆنێك دڵت دەخوازێ وای بشێلەو تێکەڵ بەیەکی بکە، هەرچیت دەوێ بیکە، وەلێ یەك تکام هەیە لەتۆ، ئەویش ئەوەیە کە بەزەییت بە کوڕەکەمدا بێتەوە!

–کۆترێکی سپی لە سەربانی ماڵی بەرامبەردا هەڵفڕیە خوارەوە بۆ ساتێ بەسەر سەری ئەوەوە باڵەکانی لێکداو ئەوکاتە بە ویقارەوە بەسەر گاشەبەردەکانی حەوشەوە دابەزی لە دەورری پێیەکانی مێریێدا کەوتە لەنجەوە، پەڕی کلکی کردەوە، گەردەنی کەچ کردو سەری وەرسووراندو سەیری مێریێی کرد، قسەی لەگەڵدا کرد، مێریێ لەبەرخۆ گوتی: ((حەتمەن دەیەوێ خەبەری رازێکم پێ ببەخشێ، چ دەبوو خاخامی پیر هاتبا، ئەو لە زمانی مەلانیش دەزانیێو دەتوانێ راڤەیان کات.)). سەیری کۆترەکەی کردو دڵی پێ سووتا، تەشیەکەی دانایە سەر زەویو بە دەنگێکی زۆر نەرمو گونجاو پەرەندەی بانگ کرد، پەرەندە خۆشحاڵەکە بە پەڕینێ بەسەر ئەژنۆکانی ئەودا هەڵکورما لەوێ وەك بڵێی تەواوی رازی ئەوە بوو کە بگاتە سەر ئەو ئەژنۆیانە، پەڕو باڵی کۆکردەوەو بە بێ جووڵە لە جێی خۆیدا مایەوە. مێریێ هەستی بەکێشی کۆتر کردو گرژیەوە، چی دەبوو، کە خودای هەمیشە وا میهرەبان بۆ مرۆڤ دابەزێتە خوارەوە، لەو ئەندێشەیە دابوو، کە کەوتە یادی سپێدەدەمێك کە هاوڕێ لەگەڵ



دەستگیرانی، یوسف، لەکێوی ئەلیاسو کەرمول سەری بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوەو سەرهەڵگەڕابوو، دەیانویست داوا لە پێغەمبەری ئاگرین بکەن کە لەگەڵ خودادا رازو نیاز بدرکێنن، تا بەلکۆ خوداوەند کوڕێکیان پێ ببەخشێ، کوڕێ کە وەقفی بەهرەوەری پایامبەریان دەکرد، بڕیاربوو کە عەسری هەمان رۆژ زەماوەند بکەن، بەر لە هەلاّتنی سپێدە ئامادبوو تا ئەو پەیامبەرە ئاگرینە کە لە لەززەتی گەورەی بروسکە بوو ئەوان پیرۆز بکات،

هەورێ لە ئاسماندا بوو، پاییزێکی خۆش بوو،خەڵکی وەکو مێرولە کلۆ بە دەوری خەرمانەی خۆیان کۆببوونەوە، ئاوی ترێ لە ناخی خومرەکاندا دەچکایەوە، هەنجیرەکان وشك دەبوونەوە، مێریێ پانزە ساڵی بوو، مێردەکەی پیرەمێردێ بوو بە پرچێکی رەنگ خۆڵەمێشی رەنگ، گۆپاڵێکی لە دەست دابوو کە وا موقەددەر بوو خونچە بکات، نوێژی نیوەڕۆ گەیشتنە قوللەی موقەدەس، ئەژنۆیانداو بەترسو لەرزەوە بەسەر پەنجەی خۆیان بەردی رەشو تیژو خوێناویان لەمس کرد، کلّپەیێ لە بەردەکە هەڵساو دەستی مێریێی بڕی، یوسف دەمی خۆی بۆ خوێندنی نیشتەجێی وەحشی گردەکە کردەوە، بەلاّم بەر لەوەی کە بتوانێ وشەیێ بخاتە سەر زار، لە تۆقەڵەی ئاسماندا هەورێ نەڕاندیو تەرزەی بە تووڕەییەوە هەڵپژانو خێمەیان بەسەر بەردی رەشدا هەڵدا، لە هەمان حاڵدا کە یوسف خۆی بۆ پێشەوە هەلاّویشت تا دەستگیرانی بگریێو بیباتە پەنای ئەشکەوتێکەوە، خوداوەند مەشخەڵێکی بە هەیبەتی هەورە تریشقەی لە کەماندا رەها کرد، ئاسمانو زەوی تێکەڵ بەیەکبوون، مێریێ بەسەر پشتەوە کەوتە سەر زەویو بێهۆش بوو کەبەخۆ هاتەوە، چاوانی کردەوەو سەیری دەوروبەری کرد، یوسفی بینی بە ڕووخساری داکەوتەی بەسەر بەردی رەشدا راکشاوەو پەکی کەوتووە.

مێریێ دەستی بە کۆترەکە داهێناو بەنەرمی نەوازشی کرد، تا نەوەکا بیترسێنی، بەچپەوە گوتی: ((خوداوەند لە ترۆپکی کێو بە رووخسارێکی وەحشی دابەزیو بە شێوییێکی وەحشیانە قسەی لەگەڵ مندا کرد، ئەرێ بەڕاستی چی بەمن گوت؟)) خاخامی پیر زۆربەی وەختان لەمبارەوە پرسیاری لەو کردبوو، خاخام سەرسام بوو بوو

سەبارەت بەو پەرجوانەی کە یەك لە دوای یەك لە دەوروبەری ئەو ژنە رووی دەدا. گوتبووی: مێرێ هەوڵدە وەبیرت بێتەوە، ئەوە رێگەیەکە کە خودا جارجارە بە هۆی هەورەتریشقەوە لەگەڵ مرۆڤ قسە دەکات، هەوڵدە وەبیری خۆت بهێنیتەوە، تا مەگەر بتوانین سەرنویشتی کوڕەکەت کەشف بکەین.

- بابە، گەواڵە بوو لە ئاسماندا بە غژغژی وەکو گاسن دابەزی،

- مێرێ، ئەی لە پشت گەواڵەکەوە؟

- بەڵێ بابە تۆ راست دەڵێی، خودا لە پشتی گەواڵەوە قسەی دەکرد، بەلاّم نەمتوانی قسەکانی بەدروستی وەربگرم، لێم ببورە، لە کاتێکدا دەستی بەسەر پشتی کۆتردا دەهێنا، هەوڵیدا، دوای تێپەڕینی سی ساڵی هەورەتریشقە بهێنێتەوە یادیو گرێ ی مانا نادیارەکان بکاتەوە، چاوەکانی داخست، لەناو لەپی دەستی، جەستەی بچووكو گەرمو دڵی خورپەداری کۆتری هەست پێدەکرد، لە پرێکا- تێ نەگەیی چۆنو نەیزانی چۆن- کۆترو برووسك بوونەوەیەك دڵنیا بوو ئەو خورپەی دڵو ئەم گەواڵەیە هەموو خودا بوو، هاواری کردو بە وەحشەتەوە لە جێی خۆی هەڵبەزیەوە، ئێستا بۆ یەکەمین جار توانای هەبوو، کە وشە نادیارەکانی گەواڵەو گمەگمی کۆترەکە لەیەك جیا بکاتەوە ((درود لە تۆ بێ مێرێ درود لە تۆ بێ مێرێ)) گومانی نەبوو کە خوداوەند هەمان ئەو هاوارەی کردبوو: ((درودت لێ بێ مێرێ)). سەری وەرسووراندو مێردەکەی خۆی بینی کە خۆی بە دیواردا دابوو،هێشتاش دەمی لەیەك دەکردەوەو دادەخست، هەوا ئەوسا تاریك بوو بوو، بەلاّم ئەو هێشتا تەقەللاّی دەداو ئارەقەی هەڵدەڕێشت، مێرێ چووە رارەوەکەیەوە، لەبەرامبەر ئەودا رەت بوو، بەلاّم قسەیەکی لەگەڵ ئەودا نەکرد، چاوەڕوانی هاتنی کوڕەکەی بوو، ئەوی بینی بوو کە چەفیەی دەستی پیاوە لە خاچدراوەکەی لە دەوروبەری سەری وەرپێچابوو لە گردەکە دەهاتە خوارەوە، بۆ کوێ چوو بوو، بۆ تاخیر بوو بوو، نەکا خواستبی هەتا هاتنی رۆژ لە مەزرادا بمێنێتەوە؟ مێرێ کە لە ئاستانە راوەستابوو خاخامی بینی، نزیك دەکەوێتەوە، گۆپاڵەکەی خۆی توند گرتبوو، هانکە هانکی بوو، تارەمووی سپی سەر لاجانگی لە نەسیمی شەوانەی کە لە کێوی کەرمولەوە هەڵیدەکرد شەپۆلی دەدا،



مێرێ، بەرێزەوە رێگەی هاتنە ژوورەوەی لەبەردەم خاخامدا کردەوە، دەستی برای مێردەکەی گرتو لاواندیەوە، بەلاّم قسەی نەکرد، ئاخر ئەو پیرەمێردە دەیتوانی چ بڵێت؟ خاخام بە زەینی نووقم بووی قولاّیی ئاوە تاریکەکان، بۆلای مێرێ گەڕایەوەو گوتی: ((مێرێ چاوەکانت نوور داوێ، مەسەلە چییە؟ ئایا خوداوەند دووبارە هاتۆتە سۆراغتەوە.

مێرێ نەیتوانی بەری زمانی خۆی بگرێتو گوتی: ((باوکە دۆزیمەوە))

–پەنا بە خوا چ شتێکت دۆزیوەتەوە؟

–وشە نادیارەکانی ناو هەورە تریشقە

خاخام لەرزی، لەکاتێکا بازووەکانی بۆ سەرەوە هەڵبڕی هاواری کرد: (خودا گەورەیە...مێرێ تەواو من بۆ ئەوە هاتووم تا جارێکی دیکە لە تۆ بپرسم وەك چۆن دەزانی، ئەمرۆ یەکێ لە ئومێدەکانی ئێمە لە خاچدراو دڵی من.....) مێرێ دووبارەی ئەکردەوە، (باوکە، دۆزیمەوە! ئەمرۆ عەسرێ لە کاتێکا دانیشتبوومو تەشیم دەڕێسیو دیسان بیرم لە هەورە تریشقە دەکردەوە، هەستم کرد بۆ یەکەمین جار گەواڵە ئارامی گرتو لە پشتی ئەوەوە دەنگێکی نەرمو ئاشکرام بیست، دەنگی خودا بوو: (درودت لێبێ مێرێ خاخام خۆی هاوێشتە سەر مێزێکەوە، لاجانگەکانی کوشیە ناو دەستەکانیو غەرقی ئەندێشەیەکی قوڵ بوو، پاشان سەری بەرز کردەوە (مێرێ هیچی دیکەت نەبیست؟ لە دەروونی خۆتا غەرق بە تا دڵنیابی کە دەبیستی، لەوانەیە سەرنویشتی سراییل وابەستە بە قسەی تۆ بێ..)

مێرێ بە بیستنی وشەکانی خاخام،ترسا، سینەی لەرزیو جارێکی دی لە زەینی خۆیدا بە دوای مانای شاراوەی ناو گەواڵەدا گەڕا، بێ تاقەت بوو دەستی دوایی بە چپەوە گوتی: ((نەخێر..نەخێر، باوکە، ئەو زۆری لەوە زیاتر گوت، بەلاّم نەمتوانی ببیستم، تەواوی هەوڵم بەکاردەهێنم، بەلاّم ناتوانم گوێم لە گوتەی ئەو بێ)) خاخام دەستی دانایە سەر سەرو چاوانی ئەوەوە..

–میێرێ، بەڕۆژو بە شەو خودا بپەرستە، زەینی خۆت بە کاری ڕۆژانە مەشێوێنە، چەندین جار دیومە کە خەرمانەییێکی نورانی بە جیلوەی هەورەتریشقە، بەسەر گەردی رووخسارت دەسووڕێتەوە، سەرسامم کە ئایا ئەو خەرمانەیە، نورێکی حەقیقییە؟ ناتوانم بڵێم رۆژو بگرەو خوداپەرستی بکە. ((درودت لێبێ میێرێ) پەیامی خودا بە میهرەبانیەوە دەست پێدەکات.. هەوڵ بدە ئەوەشی کە ماوە ببیستی.

میێرێ بۆ پەنهان کردنی هەڵچوونی خۆی، چووە لای جێ ی پیاڵاْنو فنجانێکی سینی هەڵگرتو پڕی کرد لە ئاو، مشتێکیشی لە خورما گرتو بۆ پیرەمێردی هێنا...

– مەمنونم.. برسیو تێنوو نیم، وەرە دانیشە، دەبێ قسە لەگەڵ تۆ بکەم..! میێرێ نزمترین مێزی هەڵگرتو لە کەنار پێیەکانی خاخامدا دانیشت، لە خالێکدا سەری هەڵبڕی بوو، لە چاوەڕوانیدا مایەوە، پیرەمێرد وشەکانی لە زەیندا تەتەڵە دەکرد، ئەوەی کە دەیخوازی بڵێت، گرفت بوو، ئومێدێك بوو ئەوەندە ئاوریشمینو لووس بوو کە بە مەبەستی پڕ بایەخی جلیوەنەدانو دڵنیانەبوونیەوە لە دۆزینەوەی وشەی ئاوریشمی لووس دەستەپاچە بوو، نەیدەویست دایکی بخاتە وەحشەتەوە، عاقیبەت گوتی: ((میێرێ لە دەرەوەی ئەو ماڵە رازێ وەك شێری بیابان پیاسە دەکات، تۆ وەکو ژنانی دیکە نیت خۆت هەست بەوە ناکەیت؟.

میێرێ بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: (نا باوکە من لەگەڵ ژنانی دیکە جیاوازیم نییە، منیش حەزم لە تەواوی پەیوەندیو لەززەتی تایبەتی ژنان هەیە، چێشتلێنان، چوونە سەر کانی، گوڵ گوتنو گوڵ بیستن، گوتی: لەگەڵ هاوسێکانو عەسران دانیشتنو سەیرکردنی رێبوارانم حەز لێیە، دڵم وەك دڵی هەموو ژنان مەکۆی ئازارە).

خاخام، بەبەرزکردنەوەی دەست وەك بڵێی دەیویست بەر لە هەموو جۆرو سکاڵاْیەك بگرێت، بەشێوەیەکی تژی ویقار دووبارەی کردەوە، (میێرێ،تۆ وەکو ژنانی دیکە نیت..و کوڕەکەت..)). دووبارە لە قسەکردن وەستا، چۆن دەیتوانی بۆ هێنانە سەر زمانی گرفتترین بەشی گوفتاری خۆی، وشەیەك بدۆزیتەوە، سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕیو گوێی هەڵخست، لە میانی درەختەکان هەندێ لە پەرەندەکان لە هەولێ خەو دابوون، هەندێکی دیکە لە کاری بێداربوونەوە بوون، پەیتونی زەمان سوورا خۆرەتاوی سەر



بەرەو خوار لەژێر پێی مرۆڤدا خزی، خاخام ئاخێکی هەڵکێشا، چۆن چۆنی رۆژەکان یك لە دوای یەکەوە بەپەلە رادەبرن: ((شەفەق، فەلەق، رابردنی خۆرەتاو، رابردنی مانگ لە دوای مانگ، منالاْن دەبنە پیاو، پرچی رەش سپی دەبێ، دەریا وشك هەڵدەگەڕێ، کێوەکان رووت دەبنەوە، هێشتاش کریست دیار نەکەوتووە))

میێرێ لەحالێکداکە دەنگی دەلەرزی گوتی: ((کوڕی من...کوڕی من..باوکە؟) خاخام بەشەهامەتەوە وەلاْمی دایەوە (میێرێ، ئەو وەکو کوڕانی دیکە نییە)). جارێکی دیکەش وشەکانی خۆی تەتەڵە کردو دوای ساتێ بەمجۆرە بەردەوام بوو ((جارجارە کە شەوانە تەنهایەو بیر دەکاتەوەو کەسێ ئەو نابینێ دەوروبەری رووخساری لە تاریکیدا دەدرەوشێتەوە، میێرێ، خودا لە قسووریەکانم عەفوکات، من کونێکی بچووکم لە دیوار کردۆتەوە دەچمە سەرەوەو لە کونەکەوە تەماشای دەکەمو کارەکانی دەخەمە ژێر نەزەرم..بۆ؟ چوونکە دانی پێدەنێم کە هەموو شتێ لە زەینم ژێرورووبووە، زانیاریەکانیشم یارمەتیم نادەن، شەوو رۆژ کتێبی پیرۆز هەڵدەدەمەوە، بەلاْم ناتوانم تێبگەم کە ئەو کێیەو چ کارەیە، لەبەر ئەمە بەدزیەوە چاودێری کارەکانی دەکەم لە تاریکیدا نورێ کە رووخساری دەلستەوەو دەخوات، دەست نیشانی مەکە بەڵگەی رەنگ پەڕینو تاوانەوەی رۆژ بە رۆژ وەکو یەکە، بەڵێ لەبەر خاتری نەخۆشیو رۆژو پاڕانەوە نییە، بەلاْم گیانی هەمان ئەو نورەیە))

میێرێ ئاهی هەڵکێشاو لەگەڵ خۆی کەوتە ئەندێشەوە ((وای بەحاڵی دایکی کە کوڕێ بهێنێتەوە دونیاوە جیاوازی هەبێ لەگەڵ کوڕانی دیکە))، بەلاْم قسەییێکی نەکرد

پیرەمێرد ئێستاکە بەسەر ئەودا لاربۆتەوەو دەنگی کپ کرد، لێوەکانی گریانی گرتبوو گوتی: ((درودت لێ بێ میێرێ، خوداوەند بەتواناو بەرزە هیچ کەس سەر لە کارەکانی ئەو دەرناکات، رەنگە کوڕەکەت..)) ئاخ لە نیهادی دایکی بەدبەختدا هەڵسا.

_ باوکە رەحم پێ بکە... پەیامبەر؟ نانا... ئەگەر وا بە ژێر قەڵەمی خودادا رەت بووبێ، لێگەڕێ پاکی کاتەوە، حەزم لێیە کوڕەکەم بۆخۆی وەکو ئەوانەی دیکە ببێتە پیاو، هەمان ئەوە نەکەمترو نەزیاتر وەکو ئەوانەی دیکە، بۆ بەدوای کاری باوکی دەکەوێو لاوكو جۆلاْنەو گاسنو کەل وپەلی ماڵ بۆ لە خاچدانی مرۆڤ دروست

نەکات؟ بۆ لەگەڵ کچێکی جوانو جیازدار لە خانەوادەیێکی بەڕێزدا زەماوەند نەکات؟ باشتروایە کارێکی ئازادی هەبێت بەرو منالّ وەبەربێنی، پاشان هەموو لەگەڵ یەك دایە گەورەو منالّو نەوەکان دەچینە پیاسەو هەموو ستایشمان دەکەن.

خاخام بە هاوێشتنە تەواوی کێشی خۆی بەسەر گۆچانەوە لە جێوە هەڵسایەوە، بەتووڕەییەوە گوتی: ((مێریٚ، ئەگەر خودا گویٚ لە قسەی دایکان بگریٚ، هەموو ئێمە لە چلکاوی ئاساییشو ژیانی ئاسودەدا دەڕزین... کە تەنها دەبیت، دەبیٚ دووبارە بیر لە قسەکانمان بکەیتەوە))

مێریٚ بەرەو لای برای مێردەکەی گەڕایەوە، تا شەوباشی لیٚ بکات، یوسف بەچاوانی بریقەدارو تەمگرتوو زمان ئاوێزانەوە، لە حالّێکا هەولّیدەدا قسە بکات چاوی لە بڕیبووە هەواوە.

مێریٚ سەری خۆی راتەکاند ((لە سپێدەوە تا ئێستا بەهەمان جۆر دەستەو یەخەبوو فەرەجیٚ نەهات)) بەم گوتەیە بەلای ئەودا رۆیشت ئاوی لچو لێوی بیقەوارەی ئەوی پاك کردەوە، بەلاٚم لە هەمان ساتدا کە خاخام دەستی بۆ پێشەوە برد بوو تا ئەویش شەو بەخێری مێریٚ بکات، بەدزیەوە دەرگا کرایەوە، بەرووخساری هەڵکروزاوی لە تاریکیدا لە ئاستانەدا بەدیار کەوت، دەستمالّی خوێناوی بەپرچییەوە نووسابوو، بەلاٚم تاریکی شەو دلّۆپەی درشتی ئەشکی دەپۆشی کە هێشتا بەسەر گۆناکانیەوە بوو، خاكو خوێن پێیەکانی حەشاردابوو، لە ئاستانەی دەرگادا رابردو بەپەلە سەیری دەوروبەری کرد،چاوی بەدایكو خاخام کەوت، لە تاریکی نزیك دیوارەوە چاوانی باوکی بوو کە بریقەیان دەدایەوە.

مێریٚ وویستی چرا رۆشن کات، بەلاٚم خاخام لێنەگەڕا، بەزەمزەمەوە گوتی: ((سەیر بکە، دەمەویٚ قسەی لەگەڵ بکەم)) ئەوکاتە دایە بەردلّیو نزیك بۆوە، بەنەرمی لە حالّێکدا دەنگی کز کردبۆوە، تا دایکی نەیبیستیٚ گوتی: ((کریست کوڕم، تاکەی دەتەویٚ لە بەرابەریا داکۆکی بکەیت.؟ پاشان هاوارێکی ترسناك تەواوی کوختەکەی لەرزاند ((تا ئەو کاتەی کە دەمرم)).



کوڕی مێریٚ وەك بلّێی زەڕڕەیەك، توانای لە لەشیدا نەمابوو بەیەکجاری کەوتە سەر زەمین،لە حالّێکا هانکە هانکی بوو، پشتی بە دیوار دابوو، خاخام دەیویست دووبارە قسەی لەگەلّدا بکات: لار بۆوە، بەلاٚم یەکسەر بۆ دواوە هەڵبەزیەوە، وەك بلّێی لە ئاگرێکی مەزندا نزیك دەبۆوەو رووخساری سووتابیٚ، لەگەڵ خۆی کەوتە ئەندێشەوە، ((خودا بە دەوروبەری ئەوەوەیە، بەلّی ئەوە خودایە کە دەوروبەری ئەوی تەسخیر کردوە، مۆلّەتی هیچ کەس نادات لێی نزیك بێتەوە، باشتر وایە بڕۆم)). بە نقووم بوونی لە ئەندێشەوە ئامادەبوو بڕوات، دەرگا داخرا، بەلاٚم مێریٚ جورئەتی نەکرد چرا رۆشن کات، جانەوەرێکی وەحشی لە تاریکیدا لە کەمینی ئەودا بوو، لە ناوەندی مالّیدا لە جێوە مایەوەو بەتقەتقەوە گوێی لە دەنگی بیٚ حاصیلی مێردی دەگرت، کوڕەکەی کەوتبووە سەر زەویو بەوەحشەتەوە هانکە هانکی بوو وەك بلّێی خنکاوە، کەسیٚ خەریك بوو دەیخنکاند، بەلاٚم کیٚ؟ دایکی وێرای بەدبەختی، چنگی هاوێشتە سەر گۆناکانی، دووبارە تەمەننای لە خودا کرد، شکایەتی کردو هاواری کرد ((من دایکم مەگەر تۆ بەزەییت نییە؟ بەلاٚم هیچ کەس وەلاٚمی نەدایەوە، لە حالّێکدا بەبیٚ جولّەو بێدەنگ لەویٚ وەستابوو، دەنگی خورپەی کۆتری دلّی خۆی دەبیست، هاوارێکی وەحشیو پیرۆزمەند بەرزبۆوە، زمانی پیاوە نەخۆشەکە کرایەوە عاقیبەت لە دەمی بیٚ قەوارەی تەواوی وشەکانی دەرپەڕینە دەرەوەو لەسەراسەری مالّدا دەنگی دابۆوە: ((ئە-دۆ-نی-یا!)) وەلیٚ لەگەڵ هاتنە دەرەوەی ئەم وشەیە پیرەمێرد وەك چۆن گەلە هەڵخزیە قولاٚیی خەوەوە.. مێریٚ کۆنترۆلّی دەماری خۆی کردو چرای هەڵگیرساند، شیڤەکە دەکولاٚ.. چووە لای مەنجەڵو ئەژنۆیدا، سەرپۆشی گلینی مەنجەلّی هەڵگرت تا ئەگەر پێویست بوو ئاوو خوێی تێبکات.

## بەشی شەشەم

لەنیوە رەنگی رۆشنی سیمینی سپێدەدا، ناصیرە چووبووە خەوەوەو لە خەوندابوو، لە بەرزایی سەرینەکانەوە، ئەستێرەییێکی سەحەری ناقووسی کۆتاهاتنی شەوی لێدەدا، درەختی لیمۆو خورما هێشتا لەناو پۆششی رەنگ شیندا بوون، سکوتێکی قووڵ بوو، هەتا کەلەشێری رەشیش هێشتا نەیخوێندبوو، کوڕی مێرێ دەرگای کردەوە، چەند تریفەییێکی شین لە دەوری چاوەکانیدا ئەڵقەی بەستابوو، بەلاّم دەستی نەدەلەرزی، دەرگای کردەوە، بێ ئەوەی دووبارە دایخاتەوە یا بۆ دیتنی دایكو باوکی سەیری دواوەی خۆی بکات، ماڵی باوکی بۆ هەمیشە بەجێ هێشت، دوو سێ هەنگاوی هەڵێناو وەستا، سەیری دواوەی خۆی کرد، کەسێك نەبوو، قامچی چەرمینی بزمارنیشانی خۆی لە دووری کەمەری توندکرد، دەسماڵی خوێنینی لەدووری سەری خۆی بەستا، لەکوچە باریكو پێچاوپێچەکاندا سەرەو ژێر بۆوە، سەگێك بەدەنگێکی خەمگین پێی وەڕی، کوندەپەپوێ کە هەستی بە هاتنی رۆژ کردبوو، رایکردو بەسەرسەری ئەوەوە بە ئارامی هەڵدەفڕی، دەرگا داخراوەکانی بەپەلە لە دوای خۆی جێ هێشتو چووە ناو باخەکان، مەلە نەوابەخشەکان هەر زوو لە خەو رابوونو کەوتنە چڕینەوە، لە کەناری ماڵەکەدا باخی پیرەمێردێ بوو لەکارێزەکەوە بە بەکرەی بیر ئاوی دەردەهێنا، رۆژ دەستی پێ کردبوو، ئەو نەجانتای هەبوو نەگۆپاڵو نە



کەوشی چەرمین، جادەکەش دوورو درێژبوو، دەبوایە بە کاناو تەبەریەو مەجدەلو کفرناحوم رەت بێت، بەدەروی دەریاچەی- گنسارت- دا بسوورێتەوە، بچێتە ناو بیابان- ناوبانگی پیاوانی بێ فیزو خوداپەرست لەدێرەوە دەبیتسرا، ئەوان جلی سپیان لەبەر دەکرد، گۆشتییان نەدەخوارد، شەرابیان نەدەنۆشی، خۆیان لەژن دەپارست، بیرو زەینیان پاڕانەوە بوو لە دەرگای خودا، شارەزاییان لەگیاکان هەبوو نەخۆشی جەستەیان چاك دەکردەوە، ئاشنایەتیان لە سیحرو جادووش هەبوو، ئەوانەش کە جنۆکە دەستی لێ وەشاندبوون چاکیان دەکردە، چەندین جار خاخامی مامی بە ئاخ هەڵکێشانی یەك لەدوای یەك قسەی لەبارەی ئەو دێرە پیرۆزەوە بۆ کردووە، یازدە ساڵی عومری بەجلی رەبەنەکان بەسەربردوەو نەخۆشی چاك کردوونەتەوە، بەلاّم ئەفسووس رۆژێ هەرماس- هەڵبەتە ئەویش بەهێزو بەرزە- وەسوەسەی خستبووە دڵیەوە، ژنێکی بینیوەو ژیانی رەبەنێتی تەرك کردوە، کۆنە جلی لەبەر کردبۆوەو ژنی هێنابوو مەجدەلیەی هێنابووە دونیا، حەقی بوو، خوداوەند سزاییێکی عادیلانەی لەدین وەرگەڕاوی دابوو. کوڕی مێرێ لەکاتێکدا پێیەکانی خێراتر هەڵدەگرت لەبەرخۆ کەوتە قسەوە: ((ئەوە هەمان جێگایە کە دەبێ بۆی بچم، لەوێ لەدێردا لە ژێر باڵەکانی خودا پەنهان دەبم)) چەند لەزەت بەخشبوو، لەدوازدە ساڵیەوە تاوەکو ئێستا ئارەزووی بوو ماڵو حاڵی جێ بهێڵێو لە ئەمرو نەهی دایکیو سەروسەدای باوکیو کرێتی رۆژانە رابکات، چوونکە رۆح لەکارتەدەدا، ئارەزووی کردبوو تا خۆی لەگۆڕی جەستە هەڵتەکێنێ، سوکباڵ بێتو لەبیاباندا خۆی پەنا بدات، عاقیبەت ئەمرۆکە هەمووی بەیەك کرێشمە توڕ هەڵدابوو، لەمەداری مرۆڤدا رەهایی دۆزیبۆوەو هەمووگیانو تەنی پەیوەست بەمەداری خودابوو بوو ئەو رزگاری بوو. تەبەشی رەنگ پەڕیوو دەردمەندی لە پڕێکا درەوشایەوە، رەنگە تەواوی ئەو ساڵانە چەنگاڵەکانی خودا ئەوی راگرتبێ تا ئەو بۆ شوێنێ رابکێشی کە ئێستا خۆیَ بە ویستی خۆی ئازاد لە چەنگاڵەکان، بۆلای دەچێ، ئایا ئەوە بەو مانایە نەبوو، کە خواستی ئەو لەگەڵ خواستی خودا یەکتر بگرنەوە؟ ئایا ئەمە گەورەترینو گرفتترین ئەرکەکانی مرۆڤ نەبووە، نەکا مانای بەختەوەری ئەوە بێت؟ دڵی ئارامی گرت، ئیدی هیچ هەواڵێ نەبوو لە چەنگاڵو کێشمەکێشو هەراوزەناکانی دیکەوە، ئەمڕۆ

سپێدە لەکاتی دەرکەوتنی خۆر، خوداوەند پڕ بوو بوو لە سۆزو بەزەیی، وەك شنەییێکی فێنكو لەبار هاتو پێی گوتبوو: ((وەرە بابڕۆین)) دەرگای کردبۆوەو ئێستاش... وای کە چەند دڵنەوازو خۆشبەخشە گەیشتن بە ئاشتی! لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە: ((شایستەی ئەو هەموو بایەخە نیم سەرم هەڵدەبڕمو سروودی رزگاری سەردەدەم)): ((پەروەردگاری من تۆ پەناگاو کونجی منی)) دڵی پڕ بووبوو لە لەززەتو توانای لەخۆگرتنی ئەو هەموو لەززەتەی نەبوو، لە رۆشنایی ئەفسوونگەری سەحەردا بۆ پێشەوە دەچوو، نیعمەتەکانی خوا لە درەختەکانی زەیتونو مێوستانو مەزرای گەنم دەورەیان دابوو، سروودی شادی لە کەمەرگایدا دەردەپەڕیو دەیویست بگاتە ئاسمان، سەری بەغرورەوە بۆ ئاسمان هەڵبڕیو دەمی کردەوە، بەڵام لەپڕێکا دڵی بۆ ساتێ لە خورپە کەوت: دەنگی دوو پێی پەتی بەروونی گوێ لێ بوو کە بەدوای ئەودا لە راکردن بوون، هەنگاوەکانی هێدی کردەوەو، بەدیقەت گوێی قوڵاغ کرد، دوو پێیە پەتییەکانیش دەنگیان هێدیتر بوو، ئەژنۆی شلبۆوەو وەستا. لەکاتێکدا دەلەرزی، کەوتە قسەوە: ((دەزانم کێیە، دەزانم.)). بەڵام دڵی خۆی دایەوەو لەجێوە سوورا، تا بەر لە ونبوون ئەو ببینێ... کەسی لێ نەبوو. ئاسمانی خۆرهەڵات سوور هەڵگەڕابوو، گوڵەگەنم تەواو پڕ بووبوو، قەدەکان سەریان لەهەوای گەرمدا لارکردبۆوە.

لە چاوەڕوانی داس دابوو، هیچ نیشانەیێ لە چ بلەوەڕو رەوەندێ لە جۆهیننان نەبوو، تەنها لە پشتیەوە لە ناصیرە نیشانەیێ لە ژیان بەرچاو دەکەوت، دووکەڵ لە یەکێ لە دوو ماڵەکە بۆ هەوا بەرز دەبۆوەو ژنان خەریك بوون بێدار دەبوونەوە.

تا ئەندازەی هەستکردن بە دڵنیایی لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە، (باشتر وایە کات بە فیڕۆ نەدەم، چاکتر وایە بۆ گومکردنی ئەو تا ئەولای گردەکە راکەم)، دەستی کرد بە راکردن.

لەولای ئەو گەنمە تا بەرزایی سەری مرۆڤ قەدی هەڵکێشابوو، لە هەمان دەشتاییدا، گەنمو مێو شوێنی خۆیان گرتبوو، مێوی کێوی هێشتا دەوروبەری کێوەکانی داپۆشیبوو، دەنگی گاسنی شوێنێ لەو دەوروبەرانەدا بەرگوێ دەکەوت، کەرەکان خۆیان لە زەوی بەرزکردەوە، بۆنیان دەکرد، کلکیان قیت دەکردەوەو دەزەڕین، دەنگی



خەندەو گاڵتەوگەپ کردن گەیشتە گوێی داسە سپی کراوەکان بریقەیان دەدایەوە، یەکەمینی دروێنەکەران گەیشتن خۆرەتاو بە هەڵاتن بەسەر بازوو گەردەنو لولاقی جوانیان پێشوازی کردن، بە دیتنی کوڕی مێرێ کە لە حاڵی راکردندا بوو کەوتنە پێکەنینو، بانگیان کرد:

((ئاهای ئەوە بەدوای کەسێدا دەگەڕێی یا بە دواتدا دەگەڕێن...؟ بەڵام کە نزیکتر بۆوە، ئەویان ناسیەوەو کەوتنە قیلو قالەوەو بە پسەپس کردن سەریان لەبن گوێی یەك نا ((سەلیبساز... نەفرەتی لێ بێ... دوێنێ بینیم کە... لەخاچیان دەدا)).

- ئەو دەسماڵە خوێناویە.

- لەجلی لەخاچدراوەکە ئەوەندەی بەرکەوتووە، ئومێدەوارم کە خوێنی ئەو بێگوناهە دامەنی بگرێت خێرا درێژەیان بەدروێنەیان داو پێکەنین لەقوڕگیان گیری خورادبوو... و بێدەنگ بوون، کوڕی مێرێ بەکەناریاندا رەت بوو سەری لەبەرخۆ نا، لەمەزراکانی گەنم تێپەڕی، گەیشتە مێوستانێ کە سەرنشێوە ئارامەکان کێویان داپۆشی بوو، بەدیتنی درەختی هەنجیر هەنگاوەکانی خۆی سستکرد تا گەڵایێ بڕنێو بۆنی بکات، بۆنی گەڵای ئەو درەختانەی خۆش دەویست، بۆنی ئارەقەی ژێر هەنگڵیان بۆ دووبارە دەکردەوە تەداعی دەکرد، بچووك بوو، عادەتی بوو چاوانی دابخاو گەڵای درختی هەنجیر بۆن بکات، وای ئەندێشە دەکرد کەلە باوەشی دایکیدا مەمکەکانی ئەو هەڵدەمژێ.

بەڵام لەهەمان دەم بۆ قرتاندنی گەڵایێك وەستا، ئارەقەییێکی سارد نیشتە سەرجەستەی، ئەو دوو پێیەی کە بەدوای ئەوەوە لە راکردن بوون، لەپڕێکا وەستا، مووی جەستەی زیك بۆوە، دەوروبەری خۆی پشکنی، خەڵوەت بوو جگە لەخودا کەسێ نەبوو، خاك نمناك بوو، گەڵاکان چکە یان دەکرد، لەقوڵتایی درەختێکەوە پەروانەیەك لە تەقەلادابوو کە باڵە شەونمییەکانی بکاتەوەو بکەوێتە پەروازەوە.

- هاوارێ لە جگەرەوە سەردەدەم تا مەگەر ئارام بێتەوە. هەر زەمانێ کە لە بەرزایی کێوەوە یا دەشتاییێکی جێهێڵراو بۆ نوێژی نیوەڕۆ تەنها دەمایەوە، ئەوە چ هەستێ بوو

که بوونی ئەوی تێژی دەکرد؟ شادومانی، بەدبەختی، یا بالاتر لە هەموو شتێ ترس؟، هەمیشە هەستی دەکرد کە خودا دەوروبەری ئەوی ئابلۆقە داوە، هاوارێکی وەحشی سەردەدا گوایە بەهەولێکی بێ حاصیل ئارەزووی راکردنی هەبوو، تا مەگەر شوێنێ بدۆزێتەوە بۆی راکات. جار جارە وەکو کەڵەشێر بانگیدەدا، زەمانێ وەکو چەقەڵێکی برسی لوولی دەخوارد، جار جارەش وەکو سەگێکی کوتك خواردو دەیلوراند، بەلام ئێستا کە دەمی بۆ هاوارکردن کردەوە، چاوی بە پەروانەیێ کەوت کە لە هەولی کردنەوەی باڵەکانیدا بوو، لاربۆوە بە ئارامی هەڵیگرت، داینا سەر گەڵای درەختێکی هەنجیرو خۆرەتاو کەوتە گەشانەوە بە سەریا، بەبنی لێویەوە گوتی: ((خوشکی من خوشکی من)) بەمیهرەبانیەوە سەیری کرد. پەروانەکەی لەجێ دانا تا گەرم بێتەوەو خۆشی جارێکی تر کەوتەرێ، چەند هەنگاوێ لەدوای خۆیەوە یەکسەر دەنگی کپی پێ پەتییەکانی بەسەرخاکی نماکەوە کەوتە بەرگوێ، کاتێ کە (ناصیرە)ی جێدەهێشت، لەسەرەتادا دەنگی پێی ئەو ژنە سووك بوو، وەك بڵێی لەدوورەوە دەهات، هێدی هێدی جورئەتی دەهاتە بەر، نزیکتر بوو بوو، کوڕی مێرێ بە لەرزێکەوە لەگیانی، کەوتە ئەندێشەوە ((هەر زوو دەگات بەبنی لێویەوە گوتی: ((خودایە کۆمەکم بکە تا بەر لەگەیشتی ئەو زووتر بگەمە دێرەوە)) خۆرەتاو ئێستا سەرتاسەری دەشتایی گرتووە بەسەرسەری بلەوەڕو خەڵکدا هاتۆتە خوارەوە، دەنگی تێکەڵو پێکەڵ لە زەوی بەرز دەبۆوە، دەوروبەری کێو، بەرخو مەڕ هاتبوونە جوولەو شوانەکان شمشاڵی خۆیان دەژەنی: دونیا کەهیو بەرەو شارستانیەت دەچوو، چەند ساتێکی دیکە، بە گەیشتن بەو ئەسپێندارە بەرزە لەلای چەپەوە، لەبەر چاوی، کانای دەبینی هەمان ئەو گوندە شادو شەنگوڵە کە ئەوەندەی خۆش دەویست، کاتێ کە مووی لە رووخساری هاتبوو، بەر لەوەی کە خودا بە چەنگاڵەکانی خۆی لێ بەرێتە خوارەوە، چەندان جار لەگەڵ دایکی بۆ بینینی جەژنو زەماوەند هاتبووە ئێرەوە، چەندین جار لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، ئەو کچانەی پەسنی بوو کە لە ژێر هەمان ئەو ئەسپێندارە بالابەرزو گەورەیەدا سەمایان دەکرد زەوی شادیان لەژێر پێی خۆیان دەخستە لەرزەوە. بەلام جارێکیان زەمانێ کە بیست سالان بوو لەژێر ئەو سپێندارە هانکە هانکی بوو، بەخۆو بە تاجە گوڵی دەستیەوە،.. کەوتە لەرزەوە، لەپڕێکا کە داغی هەزاران ماچی نهێنی



بەسەر لێوەکانیەوە بوو، دیتی جارێکی دی لەبەر دەمیا وەستاوە، خۆرەتاوو مانگ، یەکیان لەلای راستو ئەویتر لەلای چەپەوە، لە مەمکەکانی ئەودا خۆیان حەشارداوە، رۆژو شەو لەپشتی سینەی شەفافیەوە لەهەلاتنو ئاوابوون دابوون، هاواری کرد ((بەرەلام کە، وازم لێ بێنە، من کراومەتە دیاری خودا، لەبیابانەدا وادەی دیتنیم هەیە)) بەپەلە لە ئەسپێندارەکە رەت بوو، لەپڕێکا کانا لەبەر چاوی ئەودا کراوەتر بوو: خانووە نەویەکان کە بە قسل سپی کرابوون، سەکۆ خڕەکان کە بەگەنمە شامیو کودیو زەردین سواخ درابوون کچانی تولاز بەپێی پەتیەوە، فولفلی سووریان بە داوەوە دەکرد، تا ماڵەکانیان بڕازێننەوە، بەچاو بەرەو ژێرکردنەوە لەو داوە هەرماسیە رایکرد، نەیدەخوازی کەسێ ببینێ، دەنگی بەرزی پێی راکردووی خۆی بەسەر تاشەبەردەکانەوە لە دواوەی خۆی دەبیست، ئەوانیش هەر بە پەلەبوون، خۆرەتاو سەرهەڵگەڕاو زەوی داپۆشی، دروێنەکەران لە حالێکدا بە شادومانی گۆرانیان دەچڕی، داسەکانیان بەتەواوی مەهارەتەوە دەخستەکارەوە، قەدەکانیان باقە باقە دەکردو هەڵیاندەپاچی باقەکانی دروێنەکراویان لە خەرمانگادا بەسەریەکەوە دادەناو هاواریان دەکرد، کوڕی مێرێ بەهەمان شێوە دەچووە پێشەوە، بەپەلەوە ئارەزووی بەرەکەتی بۆ ئەوان دەکرد: ((خەرمان بەرەکەت)) کانا لەپشت زەیتونستاندا ون بوو، سێبەر کەوتبووە سەر ریشەی درەختەکانەوە، نزیك نیوەڕۆ بوو، کوڕی مێرێ لەهەمان حالدا کە لەززەتی لەدیمەنی دەوروبەر وەردەگرت، زەینی خۆی پەیوەستی خودا کردبوو، لەپڕێکا بۆنی خۆشی نانی تازەی کەوتە بەر لووت بەیەکجار هەستی بەبرسیەتی کردو تێژی شادومانی بوو، چەندین سالە کە هەستی بە برسیەتی کردووە تاسوقێکی وا پیرۆزتی بۆ نان ئەزمون نەکردبوو، بەلام ئێستا... کونەلووتەکانی بۆنی هەوایان دەکرد، بە بەدواداچوونی ئەو بۆنە خۆشە، بەدرێژایی قولتاییەکدا دەڕۆیشت، بەسەر پرژینێکەوە هەڵگەڕاو چووە ناو مێوستانێ، کوختەییێکی لەژێر درەختێکی زەیتونی کلۆر دۆزیەوە، دوکەڵ لەسەربانی کاگلێدا بەرزدەبۆوە، ژنێکی پیر لاربۆوەو نانی لە تەنوورێکی خشتینی بچووکدا کە لە ڕاڕەوی کوختەکەدا بوو دەردەهێنا، چالاك بوو لووتی لەشیشەی کەبابێ دەچوو چاوەکانی بێ برژانگ بوون، لە کەناریا سەگێکی رەشی زەردخاڵ، پەنجەکانی لەپی خۆی لە کەناری تەندووردا درێژ کردبوو، دەمی پڕ

ددانی بۆ کەپکەیەك وەکو جەوال کردبۆوە، هەرکە گوێی لەدەنگی پێ بوو لە مێوستاندا، کەوتە حەپینەوەو بۆلای کابرا هێرشی کرد، پیرێژن بەسەرسامییەوە گەڕایەوە، بەبینینی گەنجەکە چاوە وردەکانی درەوشانەوە، خۆشحاڵ بوو، بەوەی کە پیاوێ هاتۆتە لای‌و دەستی لەکار هەڵگرت، گوتی:

- بەخێر بێی. برسیتە؟ تۆو لوتفی خودا لەکوێوەوە دێی؟

- لەناصیرە...

پیرێژن بەخەندە پرسی: ((برسیتە؟))

- بەڵێ برسیمە، ببوورە

بەلاّم پیرێژن کەڕبوو نەیبیست. ((چی؟ دەنگت بەرزتر بکە)).

- ببورە برسیمە

- ببوورم؟ بۆ کوڕەکەم، برسیەتی‌و تێنوێتی‌و ئەڤین هیچ شەرمی ناوێ، هەمووماڵی خودایین، ئێستا وەرە پێش‌و شەرم مەکە، دووبارە پێکەنی‌و تاکە ددانەکەی بەدیارکەوت...

- ئاوو نان لێرەیەو ئەڤین لەوێ لەمەجدەلە. نانێکی کە لەگەڵ نانەکانی دیکە بەسەر چوارپایەیێکی بەردینەوە لەکەنار تەنوورەکەدا قەرای گرتبوو هەڵگرت ((تەماشاکە هەر جارەی کە تەنوورەکە دەردەدەمەوە ئەو نانە بۆ ڕێبواران دادەنێم، ناوی ((نانی کلۆ))م لێناوە، هی من نییە هی تۆیە، پارچەیێ هەڵگرەو بخۆ)) کوڕی مێرێ هەستی بە ئارامی کرد، بەسەر ریشەی کۆنی دار زەیتونەوە دانیشت‌و دەستی بەخواردەن کرد، نانێکی چەند بەتام‌و خۆشمەزە بوو! ئەو دوو دانە زەیتونەی کە پیرێژن بەوی دابوو تا لەگەڵ نانی بخوات چەند شیرین بوون! هێشووی، ناوکی زەیتونەکە کە ورد بوو، وەکو سێوی درشت‌و گۆشتین بوو، بەئارامی دەیجووی‌و قووتی دەدان، هەستی دەکرد جەستەو ڕۆحی پەیوەستی یەك بووبوون، نان‌و زەیتوون‌و ئاوی لەیەك دەمدا دەگێڕان‌و شادیان دەکردو قووت دەدران، بۆ ئەو بەختی دەهێنا، بەخەندەوە گوتی: ((راستی



راستی برسی بووی بخۆ، تۆ گەنجی... ڕێگاییێکی درێژت لەپێشە، ئازارەکان کۆتاییان نییە، بخۆ تا گیانت وەبەربێ‌و بەرگە بگری گۆشەی نانێکی دیکەی هەڵپاچی‌و لەگەڵ دوو زەیتوونی دیکە دای بەو، لەچەگی لەسەر بۆوەو، سەری نیوە کەچەڵی کەوتە بەر تەماشا، بەپەلە لەچەکەکەی دووبارە خستەوە سەری‌و پرسی: ((بەلوتفی خودا بۆ کوێ دەچیت؟))

- بیابان.

- کێندەرێ، بەرزتر بڵێ

- بیابان

پیرێژن دەمی بێ ددانی هەڵگێڕو وەرگێڕکرد، چاوەکانی حاڵەتێکی وەحشیان گرتە خۆو بەتۆڕەییێکی چاوەڕوان نەکراو نەڕڕاندی: ((دێر؟ بۆ؟ چ کارت هەیە لەوێ؟ ڕەحم بەگەنجێتیت ناکەیت؟))

کوڕی مێرێ هیچی نەگوت، پیرێژن سەری تاسی تەکاندو وەکو مارێ کەوتە کیفەوەو بە پەلار لێدانەوە گوتی: ((دەتەوێ خوا بدۆزیەوە، بەڵێ؟ گەنجەکە بە دەنگێکی کز گوتی: ((بەڵی)). پیرێژن لەقەییێکی لەسەگەکەدا، کە بەپێی - ئەوەوە نووسابوو، لە گەنجەکە وەنزیك کەوتەوە، هاواری کرد: ((هەرماسی بەدبەخت، تۆ نازانی خوا لەدێرەکاندا پەیدا نابێ، بەڵکو جێگای لە ماڵی مرۆڤەکاندایە، هەر شوێنێ کە ژن‌و مێردێکی لێ بێ، خوداش لەوێیە، لە هەر شوێنێ کە منالّە ورتکەو چێشتلێنان‌و شەڕو ئاشتی هەبێ، خوداش لەوێیە، گوێ لەو خواجانە مەگرە، هێشووی تاڵ... هێشووی تاڵ! ئەو خودایەی کە من باست بۆ دەکەم خودای مالاّنە نەك دێرەکان، خودای حەقیقی هەر ئەوەیە، دەبێ هەمان ئەو خوایە بپەرستی‌و خودای تر بۆ ئەو گەمژەڵ‌و تەمبەڵ‌و ئەبتەری بیابان جێبهێڵی. پیرێژن هەر چەند زیاتر قسەی دەکرد زیاتر جۆشی دەگرت، قسەی دەکردو هاواری دەکرد، کە تۆڵەی خۆی سەندەوە ئارامی گرت بەلاواندنەوەی شانی گەنجەکە گوتی: ((گچکەلاّنە ئازاکەی من، لەمن ببوورە، زەمانێ کوڕێکم هەبوو، وەکوتۆ باش، ڕۆژێکیان سپێدە ئەقڵی لەدەستدا، دەرگای

کردەوەو چووە دێر بۆ سووراغی شفا بەخشەکان، هەی ئاگریان لەعومربەر بێ، ئومێدەوارم هەتا زیندوون کەسێ بەوان چارەسەر نەکرێ، کوڕم لەدەستدا، ئێستا تەنووری پڕ دەکەمو خاڵی دەکەم، نانی کێ بدەم؟ مناڵەکانم، نەوەکانم؟ من درەختێکی وشکەوەبووی بێ ئومێدم)) ساتێ وەستا تا ئەشکی چاوەکانی وشك کاتەوەو دووبارە دەستی پێ کردەوە (ساڵانێك دەستم بۆ خودا درێژ کرد، هاوارم کرد: ((بۆ منت هێنایە دونیا؟ بۆ کوڕی تاقانەت لە من سەند؟ هەر هاوارم دەکرد، بەڵام گوێچکەیێ نەبوو بمبیستێ).

تەنها یەکجار بینیم دەرگای ئاسمان کرایەوە، نیوەشەوبوو بەسەر ترۆپکی کێوی ئەلیاس پێغەمبەرەوە دەنگێکی بروسکە ئاسام بیست. ((تا ئەو شوێنەی کە پەیوەست دەبێ بەمن، هەرچەند دەتوانی هاواربکە. پاشان ئاسمان دووبارە داخراوە، ئەوە دواجار بوو کە بانگی خودام کرد.)). کوڕی مێرێ هەڵسایەوە سەرپێ دەستی درێژ کرد تا ماڵاوایی لە پیرێژن بکات، بەڵام ئەو دەستی کێشایە دواوە، وەکو مار دووبارە دەستی کرد بە کیفەکیف، ((تۆ گوتت دەچمە بیابان؟ دروستە تۆش هەم عاشقی زیخی، ها؟ وەڵێ گچکەلانەکەم، چیت لەچاوت کردووە؟ مەگەر مێوستانو هەتاوو ژنان نابینی؟ واپێت دەڵێم بڕۆ بۆ مەجدەل، تۆ بەوێوە پەیوەستی تا ئێستا کتێبی پیرۆزت خوێندۆتەوە؟ خودا دەڵێت: (ڕۆژوپەرستنم ناوێ، گۆشتم دەوێ)). بە دەستەواژەییێکی دیکە ((خودا لەتۆی دەوێ کە مناڵ وەبەربهێنی!)). کوڕە گونجەکە گوتی: ((خوا ئاگادارت بێت، بەخاتری میوانداریت خودا جەزای چاکەت بداتەوە)) پیرێژن کە ئارامی گرتبوو وەڵامی دایەوە: ((خودا پاداشتی تۆش بداتەوە، ئومێدەوارم بەخاتری ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ منتدا کردووە، خودا پاداشتی چاکەت بداتەوە، ساڵانێك بوو کەسێ بە تەك ئەو کوختە خەرابەیە ڕەت نەبووبوو، ئەگەر کەسێکیش لێرەوە ڕەت بووبێ ئەوە پیر بووە.)). کوڕی مێرێ، دیسان گەڕایەوە نێو مێوستانو بەسەر پەرژینەکە بازیدا پێی نایە ڕێی ئەسڵیو لەبەرخۆ کەوتە ورتەوە:

- بەرگەی دیتنی مرۆڤ ناگرم، نامەوێ بچمیان ببینم هەتا ئەو نانەی کە بە تۆی دەدەن ژەهرە، تەنها یەك ڕێ ڕاستە کە دەگاتە خوا ڕێگاییێ، کە ئەمرۆ هەڵمبژاردووە:



ڕێگاییێکە بێ تەماسی مرۆڤەکانە، بەنێو ئەواندا ڕەتدەبێو دەگاتە بیابان، ئاخ کەی دەگەم؟ وشەکانی هێشتا ون نەبووبوو، کە خەندەیەك لەپشتی سەریەوە سەری هەڵدا، بەهەراسانیەوە گەڕایەوە، خەندەییێکی دەرپەڕیو لەدەمێکی بێ ددان، هەوای وەبەریەکدا،: خەندییێکی کیفکار، خەنیمئامێز بەدخو ((ئەدونیا... ئەدونیا)) هاوارێ بوو کە لە گەروی پەستراوی دەهاتە دەرەوە، لە حاڵێکا کە مووی لەشی زیك بووبوونەوە، ڕوانیە هەوای قاقاچڕەوە، پاشان بەحاڵەتێکی شێتامێز دەستی بەراکردن کرد، یەکسەر دەنگی پێی ڕاکەرەکەی لەدوای خۆیدا بیست: ((لەهەر کوێیەك بن، هەر زوو دەگەنە من)) بەورتەوە ورتەوە ئەم قسانەی دووبارە دەکردەوە. ژنان هێشتا دروێنەیان دەکرد، پیاوان باقەچنی گەنمیان لەسەر چۆخین کەڵەکە دەکرد، تۆزێ دوورتر، ئەوانی دیکە دەستیان کردبوو بەشەنەبا کردن، لەحاڵێکدا کە دەنکە گەنمە سەنگینەکان جیا دەبوونەوە، لەخەرماندا جۆخینیان دەکرد، شنەییێکی گەرم کاوپوشەکانی دەگرتو زێڕی زەردی هەڵدەپڕژاندە زەویەوە. ڕێبواران مشتێ گەنمیان دەگرتو ماچیان دەکرد، ئارەزووی بەرهەمێکی چاکی تریان بۆ خاوەنی بەرهەم دەکرد لە ساڵی ئایندەدا. لەوان دەوراندا لەباوەشی دوو گردۆلکەدا، تەبەریەی بت پەرست بە هەیبەتەوە، نووساو پڕ لە پەیکەرو نمایشخانەو ژنانی ڕەنگو ڕوو چەورو دانیشتوو، بینینی ئەوانە، کوڕی مێرێی تژی هەراسانی دەکرد، زیاتر لەمنداڵێکی بچووك نەبوو کە لەگەڵ خاخامی مامی هاتبووە ئێرەوە، مامی ئەویان بۆ ڕزگارکردنی ژنێکی بەنەژاد ڕۆمیو نەسەبدار بانگ کردبوو تا لە چەنگاڵی جنۆکەکاندا ڕزگاری بکات، لەڕوودا جنۆکەکەی- مەرگ- بوو چووبووە جەستەی، چوونکە ڕووتو قوت دەچووە خیابانو ڕێی ڕێبوارانی دەگرت، خاخامو برازاکەی ئەوکاتە گەیشتبوونە کۆشکی ئەو کە خانمی بەڕێز دووبارە جنۆکە دەستیان لێوەشاندبوو، بۆڵای دەروازە ڕای دەکردو کۆیلەکانیش بەدوایدا ڕایاندەکرد، خاخام بە گۆپاڵی خۆی پێشی لێ گرتبوو، بەڵام لەهەمان دەم کە کوڕەکەی دی خۆی هاوێشتتبووە سەریەوە، کوڕی مێرێ هاوارێکی کردبوو بورابۆوە، لەو کاتە بەدواوە ئیدی ئەو شوێنە بێ شەرمەی دەکەوێتەوە بیر، لەبەر خۆیەوە دەلەرزی، خاخام هەمیشە بەوی دەگوت ((خوداوەند غەزەبی لەوشارە گرتووە، هەرکات کە بەو ڕێیە ڕادەبووری، بڕوانە زەویو لە یادی مەرگ بە، یا سەیری

ئاسمان بکەو لەیادی خودا بە، ئەگەر دوعای خێرت دەوێ، هەرکات سەفەر بۆ (کفرناحۆم) بکەیت ڕێگاییێکی دیکەبگرەبەر، بتپەرستی ئاشوبکار ئێستاکە لەژێر نوری خۆرەتاودا پێدەکەنێ، خەڵك بە ناو دەروازەی دەچنە ژوورەوەو دێنە دەرەوە، لە بەرزایی ماڵەکەیدا چەند پەرچەمێك کە نیشانەی بازی دووسەری پێوەیە دەشەکێتەوە، چەکی برۆنزی بریقەی دەداتەوە، کوڕی مێرێ جارێکیان جەستەی مانگاییێکی بینی بوو کە لەناو زۆنگاوێکی سەوزی دەرەوەی ناصیرە کەوتبوو، هەڵمسابوو پێستی وەکو تەپڵ تا رادەی قەڵشتی بوون لەبەریەك کشابوو، لەشکری قرژاڵو چسنەکان لەناو ورگی کراوەیدا، کە پڕی بوو لە گەندو پیسی، لەهاتنە دەرەوەو چوونە ژوورەوەدا بووە، مێشەکەرانەی گەورە لەرەنگی سەوزی زێڕیندا وەکو ئاپۆڕەی هەور لەهەواداوزەوزیان دەکرد، دووقەل چەنگاڵی تیژی خۆیان لەناو چاوی گەورەو درشتی ماین ئاسا بردبووە خوارەوەو دەریاندەهێنا، جەستەکە جیلوەییێکی تایبەتی هەبوو، لەبەرەکەتی بوونو هەبوونی گەزەندەکانی ناوەوەو دەرەوەی وەك بڵێی دووبارە گەڕابۆوە ژیان، مرۆڤ بیری دەکردەوە کە لەمیانی گیاوگۆلی بەهاریدا لەخۆشیان دەگەوزێ، خۆیو ئەو چووارسمە ناڵ دارەی کە بۆلای ئاسمان بەرزبووبۆوە، تەواو رازی بوو. کوڕی مەریم کە نەیتوانی بوو چاو لە شاری تابان هەڵگرێ بەزەمزمەکردنەوە گوتی: ((تەبەریە وایە، وەکو جەستەی ئەو مانگایە، سەدومو گەمورەش هەروایە، رۆحی گوناهکاری مرۆڤیش)) پیرەمێردێکی هەیکەل بەهێزو پڕ پێ بەپێی کەرەکەی رەت بوو، کریستی بینیو وەستا پرسی: یارو بۆ وامات بووی، مەگەر نایناسی؟ شاکچی تازەی ئێمەیە: تەبەریەی بەد، یۆنانیو رۆمیو چۆلنشینو کلدانو قەرەجەکان و یەهودیەکان سواری دەبن، هێشتانیش تێر نابێ، دڵی زیاتری حەز لێیە، دەبیستی چی دەڵێم؟ دوو دوو تا چووار تا؟ لەناو توورەگەکەی مشتێ گوێزی هەڵگرتو دای بە کریست، گوتی: ((وا دێیتە بەرچاو کە مرۆڤێکی چاكو شەرافەتمەندو بێ وەی بیت، ئەوانە بگرەو لە ڕێگە بیخۆ، قەت لەبیر نەکەی بڵێی کە خوداوەند رزقی زوبەدی پیری ئەهلی کفرناحوم بەرفراوانتر کات)) ردێنی دوو فلیقانەی یەکپارچە سپی بوو لێوەکانی ئەستوورو هەوەسناك بوون، ملی کورتی لەملی مانگا دەچوو چاوانێکی مەڕ ئاسای دڕندەخووی هەبوو، هەڵبەت ئەو جەستە خەپەو قەڵەوە لە شوێنی خۆیدا باشی خواردووەو



خواردۆتەوەو ماچ کردووە، بەڵام هێشتا هەر قانیع نەبووبوو، دێوێکی بێ شاخو کلکێکی پڕ پەشم گەیشت، دوگمەی کراسی کرابۆوەو ئەژنۆکانی رووت بوون، گۆپاڵێکی چەماوەی شوانانی لەدەستدابوو، وەستاو بێ ئەوەی سەلامێ لە پیرەمێرد بکات رووی لە کوڕی مەریم کرد: ((جەنابعالی تۆ هەمان کوڕی نەجاڕی خەڵکی ناصیرە نیت؟ جەنابعالی هەمان ئەو کەسە نیت کە سەلیب دروست دەکەیو لەخاچمان دەدەیت؟)) دوو پیرێژن کە لە مەزرای بەرامبەردا بوونو دروێنەیان دەکردو دیقەتیان دایە قسە کردنەکەو گەیشتن. کوڕی مێرێ گوتی: ((من... من.)). ویستی بڕوا کابرای دێوی بێ شاخو کلك بەگرتنی بازووی ئەو هاواریکرد: ((بۆ کوێ تەشریف دەبەی؟ وابە ئاسانی ناتوانی لەچنگم قورتارت بێ! سەلیبساز، خیانەتکار دەتکوژم.)).. بەڵام پیرمێردی قودرەتمەند گۆپاڵی گرتەدەستو شوانەکەی لە چنگی دەرهێنا، گوتی: ((فیلیپ سەبر بکە، گوێکانت باش بکەوە... تەماشاکە پیرمێرد چ دەڵێت، دەتوانم تکا بکەم کە وەڵامی پرسیاری من بدیتەوە ((مەگەر وانییە هەرچیەك لە دونیا روودەدات خواستی خودایە؟))

- دروستە زوبەدی

- زۆر باشە لەم حاڵەتەدا ئەوە خواستی خودایە کە ئەو کەسە خاچ دروست بکات. لێی گەڕی با وشەییێکی دیکەش بڵێم گوتویانە: کەسێکی کەسە یەك ئەلفی بەسە، باشتر وایە کە مرۆڤ دەخالەتی کاری خودا نەکات.

- دوو دوو تا چووار تا !!

لەو بگرەوبەردیەدا کوڕی مێرێ خۆی لەچەنگی مرۆڤە نەکیرەکە رەها کردو بەیەك باز تێی تەقاند، دوو دروێنەکەری پیر بەدوای ئەودا دەیانقیژاندو داسی خۆیان بەهەڕەشەوە رادەتەکاند، دێوی بێ قۆچو کلك گوتی: ((زوبەدی بابڕۆین دەستمان بشۆین چوونکە دەستمان بەخاچ سازکەوتووە، بابڕۆین ئاولە دەممان وەربکەین، چوونکە قسەمان لەگەڵ ئەو کردووە)). پیرمێرد گوتی: ((نیگەران مەبە، لێرە راناوەستین لەگەڵ مندا وەرە... پەلەمە، کوڕەکانم هەریەکەو بۆلایێ چووینە، یەکێکیان بۆ دیتنی لەخاچدان چۆتە (ناصیرە)و خۆی وایدەگوت، وادێتە بەربەرچاوم کە ئەو یەکیانیش

چۆته بیابان تا ببێته مرۆڤێکی پیرۆز، باشە ئێستا خۆمو قایغەکانی ماسیگری خۆم ماوینەتەوە، وەرە یارمەتیم بدە تا دەریبهێنین تا ئێستا رەنگە پڕبوو بن، پڕ بە یەك مەنجەل ماسیت دەدەمێ، کەوتەڕێ، کەیفی کۆك بوو، بەخەندەوە دەیگوت ((ئەی خودا گیان، بیری لێ بکەوە، کە خودای پیری بێچارە دەبێ چ بکوژێ، کاتێ دونیای خولْقاند حەتمەن خۆی هاویشتۆتە ناو گرفتاریەوە، ماسی هاواری دەکرد: ئەی خودا کوێرم مەکە، لێنەگەڕێی بکەومە ناو تۆڕەوە، ماسیگر هاواری دەکرد: خودایا ماسییەکان کوێرکەیو ناچاریان بکەی بێنە ناو تۆڕەوە، باشە خوا گوێ لەکامیان بگرێت؟ جارێك گوێ لەقسەی ماسی رادەگرێو جارێکیش قسەی ماسیگر، بەم جۆرەیە کە دونیا دەسوورێت. کوڕی مێرێ، لەهەمان کاتدا بەدرێژایی سەرەو نشێوی بەرێ کەوتبوو تا لە مەجدەل پارێز بکات، نەیدەیوست ئەو گوندە ئەفسووناویە دەست کراوە بەلاّم پیس دامەنی بکات، گوندێ کە لەنێو درەختەکانی خورمادا کەوتبووە سەر رێگای کاروانچیان شەوو رۆژ بەوێدا تێدەپەڕن، هەندێ لە بیابانی عەرەبی کە بەرەو دەریای عەرەبی دەڕۆیشتن هەندێکی دیکە لە شام یا حەبەشە کە مەبەستیان-پێخەفی سەوزو ئارامی نیل بوو، لەکەنار دەرگای چوونە ژوورەوەی دێدا کانیاوێکی فێنك هەبوو، بەسەر لێواریەوە ژنێکی سووراوچنو چەورین خۆیو سینەیێکی رووتو قووت دادەنیشتو بەرووی بازرگانان پێدەکەنی، خۆزگەم بە راکردن، رێ گۆڕین، راستەوخۆ رێ بڕین بەرەو دەریاچەو گەیشتن بەبیابان! لەوێ لەناو چالێکی وشك خودا دانیشتبوو چاوەڕوانی دەکرد. بە یادهێنانەوەی خودا دلّی پڕبۆوەو هەنگاوەکانی توندتر کرد، لە کۆتاییدا خۆرەتاو رەحمی بەکچانی دروێنەکەر کردو دەستی بەئاوابوون کرد، هەوا فێنك بوو، کچانی دروێنەکەر بەسەر گیادا لەسەر پشت راکشان تا هەناسەیان تازەکەنەوە بۆ لەناوبردنی ماندوویی خۆیان مەتەلّ بلّێین، لەبەر کارکردنو ئارەقەهەلّڕژتن بەدرێژایی رۆژ لەژێر هەتاو بەسینەی بازەوە لەکەنار پیاواندا کە ئەوانیش ئارەقەیان هەلّدەڕشت گڕیان گرتبوو، ئێستاش لەناو گالّتەبازیو خەندەدا خۆیان فێنك دەکردەوە، کوڕی مێرێ فشەبازییەکانی ئەوانی بیست، سوورهەلّگەڕا، بەبێ تاقەتی، بۆکاتێك کە ئیدی دەنگی مرۆڤ نەبیست، بیری خۆی سەنتەر کردە لای شوێنێکی دیکە- لەزەینی خۆیدا دەستی کرد بە هەلّگێڕو وەرگێڕی قسەکانی فیلیپ،



ئەوشوانکیلە بێ ئەدەبە، بەئاخێکەوە بە زەمزەکردنەوە گوتی: ((کەس تێناگا چ عەزابێ دەکێشم، هیچ کەس نازانێ بۆخاچ دروست دەکەم، لەگەلّ چ کەسێکدا لەحالّی کێشمەکێشدام. ((لەبەردەم خانووێ دوو جوتیار پوشو کایان لەسەرو ریشی خۆیاندا دەتەکاندو خۆیان دەشوشت، وادەهاتە بەرچاو برا بن دایکی پیریان شامی هەژارانەی بەسەر قەفەزەبەردێکەوە لەکەنار تەندووردا راخستبوو. گەنمەشامی بەسەر رەژوودا دەبرژاند، بۆنی خۆشی فەزای پڕکردبوو جوتیارەکان کوڕی مێرێیان بینی، ماندوو تۆزاوی بوو، سکیان پێ سووتا، بانگیان کرد: ((ئاهای ئەو هەموو پەلەیە بۆچییە، وادێتە بەرچاو کە لە رێگەیێکی درێژەوە هاتبێت، تێشووی سەفەریشت نییە، وەرە لێرە تۆزێ بحەسێوە لەگەلّ ئێمە لوقمەیێ بخۆ)). دایکە گوتی: هەروەها گەنمەشامیش)).

- تۆزێ شەراب بخۆ تا رەنگوڕووت بێتەوەبەر. کوڕی مێرێ بە تێپەڕین بەتەکیانەوە وەلاّمی دایەوە: ((برسیم نییە شتێکم ناوێ، مەمنونم)) لەبەرخۆ گوتی: کە تێبگەن من کێم لەوەی کە لەشم بەلەشیان بکەوێو لەگەلّم قسە بکەن هەست بەشەرم دەکەن. یەکێ لەبراکان بانگی کرد: ((بۆ کەللەی کەرت نەمری، وەك بلّێی شەرمت بەخۆیە لەگەلّ ئێمە نان بخۆی!)) کریست ویستی وەلاّم بداتەوەو بلّێ: ((من سەلیبسازم)) زاتی نەکرد، سەری لەبەرخۆ ناو کەوتە رێی خۆیەوە. عەسر وەك شمشێرێك دابەزی، بەرلەوەی گردۆلّکەکان هەلی رۆشنایی سووری گولّڕەنگ بەدەست بهێنن، خاکیان ئەرخەوانی هەلّگەڕاندو یەکسەر رەش هەلّگەڕا، رۆشنایی کە چووبووە ترۆپکی درەختەکانەوە، هەلّبەزیە ئاسمانو گوم بوو، تاریکی کوڕی مێرێی لەبەرزایی گردەوە گرتەخۆ، لەوێ درەختی سەرونیازنیازی کۆنەسالّ رەگاژۆ بووبوو، سەرەڕای بوونی قامچی بایەکانو شکەنجەی هەمیشەیی، هێشتاکەش لەوێ بزمارکوت بووبوو، رەگو ریشەی لەتاوێرەبەرد چوو بووە خوارەوە، بۆنی گەنمو داری سووتاو لەدەشتایی خوارەوە دەهاتە سەرەوەو لە کوختەکاندا پەرشو بلاّوبوونەوەی دووکەلّی خۆراك بەرزبوو بۆوە، کوڕی مێرێ تینوو برسی بوو، بۆ ساتێکی کورت حەسوودی بەو کارگەرانە برد کە بەدرێژایی رۆژ کاریان کردبوو و ماندوو مردو دەگەڕانەوەو برسیەتی خۆیان دەهاوێشتە ناو کوختەوە. لەدوورەوە رۆشنایی ئاگرو بەرزبوونەوەی دوکەلّو ژنەکان کە

شامی شەویان ئامادە دەکرد بینی، لەپڕێکا زیاتر لە هەمیشە خۆی تەنهاو تەنها هەست پێکرد، تەنهاتر هەتا لە ڕێویو کوندەپەپوەکان، لانی کەم ئەوان کولانکەیێکی گەرمیان هەیەو چ بوونەوەرێکی ئازیز چاوەڕوانیان دەکردن، ئەو کەسی نەبوو، هەتا دایکیش، لەژێر درەختی سەرونیازنیازودا دانیشتو خۆی گلۆلە کرد... خەریك بوو دەلەرزی. لەبەرەخۆ زەمزەمەی کرد: ((پەروەردگارا، بۆ هەمووشتێ سوپاسی تۆ دەکەم، لەبەر خاتری تەنهاییو برسیەتی، سەرما، هیچم کەم نییە)). بەلاّم بە گوتنی ئەم وشانە، هەستی بە زولّم کرد کە دەرهەقی دەکرێت، وەکو ئاژەلّێکی گرفتار سەیری دەوروبەری کرد، لاجانگەکانی لەبەر تووڕەییو ترس وەکو تەپل دەنگیان دەهات، بەهەلّسانەوە سەر ئەژنۆکانی چاوی بڕیە چاوە باریکەکانەوە، هێشتاکە دەنگی پێی پەتی دەبیسترا، بەردەکانیان دەڕەتاندو سەرهەلّدەگەڕان، عاقیبەت گەیشتنو ئەوکاتە کوڕی مەرەیەم بەبیستنی دەنگی خۆی، بەبێ ئیرادە کەوتە ترسەوە، هاواری دەکرد: ((خانمی من، وەرە نزیکتر، پەنهان مەبە، ئێستا شەو داهاتووە کەس تۆ نابینی، خۆت ئاشکراکە. هەناسەی خۆی راگرت لە چاوەڕوانیدا مایەوە، شتێ جگە لە دەنگی جاویدانەی شەو نەبوو، کە بە نەرمیو ئارامییەوە بەرز دەبۆوە هەواوە، زنجیرو کلۆو سەگو مەگەزەکان ئاخیان هەلّدەکێشا، لە دوورترێکەوە، سەگان ئەو شتانەی کە چاوی مرۆڤ نایانبینێ لەتاریکیدا دەحەپین، سەری بۆ پێشەوە درێژ کرد، دلّنیابوو کە کەسێ لەژێر درەختی سەرونیازنیاز رووبەڕووی ئەو وەستاوە. ئێستا بە ئاوازێکی ئارامو پاڕانەوە ئامێز کە لە هەولّی فریودانی مرۆڤێکی غەیبی بوو، زەمزەمەی کرد: ((خاتوونی من، خاتوونی من)) لە چاوەڕوانیدا مایەوە، نەدەلەرزی، ئارەقەی لەبن هەنگلو برۆکانی هەلّدەڕژا لە حالّێکدا بەدیقەت گوێی دەگرت، داما، لەیەك ساتدا خەیالّی کردەوە کە دووبارە لە دەروونی تاریکیەوە گوێی لە دەنگی خەندەیێکی نەرم دەبێ، ساتێکی تر بینی هەوا بە شێوەی گەردەلوول پێچی خوارد، بەرجەستە بوو بوو بە جەستەیێ، کەبەر لە بەرجەستە بوون، پەراگەندەبوو ون بوو. کوڕی مێرێ بە هەولّێکی زۆرەوە خەریکی کاری ئەفسووناوی هەوای تاریك بوو، ئێستا هاواری نەدەکرد، دەپاڕایەوە، چۆکی دابوو لەژێر داری سەرونیازدا بەچاوەڕوانیو تاوانەوە سەری هەلّدەکێشا، بەردەکان ئەژنۆیان هەوپێکردبوو، خۆی دەخزاندە جێوە، پالّی دایە



قەدی درەختی سەرونیازنیازو چاوەکانی داخست، ئەو کاتە بێ ئەوەی ئارامی خۆی لەدەستبدا یا هاوارێ بێنێتە بەرخۆی، لەناو چاوەکانی خۆیدا ئەوی بینی، ئەو بەو جۆرەی کە چاوەڕوانی بوو نەهات، ئەو چاوەڕوان بوو دایکی بێچارەی دەستبەسەرو نەفرەت لەسەر لێو ببینێ، بەلاّم ئێستا ئەوە چی بوو؟ لەحالّێکدا دەلەرزی هێدی هێدی چاوانی کردەوە، بەدەنی وەحشی ژنێك سەرتاپا غەرقی چەکی گەورەی زیوین لەبەر چاویدا بریقەی دەدایەوە، بەلاّم سەری بازبوو، بەچاوانی زەردو دەنووکێکی چەماوە، پارچە گۆشتێکی لەدەم گرتبوو، بەئارامیو بێ رەحمییەوە سەیری کوری مێرێی دەکرد. کریست بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((بەو جۆرەی کە چاوەڕوان بووم نەهاتی، تۆ دایکم نیت... رەحم بکەو قسەیەکم لەگەلّدا بکە، بلّێ تۆ کێی؟)) پرسیو چاوەڕوان مایەوە، دووبارە پرسی، جگە لەبریقەی زەردڕەنگی چاوانی خڕ هیچ شتێکی دیکە نەبوو لە تاریکیدا، بەلاّم لە پڕێکا کوڕی مێرێ تێگەیشت، هاواری کرد: ((نەفرەت!)) بەسەر رووخساریەوە کەوتە سەر زەوی.

## بەشی هەفتەم

ئاسمان لە بەرزایی سەری ئەوەوە لە درەوشانەوە دابوو، لە حاڵەتێکدا لە خوارەوە زەوی بە بەردو دڕکیەوە پێیەکانی ئەویان بریندار دەکرد، بازووی خۆی درێژ کردبۆوە، بە شڵەژاوی هەولیدەداو دەینالاند، وەك بڵێی تەواوی زەوی خاچێ بێ بە سەریەوە لە خاچ دەدرا.

تاریکی لەگەڵ هاوڕێیانی وردو درشتی خۆیەوە- ئەستێرەو باڵدارو شەوگەرد- بەسەر بەرزایی سەریەوە رادەبردن، لە هەموو لایەکدا سەگان لە ناو مەلۆکاندا لورە لوریان بوو، پاسداری سەرو سامانی خاوەنەکانی خۆیان دەکرد، ساردبوو، کریست دەلەرزی، بۆ ساتێ خەو ئەوی فڕاندە گەردشگاییێکی گەرمی سەر زەمینێکی دوور دوور بوو بە رێشاندەری ئەو، بەلاّم یەکسەر دووبارە ئەوی هێنایەوە سەر زەوی‌و سەر تاوێرەکانەوە.

دەمەدەمی نیوە شەو، دەنگدانەوەی گوێنەوازی زەنگوڵەکان لە خوارەوەی دامێنی گردۆلکەیێ دەکەوتە بەر گوێ، لە دوایانەوە، نەوای خەمباری حوشترەوانێ، دەنگی قسە دەهات، کەسێك ئاخی هەڵدەکێشا، نەواییێکی رۆشن‌و تازەی ژنێ کە لە ناو دڵی تاریکیدا خونچەی دەکرد، بەلاّم جارێکی دی هەر زوو رێگە کپ بۆوە، بەسەر وشترێکەوە، جیازی زێڕینی مەجدەلیە لە شەو رەت دەبوو گریان رووخساری کێلابوو ئارایشی گۆناکانی ببوونە گوڵ، بازرگانە پولدارەکان لە چووار گۆشەی جیهانەوە دەهاتن، بە نەدۆزینەوەی ئەو لە ناو چاڵ یا ماڵ لە میانی وشترەکان، وشترێکیان



هەڵبژارد کە زێڕینترین‌و بەنرخترین قەڕاسەی هەبوو، وشتروانەکەیان نارد تا بە زووترین کات ئەو بهێنێ، سەرەڕای تەیکردنی رێگاییێکی دوورو درێژو ترسناك، دڵنیابوون کە بە گەیشتن بە مەجدەل، جەستەیێ دەدۆزنەوە کە هێزیان پێ دەدا، بەلاّم ئەو جەستەیان نەدۆزیبۆوە، لەبەر ئەمە خاوەن وشتریان رەوان کرد، لە حەوشەی ماڵی مەجدەلیە رێزیان بەستابوو، ئێستا بەچاوی داخراوەوە لە چاوەڕوانیدا دانیشتیبوون، دەنگی زەنگوڵەکان هێدی ترو دڵنەواتر دەبوو، بە نەزەری کوڕی مێرێ، وەك چۆن خەندەییێکی نەرم‌و غەلغەلەی ئاو لە میانی گوڵستانەوە دەهاتن‌و بە نەوازشەوە بانگیان دەکرد، بەم جۆرە ئارام ئارام بە پەیگیری دەنگی ئەفسوناوی زەنگوڵەکان دووبارە کەوتە خەوەوە، خەوی دەبینی، وا بەدیار دەکەوت کە دونیا مەزراییێکی سەوزو پڕ لە شکۆفەیەو خودا شوانکیلەییێکی پێست زەیتونییە، بە دوو شاخی تازە هەڵکەوتە لە کەنار ئاوی ئەمبارەوە دانیشتووەو شمشاڵ دەژەنێ.

کوڕی مێرێ هیچ کات لە ژیانی خۆی دەنگێکی دڵڕفێن‌و ئەفسوناوی نەبیستبوو. لە کاتێکا شوانکیلە خودای دەلاواندەوە خاك بست بست دەلەرزی‌و دەکەوتە جوڵەو خڕدەبوو، رۆحی وەبەر دەهات، ئاسکە جوانەکان لەگەڵ بەرانەکان لە پڕێکا مەزرایان داپۆشی، خودا لاربۆوەو سەیری ئاوی کرد، ئاوی ئەنبار پڕ ماسی بوو، چاوی کردە درەختەکانەوە، لقەکان رەنگیان گۆڕاو بوون بە چەند مەلێکی چەهچەهە چڕ، مۆسیقای شمشاڵ ژەن پڕ بوو لە جۆش‌و خرۆش، دوو مەگەز بە گەورەیی دوو مرۆڤ لە زەوی هاتنە دەرەوە، لە ناو گیای بەهاریدا کەوتنە ناو باوەشی یەکترەوە، لەسەرێکی مەزراوە تا ئەوسەر گلۆر دەبوونەوە، جووت جووت، لەیەك دەبوونەوەو سەر لە نوێ جووت دەبوونەوە، وەقیحانە پێدەکەنین، تیزیان بە شوانکیلە دەکردو هیسە هیسیان دەکرد، شوانکیلە شمشاڵی خۆی لە دەم کردەوەو سەیری کردە جووتە بێشەرم‌و وەقیحەکەوە، لە پڕێکا سەبری تەواو بوو، شوانکیلە لە ژێر پاژنەی پێیەوە بەزەربەییێکی وردوخاش کەرو لە هیکەوە، ئاسکەکان، مەلەکان، درەختەکان، ئاوو خەڵك‌و ژن، بەیەکەوە نووساو ونبوون نەمان، کوڕی مێرێ بەهاوارێ لە خەو رابوو، بەلاّم لە هەمان ساتدا بێداری، چاوی کەوت بە بەدەنی بەیەکەوەنووساوی پیاوو ژنێ کە لە دەرگاییێکی تاریکی کەمەرگایدا بۆ خوارەوە دەخزین .

- کەواتە زەلکاوی دەروونی من هەمان ئەوەیەو پۆخڵی دەروونم هەمانە.

قامچیەکەی لەکەمەر کردەوە، تەنپۆشی خستە ژێر پێکانیەوە، بێ ئەوەی قسەیێ بکات، بەبێ رەحمی دەستی کرد بە قامچی لێدانی رانو پشتو تەبەش، خوێن بازرقەی کردو پەرشی سەر رووخساری بوو، هەستی پێکردو ئارامی گرت، سپێدەدەم داهات، ئەستێرەکان تاریبوون، زەمهەریر چووە ناو ئێسقانەکانیەوە، سەرو بەسەر باڵای سەریەوە پڕ بوو لە باڵو ئاواز، روانیە دەوروبەر، هەوا خاڵی بوو، لە رۆشنایی رۆژدا- نەفرەتی- باز بە سەریانەوە سەر لە نوێ لەبەر چاو ون بوو، لەبەر خۆ کەوتە ئەندێشەوە "دەبێ دوورکەومەوە، دەبێ بۆ خۆپارێزی لە مەجدەل رابکەمو مردووشۆر بیبات، تا بەر لە گەیشتن بە بیابانو ناشتنی خۆم لە دێر راناوەستم، لەوێ جەستەم دەکوژم دەیکەم بە رۆح" ناو لەپی دەستی دانایە سەر تەنی کۆنینەی درەختی سەرونیازنیازو لاواندیەوە، هەستی کرد کە رۆحی درەختەکە لە رەگەوە هەڵدەچێو تا بەرزترینو ناسکترین لق پەرشوبلاودەبێتەوە، بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: خوا ئاگادارت بێ خوشکم، دوێنی شەو لە پەنای تۆ بۆخۆم رووڕەش بووم، بمبورە." بەم قسەیە، ماندوو مردوو وێڕای خەیاڵی ئازار بەخش لە گردەکەوە سەرەوژوور بۆوە. گەیشتە رێی ئەسڵی، دەشتایی بێدار دەبۆوە، یەکەمین تیشکی خۆرەتاو بەسەر جۆخینەکانەوە هەلآت، بە چپەوە گوتی: "نابێ بچمە ناو مەجدەلەوە دەترسم" وەستا تا بڕیاربدات بۆ گەیشتن بە دەریاچە دەبێ بۆ کام رێ بڕوات؟ یەکەمین رێگای لای راستەوەی گرت، دەیزانی مەجدەل دەکەوێتە لای چەپو دەریاچەش لە لای راست، بە دڵنیاییەوە چووە پێش. دەرۆیی‌و زەینیشی پەرێشان بوو، لە مەجدەلیە بەرەو لای خودا رایدەکردو لە خاچەوە بۆ بەهەشتو لە دایكو باوك بۆ سەر زەمینە دوورو مرۆڤە جۆراوجۆرەکان، سپی، زەرد، رەش، سەرەڕای تێپەڕنەکردنی مەرزی سراییل، لە زەمانی منداڵی ناو کوختەی قوڕی باوکی چاوەکانی داخستو زەینی ئەو وەك چۆن بازێکی کەوی بە زەنگی زێڕینی‌و هاواری خۆشحاڵی، لە سەر زەمینێکەوە بۆ سەر زەمینێ، لە ئۆقیانوسێ بۆ ئۆقیانوسێ هەڵفری بوو، لە جەستەی خافڵ بوو بوو، لە قالبی جەستەدا رایدەکردو بەرەو لای ئاسمان سەرهەڵدەگەڕا، ئەوە تەنها ئارەزووی ئەو بوو.



رێی دەبڕی، جادە پیچاوپێچ بەناو مێوستانەکاندا رەتدەبوو، دووبارە سەیری دەکردو دەگەیشتە زەیتونستان، کوڕی مێریێ بەشێوەیەك رێی دەبڕی وەکو ئەو کەسەی بەدوای ئاوێکی رەوان یا ئاوازی خەمناكو یەکنەوای وشتروان کەوتبێ.

تەواوی ئەو سەفەرە بۆ ئەو وەك خەون وابوو، بەدەگمەن بە زەمین دەکەوت، پێیەکانی ئەو، نەخشەی مرۆیی ئەو، پاژنەو پێنج ئەنگوستی بە ئارامی لە خاك دەنا. درەختەکانی زەیتوون، لقە پڕەکانی خۆیان رادەتەکاندو بەخێرهاتنی ئەویان دەکرد، هێشووی ترێ دەدرەوشایەوە.. بەقەدی مێو هەڵواسرا بوونو دەگەیشتنە سەر زەوی، ئەو کچانەی کە بە شاڵی سپی‌و لولاقی سفتەوە بە ژێر هەتاوی سوتێنەر دا تێدەپەڕین، بەگەرمی سەلآویان لێدەکرد، جار جار کە لە جادەوە هیچ رێبوارێ نەدەبوو لەسەر جادەکە، دەنگی پێیە سەنگینەکان دووبارە لە دواوە دەبیسترا، جیلوەو جەلالی رەنگ برۆنزی دەپەڕیە هەواوەو دووبارە ون دەبوو، سەدای خەندەی هەرماسی دیسان بەسەر سەریەوە دەتەقیەوە، بەلآم کوڕی مێریێ هەمیشە سەبرو ئارامی دەگونجاندە خۆیەوە، ئەو خەریك بوو دەگەیشتە رزگاری، هەر زوو دەریاچەی رووبەڕووی خۆی دەدیتو پاشان لە پشت ئاوەشینەکانەوە، کە وەکو هێلانەی شاهین لە میانی تەختەبەردە سوورەکانەوە هەڵواسرا بوو.

رێگای دەبڕی‌و زەینی هەڵدەفڕی، بەلآم لە پڕێکا بە هەراسانیەوە وەستا، لەوێ، لەبەر چاوی ئەو لە گوێی سایەبانداری ژێری درەختەکانی خورما مەجدەل بەرفرە بوو بوو، زەینی پاشەکشەی کرد بەلآم پێیەکانی بەپێچەوانەی ئیرادەی بەهەنگاوی دڵنیا ئەوی بەرەو لای گۆشەگیرگای عەتراوی مەجدەلیەی کچە مامی رێنما دەکرد. بە وەحشەتەوە زەمزەمەی بۆ ماڵێ کرد کە مەحکوم بە ئاگری دۆزەخ بوو ((نا نامەوێ بڕۆم، نامەوێ بڕۆم)) هەولێ دا تا رێگەی خۆی بگۆرێ بەلآم جەستەی کە وەك سەگێکی شکاری لە جێی خۆی وەستابوو بۆنی دەکرد.. سەرپێچی کرد

جارێکی دی بڕیاری دا لەوێ دوور کەویێتەوە، بەلآم تەکانی نەدا دەیتوانی ماڵە خاوێنو بەدۆی قسلێ سپی کراو و بیرەئاوی کۆنینەو لێواری مەرمەڕی ببینێ.

سەگەکان دەیانلوراندو مریشکەکان قدە قدیان بوو، ژنەکان پێدەکەنین، وشترە بارکراوەکان لە کەنار بیری ئاوەوە ئەژنۆیان دابوو، کاوێژیان دەکرد.

❋❋❋

سەداییێکی دڵنەوازی لە دەروونی خۆیدا بیست کە دەیگوت:" دەبێ ئەو ببینم.. دەبێ ئەو ببینم،پێویستە، خوا منی راکێشاوەتە ئێرە، بەڵێ خودا نە زەینی من تا ئەو ببینم، بکەومە سەر دەستو پێیەکانیو داوای لێبوردنی لێ بکەم، کەمتەرخەمی لە منە "بەر لە چوونە ناو دێرو لەبەر کردنی جلی سپی دەبێ داوای لێبوردن لەو بکەم دەنا رزگاربوون مەحاڵە، خوداوەندا سوپاسگوزارم کە منت هێناوەتە شوێنێ کە خۆم نەمدەویست".

هەستی بە شادی دەکرد،بە توندکردنی کەمەربەندی، دەستی کرد بە چوونە خوارەوە بۆ مەجدەل، مێگەلی وشتران لە دەوروبەری بیرەئاودا بەسەر ورگیانەوە راکشابوون، خواردنیان تەواو کردبوو بەباری سەر شانی خۆیانەوە لەسەرەخۆو سەبورانە کاوێژیان دەکرد، دیاربوو کە لە سەر زەمینی دووری عەتراویەوە رادەهاتن،چوونکە تەواوی ناوچەکە بۆنی عەتری دەدا، کریست لە کەناری بیرەکەدا وەستا، ژنێکی پیر کە ئاوی هەڵدەکێشا، جامێکی بۆلای ئەو گرتو ئەویش نۆشی کرد، دەیویست بپرسێ ئایا مێریێ لەماڵە، بەلاّم شەرمی کرد، لەبەر خۆوە کەوتە ئەندێشەوە: "خوداوەند منی بۆ لای ماڵی ئەو پەلکێش کردوە، باوەڕم هەیە بە دڵنیاییەوە کە ئەو لە ماڵەوەیە".

لە کوچەییێکی سێبەردارەوە کەوتە رێ، غەریبەییێکی زۆر لە شار بوون، هەندێك کراسێکی درێژی چۆڵنشینەکانیان لە بەرا بوو..هەندێکیان شاڵی کشمیری گرانبەهای هیندی، دەرگاییێکی بچووك کرایەوە، ژنێکی خەپڵە بەسمێڵێکی مشکینی هاتە دەرەوە، بە دیتنی ئەو یەکسەر کەوتە خەندەوە، بە دەنگێکی بەرز گوتی: "باشە باشە، چاوم رۆشن نەجارِ تۆش دەتەوێ بچیتە تەوافی زیارەتگاوە؟" لە میانی قاقاوخەندەوە دەرگەی داخست.



کوڕی مێریێ لە شەرمان سوور هەڵگەڕا، بەلاّم دڵی خۆی دایەوە، ((حەتمەن دەبێ بکەومە سەر پێیەکانیو داوای لێ بووردنو بەخشش بکەم)) پێیەکانی خۆی توندتر هەڵێنا، ماڵەکە لەوبەری دێ بوو بە هەنارستانێکی چووکەڵە دەورە درابوو، باشی بە بیر دەهاتەوە دەرگا تەك لەنگەیەکی سەوز رەنگ بوو، نەخشی دوومارى تێکەئەنگلۆزاو، یەکێکیان رەشو ئەویتریان سپی دەیڕازاندەوە، کاری یەکێ لە عاشقەکانی مەجدەلیە بوو، چۆڵنشینێ، بەسەر دەرگاوە مارمیلکەییێکی زەردی گەورە هەبوو کە بە پێیە کراوەکانیەوە وەکو ئەوەی لە خاچ درابێ وابوو. کریست ون بوو، پاشا کشەی کردو گەڕاوە ئەو شوێنەی دەستی لێ پێکردبوو،شەرمی دەکرد نیشانەی ماڵەکە بگرێ، نزیکە نیوەڕۆ بوو لە ژێر سایەی دار زەیتونێ وەستا تا هەناسەی تازە بکاتەوە، بازرگانێکی دەوڵەمەندو نەجیب زادە تێپەڕی، ریشێکی کورتو چاوانێکی مەرئاسایو بادامی ئەنگوستیلەی زۆر...

کوڕی مێریێ بە دوایەوە کەوتەڕێ، لەوکاتەی کە لەدوای ئەودا دەڕۆیشت، قەدو قەوارەی نەجیبو شاڵ ی چاكو کەشمیری ئەوی ستایش کرد کە بە وێنەی مەلو گوڵی شکۆفە کردەوە چنرابوو سەرشانی داپۆشی بوو... لەگەڵ خۆی کەوتە ئەدێشەوە (دڵنیام یەکێ لە فریشتەکانی خودایە کە بۆ رێپیشاندانی من هاتۆتە خوارەوە، نەجیب زادەیەکی غەریب بە خزین لە کوچە پڕپێچو پەناکانەوە بۆپێشەوە دەچوون، هەر زوو لەو سەوزایە لەگەڵ ئەو مارانەی تێك ئەنگلۆزابوون، سەرنجی ئەویان راکێشا، پیرەژنێك لە دەرەوە بەسەر مێزێکەوە دانیشتبوو، مەقەلەییێکی پڕ لە رەژووی داگیرساو لە بەر پێی بوو، قرژاڵی سوور دەکردەوە، لە کەنار مەقەڵەوە، تۆ کودو هەبوو، لە ناوەوە دوو پشتە دەستی دارینو نۆکی کوتراوی تیا بوو فولفولی بەسەریا دەپەرشیو دەیفرۆشت، نەجیب زادەی گەنج لاربۆوە، سکەییێکی نوقرەیی دا بە پیرێژن، چووە ژوورەوە، کوڕی مێریێ لە دوای ئەوەوە چووە ژوورەوە، چووار بازرگان بە رێزە لە سەر بەردەفەرشەکەوە لە حەوشە دانیشتبوو، دوو پیرەمێرد بە پولەكو نینۆکی خەنە لێدارەوەوەو دوو جەوان بەڕیشو سمێڵی موشکین چاویان دووریبووە دەرگای بچووكو کورتیلەی ژووری مێریێەوە، دەرگا داخرابوو، جار جارە هاواری خەندەیێ یان جیڕە جیڕی تەختەی خەو لە ژوورەوە دەهات، خودا پەرستەکات یەکسەر قسەی خۆیان

بڕیی‌و بە هانکە هانکەوە جێیان دەگۆڕییەوە، کاتێکی زۆر بەر لەتۆ ڕۆیشتبوو،درەنگ هاتنی ئەوان کە لە حەوشە ڕوونیشتبوون، پیرو جحێل بێ سەبر بوو بوون، نەجیب زادەی گەنجی هیندی لە نۆبە دانیشت‌و کوڕی مێرێیش لە پشت سەری ئەوەوە دارهەنارێکی مەزنی پڕ میوە لە ناوەندی حەوشەکەدا بوو، دوو درەختی سەرونیازنیازی بە هەیبەت لە دوولای دەرگادا بالآیان کردبوو،: یەکێکیان نێرە لە قەدێکی ڕاست قامەتی شمشێرو ئەوی تر مێینە بە لق‌و پۆپی پان‌و فراوان، لە دارە هەنارەکەدا قەفەزی سەبەتەیەك هەڵواسراو، لە ناو قەفەزەکە کەوێکی پەڕو باڵ جوان‌و بۆ سەرەوەو خوارەوە هەڵدەبەزیەوەو دندووکی لە داری قەفەزەکە دەداو قاقبەقاقبی دەکرد، خودا پەرستەکان خورمایان لە بەر شاڵیان دەردەهێناو لە دەمیان دەنا، بۆ بۆنخۆش کردنی دەمیشیان کاکڵە گوێزیان دەخوارد، یەکتریان بە قسە گرتبوو تا کات بەسەر بەرن، سەریان وەرسووراندو سەلامیان لە نەجیب زادە کرد، سەیرێکی نەفرەتباریان کردە کوڕی مێرێی کۆنەپۆش، پیرەمێردێ کە لە ڕێزی یەکەم دانیشتبوو، ئاخی هەڵکێشاو گوتی: (شەهادەتێکی بالآتر لە شەهادەتی من نیە، لێرە بەرەو ڕووی بەهەشتم‌و دەرگا بە ڕووم داخراوە،)

گەنجە خڕخاڵ زێڕینەکە پێکەنی( کاری من گواستنەوەو بارکردنی داوو دەرمانە لە فراتەوەبۆ دەریای گەورە)

ئەو کەوە چڕنوك سوورەی پێش دەممان دەبینی؟ ئارەزوومە بە فولفول‌و دارچین لە مێرێی بکڕم‌و بینێمە ناو قەفەسێکی زێڕین لەگەڵ خۆمی ببەم لەبەر ئەمە دۆستانی شەهوەت پەرستی من، لە ئەنجامدا کاری خۆتان خێرا بکەن، ئەوە دواهەمین ماچە کە وەبەرتان دەکەوێ.

پیرەمێردی دووەم قسەی پێ بڕی‌و گوتی: (سوپاست دەکەم، ئاگرین میزاج خێرا وەرە بالآم) ئەو ریشێکی سپی عەتر لێدراوی هەبوو، ناولەپی جوان‌و ئەشرافی ئەو بە خەنە ڕەنگی گرتبوو، ((گوفتاری تۆ ئەمڕۆکەیە مەزەو فلفل‌و دارچین پڕ دەکاتەوە)).

نەجیب زادە پێڵوەکانی هێنابووە خوارەوە،بەشی لای سەرەوەی بەدەنی، لەسەرخۆ بۆ پێش‌و پاش دەچوو، لێوەکانی دەتگوت بە گوتنی پاڕانەوەیێك لە چڕین دابوو، بەر لە



چوونە ناو بەهەشت لە ڕوودا چوو بووە ناو بێهەستییێکی قووڵەوە، قاقبەقاقبی کەوو و جیڕەجیڕی ناو ژووری دەبیست‌و دەنگی پیرەژنیش کە کەناری دەرگای مەقەڵەی بە قرژاڵی زیندوو پڕ دەکردو یەك یەکیانی لە ڕەژووی داگیرساودا دەبردە خوارەوە، نەجیب زادە لە کاتێکدا کە بێ هەستی جەستەی گرتبووە خۆ، لە جیهانی بێ هەستیدا ئەندێشەی دەکرد: ئەو بەهەشتە، ئەمە خەونێکی قووڵە کە پێی دەڵێن ژیان، خەونێك کەبەهەەشتی تیا دەبینین، بە هەشتێکی دیکە لە نێوان دانییە، ئێستا دەتوانم هەڵسمەوەو بڕۆم چوونکە پێویستم بە لە ززەتی زیاتر نییە."

پیاوێك بە جلێکی سەوزی درێژەوە، لە بەردەم ئەو دانیشتبوو، ئەژنۆی خۆی لەوداو پێکەنی ((شازادەی هیند خودای تۆ دەربارەی هەموو ئەوانە چی دەڵێت؟

-گەنجەکە بەکردنەوەی چاوی پرسی کام؟

-لێرە لە پێش چاوی تۆ: پیاوان،ژنان، قرژاڵ‌و ئەڤین.

-دەڵێت هەموو شت خەونە.

پیرەمێردێکی ریش سپی کە تەسبیحی بادەدا،بەزیە ناو قسەکانی‌و گوتی: ((لەبەر ئەوە کوڕانی ئازای من، ئاگادار بن کە بێدار نەبنەوە))

دەرگا بچووکەکە کرایەوە، چۆل نشینەکە چووە دەرەوە، بە چاوانی هەڵمساوی، هێدی هێدی دەهاتە پێش‌و لچ‌و لێوی دەلستەوە.

پیرەمێردێ کە نۆبەتی بوو، یەکسەر بە چاپوکی گەنجێکی بیست ساڵە لە جێوە هەڵبەزیەوە، خوات لەگەڵ باپیرە ڕەحمان پێ بکەو زوو تەواوی کە بەلآم پیرەمێرد بە بێ خەیاڵ کەمەربەندی خۆی کردەوە بۆ لای ژوورەکە چوو، کاتی قسەکردن نەبوو، چووە ژوورەوەو دەرگای لە دوای خۆی دا جوت کردو کلوم دا، یان بەحەسوودیەوە سەیری چۆڵنشینەکەیان دەکردو کەسێ جورئەتی قسەکردنی نەبوو، هەستیان دەکرد کە ئەو بەسەر قایغێکەوە دانیشتووەو لە دەریا قوڵەکانەوە سەوڵی لێدەدا، لە ڕاستیدا ئەمریش ئەو بوو کە ئەسڵەن سەیرێکی ئەوانی نەکرد، بە دەرگای حەوشە ڕەتبوو، گەیشتە دەروازە، شەنسی هەبوو کە نەکەوتە سەر مەقەڵەی پیرێژن، عاقیبەت لە

میانی کوچەو کۆلانە پێچاوپێچەکان ون بوو، لەو کاتەدا پیاوە خەپڵە جل سەوزەکە بە مەبەستی ڕێکخستنی بیرۆکە لێکهەڵپچڕاوەکانیان لە ژێر ئاسمانی سافدا دەستی کرد بە قسەکردن لە بارەی شێرو دەریاکانو جەزیرە دوورەکانی مەرجانی.

زەمان تێدەپەڕێ، جارناجار دەنگی ئارام کەوتنە خوارەی دانە دانەی تەسبێح ی کارەبایی دەبیسترا، تەواوی چاوەکان جارێکی دی بڕانە لای دەرگا بچووکەکەوە، پیرەمێرد زۆری بەسەر چوو.

نەجیب زادە هیندیەکە قیت بۆوە، ئەوانی دی بەسەر سوورمانەوە گەڕانەوە، بۆ هەڵسابۆوە؟ نەیدەویست قسەیێ بڵێت؟

دەیویست بڕوا؟ خۆشحاڵ بوو، ڕووخساری بریقەی دەدایەوە، نورێکی گونجاو لە گۆناکانی دەدرەوشایەوە، شاڵی کەشمیری بە توندی لە خۆی پێچا، دەستی بەسەردڵو لێوەکانی داناو خوا حافیزی کرد، سێبەری لە ئاستانەی دەرگادا خزیو ڕەد بوو، گەنجە خڕخاڵ زێڕینەکە گوتی: "بێدار بۆوە" هەوڵی دا پبێکەنێ، بەلاّم ترسێکی غەریب بەسەر هەموویان دا زاڵ بوو، بەپەلەو بە شڵەژاوی دەستی کرد بە قسەکردن دەربارەی سودو زیانو نرخی بەهەڕمێنی بازاڕی کۆیلە فرۆشی لە قوستەنتینیەو شام، بەلاّم هەر زوو ئاراستەی قسەکانیان گۆڕیە سەر قسەکردنی بێ پەردە دەربارەی ژنو کوڕانو زمانی دەرهێناو دەستی کرد بە لستنەوەی لچو لێوی خۆی.

کوڕی مێرێ بە زەمزەمە کردنەوە گوتی: ((خودایە، ئاخ خودایە، سەیرکە منت هاوێشتۆتە کێندەرێ؟ ناو چ حەوشەیێ؟ دانیشتن لەگەڵ چ جۆرە جانگێکی مرۆڤان؟ خودایە ئیدی ئەوە گەورەترین ڕەزیلیە، توانای بەرگەگرتنیم پێ ببەخشە))

زیارەتکەران برسیان بوو، یەکێ لەوان هاواری کرد، پیرێژن چووە ژوورەوە، لە میانی چووار نەفەردا نانو قرژاڵو نانی شیرینی گۆشتی دابەش کردو تونگەیێ شەرابی خورمای هێنا، پێیان لەسەر پێ دانا، خواردنیان بەسەر دامەنیانەوە دانا شەویلاگەکانی خستە دەنگەوە. یەکێ لەوان کە کەیفی خۆش بوو، پێستی قرژاڵێکی



گەورەی بۆ لای دەرگا هاوێشتو هاواری کرد ((ئاهای باوەگەورە، زووتر تەواویکە تەواوی ڕۆژێ مەگرە)). دایانە قاقای پێکەنین.

کوڕی مێرێ دووبارە کەوتە زەمزەمەوە: ((خودایە ئاخ خودایە هێزم پێ ببەخشە تا گەیشتنی نۆبەتم بووەستم.

پیرەمێردێ کە عەتری لە ریشی دابوو، بە داخەوەبوو بۆ ئەو، ڕووی لەو کردو گوتی: ((ئاهای تۆ کوڕی نازەنینم، برسیو تێنوت نییە، وەرە ئێرە لوقمەیێ بخۆ گیانت پێ دەبەخشێ))

پیاوە زەبەللاحەکە جل سەوزەکە لە کاتێکدا پێدەکەنی، پێداچوو گوتی: ((بەڵێ منالێژگە باشتر وایە شتێ بخۆی کاتێ کە نۆبەتی تۆ بێت، نامانەوێ ببیتە مایەی سەرشۆڕی ئێمە، کوڕی مێرێ لە شەرمان سووڕ هەڵگەڕاو هیچی نەگوت.

پیرەمێرد لە کاتێکا، بن ردێنی خۆی لە وردە پارچە خۆراکەکان پاك دەکردەوە گوتی: ((ئەوەش یەکێکی دی ناو خەونە، بەڵی سوێندم بە بلیزبوب ی پیرۆز کە لە خەوندایە، ئەوەش وەکو ئەوی دیکە ئێستا هەڵدەستێتەوەو دەڕوات، ئێستا دەبینیت)).

کوڕی مێرێ بە وەحشەتەوە سەیری دەوروبەری کرد، نەکا نەجیب زادەی هیندی لەسەر هەق بێ؟ نەکا هەموو ئەوانە —حەوشە، دار هەنار، مەقەڵە، کەو، خەڵکان جگە لە خەونێك هیچی تر نەبن؟ ڕەنگە هەتا ئێستاش لە ژێر درەختی سەرونیازنیازدا دانیشتبێو خەون ببینێ، ڕووی لە لای دەروازە دەکرد، وەك بڵێی لە گەڕاندابوو بە دوای کۆمەگ،هاوسەفەری سەرباز ئاسای خۆی دیت کە بە بێ حەرەکەت لە کەنار درەختی سەرونیازنیازی نێرە وەستاوە تا بن لوتی چەکدار بوو، ئێستا بۆ یەکەمین جارە بە بینینی ئەو هەست بە ئارامیو ئاسایش دەکات.

پیرەمێرد بە هەناسە بڕکێوە، هاتە دەرەوە، پیاوە زەبەللاحو جل سەوزەکە چووە ژوورەوە، چەند سەعاتێك دوای ئەوە نۆبەتی گەنجە خڕخاڵ زێڕینەکە هات، پاش ئەو پیرەمێردە تەسبیح لە دەستەکە،کوڕی مێرێ ئێستاکە بە تەنها مایەوە لە چاوەڕوانیدا دانیشت.خۆرەتاو لە حاڵەتی ئاوابوون دابووە، دوو پارچە هەور لە ناو ئاسمان دا مەلەی

دەکرد، لە غەرق بوون لەزێڕ وەستان، دانە دانەی زێڕینی وردە بەفری سەر درەختان کەوتە سەر زەوی‌و رووخساری مرۆڤەکانەوە.

پیرەمێرد هاتە دەرەوە، بۆ ساتێ لە ئاستانەی دەرگادا وەستا، چاوو لوت‌و لێوی ئاولێتکاوی پاك کردەوە، پاشان بەشانە دابەزیوەکانی بەرەو لای حەوشە کەوتە رێ.

کوڕی مێرێ هەڵسایەوەو رووی کردە لای درەختی سەرونیازنیازی نێرەوە، هاوسەفەرەکەشی پێی خۆی بەرز کردەوەو ئامادەی کەوتنەدوای ئەو بوو، دەیەویست لەگەڵ هاوسەفەرەکەی قسە بکات، تکا بکات لە دەرەوەی دەرگاکە بمێنێتەوە، بەو بڵێ کە دڵی دەخوازێ بە تەنها بمێنیتەوە، بڵێت کە رانەکات، بەلاَم دەیزانی قسەکانی بە با دەچێ. لەبەر ئەمە خامۆش مایەوە بە توند کردنی کەمەربەندی خۆی سەری هەڵبڕی‌و سەیری ئاسمانی کرد، دوو دڵ بوو بەلاَم دەنگێکی زبر لەناو ژوور دا بە تووڕەییەوە گوتی:" ئەگەرکەسێکی دیکە هەیە با بێتە ژوورەوە" دەنگی مەجدەلیە بوو، بە هێنانەبەری تەواوی هێزی خۆیەوە چووە پێشەوە، دەرگا نیوەی کرابۆوە، لە کاتێکدا دەلەرزی چووە ژوورەوە.

مەجدەلیە رووت‌و قووت‌و ئارەقاوی بەسەر پشتەوە درێژ بوو بوو،پرچی بە رەشی شەبەقەوە بەسەر سەرینەوە پەرشوبلاَوبووبۆوە، بازووکانی خستبووە ژێر سەریەوە، رووی لە دیوار بوو باوێشکی دەدا، پیشاندانی هێزی زۆری خۆی لەگەڵ پیاوان لە شەبیوری سەحەرەوە تا ئێستا نای بۆ نەهێشتبۆوە، لە مووی پرچ، نینۆك وبەش بەشی جەستەی دا بۆنی تەواوی میللەتانی لێ دەهاتە دەرەوە، ئاسەواری گەزە بازوو گەردەن‌و مەمکەکانی داپۆشی بوو.

کوڕی مێرێ سەری لەبەر خۆنا، لە ناوەندی ژوور وەستا بوو، قودرەتی چوونە پێشەوەی نەبوو، مەجدەلیە بە بێ حەرەکەت لە چاوەڕوانی دا مابۆوە رووی لە دیوار بوو بەلاَم لە پشتی سەری خۆیەوە دەنگی خرە خرِی پیاوانی نەدەبیست، کەس جلی لەبەر نەدەکردەوە، هەتا دەنگی هەناسەش نەدەهات بە وەحشەتەوە رووخساری وەرگێڕا، یەکسەر قیژاندی، چنگی لەوەرپێچەکە گیر کردو خۆی پێ داپۆشی، لە کاتێکدا لێوو چاوانی خۆی بەناو لەپی داپۆشی بوو، هاواری کرد



((تۆ... تۆ!))

– مەرەیم لێم ببورە

مەجدەلیە خەندەیێکی زبرو دڵبریندارەکەی سەردا، وەك بڵێی تاری رووخساری لە حاڵەتی پارچە پارچە بووندا بوو، دوبارەی کردەوە ((مێرێ لە من ببوورە مێرێ بە لەبەر کردنی جێپۆشەکەی بەسەر ئەژنۆکانی هەڵبەزیەوەو دانیشت، مستی خۆی بەرز کردەوە، ((دولبەری رەعنای من، کەواتە بڵێ بەڵگەی هاتنە ژوورەوەت بۆ حەوشەی بۆ ئەوەبوو کە تێکەلاَوی عاشقانم بی‌و گاڵتەم پێ بکەی؟ تابێیتە ماڵەکەم خواترسناکەکەت بێنێتە سەر پێخەفە گەرمەکەم؟ دۆستی من، تۆ بە هەڵەداچووی، دەربارەی خوداکەت، ئەوم ناوێ، پێشتر دڵم شکاوە، مەجدەلیە دەینالاَند لە هەمانحاڵدا قسەی دەکردو سینەی پڕ لە رق‌و قینی لەو دیو دۆشەگپۆشەکەیەوە بەرزو نەوی دەبۆوە ((ئەو دڵمی شکاندوە، دڵم شکاوە)) دوو دڵۆپ ئەشك لە ناو چاوەکانیدا کۆ بوونەوەو بەسەر برژانگە درێژەکانیەوە قەتیس ما.

–مێرێ کفر مەکە من دەبێ سەرزەنشت بکرێم نەك خودا بۆیە هاتووم، دەمەوێ داوای لێبوردن لە تۆ بکەم، بەلاَم مەجدەلیە تەقیەوە ((تۆو خوداکەت لەیەك جانگن، وەکو یەکن، یەکنەفەرن‌و ناتوانم لە یەکتریتان جیا بکەمەوە، جار جارە شەوانە بیر لەوە دەکەمەوە کە نەفرەت لەو سەعاتە بێ، رووخساری تۆ لە میانی تاریکیدا بەدیار دەکەوێ، کاتێ کە دەبینم تۆ گوزەردەکەی هەی نەفرەت لەو سەعاتە، هەست دەکەم ئەوە خودایە کە راستەوخۆ بۆلای من دێت)) مستی خۆی بۆ هەوا بڵند کردەوە هاواری کرد: ((لەگەڵ خوادا حەوسەڵەم مەبە، لێرە لە بەرچاوم وونبە، نامەوێ تۆ ببینم، تەنها تاکە پەنایێکی دڵدەرەوە بۆ من هەیە

–چڵکاو! تەنها یەك کلێسا هەیە کە بۆ پەرستن بچمە ناویەوەو خۆم پاك کەمەوە- چڵکاو-

مێرێ- گوێ لە من بگرە، لێگەڕێ باقسە بکەم،ئەوەندە لە نائومێدی مەچووە خوارەوە، بەوردی بۆ ئەمەیە کە هاتووم خوشکم تا تۆ لەو چڵکاو دەربهێنم، من

گوناهێکی زۆرم کردوە، وا لە رێمە بۆ بیابان تا کەفارەتی ئەو گوناهانە بدەمەوە، بەڵێ مێرێ، گوناهێکی زۆر، بەلاّم بەدبەختی تۆ زیاتر لە هەموویان قورسایی دەخاتە سەر ئەستۆی منەوە.

- مێرێ نینۆکە تیژەکانی درِندە ئاسا بۆ لای میوانی ناخواندە وەشاند، وەك بلێی دەیەویست گۆناکانی خۆی هەڵپاچیو قیژاندی ((کام بەدبەختی؟ زۆریش خۆشبەختم، پێویستیشم لە دڵسۆزی حەزرەتی پیرۆزی تۆ نییە، خۆم بۆ خۆم دەجەنگم تەنیا خۆم داوای هیچ یارمەتییێك لەخەڵكو خوا یا هەرماسەکان ناکەم دەجەنگم تا خۆم نەجات بدەم وئەو کارەش دەکەم)).

- لە چیو لە چ کەسێ خۆت نەجات دەدەی؟

- خەیاڵت ئاسودەبێ کە خۆم لە زەلکاو نەجات نادەم، خوا لە بەرەکەتی کەم ناکات، تەواوی ئومێدی من لێرەیە لە رێی، رزگاری من لەو چڵکاوەیە.

- چڵکاو...

- بەڵێ قەوزەزار، نەنگ وپیسی ئەو نوێنە، ئەو جەستەی من کە پڕ لە گازەو بە ئارەقەو لیکاوی دەم، تەواوی دونیا ئالودە بووە! ئەو چاوە مەڕ ئاسایەت بەمجۆرە ماوێ سەر منەوە،! ون بە، ترسنۆك، نامەوێ لێرە بیت، قێزم لە تۆیە نەکەی دەست لە من بدەی! بۆ فەرامۆش کردنی پیاوێكو بۆ نەجاتدانی خۆم جەستەی خۆم تەسلیمی هەموو پیاوەکان کردوە!

کوڕی مێرێ سەری دابەزاند، بە دەنگێکی کزەوە دووبارەی کردەوە ((کەمتەرخەمی لە منە)) کەمەربەندی کە هێشتا خوێناوی بوو، بە توندی چەسپاند ((لێم ببوورە، کەمتەرخەمی لە منە، بەلاّم پاشان سزاکەی دەدەمەوە)).

خەندەیێکی وەحشی دووبارە لە گەرووی ژنە دەرپەڕی،بە سەداییێکی کزەوە گوتی: ((خەریکی بە میهرەبانیەوە باعە باع دەکەی، کە ...کەمتەرخەمی لەمنە.. کەمتەرخەم منم خوشکم،نەجاتت دەدەم)) نە جانم نا تۆ ناتەوێ وەکو پیاوێ سەرت بەرز کەیتەوەو دان بە راستی بنێیت تۆ تەمەننای جەستەم دەکەیت لە جیاتی ئەوەی



داوای بکەیت چوونکە جورئەتی ئەوەت نییە، رۆحی من سەرزەنشت دەکەیو دەڵێی کە گوایە ئارەزووی نەجات دانیت هەیە، ئاخر کام رۆح، ئەی خەوناوی؟ رۆحی ژن جەستەی ئەوە، تۆش ئەوە دەزانی، بەلاّم شەهامەتت نییە کە ئەو رۆحە لە بازووەکانت بگریتو ماچی کەیت، ماچی کەیتو نەجاتی بدەیت، بە داخەوەم بۆ حاڵی تۆو قێزم لە تۆیە.

گەنجەکە کە لە شەرمان وەك گوڵ سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد ((حەوت هەرماس چۆتە ناو تۆوە هەی ...، حەوت هەرماس، بەڵێ هەق بە باوکە بێچارەکەت بوو)).

مەجدەلیە کەوتە لەرزەوە، لە تووڕەییان پرچی کلاّفە کردو بە رشتەیێکی ئاوریشمی رەنگ قرمزی بەستایەوە، بۆ ماوەیەك قسەی نەهێنایە سەر زار، بەلاّم عاقیبەت لێوەکانی جولا ((کوڕی مێرێ هەفت هەرماس نییە، هەفت برینە، ئەوە بزانە کە ژن ئاسکێکی مێینەی برینەدارە. ئەو ئاژەڵەی کە هیچ لەززەتێکی دیکەی نییە جگە لە لستنەوەی زامەکانی خۆی نەبێ))، چاوەکانی پڕ فرمێسك بوو یەکسەر فرمێسکەکانی خۆی بەناو لەپ پاك کردەوە، ئەو کاتە وەکو تۆپ تەقیەوە ((بۆچی هاتوویتە ئێرەوە؟ چیت لە گیانی من دەوێ؟ ون بە. پیاوە گەنجەکە پێیەك نزیکتر کەوتەوە ((مێرێ ئایا هەوڵدەدەی زەمانێ وەبیر خۆت بهێنیتەوە کە هێشتا منالێکی بچووك بووین)).

"من لە بیرم نەماوە! تۆ چ جۆرە بوونەوەرێکی، هەتا ئێستاش، هەلەق وبەلەقان دەڵێی؟ دەبێ شەرم لە خۆت بکەیتەوە! تۆ هیچ کاتێ شەهامەتی ئەوەت نەبووە وەکو پیاوێ بەسەر پێیەکانی خۆت بوەستیو پشت بە خەڵکی تر نەبەستی، ئەگەر دەستت لە لولدان لەناو دەستو پێی دایکت هەڵگرتووە ئەوە ئێستا دەتەوێ دەست لەناو دەستو پێی من یاخودا لول بدەی، ناتوانی بەسەر پێیەکانی خۆت بوەستی، چوونکە دەترسیت، جورئەت ناکەی سەیری قولاّیی رۆح یا جەستەی خۆت بکەیت، چوونکە دەترسیت، ئێستاکە ئارەزوتە بچیە بیابان تا خۆت بشاریتەوە، تا لموزت لە ناو زیخو چەو ببەیتە خوارەوە، چوونکە دەترسی، دەترسی! بەدبەختی بێچارە، قێزم لە تۆیە، بەداخەوەم بۆ تۆ، هەر کات تۆ وەبیر خۆم دەهێنمەوە، دڵم ریشەڕیشە دەبێ.

مەجدەلیە زیاتر لەوە نەیتوانی بەردەوام بێتو دەستی بە گریە کردن کرد، لەگەڵ ئەوەش کە چاوانی خێراخێرا پاك دەکردەوە، فرمێسکەکان وێڕای سووراووسپیاوی رووخساری هەڵدەخزینە خوارەوەو دەسماڵەکەیان پیس دەکرد. پیاوە جحێڵەکە هەستی بە ئازارێ کرد لەناو دڵیدا: ئاخ چی دەبوو ئەگەر تەنها دەیتوانی ترسی خودا لە گیانیدا هەڵڕێژێو مێرێ لە باوەش بگرێتو فرمێسکەکانی پاك کاتەوە، پرچی بلاوێنێتەوە، دڵی وەدەست بهێنێ، ئەو کاتە لەگەڵ خۆی هەڵیگرێتو بڕوات، بەڕاستی ئەگەر پیاو بوایە دەبوایە هەمان ئەو کارە بکات بۆ نەجات دانی ئەوە، ئەو ژنە بۆ رۆژوو پەرستنو حیسابی بۆکەس نەدەکرد، لەبەر ئەمە تەنها رێی نەجات ئەوە بوو، کە لەسەر تەختەخەوەی دەربهێنێ، دەستی بگرێو بەیەکەوە بچنە گوندێکی دوورەوە، زەماوەند بکەن، کۆزو منداڵ وەبەر بهێنن، وەکو هەموو مرۆڤێك شادی بکەنو رەنج بدەن، بەڵێ تەنها هەمان ئەو رێگە هەیە.

ئێستاکە شەو دامەنی خۆی بەرفرە دەکرد، لەدوورەوە گەواڵەکان دەیاننەڕاند، تیشکێکی هەورەتریشقە لە کلاۆرۆژنەوە درەوشایەوە ناو ژوور، رووخساری شینی هەڵگەڕاوی مێرێی رۆشن کردنەڕەی هەورەتریشقەییێکی لە دوارایی نزیکتر بیست، ئاسمان بەکزاڵودی دابەزی لەنزیك زەوی قەراری گرت لەناکاو ماندووبوونێکی لەڕادەبەدەر کەوتە گیانیەوە ئەژنۆی کەوت، چووارمێخەکی دانیشتە سەر زەوی بۆنی هێڵنح هێنەری مشكو ئارەقەو بزنی نێری کەوتە بەر لوت، ناو لەپی نایە سەر گەرویو تا سەر هەڵنەگەڕێ، دەنگی مێرێی لە تاریکیدا بیست ((روت وەرگێڕە، دەمەوێ قیت ببمەوەو چرا رۆشن کردەوە، بەلاّم رووتم)).

گەنجەکە بە ئارامی گوتی: ((دەمەوێ بڕۆم)) بە هێنانەبەری تەواوی هێزی خۆیەوە کەوتە سەرپێ، بەلاّم مێرێ خۆی لە گوڕە نەبرد، ((سەیری حەوشەکە بکە، ئەگەر هێشتا کەسێ لەوێیە دەست بەسەری بکە))

گەنجەکە دەرگای کردەوەو سەری دەرهێنا، هەوا تاریك بوو بوو، دڵۆپەی درشتی پەرشو بلاّوبووی سەر گەلاّی دار هەنار دەکەوتە خوارەوە، ئاسمان خۆی هاویشتبووە سەر زەویەوە، لە ئانی دابەزین بوو، پیرەژن مەقەڵەی داگیرساوی بەدەست گرتبوو،



لەناو حەوشەدا لەژێر درەختی سەرونیازنیازی نێرەوە خۆی پەنا دابوو، دڵۆپەی درشت خێراتر دەستی کرد بە هەڵڕژان، گەنجەکە بەخێرایی دەرگەی داخستو گوتی: ((هیچ کەس نییە)) تۆفانەکە خەریك بوو کارەساتی دەخولقاند.

مەجدەلیە لەو کاتەدا لەناو نوێن هاتە دەرەوە بەخۆو بەشاڵێکی پەشمینی گەرمەوە کە بە وێنەی شێرو ئاسك چنرا بوو ئەو رۆژە سپێدە لە لایەن یەکێکی حەبەشی کرابووە دیاری بۆ ئەو، خۆی داپۆشی. گەرمای گیانبەخشی شاڵەکە لەرزینێکی پڕ لە لەززەتی بەخشی بە شانەکانی، کەوتە سەر پاژنەی پێیەوەو چرای لە بزماری دیوار کردەوە. گەنجەکە بە دەنگێکە تاسوقەوە دووبارەی کردەوە ((کەسێك لێرە نییە))

–پیرێژن لە کوێیە

–لە ژێر درەختی سەرونیازنیازدا تۆفانێکی بەڕاستییە.

مێرێ باڵی بۆ ناو حەوشە کردەوە، ئاگری مەقەڵەکەی لە تاریکیدا بینیو نزیك بۆوە، لە کاتێکدا هێمای بۆ کیلۆنی درەگا دەکردو گوتی: ((دایە گەورە نعومی، مەقەڵەو قڕژاڵەکانت هەڵگرەو بچۆرەوە ماڵەوە، دەرگا دادەخەم، بۆ ئەمشەو بەسە)). پیرێژن بە خاتری لەدەست دانی موشتەریەکانی ئەو شەوە خەمبار بوو، بەمنەمنەوە گوتی: ((عەشقەکەت لەژوورەوەیە ها؟))

مەجدەلیە وەلاّمی دایەوە ((بەڵێ ئێستا بڕۆ))

پیرێژن بە منەمنەوە هەڵسایەوە سەرپێو کەل وپەلی خۆی کۆکردەوە، بەپدوی بێ ددانی کەوتە منەمنەوە ((عاشقی شڵەژاوت عەجەب پارچەییێکە))، بەلاّم مێرێ کە بە پەلە بوو پاڵیدا دەرەوەو دەرگای داخست، ئاسمان دەمی کردەوە باران وەکو سولاوکە دەڕژایە ناو حەوشەوە.

دروست وەکو ئەوکاتانەی کە منداڵ بوو بە دیتنی یەکەمین بارانی پاییزی هاوارێکی خۆشحاڵی سەردا، کاتێ کە چووە ژوورەوە، جلی تەڕ بوو بوو، گەنجەکە لە ناوەندی ژوور بە بێ بڕیار وەستا بوو، نەیدەزانی بڕوات یا بمێنێت، کامیان ئیرادەی خوداوەندی بووە؟ ئێرە ئاسایيو گەرم بوو، هەتا لە بۆنی هێڵنجهێن راهاتبوو، لە دەرەوە سەرماو

با بوو، کەسی لە مەجدەلی نەدەناسیو کفر ناحوم دوور بوو، بڕوات بمێنێ، رۆحی وەکو پاندۆڵێ بۆ پێشو پاش هاتوچۆی دەکرد.

–((کریست باران وەکو سێلاو دێتە خوارەوە، گرۆت لەگەڵ دەکەم کە ئەمڕۆکە هیچت نەخواردوە، کۆمەکم بکە تا ئاگر هەڵگیرسێنمو خۆراك دروست بکەم)) دەنگی وەك دەنگی دایك نەرمو دڵکێش بوو.

گەنجەکە لە کاتێکا بەرەو لای دەرگا گەڕابۆوە گوتی: ((دەمەوێ بڕۆم)) مەجدەلیە وەکو فەرماندەرێ گوتی: ((تۆ لە هەمان جێ دەمێنیتەوەو بەیەکەوە خواردن دەخۆین، نەکا ئەو کارە مایەی ختوکە بێت بۆ تۆ؟ نەکا لەوە بترسی کە خۆراك خواردن لەگەڵ بەدێك ئالودەت بکا!؟))

گەنجەکە داروپەردوی لە گۆشەی ژوورەکەوە هێناو لە کەنار چووارچێوەی بەردی سۆپاکە لار بۆوە، ئاگری کردەوە، دڵی مەجدەلیە ئارامی گرتبوو بە بزەی سەر لێوەوە قاپێکی پڕ لە ئاو کردو داینایە سەر ئاگر، لەو کیسەی کە بە دیوار هەڵواسرابوو دوو مشت لوبیای — چاو بولبولی- هەڵگرتو لە ئاوەکەی کرد، ئەو کاتە لەبەردەم ئاگر ئەژنۆی داو گوێی هەڵخست، لە دەرەوەدا بەنداوەکانی ئاسمان ببوونەوە.

–کریست لە منت پرسی کە ئایا زەمانی منداڵیمان کە بەیەکەوە یاریمان دەکرد وەبیرم دێتەوە؟

بەلاّم پیاوە گەنجەکە وەکو مەجدەلیە لەبەردەم ئاگر دانیشتبوو، چاوی بڕیبووە ئاگرو مەلی زەینی بۆ دوور هەڵدەفڕی، هەستی دەکرد وەك بلێی بەر لە هەموان گەیشتۆتە دێرەوە، کراسی سپی لەبەر کردوەو لە خەلوەتی بیاباندا کەوتۆتە گەڕانو سووڕانو وشکاییەوە دلێشی ماسییێکی رەنگ سووری سادەدڵو خۆشحاڵە، کە لە ئاوە قوڵو ئارامەکانی خودادا مەلە دەکات، لە دەرەوە، جیهان لەبەریەك دەڕشێنێ، دەروونی ئەو ئارامیو ئەڤینو ئاسایش بوو.

دەنگێ لە تەنیشتیەوە دووبارە گوتی: ((کریست لە منت پرسی کە ئاخۆ زەمانی منالّی خۆمان کە بەیەکەوە یاریمان دەکرد وەبیرم دێتەوە؟)).



تەبەشی بە شەوق دانەوەی رۆشنایی مەشخەڵەکان، وەکو ئاسنی داغکراو دەدرەوشایەوە، بەلاّم جحێڵەکە کە لە بیابان نقوم بوو بوو، نەیدەبیست، ژنە دووبارە گوتی: " کریست تۆ سێ سالاّن بوویو من یەك ساڵ لە تۆ گەورەتر بووم سێ پەیژە کە لە دەرگای مالّی ئێمە کۆتایی دەهات، من عادەتم کردبوو کە لە دواهەمین پەیژە دابنیشمو سەیری تۆ بکەم ،چەندین سعات هەولّت دەدا تا لە پەیژەی یەکەم سەرکەویت، بەردەبوویتەوە، دووبارە قیت دەبوویەوە، من هەتا ئەنگوستی بچووکم بۆ کۆمەگی تۆ بەرز نەدەکردەوە، دەمویست بۆ لای من بێیت، بەلاّم دەبوایە یەکەم جار رەنجێکی زۆرت بکێشایە، وەبیرت دێتەوە؟

یەکێ لە حەوت هەرماسەکانی ناو بوونی ئەو سیخورمەی لێدەدا تا ئەو پیاوە قسە بکاتو تووشی وەسوەسەی بکات...

–دوای چەندین سەعات ئەن ئاخیری دەتتوانی بە پەیژەی یەکەم هەڵگەڕێی، پاشان هەولّت دەدا بە پەیژەی دووەمو پاشان بە سێهەم هەڵگەڕێی، لە هەمان جێدا کە من بە بێ حەرەکەت دانیشتبووم چاوەڕوانیم دەکردی ...و پاشان)).

–گەنجەکە راجفریو دەستەکانی هێنایە پێشەوەهاواری کرد ((بەسە مەچووە پێشتر، بەلاّم رووخساری ژنە دەدرەوشایەوو دەیجریواند، مەشخەڵەکان ئەبرۆو لێو چەناگەو گەرووی رووتی ئەویان دەلستەوە، مشتێ گەلاّی درەختی گاری هەڵگرت، هاوێشتیە ناو ئاگرەوەو ئاخی هەڵکێشا.

–پاشان دەستم دەگرتی، بەلّێ کریست.. دەستم دەگرتی، دەچووینە ژوورەوەو بەسەر تاوێرە بەردەکانی حەوشەوە رادەکشاین، بنی پێی خۆمان بەیەك وەدەنووساند، هەستمان دەکرد کە گەرمایی لەشمان تێکەڵ بەیەك دەبوو، لە پێوە دەگەیشتە رانو لە رانەوە دەگەیشتە کەمەرمانەوە، پاشان چاوانمان دادەخست و...

گەنجەکە دووبارە هاواری کرد ((بەسیکە))و دەستی بلّند کرد تا دەمی بگرێ بەلاّم خۆپارێزی کرد، دەترسا لەوەی کە دەستی بە لێوی بکەوێ.

ژنە ئاهێکی هەڵکێشا، دەنگی خۆی تا سەرحەدی زەمزەمە کز کردبوو بەردەوام بوو: ((هیچ کاتێ لە تەواوی عومری خۆم گەرمایی وام هەست پێنەکرد بوو)) تۆزێ وەستاو پاشان پێداچوو ((کریست هەمان ئەو گەرمییەیە کەلەو کاتەوە تا ئەمڕۆکە لە دەروونی پیاواندا بەشوێنیدا دەگەڕێم بەلاّم نەمدۆزیوەتەوە))

گەنجەکە رووخساری خۆی لە میانی ئەژنۆکانی پەنهان کرد بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((ئەدونیا ... ئەدونیا .. فریام کەوە)).

بێدەنگی ژووری گەرمو ئارامبەخش جگە لە بلّقە بلّقی لۆبیای ناو قاپەکەو گزەگزی ئاگر لەو کاتەدا کە بەداری سوتاو دەکەوت، هیچ شتێکی دیکە ئەو بێدەنگیەی نەدەشکاند، لە دەرەوە، ئاوی بەخوڕ لەگەڵ گوڕەی ئاسمان دەهاتە خوارەوە، رانەکانی لێك دەکردەوەو زەق زەق پێدەکەنی، مەجدەلیە کە ئێستا جورئەتی رووبەڕووبوونەوەی ئەوی نەبوو پرسی: ((کریست بیر لە چ شتێ دەکەیتەوە؟

کریست بە دەنگێکی کز، وەلاّمی دایەوە: بیر لە خودا دەکەمەوە، خودا .. ئەدۆنیا))

لە کاتێ کە قسەی دەکرد، لە بەسەرزمان هێنانی ناوی خودا لەم ماڵەدا داوای لێبوردنی دەکرد، مەجدەلیە لە جێوە قیت بۆوەو لە میانی سۆپاو دەرگا، دەستی کرد بۆ سەرەوەچوونو هاتنە خوارەوە، خەشمێکی سەرکێش لە زەینیدا دەجۆشا، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((خودا گەورەترین دوژمنی مرۆڤە، بەڵێ خودا. دەست لە فزولی هەڵناگرێ، شەڕانگێزو حەسودە، ناهێڵێت کەسێك خۆشحاڵ بێت))

لە پشتی دەرگا وەستاو گوێکانی تیژ کرد، ئاسمان نەعرەتەی بوو، گەردەلولێ هەڵسابوو درەختەکانی هەناری لە حەوشەدا وا بەیەك دادەکوتا دەتگوت هەر ئێستێ وردوخاش دەبن.

گوتی: ((باران تۆزێ وەستاوە))

گەنجەکە لە کاتێکا هەڵدەستایەوەو گوتی: ((من دەڕۆم)).



((یەکەمجار شیڤ بخۆ تا گیانت بێتەبەر، لەوشەوە رەشو بارانییە دەتەوێ بۆ کوێ بچیت؟))

سفرە ی لە دیوار کردەوەو لە ناوەندی ژووردا پانی کردەوە،تێکەڵەی گۆشتو لۆبیای بەسەر ئاگرەوە هەڵگرت، دەرگەی رەفەی کردەوەو دوو نانی جۆیینو دووکاسەی چەلاوی گۆشتو خواردنی هێنایە دەرەوە، گوتی: ((بەناوی خودا، ئەو شیڤە بەدە ئەی جانگی پەرستن، ئەگەر حاڵت تێکناچڕژێ فەرموو بیخۆ))

گەنجەکە برسی بوو بەبێ بەفیڕۆدانی کات دەستی بۆ لای خواردن رەپێش کرد، ژنە خەندییێکی نازئامێزی کردو بە پسەپسەوە گوتی:

–هەروا بەبێ خوێندنی دوعا خواردن دەخۆی؟ چاتر نەبو یەکەمجار شوکری خودا جێ بەجێ بکەیت بە خاتری ئەوەی کە بەدکاری نانو لۆبیات دەداتێ؟ لوقمە لە گەروی کریست گیری خواردو گوتی: ((مێرێ بۆ لە من بێزاری؟بۆسەرت لەبەر سەرم دەنێ ی؟ تەماشاکە ئەمشەو نان دەخۆمو لەگەڵ تۆ بەشی دەکەم، دوبارە بووینەوە دۆستی یەکتری، رابردوو بەسەر چووە، لێم ببورە، هەر لەبەر ئەمەیە کە هاتوومەتە لای تۆ)).

–نالەوزاری مەکە بیخۆ ئەو قسانە چییە دەیکەیت هەی ناسەلامەت، تۆ پیاوی.

دەستی بەرز کردەوەو نانەکەی کردە دوو پارچە، بەخەندەوە گوتی: ((سوپاسی خودا دەکەین بەخاتری ئەوەی کە نانو لۆبیاو خراپەکاری ... میوانانی پارێزکاری بۆ دونیا ناردوە.

ئەوان لە بەرامبەر یەکتریو لەژێر نوری چرادا دانیشتبوون، زیاتر لەوە هیچیان نەگوت. هەردوکیان برسی بوون، هەردوکیان بەرگەی ئازارێکی زۆریان لەمڕۆکەدا گرتبوو، خواردنیان دەخوارد تا هێزو گوڕیان وەبەر بێتەوە، باران کپ ی کردبوو، خەشمی ئاسمان داگیرسابۆوە، زەوی ئاوس بوو بوو، هیچ دەنگێ جگە لە سەدای خەندەی جۆگەلەکان کە بە شادومانیەوە لەبەر درێژی کوچەکانەوە سەرەو ژێر دەبوونەوە نەبوو، ئەوان دەستیان لە خواردن کێشایەوە، لە ناو رەفەکەوە قومە شەڕابێکیشی لێ بوو، خواردیانەوەو چەند دەنکە خورماییێکی گەییویشیان وەك مەزە

بەسەردا خوارد، هەردوکیان بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوون، سەیری ئاگریان دەکرد کە لە حالّی خامۆش بوون دابوو، هاورێ لەگەڵ مەشخەڵەکانی میرا زەینیان بەرز دەبووە دەهاتە خوارەوەو دەکەوتە سەماوە.

هەوا سارد بوو، گەنجەکە هەڵسایەوە سەر پێ، برێ داری هاوێشتە ناو ئاگرەکەو مەجدەلیە مشتێکی تری گەلاَی دار گاری هاوێشتە سەر، بۆنی عەتر ژووری پڕ کرد، بەرەو لای دەرگا چوو کردیەوە، بایێ هەڵیدەکرد، هەورەکان پەرتو بلاَو بووبوونەوە، دوو ئەستێرەی پڕ جریوە تازە لە ژێر بارەوە هاتبوونە دەرەوە نوریان هەڵدەڕشاندە حەوشەی دەرەوە.

گەنجەکە دوبارە دوو دڵ لە ناوەندی ژوور وەستابوو، پرسی ((هێشتا باران دێ))؟ بەلاَم مەجدەلیە وەلاَمی نەدایەوە، حەسیرێکی کردەوە، لە یەخدان دا سەرپۆشێکو داپۆشێکی پەشمینی گەورەی کە دیاری مەعشوقەکانی بوون، هێنایە دەرەوەو لەبەردەم سۆپاکەوەهاویشتە سەر جێ.

–تۆ لە هەمان ئەو جێیە دەخەوی، لەم ئەم نیوەشەوە بەم هەوایە ساردو باو بۆرانەدا دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟ لە سەرمان دەمری، لە هەمان جێدا لە کەنار ئاگر دەنووی.

گەنجەکە کەوتە لەرزەوە ((هەر لێرە!))

مەجدەلیە وەلاَمی دایەوە ((نەکا بترسێی؟ خەیاڵت رەحەت بێ کۆتری بێ گوناهی من، کارم بە تۆ نییە، نازنازی من مەترسە، تووشی وەسوەسەت ناکەم لێ گەڕێ با دەستێ بە پاکیزەییت نەکەوێت)).

داروپەردوێکی زیاتری خستە ناو ئاگرو فتیلی چراکەی کز کرد ((خەوی خۆش ببینی بەیانی هەردووکمان کارێکی زۆرمان لە پێشە تۆ دووبارە دەکەویە رێگاوە تا بەدوای رزگاری خۆتدا بکەویتو منیش بچمە رێگاییێکی دیکەی تایبەت بەخۆم، منیش بەدوای رزگاری دا دەگەڕێم، هەر کەسەو بەڕێگای خۆی.

هیچ کاتێ یەکتر نادۆزینەوە.. شەو بەخێر...



مەجدەلیە ئەو کاتە خۆی هاوێشتە سەر دۆشەگو سەری لە سەرین بردە خوارەوە، شەو تەواوی شەوێ، بۆ ئەوەی بەر لە گریانو ناڵە بگرێت گازی لە لێفەکەی دەگرت، دەترسا نەوەکا جەوانمەردەکە کە لە کەناری ئاگردا خەوتبوو، لە بیستنی دەنگی ئەو بترسیتو را بکات، بە درێژایی شەو گوێی لە هەناسەی ئەو گرتبوو کە وەك هەناسەی منداڵێ وابوو بەسەر سینەی دایکیەوە، بەئارامی وئاخ هەڵکێشانی نەرمەوە لە دەروونی خۆیا دەگریاو وەك دایکێ لایلایەی بۆ دەکرد.

سپێدەدەمی رۆژی دوایی لە میانی پێڵوە نیوە کراوەکانیدا سەیری کردو ئەوی بینی بێدار بۆتەوە، کەمەربەندی چەرمینی خۆی بەتوندی لە دەورەی کەمەری خۆی بەستاو دەرگای کردەوە، لەوێ وەستا، دەیەویست بڕوات، بەلاَم لە هەمان کاتدا، نەیدەویست، گەڕایەوەو سەیرێکی کردە تەختەی خەوو بەدوو دڵیەوە هەنگاوێکی بۆ لای هەڵێنا، لە ناو ژووردا هێشتا تەواو رۆشن نەبوو بۆوە، لار بۆوە وەك بڵێی گەرەکی بوو بەدوای ژنەکەدا بگەڕێ و دەستی لێدا، دەستی چەپی خۆی نابووە ژێر کەمەریەوەو بە دەستی راستی چەنەگەو دەمی داپۆشی بوو.

ژنە بە بێ حەرەکەت بەسەر پشتەوە راکشابوو قژی مەمکی رووتی ئەوی داپۆشی بوو، لە میانی پێڵوەکانیدا سەیری ئەوی دەکردو تەواوی بەدەنی دەلەرزی، لێوەکانی جولان: ((مێرێ.)). بەلاَم بە بیستنی دەنگی خۆی هەراسان بوو، بە پازێك خۆی گەیاندە ئاستانەی دەرگا، بە پەلە حەوشەی بڕیو کیلۆنی دەرگای کردەوە..

ئەوکاتە مێرێ لە کاتێکدا لێفی بەسەرا فڕێ دەدا دەستی کرد بە گریان.

## بەشی هەشتەم

دێرەکە لە بیاباندا لە پشت دەریاچەی گنسارتەوە بوو، بە سوورە بەرد دروست کرابوو، لە ناوەندی بەردە زلەکانەوە سوورایی شاراوەبوو، نیوەشەو بوو، لە ئاسماندا سێلاوئاسا باران دەهاتە خوارەوە، کەمتیارو گورگو چەقەل لورەلوریان بوو، جووتە شێرێ کە لە دەست بروسکو هەورەتریشقەی یەك لە دوای یەك شێتو هار بوو بوون، دەیاننەڕاند، دێرەکە کە لە تاریکی ئەنگوستە چاودا روو چوو بووە خوارەوە، چەرمەبەندی هەورەتریشقەی بەسەر گەردەوە دەژەنرا..

وەك بلێی خودای کێوی — گور- قامچی خۆی دەوەشاند، رەبەنەکان لە حوجرەکانیان کەوتنە سوژدەوە، بە پاڕانەوە داوایان لە ئەدۆنیا دەکرد کە دووبارە زەمین نغرۆ نەکاتەوە، ئەدی ئەو وادەی بە حەزرەتی نوح نەدابوو؟ مەگەر پەلکەزێڕینەی بەناونیشانی دۆستایەتی لە ئاسماندا نەنەخشاندبوو، لە نێوان حوجرەکاندا تەنها حوجرەی — عابید- روناك بوو، -یەواکیم- عابید خۆی پەیکەرێکی ئێسقان ئاساو ریشێکی سپی پەرشو بلاوو بازووی خاچ ئاساو چاوانی داخراو بە هەناسەبڕکێوە، بەسەر تەختێکی بەرزەوە کە لە داری سەرونیاز بوو لە پرتەوی چراییێکی هەفت لقە دانیشتبوو گوێی لە یۆحەننا راگرتبوو، شاگردی جحێڵ لە کەناری کتێبگرەوە وەستاوەو قسەکانی دانیال پێغەمبەر بۆ ئەو دەخوێنێتەوە:



-شەوانە لە جیهانی بە خەون بوودا بینیم کە چەند باییێکی چووار لایەنەی ئاسمان لە بەرزایی دەریای گەورەدا هەڵیکرد، چووار وەحشی زەبەللاح لە ناو دەریادا هاتنە دەرەوە کە هیچیان بە یەکتر نەدەچوون، یەکەمیان وەکو شێر بوو باڵی بازانی هەبوو، سەیرم کرد تا باڵەکانی لێك کردەوەو لە زەوی بەرز بۆوەو وەکو مرۆڤ بەسەر پێیەکانی خۆی وەستاو قەراری گرت، دڵی مرۆڤی لە سینەدا دانرا، پاشان وەحشی دووەم هاتە دەرەوە کە وەك هرس وابوو، بەویان گوت راپەڕەو گۆشتێکی زۆر بخۆ، پاشان سەیرم کردو تا دوایی وەحشی سێهەم وەکو پڵنگ وابوو کە چووار باڵی باڵندەی بەسەر پشتەوە بوو، ئەو وەحشە چووار سەری هەبوو کە سەڵتەنەتی بەو بەخشی بوو،

شاگرد کەوتە شڵەژانو لە خوێندنەوە وەستا، ئیدی دەنگی ئاخی عابیدو کشانو هەڵچوونی نینۆکەکانی بەسەر تەختەوە نەدەبیسترا، هەتا دەنگی هەناسەشی نەدەبیسترا، نەکا مردبێ؟ ئێستاکە ئەوە چەندین رۆژە کە خۆی لە خواردن بێبەری کردبوو، لە دەست خودا تووڕە بووبوو دەیەویست بمرێت، ئەو بابەتە بۆ براکان رۆشن بوو کە ئەو دەیخوازی بمرێت. هەتا رۆحی لە ژێر باری جەستەدا رزگاری بێت، سوکباڵ بێت بەرەو ئاسمان پەڕبگرێت تا خودا بدۆزێتەوە، شکایەتی لە دەست خودا هەبوو، دەبوایە شکایەتی خۆی لە کاتی دیتنی ئەودا بەرز بکاتەوە. بەڵام تۆزو گەردی لەش ببووە پەردەی تەبەشی گیانی ئەوەوە، بڕیاری دا دەست بەسەر لەشی خۆیدا بگرێو لەناو گۆڕدا رەهای بکات تا (یەواکیم) ی حەقیقی بتوانێ بەرەو ئاسمان پەڕبگرێو پەریشانی خۆی بەخودا بڵێت ئەوە وەزیفەی بوو، مەگەر نا ئەدی ئەو یەکێ لە باوکانی سراییل نەبوو خەڵکی دەمیان هەبوو بەڵام دەنگیان نەبوو.

نەیاندەتوانی رووبەڕووی خودا بوەستنو ئازاری خۆیان بگێڕنەوە بەڵام یەواکیم دەیتوانی چارەی دیکەی نەبوو.

(شاگرد) بەرەو لای ئەو گەڕایەوەو سەیری کرد، سەری عابید کە وەکو پیرەدارێکی کرم لێدراو کون کون بوو بوو هەتاوو بەرۆژو بوون هیشكو بریشکیان کردبۆوە، لەژێر مەشخەڵی مۆمدا بەشێوەییێکی عەجیب لەو کەللەسەرە بە باران شوراوانەی ئاژەڵە سەرەتاییەکان دەچوو کە جارەجارە کاروانچیان لە بیاباندا رووبەڕوویان دەبوونەوە،

دەبێ چ سروشتێکی وەبەرهاتبێ، چەندین جار ئاسمانو بنی دۆزەخ بۆ ئەو کرابێتەوە! زەینی پەیژەی یاکوب بوو، کە تەواوی ترسو ئومێدی سرائیلی پیایا سەرکەوتبوو هاتبووە خوارەوە، عابید بەکردنەوەی چاوانی یۆحەننای بینی لە بەردەمیا وەستاوەو رەنگی وەکو مردوان سپی هەڵگەڕاوە، لە روناییی قەندیلدا موی یۆحەننا تازە رستەی گۆناکانی بەتەواوی پاکیزەگی خۆیەوە دەدرەوشایەوە، چاوەکانی کە قووڵ ببوون تژی خەم بوون، چەهرەی عەبوسی عابید گەش بوو، ئەو گەنجە جوانەی کە لە چنگی زوبەدی پیری باوکی فڕاندبوو هێنابوویە ئێرەوە تا وەقفی خودای بکات، ئەو خوودی نەرمو نیانو دڕندەخوویی‌و لێوانی خامۆش‌و چاوانێ کە تێربوونی نەبوو هەروەها رووخۆشی‌و هۆشی تیژی ئەوی خۆشدەویست، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە:

"رۆژێ دێ ئەو کوڕە لەگەڵ خودا قسە دەکات، هەموو ئەو شتانەی من نەمتوانی ئەنجامی بدەم ئەو ئەنجامی دەدات، دوو دانە برینیش کە بەسەر شانمەوە هەیتم دەبێتە باڵ، لە دەورانی ژیانم دا بەرزنەبوومەوە ئاسمان، بەلاّم ئەوهەما ئەو سەرکەوتنە لەبەرزبوونەوەیدا بۆ ئاسمان وەدەست دەهێنێ.

ئەو کوڕەیان جارێکیان لەگەڵ باوكو دایکی هاتبووە دێرەوە، جێژنەی پسح بوو، عابید کە لە خانەوادەی دووری زوبەدی بوو، بە رووخۆشی ئەوانی قبوڵ کردو بەسەر تەختی خۆیەوە داینیشاندن، یۆحەننا ئەو دەم نزیکەی شانزە ساڵی بوو، لە هەمان کاتدا کە بەسەر خۆراکەوە لار ببۆوەو دەیخوارد هەستی کرد کە چاوی عابید لە پێستی سەری بۆتەوە، ئێسقانەکانی فڕێ داوە، لە لای درزی کەللەسەری رەتی کردوەو گەیشتۆتە مێشکیەوە، بە وەحشەتەوە سەری بەرز کردەوەو دوو نیگای لە میانی هەوادا بەسەر مێزی تایبەتی مەراسیمی جەژنی –پسح- پێك گەیشتن.

هەر لەو زەمانە بەدواوە، قایغەکانی ماسیگری‌و دەریاچەی گنسارت بۆ ئەو فراوان نەبوو، ئاخێکی هەڵکێشاو کەوتە لێکدانەوە، تا ئەوەی کە رۆژێکیان سپێدە زوبەدی پیر حەوسەڵەی نەماو هاواری کرد ((حەواست لای ماسی گرتن نییە، لای خودایە، یاڵلاّ برۆ دێرەوە، من دوو کوڕم هەیە خوداوەند ئیرادەی لەسەر بوو کە ئەو دوو کوڕەی لەگەڵدا بەش بکەم، زۆر باشە، ئێستا دابەشی دەکەین وخەیاڵمان رەحەت دەکەین)).



عابید سەیری کوڕەکەی کرد کە لە بەردەمیا وەستا بوو، بڕیاری دابوو سەرزەنشتی بکات، بەلاّم بەسەیر کردنی ئەوەوە تەبەشی گەش هەڵگەڕا، پرسی ((کوڕم، بۆ لە خوێندن وەستای؟ قسەکانت بەنیوە چڵی جێ هێشت؟ مرۆڤ نابێ ئەو کارە بکات، ئەو پێغەمبەرێکە حورمەت گرتنی پەیامبەران ئەرکە)).

رووخساری کوڕە وەك گوڵ سوور هەڵگەڕا، جارێکی دی کتێبی چەرمینی بەسەر کتێبگرەوە کردەوەو کەوتە خوێندنەوە..

–پاش ئەمە، سەیری خەونەکانی شەوم کرد، ئێستا وەحشی چووارەم کە ترسناكو بە هەیبەت بوو زۆر بە هێز بوو، ددانی زلی ئاسنینی هەبوو، پاشماوەکەی دەخواردو پارچە پرچەی دەکردو بە پێکانی خۆی وردوخاشی دەکرد، لە وەحشەکانی دیکە نەدەچوو دە قۆچی هەبوو، عابید هاواری کرد((زۆرتر مەڕۆ.. بەسە)).

–کوڕەکە لەبەر هاوار کردن کەوتبووە وەحشەتەوە، نووشتەی ی پیرۆزی ناو دەستی کەوتە سەر بەردرێژەکەوە، هەڵیگرتەوەو لێوی خۆی لەسەر داناو ماچی کرد. ئەو کاتە رۆیشتو لە گۆشەییێکەوە وەستاو چاوی بڕیە مەولاکەیەوە، عابید کە ئێستاکە نینۆکەکانی لە تەختەی دانیشتن بردبووە خوارەوە، هاواری دەکرد ((ئەی دانیال تەواوی پێشبینیەکانی تۆ هاتەدی، هەر چووار وەحشی هێرشیان کردۆتە سەر ئێمە، ئەو شێرە بەباڵە بازئاساکانی هاتو ئێمەی هەڵدڕی هرسێ کە گۆشتی کەلیمیەکان دەخوات، هاتو ئێمەی خوارد، پڵنگ ی چووارسەر لە رۆژهەلاّتو رۆژئاواو باکوورو باشوور ئێمەی داوەتەبەر قەپ، دڕندەی نەنگینی دە قۆچ ئێستا لە بەرزاییی ئێمەوە دانیشتووە، هێشتا نەهاتووە، هێشتا راینەکردوە، تەواوی بێشەرمی‌و ترسێ کە پێشبینیت کردبوو بینێریتە سۆراغمان ئەی پەروەردگار ناردتو سوپاست دەکەین. بەلاّم پێشبینی شتی باشیشت کردبوو، بۆ ئەوانت رەوانە نەکرد؟ بۆ کاتێ کە پێی ئەوان لە میاندایە قرچۆك دەبێ؟ موسیبەتەکانت بە دەستێکی کراوە بە ئێمە بەخشیووە، ئێستاش نیعمەتەکانی خۆت سەخاوەتمەندانە بۆ ئێمە هەرزان فرۆش کە! ئەو کوڕە مرۆڤەی کە تۆ وادەت بە ئێمە داوە بینێریت لە کوێیە؟ .. یۆحەننا بخوێنەوە!))

کوڕەکە لە گۆشەکەوە وەستا بوو کتێبەکەی لە ژێر هەنگلی نابوو، بۆ لای کتێبگرەوەکە چوو دووبارە دەستی کرد بە خوێندنەوە، بەڵام دەنگی وەك دەنگی مەولای خۆی ئێستاکە تووڕەو توندبوو:

-تەماشای خەونی شەوانم کرد ئێستاکە وەکو کوڕی مرۆڤ لەگەڵ هەوری ئاسمان هاتو گەیشتە لای رۆژانی قەدیمو ئەویان بۆ لای هێنا سەڵتەنەتو جیلوەو مەلەکوتیان بەو دا تەواوی میللەتانو مرۆڤ بە زمانی جیاجیا کەوتنە خزمەتی ئەوەوە سەڵتەنەتی ئەو جاویدانییە، هیچکاتێ دیماهی بۆ نییە، مەلەکوتی ئەو هەمیشەو بەردەوامە.

عابید کە ئیدی یارای بەرگەگرتنی نەبوو، بەسەر تەختەوە بەرز بۆوەو هەنگاوێکی هەڵێناو پاشان هەنگاوێکی دیکە، ساتمەی کرد، زۆری نەمابوو بکەوێتە خوارەوە، بەڵام پێشدەستی کرد ناولەپی دەستی بەتوندی بەسەر نووشتەی پیرۆز داگرتو بالآنسی خۆی وەدەست هێنایەوە،

_ ((ئەو کوڕە مرۆڤەی کە وادەت بە ئێمە دابوو لەکوێیە؟ مەگەر قەولت بە ئێمە نەدا؟ ناتوانی ئینکاری بکەیت. لێرە نووسراوە!)) دەستی خۆی بە تووڕەییەوەو لە هەمان کاتدا لە رووی شادیەوە کوتایە سەر نووشتەوە: هەرلێریە، نووسراوە، یۆحەننا دووبارە بخوێنەوە))، بەڵام عابید نەیدەتوانی لە چاوەڕوانی دا بمێنێتەوە، بەر لەوەی کە شاگرد هەلی دەست پێکردنی پەیدا بکات. نووشتەی گرتو لە ژێر نوردا گرتو بەبێ سەیرکردن، بەهاوارێکی پیرۆزمەندانە دەستی کرد بە خوێندنەوە " سەڵتەنەت جەلالو مەلەکوت بەو دراوە، تەواوی میللەتانو مرۆڤ بە زمانی جیاجیا لە خزمەتی ئەو دابوون، سەڵتەنەتی ئەو جاویدانییە، هیچکاتێ کۆتایی نییە، مەلەکوتی ئەو هەمیشەییە)).

ئەو کاتە کتێبی بەسەر کتێبگرەوە رەها کردو لە پەنجەرەوە روانیە تاریکی دەرەوە.لە کاتێکا دەیڕوانیە تاریکەشەوو هاواری کرد ((کەواتە ئەو کوڕی مرۆڤە لەکوێیە؟ ئەو ئیدی هی تۆ نییە، چوونکە وادەی ئەوەت بە ئێمە داوە، ئەو هی ئێمەیە، یاڵڵا بڵێ لە کوێیە؟ بۆ سەڵتەنەتو جەلال مەلەکوتی پێنادەی تا خەڵکی تۆ، خەڵکی سراییل،



فەرمانڕەوایەتی تەواوی جیهان بکات؟ هەروا دەڕوانینە ئاسمانو چاومان لە رێ کردۆتەوە ماوینەتەوە، گەردەنی ئێمە وشك بۆتەوە، کەی کەی؟ بۆ ئەوەندە رایدەکێشی، ئێمە باش دەزانین کە یەك ساتی تۆ هەزار ساڵی مرۆڤە، زۆر باشە بەڵام ئەگەر ئەی پەروەردگار تۆ دادگەر بیت ئەوە زەمانە بە پێوانەی مرۆڤ دەپێوی نەك بە پێوانەی خۆت، مانای عەدالەت ئەوەیە))..

بەلای دەرگاوە کەوتە رێ، بەڵام ئەژنۆکانی خاوبۆوە وەستا، دەستەکانی بۆ پێشەو هاوێشت، وەك بڵێی دەیەویست بەلآنسی خۆی بپارێزێ، کوڕێژگە رای کرد تا یارمەتی بدات، بەڵام عابید تووڕە بوو بە هێمای سەر نەیهێشت، بە وەبەرهێنانی تەواوی هێزو توانایەوە خۆی گەیاندە پەنجەرەوە، پشتی بە دیواردا سەری تا ئەو جێیەی کە دەیتوانی درێژە کردەوەو سەیری دەرەوەی کرد، شەوەزەنگ بوو، هەورەتریشقە، ئێستاکە کەمتر هەڵدەبەزیەوە، بەڵام ئاوەکان هێشتا لە لابەلای تاوێرە بەردەکانەوە کە لە کەناری دێردا قەراریان گرتبوو بە گوڕڕەوە دەهاتنە خوارەوە هەرکاتێ کە هەورەتریشقە دادەبەزیە سەر کاکتوسەکان وا دیاری دەدا کە بەدەوری خۆیاندا دەسووڕێن، بە شێوەی مرۆڤی نەخۆش کە وێڕای مۆرەکانی بازووی کە بۆ ئاسمان بەرز بوو بۆوە، ماهیەتی خۆیان دەگۆڕی،

عابید بە جەستەو رۆحی لە هەڵچوون دابوو گوێی رادەگرت، لەوان دوورەوە لورەلوری وەحشیەکانی بیابان دەهات، ئاژەڵەکان برسی بوون، ترس دایگرتبوون، لە نزیکتر، بەسەرسەری ئەوانەوە، ئاژەڵێ لە میانی ئاگرو تۆزوبادا، هەراو زەنای دەکرد، لە تاریکیدا دەهاتە پێشەوە، عابید گوێی دەدایە دەنگی بیابان، لە هەمان حاڵدا لە پڕێکا لەبەر خۆی لەرزیو گەڕایەوە، بوونەوەرێکی نادیار هاتبووە ناو حوجرەکەیەوە، حەوتەوانەی چرا بەشێوەییێکی تێکچڕژاو جریوەجریویان بوو، لە ئاستانەی خامۆشی دا قەراریان گرت، تاری نۆ ژێی روباب کە بە بێ سوود لە گۆشەیێ کەوتبوو، وەحشیانە کەوتە لەرزەوە، وەك بڵێی دەستێکی نادیار لەڕوی توڕییەوە دەستی هاوێشتۆتە سەریانو دەیەویست لە جێوەیان هەڵتەکێنێ، بەدەنی عابید کەوتە لەرزەوە، بە ئارامی لە کاتێکدا سەیری دەوروبەری دەکرد، گوتی: ((یۆحەننا وەرە ئێرە نزیکی

من)). کوڕێژگەکە بە چاپوکی لە جێوە پەڕیو هاتە نزیکو گوتی: ((ئەمرکە باوکە)) کەوتە سەر ئەژنۆکانی خۆی تا سوژدەی بۆ ببات.

-یۆحەننا بڕۆ ڕەبەنەکان بانگ بکە، بەر لە کۆچ دەبێ شتێ بەوان بڵێم.

-بەر لە کۆچ باوکە؟

کوڕە کەوتە لەرزەوە، دوباڵی گەورەی ڕەش کە لە پشتی پیرەمێردەوە وێکدەکەوتن، بەرچاوی کەوتبوو، عابید گوتی: ((من دەڕۆم)) دەنگێ وەك بڵێی لە پڕێکا لە پشتەوەی کەنارێکی دیکەوە دەهات ((من بەسەرچوویمە، جریوەی بلێسەکەو جیابوونەوەیت لە فتیلەکە نەبینی؟ دەنگی لەرینەوەی دێوانەئاسای تاری ڕوبابت گوێ لێ نەبوو؟ یۆحەننا، من تەواو بوویمە، پەلەکە ڕەبەنەکان بانگ بکە دەمەوێ قسەیان لەگەڵدا بکەم.

کوڕیلە سەری دانەواندو ون بوو، عابید لە نێوەندی حوجرەداو لە ژێر قەندیلی حەوت لقدا لە جێوە مایەوە، دەیتوانی ئازادانە بە بێ ترس لە بیستن ڕازی دڵی خۆی بڵێت، دەیزانی خوداوەند ڕووبەڕووی وەستاوە،

-وادێم.. وادێم..بۆ دێیتە ژوورەکەم؟ بۆ هەوڵدەدەی چراکان خامۆش کەی‌و دەتەوێ ڕوبابەکە وردو خاش بکەی‌و من دەستگیر بکەیت؟ وادێم نەك تەنها بە خواستی تۆ، بەڵکو بەخواستی خۆم، وادێم، چەند ستوونێکم لە دەست دایە کە گازندەی خەڵکەکانمە، دەمەوێ تۆ ببینم‌و قسەت لەگەڵدا بکەم، دەزانم گوێ ڕاناگری، یا لانی کەم واخۆت دەنوێنی، بەڵام ئەوەندە ئەڵقەکە لە دەرگا دەدەم تا دەرگام بەڕودا بکەیتەوە، ئەگەر دەرگە نەکەیتەوە (هیچ کەس لێرە نییە تا گوێی لە دەنگم بێ، لەبەر ئەمە ئازادانە قسە دەکەم)

دەیشکێنم تۆ دڕندە خووی ومرۆڤی توندخووت خۆش دەوێ، تەنها بۆ ئەوان وەکو کوڕانی خۆت دەپەیڤی، تا ئێستا ئێمە گریاوین، کەوتوینەتە سەر خاکت‌و گوتومانە ((خواست خواستی تۆیە)) بەڵام پەروەردگارا زیاتر لەوە ناتوانین بەرگە بگرین؟ ئاخر



دەبێ تا چەند لە چاوەڕوانی دا بمێنینەوە؟ تۆ دڕندە خووی، مرۆڤی دڕندە خووت خۆش دەوێ، ئێمە دەبینە دڕندەخو، ئێستا خواست خواستی ئێمەیە.

عابید لە کاتێکا قسەی دەکرد، گوێکانی تیژ کردبوو تا ئەوەی کە لە هەوادا بوو ببیستێ، هەورەتریشقە بەبەردەوامی‌و لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهات، مەشخەڵەکان یەکڕیز لە بەرزایی سەری سپی پیرەمێردەوە دەسووتان.

عابید لە بێدەنگیدا بە چاوەڕوانی مایەوە، ماوەیەك ئارامی گرت تا مەشخەڵەکان بکەونە جریوەو ڕوبار دووبارە بکەوێتە دەنگەوە، هیچ ڕوینەدا! سەری ڕاتەکاندوبەزەمزەمەکردنەوە گوتی: جەستەی مرۆڤ نەفرەتیە، ئەو جەستەیەیە کە هەمیشە دەبێتە پەردەی ڕۆحی، ئەو لە دیتن‌و بیستنی شتی نادیار بێبەش دەکات، ئەی پەروەردگار گیانم لێ بستێنەوە، دەمەوێ توانای وەستان لەبەرابەر تۆدا بەبێ پشت دانە دیوار پەیدا بکەم، تا ئەو کاتەی کە قسە لەگەڵ من دەکەی گوێم لە دەنگت بێ!))

لە هەمان کاتدا، دەرگای حوجرەی بێ سەروسەداوە کراوە ڕەبەنەکان لە ناوەخت بێداربوو بوونەوەو بە جلی سپی هاتبوونە ناو قیتارەکەو وەکو تارمایی ڕووبەڕووی دیوار وەستان‌و لە چاوەڕوانیدا مانەوە، وشەکانی کۆتایی عابیدیان بیستبوو، هەناسەیان لە گەرو گیر ببوو، بە یەکتریان دەگوت، پیرەمێرد قسەی لەگەڵ خودا کرد، خودا سەرزەنشتی دەکات، هەر ئێستاکە هەورەتریشقە بەسەرمانا دادەبەزێ))

بەم قسەیە بەترس‌و لەرزەوە ڕووبەڕووی دیوار وەستان.

عابید سەیری دوور دووری دەکرد، چاوەکانی لە شوێنێکی دیکە بوون، نەیاندەدیت، شاگردەکە نزیك کەوتەوەو کەوتە سوژدەوە ((باوە ئەوان هاتوون)) بە ئارامی قسەی دەکرد تا نەبادا هەراسانی بکات. عابید دەنگی بەردەستەکەی خۆی بیست. گەڕایەوەو ڕەبەنەکانی بینی، لە کاتێکدا بە ویقارو دڵنیاییەوە بەڕێدا دەڕۆیشت، جەستەی گیانەڵای ڕاست کردبۆوە، لە ناوەندی حوجرەدا بەرەو لای تەختەکە کەوتەڕێ، بە پێش مێزێکی کورتدا سەرهەڵگەڕاو وەستا، قاپی چەرمین تەورات کە لە

ناو بازووبەندی بوو، کرایەوە، شاگرد بە خێرایی بروسکە خۆی گەیاند، بەر لەوەی بکەوێتە خوارەوەو بێ حورمەتی پێ بکرێ، خۆی توند کرد، عابید دەستی درێژ کرد گۆچانی قەفتە عاجی تایبەتی خۆی کە لە کەنار تەختەکەوە بوو گرتە دەست، بە هەست کردن بە هێزێکی تازە، سەری بۆ سەرەوە هەڵبڕیو چاوی بڕیە لای ئەو ڕەبەنانەی کە ڕووبەڕووی دیوار بە ڕێزە وەستابوون، وای گوت:

–ئەی ڕەبەنەکان، دەمەوێ چەند وشەیەك کە دوا وشەکانی منن بۆ ئێوە بخەمە ڕوو، گوێتان بکەنەوە، ئەگەر کەسێ لە ئێوە خەوتووە، با ئێرە جێ بهێڵێ، ئەوەی کە دەمەوێ بیخەمە سەر زمان سەختە، تەواوی ترسو ئومێدی ئێوە دەبێ رابنو گوێیان تیژ کەنەوە تا وەڵامی من بدەنەوە.

باوکە هەبەکوك پیرترین یاوەری عابید گوتی: ((عابیدی پیرۆزی ئێمە سەراپا گوێین)). دەستی دانایە سەر سینە.

–ئەی ڕەبەنەکان، دوا وشەکانم ئەوانەن. چوونکە دیقەتی تەواوتان نییە، بە زمانی نمایش قسە لەگەڵ ئێوە دەکەم.

باوکە هەبەکوك، دوبارەی کردەوە ((عابیدی پیرۆز ئێمە سەراپا گوێین)).

عابید سەری دابەزاند بە دەنگێکی ناسك گوتی:

((سەرەتا باڵەکان هاتنو ئەوسا فریشتە " قسەی خۆی بڕیو ڕەبەنەکانی تاك تاك خستە ژێر نیگاوە، پاشان سەری تەکاندا،" بۆ ئاوا بە دەمی کراوە سەیری من دەکەن؟ باوکە هەبەکوك تۆ دەستت بڵند کردو لێوت جولاند، سکاڵات هەیە؟

ڕەبەن دەست بەسینەوە گوتی: ((ئەی عابیدی پیرۆز تۆ گوتت سەرەتا باڵەکان هاتنو ئەوسا فریشتە)) ئێمە ئاگامان لە وتەی ئاوا نەبووە لە کتێبی پیرۆز)).

–باوکە هەبەکوك چۆن دەتوانیت ئاگاداری ئەو ووشانە بیت؟ ئەفسوس! زەینی تۆ هێشتا تیروتاریە، گوفتاری پەیامبەران لە بەرچاو دەکەنەوەو شتێ جگە لە پیت نابینن، پیتەکان چی تیایەو دەتوانن ببن بە چ پەیامێ. ئەوان ئاسنی ڕەشی زیندانن،



لەو شوێنەی کە ڕۆح هاوار دەکاتو خەفە دەبێ، لە میانی پیتو هێلکاریو دەوروبەرو شیرازە ڕۆح ئازادانە دەسووڕێو من لە گەڵیا دەسووڕێمو ئەو پەیامە گەورەیە بۆ ئێوە دەهێنم، ڕەبەنەکان، سەرەتا باڵ بوو هاتن ئەو کات فریشتە، باوکە هەبەکوك دووبارە دەمی کردەوە: ((عابیدی پیرۆز، زەینی ئێمە لە مەشخەڵی خامۆش بوو دەچێت هەڵیانگیرسێنە تا بتوانین بچینە ناو نمایشو ببینین)).

–باوکە هەبەکوك، سەرەتا ئارەزوو بۆ ئازادی بوو، ئازادی بوونی نەبوو، بەڵام لە پڕێکا لە قوڵایی کۆیلەتیدا، مرۆڤی دەست بە زنجیر بەستراو وەك بڵێی هەروەکو باڵ بووینە بە خێرایی رایتەکاندوە، پاشان یەکێکی دیکەو یەکێکی دیکە عاقیبەت تەواوی خەڵك.

دەنگە پرسیارکەرەکان بە بەختەوەریەوە دەنگیان دایەوە ((خەڵکی سراییل))؟

–بەڵێ ڕەبەنەکان، خەڵکی سراییل! ئەو ساتەی کە دەیگوزەرێنین، ساتێکی گەورەو مەترسیدارە، تاسوق بۆ ئازادی واهەڵدەقرچێ، باڵەکان وەحشیانە وێك دەکەون، رزگارکەر لە حاڵی هاتن دایە! بەڵێ ڕەبەنەکان رزگارکەر خەریکە دێت، بۆ- سەیر بکەن، وا بیردەکەنەوە کە ئاخۆ ئەو فریشتەی ئازادییە لە چ ڕسکاوە؟ لە خاکەڕاییو چاکەی خودا؟ لە ئەڤینی ئەو؟ عەدالەتی ئەو؟ نا ئەو فریشتەیە لە سەبرو سەرسەختیو کێشمەکێشو جۆری مرۆڤ هێوێن بووە.

باوکە هەبەکوك جورئەتیدا بەرخۆیو پەلپی گرت " عابیدی پیرۆز ئێوە وەزیفەیێکی مەزنو بارێکی سەنگین لەسەر شانی مرۆڤ دادەنێن، یانی ئەوەندە بەوە دڵنیاییت."

بەڵام عابید پەلپەکەی بەهەند هەڵنەگرت، شەش حەواسی لای کریستیانو بوو، هاواری کرد: ((ئەو یەکێ لە کوڕانی ئێمەیە لەبەر هەمان ئەوەیە کە کتێبی پیرۆز بە ((کوڕی مرۆڤ)) قسەی لەگەڵ دەکات هاوخەوبوونی هەزاران مەردو ژنی سراییلی، نەوە لە دوای نەوە بۆچی بووە؟ ئایا بۆ ئەوە بووە کە کەفەڵیان لێك بسوونو درێژیو پانی رانیان ختوکە بدەن؟ نەخێر، تەواوی هەزاران ماچ بۆ بە وجودهێنانی کریست پێویست بووە)).

عابید گۆپاڵی لە تەختەکە دەداو بەردەوام بوو ((ئەی رەبەنەکان، ئاگادار بن. ئەو لەوانەیە لە نیوەرۆ بێت، لەوانەشە لە نیوەندی شەودا بێت، هەمیشە لە حاڵەتی ئامادەباشیدا بن، حەمامی کردەوەو برسی، بێدار، وای لە ئێوە، ئەگەر ئەو ئێوە بە پۆخڵیو تێرو خەوەوە ببینێ)).

ڕەبەنەکان وەکو مێگەلی مەڕ بەیەك وەنووسا بوون، جورئەتی سەر بڵندکردنیان نەبوو، هەستیان دەکرد کە لە جانگی سەری عابیدا مەشخەڵێ دەرپەڕیوەو هێرش دەکاتە سەر ئەوانەوە.

عابید کە لە سەرەمەرگدا بوو لە کاتێکا دەهاتە خوارەوە بە هەنگاوی توند بەرەو مێگەلی وەحشی رەبەنەکان چووە پێش، گۆپاڵەکەی بەرز کردەوە یەکەیەکەی لەمس کردن، هاواری کرد ((رەبەنەکان ئاگادارین، ئەگەر ئاگری ئارەزوو تاسوق ی ئێوە ساتێ خامۆش بێ، باڵەکان دووبارە دەبنەوە زنجیر، گوێ قولاغ بن،، بجەنگن، مەشخەڵی رۆحتان شەوو رۆژ بە داگیرساوی راگرن، تەوەرەکان بوەشێنن، باڵەکان تێراوکەن، من ئیدی رۆیشتووم، بەپەلەم تا لەگەڵ خودا قسە بکەم، من رۆیشتووم، دواهەمین وشەکانم ئەوانەن "تەوەرەکان بوەشێنن! باڵەکان ئامادەکەن!. لە پڕێکا هەناسەی گیرا، گۆچانی لە دەست کەوتە خوارەوە، پیرەمێرد بە بێ سەروسەدا بە ئارامیو نەرمییەوە کەوتە سەر ئەژنۆکانیو بە ئارامی بەسەر بەردڕێژەکەوە خزی، شاگرد هاواری کردو پەلەی کردە کۆمەگی مەولاکەی رەبەنەکان لە جێی خۆیانەوە کەوتنە حەرەکەت، سەریان دانەواند، عابیدیان دانایە سەر بەردەکانو چرای حەوت لقەیان هێنایە خوارەوە، لە کەنار رووخساری شینو بێ جولەی ئەویان دانا، ردێنی دەدرەوشایەوە، کراسی سپی کرایەوە، جلی کۆنو زبری ئەو بە سنجاقی تیژی ئاسنین کەسینەو تەنکێشی خوێنینی پیرەمێردیان داپۆشی بوو، وەدیار خست، باوکە هەبەکوك دەستی دانایە سەر دڵی عابید ((تەواوی کردوە))

یەکێکی دیکە گوتی: وادەی رەهابوونی هاتووە. سێهەمیان بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((دوو دۆست لە یەك بوونەتەوە، گەڕاونەتەوە ماڵەکانی خۆیان جەستە بۆ خاكو رۆح بۆ خودا))



بەلاّم لە کاتێکا ئەوان لەگەڵ یەك قسەیان دەکردو ئاویان گەرم دەکرد بۆ شورینی، عابید چاوی کردەوە، رەبەنەکان بە وەحشەتەوە پاشەکشەیان کرد کەوتنە روانینی ئەوەوە، رووخساری بریقەی دەدایەوە، دەستی لاوازو نینۆکی درێژی دەجولان، چاوەکانی بە خەواڵوییەوە بە هەواوە دوورابوو، باوکە هەبەکوك، کەوتە سەر ئەژنۆو دوبارە دەستی لەسەر دڵی دانا، بە رازکاریەوە گوتی: ((دڵی لێدەدا، نەمردووە)) رووی لە شاگرد کرد کە بەسەر پێیەکانی پیرەمێردا کەوتبوو ماچی دەکردن: ( رابە یۆحەننا خۆشبەزترین وشتر بگرەو بۆ هێنانی شەمعونی پیر بچۆ ناصیرە، خاخام داوو دەرمانی دەکات. پەلەکە.. ئەوە هەوا وا رووناك دەبێتەوە، رۆژ لە حاڵەتی هەلاّتن دابوو، هەورەکان پەڕاگەندە ببوون، زەوی تازە باران خواردوو تێر ببوو، دەدرەوشایەوەو بەسپاسەوە سەیری ئاسمانی دەکرد، دوو قوش سینەی ئاسمانیان شەق دەکرد بە دەوری دێرەوە دەسووڕانەوە تا پەڕوباڵیان وشك بێتەوە، شاگرد لە کاتێکا ئەشکی لە گۆناکانی دەسڕیەوە، بەرەو لای تەویلە رۆیی توندڕۆترین وشتری هەڵبژارد، وشترێکی تولاز، باریك، ئەستێرەییێکی بە توێڵیەوە بوو، ناچاری چۆکدادانی کرد، ئەو کاتە سوورابۆوەو هۆق هۆق کەوتە گریانەوە.

وشتر لە جێی خۆی هەڵسا وەستا، ئەو کاتە بە هەنگاوی درێژ درێژ بەرەو ناصیرە تێی تەقاند، پرتەوی سپێدان بەسەر دەریاچەی (گنسارت) هەڵدەهاتو ئاوێ لە نوری سپێدان دەدرەوشایەوە، لێوارەکانی لەبەر ئاسەواری بارانی دوێنێ شەو گلالود بوو بوونو دوورتر ئاوێکی سەوزو بەدەوری درزی سپی شیرێ، چارۆگەی قایغی ماسیگری بوو بوونەوە تا خشکە بکەن، هەندێ لە قایغەکان لە پێشتر لە ئاوە کراوەکاندا بوون، ماسیگریی دەستی پێکردبوو، مەلی باران بە نەواری سپیو گوڵ رەنگیان بە شادومانیەوە بەسەر ئاوی لەرزیوەوە وەرکەوتبوون، قەرەقازەکان بەسەر تەختەتاوێرەکانەوە وەستابوون، چاوی خڕکەڵەیان بڕیبووە دەریاچەوە تا لەو کاتەی کە ماسی بۆ هەڵبەزینو دابەزین لە میانی کەفی ئاوەوە سەر ئاو دەکەون بە حسابیان رابگەن.

له رۆخانەی لێواردا، کفرناحوم کە تا مەغزی ئێسقانی تەڕ بوو بوو، بێدار دەبۆوە، کەلەشێران ئاوی سەرپەڕی خۆیان راتەکاند، کەرەکان دەزەڕین‌و گۆلکەکان بە ئارامی بۆڕاندیان‌و تێکەڵ بەو دەنگە ناهەمرەنگە، گفتوگۆی مانا‌داری مرۆڤ، ئاسایش‌و شادی دەبەخشیە هەواوە.

دەدوازدە ماسیگر لە پەناگای کەنارێکی چۆڵکراودا، پێی درێژیان لە تاوێرە بەرد گیر کردبوو لە کاتێکدا تۆڕەکانیان بە ئارامی‌و کارامەییەوە رادەکێشا، خەریکی گۆرانی گوتن بوون، لە بالآی سەری ئەوانەوە، زوبەدی پیر، سەرۆکی چەنەبازوو حەوت خەتیان وەستابوو، وا خۆی دەردەخست کە هەموو ئەوانی وەکو کوڕێ خۆی خۆشدەوێن‌و سەبارەت بەوان خاوەن دڵێکی میهرەبانە، بەلآم ئەمانی لێ بڕی بوون، بەڕۆژانە کاریان دەکردو پیرەمێردی چەنەباز نەیدەهێشت یەك ساتیش هەناسە تازەکەنەوە.

زەنگوڵەکان کەوتنە ئاوازەوە،مێگەلێ لەمەڕوبزن بەرەو کەنار تاویان دا سەگەکان دەوڕین، نەفەرێ فیکەیێکی کێشا، ماسیگرەکان بۆ تەماشاکردن ئاوڕیان دایەوە، بەلآم زوبەدی پیر بۆ پێشەوە رایکردو بەتووڕەییەوە گوتی: ((فیلیپ‌و قەوم‌و خزمانیەتی .. ئێمە دەبێ بە کارەکانی خۆمان رابگەین)).

خۆی کندڕەکەی کەوتە دەست‌و وای نیشاندا کۆمەگیان دەکات، ماسیگرەکان دەماودەم بۆ گوند سەرەو ژێر دەبوونەوە، تۆڕەکانیان لە کۆڵ ناو ژنەکانیان دانانی پێویستیەکانی رۆژانەیان لەسەرسەردانا بەدوای ئەوانەوە دەچوون، کوڕانی لەبەر هەتاو سووتاو، سەوڵەکانیان توند گرتبوو، سەوڵیان لێدەدا، بەلێدانی دووسێ سەوڵ دەوەستان‌و قەپیان لەو نانە وشکەدەدا کە لە دەستیاندا بوو، فیلیپ لە رامانکردنی تاوێرە بەردێ قەراری گرتبوو فیتەی لێدەدا، دڵی دەیخوازی گاڵتەو گەپ بکات: بەلآم زوبەدی پیر بە مچوومۆڕی دەستی لەسەر دەم داناو هاواری کرد: " فیلیپ دەست لە ئێمە هەڵگرە ئێمە کارمان زۆرە، خوا لەلاییێکی دیکە رزقت بداتێ" ئەوکاتە بەساردیەوە پشتی تێکرد، بەچپەوە گوتی: ((دەفنی کە با بچێتە سۆراغی یونسەوە لەوێ تۆڕ هەڵدەدا، کوڕینە ئێمە کارمان زۆرە))



جارێکی دیکە یەکێك لە کندڕەکانی گرت‌و دەستی بەڕاکێشان کرد، زڤرینگێکی قورمزی جەستەی مەلەوانانی کە دەماو دەم نزیك دەبوونەوە بە چووار چاو دەپشکنی.

بەلآم لەم کاتە دا کە دەیانویست تۆڕەکە بۆ سەرەوە هەڵبکێشن‌و دیسان ماسیەکان هەڵڕێژنە کەنارەوە، دەنگی وزەوزێکی خەمەنگیزی لە دوورەوە بیست، کە لە سەراسەری دەشتاییکەدا بلآو دەبۆوە، لەگەڵ زەنایێ کە لە سروودی پرسە دەچوو هاوجووت بوو، زوبەدی پیر گوێچکەی زل‌و پڕمووی تیژ کرد تا روونتر گوێی لە سەداکە بێت، مرۆڤەکان هەلەکەیان قۆستەوەو دەستیان لەکار کێشایەوە. زوبەدی پرسی: ((کوڕینە دەبێ چی روویدابێ؟ سروودی پرسەیە، ژنان خەریکن شیوەن دەکەن؟)) ماسیگرێکی پیر وەلآمی دایەوە ((مرۆڤێکی گەورە وەفاتی کردوە، سەرۆك، خوداوەند تەمەنێکی درێژ ببەخشێ بەتۆ)) بەلآم زوبەدی پیر پشتڕێ چووبووە بەرزایی تاوێرەبەردێ، چاوانی دڕندەخوی بە دەشتاییدا وەرسووراند، لەوێ پیاوان‌و ژنانی دێ کە بە لای رایاندەکردو بەردەبوونەوە سەر زەوی دووبارە هەڵدەستانەوەو سروودی پرسەیان دەچڕی، لە تەواوی دێدا هەراو زەناو گەڕەلاوژە کەوتبوە ئاراوە، ژنان شیوەنەوە رادەبردن، بەلآم لە دوای ئەوانەوە پیاوان بە بێدەنگی دەڕۆیشتن بۆ سەر زەوی لار بووبوونەوە.

زوبەدی هاواری کردە سەریان ((چی رویداوە؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟ بۆ ئەو ژنانە دەگرین؟))، بەلآم ئەوان بە پەلە لەتەك زوبەدی رادەبردن بێ ئەوەی وەلآمێ بدەنەوە، بەرەو لای جۆخینان رایاندەکرد، زوبەدی بە هەلشەقانی دەست هاواری کرد: ((ئاهای بۆ کوێ دەچیت؟ کێ مردوە؟)) پیاوێکی چووارشانە کە هانکەهانکی بوو وەستاو لە وەلآمدا گوتی: ((گەنم)).

–وەکو پیاو قسە بکە بەمن دەڵێن زوبەدی پیر، کەس لەگەڵ مندا فشەبازی ناکات، کێ مردوە؟ ئەو هات‌و هاوارەی کە لە هەموو لایەکەوە دەهات وەلآمی دایەوە،((گەنم، جۆ، نان!)) زوبەدی پیر کە سەرسام بوو بوو، بەسەر جێی خۆیەوە وشك هەڵگەرا، بەلآم لە پڕێکا بە زیللەیێ کە بە پشتی خۆیا کێشابووی، تێگەیی بوو، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((ئاها، جۆخینەکان لافاو بردونیەتی باشە لێگەڕێ با

هەژارەکان شکایەت بکەن، پەیوەندی بە منەوە نییە)) ئێستاکە هاوار لە سەرتاسەری دەشت دەنگی دەدایەوە، تەواوی دانیشتوانی دێ هەڵڕژابوونە دەرەوە، ژنان خۆیان بەسەر جۆخیناندا دەدا، لە ناو گڵو لیتاودا دەگەوزین، تەواوی هەوڵیان ئەوە بوو کە ئەو گەنم جۆیەی کەوتبوە ناو چاڵو چۆڵەکان کۆکەنەوە، بازووی ئەوانەی لەگەڵ زوبەدی بوون شل بوو هاتنە خوارەوە، هێزی راکێشانی تۆڕەکانیان لە دەست دابوو، زوبەدی بە بینینی دەستی بێکارو چاوانێ کە دەیانڕوانیە دەشتایی وەکو ئەسپەند بەسەر ئاگردا هەڵبەزیەوە، بەسەر بەردەکەوە دابەزیو هاواری کرد ((بگەڕێنەوە سەر کارتان، یاڵڵا تۆڕەکان راکێشن)) جارێکی دیکە کندڕی گرتە دەستو وا خۆی نواند کە رایدەکێشێ، ((سوپاس بۆ خوا کە ئێمە ماسیگرینو جوتیار نین، پەیامبەر بەخێرهات، ماسیەکان مەلەوانێکن شایستەنو غەرق نابن، ((دوو دووتا چووارتا)) فیلیپ مێگەلی رەها کردبوو لە بەردێکەوە دەپەڕیە بەردێکی دیکە، حەزی لێ بوو قسە بکات، لە بەردەم ماسیگرەکان بەدیار کەوتو هاواری کرد ((کوڕینە تۆفانێکی نوێو بۆ خاتری خودا دەست لە کار هەڵگرنو وەرن قسان بکەین،کۆتایی دونیا هاتووە! یەك یەك موسیبەتەکان بژمێرین! پێرێ ئومێدی گەورەی زۆر ئێمە —جانباز-یان لە خاچ دا، دوێنی خودا بەندازی ئاسمانی کردەوە ئەوەش دروست لەو کاتەی کە جۆخینەکان پڕ گەنم بوون، نانمان بەلاش چوو، هەمان چەند کاتێکی بەر لە ئێستا یەکێ لە مەڕەکانی من زاو بەرخێکی دووسەری هێنا، من دەڵێم دیماهی دونیا هاتووە، بۆ خاتری خوا دەست لەکار هەڵگرنو وەرن باقسە بکەین. بەڵام زوبەدی پیر کە خوێنی خۆی دەخواردەوە، هاواری کرد ((فیلپ بۆ لێرە دەفن نابیو نارۆییو لە ئێمە ناگەڕێی مەگەرنابینی کە ئێمە کارمان هەیە، ئێمە ماسیگرینو تۆ شوان، جوتیاران دەبێ گلەیی بکەن، پەیوەندی بە ئێمە چییە؟ یاڵڵا کوڕینە بگەڕێنەوە سەر کارتان.

شوان زمانی بە سکاڵا کردەوە ((زوبەدی تۆ سگت بە جوتیاران ناسووتێ کە لە برسان وا تەلەف دەبن؟ ئەی ئەوانیش سراییلی نینو برای ئێمە نین، ئێمە یەك درەختینو رۆشنە کە جوتیاران وەكو ریشەی درەختن، ئەگەر ئەوان وشك بکەن هەموو ئێمەش وشك دەبینەوە، زوبەدی شتێکی دیکە، ئەگەر کریست بێتو لە هەمان بگرەو بەردەدا



ئێمە مردوو بین چ کەسێ بۆ نەجاتدان دەدۆزیتەوە؟ یاڵڵا وەڵامی من بدەوە. زوبەدی پیر لە تووڕەییان پڕوخاڵی دەبۆوە، ئاگرت لە لووتی دەگرتو بەشێوەییێکی حەتمی دەتەقی ((بۆخاتری خوا دەست لەسەری ئێمە هەڵگرەو بگەڕێوە لای قەوم وقیلەت، نامەوێ من سەبارەت بە کریستی موژدەهێن شتێ ببیستم، دەڕشێمەوەو یەکێکیش دێت لە خاچ دەدرێو یەکێکی دی دێو ئەویش لە خاچ دەدرێ، مەگەر نازانی ئەندریاس چ پەیامێکی بۆ یونسی باوکی هێنابوو؟ وادێتە بەرچاو بۆ هەرکوێیەك بچیتو لەهەر کوێیەك بوەستی خاچێ دەدۆزیەوە، چاڵە رەشەکان وا لە کریستی موژدەهێندا شەپۆڵ دەدەن...ئیدی بۆ حەوت پشتیشمان بەسە، بەبێ ئەوان کاروبارمان باش بەڕێوە دەچێت، ئەوان شتێ نین جگە لە مایەی دەردەسەری، ئێستا برۆ کەمێ پەنیرم بۆ بهێنە، تاپڕ بەو تاوەیە ماسیت بدەمێ، مامەڵەی پایا پای، ئەوە پێی دەڵێن کریست پێکەنیو گەڕایەوە لای ئەوانەی زڕکوڕەکانی: ((کوڕە ئازاکانی من بجولێنەوە تا بەڵکو بتوانین ئاگر داگیرسێنینو مەنجەڵی ماسی بارکەین سەیرکەن خۆرەتاو مەترێك سەرهەڵگەڕاوەو ئێمە کارێکمان نەکردوە)) بەڵام فیلیپ بۆ گەیشتن بە مێگەلەکەی هێشتا پێی لەسەر پێ هەڵنەگرتبوو، کە وەستا کەرێك بارێکی لینرابوو تا گوێکانی خەریك بوو بکەوێ، بەسەر رێگایەکی باریکەوە کە کەناری دەریا دەگرێتە خۆ بەدیار کەوت، لە دوایەوە نەناسێکی پێ خواست بە کراسی کراوەو ریشێکی سوورو دارێکی دوو لقی لە دەست گرتبوو سیخورمەی لە ئاژەڵەکە دەدا، لە پەلەدا بوو.

شوانە کە لە هەمان جێدا وەستابوو گوتی: ((سەیرکە، وا بیردەکەمەوە کە ئەو موو هەرماسییە یەهودای ئەسخەریوتی بێ، کردووە بە دێهات گەڕی سەرلەنوێ دەستی پێکردەوە تا ولاغان ناڵ بکاتو کولێنگ دروست بکات، وەرن با بزانین چی لەبن سەرییە؟

زوبەدی پیر بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((هەی مردوو شۆر رووخساری ببات کەیفم بە سەرو مووی نایەت، بیستوومە قابیلی باوکە گەورەشی، هەمان جۆر ریشی هەبوو.

فیلیپ گوتی: ((ئەو مرۆڤە فەلەکزەدیە لە بیابانی ئەدومیە دا هاتۆتە دنیاوە، لەوێ هێشتاکەش کە هێشتایە، گەردشگەی شێرانە، کەواتە باشتر وایە سەری لەبەر سەری نەنێین)).

فیلیپ ئەو کاتە دوو ئەنگووستی خۆی لە دەم ناو فیکەییێکی بۆ کەرسوارەکە کێشاو بانگی کرد ((یەهودا سەلام، بە دیتنت خۆشحالم کەمێ وەرە ئەوبەرە تا بتوانین تۆ باشتر ببینین)) ریش سوور تفی روکردو جوێنی پێدان، کەیفی بەو شوانە نەدەهات، هەروا بەزوبەدی پیریش، دەیەویست تێکەڵیان نەبێت، بەلام چ دەبوا بکرێ ئاسنگەرێ بوو پێویستیان پێ دەبێ، لەبەر ئەمە نزیك بۆوە فیلیپ پرسی ((وەزعی خەڵکی ئەو دێیانەی سەر رێگا چۆنە؟ لەوێ لەو دەشتە چ خەبەرە؟

ڕیش سوور بەڕاکێشا کلکی کەر، رایگرتو بەخەندییێکی وشك وەلامی دایەوە ((وەزعەکە بە پێی مورادە، خوداوەند میهرەبانترینی میهرەبانانە، بەڵێ ئەو خەڵکی خۆی خۆش دەوێ، لە ناصیرەدا پەیامبەران لە خاچ دەداو لێرەش لە دەشت تۆفان دەنێرێو نان لە دەستی خەڵك دەردێنێ، گوێتان لە دەنگی شێوەن نییە ژنان بۆ گەنم سەردولکە دەڵێنو وەك بلێی کوڕانی خۆیان لە دەست داوە زوبەدی کەلەبەر فەلەج بوونی کاری ئەو رۆژەی دڵی توند بوو بوو، بەپەلپ گرتنەوە گوتی: ((هەموو کارەکانی خودا لە رووی بەرژەوەندییەوەیە، هەر کارێ ئەنجام بدات بە باوەڕی من وڕوشانێ نایەتەدی، کاتێ هەموو غەرق دەبن تەنها من بە سەلامەتی دەردەچم ئەوە خودایە کەمن لە باوەشی پاراستنی خۆی دەکات، بە ئێوە دەڵێم من ئیمانم هەیە ((دوو دووتا، چووارتا)) بە بیستنی ئەو ووشانە، ریش سوور تەواو لەبیری کرد کە یەك لوقمە نانی نەمریو نەژی چۆن دابین دەکاتو ناچار بوو بۆ وەدەست هێنانی بژێو پشت بە هەریەك لەو مرۆڤانە ببەستێ، بەبێ شەرم کردن گوتی: ((زوبەدی تۆ ئیمانداری تەنها بۆ ئەوەی کە خودای گەورە جێی گەرمو نەرمی پێداون تا کاروبارت بە خێرو خۆشی بڕوات، حەزرەتی عالی پێنح قایغت لەبەر دەستەو پەنجا نەفەری ماسیگرت هەیە کە وەکو کۆیلە رەفتاریان لەگەڵدا دەکەیت، هەر ئەوەندە خواردنیان دەدەیتێ کە بتوانی کارت بۆ بکەنو لە برسان نەمرن، بەدرێژایی ئەو ماوەیە وجودی باشی



جەنابعالی سندوقچەو گەنجو ورگت پڕ دەکەیت، پاشان دەستت بۆ ئاسمان بەرز دەکەیتەوەو دەڵێیت ((خودا عادیلەو من باوەڕم پێیەتی، دونیا قەشەنگە، ئومێدەوارم هیچ کاتێ نەگۆڕێی!))

بۆ لەو جانبازە ناپرسی کە چەند رۆژێك لەمەوبەر لە خاچ درا، ناپرسی کە ئەو هەوڵیدەدا تا ئێمە ئازاد بکات، ئەو جوتیارانەی کە خودای یەکشەوە زەخیرەی گەنمی تەواوی ساڵی لە چنگ فڕاندن، هەر بە هەمان شێوە لێیان بپرسە، هەمان ئێستاکە لە ناوگڵو لیتەدا لول دەخۆن دانە دانە گەنم کۆدەکەنەوەو دەگرین، بۆ لە من ناپرسی؟ من دێ بە دێ دەڕۆم ئازاری سراییل دەبینمو دەبیستم، تاکەی ...تاکەی؟ زوبەدی تۆ هیچ کاتێ ئەوەت لە خۆت پرسیوە..؟))

پیرەمێرد وەلامی دایەوە ((ڕاستیت بوێ، من باوەڕم بە پرچو موی سوور نییە، تۆ لە جانگی قابیلی کە برای خۆی کوشت، دۆستی من، بڕۆ ون بە، حەزم لێ نییە قسە لەگەڵ هی وەکو تۆ بکەم)). بەم قسەیە پشتی لەو کرد، ریش سووورداری دولقەی لە ملی کەر بردە خوارەوە، ئاژەڵ سەری بەرز کردەوەو لەناو قەڕاسەی بردە خوارەوە تێ تەقاندو کەوتە رێوە.

یەهودا بەزێمارەوە گوتی: ((مشەخۆری پیری نەترس، کریست دێت تا هەموو شتێ رێکبخات)). بەگەیشتن بە دەوروبەری بەردەکان گەڕایەوەو هاواری کرد: ((لە هەلێکی دیکە سەبارەت بەم بابەتە دووبارە لەگەڵ یەك قسە دەکەین ((لە دیماهیدا کریست رۆژێ هەر دێت، مەگەر وانیە؟ بەڵێ، پاشان هەر خۆی پیسو چەپەڵەکان دەخاتە شوێنی خۆیان، مرۆڤی بە ئیمانی وەکو تۆ کەم نین! بەدیداری قیامەت)).

زوبەدی وەلامی دایەوە ((ریش سوور بڕۆ بە جەهەننەم)). عاقیبەت کونالکەکانی تۆڕ بەدیار کەوت پڕ لە ماسی سەر زێڕینو شاماسی سوور بوو، فیلیپ لە میانی ئەو دووە وەستابوو نەیدەتوانی لایەنگری یەکێکیان بێت ئەوەی کە یەهودا گوتبوی حەقیقەت بوو لە رووی شەهامەتەوە بوو، ئەو شوانە هەموو دەمێ خواستبووی هەمان ئەو ووشانەی یەهودا بەڕووی پۆخڵی پیرەمێرد بپڕژێنێ، یا لە کەللەی دا بیانباتە خوارەوە، بەلام هیچ کاتێ شەهامەتی ئەوەی نەبوو. ئەو کلك بڕاوە،

زەمینداریکی کەللە گەورەبوو تەك تەکی ئەو لەوەڕگایانە ی کە فیلیپ بزنو مەڕەکانی لیّ دەلەوەڕاند هی ئەو بوون، چۆن دەیتوانی هێرش بکاتە سەری مرۆڤ یا دەبیّ شێت بیّ یا قارەمانو فیلیپ هیچیان نەبوو، تەنها قسەی قەڵەو قەڵەوی دەکردو زماندرێژی دەکرد، هیچ کاتێکیش لە بیری نەدەکرد کە شتێکی تیا بهێڵێتەوە. لەبەر ئەوە لە کاتێکدا کە ئەو دووە شەڕە چەقیان بوو، ئەو بێدەنگ مابۆوە مەحجوبو دوو دڵ لە کەناریّ وەستابوو، ماسیگرەکان تۆڕەکانیان راکێشابووە نێو قایغ، ئەویش لەگەڵ ئەواندا لار بۆوە، لە هەڵرژتنی ماسی بۆ ناو سەبەتەکان کۆمەگی دەکردن، هەتا زوبەدیش تا کەمەری لەناو ئاو بوو، خەڵکەکەو ماسیەکانی رێنمایی دەکرد، لە هەمان ئەو بگرەوبەردەیەدا لە پڕێکا دەنگی ریش سوورەکە لە تاوێرە بەردێکی بەرامبەر دەنگی دایەوە ئاهای زوبەدی، زوبەدی پیر خۆی لە کەڕیدا جارێکی دی دەنگەکە خرۆشا ((ئاهای زوبەدی، گویّ بگرە لە ئامۆژگاری منو یەعقوبی کوڕت بە پیّ.)). پیرەمێرد بە پەرێشانی هاواری کرد (یاقوب) تا ئەو جێیەی کە پەیوەست بوو، بەکوڕی بچووکتری تازە کار لە کار ترازابوو، ئەوی لە دەست چوو بوو. نەیدەخوازی ئەویش لە دەست بدات، کوڕێکی دیکەی نەبوو، بۆ کارەکانی پێویستی بەو بوو، بە نیگەرانیەوە یەهودای بانگ کرد ((ڕدێن سووری نەفرەتی، لە بارەی یاقوبەوە چیت هەیە بڵێی؟

–لە رێدا بینیم کە لەگەڵ سەلیبسازدا لێك نزیك بوونەوە، لەگەڵ یەکدا چاکوچۆنیان دەکرد

–کافر کام سەلیبساز؟ رونتر قسە بکە؟

–کوڕی دارتاش، هەمان ئەوەی کە لە ناصیرە خاچ دروست دەکاتو پێغەمبەران لە خاچ دەدا، ئیدی زۆر درەنگە! زوبەدی پیری بێچارە، یاقوبیش لە دەست چوو، تۆ دوو کوڕت هەبوو یەکێکیان خودا لە چنگی فڕاندی ئەوی دیکە هەرماس. زوبەدی پیر دەمی بەش بوو بۆوەو هەڵسایە سەر پیّ ((ماسییێکی پەڕەندە لە ئاودا هەڵبەزیەوە، بەسەر سەریەوە، پەڕی گرت، ئەوکاتە بازی دایە ناو ئاوو داو ون بوو.پیرەمێرد بە ترسەوە کەوتە چپەوەو گوتی: "نیشانەییێکی بەد، نیشانەییێکی بەد! واتە کوڕی من وەکو ئەو ماسییە پەڕەندە وازم لێدێنیّو لە ژێر ئاوە قوڵەکانداوون دەبیّ؟ ئەو کاتە



رووی لە فیلیپ کردو گوتی: ((باڵندەماسیت بینی؟ هەرچی لەو دونیا روودەدات بیّ مانا نییە، بڵیّ بزانم ئەوە چ مانایێکی هەیە، ئێوە شوانەکان.)).

–باوکە زوبەدی، ئەگەر بەرخ بوایە خۆ پشتیم دەبینی، دەمتوانی شتیّ بڵێم بەلاّم من سەرەدەر لە ماسی دەرناکەم.

فیلیپ تووڕە بوو، چوونکە بە پێچەوانەوەی یەهودا شەهامەتی نەبوو، کە وەکو پیاویّ قسە بکات ((دەبیّ بچمە سۆراغی مێگەلەوە)). گۆپاڵی شوانی نایە سەر شانو لە بەردێکەوە بازی دەدا سەر بەردیّو خۆی گەیاندە یەهوداو بانگی کرد:

–سەبرکە برا، دەمەویّ قسەت لەگەڵ بکەم.

ڕدێن سوور بیّ ئەوەی کە ئاوڕ بداتەوە وەلاّمی دایەوە ((ترسنۆك برۆ سۆراغی مەڕەکانت، دەست تێکەڵ کردن لە ئیشی پیاوان بۆ تۆ نەهاتووە،بە برا بانگم مەکە من برای تۆ نیم))

–دەڵێم سەبرکە، شتیّ هەیە دەبیّ پێتی بڵێم، تووڕەمەبە. یەهودا وەستاو بە قێزەوە سەیری ئەوی کرد ((بۆ قسەت لە لامەوە تا کاف نەکرد؟ بۆ لێی دەترسێی؟ کاتیّ کە دەزانی چی روودەدا، چ کەسیّ وا دێتو رێت لە کوێیە، هێشتا هەر دەبیّ بپرسی؟ رەنگە ئێستاش بۆنی شتێکت نەکردبیّ، وەلیّ منالێچکە بەزوویی پاشای یەهود دێتو وای بە حاڵی ترسنۆکان، فیلیپ بە پاڕانەوە گوتی: ((یەهودا، زیاترم بۆ باس بکە، هەرچەند دەتوانی سەری من بکوتەوە، بەو داردەستەت لەناو سەرم بدە تا کەمیّ عیزەتی نەفسم بێتە ناو، ئیدی لە دەست ئەو ترسە هەمیشەییە بێزار بووم، یەهودا لە سەرخۆ نزیك بۆوەو بازووی ئەوی توند گرت. ((فیلیپ ئەوە لە ناخی دڵەوەی دەڵێی یا قسەی بۆشم بۆ دەکەی؟

–وا دەڵێم هەڵەبووم، ئەمڕۆ بێز لە خۆم دەکەمەوە، وەرە پێشەوە رێم نیشاندە، من ئامادەم.

ڕدێن سوور سەیری دەوروبەری کردو دەنگی کز کرد ((ئامادەی کوشتنی؟))

-کوشتنی مرۆڤ.

-ئاساییە، بۆ وا بیرت کردەوە کە مەڕ بکوژی؟))

-هێشتا مرۆڤم نەکوشتوە، بەلاّم دەتوانم ئەو کارە بگرمە ئەستۆ، بەلّێ گومانم نییە، مانگی پێشوو یەك گام بە تەنها بە زەوی داداو سەرم بڕی.

-کوشتنی مرۆڤ ئاسانترە، لەگەلّ مندا وەرە. فیلیپ لەرزی، پەنجەی وە خەبەر هاتبوو، بەتەبەشێکی ترسناکەوە پرسی ((تۆ یەکێ لەوانی — یەکێ لە جانبازەکانی؟ هەوالّێکی زۆری لە بارەی ئەو — برایەتیە — بیستبوو، ناویان لەوان نابوو، جەنگاوەرانی پیرۆز هەرکەسێ دەستیان بگەیشتبایێ، دەیانکوشت: لەکێوی — هیرمون- بگرە تا دەریای مردوو هەتا بیابانی (ئەدومیە)، بە باریەو کوندڕو خەنجەر چەکدار بوون دەچوونە دەوروبەرو جاڕیان دەدا: ((لە بەرابەر گاوران سەر دامەنوێنن، ئێمە تەنها یەك خودامان هەیە: ئەدونیا، هەر یەهودێ کە سەرپێچی لە یاسای پیرۆز بکاتو لەگەلّ دوژمنانی خودای ئێمە واتا رۆحیەکان پێبکەنێ، با قسە بکات یا کاربکات بیکوژن، لێیدەن، بیکوژن، رێگا بۆ پەڕینەوەی کریست پاك کەنەوە، دونیا لە پیسی پاك کردەوە، بوارگا ئامادە کەن ئەو خەریکە وادێت)) بەڕۆژی رۆشن بێ ئەوەی مەشورەت لەگەلّ کەس دا بکەنو جگە لە خۆیان دەچنە ناو شارو دێهاتەکان تا- سەدوکیەك — یا خائینێکی رۆمی خوێنخۆر بکوژن، زەویدارەکان، کاهینەکانو سەرۆکی کاهینان لە بەردەمیاندا دەلەرزین، شێتو هار بوو بوون لە دەست ئەوانەوە، ئاخر هەر ئەوانە بوون ئاشوبیان دەنایەوەو سەربازانی رۆمیان دەفڕاند، ئەنجامەکەی وا دەبوو کە لە مەودایەکی دەست نیشانکراودا کوشتو کوشتاریان دەخستە ئاراوەو جۆگەلەی خوێنی یەهودیان هەلّدەڕشت. فیلیپ بە زەمزەمەوە گوتی: ((تۆ یەکێکی لەوان — یەکێ لە گیانبازەکان؟: ردێن سوور لە کاتێکا بە تیزەوە پێدەکەنیو پرسی ((دۆستی ئازای من دەترسی؟ مەترسە. ئێمە پیاو کوژنین فیلیپ، ئێمەلە پێناوی ئازادی دەجەنگین تا خودای خۆمانو رۆحمان ئازاد بکەین، راپەڕە، ئەو ساتە گەیشتووە کە تۆش بتوانی پیشانی دنیای بدەی کە بۆ خۆت پیاوی، وەدوام کەوە)).



بەلاّم فیلیپ چاوی لە زەوی دووریو لەوەی کە بە شوروشەوقەوە دەربارەی ئەو بابەتە قسەی لەگەلّ یەهودا کردوە، هەستی بە پەشیمانی دەکردو لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((قسەکانی ردێن سوور جوانن، دانیشتن لەگەلّ دۆستو خواردنو خواردنەوەو سەنگین کردنی قسەو باسو گوتنی (واووا دەکەین) لەززەت بەخشن، بەلاّم فیلیپ حەواست کۆکەوە لەمە زیاتر نەڕۆی دەنا خۆت دەخەیتە ناو تەلّەوە، یەهودا بەسەریا لار بۆوەو شێوەی قسەکردنی گۆڕی چەنگالّی سەنگینی ئەو ئێستاکە شانی فیلیپی بەنەرمی لە مس دەکردو دەیلاواندەوە ((مەگەر ژیانی مرۆڤ چییە نرخی چەندە؟ ئەگەر ئازاد نەبێ.. هیچە، ئێمە بۆ ئازادی دەجەنگین وەدوای ئێمە بکەوە. فیلیپ بێدەنگ بوو، چ دەبوو ئەگەر بیتوانیایە دوور چووبا! بەلاّم یەهودا بەجۆرێکی خراپ شانی گرتبوو ((کەواتە دوای ئێمە کەوە، تۆ پیاوی، بڕیار بدە، خەنجەرت پێیە))

– بەلّێ

– هەمیشە خەنجەر لەژێر کراست بێ، لەوانەیە هەموو دەقیقەیێ پێویستت پێی بە، برام وا خەریکە دەچینە ناو رۆژە سەختەکانەوە، دەنگی پێی سوکبالّ کە نزیکترو نزیکتر دەبێتەوە نابیستی؟ دەنگی پێی کریستە، دەبێ رێگاکان بە رووی ئەوانە کراوە بن، خەنجەر لە نانی شەو واجیب ترە، ئەلێرەوە باش سەیری من بکە! یەهودا، کراسی کردەوە، لە بەغەلّ پێستی رەشی سینەی خەنجەرێکی دوتیغی رووت بریقەی دایەوە.

– ئەگەر بە خاتری یاقوب، کوڕی زوبەدی کەللەپوك نەبوا هەمان ئەمڕۆکە ئەم خەنجەرەم لە دلّی یەك خائین دەبردە خوارەوە، دوو رۆژ بەر لە جێهێشتنی ناصیرە ئەنجومەنی — برایەتی — ئەوی بە مەرگ مەحکوم کرد.

– چ کەسێ؟

– لە تیرو پشکدا ناوی من دەرچوو...

فیلیپ دووبارە پرسی ((چ کەسێ؟ ترس دایگرتبوو..

ڕدێن سوور بەشێوەییێکی ناگەهانی وەلاّمی دایەوە: ((ئەوە پەیوەستە بەخۆم، دەست لە کاروباری ئێمە وەرمەدە.

-باوەڕت بەمن نییە؟

یەهودا سەیری دەوروبەری کرد، ئەو کاتە لار بۆوەو فیلیپی گرت.

– گوێکانی خۆت باش بکەوە، فیلیپ سەیرکە چی دەڵێم، یەك وشە لە قسەکانم لای کەسێك نەدرکێنی، دەنا کارت تەواوە، ئێستا لەسەر ڕێگام بەرەو بیابان، دەچمە دێر، ڕەبەنەکان داوایان لێکردوم چەند شتێکیان بۆدروست بکەم، سێ چووار ڕۆژی دی بێرەوە ڕەت دەبم ئەو قسانەی کە لەگەڵ یەك ڕەدوبەدەلمان کرد، لە مێشکت دا بە چاکی هەڵگێڕو وەرگێڕی بکە، مۆری بێدەنگی لە لێوت بدە، ئەو ڕازە بۆ کەس ئاشکرا نەکەی، تەنها خۆت بڕیار بدە، ئەگەر پیاوەتیت چەسپاو گەیشتیە بڕیارێکی دروست، ئەوا نەخشەی کوشتنت بۆ ئاشکرا دەکەم.

– کوشتنی چ کەسێ، من دەیناسم. یەهودا بە بەرز کردنەوەی دەستە قەبەکانی وەلامی دایەوە ((ئەوەندە پەلە مەکە، تۆ هێشتا نەهاتوویتە ڕێزی (برایەتی) خودا حافیز، تا ئێستا مرۆڤێکی بێ وەی بوو، هیچ کەس بایەخی بەوە نەدەدا کە مردووی یا زیندووی، منیش هەروا بووم.

مرۆڤێکی بێ وەی — تا ئەو ڕۆژەی پەیوەندیم بە ئەنجومەنی برایەتی کرد، لەو کاتەوە تا ئێستا، بوومەتە مرۆڤێکی دیکە، بوومەتە پیاو، ئیدی ئەو یەهودە ردێن سوورو ئەو ئاسنگەرەنیم کە وەك گا بەدەمو لێوی ناشیرنەوە بەسەختی کارم دەکردو هەموو هزروبیرم لای پڕکردنەوەی وورگو دووگو پوزی کرێتی بوو. ئێستا من بۆ ئامانجێکی گەورە کار دەکەم، گویت لێیە؟ بۆ ئامانجێکی گەورە.. کەسێ کە بۆ ئامانجێکی گەورە کار بکات، هەتا ئەگەر پەستترینی خەڵکان بێت، گەورە دەبێ، تێگەیشتی؟ زیاتر لەمە شتێکم نییە بۆ تۆی بڵێم، خوا ئاگادارت بێت)). بەم قسەیە نەقیزەی ژەنیە کەرەکەیو بۆ لای بیابان بەرێکەوت بوو، فیلیپ بەتەنها لەگەڵ خۆی مایەوە، خۆی هاوێشتە سەر گوپاڵەکەی، تا گەیشتن بە ئەوبەری تاوێرە بەردەکانەوە ون بوو سەیری یەهودای کرد لەبەر خۆ کەوتە ئەندێشە ((ئەو ردێن سوورە قسەی چاك دەکات وەکو مرۆڤێکی پیرۆز، هاییت لێیە؟ لەوانەیە تۆزێ ستایشی خۆی بکات لە قسەکردنیا، وەلێ گوێ قەرداری کێیە؟ مادەمەکێ قسە لەمیاندا بێ، هەموو شتێ بە



چاکیو خۆشی دەگوزەرێ، بەلاّم کاتێ کار دێتە میانەوە.. فیلیپ ی بێچارە، ئاگادار بە بیر لە مەڕەکانت بکەرەوە، ئەو کارە کەمێ فیکری دەوێ، باشتروایە کارت بەکاریەوە نەبێو سەبر بکەی کەچی ڕوودەدات)).

ئەوکاتە گۆپاڵی شوانی خستە سەرشانو دەنگی زەنگوڵی بزنو مەڕەکانی بیست بە فیکە کێشانەوە بۆ لای ئەوان رایکرد.

لە هەمان ئەو بگرەو بەردەیەدا بوو، زڕکوڕەکانی زوبەدی ئاگریان داگیرساندبوو، ئاویان بەسەر نابوو، کە ئاوەکە جۆشیدا ماسی پولەکەدارو سەدەفو دوپشکی دەریایی، یەك دوو دانەش بەڕووی دەرياییان هاویشتە ناویەوە، بۆ ئەوەی خۆراکەکە بۆنی دەریای لێ بێ، بەردێکی خەزەداریشیان هاویشتە ناو شتەکانەوە، ماسیگرە برسیەکان بە دەوری قاپ ئەلقەیان بەستابوو، بە بێ تاقەتی لە چاوەڕوانیدا دانیشتبوون، لەسەرەخۆ لە میانی خۆیان گفتوگۆیان دەکرد، پیرترینی ئەوانە بۆ لای تەنیشتی لار بۆوە ((دیتت ئاسنگەر چۆن چۆنی ڕووبەڕووی وەستا، سەبرت هەبێ، ئەو ڕۆژە دێت کە هەژاران سەر هەڵگەڕێنو دەوڵەمەندەکان بن هەڵگەڕێن مانای عەدالەت هەمان ئەو شتەیە)).

یەکێکی دیکە کە هەر لە دەورانی جەوانیەوە بەولا هەمووی برسیەتی چەشتبوو وەلاّمی دایەوە ((بیر دەکەیتەوە وا رواداوێ ڕووبدات، بیر دەکەیتەوە کە ڕوودانی لەمجۆرە ڕووداوە لە سەر زەمین هەبێ.

پیرەمێرد وەلاّمی دایەوە ((خودایێ هەیە، مەگەر وانییە؟ بەڵێ خودایێ هەیەو عادیلە، دروستە؟ ئەگەر خودایە دەبێ عادیلیش بێت، وانیە؟ ئەو عادیلە، لەبەر ئەمە دەبینی کە ڕووداوێکی وا ڕوودەدات، کوڕەکەی، زوبەدی کە ئاگاداری قسەکانی ئەوان بوو نیەتی پیسی پەیدا کردبوو گوتی: ((ئاهای ئەوە چ هەلەقو مەلەقان دەچنن؟ ئێوە تەنها نیگەرانی کارتان بنو خودا بە حاڵی خۆی لێگەڕێن، ئەو باشتر لە ئێوە دەزانی چ کارێ دەکات)) یەکسەر هەموویان بێدەنگ بوون ماسیگری پیر هەستایەوە سەرپێ، کەوچکی دارینی هەڵگرتو خواردنەکەی تێکدا.

## بەشی نۆیەم

لە هەمان سەعاتێ کە زڕکوڕانی زوبەدی پیر تۆڕیان دەهاویشتە سەر شانیان، پرتەوی سپێدەدەمان دەکەوتە سەر دەریاچەوەو بەو ئاوە زولاڵەیەوە کە دەتگوت تازە لە دەستی خالیقیەوە داچکاوە، کوڕی مێرێ هاوڕێ لەگەڵ یاکوب، کوڕی گەورەتری زوبەدی، ڕێی دەبڕی، ئەوان پێشتر مەجدەلیان لە دوای خۆیان جێ هێشتبوو، جارناجار بۆ ساتێ دەوەستان تا دڵی ئەو ژنانە بدەنەوە کە لەبەر خاتری ئەو گەنمەی لە دەستیان چوو بوو شیوەنیان دەکرد، پاشان بەقسەکردنەوە، بەردەوامیان بە ڕێگەی خۆیاندا، تۆفان یاکوبیشی گرفتار کردبوو، شەوێ ی لە مەجدەل گوزەراندبوو، لە ماڵی دۆستێ مابۆوەو بەر لە دەرکەوتنی سەحەر هەستا بۆوەو تا سەرلەنوێ بکەوێتە سەفەری خۆیەوە.

یاکوب لە نیوە ڕەنگی شینی سپێدەدا، بە نێو لیتاودا خۆی پەلکێش دەکردو نیگەرانی گەیشتن بە دەریاچەی گنسارت بوو، ئاسەواری تەڵخو ناخۆشییێ کە لە (ناصیرە) بینی بووی پێشتر لە بوونی ئەودا سڕابۆوە، جانبازی لە خاچدراو بووبووە، یادگارێکی دوورو جارێکی دیکە قایغەکانی ماسیگریو ئادەمیەکانی باوکی، کاری ڕۆژانە زەینی ئەوی داگرتبوو، پێی بەسەر ئەو چاڵو چۆڵانەدا هەڵدەگرت کە ئاوی باران وەبەری هێنابوون، ئاو لە درەختە نیوە خەندانو نیوە گریانەکانەوە دەچکایەوە، ئاسمان لە بەرزایی سەری ئەودا پێدەکەنی، باڵندەکان بێداردەبوونەوە، ڕۆژێکی شکۆمەند بوو، بەلاّم بەزیادبوونی روناکی دەیتوانی ببینێ کە لافاو چ ڕۆژێکی بەسەر جۆخینەکانەوە هێناوە، کەڵەکەی گەنمو جۆ لە خەرمانگاکاندا پڕ لە ئاو بوو بوون، یەکەمین گروپی جوتیاران لەگەڵ ژنەکانیانەوە، هەڵڕژابوونەوە ناو مەزراکانو سەردولکەی پرسەیان سەردەدا، یاکوب لە ناکاو کوڕی مێرێی بینی کە لەگەڵ دوو پیرێژن لار بوونەتەوە سەر خەرمانگاوە. گۆپاڵەکەی توند گرتە دەستو جوێنیدا، ناصیرە لەگەڵ خاچو —جانباز- ی لە خاچ دراو دووبارە لە زەینیدا گیانی وەبەرهات، ئێستا سەلیبساز کە هاوڕێ دەگەڵ ژنان بۆ گەنمی لە دەست چوو، شینو زاری دەکات! ڕۆحی یاکوب زبرو ناهەماهەنگ بوو، چەنەبازیو بێڕەحمی لە باوەکیەی بە میرات وەرگرتببۆ مابۆوە، هیچ لە سالومەی دایکی نەدەچوو، کە ژنێکی پاك سیرەت بوو، هەروەها دڵێکی باشو خۆشەویستی یۆحەننای براشی نەبوو، لە کاتێکا داردەستی خۆی بە توندی لە مشتیدا گرتبوو، بە تووڕەییەوە بە لای خەرمانگادا بۆ پێشەوە چوو، دروست لە هەمان ساتدا کوڕی مێرێ کە فرمێسك لە گۆناکانیدا دەهاتە خوارەوە، لە جێوە هەڵسایەوەو تا بگەڕێتەوە جادەکەوە، دوو ژنی پیر دەستی ئەویان گرتبوو، بە ماچو پاڕانەوە نەیاندەهێشت لە جێوە تەکان بخوات، لە دۆزینەوەی وشەی لەبار بۆ دڵدانەوەی ئەوان کێ دەیتوانی بەم ڕێڕەوە نەناسراوە کۆستێکی بەرابەر بهێنێتەوە؟ لە کاتێکدا لە سەرەخۆی دەستەکانی خۆی لە دەستی پیرێژنەکان دەردەهێنا، هەمیشە بەوانی دەگوت ((گریە مەکەن.. گریە مەکەن.. من دەگەڕێمەوە)) یاکوب کە لەسەرساامیاندا دەمی بەش ببۆوە، لە ڕۆیشتندا دیسان وەستا، ئەشك لە چاوانی سەلیبسازدا ئەڵقەی بەستابوو، بریقەی دەدایەوە، بۆ ساتێ سەیری ئاسمانی بەرزی گوڵڕەنگیان دەکردو ساتێکی تریش سەیری زەمین، خەڵکە قامەت چەمیوەکە کە بەناو قوڕو لیتەدا هەڵدەخزینو شیوەنیان دەکرد، یاکوب بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((واتە ئەمە هەمان سەلیبسازە؟)) شڵەژانی خۆی لادابە لایەك ((لە تەبەشی ئەودا وەکو تەبەشی ئەلیاس پێغەمبەر نور دەگەشێتەوە))

کوڕی مێرێ ئێستاکە پێی نابووە شیرازەی خەرمانگاوە، یاکوبی دیت بە ناونیشانی سەلام دەستی بەسەر دڵیەوە دانا.

کوڕی زوبەدی بە ئاوازرێکی شیرین گوتی: ((کوڕی مێریێ ئۆغرت خێر))و بەرلەوەی ئەوەی دی بتوانێ وەلاٚمی داتەوە، هەندێ شتی تری خستە سەر قسەکەی ((لەگەڵ یەك بڕۆین، ڕێ درێژەو هاوسەفەری پێدەوێ ئەمر دەکات)) کوڕی مێریێ بۆ خۆی دووبارەی کردەوە ((ڕێ درێژەو هاوسەفەری پێدەوێ))، بەلاٚم ئەندێشەی خۆی نەخستە سەرزمانو گوتی: ((بڕۆین)) لەگەڵ یەك لە جادەی پانی کفر ناحوم کەوتنەڕێ، ماوەیەك بێ قسە ڕەتبوو، شیوەنی ژنان لە خەرمانگاکاندا بەرز دەبۆوە، پیرەمێردەکان خۆیان هاوێشتبووە سەر گۆپاڵو سەیری ئەو گەنمەیان دەکرد کە لە ناو ئاودا بە تاراج چوو، جوتیاران بە تەبەشی گرژیانەوە، بەبێ حەرەکەت لە ناوەندی مەزرای دروێنەکراوی خۆیاندا وەستابوون هەندێکیان بێدەنگ مابوونەوەو هەندێکیان کفریان دەکردو جوێنیان ڕەوان دەکرد، کوڕی مێریێ بە هەڵکێشانی ئاخێ گوتی: ((چ دەبوو ئەگەر تەنها یەك مرۆڤ هێزی بەرگەگرتنی برسیەتی هەبێ تاسەرحەدی مەرگ، تا مرۆڤ لەبەر برسیەتی تەلەف نەبێ))

یاکوب بەگۆشەی چاویەوە سەیری ئەوی کرد، بە تیزەوە وای نیشاندا کە ((ئەگەر بتتوانیایە ببیت بە گەنم تا خەڵکان بتخۆنو نەجاتیان بێ ئەو کارەت دەکرد؟))

چاوی شاهین سیفەتو لێوانی ئەستوورشۆڕی یاکوب لەرزی، وەلاٚمی دایەوە،((من!)) کوڕی مەرەیەم بێدەنگ بوو، ئەویدی گرتە خۆو بە بۆڵەوە گوتی: ((بۆ من لەناوبچم، ئەوە خودا بوو کە لافاوی نارد من چ گوناهێکم هەیە؟ وەحشیانە سەیری ئاسمانی کردو پێداچوو ((خودا ئەم کارەی بۆ کرد؟ خەڵك چییان کردبوو؟ کە تێناگەم ئەی تۆ چۆن کوڕی مێریێ؟))

((براکەم مەپرسە، گوناهیان هەیە، تاچەند ڕۆژی پێش منیش پرسیارم دەکرد، بەلاٚم ئێستا من تێدەگەم، ئەوە هەمان (ماریێ) بوو کە یەکەمین مەخلوقی ڕێبەدەرکردو خودا ئەوانی لە بەهەشت فڕێ دایە دەرەوە

–مەبەستت لەمەدا چییە؟

–پرسیار



–کوڕی زوبەدی ((تێناگەم، خێرا ڕۆیی. ئیدی بۆ هاوسەفەریی دانووی لەگەڵ کوڕی مێریێ ناکوڵێ، وشەکانی قوڕس دەبوونو بەرگەگرتنی بێدەنگیەکانی لە قسەکانی سەخت تربوون، ئێستاکە ئەوان گەیشتنە سەر بەرزایی کۆلاٚنێکەوە لە لە دەشتاییدا، ئاوی بریقەداری گنسارت لە دوورەوە بەدیارکەوت، کەشتیەکان گەیشتبوونە دەریاچەوە ماسیگرێ دەستی پێکردبوو، هەتاو وەك دزێکی خوێناوی لە بیاباندا سەری هەڵکێشا، کەناری دەریاچەی شاری بازرگارنیو سەروەتمەند بە تەواوی سپێدەیەوە دەدرەوشایەوە. یاکوب قایغەکانی خۆی لە دوورەوە دیت زەینی پڕ لە ماسی بوو، گەڕایەوە لای هاوسەفەری ناجۆریو گوتی: ((کوڕی مێریێ بۆ کوێ دەچیت؟ سەیرکە کفرناحوم لەوێیە))

کوڕی مێریێ سەری لار کردەوەو وەلاٚمی نەدایەوە، شەرمی دەکرد بڵێ کەبەرەو لای دێر دەچم تاببمە مرۆڤێکی پاكو پیرۆز، یاکوب بە هەڵبڕینی سەریەوە زەق زەق کەوتە ڕوانینی ئەوەوە، لەپڕێکا ئەندێشەیەکی هەرماسی ختوورەی کردە زەینەوە، بەتووڕەییەوە پرسی ((وای بەچاك دەزانی قسەیێ نەکەی، وانییە؟ خەریکی دەیشاریتەوە، دروستە؟)) دەستی هاوێشتە ژێر چەناگەی هاوسەفەری خۆیو سەری ئەوی بەرزکردەوە، ((سەیری چاوەکانی من بکە بڵێ بزانم کێ تۆی ڕەوانە کردووە؟)) کوڕی مێریێ ئاهێکی هەڵکێشاو کەوتە زەمزەمەوە ((نازانم نازانم ڕەنگە خودا لەوانەشە..)). دوو دڵ بوو، ترس وا بەسەریدا زاڵ بوو، وشە لە گەرووی گیری خوارد، ڕاست نەکات کە لەلایەن هەرماسەوە ناردرابیت؟

خەندەییێکی وشكو تێکەڵ بە بێزکردنەوە لە لێوەکانی یاکوب کەوتە هەڵبەزینەوە، بازووەکانی ئەوی توندگرتو بەزبری ڕایتەکاند بە نەرمی هاواری کرد، ((یوزباشی، یوزباشی دۆستت هەمانە کە تۆی ناردوە)) بەڵی خۆی بوو، حەتمەن یوزباشی ئەوی بەناونیشانی جاسوس ناردبوو، جانبازە نوێکان، کێوو سەحرایان پڕ کردبوو، ئەوان بەرەو دێهاتەکان سەرەوژێر دەبوونەوە، بەدزیەوە پەیوەندیان لەگەڵ خەڵك دروست دەکردو دەربارەی تۆڵەو ئازادی لەگەڵیاندا قسەیان دەکرد، یوزباشی خوێنخۆری ناصیرە جاسوسی زێڕکڕی یەهودی بۆ دێهات ڕەوانە کردبوو، هەمان سەلیبساز

یەکێکە لەوان. یاکوب بەرقەوە کریستی لە خۆی بە دوور کرد، لە کاتێکدا کە دەنگی خۆی کز کردبوو، گوتی: ((کوڕی نەجاڕ، گوێ بگرە، لە هەمان ئەو جێیەدا ڕێگەمان لە یەك جیا دەبێتەوە، لەوانەیە تۆ ئاگاهیت لە مەبەستی خۆت نەبێت، بەڵام من ئاگادارم، زۆر چاکە، ئێستێ برۆ، بەڵام ئەوە دواجار نابێ کە من دەبینی یا سەبارەت بەمن شتێ دەبیستی، بێچارە بۆ هەر لایێ کەمن رابکێشی بەدوات دەکەوم، وای بە حاڵت! زیاتر لەوە قسەم نییە، بەڵام ئەوەت لە من پێ بێ، ئەو ڕێبەرەی هەڵتبژاردوە، گیانت بە سەلامەتی لێی دەرناچی!)) ئەوکاتە بێ ئەوەی دەستی بۆ خواحافیزی درێژ کات، بەپەلە سەرەوژێر بۆوە، زرکوڕانی زوبەدی، مەنجەڵی مسینیان بەسەر ئاگرەوە هەڵگرتبوو بەدەوریا ئەڵقەیان بەستابوو، یەکەمین نەفەر کە کەوچکی دارینی نایە ناو مەنجەڵ خودی پیرەمێرد بوو، گەورەترین ماسی هەڵبژاردو خەریکی خواردنی بوو، بەڵام پیرەمێردترین کەسی گروپەکە دەستی هێنا پێشەوەو تا لە خواردنی بکات "لەبیرمان کرد سپاسی خودا بکەین"

زوبەدی پیر، لە کاتێکدا لوقمەکەی دەجووی، کەوچکی دارینی بەرزکردەوە کەوتە سوپاسگوزاری خودای سراییل، تا نەوەکانی کەلیمیان پەروەرش بکاتو تا گەیشتنی رۆژێ خودا توانااو بەرگەگرتن بەوان ببەخشێت، رۆژێ کە دوژمنانیان پەرش‌و بڵاوەبنەوە، رۆژێ کە تەواوی میللەتان لە پێشگای سراییلی بەخاك دادراو سوژدە ببەن. رۆژێ کە تەواوی خودایانی سەر بە ئاستانەی ئەدۆنیای نەرم‌و نیان ئەو دەپەرستن، ((ئەی پەروەردگار لەبەر ئەمەیە کە دەخۆین، لەبەر ئەمەیە کە ژن دەهێنن‌و منداڵ وەبەردێنین، هەر بۆ ئەوەیە کە دەژین- هەموو لەبەر خاتری تۆ-)) لەگەڵ ئەم قسەیەدا ماسیەکەی درشت بە لوقمە قورتدا.

لە هەمان کاتدا کە ئاغاو کارگەر خواردن دەخۆن، لەززەت لەو مێوەیەی کە زەحمەتیان بۆ کێشاون، چاویان بڕیبووە دەریاچەی دایکیان کە سەرچاوەی بژستیان بوو، لەپڕێکا یاکوب تووڕەو قوڕاوی لەبەر چاوی ئەوان بەدیار کەوت.

ماسیگرەکان جێیان بۆ کردەوەو زوبەدی پیر کە کەیفی خۆش بوو هاواری کرد: ((بەخێر بێی بەخت لەگەڵ تۆ یارە، دانیشەو بخۆ...خەبەری تازە چییە؟



وەڵام نەهات، کوڕە لە کەنار باوکی چۆکی داو دەستی بۆ لای مەنجەڵەکە درێژ نەکرد کە بۆنێکی خۆش‌و بوخاری لێ بەرزدەبۆوە، زوبەدی پیر بەترس‌و لەرزەوە سەری وەرسووراندو سەیری ئەوی کرد، ئەو کوڕە مەڕئاساو کەم قسەیەی باش دەناسی‌و لەسەرو سەربردەی ئەو ئاگادار بوو لێی دەترسا، پرسی ((مەگەر برسیت نییە؟ ئەو چ سەرو پۆتەلاکە پەیدات کردوە؟ ئەوە جارێکی دی لەگەڵ کێ شەڕت کردوە؟

یاکوب بەتووڕەییەوە وەڵامی دایەوە ((لەگەڵ خوداو هەرماس‌و مرۆڤەکان، برسیم نییە)).

زوبەدی بەخۆی گوت ((نەفرەت لە هەرماس، هاتووە نەهێڵێ یەك لوقمەی خۆش لە گەروومان بچێتە خوارەوە)). بەڵام بە بەسەر زمانهێنانی ئەو قسانە خودپارێزی کرد تا خولقی تەنگ نەبێ بابەتەکەی گۆڕی بە میهرەبانییەوە دەستی لە ئەژنۆی کوڕەکەی داو بەچاو هەڵتەکانەوە گوتی: ((هەی بەد فیترەت ئەوە لە ڕێگا لەگەڵ کێ قسەت کردوە؟))

یاکوب ((ئاوا کەواتە ئێمە جاسوسمان هەیە؟ کێ بە ئێوەی گوت؟ من لەگەڵ کەسێ قسەم نەکردوە!))

بەم قسەیە هەستایەوە سەرپێ‌و چووە لای دەریاچە، چۆکی لە ئاو بردە خوارەوەو دەم وچاوی شوشت، ئەو کاتە بەرەو لای گروپەکە گەڕایەوە، بەڵام بە دیتنی سەروپۆتەلاکی خەندانی ئەوان کە دەیانخواردو پێدەکەنین، وەکو تۆپ تەقینەوە: ((ئێوە دەخۆن‌و دەخۆنەوەو لە ناصیرە ئەوانی دیکە لە پێناوی ئێوە لە خاچ دەدرێن!)) ئیدی نەیتوانی بەرگەی سەروپۆتەلاکی ئەوان بگرێ بە بۆڵەبۆڵەوە بۆ لای دێ کەوتە ڕێگاوە. زوبەدی پیر سەیری پشتی سەری ئەوی دەکردو لە کاتێکدا سەری خۆی هەڵدەتەکاندو گوتی: ((کوڕەکانم وەك دڕکی ناو چاوی منن، یەکێکیان زیاد لە پێویست نەرم‌و نیان زاهیدو خواپەرست بوو. ئەویتریش زیاد لە ئەندازە کەللەشەق، بە هەر شوێنی دابڕوات، یا بوەستێ جارو جەنجاڵ دەخاتە ئاراوە، دڕك... هیچ یەکێکیان نەبوونە مرۆڤێکی دروست‌و حیسانی، یەکیان تۆزێ نەرم کە بە پێچەوانەی سروشت‌و خوو، جارێ میهرەبان‌و جارێ سەگێکی هار، نیوەی هەرماس‌و نیوەی فریشتە- بە کورتی..

یەك مرۆڤ!)) بە هەڵكێشانی ئاخێ، ماسی سەر زێڕی فڕاندە دەمی تا كامی تاڵی قورت بداتو ئاودیوی بكات، گوتی: ((سوپاس بۆ خودا كە ماسی سەر زێڕینو ئەو دەریاچانەی كە زایندەی ئەوانو خوداییێ كە دەریاچەكانی خەڵق كردوە)) پیرەمێردی گروپەكە گوتی: ((تۆ كەوا دەڵێی كەواتە یونسی پیر چی بڵێت؟ بێنەوایەی هەموو رۆژی عەسران بەسەر تاوێرە بەردێ دادەنیشێ. سەیری لای ئورشەلیم دەكاتو بۆ ئەندریاسی كوڕی ئەشك هەڵدەڕێژێ، ئەندریاس یەكێ لە هەمان ئەو سەر گەرمانەن، دەڵێن پێغەمبەرێكی كەشفكردووەو لە هەموو جێگاییێ بە دوای ئەوا دەكەوتە رێ، جگە لە كلۆو هەنگوین هیچی دیكە ناخوات، خەڵكی دەگرنو دەیانخەنە رووباری ئۆردنو تا لە بەقسەی خۆیان گوناهەكانیان بشۆنەوە)).

زوبەدی دەخالەتی كردو گوتی: ((بە ئێمەیان گوتووە كوڕتان هەبێ تا وەزعتان باش بێ، ئەو گۆزیەم بدەرێ، بەڕای من هێشتا هەندێ شەڕابی تیایە دەمەوێ حاڵم بێتەوە جێ، دەنگی هەنگاوی سەنگینو سست رۆیشتنی بەسەر گاشەبەردەكانەوە بیست وای بەدیاردەخست كە ئاژەڵێكی زەبەلڵاح بە تووڕەییەوە نزیك دەكەوێتەوە، زوبەدی پیر ئاوڕێكی دایەوەو بە دەنگێكی بەرز گوتی: ((صەفات هێنا یونسی نازەنین)) ردێنی بەشەراب بووی پاك كردەوە بەڕێزەوە لە جێوە هەڵسایەوە، شەرمی كرد دابنیشێ، ((لەگەڵ كوڕەكانم دانیشتوومو خەریكین میوانداری خۆمان بەماسی سەرزێڕین دەكەین، فەرموو، ماسی بخۆو قسەمان بۆ بكە، ئەدی خەبەری كوڕەكەت-ئەندریاسی پیرۆز- چییە؟.ماسیگرێكی پیر لە پێشیاندا بەدیاركەوت، كورتو چووارشانەبوو، پێلاوی لەپێ نەبوو هەتاو ئەوی كردبووە كەباب، چاوانی كزو تیر بوو، كەللەییێكی گەورە كە موی سپیو ئاڵۆز داپیۆشی بوو پێستی وەكو پولەكەی ماسی لێهاتبوو، بۆ پێشەوە لار بۆوەو، تاك تاكی ئەوانی خستە ژێر نەزەری خۆیەوەو بەدوای كەسێدا دەگەڕا.

زوبەدی پرسی ((باوكە یونس بە دوای كێ دەگەڕێی؟ وەكو ئەوەی كە زۆر ماندووبێو نەتەوێ قسە بكەیت؟)) چاوی بڕیە پێو ردێنو قژی یونس: پڕبوو بوو لە ئێسقانی ماسی خەزەی دەریایی، لێوی ئەستوورو قاش قاشی وەكو لێوی ماسی دەكرانەوەو



دادەخران ودەنگیان نەبوو .. زوبەدی ویستی لەبنەوە پێبكەنێ كەناگەهان ترسێكی بەسەردا زاڵ بوو، بەدحاڵیبوونێكی گەمژەلانە بەزەینیدا رەتبوو، بە هەراسانیەوە دەستەكانی بۆ پێشەوە درێژ كرد، وەك بڵێی دەیەویست یونسی پیر زیاتر نزیك نەكەوێ، لە كاتێكدا بەسەر پێیەكانیەوە هەڵدەبەزیەوە هاواری كرد:

((قسە بكە نەكا یونس پێغەمبەر بیت؟ ئەو هەموو ماوەیە لەگەڵ ئێمەبوویت خۆشت شاردۆتەوە؟ بەناوی ئەدونیاوە سوێندت دەدەم كەقسە بكەی، بیستوومە جارێكیان ئەوعابیدەی دێر دەربارەی ئەو ماسیەی كە یونس پێغەمبەری بە یاكپارچەیی قورت داوە قسەی دەكردو پاشان ساغ وسەلامەت ئەوی هێنابووە سەرەوە: خەزەی دەریایی بەموی سەرو سینەی وەنووسا بوو، ردێنی پڕبوو بوو لە فەرخە قرژاڵ، لەدڵ نەگری بەلاّم مەرج دەكەم كە ئەگەر لەناو ردێنت بگەڕێم، قرژاڵ دەدۆزمەوە.

ماسیگرەكان قاقا پێدەكەنین، بەلاّم زوبەدی بە وەحشەتێ لە چاوەكانی، سەیری دۆستە كۆنینەكەی خۆی دەكرد، بەوی گوت:

((ئەی مەردی خودا قسەبكە تۆ یونس ی پێغەمبەرنیت؟))

یونسی پیر بە هێمای رەت كردنەوە سەری راتەكاند، بەبیری نەدەهات كە ماسی قورتی دابێ؟ بەمحاڵەوە رەنگبوو دوای ساڵەهای ساڵ خەبات لەگەڵ ماسی لەكێ دەیتوانی وەبیری بێتەوە. زوبەدی پیر بە زەمزەمە كردنەوە گوتی (خۆیەتی ... خۆیەتی ) چاویشی لەلایێكەوە بۆلایێ دەسوورا، وەك بڵێی دەیخوازی رێگەی راكردن بدۆزێتەوە، دەیزانی كە پەیامبەران مرۆڤی رەنگاوڕەنگ بووینەوە كە نەدەبوو پشتیان پێ ببەسترێ، لەهەواو دەریا لە ئاگر ون دەبوون، پاشان لە كاتێكی چاوەڕوان نەكراودا، بە جیلوەیێ سەوز دەبوون، مەگەر ئەلیاس بەسواری ئاگر بەرزنەبووبۆوە ئاسمان؟ لەگەڵ ئەمەش هێشتا زیندوو بوو سەڵتەنەتی دەكرد، جیاوازی نەبوو دەچوویتە كام لووتكەی كوێستان لەوێ لەبەر دەمت بوو، هەمان ئەوەش دەربارەی — خنوخ — راستە: ئەو جاویدانەبوو، ئێستاش یونسی پەیامبەر، زوبەدی بە خۆی گوت: ((خۆی لە گێلی دەدا، واخۆی دەنوێنێ كە ماسیگرێكەو دەبێتە باوكە پەتڕۆسو ئەندریاس، چاكتر وایە بە میهرەبانی رەفتاری لەگەڵ بكەیت، ئەو پەیامبەرانە

بوونەوەری عەجیبو غەریب کەللەڕەقن، ئەگەر حەواست کۆنەکەیتەوە دەکەویتە دەردەسەریەوە)) لەبەر ئەمە بە ئاوازێکی شیرین گوتی:

- هاوسێی ئازیزم باوکە یونس ئایا بەدوای کەسێدا دەگەڕێی؟ یاکوبت دەوێ؟ لە ناصیرە گەڕایەوە، بەلاّم وادەهاتە بەرچاو کەماندوو بێو چووە گوند ئەگەر لەهەوالّی کوڕەکەت پەترۆس دەپرسی، گوتی: زۆرباشەو سوپاس بۆ خوا حالّی باشەو نیگەرانییەك لەمیاندا نییە، سەلامەتەو زوو دێتەوە، لەناخەوە سلاّوی هەیە، گوێت لە منە، یونس؟ هێمایەك بکە لەگەلّ ئەودا بەگەرمی قسەی دەکرد دەستی لەشانی چەرم ئاسای دەدا، کێ دەیزانی هەموو شتی دەبێ، ئەو ماسیگرە کەللوپەکە رەنگە یونسی پەیامبەر بێ، لەبەر ئەمە باشتربووکە حەواست جەم بێ، یونسی پیر کوڕبوو بووبۆوە، لەناو مەنجەلّدا یەك دووپشکی دەریای دەرهێناو یەکپارچە نایە دەمیەوە، خەریکی جوینی بوو، ئەوکاتە بەمقەمقەوە گوتی: ((من دەڕۆم))و پشتی لەوان کرد، جارێکی دیکەش تاوێرەبەردەکان کەوتنە قرچە قرچەوە، مەلێکی دەریایی هاتە سەر سەریەوە، بالّەکانی لێکداو ساتێ وەستا، وەك بلّێی چاوی بەقرژالّی مووی ناو سەری ماسیگر کەوتبێ، لە رووداو لە رووی ترسەوە کەوتە قاژوقیژەوەو دوورکەوتەوە زوبەدی پیر گوتی (کوڕینە ئاگاداربن مەرج دەکەم یونسی پەیامبەرە ئێستا کە پەترۆس لێرە نیە، باشتر وایە کە دوو نەفەر لە ئێوە بچێتە کۆمەگی ئەوەوە، دەنا خودا دەزانی چیمان بەسەردێت. دوو ماسیگری زەبەللاح لە جێوە قیت بوونەوە نیوە بە شۆخی ونیوە بەترسەوە، ئەویان خستە بەر قسەوە ((زوبەدی تۆ بەرپرسی ئەنجامی ئەوکارەی، پەیامبەران ئاژەلّی وەحشین، وەهەروەها بەبێ خەبەر دەم دەکەنەوە مرۆڤ دەخەنە ژێر ددانیانەوە ! باوابێ بڕۆین خودا حافیز)) زوبەدی سەری رازی بوونی نا بە سینە، چاك لەگەلّ ئەو پەیامبەرە خێوابوێ، ئێستا رووی لە زڕ کوڕەکانی دیکەی کردو گوتی ((کوڕینە خۆتان شاد نیشان بدەنو بەشادومانی پێ هەلّگرن سەبەتەکانتان پڕ ماسی بکەنو بۆلای دێ بکەونە رێ، بەلاّم حەواستان جەم بکەن)).

جووتیاران مرۆڤی مەکربازن وەکو ماسیگران بێ فاكو فیك نین، ئێمە بەندەی تایبەتی خوداین، تا ئەوەندەی کە دەتوانن ماسی کەمتر بدەنو گەنمی زیاتر وەرگرن



(هەتا ئەگەر هی پارسالّیش بێت ) روونو شەرابو مریشكو کەروێشکیش وەرگرن، حەواستان کۆکەنەوە (دوو دووتا چووارتا)

زڕکوڕەکان لە جێوە قیت بوونەوە دەستیان کرد بەپڕکردنی سەبەتەکان . لەدوورەوە لەپشت تاوێر بەردەکاتەوە، نەفەرێکی وشترسوار بە دیارکەوت، زوبەدی پیر دەستی خستەسەر چاویو سەیری کرد، بە دەنگێکی بەرز گووتی: ((ئاهای کوڕینە وەرنە ئێرەوەو سەیربکەن، وابیرناکەنەوە یارۆ کوڕی من بێ؟

سوارەکە بە سەر زیخی نەرمدا رادەبردوو لەوان نزیك کەوتەوە، ماسیگرەکان بەیەك دەنگ هاواریان کرد ((خۆیەتی، خۆیەتی، چاوتان روون)) سوارەکە بەبەردەوامی ئەواندا رەت دەبوو، بۆ سەلام کردن دەستی راستی راتەکاند، باوکە پیرەکە هاواری کرد ( یۆحەننا بۆ ئەوەندە بە پەلەی؟ ئۆغرت خێر دەقیقەیێ بوەستە بتبینم) .

- عابید لە حالّی مەرگدایە ،کاتم نیە .

- چی بووە

- نایەوێ خۆراك بخوات، دەیەوێ بمرێت

- بۆ.... بۆ ..

-بەلاّم قسەکانی سوار لە هەوا گوم بوو ...

زوبەدی پیر کۆخەیێکی کرد، بۆ ساتی کەوتە ئەندێشەو ئەوکاتە سەری راتەکاندو گوتی: ( خودایە ئێمە لە ئافەتی بە پیرۆزکردن بپارێزە)) کوڕی مێرێ سەیری سەرەوژووربوونەوەی یاکوبی کرد کە بە هەنگاوی تووڕە بەرەو کفرناحوم رۆیشت، بە پێ ی وەك خاچ ودلّی پڕ دەردەوە خۆی هاوێشتە سەر زەوی.

بۆ ئەو کە بەمجۆرە شەیدای خۆشەویستیو هەبوونی دۆست بوو، ئەو هەموو رقو قینەی لەناودلّی مرۆڤدا بێدار دەکردەوە؟ کەمتەرخەمی لە خۆی بوو، خوداو خەلّك کەمتەرخەم نەبوون، بۆ بەم هەموو دلّڕەقییە رەفتاری دەکرد، بۆ رێگاییێکی هەلّدەبژاردو ئێستا کەش، شەهامەتی ئەوەی نیە تاکۆتایی بیپێوێ؟ ئەو ترسنۆکێکی

زەلیل بوو شایستەی بەزەیی بوو، بۆ مەجدەلیەی بەناوی هاوسەر هەڵنەبژارد، تارزگاری بکات، لە شەرم ومەرگ؟ لەوکاتەی کەخواوەند چەنگاڵەکانی خۆی لەسەریا بردەخوارەوە، ئەمری دەکرد هەڵستێتەوە، ئەی بۆ بە زەوی وەدەنووساو سەرپێچی لە هەستانەوە دەکرد؟ ئێستا بۆ بۆتە بەندەی ترس‌و دەچێتە بیابان تاخۆی بشارێتەوە؟ بیری نەدەکردەوە کە خودا لەوێش وەك هەر شوێنێکی دی پەیدا دەبێت؟

خۆرەتاو نزیکەی بەسەرسەریەوە وەستابوو، لە خۆدان ونالە وشین بۆ گەنمی لە دەست چوو تەواوببوو، ئەو خەڵکە رەنجدەرانە، پێشتر خوویان بە کارەساتەوە گرتبوو، ئەوان وەبیریان بوو کە شیوەکانیان هیچ بەرهەمێکی نەهێنابوو، لەبەرئەمە ورەیان نەدەرووخا . هەزاران ساڵ بوو کە لەژێر باری زوڵم بوون، برسیەتیان چەشتبوو، هێزی دیارو پەنهان ئەوانی بەم لاو بەملادا راکێشابوو، بەڵام بەرێگایەك بەری خۆیان لە ئاودا پەڕاندبۆوە، هەمان ئەوە فێری سەبرو بەرگەی کردبوون مارمیلکێکی سەوز لە ژێر بنە درکێکی کورتەوە دەرپەڕی، هاتبووە بەر رۆژێ، بەبینینی ئەم مرۆڤە - ئاژەڵی ترسناك — زراوی چوو دەستی کرد بە قەرەج و دلی، بەڵام دڵی خۆی دایەوە جەستەی خۆی نووساندە گاشە بەردی گەرمەوە، چاوانی رەشی کارەبایی خۆی وەرسووراند بە دڵنیاییەوە چاوی بڕیە کوڕی مێرێ‌ەوە، وەك بڵێی چاك‌و چۆنی لەگەڵدا دەکات، یا دەیگوت ((چوونکە تۆم بینی بەتەنهای هاتووم لەگەڵ تۆدابم))، کوڕی مێرێ خۆشحاڵ بوو، هەناسەی راگرت تا نەوەکا ئەو میوانە بترسێنێ، بەڵام لە هەمان کاتدا کە سەیری ئەوی دەکرد دڵی وەکو ئەو لێی دەدا، دوو پەپوولەی خاڵ سوورو رەش لە میانی ئەواندا کەوتنە لەرینەوە، بەرەو لای کوڕی مێرێ پەڕیان لێکداو پاشەکشەیان دەکرد بەرەو مارمێلکەکە دەچوون، خەیاڵی رۆیشتتنیان نەبوو، بە شادومانی سەمایان دەکرد لەبەرهەتاودا ورشە ورشیان بوو لە کۆتاییدا بەسەردەسماڵی خوێنینی پیاوەکە نیشتنەوەو خەرتومی خۆیان گرتە سەر خاڵە سوورەکانەوە وەك بڵێی هەوای هەڵمژتنی خوێناویان هەبوو، هەستی لاواندنەوەی خەرتومی پەپولەکان بەسەرجانگیەوە، ئەوی خستەوە یادی پەنجەکانی خودا، وای هاتە بەرچاو کە پەنجەکانی خوداو خەرتومی پەپولەکان پەیامێکی تاقانە بۆ ئەو دەهێنن، ئاخ چ دەبوو کە خودا هەمیشە وەکو هەورەتریشقە یا خەرتەلی چڕنووك تیژ نەهاتبایە



خوارەوە، بەڵکو وەکو پەروانەیەك دادەبەزی‌و لەهەمان کاتدا خوداو پەپولەی لەزەینی خۆیدا دەکرد بەیەك، هەستی دەکرد شتێ ختوکەی پێیەکانی دەدا، سەیری خوارەوەی کرد بینی زنجیرەیێ لە مێروولەی درشتی رەنگی زەردو رەش لەژێر کەوانەی پێیەکانیدا بەپەلە لەهاتوچووندان.

لە چەند دەستەیەکی دوو دووی‌و سێتایی بە دەمەوە گەنمیان هەڵدەگرت کەلە کێڵگەی گەنمەوە، لە خەڵکیان دزی بوو بۆ لانەکانی خۆیان دەیانگواستەوە، لەتەواوی ئەم کاتانەدا خودایان — مێروولەی گەورە — سوپاسگوزاری دەکرد کە هەمیشە نیگەرانی خەڵکی هەڵبژ ێردراوەکانی — مێروولەکان — بوو.

دروست کاتیێ کە گەنم لە خەرمانگاکاندا عەمبار کرابوو، لافاوی بۆ مەزرا دەنارد، کوڕی مێرێ ئاخێکی هەڵکێشاو لەگەڵ خۆیدا کەوتە ئەندێشە ((مێروولەکانیش ئافەریدەی خودان .، مرۆڤو مارمیلکەکانیش، هەروەها ئەو کلۆیانەی کە گوێم لە دەنگیان دەبێ لە زەیتونستانەکاندا، چەقەلەکان کە شەوانگاوان دەلورێنن .. لافاو برسیەتی .. )) .

دەنگی هەناسەکانی توندی کەسێکی لە دوای خۆی بیست، ترس سەراسەری وجودی داگرت، ماوەیەك بوو کە ئەو ژنەی فەرامۆش کردبوو، بەڵام ئەو ئەمی فەرامۆش نەکردبوو، دەیتوانی لەپشتی خۆی هەست بەو بکات کەوەکو خۆی چووارمێچکی دانیشتووەو بە سەختی هەناسە هەڵدەکێشی، لەبەرخۆکەوتە زەمزەمەوە ((نەفرینیش مەخلوقی خودایە)).

هەستی کرد لەهەناسەی خودادا وەرپێچراوە، ئەوە هەناسەیە جارجار گەرم‌و میهرەبان جارێکیش وەحشی‌و بێ بەزەیی لەودا هەڵیدەکرد، مارمیلکەکان، پەپولەکان، مێرولەکان‌و نەفرەتی، هەموویان خودابوون. بەبیستنی دەنگ‌و ئاوازی زەنگوڵە بەدرێژایی رێگا ،کاروانی درێژی وشتران کە پڕ باری کەل‌و پەلی بەنرخ، رەت دەبوون، ولاغێکی چووکەلە وپەست لە پێشەوە بوو، ئەم کاروانە حەتمەن لە نەینەواو بابل دەهات‌و بەدامێنی رووباری پڕ بەرەکەی حەزرەتی ئیبراهیم داکەوتبوونە رێ‌و

بەدرێژایی بیاباندا تێدەپەڕین، ئاورێشمودااوودەرمانو عاجو رەنگە کۆیلەی ژنو پیاویشیان بە کەشتی رەنگاورەنگ بار کردبێ.

کاروانەکە لە قەتارەییێکی رێکوپێکدا رێی دەبڕی، وا بە دیار دەکەوت کە پاپانی بۆ نییە، کوڕی مێریێ لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە، ((ئەو خەڵکە چ سەروەتو سامانێکی هەیە!)) لە کۆتایی کاروان دا بازرگانێکی ردێن رەشی دەوڵەمەند بە خۆیو گوارەییێکی زێڕینەوە کە جلێکی سەوزو چادرێکی سپی لەبەردا بوو بەدیارکەوت.

وشترەکان بەنازوفیزەوە بە بەردەمی ئەودا رەتدەبوو، لەپڕێکا هاتە زەینی کە ئەوان لە مەجدەل دەوەستن، لەبەرخۆ گوتی: ((دەرگای ماڵی مەجدەلیە رۆژو شەو کراوەیە، ئەوان دەچنە ماڵەکەی ئەوەوە، مەجدەلیە دەبێ تۆ نەجات بدەم — ئۆە چی دەبوو ئەگەر بمتوانیایە تۆ نەجات بدەم ئەی مەجدەلیە، ناتوانم قەومی سراییل نەجات بدەم، من پەیامبەر نیم، ئەگەر لێو بکەمەوە نازانم چی بڵێم، خوداوەند لێوەکانی منی بە پشکۆی سووتێنەر پیرۆز نەکرد، هەورەتریشقەی دانەبەزاندە دەروونم تا ئاگر بگرمو دێوانە ئاسا راکەمە خیابانو هاوارا بکەم، دەمەوێ وشەکان لە خودی ئەوبن، منو وشەکان کوجا مەرحەبا، من تەنها دەمم دەکەمەوە ئەو قسە دەکا نا پەیامبەرنیم، من مرۆڤێکی ئاسایی زیاترنیم، کە لە هەموو شتی دەترسێ. مەجدەلیە ناتوانم تۆ لە ناو نوێنی شەرم بهێنمە دەرەوە، بۆیە دەچمە بیابان، دەچمە دێر تا دوعات بۆ بکەم، پاڕانەوە هەموو توانای منە، دەگێڕنەوە لە کاتی جەنگەکان، مووسا هەمیشە دەستی بۆ ئاسمان درێژ دەکرد/ کوڕانی سراییل سەرکەوتن، هەرکە دەستی ئەوان ماندوو دەبوو دەیانهێنایە خوارەوە، شکستیان دەخوارد، مەجدەلیە بۆ خاتری تۆ دەستەکانم رۆژو شەو بەرەو ئاسمان بەرز دەکەمەوە)).

سەیری بەرزایی کرد تا بزانێ خۆرەتاو کەی دەیەوێ ئاوابێ، دەیەویست شەوانە بەردەوامی بەسەفەری خۆی بدات، تابتوانێ لە کفرناحوم- رەت ببێ، بەبێ ئەوەی کەسێ ببینێ، ئەو کاتە بەدەوری دەریا بسوورێتەوەو بچێتە ناو بیابان، بۆ گەیشتن تا دەهات دڵێ بێ تاقەتو بێ تاقەت تر دەبوو، لەکاتێکا دیسان ئاخی هەڵدەکێشا لەبەرخۆ قسەی دەکرد:



((ئاخ چی دەبوو ئەگەر بمتوانیایە بەسەر ئاودا بڕۆمو راستەوخۆ بەسەر دەریاچەدا بڕۆیشتبام))

مارمێلکەکە هێشتا لەبەر خۆرەتاودا بەگاشە بەردەکەوە نووسابوو، پەروانەکان پۆپەیان گرتبوو، لە دەروونی رۆشناییدا ون بوو بوون، مێروولەکان کاری هەڵگرتنو گواستنەوەی خەرمانیان درێژە پێدەدا، دەیانکێشایە ناو عەمبارەکانیان، بەپەلە دەچوونە مەزراو بەبارێکی تازە دەگەڕانەوە، خۆرەتاو ئامادەی ئاوابوون بوو، رێبواران کەم بوونەوە، سێبەرەکان درێژ دەبوونەوە، عەسر دەکەوتە سەر درەختو خاکەوەو زێڕاو دەکردن، لە دەریاچە ئاو لە هەڵچوون ی تەواو بوو، لە چاولێکدانێ تەبەشی خۆی دەگۆڕی، سوور دەبوو، دەبوو بەڕەنگی وەنەوشەیی، تاریك دەبوو، ئەستێرەییێکی گەورە لە تاقی ئاسمانی شێواندا هەڵواسرابوو، کوڕی مێریێ لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە، ((هەر ئێستا شەو دەگات، هەر ئێستا کچی رەشپۆش ی خودا لەگەڵ کاروانی ئەستێرەکانیدا لەتۆزی رێوە دەگەن)) بەر لەوەی ئەستێرەکان هەلی دەرکەوتنیان بۆ بڕەخسێ تا ئاسمان داپۆشن، زەینی ئەویان داپۆشی.

بۆ دەستپێکردنی سەفەر خۆی ئامادە دەکرد، دەنگی بۆقێکی لەپشتی خۆی بیست، رێبوارێ ئەوی بانگ کرد، گەڕایەوەو لەڕۆشنایی کەمڕەنگی ئاوابووندا، ئاگاداری کەسێ بوو کە هێمای بۆ لای ئەو دەکرد، لەبەرزاییەوە دەهاتە خوارەوە، کۆڵەبارێکی گەورەی بەشانیەوە بوو، لە کاتێکا، هەولیدەدا سەروسەکوتی رێبوارەکە لەژێر باردا بناسێت، لەبەرخۆ گوتی: ((دەبێ کێ بێ؟)) ئەو رووخسارە رەنگ پەڕیوو ردێن کورتەو کەم مووەو ئەو لولاقە باریكو چەماوەی پێشتری لە شوێنی دیوە، لەپڕێکا هاواری کرد ((ئەوە تۆی تۆماس؟ دووبارە دەستت بە دێوەرەیی کردەوە؟)) دەورە گەڕی مەکربازو خێڵ، بەهەناسەبڕکێوە ، لەبەردەم ئەو وەستابوو، کۆڵەباری دابەزاندە سەر زەوی، ئارەقەی نێوچاوانی پڕ لەکەو پیسو چاوانی وردوو لچی خۆی سڕیەوە، چاوانێ کە بە سەمای دوو فاقەی خۆیەوە تۆیان لە بەرزەخی بێ بڕیارەوە قەراردەدا، نەتدەزانی کە خۆشحاڵن، یا تیزبازی دەکەن، کوڕی مێریێ، تۆماسی زیاد لە حەد خۆشدەویست، زۆر جار دەبینرا لە کاتی گەڕانەوە لە دێوەرەیی بە بوق لەپەڕی

شاڵیەوە بەکەنار کاریگەی ئەودا ڕەتدەبوو، کۆلەباری خۆی دادەنایە سەر مێزو دەربارەی ئەو شتانەی کە بینیبووی دەستی بەقسان دەکرد. پێدەکەنی‌و گاڵتەی بەخەڵك دەکرد، نەباوەڕی بەخودای سراییل هەبوو نە بە خودایێکی دیکە، دەیگوت ((خوداکانی ئێمە گاڵتەمان پێدەکەن‌و تیز بە ئێمە دەکەن تا ناچارمان کەن منالآنی خۆمان بکەینە قوربانی ئەوانەوە، تا بخوریان بۆ بسووتێنین‌و بەدەنگی بەرز سرودی جوانی ئەوان بچڕین)). کوڕی مێریێ گوێی لەو دەگرت‌و دڵی پڕ ئازاری تۆزێ ئارامدە بۆوە، ئەو مرۆڤە نوکتەبازەی پەسند دەکرد، کە سەرەڕای تەواوی هەژاری‌و تەواوی کۆیلەتی‌و فەلاکەت نەژادیشی بە داوو دەرمانی پێکەنین‌و لووگیەوە بەسەر هەژاری‌و کۆیلەتیدا زاڵ دەبوو، تۆماسی دێوەرەش، کوڕی مێریێی خۆش دەویست، بەناوی مەڕێکی بێ گوناەو ناخۆش کە بەباعە باعەوە بەدوای خودا دەگەڕا تا لە پشتی سێبەریەوە خۆی پەنهان کات، سەیری ئەوی دەکرد، بە ڕەهاکردنی خەندەوە، پێی دەگوت ((تۆ مەڕێکی، کوڕی مێریێ. بەلآم گورگێکیشت لە دەروون دایە کە ئارەزووی خواردنی تۆیەتی))

ئەوکاتە لەژێر کراسەکەیدا مشتێ خورمای لەگەڵ هەنارو سێوێك دەردەهێنا کە لە باخێکی دزی بوو پێشکەشی دەکرد، بەتازە کردنەوەی هەناسەوە گوتی:

بەدیتنت خۆشحاڵم، خودا تۆی خۆشدەوێ،ئۆغرت خێر؟

کریست لە کاتێکا هێمای بۆ دەریاچە دەکرد وەلآمی دیەوە ((بۆدێر؟))

-لەم حاڵەتەدا بە بینینی تۆ دووبارە خۆشحاڵم، یاڵلآ بگەڕێوە.

- بۆ؟ خودا..

بەلآم تۆماس وەکو تۆپ تەقیەوە: ((وەرەو لە هەقی من لوتفێ بکەو دووبارە دەربارەی خودا داد قسە مەکە، ئەو هیچ سنورو مەرز ناناسێ، تەواوی عومرت بۆ ئەملاو ئەملا دەڕۆیت تا بگەی بەو، بەلآم ئەو مرۆڤە سوبحانی کۆتایی نیە،لەبەر ئەمە فەرامۆشی بکەو لەناو کاری ئێمەدا قاتی مەکە. گوێ بگرە لەمن، لێرە ئێمە دەبێ لەگەڵ خەڵك سەروکارمان هەبێ، لەگەڵ مرۆڤی نارێك‌و فێڵباز، یەکەمینی



هەموان دەبێ ئاگاداری ئەو یەهودیە ردێن سوورە بی، بەر لە جێهێشتنی ناصیرە بینیم لەگەڵ دایکی جانبازی لە خاچدراودا پسەپسی دەکرد، پاشانیش لەگەڵ باراباس‌و دووسێ کەس لە هاوڕێیانی خەنجەر بەدەستی لە ئەنجوومەنی (برایەتی)دا، بیستم کە ناوی تۆیان دەهێنا لەبەر ئەمە ئاگادار بە کوڕی مێریێ، نەچیە دێر.

بەلآم کریست سەری هێنایە خوارەوەو گوتی: ((هەموو بوونەوەرێکی زیندوو لەدەست خودایە، هەر ئەوە کە بڕیار دەدا کە دەیەوێ کێ نەجات بدات‌و کێ بمرێنێ، چی لەدەست ئێمە دێت؟ من دەڕۆم‌و ئومێدەوارم خودا یارمەتیم بدات)) تۆماس بە توورەییەوە هاواری کرد ((تۆ دەڕۆیی؟ بەلآم هەمان ئێستا کەوا خەریکین قسە دەکەین، یەهودا بەخۆی‌و خەنجەری ژێر کراسی لەناو دێرە، تۆ خەنجەرت پێیە؟))

کوری مێریێ کەوتە لەرزەوە ((نە چی لە خەنجەر بکەم؟))

تۆماس پێکەنی‌و بەمنە منەوە گوتی: ((ئەی مەڕ.. ئەی مەڕ)). کولەباری هەڵگرت ((خودا حافیز.. هەر جۆر مەیلتە وامن پێت دەڵێم بگەڕێوەو تۆ دەڵێی ((دەڕۆم)) زۆر باشە، بڕۆ، ئەوکاتە ئیدی زۆردرەنگ بووە، لەقە لەخۆت دە)). هەڵتەکاندنی چاوی لۆچ‌و وردیلەی لە کاتێکدا فیکەی لێدەدا، بینی‌لەسەر بەرزاییەکەوە سەرەو ژێر بووەوە.

شەو بەتاسووقەوە، دامەنی خۆی رادەخست، زەوی تاریك دەبوو دەریاچە ون دەبوو، یەکەمین چراکان لە کفرناحوم داگیرسان، باڵداری ڕۆژ سەری خۆیان لەژێر باڵ نابوو کەوتبوونە خەوەوە، مەلانی شەو بێدار بووبوونەوەو بۆ ڕاوشکار دەچوون، کوڕی مێریێ کەوتە ئەندێشەوە:

((کاتێکی پیرۆزە، کاتێکی باشە بۆ بە رێکەوتن، کەس نامبێنێ بۆیە باشترە بڕۆین)) کەوتەوە یادی قسەکانی تۆماس‌و بە زەمزەمە کردنەوە گوتی: ((ئیرادەی خودا هەرچیەك بێت.. هەمان ئەوەدەبێ، ئەگەر ئەوە خودایە من بۆ پێشەوە رادەدا تا بکوژی خۆم بدۆزمەوە، لەبەر ئەمە لێگەڕێن هەرچی زووە بابڕۆم تا بکوژرێم، لانی کەم دەتوانم ئەوە ئەنجام بدەم‌و ئەنجامیشی دەدەم)). گەڕایەوەو سەیری دواوەی کرد،

بە هاوسەفەرە نادیارەکەی خۆی گوت ((بکەوینە رێ)). بەرەو لای دەریاچە کەوتە رێ. شەوێکی دڵنەوازو گەرمو نمناك بوو، بایێکی نەرم لە لای باشوورەوە هەڵیدەکرد کفرناحوم بۆنی گوڵی یاسەمینو ماسی دەدا، زوبەدی پیرلە حەوشەی ماڵەوەدا لە ژێر داربادام دا لەگەڵ سالومەی ژنی دانیشتبوو، تێشتیان تەواو کردبوو خەریکی گەپبازی بوون لە ماڵێدا، یاکوبی کوڕیان بەسەر دۆشەگەوە خۆی هەڵگێرو وەرگێڕ دەکرد، جانبازی لە خاچدراو، هەروەها ستەمێکی تازە بەلەناوبردنی گەنم کەخودا بە ڕەوای دەزانی لە هەقی خەڵك، کوڕی مێرێ کەخۆی بەناوونیشانی جاسوس فرۆشتبوو، ئەو شتانە لە تانو پۆی زەینی دا هەڵنیشتوونو دڵیان پڕ لە تووڕەیی کردبوو، ئەم بیرۆکانە خەویان لە چاوی فڕاندبوو. لە دەرەوەشدا چەنەبازیەکانی باوکی بە هەمان ئەنداز تووڕەی دەکرد، لە کاتێکا لە تووڕەییان دەکولاً هەڵبەزیەوە سەر پێیەکانیو چووە ناو حەوشەکەوەو بەرەو ئاستانەی دەرگا چوو.

دایکی به نێگەرانییەوە بانگی کرد ((بۆ کوێ دەچی؟))

یاکوب بە بۆڵە بۆڵەوە گوتی:((دەچمە لای دەریاچە تا هەوای تازە هەڵمژم))و لە تاریکیدا ون بوو، زوبەدی پیر سەری راتەکاندو بە ئاخ هەڵکێشانەوە گوتی: ((ژنێ، ئیدی دەوروزەمان گۆڕاوە، ئەو رۆژانە جەوانەکان سەری خۆیان لێ بەلاێە، لە هەوا دەفڕن، بەلاّم ناتوانن زۆر لە هەوادا بمێننەوە، دووبارە نوقمی ناو دەریا دەبنو سەر لە نوێ دەست پێدەکەنەوە. ئەوانە سەرپاکی ئەقڵیان لە دەست داوە، دەڵێی نا، سەریری یۆحەننای خۆشەویستت بکە، دەفەرمون ((من دەچمە دێرەوە)). نوێژ، رۆژ، خودا، قایغی ماسیگری زۆر بە تەسکی دێتە بەرچاوی- جێی تەنگە، ئێستاش ئەوەش ئەوی تر، یاکوب، کەوام بیردەکردەوە زەرڕەیەك ئەقڵی لە کەللەدایە، ئەوەت لە من پێ بێ: ئەویش عەشقی بەری دایتە سەری، نەتبینی ئەمشەو چۆن دەکولاّو ئامادەی تەقینەوە بوو، ماڵ بۆ ئەو زۆر تەنگ دەهاتە بەرچاو، عەیبی نییە، پەیوەندی بەمنەوە نییە، وەلێ کێ ئاگای لە کەشتیو پیاوەکانم دەبێ؟ ئایا هەموو رەنجم بە بادەچێ؟ ژنێ من دڵو دەماغم نییە کەمێ شەرابو مەززەم بۆ بهێنە تا بێمەوە سەرخۆ)).



سالومەی پیر خۆی لە کەرێ دا: مێردی پیری بە ئەندازەییێکی تەواو شەرابی نۆشی بوو، هەوڵیدا بابەتی قسە بگۆڕیو گوتی: ((ئەوان گەنجن، نیگەران مەبە، جەوانی وەکو ئارەقە وایە زۆر زوو سارد دەبێتەوە)).

- ژنە بەخودا تۆ راست دەکەی، عەجەب مێشکێکت هەیە! بۆ من لێرە دانیشمو دەردەسەری بگرم؟ خۆیەتی: ئەوان گەنجنو گەنجێتی وەکو ئارەقەی توند زوو سارد دەبێتەوە. گەنجێتی نەخۆشییێکە نامێنێ، منیش کاتێ گەنج بووم، جۆشم دەهێناو لەسەر تەختەوە خۆم هەڵگێڕو وەرگێر دەکرد، وام بیرکردەوە بەدوای خودادا دەگەڕێم، بەلاّم لە واقیع دا وانەبوو بەڵکو بەدوای ژنێ دا دەگەڕێم، بەدوای تۆ سالومە! ژنم هێناو ئارام بوومەوە، کوڕەکانی منیش هەمان کاردەکەن، لەبەر ئەمە هەر بیری لێ مەکەمەوە، من ئێستا قانیع بووم، ژنە کەمێ مەززەو شەرابم بۆ بهێنە، سالومەی ئازیز دەمەوێ بەسەلامەتی تۆی نۆش بکەم. لە هاوسێتی ئەواندا یونسی پیر تەنهاو تەنها لە کوختەکەی دانیشتبوو لە ژێر روناهی چرادا، تۆڕەکانی خۆی چاك دەکردەوە، ئەو تۆڕی چاك دەکردەوە، بەلاّم بیرو هۆشی لای ژنەکەی نەبوو، کە ساڵی پێشتر لە هەمان ئەو ئەو وەختە کۆچی دوایی کردبوو، یا لای کوڕی نیوە شێتەکەی ئەندریاس، یا کوڕەکەی دیکەی پەترۆس، ئەو کەللەکەرە کە مەیخانەکانی ناصیرەی خستبووە ژێر پێیەکانی، پیرە باوکی خۆی سپاردبووە ئەمانەتی خوداوە تا هەر خۆی تەنها لەگەڵ ماسییەکانیدا دەستو پەنجە نەرم کات، نەخێر، ئەو بیری لە وشەکانی زوبەدی دەکردەوە لە ژێر هاواری شەڵەژان کاری دەکرد، رەنگە لە واقیعدا ئەو یونس پێغەمبەر بێ، سەیری دەستو پێو رانەکانی خۆی کرد، هەمووی پڕ لە پولەکەی ماسی بوو، هەتا هەناسەو ئارەقەی لەشیشی بۆنی ماسی لێدەهات، ئێستاش وەبیری هاتەوە کە دوێنێ لە کاتێکا بەیادی ژنەکەی دەگریا گریانەکەشی بۆنی ماسی دەدا، زوبەدی پیری فێڵباز لە بارەی قرژاڵەکان راستی دەگوت: جارو ناجار لە ناو ردێنییدا یەکێك هەڵدەبەزیەوە، رەنگە یونس پێغەمبەربێ، ئاخ لەبەر هەندێ بوو کە دڵو دەماغی قسەکردنی نەبوو، دەبوایە بە مەقاش قسەی لە دەمی دەربهێنین، هەمیشە لە کاتی رۆیشتن بەسەر زەوی وشکدا پێی دەخزیو ساتمەی دەکرد، بەلاّم کاتێ کە خۆی دەهاوێشتە دەریاچەوە چ کەیفێکی دەبوو، چەند هەستی بە ئارامی دەکرد! ئاوی بەرز

دەکردەوە سەر سینەی و دەیلاواندەوەو دەیلستەوە، لە گوێکانیدا غەلغەلەی دەکردو لە گەڵیا قسەی دەکردو ئەویش هەروەك ماسی بە بێ قسە وەڵامی ئاوی دەدایەوە بلقەبلقی لەدەم دەهاتە دەرەوە..

لەبەرخۆیا گوتی: ((بەبێ گومان من یونس پێغەمبەرم، دووبارە زیندوو بوومەتەوە، ماسی سەر لە نوێ منی رشاندۆتەوە، بەڵام ئەمجارە کەمێ ئەقڵ لە کەللەم دا هەیە، پێغەمبەرایەتیەکەم لە شوێنی خۆی، بەڵام واخۆم دەنوێنم کە ماسیگرم، شتێ بەکەسێك نالێم، حەزم لێ نییە سەر لە نوێ خۆم باوێمە ناو دەردەسەریەکانەوە)) خاتری ئەو هوشیارە بزەییێکی لە رازی بوون بەسەر لێوەکانیا نەخشی بەستا، لەبەر خۆ کەوتە ئەندێشەوە: ((چەند قشت هاتوومەتە بەر کارەوە.. تەماشاکە ئێستا چەند ساڵە کە هیچ کەس هەتا خۆشم، بۆنی ئەو بابەتەم نەکردووە، تا ئەوەی کە ئەو زوبەدیە ناجسنە پەی بە کاری من برد، بەهەر جۆرێ بێ مەمنونم چاوی منی کردەوە)).

کەل وپەلی لە ناو ژووری کوختەکەیدا بەر هەڵاکرد، بەرازی بوونەوە دەستی لێکخشاند، دۆلاّبچەییێکی کردەوە گۆزەی شەرابی هێنایە دەرەوە، گەرووی چۆکەو پولەکەیی خۆشی تەڕ کرد، لە حاڵێکا قاقا پێدەکەنیو دەستی کرد بە نۆشین. لە کاتێکا دوو پیرەمێرد بەڕازەمەندییەوە لە (کفرناحوم) شەرابیان دەنۆشی، کوڕی مێرێ بە درێژایی کەناری دەریاچە غەرقی ئەندێشە بوو بوو سەفەری دەکرد، تەنهای تەنها نەبوو، لە پشتی سەری خۆیەوە لەناو حەوشەی مەجدەلیە دەنگی وێککەوتنی بەردەچەگڵی دەبیست، بازرگانەکان تازە لە کەشتی خۆیان دابەزینو بەسەر تاوێرە بەردەکانەوە دانیشتوون، ئەوان بە ئارامی قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد، لە کاتێکدا کە چاوەڕوانی نۆرەی خۆیان بوون، خورماو قرژاڵی سوورکراوەیان دەخوارد، لەدێردا رەبەنەکان عابیدیان لە ناوەندی ژوور خەواندبوو، شەوخونیاندەکرد،

عابید هێشتا هەناسەی هەڵدەکێشا، چاوانی کەوتووی بڕی بووە دەرگاوە، رووخساری لەڕو لاوازی شپرزەبوو، وەك بڵێی هەولیدەدا شتێکی گوێ لێ بێ.

ڕەبەنەکان سەیریان دەکردو لە میانی خۆیان پسەپسیان بوو.



-هەولێدەدا ببیستێ کە ئایا خاخام لە ناصیرەوە نەگەیشتووە تا چارەسەری بکات.

-هەوڵدەدا ببیستێ کە ئایا باڵە رەشەکانی عیزرائیل نزیك ناکەوێتەوە.

-هەوڵدەدا گوێی لە دەنگی پێیەکانی کریست بێت

ئەوان زەمزەیان دەکردو سەیری ئەویان دەکرد، رۆحی هەموو یەکێ لەو کاتەی شەودا ئامادەبوو تا پێیەکانی پەرجو بە ئازیزی راگرێ، گوێکانی خۆیان تیژ کردبوو، بەڵام جگە لە دەنگی لێدانی سەنگینی چەکوش بەسەر بزمارەوە هیچ دەنگێکی دیکەیان نەدەبیست، لە گۆشەییێکی دووری حەوشەوە، یەهودا ئاگری رۆشن دەکردەوەو هاوکات دەگەڵ شەودا کاری دەکرد.

## بەشی دەیەم

لە گۆشەییێکی دوور هەڵکەوتەی ناصیرەدا، مێریۆی ژنی یوسف، لە کوختەی چووکەڵەی خۆیدا دانیشتبوو، چرا رۆشن بوو، دەرگاش کراوەبوو، ئەو خوریەی کە رسترا بوو، هەڵیکردەوە سەر تەشی، بڕیاری دابوو کە بۆ گەڕانو سووڕان بەدوای کوڕەکەیدا گوندەکە تەی بکات، خوری دەڕست، بەلاّم ئاگای لە خۆ نەبوو، زەینی بێکەسو بێئومێدی بەسەر مەزراکاندا رادەبرد، مەجدەلو کفرناحومی دەپشکنی، بەدەوری دەریاچەی گنسارتدا دەگەڕاو دەسووڕا، ئەو دووبارە رایکردبوو، جارێکی دی خوداوەند نەقیزەی تێژەنی بوو، مێریۆ لە خۆی پرسی ((ئایا خودا رەحم بەو ناکات؟ ئایا خودا رەحم بەمن ناکات مەگەر ئێمە کوفرانی نیعمەتمان کردوە؟ ئایا ئەو شادیو عیززەتەی کە خودا وادەی بە ئێمە دەدا ئەوەبوو؟ ئەی پەروەردگار بۆ واتکرد گۆپاڵی یوسف بپشکوێو ناچارت کردم کە لەگەڵ پیرەمێردێ زەماوەند بکەم؟ بۆچی هەورەتریشقەی خۆت دابەزاندو ئەم کوڕە خەوناویەت لە ناو رەحمی من دانا؟ لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە سکم پڕ بوو، هاوسێکان دەهاتنو رێزیان لێدەنام، دەیانگوت: ((مێریۆ خوداوەند لەناو هەموو ژنانی دونیا تاجی کەرامەتی بەتۆ بەخشیوە)).

من پشکوتم، درەختی بادام بوومو شکۆفەباران بووم، رێبوارە بازرگانەکان دەیانپرسی: ((ئەو بادامە پڕ شکۆفەیە کێیە؟))و کاروانی خۆیان رادەگرتو لە وشترەکان دادەبەزینو کۆشیان پڕ لە دیاری دەکردم، بەلاّم لە پڕێکا بایێ هەڵیکردو بێ گەلاّو بەرهەم مامەوە، بازووەکانم بەسەر مەمکە وشکەوەبووەکانمدا شۆڕ کردەوە، پەروەردگار خواستی تۆ هاتەدی: تۆ ناچارت کردم کە بپشکوێم، تۆ وەك باهەڵت کردو گەلاّی گوڵەکان هەڵوەرین، خوداوەند ئایا دووبارە ئومێدی پشکوتنم هەیە؟

کوڕەکەشی سبەینەی رۆژی دوایی لە خۆی پرسی ((ئایا ئومیدی ئەوە هەیە دڵم دووبارە ئارام بگرێتەوە؟)) ئەو بەدەوری دەریاچەدا سووڕابۆوە، ئێستا دێرێکی لە میانی تاوێرە بەردی رەنگ سووردا لە بەرابەری خۆیا دیت، ((بە هەمان شێوە کە بۆ پێشەوە دەڕۆمو لە دێر بەنزیك دەکەومەوە، دڵم توندترو توندتر دەبێ بۆ؟ ئەی خوداوەند نەکا رێگەی راستم نەگرتبێتەبەر؟ مەگەر ئەوە نییە من بۆلای گۆشەگیرگای پیرۆز رادەکێشی؟ کەواتە بۆ ریێ لە پێشدەستیمو شادکردنی دڵم دەگریت؟))

دوو رەبەنی سپیپۆش لە کەنار دەرگای گەورە بەدیارکەوتن، چوونە سەر تاوێرەبەردێو چاویان بڕیە لای کفرناحوم، یەکێ لەوان کە قەمبورێکی نیوە شێت بوو، گوتی: ((هێشتا هیچ نیشانەیێ بەرچاو ناکەوێ)).

ئەویتر کە سەرو پۆتەلاّکێکی فیلئاسای هەبوو دەمی کۆسەئاسای دەگەیشتە بناگوێی گوتی: ((تا گەیشتنی ئەوان، رەحمەتی دەنارد-گیروبوم- تۆ بڕۆ، تا بەدیارکەوتنی سەرو کەللەی وشتر، من لە هەمان جێدا پاس دەکەم)).

قەمبورەکە شادومان بوو، لە کاتێکا بەسەر بەردەکەوە هەڵدەخزیە خوارەوەو گوتی: ((زۆرباشە من دەڕۆمو تەماشای دەکەم تا دەمرێ)) کوڕی مێریۆ بە دوو دڵیەوە لە ئاستانەی دێردا وەستابوو، دڵیشی وەك ناقوسێ لە لەرینو جولە دابوو، بچێتە ژوورەوە یا نەچێتە ژوورەوە؟ دیمەنی دێرەکە خڕ بوو بەردڕێژ کرابوو، هەتا تاکە درەختێکی سەوزو گوڵێ یا پەرەندەیێ حەوشەکەی نەڕازاندبۆوە.

تەنها هەرمێی دڕکاوی کێوی دەورانەدەوری جوان کردبوو، لە دەوروبەری ئەو گۆشەگیرگایە خڕو بێ سۆزەدا، بەرد دانرابوو، ناو بەردەکان وەکو گۆڕ هەڵکەنرابوون، کوڕی مێریۆ لە خۆی پرسی: ((ئایا مەلەکوتی ئاسمان ئەوەیە؟ ئایا ئەمە شوێنێکە کە تیایا دڵی مرۆڤ هێور دەبێتەوە؟))

سەیری کردو دیسان سەیری کرد، نەیدەتوانی بڕیار بدات کە لە دەروازەدا رەتببێ، دوو سەگی رەشی مێگەڵ لە گۆشەییێکی دەرەوە هەڵەبەزینو دەستیان کرد بە پێوەڕینی، قەمبوری بەلەنگاز لە تازە هاتووەکە ئاگادار بۆوەو بە فیکەیێ سەگەکانی ئارام کردەوە، پاشان گەڕایەوە تا سەراپای بەسەر بکاتەوە، وا دەهاتە بەردیدی کە چاوانی گەنجەکە پڕ لە ئازاربێ، جلی بەری هەژارانە بوو،خوێنی لە پێیەکانی دەهات، سگی بەحاڵی ئەو سووتا.

- بەخێربێی برا کام با تۆی هاوێشتۆتە ئەم بیابانەوە؟

کوڕی مێرێ بە دەنگێکی قووڵو بێئومێد وەلاّمی دایەوە ((خودا))

ڕەبەنەکە ترسا، هیچکات نەیبیستبوو کە ناوی خودا بەم جۆرە وەحشەتەوە لە لێوی کەسێ بێتە دەرەوە، بازووەکانی شۆڕکردەوە هیچی نەگوت.

تازە هاتووەکە، دوای مانەوەییێکی کورت بەردەوام بوو لە قسە:

هاتووم عابید ببینم)).

- دەتوانی ببینی بەلاّم ئەو تۆ نابینێ، چ کارێکت بەو هەیە؟

- نازانم ... خەونم دیوە... لە ناصیرەوە دێم.

ڕاهیبەکە بەنیوە دێوانەییەوە بەخەندەوە گوتی: ((خەون))

- خەونێکی وەحشەتناك، باوکە، لەو زەمانەوە تائێستا دڵم ئارامی بەخۆوەنەبینیوە، عابید پیرۆزە، خوداوەند راڤەکردنی زمانی مەلو خەونی فێری ئەو کردوە، لەبەر هەندێیە کە هاتووم.

کوڕی مێرێ، هیچکاتێ نەهاتبووە زەینی بێتە ئەو دێرەوە تا لێکدانەوەی ئەو خەونەی لە عابید بوێ ،کە لە کاتی دروست کردنی خاچ دیبووی: ئەم تاقیب کردنە ترسناکەی خەونەکەیو بۆ پێشەوە تاودانی ردێن سوور لە پێشەوەو کورتە بالاکان خۆیانو ئامێری ئەشکەنجەدانیان. بەلاّم ئێستاکە لە ئاستانەی دەرگا بە دوو دڵی وەستاوەو لە پڕێکا ئەم خەونە وەك بروسك پەڕیە زەینیەوە، تووشی ترسو تەشەر بوو



((خۆیەتی...لەبەرخاتری خەون هاتووم، خوداوەند ئەو خەونەی ناردوە تا رێگە بەمن نیشانبداتو عابید رازی ئەو خەونە بۆمن ئاشکرا دەکات.

ڕەبەنەکە گوتی: ((عابید لەسەرە مەرگدایە برا تۆ درەنگ هاتی بگەڕێوە)) کوڕی مێرێ وەلاّمی دایەوە ((خودا فەرمانی بەمن داوە کە بێم، ئایا ئەو توانای ئەوەی هەیە گاڵتە بە رۆڵەکانی خۆی بکات؟)) رەبەنەکە قاقا پێکەنی، لە دونیادا هەموو رەنگێکی بینی بوو، چاوانی ئاو لە خوادا ناخواتەوە.

- مەگەر نە ئێستاکە ئەو پەروەردگارە؟ لەبەر ئەمە هەرچییەك کە بیەوێ ئەنجامی دەدا، ئەگەر توانای هەڵپاچینی ستەمی نەبێت چۆن چۆنی دەیتوانی توانادارێکی بەرز بێت؟

ڕەبەنەکە دەستی لە پشتی تازە هاتووەکەداو مەبەستی بوو بیلاوێنێتەوە، بەلاّم پەنجەکانی ئەو سەنگین بوو گەنجەکەی ئازارداو گوتی: ((زۆر باشە نیگەران مەبە بفەرموو وەرە ژوورەوە، من خانەخوێم)) لەگەڵ یەك چوونە حەوشەی دێر، بایێ هەڵێکردوو، چەوی سەر بەردرێژی تێکلول دەدا، پەردەی گەردەلوول هەتاوی لەخۆی دەپێچا، هەوا تاریك دەبوو، لەناوەندی حەوشە بیرێکی وشك دەمی کردبۆوە، جاران پڕ ئاو دەبوو، بەلاّم ئێستا پڕ بووە لە لیم، دوو مارمێلکە دەرپەڕینە دەرەوە، تا لە لێواری وشكو کۆنینەی بیردا خۆیان گرم کەنەوە.

حوجرەکەی عابید کرابۆوە، رەبەنەکە بازووی مێوانی خۆی گرت ((هەر لێرەوە چاوەڕوانبە تا مۆڵەت لە برایان وەردەگرم.. تەکان نەخۆی)).

دەست بەسینەوە چووە ژوورەوە، سەگان لە دوولای ژووری عابید وەرکەوتبوون، ملیان درێژ کردبوو، بۆنیان هەڵدەکێشاو بەخەمەوە واقە واقیان بوو...

عابیدیان بەلای پێیدا لە ناوەندی حوجرەکەوە درێژودرێژ خەواندبوو،لە دەوری ئەودا رەبەنەکان لەچاوەڕوانیدا بوون، خەوەکوتکەیان دەبردەوە، شەوبێداری بێ تاقەتی کردبوون، کابرای لە سەرەمەرگ بەتەبەشی هەڵچوو چاوانی کراوەوە چاوی بڕیبووە رارەوەکە، قەندیلە حەوت لقەکە لە کەنار رووخساریدا بوون سەرهەڵگەڕانێکی

درەوشاوە هەنیەو چاوانی هەرگیز ناتێرو لوتی بازئاساو، لێوانی شینو ڕەنگ پەڕیوو ریشی سپی درێژی کە دەگەیشتە کەمەریو سینەی روتو ئێسقانی ئەوی دادەپۆشی، رەبەنەکان داری تێکەڵ بەگەڵای وشکە گوڵی سووریان بەسەر رەژووی داگیرساودا هەڵرژشتە ناو سۆپاییێکی گڵێن، فەزا تژی عەتر بوو بوو رەبەن هاتە ژوورەوە، هۆی چوونە ژوورەوەی لەبیرکردو لە ئاستانەی دەرگادا لە میانی سەگەکاندا دەستەو ئەژنۆ دانیشت. خۆرەتاو ئێستاکە دەرگای لەبەردەست بوو، هەولیدەدا تا بەچوونە ژوورەوە بەناو دەرگادا پێیەکانی عابید نەوازش بکات، کوڕی مێرێ لەدەرەوە لە چاوەڕوانیدا وەستابوو، دەنگێ جگە لە ناڵەی سەگان لە دوورو زەربەی باڵانسیو لەسەرخۆی چەکۆش بەسەر بزمارەوە هیچی دیکە نەبوو.

میوان هەر چاوەڕوان بوو، رۆژ دەچووە پێشەوە، ئەویان تەواو لەبیرکردبوو، لە شەودا شەونم کەوتبوو، بەڵام ئێستاکە ئەو لە دەرەوەی حوجرە وەستاوە، گەرمای گیانبەخشی خۆرەتاوی سپێدانی هەتا ناو مۆخی ئێسقانی هەست پێدەکرد.لە پڕێکا بیدەنگی بە دەنگی رەبەنێ کە بەسەر بەردەوە خەریکی پاسەوانی بوو شکا((وادێن، وادێن)).

ڕەبەنەکان لەناو حوجرەی عابید راجفرینو بێداربوونەوەو رایانکردە دەرەوەو عابیدیان تاكو تەنها بەجێهێشت، کوڕی مێرێ دڵی خۆی دایەوە دوو هەنگاو چووە پێشەوەو لە ئاستانەی دەرگادا وەستا، لەناو حوجرەکەدا ئارامییو مەرگی جاویدانە بوو، پێی ناسكو ڕەنگ پەڕیوەی عابید لە پرتەوی هەتاودا دەردرەوشایەوە، هەنگێ لە نزیك بنمیچ دا وزە وزی بوو، مەگەزێکی رەشی موووینی بەدەوری قەندیل دەسوورایەوە بەسەماوە لە لقێ بۆ لقێ هەڵدەبەزیەوە، وەك بڵێی لە کاری هەڵبژاردنی خۆڵەمێشدانی ئەودا بوو لەپڕێکا عابید تەکانێکی داخۆ، بە وەبەرخۆهێنانی تەواوی هێزی خۆیەوە، سەری خۆی بڵند کردەوەو بە جارێك چاوانی لە گلێنەدا دەرپەڕیو دەمی کراوە، کونەکانی لوتی هەوایان هەڵمژی، کوڕی مێرێ بەعەلامەتی سەڵاو دەستی نایە سەر دڵیو تویڵی، لێوانی عابید جولان ((تۆ هاتووی... تۆ هاتووی.. تۆ هاتووی)) زەمزەمەکەی ئەوەندە شاراوەبوو کە کوڕی مێرێ گوێی لێ نەبوو، بەڵام



بزەییێك کە گوزارشتی لە سوپاسێك دەکرد وەسف نەدەکرا لە رووخساری زبرو رەنجدیدەی عابید پشکوت، یەکسەر چاوەکانی داخست، پەڕی لوتی بەبێ جولە مانەوە، دەمی داخرا دوو دەستی خاچئاسا بەسەر سینەیەوە قەراری گرتبوو یەکێکیان بەلای راستو ئەویدی بەلای چەپدا خزیو بەسەر زەویەوە ئارامی گرت، لە هەمان ئەم بگرەو بەردەیەدا دوو وشتر لە حەوشەدا چۆکیان دابوو، رەبەنەکان بۆ پێشەوە رایانکرد، تا یارمەتی خاخام بدەن لە دابەزیندا.

بەردەستەکەی عابید بەشێوەییێکی شڵەژانئامێزەوە گوتی: ((ئایا زیندوە.. هێشتا زیندوە؟))

باوکە هەبەکوك وەڵامی دایەوە ((هێشتا هەناسە هەڵدەکێشێ، هەموو شتێ دەبینێو دەبیستێ، بەڵام قسە ناکات)).

سەرەتا خاخام چووە ژوورەوە بەدوای ئەوەوە بەردەستەکەی خۆی وجانتایەکی گرانبەهای کە پڕ بوو لە داوودەرمانو گیادەرمانو رەملو قیبلەنوما، سەگە رەشەکان کە کلیان نابووە ناوگەلۆزیان، هەتا سەریشیان وەرنەسووراند، ملیان بەسەر زەمینەوە درێژ کردبوو، وەك مرۆڤـ بەخەمەوە واقەواقیان بوو.

خاخام گوێی لە دەنگیان بوو سەری خۆی راتەکاند، لەبەر خۆ گوتی: ((زۆر درەنگ گەیشتم))، بەڵام قسەییێکی نەکرد، بەسەر لەشیان لار بۆوەو دەستی لەسەر دڵی دانا بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((زۆر درەنگ گەیشتم.. باوکان خوا عومری درێژ بە ئێوەببەخشێ، رەبەنەکان بەگریانەوە لاربوونەوەو هەریەکە بە پێی خزمەتی خۆیو بە پێی رێوڕەسم جەستەی عابیدیان ماچ کرد: باوکە هەبەکۆك چاویو رەبەنەکانی دیکە قژو دەستیو بەردەستەکانیش پێی، یەکێ لەوانیش گۆچانەکەی عابیدی بەسەر شوێنی خاڵیەوە هەڵگرتو لە کەنار تەرمی پیرۆزدا داینا.

خاخامی پیر چۆکی داو سەیری ئەوی دەکردو نەیدەتوانی چاوی لێ هەڵگرێ، ئەو خەندە پیرۆزمەندە چی بوو؟ ئەو درەوشانەوە رازئاسایەی دەوروبەری چاوانی داخراوی

چ ماناییێکی هەبوو؟ خۆرەتاو، خۆرەتاوی جاویدانی، کەوتە سەر ئەو رووخسارەو لەوێ مایەوە، ئەو خۆرەتاوە چی بوو؟

سەیری دەوروبەری کرد، رەبەنەکان هێشتا، بەسەر چۆکەوە ریزیان لە خوالێخۆشبووەوە دەنا، یۆحەننا لێوی بەپێی عابید نوسابوو دەگریا، خاخامی پیر نیگای لەرەبەنێکەوە دەخزاندە سەر رەبەنێکی دیکە وەك بلێی ئەوان دەخاتە باری پرسیارەوە، لەپڕێکا چاوی بەکوڕی مێریێ کەوت کە لە گۆشەییێکی دواوەی حوجرە بە بێ جولەو ئارام وەستاوەو خاچئاسا دەستی ناوەتە سەر سینەیەوە، بەلاّم رووخساری هەمان بزەی ئارامو پیرۆزمەندانەی گرتبووەخۆ، خاخام بەترسەوە لەگەڵ خۆی کەوتە زەمزمە ((ئەی یەهوی سەبایوت ئەی ئەدونیا، تۆ هیچ کات لە بەوەسوەسەکردنی دڵم ناوەستی ئێستا یارای زەینمدە تا تێبگەمو بڕیاربدەم.

رۆژی دوایی خۆرەتاو تووڕەو خوێناوی، کەتۆفانێکی رەش دەورانەدەوری گرتبوو، لە میانی زیجدلێمەوە هەلّدەبەزیە دەرەوە، باییێکی ئاگراوی لەرۆژهەلاّتەوە لە بیابانەدا هەڵسا، دونیا تاریك بوو، هەر دوو سەگی رەشی دێر هەولّیاندا بوەڕن، بەلاّم دەمیان پڕ لە چەو بوو بێدەنگ بوون، وشترە بەزەوی نووساوەکان،چاوانیان داخستو لە چاوەڕوانیدا مانەوە.

ڕەبەنەکان کە بەیەکتر زنجیر بووبون، هێدی هێدیو وڕ بۆ پێشەوە دەڕۆیشتنو هەولّیان دەدا بەرنەبنەوە سەر زەوی، لە کاتێکدا بەیەکەوە بە قەرەپەستێوە تەرمی عابیدیان توند گرتبوو، نەوەکا با لە دەستیان بڕفێنێ بۆ پێشەوە دەچوون تا بەخاکی بسپێرن.

بیابان لە شەپۆلدا بوو، وەکو دەریا سەر هەلّدەگەڕاو دەکەوتە خوارەوە. یۆحەننا لە کاتێکدا پشتی بە دیواردابوو بەزەمزمەکردنەوە گوتی: ((بای بیابانە، هەناسەی یەهوە، هەموو گەلاّییێکی سەوز سیس دەکات، هەموو سەرچاوەیێ وشك دەکات، دەمی مرۆڤ پڕ لە لیم دەکا.. ئێمە تەنها تەرمی پیرۆز لە چالّ دەنێینو شەپۆلّی چەو دایدەپۆشێ.



ئەو ساتەی کە ئەوان بە ئاستانەی دێردا رەت دەبوون، ئاسنگەرێکی ردێن سوور خۆیو چەکوشی سەرشانی، لەمیانی لافاوی لیمدا، رەشو زەبەللاح هەلّسایەوە سەرپێ بۆساتێ سەیری کردن، بەلاّم یەکسەر لەنێو زیخو لمدا ونبوو، کوڕی زوبەدی، ئەوناشوناسەی لەمیانی لافاودابینی، بەترسەوە خۆی بەبازووی هاوڕێکەی وەنووساند بەئارامی پرسی ((کێ بوو؟ ئەوت نەبینی؟)) کوڕی مێریێ وەلاّمی نەدایەوەو کەوتە ئەندێشەوە ((خوا هەموو شتێ رێکدەخات، دروست بەهەمان شێوە کە خۆی دەیەوێ ،سەیرکە چۆن چۆنی منو یەهودای لێرە پێك گەیاندووە، کە شوێنێکە زەوی کۆتایی لێوە دێت، ئەی خوداوەند لەم حالّەتەدا لێگەڕێ خواستی تۆ بێتەدی)) .

ئەوان، بۆ پێشەوە لاربوونەوە، بۆ پێش دەچوون وپێیەکانیان لە چەوی سوتێنەر دا دەبردە خوارەوە ،هەولّیان دەدا کەدەمو لوتیان بە جلی بەریان بگرن، بەلاّم لیمی نەرم پێشتر جێی خۆی لە گەرویانا گرتبوو ... لە پڕێکا با رێشمەی لە دەست باوکە هەبەکوکی فڕاند، ئەوی هەلّخزاندو بەزەویدادا، رەبەنەکان کە خۆلّی چڕ نابینای کردبوون، بەسەریا رەتبوون بیابان فیکەی بوو، بەردەکان جرینگە جرینگیان بوو، هەبەکۆکی پیر هاوارێکی زبری سەردا، بەلاّم کەس گویی لە دەنگی نەبوو، کوڕی مێریێ لەبەرخۆ گوتی ((بۆ نابێ هەناسەی یەهوە شنەیێکی فێنك بێ لە دەریای گەورەوە بۆ ئێمە بێ، دەیویست ئەم پرسیارە لە هاوڕێکەی بپرسێ، بەلاّم دەمی نەکردەوە ((بۆ نابێ بای یەهوە بیرە وشکەکان پڕ ئاو بکات؟)).

ئایا ئەمەیان دوورە لە قودرەتی یەهوە کە گەلاّی سەوزی خۆش بویو میهرەبان بێ بۆ خەلّك؟

ئاخ ئەگەر نەفەری تەنها یەك نەفەر دەبوو سۆراغی بکاو بیتوانیایە لێی نزیك بێتەوەو بکەوێتە سەرپێیەکانی، بەرلەوەی ببێتەوە خۆلەمێش باسی ئازاری مرۆڤو ئازاری خاكو گەلاّی سەوزی کردبا؟)) یەهودا هێشتا لە رارەوی حوجرەییێکی تاریکدا وەستا بوو کە رەبەنەکان بەناوی کارگەوە لەبەردەستیان دانابوو، لەکاتێکدا لەبەر زۆرپێکەنین شەقی دەبرد، رێ وڕەسمی بە خاك سپاردنی سەیر دەکرد، خلیسکی دەبردو بە هەوا دەکەوت، بۆ ساتێ ون بوو، ساتێکی دیکە بەدیارکەوتەوە، ئەوکەسەی بینی

بوو کە بەدوایەوە بوو چاوە رەشەکانی لە خۆشیاندا بریقەی دەدایەوە ،کەوتە زەمرەمەوە ((خودای سراییل گەورەیە، چەند چاك هەموو شتێ رێکدەخات ،خائینەکەی دوورست لە ژێر خەنجەرەکەمەوە داناوە، ((لەکاتێکا لە خۆشحاڵیان سمێڵی بادەدا ،چووە ژوورەوە ،حوجرە تاریك بوو، بەلاّم لەناو ئاگردانێکی بچووك لەسوچێکدا، رەژووی داگیرساوو توند لە حاڵی داگیرساندا بوو ،ڕەبەنی قەمبوری نیوە شێت ونیوە عاقل ئاگردانی خۆش دەکرد . ئاسنگەر کەیفی خۆش بوو، گوتی ( ئاهای باوکە یەربوکامو ئەوە هەمان بایە کە پێ ی دەڵێی بای خودا من خۆشم دەوێ، زۆر خۆشم دەوێ، ئەگەر لە جێ ی خودادا بوام بە هەمان جۆر هەڵم دەکرد)).

ڕەبەنەکە بەخەندەوە گوتی: ((من بام هەر هەڵم نەدەکرد بێ تاقەت بووم، دەستی لە خۆشکردنی ئاگر کێشایەوە تا ئارەقەی توێڵو ملی بسڕێتەوە. یەهودا لێی نزیك کەوتەوە پرسی ((باوکە یەربوکام، لوتفێکی پێ دەکەی؟ دوێنی گەنجێ بە ردێنێکی کورتو رەش بەناوی مێوان هاتە ناو دێرەوە، نیوشێتێ وەکو خۆت جەناب عالی، پێلاّوی لەپێ نەبوو، دەسماڵێکی بەخاڵی سوور سوورەوە بەسەرەوە بوو))

ڕەبەنەکە باییێکی بە غەبابەی داکردو گوتی: ((من یەکەمین کەس بوم کە ئەوم بینی، بەلاّم گەوجێکی تەواوە دروست وەکو ئەوانی دیکەی دێنە ئێرەوە، دەڵێت لەناصیرەوە هاتووم خەونێکم دیوە، تا عابید ببینێ- دلڤانی خوای بەرکەوێ- تا رازی ئەو خەونەی بۆ بکاتەوە)).

-باشە گوێ بگرە، ئەگەر هەڵەم نەکردبێ جەناب عالی میواندری دەکەی، هەرکاتێ کەسێ دێت، مەگەر ئێوە نین کە حوجرەی دەخەنە بەردەستو خواردنو خۆراکی پێدەدەن..؟

لەم بارەوە گومانت نەبێ، وادێتە بەرچاو کارێکی دیکە بە من ناکرێ، بۆیە منیان کردۆتە خانەخوێ، دەشۆمو گەسك لێدەدەمو خواردن دەدەم بەمیوانان.

-زۆرجار چاکە ئەمشەو جێگەی لەژووری من بۆ راخە، من ناتوانم بە تەنها بخەوم، (یەربوکام) چۆن دەتوانم بۆت روون کەمەوە؟ من کابووسم هەیە، هەرماس دێتە



سۆراغمو تووشی وەسوەسەم دەکات، دەترسم گرفتاری عەزابی دۆزەخ بم، بەلاّم هەرکە هەناسەی ئادەمیزادێ لە تەکمەوە هەست پێدەکەم، ئارام دەبمەوە، ئەو کارە بکە، دیاریەکت پێدەبەخشم، مقەستێکی موچنینت دەدەمێ تا ردێنت پێ چاکەیت، دەتوانی ردێنی رەبەنانیش چاك بکەیو پەشمی وشترانیش هەڵپاچی، ئیدی کەس تۆ بەبێ دەسەلاّت ناداتە قەڵەم، باشە گوێت لەمنە؟

-دەی مقەستەکەم بدێ.

ئاسنگەر ناو جانتای گەڕاو مقەستێکی گەورەی ژەنگاوی هێنایە دەرەوە، رەبەنەکە لەدەستی فراندو نایە بەر رووناهی، کردیەوەو دایخست، (شاگەشکە ببوو) غەرقی سەرسامی بوو، بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((خوداوەندا تۆ گەورەیتو کارەکانت سەرسام ئەنگێزە)) یەهودا لە کاتێکا ئەوی بەزبریەوە رادەتەکاند تابێتەوە خۆیو گوتی: ((باشە چی دەڵێی؟))

ڕەبەن وەلاّمی دایەوە: ((ئەمشەو لەحوجرەی تۆ دەبێ)) بەمقەست لە دەستیەوە چووە دەرەوە.

ئەوان ئیدی گەڕابوونەوە، نەیانتوانی بوو زۆر دوور بڕۆن، چوونکە بای یەهوە ئەوانی راپێچ دابوو بەزەمینی دادابوون،قۆڵتێکیان دۆزیبۆوە، تەرمەکەیان هاوێشتبووە ناو قۆڵتێکەوە باوکە هەبەکۆکیان بۆ خوێندنی نوێژی مردوان بانگ کردبوو بەلاّم ئەویان نەدۆزیبۆوە، خاخامی پیری ناصیرە بەسەر لێواری قۆڵتەکەوە لار بوو بۆوەو بانگێکی بەرزی بۆ جەستەی خاڵو بێ روحی ئەوا کرد: ((تۆ خاکیو دەگەڕێیتەوە خاك، رۆح لە دەروونی تۆدا هەڵفڕیوە، ئیدی پێویستی بە تۆ نییە، وەزیفەی خوات ئەنجامدا، ئەی لەش تۆ وەزیفەت بەئەنجام گەیاند، یارای رۆحت کرد تا دابەزێتە خاکدانی غوربەتەوە چەند سپێدەیەك بەسەر بەردو چەودا رێ بکات، گوناە بکات هەست بە ئازار بکات، بۆ بەهەشت، سەر زەمینی باوکی، بۆ خودا، باوکی، بێ سەبرو بێقەراری بکات، ئەی لەش، عابید ئیدی پێویستی بەتۆنییە: لەگەڵ خاك ببە بەیەك)) هەمان کات کە خاخام قسەی دەکرد، کاتێ لیمی نەرم تەرمی عابیدی داپۆشی بوو، رووخسارو ریشو

دەستەکان کەوتبوونە ژێر تۆزو خاکەوە، گەردەلوولی لیم بەرزبۆوەو رەبەنەکان بەپەلە پاشەکشەیان کرد.

لەهەمان دەمدا کە خانەخۆیی نیوەشێت، مقەستەکەی قەپاندو ئاسنگەری جێ هێشت، رەبەنە نابینابووەکان، بەلێوی قاش قاشو ژێرهنگڵی ورشاوەوە پەنای ناو دێر بون، هەبەکۆکی پیریان لەرێگەی گەرانەوەدا لە کاتێکا نیوەی لەشی داپۆشرابوو، لەگەڵ خۆدا هێنابۆوە. خاخامی پیر چاوانو دەمو ملی خۆی بە پارچەیەکی تەڕ پاك کردەوە بەسەر زەویو لەبەردەم شوێنی خاڵی عابیدا دەستەوئەژنۆ دانیشت، لەکلاۆرۆژنەی دەرگای کلوم دراودا دەیتوانی دەنگی هەناسەکانی یەهوە کە دونیای تاواندبۆوەو نەیهێشتبوو ببیستیٚ، پەیامبەران بەکۆڕەو لەپانتایی زەینیدا لە پەرستاگاییێکەوە بۆ پەرستاگاییێکی دیکە دەڕۆیشتن، لە هەوای ئاگراوی دابوو کە بانگی خودایان دەکرد، بەنزیك کەوتنەوەی (یەهوەی سەباویوت) دەبیٚ سووتانی لێوو چاوی ئاوەهایان هەست پێکرابایە! بەزەمزەمەوە گوتی: ((هەڵبەتە! خوداوەند بایێکی قامچی ژەنەو جیلوەی هەورەتریشقەیە ئەوە دەزانم، ئەو یاخێکی غەرقی شکۆفە نییە، دڵی مرۆڤ گەلاێیکی سەوزە: خودا لقی ئەو لولدەداو پەژموردەی دەکات. چی لە دەست ئێمە دێت؟ لە رەفتاری ئێمەوە سەبارەت بەوەوە چ هونەریٚ لەدەست ئێمە دێت تا بەیانکردنی ئاسایی بیٚ؟

ئەگەر بەرخی قوربانی پێشکەش بەو بکەین هاوار دەکات ((ئەوانم ناوێت، گۆشتم ناویٚ، تەنها مەزامیر دەتوانی برسیەتیم بڕەوێنێتەوە)) ئەگەر دەممان بۆ خوێندنەوەی مەزامیرەکان بکرێتەوە، هاوار دەکات " من وشەم ناویٚ، شتیٚ جگە لە گۆشتی بەرخ، گۆشتی کوڕ، تەنها گۆشتی کوڕ دەتوانیٚ برسیەتیم بڕەوێنێتەوە)).

خاخامی پیر ئاخێکی هەڵکێشا لە بارەی خوداوە کەوتە ئەندێشەوە، ئەوی تووڕەو بێتاقەت کردبوو، بەدوای سوچیٚ دەگەڕا تا رابکشیٚ، رەبەنەکان لەبەر ئەوەی شەو بێداربوون بۆ خەو هیلاك بووبوون، هەریەك رایکردبووە سوچێکی ژوورەکانیان تاسەربە سەرین بکەنو بحەسێنەوەو عابید لەخەو ببینن، رۆحی عابید چل رۆژان لەسەر دێر دەسوورێتەوە، سەر لەیەك یەکی ژوورەکان هەڵدەکێشیٚ، تا کاری رەبەنەکانی خۆی



بخاتە ژێر چاویەوەو رێنماییان بکات، جار جارەش سەرزەنشتیان بکات، لەبەر ئەمە ئەوان پاڵیان داوە تا بحەسێنەوەو عابیدیش لەخەوندا ببینن، خاخامی پیر گەڕایەوەو سەیری دەوروبەری خۆی کرد کەسێکی نەبینی، لەژوورەکەدا جگە لە دوو سەگی رەش کەسێکی دیکە نەبوو، ئەو سەگانەی کە هاتبوونە ژوورەوەو بەسەر بەردڕێژەوە وەرکەتبوون، خەمبارانە شوێنە خاڵیەکەی عابیدیان بۆن دەکرد، بایێکی تووڕە لەدەرگای دەدا، ئەویش گەرەکی بوو بێتە ژوورەوە، بەلاٚم لە کاتیٚ کە خاخام لە کەنار سەگەکانەوە ئامادەی راکشان بوو، چاوی بە کوڕی مێریٚ کەوت کە بەبیٚ جوولە لە سوچێکەوە وەستاوەو سەیری ئەو دەکات، یەکسەر خەو لە پێلوە خەواڵوەکانیەوە رەویەوە، بەپەرێشانیەوە هەڵسایەوە بە هێمای سەر داوای لە برازاکەی کرد نزیك بێتەوە، وا بەدیار دەکەوت گەنجەکە لە چاوەڕوانی بانگ کردنیەوە وەستابیٚ، بەخەندییێکی تەڵخەوە بەسەر لێوەکانیەوە نزیك کەوتەوە، خاخام گوتی: ((کریست دانیشە دەمەویٚ قسەت لەگەڵدا بکەم))

گەنجەکە وەلاٚمی دایەوە ((سەراپام گوێیە، لە بەرابەریا چۆکیدا ((مامە شەمعون منیش دەمەویٚ لەگەڵ تۆدا قسە بکەم))

-لێرە بەدوای چییەوەی؟ دایکت بەدوای تۆدا هەموو گوندەکان دەگەڕیٚو دەسووریٚو شیوەن دەکات.

-ئەوە بەدوای مندا دەگەڕیٚ، من بەدوای خودادا دەگەڕێم، ئێمە قەت یەکتر نابینینەوە.

-تۆ دلڕەقی، هیچ کاتیٚ بەوجۆرەی کە شایستەی مرۆڤە باوكو دایکت خۆش نەویستووە.

-باشتریش، دڵی من چ پشکۆییێکی سووتێنەرە، هەرکەس نزیك بێتەوە دەیسووتێنیٚ،

خاخام لە کاتێکا سەری هێنابووە پێش تا سەیری کوڕی مێریٚ بکات، گوتی: ((چیت بەسەر هاتووە، بەمجۆرە قسە دەکەی؟ لەچیت کەمە؟))

چاوانی گەنجەکە ئەشکالود بوو ((کوڕم، دەردێکی پەنها کەوتۆتە گیانتەوە. دانیپیابنێو خۆت بحەسێنەوە، ئازارێکی پەنهان لەناخی.)).

گەنجەکە قسەی ئەوی بڕی ((یەك ئازار؟)) خەندەیێکی تەڵخ سەراسەری رووخساری راگرت ((نەیەك ...زۆر!)) دەنگی دڵ وڕوشێنەری ئەم هاوارە، خاخامی ترساند، دەستی دانایە سەر چۆکی گەنجەکەو دڵی دایەوە، بەنەرمی گوتی: ((کوڕم من گوێ دەگرم، ئازارەکانی خۆت هەڵڕێژە، لە دڵی خۆتا دەریانبهێنە، تاریکی پەرورەشگای ئەو ئازارانەیە، بەلاّم رۆشنایی بەلاّی گیانیانە، شەرمنو هەراسان مەبە قسە بکە))

بەلاّم کوڕی مێرێ نەیدەزانی چۆن دەست پێبکاتو چی بڵێ ((چ شتی لە دڵیا بهێڵێتەوەو دان بەچ شتێ بنێ تا ئارام بێتەوە، مەجدەلیە، حەوت گوناهی گەورە، خاچو لەخاچدراو، هەمووی بەناخدا رادەبردن، برینەکانی دەروونی ئەویان دەکولاندەوە، خاخام بە بە هاوارێکی خامۆشی روانینەوە سەیری ئەوی دەکردو ئەژنۆی ئەوی دەلاواندەوە، عاقیبەت بەدەنگێکی وردو نەرم گوتی: ((کوڕم ناتوانی..؟))

-نا مامە شەمعون ..ناتوانم

خاخام بەدەنگێ کە ئێستا ئارامترو نەرمتر بوو پرسی ((نەکا وەسوەسەیێکی زۆر دەورەی دابی؟

گەنجەکە بەترسەوە وەلاّمی دایەوە ((زۆر،زۆر))

خاخام بەهەڵکێشانی ئاخێك گوتی: (کوڕم منیش کاتێ گەنج بووم زۆرم ئازار دەکێشا، خودا ئەشکەنجەی دەدامو تاقی دەکردمەوە، دروست بە هەمان شێوە کە .. ئاگای لەتۆیە، دەیخوازی بۆ ماوەیەك ماوەو پلەی بەرگەگرتنی من ببینێ، منیش وەسوەسەی زۆرم هەبوو، هەندێ لە وەسوەسەکان، ئەوانەی کە شێوەیێکی ترسی هەبوو، منیان نەدەترساند، بەلاّم لەوەسوەسەکانی ئەهلی پڕ لەنازو نەوازش دەترسام، وەك چۆن کە دەیزانی، هاتمە ئەم دێرەوە تا ئارامی بدۆزمەوە، ئەو کارەی کە تۆ کردت، بەلاّم خودا لە چاودێری کردنم دەستی نەکێشایەوە لە هەمان جێدا بوو کە چەنگالّی کردم... وەسوەسەیێکی لەشێوەی ژنێکی نارده سۆراغم ئەفسوس کە لەم



وەسوەسەیە توانایيم لەدەست داو بەزیم. لەم کاتەوە تا ئێستا- رەنگە خواستی خوا بووبێ، رەنگە لەبەر هەندێ بێ کە ئەشکەنجەی دەدام، بەڵێ لەم کاتەوە تاوەکو ئێستا ئارامم گرتووەو خوداش، ئێمەی لەگەڵ یەکتر ئاشت کردوەو ئێستاکە دۆستی یەکترین.. بەهەمان شێوە کوڕی خۆم تۆش ئاشتی لەگەڵ خودا بکەو چارەسەرێ دەدۆزیەوە))

کوڕی مێرێ سەری راتەکاندو بەزەمزەمەوە گوتی:((وابزانم بەم سادەگیەوە چارەسەری نادۆزمەوە)) بێدەنگ مایەوەو خاخام هیچی نەگوت: هەردووکیان بە توندی هەناسەیان هەڵکێشا. گەنجەکە لە کاتێکدا لە جێوە هەڵسایەوە، گوتی: ((نازانم لەکوێوە دەست پێبکەم؟ هیچ کات دەست پێناکەم، من زۆر شەرم دەکەم!))

بەلاّم خاخام بازووی گەنجەکەی بەتوندی گرتو نەیهێشت هەڵسێتەوە بەئەمرکردنەوە گوتی: قیت مەبەوە، نەڕۆی، شەرمیش وەسوەسەییێکە بەسەریدا زالّ بە، بوەستە، دەمەوێ چەند پرسیارێ لەتۆ بکەم، من پرسیار دەکەم تۆ بەحەوسەڵەوە وەلاّمیان دەدەیتەوە، بۆ هاتویتە دێرەوە؟

- تا خۆم نەجات بدەم

تا خۆت نەجات بدەی؟ لەدەست چ شتێ؟ لەدەست چ کەسێ؟

- لە دەست خودا

خاخام بە پەرێشانیەوە پرسی- لەدەست خودا؟

- ئەو هەمیشە بەدوامەوە بووە، پەنجەکانی خۆی لەسەرم، لە دڵم، لە دەروونم بردۆتە خوارەوە.. هەوڵدەدا پالّم پێوەبنێ...

- بۆ کوێ؟

- بۆ تەلان

- کام تەلان

- تەلانی خۆی، پێم دەڵێ کە راپەڕمو بڵێم، بەڵام ئایا من دەتوانم چی بڵێم؟ هاوارم کردە سەری ((بەحاڵی خۆم لێمگەڕێ هیچم نییە بۆ وتن))، بەڵام سەرپێچی کرد پێمگوت ((ئاها.... سەرپێچی دەکەی؟ زۆر چاکە منیش نیشانت دەدەم، کارێ دەکەم کە لە من بێزار بیت، ئەو کاتە وازم لێدێنی)). لەبەر ئەمە کەوتومەتە ناو گەرداوی تەواوی گوناهەکانەوە.

- خاخام هاواری کرد ((گەرداوی تەواوی گوناهەکانی کە دەکرێ.........؟

بەڵام کوڕە گەنجەکە نەیبیست، تووڕەیی‌و ئازار لە دونیاو ئەو شتانەی کە تیایەتی ئەوی بێ خەبەر کردبوو..

- بۆ منی هەڵبژارد؟ ئایا ئەو پەردەی سەر سینەم هەڵناگریت، تا لە رازی دەروونم وەئاگابێتەوە؟ تەواوی مارەکانی دونیا لەوێ بەسەماو کیفە کیفەوە کەپکەیان کرد، تەاوی گوناهەکانو .... بەرزتر لە هەموو... قسە لە گەرووی گیری خوارد، لە گوتن وەستا، ئارەقە لە کونەموی سەریەوە هەڵدەڕژا.

خاخام بە نەرمی پرسی ((و.. بالاٚتر لە هەموو...؟

کریست لە کاتێکدا سەری بڵند کردبۆوە گوتی: ((مەجدەلیە، مەجدەلیە)).

- ڕەنگ لە رووخساری خاخام پەڕی بوو..

- هەمووی خەتای من بوو کە ئەو راکێشرایە نێو ئەم رێگەیەوە، کاتێ کە زیاتر لە منالێکی بچووك نەبووم، چووم بۆ لای، لەززەتی لەش رێنمایی کردم- بەڵێ دانی پیادەنێم، خاخام ئەگەر دەتەوێ وەحشەت وجودت دابگریت، گوێ بگرە، ئەو کاتە رەنگە لەسێ ساڵ زیاترم نەبووم، لەوکاتە کەس لە ماڵ نەدەبوو من بەدزیەوە دەچوومە ئەوێ، دەستی مەجدەلیەم دەگرت، جلیم لەبەر دادەکەند، بەسەر زەویەوە رادەکشاین، لەکاتێکا قاچی رووتمان بەسەریەکەوەدا دەچەسپاند، چەند بەلەززەت بوو، چ گوناهێکی لەززەت بەخش بوو، لەو زەمانەوە بەدوا مەجدەلیە گومڕابوو، ئیدی نەیدەتوانی بەبێ پیاوێك، بەبێ پیاوەکان بژیت.



سەیری خاخامی پیری کرد، بەڵام خاخام سەری لە میانی ئەژنۆکانی نابوو قسەی نەدەکرد، کوڕی مێرێ کە سینەی دەکوتایەوە هاواری کرد ((خەتای منە خەتای منە!)) دوای ساتێ بەردەوام بوو لە قسەو گوتی: ((ئەیکاش هەر ئەوە بوایە، خاخام، لە کاتی منالیەوە تا ئێستا نەتەنها دێوی زینام لە قولاٚیی بوونمدا شاردۆتەوە، بەڵکو دێوی غروریش، هەتا لە کاتێ کە زۆر بچووك بووم بەزەحمەت دەمتوانی رێکەوم، بەسەر دیواردا دەڕۆیشتم بۆ ئەوەی نەکەوم خۆم بەوەوە دەنووساند، هەتا ئەو کاتەش هاوارم دەکرد- ئاخ چ جەسارەتێك بوو.. جەسارەت، خودایە)) خودایە بمکە بەخودا... بمکە بەخودا)) رۆژێکیان هێشوێکی گەورەی ترێم لەدەست بوو ژنێکی قەرەج تێدەپەڕی هاتە لای من، دەستەو ئەژنۆ دانیشت دەستی گرتم گوتی: ((ئەو ترێیە بدە بەمن تا سەیری بەختت کەم)) ترێکەم بەودا لار بۆوەو ناو لەپمی بینی، هاواری کرد ((ئاخ ئاخ خاچ دەبینم... خاچو ئەستێرە)) ئەو کاتە پێکەنی‌و پێداچوو: تۆ دەبیتە پاشای یەهود))و رۆیشت.

بەڵام من باوەڕم بەقسەی ئەو کرد پڕ بووم لە بای غرور، لەو زەمانەوە تا ئێستا مامە شمعون، تەواو دۆڕاوم، تۆ یەکەمین کەسی کە ئاگاداری رازی من دەبیت، تا ئێستا لای هیچ کەس دانم پیانەناوە لەو رۆژەوە بەدوا من هەموو شتێکم لەدەست دا)) بۆ ساتی بێدەنگ ماوە، ئەو کات هاواری کرد: ((من لوسیڤەرم)).

خاخام سەری لەمیانی ئەژنۆکانی خۆی بەرزکردەوەو دەستی لەسەر دەمی گەنجەکە داناو بەئەمرکردنەوە گوتی: ((بێدەنگ بە!))

گەنجەکە بە داگیرسانەوە گوتی: ((نە من بێدەنگ نابم، ئێستا دەستم پێکردوە، بەڵام زۆر درەنگی بەسەردا چووە، من بێدەنگ نابم، من درۆزنێکی مونافیقم، لەسێبەری خۆشم دەترسم، هیچکات راستی ناخەمە سەر زمانم شەهامەتی ئەوەم نییە، کاتێ کەژنێ دەبینم سوور هەڵدەگەڕێمو سەرم لەبەرخۆم دەنێم، بەڵام چاوەکانم تژی دەبن لە هەوەس، هیچکاتێ دەستم بۆ تالاٚنو کوشتن بەرز ناکەمەوە... نەك لەبەر ئەوی کە نامەوێ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە دەترسم، دەمەوێ لەبەرابەر دایکمو یوزباشی‌و خودا سەرپێچی بکەم ...بەڵام دەترسم... بەڵێ دەترسم، ئەگەر سەیری دەروونم کەی ترس

دەبینێ، بەڵێ کەروێشکێکی لەرزیو لە دەروونی داکەوتووە، ترس نەك شتێکی دیکە، باوكو دایكو خودام ترسە)).

خاخام دەستی گەنجەکەی لەدەستی خۆی گرت تا ئارامی کاتەوە، بەلاّم جەستەی کریست لەبەر گڕوگڵپە دەلەرزی، خاخام گوتی:((کوڕم، مەترسە، هەرچەند دێوی دەروونمان زۆرتر بێ بە هەمان ئەندازە شەنسمان دەبێ ئەگەر بیانگۆڕینەوە بەفریشتە، فریشتە ناوێکە کە دەیبەخشینە ئەو دێوانەی تۆبە دەکەن، لەبەر ئەوە باوەڕت هەبێ... وەلێ حەزم لێیە تەنها یەك پرسیارت لێ بکەم کە ئایا تا ئێستا لەگەڵ ژنێ نووستووی؟

گەنجەکە بە ئارامیەوە گوتی: ((نەخێر))

هیچ مەیلێکیشت بۆ ئەم کارە نییە؟

گەنجەکە سوور هەڵگەڕا ((مەیلم هەیە)) ئەو قسەیەی ئەوەندە لەسەر خۆ کرد کە خاخام نەیبیست، بەلاّم یەکسەر راجفری، وەك بڵێی تازە بێدار بوو بۆوەو هاواری کرد ((نەخێر مەیلم نییە.. مەیلم نییە)).

خاخام کە چارەسەرێکی دیکەی بۆ گەنجەکە نەدۆزیبۆوە، گوتی: ((بۆ نە؟)) ئەو بە ئازموون فێر بوو بوو ئەوانەی کە جنۆکە دەستیان لێ دەوەشێنێ، بەجوێنو هاوارو دەست لەسەر دەمەوە بۆ لای ئەو دەهاتنو شکایەتیان هەبوو لەوەی دونیا بۆ ئەوان زۆر بچووکە، هەرکە ژنیان دەهێنا دونیا بۆ ئەوان بچووك نەبوو، دەبوونە خاوەن ماڵو ئارام دەبوونەوە.

گەنجەکە بە ئاوازێکی دڵنیاییەوە گوتی: ((بۆ من بەس نییە، شتێکی گەورەترم گەرەکە، خاخام بەسەرسامیەوە پرسی ((بۆ تۆ بەس نییە؟ کەواتە چیت دەوێ؟ مەجدەلیەی خۆویستو کەفەڵ بەرز لەبەرامبەر زەینی ئەودا رەتبوو، سینەی رووتو قووت بوو، چاوو لێو گۆناکانی شەلاّلی سوورو سپیاو بوو، پێدەکەنیو ددانەکانی لەبەر نووری خۆرەتاو دەبریقانەوە، بەلاّم وەك چۆن کە لەبەرابەریا، دەسوورایەوە، گۆڕا.. زۆر بوو، کوڕی مێرێ ئەوسا دەریاچەیێکی بینی کە لە دەریاچەی گنسارت



دەچوو لە دەوریا هەزاران ژن ومێردو هەزاران مەجدەلیە خۆیانو رووخساری شادیان بەرزبووبوونەوە ئاسمان، خۆرتاو لەوانی دەداو ئەوان دەدرەوشانەوە، بەلاّم نا خۆرەتاو نەبوو، خودی ئەو بوو کریستی ناصری، بەسەرو رووخساری ئەواندا لاربۆوە، تژی شکۆو جیلوەی کردبوون، ئەوە جیلوەی رووخساری خۆشحاڵی بوو، ئارەزوبوو یا رزگاری؟ نەیدەتونی دەست نیشانی بکات، بەلاّم هەرچیەك بووبێ، شکۆو جیلوە بوو...

خاخام پرسی ((بیر لە چی دەکەیتەوە؟ بۆ وەلاّمم نادەیتەوە..؟

پیاوەگەنجەکە، لەناکاو پەڕیە ناو قسەکانی خاخامو پرسی

((مامە شەمعون تۆ باوەڕت بەخەون هەیە؟ من کە خۆم باوەڕم هەیە، باوەڕم بەشتێکی دیکە نییە، شەوێ لە خەونم بینی کە دوژمنانی نادیار منیان لە سەرونیازێکی وشك بەستایەوە، چەند تیرێکی رەنگ سووری درێژ لە تەواوی لەشمدا چوو بووە خوارەوەو خوێن بازرقەی دەکرد. تاجێکی لە دڕکیان لەسەر سەرمەوە دانابوو، لە میانی دڕکەکان چەند وشەیێکی ئاگرین نەخشیان بەستابوو ((کافری پیرۆز)) مامە شمعون من کافری پیرۆزم؟ لەبەر ئەمە باشتر وایە شتێکی دیکە لە من نەپرسی دەنا دەست بە کفرگۆیی دەکەم)).

خاخام لەکاتێکا دووبارەدەستی ئەوی گرتبوو بەئارامی گوتی: ((یاڵلا فەرزەندە دەست پێبکە، کفر گۆییت دەست پێبکەو خۆت رزگار کە.

دێوێ لە دەروونمدایە هاوار دەکات ((تۆ کوڕی نەجاڕنیت، تۆ کوڕی داود شای تۆ مرۆڤ نیت تۆ هەمان- کوڕی مرۆڤ -یت کە دانیاڵ پێشبینی کردبوو، لەوەش زیاتر، تۆ کوڕی خودایت.. لەوەش زیاتر.. خودی خودای !

خاخام گوێی رادەگرت.. لاربۆوەو لەرزە کەوتە جەستەی لەڕولاوازی، لێوی قاش قاشی گەنجەکە ئاڵودەی کەف بوو بوو، زمان بە مەلاّشوی نووسابوو.. نەیدەتوانی ئیدی قسە بکات، دەیتوانی ئیدی چیە بە خودا بڵێ؟ ئەو هەوو شتێکی گوتبوو، هەستی دەکرد دڵی وشك بۆتەوە لە کاتێکا دەستی لە ناو دەستی خاخام دەرهێنا.... هەڵسایەوە،

ئەوکاتە بەرەو لای پیرەمێرد گەڕایەوە بەتەوسەوە پرسی ((پرسیاری دیکەت نییە؟ پیرەمێردکەهەستی کرد تەواوی هێزی ئەو لە لەشی دا هەڵڕژاوەتە سەر زەویەوەو لە ناو چووە، وەڵامی دایەوە: ((نەخێر) بەدرێژایی ژیانی دێویێکی زۆری لە دەمی خەڵکان هێنابووە دەرەوە، ئەوانەی کە جنۆکە دەستی لێ وەشاندبوون لەوپەڕی دونیاوە دەهاتن تا چاکیان بکاتەوە، بەڵام دێوی ئەوان بچووك بوو بەدەست نەدەگیران، دێوی مەرگ، دێوی تووڕەیی، دێوی نەخۆشی .. بەڵام ئێستا چۆن دەیتوانی لەگەڵ دێویێکی وادا دەستو پەنجە نەرم بکات؟

لەدەروەدا بای یەهوە هێشتا لاجانگی دەرگای دەکوتیەوەو هەوڵیدەدا بێتە ژوورەوە، نەچەقەلێ بەسەر زەویەوە بوو، نەقەلێ بە ئاسمانەوە، تەواوی بوونەوەرە زیندوەکان لە ترسان سەری خۆیان لەبن باڵیان بردبووە خوارەوەو لە چاوەڕوانیدا وەرکەوتبوون تا خەشمی خودا بەرز بێتەوە.



## بەشی یازدەم

کوڕی مێرێ پشتی بەدیوارداو چاوەکانی داخست، زەینی وەکو ژەهر تاڵ بوو، خاخام کە جارێکی دیکە سەری نابووە ناو ئەژنۆکانی، غەرقی بیرکردنەوە بوو بوو لە بارەی دۆزەخو دێوو دڵی مرۆڤ... نەخێر دۆزەخ لەگەڵ دێوەکانی لە قوڵایی زەویدا نەبوون، دۆزەخ لەسینەی مرۆڤدایە، لەسینەدایە، لەگەڵ خوداپەرستترینو راستترینی خەڵکان، خودا گەرداوێکی بەهێماکراوە، مرۆڤیش، خاخامی پیر زاتی نەدەکرد دەرگای دڵی بکاتەوە تا ببینێ کەچی لە ناخدا شاردراوەتەوە.

بۆماوەیەك قسەی نەکرد، بێدەنگییێکی قووڵ فەرمانڕەوابوو، هەتا هەردوو سەگە رەشەکەش چوونە خەوەوە، لەپرسەدا ماندووبوون، لەپڕێکا دەنگی کیفەکیفێکی دڵنەواز لە حەوشەدا بەرگوێ کەوت، (یەربوکامی) نیوە دێوانە بوو لە شادیان هەڵدەبەزیەوە، یەکەمین کەسێ بوو کە گوێی لە دەنگەکە بوو بوو، بای یەهوەش لەگەڵ دەنگی کیفەکیفەکە هاوڕێ بوو، رەبەنی دیوانە هەر کاتێ ئەم دەنگەی بەرگوێ کەوتبا، لەخۆشحاڵیان هەڵدەبەزیەوە، خۆرەتاو لە کاری ئاوابووندا بوو، بەڵام تەواوی حەوشەکە هێشتا غەرقی رۆشنایی بوو، رەبەنەکە بەسەر بەردفەرشی نزیك بیرەئاوە وشکەکەوە چاوی بەمارێکی نەخشەدار کەوتبوو، نەخشێکی رەشو زەرد، کەملی بەرز کردەوەو زمانی دەخسە لەرزەوەو دەیکیفاند، (یەربوکام) لەژیانی دا هیچ کاتێ نەواییێکی فریوەدەرتری لەو شمشاڵە نەبیستووە، جارناجار لەرۆژانی هاوین دا ئەو کاتەی کە خەوی بەژنێکەوە دەبینی، واهاتە بەرچاوی وەکو ئەو مارە دەهات کەبەسەر ئەو حەسیرەی ئەو بەسەریا خەوتبوو زمانی لەگوێی دەناو کیفەکیفی بوو....

ئەمشەو جارێکی دی_ یەربوکام_ لەژووری خۆی دەرپەڕی بوو، بە حەپس کردنی هەناسەی لەسینەدا لە مار نزیك بۆوە، مار شمشاڵی لێدەداوو سەیری دەکرد، ئەویش دەستی کرد بە شمشاڵ ژنیو هەستی کرد کە گەرمای وجودی مار بە لەشی ئەودا رەت بوو، ئەو کاتە لەسەر خۆ مارەکانی دیکە لە بیرە ئاوی وشكو یا لە دەوروبەری کاکتوسەکانەوە دەخزینە دەرەوە، یەکێکیان بەکلاوێکی شینو یەکێك بەکلاوی سەوزو دووشاخەو ئەوانی دیکە بەکلاوی زەردو خاڵخاڵو رەش بەخێرایی وەك ئاو بۆ پێشەوە دەخزین، گەیشتنە یەکەمین مارو بەیەکەوە نووسان، خۆیان لە یەکتر هەڵدسووی.. یەکتریان دەلستەوە، هێشوە ترێی لە چەشنی مار لە ناوەندی حەوشەوە هەڵواسرابوو، (یەربوکام) دەمی کردەوە باوێشکی دا، لەبەر خۆ کەوتە ئەندێشەوە ((ئەوەیان پەیوەندی سێکسیە ژنو مێرد بەجۆرە ئاوێزان دەبن، لەبەر هەندێیە کە خودا ئێمەی لە بەهەشت دەرکرد)).

خاخام چەند دەنگێکی فریوبازی بیست، سەری خۆی بەرز کردەوەو گوێی هەڵخستو لەبەر خۆیا گوتی: بای ئاگراوی خودا هەڵدەکا، لە میانی شەڕێکی وادا، مارەکان جووت دەبن... خودا هەناسە هەڵدەکێشیو دەیەوێ دونیا لە مەشخەڵی هەناسەکانی خۆیەوە بکا بە خۆڵەمێش، سەیری مارەکانیش بکە بۆ ئەشقبازی هاتوونەتە دەرەوە، بۆ ساتێ زەینی پیرەمێرد تووشی وەسوەسە بوو بەسەر گەردانی مایەوە. بەلاّم لە پڕێکا لەبەرخۆ لەرزیو کەوتە ئەندێشەوە ((هەموو شتێ لە ئانی خودایە، هەموو شتێ دوو مانای هەیە: یەکیان ئاشکراو ئەویتر پەنهان، خەڵکی رەشۆك تەنها دەرك بەمانا ئاشکراکەی دەکات، دەڵێن: ((ئەوە مارێکە))و زەینیان دوورتر لەو ناڕوات، بەلاّم زەینێ کە غەرقی خودایە، دەچێتە پشتی بەرهەستەکانەوەو مانای نادیار دەدۆزێتەوە، ئەو مارانە کە ئەمڕۆکە لە بەردەم دەرگای ئەم حوجرەیەدا دەرپەڕین، دروست دوای دان پیانانەکانی کوڕی مێرێ دەستیان بەکیفە کیف کرد، بەدڵنیاییەوە دەڵێم هەڵگری مانای قوڵو شاراوەن.. دەبێ ئەو مانایە چی بێ؟ خۆی بەلولدراوی هاوێشتە سەر زەویو لاجانگەکانی دەکوتایەوە، دەبێ ئەو مانایە چی بێ؟ ئارەقەییێکی سارد بەسەر رووخساری هەتاوەسووتی هاتە خوارەوە، جار جارە بەتیلەی



چاوی سەیرێکی دەکردە گەنجەکەو، جارێکیش بەدەمی بەشو چاوانی داخراوەوە بە دیقەت گوێی لەمارەکان دەگرت، ئەوە چ مانایێکی هەبوو.

ئەو زمانی پەرەندەکانی لە گەورە جادوگەرو رابەری پێشترێی خۆی (یوزاپت) فێر بووبوو، لەکاتێ کە ئەو هاتبووە دێرەوە عابید لەوێ بووەو بینیویەتی، دەیتوانی زمانی پەڕەسێلکەو کۆترو بازەکان راڤە بکات، یوزاپت قسەی پێدابوو کە زمانی مارەکانیشی فێری ئەو بکات، بەلاّم ئەجەل مۆڵەتی پێ نەدابوو، بەمەرگی خۆی ئەم رازەی بردبووە گۆڕەوە، بێگومان ئەو مارانەئەمشەو هەڵگری پەیامێك بوون، بەلاّم ئەو پەیامە چی بێ،؟ خاخام دووبارە دانیشت سەری لەناو دەستەکانی دانا، مێشکی کاس بوو بوو پێچی دەخوارد ئاخی هەڵدەکێشا هەستی دەکرد هەورە تریشقەیێکی سپیو رەش ی دەروونی هەور رێشمەی زەینی رادەکێشێ، ئەو مانایە چی بوو؟ ئەو پەیامە چی بوو؟ لەپڕێکا هاوارێ لە دەروونی هەستا، لەسەر زەوی قیت بۆوە، گۆپاڵی عابیدی لە دەست گرتو خۆی بەسەر دادا.

بەدەنگێکی کز گوتی: کریست دڵت چۆنە؟

بەلاّم گەنجەکە نەیبیست، ئەو نوقمی جەزبەیێکی وا بوو کە وەسف نەدەکرا، ئیمشەو دوای ئەو هەموو ساڵە، شەوێ کەبڕیاری دابوو دانی پیابنێو رازی دڵ بخاتە سەر زمان، بۆ یەکەمین جار بوو کە بوێرێ سەیری رەشێتی دڵی بکاتو ئەو مارانە یەك یەك دەست نیشان بکات کە لە دەروونیا دەیانکیفاند. هەرمارەو ناوێکی پێبەخشین، بەم ناونانە وا بەدیار دەکەوت کە لەدەروونیا دەردەهاتنو ئازادیان دەکرد.

پیرەمێرد دووبارە پرسی ((کریست دڵت چۆنە؟)) خۆ ئێستا ئارامی گرتووە؟)) لاربۆوەو دەستی ئەوی گرتە دەست بەنەمری گوتی: ((وەرە)) ئەنگووستی لەسەر لێو داناو دەرگای کردەوە، دەستی کریستی گرتبوو، لەگەڵ یەك بە ئاستانەی دەرگادا رەت بوون، مارەکان بێ شەرمانە بەیەکەوە نووسابوون، لە میانی گەرداوی ئاگرین ی لیمو چەو بەرزبووبوونەوە سەر کلكو سەمایان دەکرد. جار جارە لەبەر زۆر ماندووبوون لەجێوە بێجووله دەوەستا. کوڕی مێرێ بە بینینی ئەوان پاشەکشەی کرد، بەلاّم خاخام دەستی ئەوی کوشیو گۆپاڵی بەرزکردەوە دەستی لە لێوی هێشوە مارشێوەکەی دا،

لـەکاتێکا گەنجەکـە سـەیری دەکـرد بـزەی دەهـاتێ، بـە ئـارامی گـوتی: ((ببینـە، رایانکرد))

((بزانە هەست ناکەی باری دڵت سووك بووە؟ ئەوانە لە ناو دڵی تۆوە رایانکرد)).

کوڕی مێرێ بە چاوانی لە خانە دەرپەڕیوی یەکەمجار سەیری خاخامی کرد کە بزەی بۆ ئەو دەکردو پاشان سەیری مارەکانی کرد کە بەسەماوە بەرەو بیرە ئاوە وشکەکەوە دەڕۆیشتن، دەستی دانایە سەردڵی‌و هەستی کرد کۆتری دڵی لە خۆشیانا باڵدەگرێ.

خاخام کە دووبارە دەستی ئەوی لەدەست گرتبوو، گوتی: ((باشوایە بگەڕێینەوە)) ئەو کاتە سەیری کوڕی مێرێی کرد دووچاری شڵەژان بوو، لەبەر خۆ گوتی: ((ئەوە پەرجوییێکە، ژیانی ئەو کورە کە ئێستا رووبەڕووم وەستاوە جگە لە پەرجویەك هیچی دیکە نییە)). بۆ ساتێ ویستی دەست لەسەر سەری کریست دانێ‌و پیرۆزی بکات، ساتێکی تریش بڕیاریدەدا لاریبێتەوەو پێیەکانی ماچ بکات، بەڵام دانی بەخۆیا گرت، تا ئێستا خودا چەندین جاروجار فریوی دابوو، هەرکات دەبیبیست کە پەیامبەرێ لە کێوەوە سەرەو ژوور بۆتەوە یا لە بیابان هاتووە دەیگوت ((ئەوە ئیدی دەبێ کریستیانو بێ))، بەڵام خودا هەموو جارێ ئەوی فریو دەداو دڵی خاخام کە ئامادەی پەڕوپۆ بوو پەژموردە دەبوو وخونچەی نەدەکرد، بۆیە دەپەنگایەوە، لەگەڵ خۆیەوە گوتی: ((دەبێ یەکەمجار ئەو تاقی بکەمەوە، ئەو مارانە کە خەریکی قووتدانی بوون، ئێستا رایانکردوە، وجوودی ئەویان لە ژەنگی پیسی پاك کردۆتەوە، ئێستا توانای ئەوەی هەیە کە هەڵسێتەوە سەرپێ‌و لەگەڵ خەڵکان قسەبکات.. ئەو کاتە پێدەکەوم دەرگا کرایەوەو (یەربوکام) خۆی‌و سینیێ تێشت کە بۆ دوو میوان بوو، بریتی بوو لە نانی جۆو زەیتوونو شیر هاتە ژوورەوە، رووی لە کریست کردو گوتی: ((ئەمشەو جێگاییێکم لە ژوورێکی دیکە راخستوە تا هاودەمت هەبێ، بەڵام زەینی میوانەکان لەم دونیایە نەبوو، ئاگایان لەقسەی (یەربوکام) نەبوو، دەنگی مارەکان لەبنی بیرەوە دووبارە بەرگوێ کەوت، ئەوان شمشاڵیان دەژەنی‌و لەهەلەهیان بوو.

ڕەبەنەکان بەخەندەییێکی لوس گوتیان ((وا زەماوەند دەکەن، بای خودا هەڵدەکا ئەو بەلا بەگیان گرتوانە واهیمەییێکیان نییەو زەماوەند دەکەن)) سەیری پیرەمێردی کردو



چاوێکی هەڵتەکاند، بەڵام پیرەمێرد لوقمەی بردە دەمی‌و دەستی بەجوێن کرد، ئەو دەیەویست گیانی وەبەربێت بە گۆڕینەوەی نانو زەیتوونو شیر بەهۆش بتوانێت قسە لەگەڵ مێرێ بکات.

بابە قەمبور سەیری ئەوانی دەکردو حەوسەڵەی لەسەر نەماو ئەوێی جێهێشت.

ئەم دووە رووبەڕووی یەکتر دنیشتبوونو لەبێدەنگیدا خواردنیان دەخوارد، حوجرە تاریك بووبوو، چوارپایەو شوێنی عابیدو دار کتێب لەگەڵ کتێبی کراوەی دانیال پێغەمبەر بەسەریەوە بوو لە تاریکیدا دەدرەوشایەوە، فەزای حوجرە هێشتا بۆنی دلاوێزی بخوری دەدا، لەدەرەوەدا با ئارامی گرتبوو.لە هەمان کاتدا خاخام گوتی: بایەکە دابەزیوەو نەماوە

گەنجەکە وەڵامی نەدایەوەو لەبەرخۆ گوتی: ((ئەوان رۆیشتوون، ئەوان رۆیشتوون، مارەکان لە دەروونمدا رایانکرد، رەنگە ئەوە دروست خواستی خودابێ، رەنگە بە هەمان بەڵگە بووبێ کە خودا منی هێنابێتە بیابان تا شفام بدات ئەو هەڵیکرد، مارەکان گوێیان لە دەنگی بوو، لە دەروونمدا خزینو رایانکرد سوپاس بۆ خودا)). دوای سەرفی خۆراك، خاخام دەستی بەرز کردەوەو شوکری خودای کردو ئەو کاتە رووی لە هاودەمەکەی کرد، ((زەینت لەکوێیە کریست؟ من خاخامی ناصیرەم، دەنگم دەبیستی؟))

گەنجەکە بە راجفرینێکەوە لە دونیای جەزبە هاتەوە دەرەوەو گوتی: ((بەڵێ مامە شەمعون))

- زەمانی موژدەهێن هاتووە، رۆڵەم .. ئامادەی؟

کریست لەبەر خۆ لەرزی‌و پرسی ((ئامادە؟ ئامادە بۆچی؟

- خۆت باشدەزانی، بۆ لەمن دەپرسی؟ ئامادەیی بۆ هەڵسانەوەو قسەکردن.

- لەگەڵ کێ

- لەگەڵ مرۆڤ

- چی بلێیم؟

- نیگەران مەبە، تۆ تەنها دەمت بکەرەوە، خودا هیچی دیکەی لە تۆ ناوێ. مرۆڤت خۆش دەوێ؟

- نازانم خەڵك دەبینم دڵم بۆیان دەسووتێ تەنها ئەوە

- ئەوە بەسە کوڕم، بەسە، رابەو لەگەڵ ئەوان قسەبکەو ئەو کاتە لەوانەیە ئازاری تۆ زیاد بێ بەڵام ئازاری ئەوان هێور دەبێتەوە

- ڕەنگە هەر بۆ ئەوەبی کەخودا منی بۆ جیهان ناردووە باوکە تۆ لەکێ دەزانی؟

- نازانم، کەس شتێکی بەمن نەگوتوە، بەڵام وێڕای ئەو هەموو حاڵەتەش، دەکرێ، من نیشانەم بینیوە، ئەو کات کە منداڵ بووی، کەمێ خۆڵت هەڵگرتو مەلێکت دروست کرد، لە بە هەمان کاتدا کە دەتلاواندەوەو قسەت لەگەڵ دەکرد، وەك بڵێی باڵی دەرکرد بەڕاکردن لە دەستی تۆدا کەوتە فڕین، لەوانەیە کە ئەو مەلە قوڕینە رۆحی مرۆڤ بێ، بەڵێ کوڕم کریست- رۆحی مرۆڤ لە دەستی تۆیە.

- گەنجەکە لەجێ هەڵسایەوەو دەرگای بەدیقەت کردەوە، سەری بردە درەوەو گوێی راگرت، عاقیبەت مارەکان بێدەنگ بووبوون، بەخۆشحاڵیەوە بەرەو لای خاخام گەڕایەوە ((باوکە پیرۆزم بکەو شتێکی دیکەم پێ مەڵێ، هەموو شتێکت گوت، زیاتر لەمە بەرگەی بیستن ناگرم، دوای وەستانێکی کورت لەسەر قسەکانی رۆیشتو گوتی: ((مامە شەمعون، من ماندووم دەمەوێ بچمە سەر جێگاوە، هەندێ جار خودا بەشەو دێت روداوەکانی رۆژ یەکالاً دەکاتەوە.. مامە شەمعون بەچاکی بخەوە)) خانەخوێ لەدەرەوە چاوەڕوان بوو، گوتی: ((با بڕۆین پێت نیشان بدەم کە شوێنی تۆم لەکوێ راخستووە.. کوڕەگیان ناوت چییە؟

- کوڕی نەجار



- ناوی من (یەربوکام)ە بەمن دەڵێن برای بێ مێشكو قەمبور بەڵام تەقەی سەرم دێ، من حەواسم لای بەرداشەو وەکو مشك ئەو پەلکە وشکەی کە خودا بەمنی داوە دەجووم.

- کام پەلکی وشك...؟

- قەمبور بەخەندەوە گوتی: گەلۆرگیان، تێناگەی؟ رۆحم، لەگەڵ تەواوبوونی کارم ((ڕاستی شەو بەخێر، خەوی خۆش خۆش ببینی- ئیزرائیل دێو دەست بە جوینی من دەکات)) تۆزێ وەستا، دەرگا فسقلیە کورتیلەکەی کردەوە ((سوچی دواوەی لاچەپ جێگای تۆیە؟)) لە حاڵێکدا قاقا پێدەکەنیو ئەوی پاڵدایە ناو ژوور ((باش بخەوە، کوڕەگیان، خەوی خۆش خۆش ببینە، هەراسان مەبە، خەون بەژنەوە دەبینی، هەوای دێر وای دەوێ)) لە کاتێکا لەبەر زۆر پێکەنین خەریك بوو شەقی دەبرد، دەرگەی بەدەنگێکی بروسك ئاسا داخست.

کوڕی مێرێ لە شوێنی خۆی بزمارکوت بوو، تاریکە، سەرەتا هیچ شتێکی جیاوازی هەست پێنەکرد، بەڵام هێدی هێدی دیوارەکانی نیوەڕوون کە بە سپیاوی قسل سپی بووبووە، بەدیارکەوت، شەربەیێ لە قەڵەشتی دیوار دەدرەوشایەوە، دووچاوی کلپەدار لە سوچێکەوە لەودا دوورابوو، لەسەرخۆو کوڕماڵ بۆ پێشەوە دەچوو پێی لە حەسیری لولنەدراو گیر کردو وەستا، لە هەمان کاتدا دووچاو تاقیبیان دەکرد، کوڕی مێرێ سەلاوی لە هاودەمی کردو بەڵام کەسێ وەڵامی نەدایەوە.

یەهودا خۆی وابەدیارخست کە لولی خواردوە، لە کاتێکا چەنەگەی هاوێشتبووەسەر ئەژنۆکانی، دەنگی هەناسەی سەنگینی ئەو لە حوجرەدا دەنگی دەدایەوە، پشتی بەدیوار دابوو سەیری کوڕی مێرێی دەکرد، لە دەروونی خۆی زەمزەمەی دەکرد ((وەرە... وەرە...وەرە...وەرە، خەنجەری لە ناو مشتی خۆیا دەکوشی، لەبەرخۆ بیری دەکردەوەو نزیك بوونەوەی کوڕی مێرێی دەپێواندو زەمزەمەی (وەرە..وەرە..وەرە)ی دەکردو ئەوی رادەکێشایە سەر تەڵەوە، زەینی ئەو گەڕایەوە زادگاو دێی —خریوت- کە لە دەوروبەری ئەدومیە بوو، شێوەی بەتەڵەوەکردنی کریست ئەوی دەخستەوە یادی شێوەی بەتەڵەوەکردنی چەقەڵو کەروێشكو کەو لە لایەن مامە جادوگەرەکەی، مامی

بەسەر زەمینەوە رادەکێشا، چاوی دەگیرساوی دەبڕیە نێچیرەوەو دەنگی هیسە هیسی پڕ لە تاسوقو پاڕانەوەو دەستووری سەر دەدا (وەرە، وەرە، وەرە) ئاژەڵەکە یەکسەر گێژدەبوو بەسەری کەچو هەناسە سواریەوە بەرەو لای ئەو دەمەی کە هیسە هیسی بوو دەستی دەکرد بە خزین...

لە پڕێکا یەهودا دەستی بەهیسە هیس کرد. سەرەتا ئاراموو نەرم پاشان لە پڕێکا بە هێزترو وەحشیانەو هەراسانکەر تر بوو.

کوڕی مێرێ کە سەری بەسەر سەرینی حەسانەوە کردبوو، بەوەحشەتەوە لە جێوە راپەڕی، کێ لە تەك ئەوەوە بوو؟ کێ بوو هیسە هیسی بووە؟ عەتری هەناسەی ئاژەڵێکی لە فەزادا بەرلوت کەوتو تێگەیشت، بە ئارامی پرسی:

- یەهودا براکەم ئەوە تۆی؟

یەهودا لە کاتێکا بە تووڕەیی پێی لە زەوی دەکوتاو نەڕاندی ((هەی لە خاچ دەر!)) گەنجەکە قسەی خۆی دووبارە کردەوە ((برام یەهودا، لە خاچدەر زیاتر لە خاچدراو ئازار دەکێشێ))

ڕدێن سوور کە لە تووڕەییاندا دەپێچرایەوە ناوخۆی هاواری کرد ((بۆ برایانمو گیانبازەکانو دایکانی لە خاچ دراو سوێندم خواردوە کە تۆ بکوژم، بەخێرێی سەلیبساز، هیسە هیسم کردو تۆ هاتی)) قیت بۆوە سەر پێیەکانیو دەرگای جووت کردو گەڕایەوە سوچەکەوە، دووبارە خۆی هەڵکورماندەوە، رووی لە کریست کردو گوتی:

- گوێت لێ بوو چیم گوت؟ دایێ بە غەریبم مەزانەو خۆت ئامادەکە.

- من ئامادەم

- هاوار مەکە یاڵلا زووبە، تا هەوا تاریکەو دەمەوێ بڕۆم.

- براکەم یەهودا خۆشحاڵم بەدیدارت، من ئامادەم، ئەوە تۆ نەبووی کە هیسە هیست بوو، خودابوو-و من ئامادەم ئەو بە میهرەبانی خۆیەوە هەموو شتێکی تەرتیب



کردوە، تۆ دروست لە کاتی خۆی هاتی، برام یەهودا.. هەمیشە دڵم سوك و بێ پیسییە، ئێستا دەتوانم لە پێشگای خودایی حازر بم، ماندوو بووم لە دەستو پەنجە نەرم کردن لەگەڵ ئەو، هەروا لە ژیانیش، گەردنم لەبەر دەستی تۆ دادەنێم.. یەهودا من ئامادەم، ئاسنگەر نەڕڕاندیو بڕۆکانی وێك نایەوە، ئەو ئەسلەن هەرخۆشی بەڕاستی نەفرەتی هەبوو، ئەگەر دەست بۆ لای گەردنێ درێژ بکات، کە وەك گەردەنی بەرخ وایە، بێ داکۆکی، سارد بووبۆوە، ئەو داکۆکیو شەڕی تەنبەتەنی دەویست، لەم حاڵەتەدا دوای بەجۆش هاتنی خوێن.

کوشتن ئاوەها سزاواری مرۆڤی واقیعیو پاداشتی بەویژدانانەیە بۆ زۆرانبازی، لە کۆتایی دادەهات. کوڕی مێرێ هێشتا خۆیو ملی درێژکردووی ئامادەبوو، بەڵام ئاسنگەر بەدەستی زلو زەبەللاحی خۆیەوە، ئەوی پاڵی پێوەناو نەڕاندی: ((بۆ داکۆکی ناکەیت؟ تۆ چ جۆر مرۆڤێکی؟ قیت بەوە زۆرانبازی بکە))

برام یەهودا، من ئارەزوێکی وام نییە، بۆ داکۆکی بکەم، خواستی تۆ خواستی منە، دڵنیابە کە خواستی خوداشە، لە هەمان ئەو ساتەی کە من هاتمە ئەم دێرەوە تۆش هاتی، من گەیشتمە دێر دڵم لە پیسیو پۆخڵی پاك بۆوە، خۆم ئامادەی کوژران کرد، تۆ خەنجەرت دەست داوەتێو لەم سوچە پەنهانبووە خۆت ئامادەی کوشتن کردوە، دەرگا کراوە من هاتمە ژوورەوە، چ نیشانەیێکی ترت دەوێ برام یەهودا)).

بەڵام ئاسنگەر لێوی لە لێو نەکردەوە، سمێڵەکانی خۆی لەڕێی شێتایەتیەوە دەقرتاند، خوێن بەری چاوی گرتبوو، مێشکی دەجۆشا، عاقیبەت نەڕڕاندی ((بۆ خاچ دروست دەکەی؟)) جوانمەردەکە سەری لەبەرخۆ نا، ئەوە رازی ئەو بوو، چۆن دەتوانێ بیدرکێنێو ئاشکرای بکات؟ ئاسنگەر چۆن دەیتوانی باوەڕ بەو خەونانە بکات کە خودا بۆ ئەو جەوانمەردەی دابەزاندبوو، یا بەو دەنگانەی کە لە خەڵوەتی خۆیدا دەیبیست، یا بەو پەنجانەی لەسەری قولاب دەبوون ئارەزووی ئەوەیان هەبوو بۆ ئاسمانی هەڵکێشن.

ئاخر چۆن موقاوەمەتی خۆی لەبەرابەر هەڵکێشانی بۆ ئاسمان، لە یەهودا بگەیەنێ؟ لەڕووی نائومێدیەوە گوناهی مانەوەی کردبوو بەسەر زەوی، بە پەشیمانیەوە گوتی: ((برام یەهودا، ناتوانم بۆت روون کەمەوە ببورە ناتوانم))

ئاسنگەر جێی خۆی گۆڕی تا بتوانێ رووخساری گەنجەکە لە تاریکیدا باشتر دەست نیشان بکات، بەمکوڕیەوە سەیری رووخساری دەکرد، ئەو کاتە لەسەرخۆ بۆ دواوە گەڕایەوە، دووبارە پشتی بەدیواردا، لە خۆی پرسی ((ئەوە ئیدی چ جۆرە مرۆڤێکە؟ تێ ناگەم، سەیرم پێ دێ هەرماس رێنمایی دەکات یا خودا؟ لە هەردوو حاڵەتدا بەخاترجەمی رێنمایی دەکەن، ئەو مقاوەمەت ناکات، کە ئەوە خۆی گەورەترین موقاوەمەتە، من ناتوانم بەرخ بکوژم.. مرۆڤ ئا، بەلاّم بەرخ نا، هاواری کرد ((تۆ ترسنۆکی ..هەی بێچارەی بەلەنگاز، هەی سەگ سەروبچمت بخوات. کوڕی مێرێ بە زەمزەمەوە گوتی: ((خودا دەتوانێ)) ئاسنگەر خەنجەری لە مشت وەرسووراندو لەبڕیاردانددا ساردبۆوەو دەستەوەستان بوو، بۆ ساتێ خەیاڵی کرد، کە تریفەیێکی نورانی لە تاریکیدا بەسەر رووی سوورفڵەوەبووی گەنجەکەدا دەجریوێنێ، وەحشەت سەراپای داگرتو بەندی دەستی شل بۆو، بە کوڕی مێرێی گوت ((لەوانەیە من مرۆڤێکی کەرکەللە بم، بەلاّم تێدەگەم، قسەبکە تۆ کوێی؟ چیت دەوێ. خەڵکی کێی؟ ئەو داستانانەی کە لە هەموو شوێنێ دەربارەی تۆ دەگێڕنەوە، گۆپاڵی شکۆفە کردوە، کلّپەی هەورەتریشقە، ئەو هێرشانەی کینە کە لە کاتی بەرێدارڕۆیشتن دێنە سۆراغت، ئەو دەنگانەی کە لە تاریکی دەیبیستی.. پێم بڵێ رازی تۆ چییە؟

بۆ کێ؟ بەزەییت بەکێدا دێتەوە؟ بەخۆت، بە هەژاریو فەلاکەتی خۆت؟ یا رەنگە دڵت بە حاڵی سراییل بسووتێ؟ یاڵلاّ بڵێ، بۆ سراییلە؟ دەمەوێ هەمان ئەوە بڵێی؟ هەمان ئەوە، نەك شتێکی دیکە؟ ئایا ئەوە ئازاری سراییلە کەوتۆتە گیانتەوە..

- ئازاری مرۆڤ.. برام یەهودا..

مرۆڤ فەرامۆش کە، یۆنانیەکان کە ئەو هەموو ساڵە کوشتاری ئێمە دەکەن.. مرۆڤن.. نەفرەتیان لێبێ.. رومیەکانیش مرۆڤن! ئێستەش کوشتاری ئێمە دەکەنو پەرستگاو خوداکانمان پیس دەکەن.



لەوانە گەڕێ، دەبێ بۆ سراییل بێ، جگە لەوەی هەموو شتێ دوور فڕێدە.

- بەلاّم من بۆ چەقەلەکان، برام یەهودا بۆ پەڕەسێلکەکانو گیاش هەست بە میهرەبانی دەکەم

- ها...ها بۆ مێرولەکان؟

- بەڵێ بۆ مێرولەکانیش هەموو شتێ لە ئانی خودادایە، کاتی بەسەر مێرولەیەك لاردەبمەوە، لە دیدگای رەشو بریقەداریان، رووخساری خودا دەبینم

- لەم حاڵەتەدا ئەی من چی کوڕی دارتاش؟

- لەوێش لە قولاّیی دا رووخساری خودا دەبینم.

- لە مەرگ ناترسی

- بۆ بترسم برام یەهودا؟ مەرگ درەگایێ نیە داخرێ، مەرگ دەرگایێکە دەکرێتەوە، دەکرێتەوەو مرۆڤ دەچێتە ژوورەوە.

- بۆکوێ؟

- بۆ ناوسینەی خودا.

یەهودا لە رووی شڵەژانەوە، ئاخێکی هەڵکێشا، لەبەر خۆ گوتی: ((هیچ لەگەڵ ئەو مرۆڤە ناکرێ، چوونکە ترسی لە مەرگ نییە)) چەنەگەی نایە ناو لەپیو سەیری کریستی کردو هەوڵی دا بگاتە بڕیارێ، لە ئەنجامدا گوتی:

- ئەگەر تۆ نەکوژم دەتەوێ چ بکەی؟

- نازانم. هەرچیەك خودا بیەوێ.. مەیلم هەیە راپەرمو لەگەڵ مرۆڤ قسە بکەم.

- چییان پێ دەڵێی؟

- برام یەهودا، چۆن پێشبینی ئەوە لە من دەکەی کە بزانم؟ من دەمم دەکەمەوەو خودا قسە دەکات. تریفەی رۆشنایی بەسەر گەردی سەری گەنجەکەوە نورانیتر دەبوو،

رووخساری خەمگینو ئازارچەشتەی وەك چۆن هەورەتریشقە دەدرەوشایەوە، چاوانی درشتو رەشی ئەو بە جوانییێکی وەسف نەکردەنی یەهودای دەخستە ئەفسونەوە.. ردێن سوور هەستی بەشلەژان کردو چاوانی هێنایە خوارەوە، لەبەرخۆ گوتی: ئەگەر دلنیابم کە هاتۆتە سۆراغی سراییلیەکانو بەقسەکانی دلی ئەوان دەداتەوە هێرش بکەنە سەر رۆمیەکان ئەوا نایکوژم))

گەنجەکە پرسی: برام یەهودا، ماتەلی چیت؟ رەنگە خودا تۆی بۆ کوشتنی من ناردبێ؟، رەنگە ئیرادەی خودا پەیوەندی بەشتێکی دیکەوە هەبێ، شتێ کە بۆ تۆش رەوان نییە، تۆ سەیری من دەکەیو هەوڵ دەدەی بزانی چ شتێکە؟ من ئامادەم بکوژرێمو هەرواش ئامادەی زیندوومانەوەم، بڕیاربدە)).

یەهودا بەدلمردییەوە وەلامی دایەوە: ((پەلە بە خەرج مەدە، شەو درێژە، ئێمە کاتمان زۆرە)) بەلام دوای وەستانێکی کەم بەقینێکی شێتئامێزەوە هاواری کرد ((مرۆڤ بێ ئەوەی خۆی بخاتە دەردەسەریەوە ناتوانێ هەتا قسەش لەگەڵ تۆ بکات، من شتێ دەپرسم تۆ شتێکی دیکە وەلام دەدەیتەوە، سەرم لە کارت دەرناچێ، پێش ئەوەی تۆ ببینمو گوێ لە تۆ رابگرم.. دڵو زەینم لە ئێستا دلنیاتر بوو سەرت بۆ لایەکەی تر وەرسوورێنەو بخەوە، دەمەوێ تەنهابم تابتوانم ئەو هەمووە هەرس بکەمو بزانم چی دەکەم؟ دوای گوتنی ئەو وشانە بە شپرزەییەوە بۆلای دیوار گەڕیەوە.

کوڕی مێرێ بەسەر حەسیرەوە بە ئارامی راکشاو دەستەکانی وەك خاچ بەسەریەکەوە دانا لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((هەر ئەوەی کە خودا دەیەوێ، هەرهەمان دەبێ)) بەدلنیایەوە چاوانی بەسەر یەکەوە نا، لەکونی تاوێرەبەردێ کە ڕوبەڕووی ئەو بوو، کوندەپەپوێ هاتە دەرەوە، هەرکە بینی تۆزوبای خودا تەواوبوو بەبێ هەرواوهۆریا بۆ پێشو پاشەوە هەلفڕی، ئەو کاتە بەهوەهوەوە هاوجوتی خۆی بانگ کرد.. ((ئەزیزم وەرە، خودا رۆیشتووە، ئێمە جارێکی دی بەسەلامەتی هەلسواینەوە)) لەوانەی سەرەوەدا، لە ترۆپکی کلاوڕۆژنەی حوجرەکەوە ئەستێرەباران بوو، کوڕی مێرێ چاوەکانی کردەوە بە دیتنی ئەوان شادبوو، ئەوان لەسەرخۆ دەجولانو ون بوونو ئەستێرەکانی دیکە هەلدەهاتن .. چەندین سەعات بەدوای یەکدا رادەبردن یەهودا کە



هێشتا بەسەر حەسیرەوە چووارمێچکی لێی دانیشتبوو خۆی وەردەسووراند، جارناجار بە هەناسەبڕکێو زەمزەمەوە هەلدەستایەوە تا دەمی دەرگا دەڕۆیشتو دووبارە دەگەڕایەوە، کوڕی مێرێ، بەچاوانی نیوە داخراوی سەیری دەکردو لە چاوەڕوانیدا مایەوە، لەبەرخۆ گوتی:

((هەر ئەوەی کە خودا دەیەوێ هەمانە کە دەبێ)) لە چاوەڕوانی مایەوە، چەندین سەعات رابردن، وشترەمێینەك لە تەویلەی نزیك حوجرەکەی ئەواندا دەیحیلاند، رەنگە خەونی بە گورگێ یا شێرێ بینبێ، ئەستێرە گەورەو تازەدەرکەوتووەکانی ئاسمانی خۆرهەلات، بەتووڕەییو خرۆشەوە سەرهەلدەگەڕانو وەکو لەشکرێك رێکەوتبوون. لەپڕێکا کەلەشێر لە قولایی تاریکیدا خوێندی، یەهودا لە جێوە، هەستاوە بە هەنگاوێکی درێژ خۆی گەیاندە دەرگاوە.

دەرگای بە زبرییەوە کردەوە، لە دوای خۆی دایخستەوە، دەنگی پێی پەتی کە بە قوڕسی دەکوترایە سەر بەردڕێژەکانەوە گەیشتە گوێ ئەوکاتە کوڕی مێرێ سەری وەرسووراندو هاوسەفەری وەفاداری خۆی بینی کە لەناو تاریکیدا بە هوشیارییێکی تەواوەوە لە سوچێکەوە راست وەستاوەو بەوی گوت: لێم ببورە.. خوشکم زەمانی موژدەهێن هێشتا نەهاتووە.

## بەشی دوازدەهەم

ئەمڕۆکە باهۆزێکی گەرمو نمناك دەبووە هۆی ئەوەی کەچەند شەپۆلێکی گەورە لە دەریاچەی (گنسارت) دا هەڵبچێ، پاییز هاتنی خۆی راگەیاندو زەوی بۆنی گەلاو مێوو ترێی ترشەوەبووی لێدەهات، ژنانو پیاوان لە گزنگی سەحەرەوە لە کفرناحومدا هەڵڕژابوونە دەرەوە، رەزەکانی ترێ نوقمی شکۆو جیلوەبووبوون، هێشووی ترێ بە دانە پڕ ئاوەکانی چاوەڕوان بوون ترێچنەکان بێنو بیانچنن، کچانی جحێڵ کە ترێ ئاسا دەدرەوشانەوە، هەریەکەیان هێشوێکی تەواوی ترێیان خواردبوو رووخساریان پڕ شیر بووبوو، جەوانمەردانێ سووتاو لەبەر ئاگری شەهوەت بەدزیەوە سەیری ئەو ئافرەتانەیان دەکرد کە لە کاتی رنینی ترێدا دلێرانە تاویاندەدا، دەنگی قاقای پێکەنین لە رەزدا دەگەیشتە گوێ، کچان هێواش هێواش، لەشەرم کەوتبون، مەتەڵیان لەسەر کوڕەکان هەڵدەدا، کوڕەکانیش ئاگراوی تر نزیك دەکەوتنەوە، هەرماسی ئاگری بنکا لەناو رەزدا بە هەڵبەزودابەزینەوە ژنانی نوقرچە دەداو دەوروبەری پڕ لە قاقا دەکردن.

کوختەی لادێیانەی قوڕو فراوانی زوبەدی پیر چووارتاقە والا بوو، وەك لانەی هەنگ تژی وزەوزبوو، راووکەکە لە لای چەپی حەوشەکەوە بوو، پیاوانی گەنج سەبەتی پڕ لە ترێیان کە لە رەزدا دەرهێنا هەڵیاندەڕشتە ناویەوە، چووار ئادەمی زەبەللاح: فیلیپ، یاکوب، پەترۆس، ناتانیل ی پینەدۆزی دێ کە لە وشترێکی بێگوناه دەچوو، خەریکی



شوشتنی پێیە موویینەکانی خۆیان بوونو خۆیان ئامادە دەکرد بچنە ناو راووکەکەوەو ترێ بکوتنەوە. هەتا ئەوانەی باخیان بچووك بوو، هەڵبەتە بەشە شەرابی خۆیان وەلادەنا، هەموو ساڵێ دەیانبردەماڵی زوبەدی تا لە کارتەی بدەنو دەستهەقێ کە بە سوود وەرگرتن لە راووك وەریدەگرت، گۆزەو جلیکانەکانی شەرابی پڕ دەکرد لە هەمان کاتدا بەسەر سەکۆی بەرزەوە دادەنیشت، دارێکی گەورەو قەڵەمبڕێکی لە دەست دەگرت، ژمارەی سەبەتەکانی بەسەر دارەکەوە نیشان دەکرد، بەلاّم باخەوانەکانیش لە زەینی خۆیان ئاگاداری ژمارەی سەبەتەکان دەبوون، تا نەبادا دوای دوو ڕۆژ فێڵیان لێ بکرێ چوونکە زوبەدی پیر مرۆڤێکی فێڵ باز بوو، هیچ کەس پشتی پێ نەدەبەستا، هەموو چووارچاو چاودێریان دەکرد. پەنجەرەی ژوورەوەی ماڵێ کە دەیڕوانیە حەوشەوە، کرابۆوە، سالومەی پیرەخانمی ماڵ بەسەر تەختێکی کورتیلەوە راکشابوو، بەمجۆرە دەردی ئەژنۆو جومگەکانی دیکەی خۆی فەرامۆش کردبوو، هەڵبەت لە گەنجێتیدا زۆر جوانو بەدڵوداو بوو، خۆیو ئێسقانی وردو بالاّی زراڤ و پێستی زەیتونیو چاوانی درشتی -لە نەژادێکی خۆش جسن بوو- سێ دێهاتی کفرناحومو مەجدەل و- بیت صەدا- کەوتبووە ململانێوە..

سێ داخوازیکەر لە هەرسێ ئەو دێهاتانەوەو لەیەك کاتدا هاتبوونە سۆراغی باوکیەوە، کە کەشتیدارێکی دەوڵەمەند بوو، لەگەڵ دۆستانێکی زۆرو باری وشترو سەبەتەی پڕەوە چووبوون، پیرەمێردی حیسابگر لە زەینی خۆیدا جەستەو رۆحو سەروسامانی هەریەك لەوانی سووكو سەنگین کردبوو زوبەدی هەڵبژاردبوو، سالومەش هەرچۆنێ بێ بە زوبەدی رازی بوو، بەلاّم ئێستاکە ئەو کچە منالکارە پیربووەو گەردشی رۆژگار جوانیەکەی لە بێن بردبوو، جاروناجار لە کاتی جەژنی گرینگ گرینگدا، مێردە بونیات بەهێزەکەی کە هێشتا هەر شەهوانی بوو، شەوانە دەچووە ماڵی بێوەژنانو دەستی بەسەرو گوێیاندا.

بەلاّم ئەمرۆکە رووخساری سالومەی پیر لە خۆشیاندا دەبریقێتەوە کوڕە خۆشەویستەکەی یۆحەننا، رۆژێ پێشتر لە دێرەوە هاتبوو، ئەو لەڕاستی دا رەنگپەڕیوو لەڕولاواز بووە، پەرستنو بەڕۆژوبوون وردوخاشی کردبوو، لەبەرئەمە

سالومە نەیدەهێشت دڵی تەنگ بێ‌و نەیدەهێشت بڕوات، شەراب‌و خۆارکی پێدەداو تا دووبارە گیانی وەبەربێتەوەو لێوی گوڵ بگرێ، لەبەر خۆ دەیگوت: ((خودا باشەو ئێمە لێی دەپارێینەوە، بەڵێ ئەو چاکە بەڵام نابێ رازی بێت کە خوێنی کوڕانی ئێمە بخورێت، رۆژوو نوێژیش بەشێوەییێکی مام ناوەندی بۆ مرۆڤ باشەو بۆ خوداش، بۆیە دەبێ لەگەڵ یەك بەشێوەییێکی ئاقلانە بگەنەیەك)) بەتاسوقەوە سەیری دەرگای دەکرد، چاوەڕوانی یۆحەننا بوو لەڕەزدا بگەڕێتەوە، یەهودای ردێن سوور بێ هەرواوهۆریا خەریکی کاری خۆی بوو، چەکوشی خۆی هاوێشتە سەرشان‌و کەژی بەدەوری جلیکانەوە دەئالاند، کە لە لای راستەوە لەوت دەڕوانی، تەبەشی پڕمەکرو عەبوس بوو، کە لە لای چەپەوەش سەیرت دەکرد، تەبەشی نارەحەت‌و خەمگین بوو. لەو رۆژەوە کە وەك دزێ لە دێرەوە رایکردبوو، چەند کاتێکی بەسەرا رەتببوو، لەو ماوەیەدا، لە دێیەکەوە بۆ دێیەك چووبوو تا جلیکانەکانی شەراب راست‌و ڕیست بکات، دەچووە ماڵەکانەوەو کاری دەکردو گوێی لە قسان رادەگرت‌و کردارو گوفتاری هەموو کەسێکی لەزەینی خۆیدا تۆمار دەکرد تا بیگەیەنێتە ئەنجومەنی (برایەتی)ەوە، وەلێ ئەو ریش سوورو کەلەشێری جەنگیە لەکوێ‌و ئەو ریش سوورو بێدەنگیە لە کوێ؟ هەر لەو رۆژەوەی دێری جێهێشتبوو لەو دەستە چووبووە ئەو دەستە.

زوبەدی پیر بەسەریا هاواری کرد ((یەهودای ئەسخەریوتی نەفرەتی، دەمت بکەوە، لە چ بیرکردنەوەیەکدای- دوو دووتا چووارتا- هێشتا ئەوەت نەکردۆتە کەللەتەوە؟ دەمت بکەوە، هەی نالۆتی، شتێ بڵێ، ئێستا کاتی ترێ ڕنینە، فشەی پێناکرێ، لەڕۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا، هەموو سەرخۆشن هەتا بزنە رەشە عەبوسیەکانیش)).

فیلیپ تاویدایە ناو قسەکانی زوبەدی گوتی: ((لەڕێگەی لامەدە، چۆتە دێرەوە، وابەدیاردەکەوێ کە جلی رەبەنی لەبەر دەکات، مەگەر نەتبیستووە هەرماس پیردەبێ دەبێتە رەبەن))

یەهودا ئاوڕی دایەوەو سەیرێکی ژەهرالوودی کردە فیلیپ بەڵام هیچی نەگوت، قێزی لەو بوو، ئەو پیاو نەبوو، زانایێکی بێ کاربوو، زۆربڵێیێکی بەڕاستی بوو، تەواو لە هەمان ساتی کۆتاییدا لە ترسان خۆی پیس کردبوو سەرپێچی کردبوو لەوەی بچێتە



ناو ئەنجومەنی برایەتی، بەهانەکەی ئەوە بوو کە ((من بزنم هەیە، چۆن دەتوانم بەرەللایان بکەم)). زوبەدی پیر کەوتە بەبنی لێوەیەوە کەوتە خەندەو گەڕایەوە لای ریش سوورەکە هاواریکرد ((ئەی بێچارە، ئاگات لە خۆ بێ، رەبەنایەتی نەخۆشییێکی درمیە، ئاگات لە خۆ بێ نەپەڕێتە تۆوە، کوڕی خۆم من بەباریکی مووەوە لە دەستی رامکرد، پیرە خاتوونی من، کە خودایە هەر زیندووبێ، نەخۆش کەوت، کوڕە بەنازەکەی وەئاگاهات دەورەی گیا دەرمانی لە تەك عابیدەوە تەواو کرد، بۆیە گەڕایەوە ماڵ تا دایکی چارەسەر بکات، چ رۆژێ بوو کە گوتم ئیدی ئەو لێرە ناڕوات، ئاخر بچێتە کێندەرێ؟ خۆ شێت نییە لەوێ لە دیماهیدا برسێتی هەیە، تێنوێتی هەیەو خودا، خودا لە هەموو شوێنێکەوەیە، لەبەر ئەمە بۆچی مرۆڤ بەدوای خوادا بچێتە بیابان؟ یەهودای ئەسخەریوتی تۆ دەڵێی چی؟

بەڵام ریش سوور چەکوشەکەی خۆی دەلەراندەوەو وەڵامی نەدایەوە، دەیتوانی چی بەو بڵێ؟ هەموو شتێ بە پێی ویستی ئەو سەگە پیسە بوو، لەکێ تێدەگەیشت کە ئازاری کەسێکی دیکە چییە؟ هەتا خودا کەبەیەك تیچاوێ هەموو ئەوانی دیکە لە لاپەڕەی رۆژگار لەناو دەبات، مۆڵەتی ئەو بەرازپەنجە زێڕ پەرستەی دەداو نەیدەهێشت یەك موی سەریشی کەم بێ، لە زستاندا وەکو دۆشەگی خوری دایدەپۆشی‌و لە هاویندا وەك کەتانی فێنك.

بۆ؟ مەگەرچی لەو بینی بوو ئایا ئەو پیرە لوقمە حەرامە لەخەمی سراییل دایە؟ هەتا پەنجەش بۆ یارمەتیدانی سراییل بەرز ناکاتەوە، ئەو تاوانکارانی رۆمی خۆش دەویستن، چوونکە پاسداریان لە سەروسامانی دەکرد، دەیگوت ((خوا بیانپارێزی، ئەوان ئاسایش دەپارێزن، ئەگەر ئەوانە نەبوونایە، بێ سەروپاکان هەڵدەڕژانە سەرمان‌و تەواوی موڵك‌و ئەملاکیان بەتاراج دەبردین)) بەڵام ئەی حەرام لوقمەی پیر، لە کۆتاییدا زەمانی مۆژدەهێن هەر دەگات، هەرچیەك کە خودا لە بیری دەکات‌و بەبێ ئەنجامی رەهای دەکات، گیانبازان لە بیریان دەبێ‌و ئەنجامی دەدەن، یەهودا سەبرت

هەبێ، لێوت لە لێو مەکەوە، سەبرت هەبێ، رۆژێ یەهوەی سەبایوت دەگات! چاوانی فەیرۆزی خۆی هەڵبڕیو سەیری زوبەدی کرد، کە لەناو راووکەکەوە[◆] بوو.

وای هاتە بەرچاو کە ئەو بەسەر پشتەوە مەلەخوێنی خۆی دەکاتو رووخساری غەرقی بزەبوو.

لە هەمان کاتدا چووار ئادەمی زلو زەبەلاح پێیەکانی خۆیان پاك کردەوەو پەڕینە ناو راووك، لەکاتێکا تا چۆکیان چووبوونە خوارەوە، چیلکەی ترێ بەڕدێنیان وەدەنووسا. جارجارە دەستیان لەناو دەستی یەکتر دەناو سەمایان دەکرد، جارێکیش هەریەك لەوان هاواریان دەکردو بەتەنهایی بەرز هەڵدەگەڕان، بۆنی شیلەی ترێی ناو دەستیان مەستی کردبوون، داستانەکە لەهەمان ئەو جێیە کۆتایی دەهات. وەك چۆن سەیری لای دەرگای کراوەی بەردەم رەزەکەیان دەکرد کچانیان دەدیت کە بۆ رنینی ترێ لاربوونەتەوە سمتیان دەرپەڕیوەو مەمکەکانیان وەکو هێشوی ترێ بەسەر گەڵای مێوەوە شۆڕدەبوونەوە، ترێکوشەکان ترێی ئەوانیان دەدیو خوێن لەدەمارەکانیان جۆشیدەدا، ئێرە خۆ راووك نەبوو، زەویو رەزیش نەبوو، بەڵکو بەهەشت بوو، یەهوەی پیریش خۆیو دارێکی درێژو قەڵەم بڕەکەی بەسەر سەکۆوە دانیشتبوو نیشانگوزاری قەردەکانی سەبارەت بەهەریەك لەوان دەکرد، باشە هەرکەسێ چەند سەبەتە ترێی هێناوە تا بۆ دوسبەی کە دەمرێ بزانم چەند گۆزە شەڕابی پێ بدەم چەند گۆزە شەراب، چەند مەنجەڵ خواردن، چەند ژن!

پەترۆس بێ پێشەکی گوتی: ((بەشەرەفم قەسەم ئەگەر خودا لە هەمان ساتدا دەهاتو بەمنی دەگوت ((ئاهای پەترۆس پەترۆس گچکەلانەکەی من ئەمڕۆ تەواو بەکەیفم، شتێ لە من داوا بکە تا ئەنجامی بدەم بۆت، چیت دەوێ؟ ئەگەر ئەوە لە من دەپرسێت، وەڵامم دەدایەوە: ((کوشینی ترێ[*]، ئەی خودا کوشینی ترێ تا هەتایە)) زوبەدی بەبێ ئەدەبییەوە پرسی ((خواردنەوەی شەرابیش وانیە گەمژەڵ؟))

---

[◆] راووك: ئەو تەشتە گەورەیەیە کە ترێی تێدا دەکوشن.

[*] کوشینی ترێ، هەڵبەت ئەوان بە پێ دەیانشێلا، بەلام من کوشینم لەجیاتی پێشێل بەکارهێناوە.



–نە لە بنی دڵەوە دەڵێم تەنها کوشینی ترێ.

پەترۆس پیێنەدەکەنی، رووخساری جیدی بوو، بۆ ساتێ دەستی لەکار کێشایەوەو لەبەر هەتاو راکشا، لای سەرەوەی رووت بوو، بەسەر دڵیەوە ماسیەکی رەشی گەورە کوترابوو، هونەرمەندێ کە پێشتر زیندانی بوو، لەڕێگەی سووتانەوە وا کارامە ناو سینەی پڕمووی ئاڵۆزی پەترۆسی کوتی بوو کە مرۆڤ وای خەیاڵ دەکر کلك دەلەقێنێ، بەخۆشحاڵیەوە سەمای دەکرد، لە سەرەوەی ماسی لەنگەرگابوو بە چووار دەستی یەکتربڕو لە هەردەستێ قولابێ هەبوو.

بەلاّم فیلیپ کەوتە یادی بزنەکانی، ئەو حەزی لێ نەبوو زەوی بکێڵێو ئاگادری رەزبێ یا ترێ بکوتێتەوە، بەتەوسەوە گوتی: ((پەترۆس توخودا کارێکی دیکە بۆخۆت پەیدا بکە، کوشینی ترێ تاهەتایی چ کارێکە؟ ئەگەر من لە جێی تۆ بوام لە خوام دەخوازی کە تەواوی ئاسمانو زەوی بکاتە مەزرایەکی سەوزی پڕ لە مەڕوبزن ئەوکاتە مەڕو بزنەکانم دەدۆشیو شیری رەوانی کوێستانیم دروست دەکرد، شیردەبووە رووبارێکی روونو رەوان، کە دەگەیشتە دەشت دەریاچەییێکی دروست دەکر تا بێچارەکان بیخۆنەوە. هەموو شەوێ هەموومان کۆدەبوینەوە، هەموو شوانەکان لەگەڵ خودا، ئاگرێکمان دەکردەوە، بەرخێکمان سوور دەکردەوەو دەمانگوت مانای بەهەشت هەر ئەوەیە))

یەهودا بەزێمارەوە گوتی: ((هەی سەگ بتخوات،کەرکەللە))و نیگاییێکی وەحشیانەی دیکەی کردە فیلیپ، نەوجەوانەکان، روتو موویین، بەلەنگ رەنگییەوە دەچوونە حەوشەو دەهاتنە دەرەوە، ئەوان بە بیستنی ئەو باس خواسانەوە کە پەیوەندیان بە یەکەوە نەبوو پێدەکەنین، لە دەروونی خۆشیان بە هەشتێکیان هەبوو، بەلاّم دانیان پیا نەدەنا کە ئەو بەهەشتە چییە، سەبەتی پڕیان هەڵدەڕشتە ناو راووکەوە، هەتا خۆت دەجولاندەوە، خۆیان دەگەیاندە دەرگاوە تا خۆیان بگەیەننە ترێڕنە زیبارووخسارەکانەوە، زوبەدەی لێوەکانی لێککردەوە تا شەکرێ بشکێنێ، بەلاّم بەدەمی کراوەوە لە شوێنی خۆیدا مایەوە، میوانێکی بێگانە لە دەمی دەرگادا بەدیارکەوت، گوێی لە قسەی ئەوان دەگرت، جلێکی لە پێستی بزن لەبەر دابوو، کە لەملیەوە هەڵواسراوبوو، پێپەتی بوو، پرچی ئاڵۆزابوو رووخساری وەکو گۆگرد

زەردبوو، چاوەکانی درشتو رەشو ئاگرین بوو، پێیەکانی لە کوتانەوە وەستان، زوبەدی پیر شەکرەکەی نەشکاند، هەموو بۆلای دەرگا گەڕانەوە، ئەو جەستەی کە جولایەوە لە ئاستانەی دەرگادا چ کەسێ بوو؟ پێکەنین وەستا، سالومەی پیر لە پەنجەرەوە بەدیار کەوت سەیرێکی کردو لە پڕێکا هاواری کرد: ((ئاندریاسە..زوبەدی هاواری کرد ((خودای گەورە، ئاندریاس! تەماشا بچمی بکەن نەکا لە دونیای مردوانەوە بێی؟ رەنگە هەر لەسەرە رێت دابێ..؟))

پەترۆس لە ناو راووکەکە دەرپەڕیو دەستی براکەی لە دەستی خۆی گرت بێ ئەوەی قسەیێ بکات، بە ئەشقو ترسەوە کەوتە سەیرکردنی، ئاخ خودایە ئەوە ئەندریاس بوو، هەمان قارەمانی جحێلێ، ئەو کەلەکێویە ناودارەکە لە کارو بازیدا پێشینەی لە هەموان رفاندبوو، ئا ئەوە هەمان ئەندریاس بوو کە دەستگیرانی قەشەنگترین کچی دێ-موکتابی- بوو، کچە وێڕای باوکی شەوێ خودا بایێکی وەحشەتناکی هەڵکردو لە دەریاچە غەرق بوو بوو، ئاندریاس لەوپەڕی بێ ئومێدییەوە دێی بەجێهێشتبوو تا خۆی بەدەستو پێ بەستراویەوە تەسلیمی خودا بکات، لەگەڵ خۆیا گوتبووی ((کەس نازانێ، ئەگەر بچمە دوای خوداوە شایەت لەگەڵ ئەودا بیدۆزمەوە)) لەڕوودا بەدوای دەستگیراندا دەگەڕا نەك خودا. پەترۆس بەترسەوە لەوی روانی بوو، شکلو شەمایلی ئەوی وەبیرهاتبۆوە کە تەسلیمی خودای کردبوو، ئێستا سەیرکە کە خودا ئەوی بە چ سەرو پۆتەلاکێکەوە بۆ ئەوە گەڕاندبۆوە. زوبەدی پیر بەسەر پەترۆسەوە هاواری کردبوو، ((ئاها نەکا بەدرێژایی رۆژ بتەوێ لێی مور بیتەوە؟ لێی گەڕی با بێتە ژوورەوە، لەوێ لەوانەیە بایێ هەڵکاو بیکاتە نەخشی زەوی، وەرە ژوورەوە کوڕم، کوڕم ئاندریاس خۆت لارکەوەو تریێ هەڵگرەو بیخۆ، سوپاس بۆخوا نانیشمان هەیە، بخۆ تاکەمێ رەنگت بێتەوە بەر. چوونکە ئەگەر پیرە باوکی بێچارەت تۆ بەهەمان سەروپۆتەلاکەوە ببینێ لەبەر ئازاری گیانی دووبارە خۆی لەناو سکی ماسیدا دەشارێتەوە. بەلام ئاندریاس بازووی ئێسقانی خۆی بەرزکردەوەو هاواری کردە سەریان ((ئێوە شەرم لەخۆتان ناکەنەوە؟ لەخودا ناترسن؟ وا دونیا خراپ دەبێ ئێوەش لێرە تریێ دەکوشنو پێدەکەنن؟)). زوبەدی پیر بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((خودا بمانپارێزی، ئەوا یەکێکی دیکەش هاتووە بەسەرمانەوە گران دەفرۆشی)) بەتووڕەییەوە



رووی لە ئەندریاس کردو گوتی: ((تۆش دەست لە ئێمە هەڵناگری؟ باشە ئیدی تەواو گوێمان لە فەرمایشتەکانی تۆ بوو، فەرمایشتی تۆ هەمان ئەوەیە کە پەیامبەرە ئاوەمۆرکراوەکان زۆرباشن باشتر وایە بەوان بڵێی ئاهەنگێکی تر ساز بکەن. ئەوان دەفەرموون کۆتایی دونیا گەیشتووە، گۆڕەکان، دەروونیان دەکەنەوە، مردووەکان دێنە دەرەوە، دەفەرموون کە خودا دادەبەزێ.

-(بەدەرکەوتنی دووەم)- تا بگاتە حیسابکاریەکان، ئەو کاتە وای لە ئێمە، هەمووی درۆیە..درۆ..درۆ! گوێی لێ رامەگرن کوڕینە بگەڕێنەوە سەر کارتانو تریێ بکوشن، کوڕی یونس نەڕڕاندی ((تۆبە بکەن، تۆبە بکەن!)) خۆی لەباوەشی براکەی دەرهێناو لە ناوەندی حەوشدا راست رووبەڕووی زوبەدی وەستا ئەنگوستی بەلای ئاسماندا بەرزکردەوە کرد. زوبەدی گوتی: (ئاندریاس بەخاتری سەلامەتی خۆت دانیشە، بخۆ، کەمێ شەڕاب بنۆشە، وەرەوە سەر ئەقلێ، گچکەلانەکە، بزانە چۆن برسیەتی تۆی بەرێی شێتایەتی دا بردووە)). کوڕی یونس وەلامی دایەوە: ((زوبەدی ژیانێکی خۆش تۆی بەرێی دیوانەگی دابردووە، بەلام زەوی لەژێر پێتدا دەم دەکاتەوە، خودا زەمین لەرزەیێکە، ئەو ئەشقە، کەشتیەکانو خۆشتو ئەو ورگەستووڕەت قورت دەدات!)) ئەو ئاگری گرتبوو، چاوانی دەسووراندنو بەسەیرکردنە یەك یەکی ئەوان هاواری دەکرد، ((بەر لەوەی شیلەی تریێ ببێتە شەڕاب دونیا کۆتایی دێت، کەزیەکانتان درێژکەن، خۆڵەمێش بەسەرتانا کەن، سینەتان بکوتنەوە هاوار بکەن ((من گوناهم کردوە)). زەوی یەك درەختەو رزی بووەو کریستیانو واخەریکە بە خۆیو تەورەکەی دێت(□).

یەهودا لە چەکوش لێدان وەستا، لێوی سەرەوەی بۆ دواوە چووبوو، ددانە تیژەکانی لە نووری خۆرەتاودا دەبریقانەوە، بەلام زوبەدی ئیدی نەیتوانی دان بە خۆیا بگرێو هاواری کرد ((پەترۆس لەڕاهی خودا لێیگەڕێو لێرەی بەرە دەرەوە، ئێمە کارو ژینمان هەیە ((وادێ وادێ)) جارێ ئاگری لە دەستدایە، جارێ دەفتەرێو ئێستا- پاشان چی؟ یەك تەپشو، بۆ دەست لە ئێمە هەڵناگرن، ئەی فێڵبازان، فەریودەرانی مرۆڤ؟ ئەو

□ تیشە بە مانای تەپشوو دێت، بەلام پێموایە مەبەستی تەورە.

دونیایە هیچ عەیبی نییە، هەمانە کە من دەیڵێم، کوڕینە ترێکان بکوشن، خەیاڵتان تەخت بێ)). پەترۆس بە نەرمی شانەکانی براکەی لاواندەوەو ئارامی کردەوە، بەنەرمی بەوی گوت: ((ئارام بەرەوە،ئارام بەرەوە، هاوار مەکە برا، هاوارمەکە، سەفەر ماندووی کردوی، با بچینە ماڵ تۆزێ بحەسێیتەوەو باوکیشم بە دیتنی تۆ دڵی ئارام دەگرێ)) دەستی براکەی گرتو لەسەرخۆ بەدیقەت ڕێی پێ نیشاندا، وەك بڵێی نابینابێ، ئەوان لە کوچەیەکی تەنگ دا سەرهەڵگەڕانو وونبوون. زوبەدی پیر بزەییێکی بەبنی لێویەوە دەکرد ((ئاخ یونس ی بەلەنگاز.. پەیامبەر-ئەی پیرە ماسیە بێچارەکەی من! ئەگەر تەواوی دونیا بەمن بدەن، ئامادەنیم بێمە جێی تۆ)).

وەلێ ئێستا نۆبەتی سالومەی پیر بوو دەم بکاتەوە. ئەو هێشتا هەستی دەکرد کە چاوانی درشتی ئاندریاس بە گیانیا هەڵواسراوەو دەیسوتێنێ، لە کاتێکدا کەزی سپی خۆی راتەکاند گوتی: ((زوبەدی ئاگاداری قسەکانت بە ئەی گوناهکاری پیر، فریشتەیێ بەسەر سەرمانەوەیەو نامەی کاری ئێمە دەنووسێت، سزای تانە لێدانەکانت دەچێژێ)) یاکوب کە تا ئێستا دەمی لێکنەکردبۆوە، گوتی: ((هەق لای دایکمە، تۆش بە خاتری یۆحەننا لە ئازار دابووی، بەرای من هێشتا لە مەترسیدای رزگارت نەبووە، سەبەتدارەکان بە منیان گوتووە لە رنینی ترێدا کۆمەکی ناکات، لەگەڵ ژنان دانیشتووە دەربارەی خوداو رۆژو رۆحی جاویدانی قسە دەکات، باوکە ئەگەر تەواوی دونیا بەمن بدەن، منیش ئامادەنیم لەجێی تۆ بم)). بە وشکیەوە پێکەنی، نەیدەتوانی برای تەمبەڵو نازنازی ئەو هەرس بکات، بەتووڕەییەوە دەستی کرد بەترێ کوشین، خوێن هێرشی کردبووە ناو کەللەی زلی زوبەدیەوە، بەنۆبەی خۆی ئەویش نەیدەتوانی لە کوڕی گەورەی بگات- زۆربەیەك دەچوون، ئەگەر دروست لە هەمان ساتدا، مێریۆی ژنی یوسف ی ناصری، کە پشتی بە بازووی یۆحەننا دابوو، لە دەمی دەرگا بەدەر نەدەکەوت، هەڵبەت شەڕێکی سەخت روویدەدا. پێیە وردیلەکانی لەبەر کاریگەرێتی سەفەری دوورودرێژی خوێناویو گەردالوود بووبوو، ئێستا چەند رۆژێ بوو کە ماڵو کاشانەی جێهێشتبوو، بەگریەو ناڵینەوە لە گوندێ بۆ گوندێ، بەدوای کوڕی بەدبەختی کەوتبووە گەڕانو سووڕانەوە. خودا ئەقڵی کوڕی ئەوی دزیبوو، لەڕێی مرۆڤ دوورکەوتبۆوە، دایکە بە ئاخ هەڵکێشانەوە سروودی مەرگی ئەوی کە



هێشتا زیندووبوو سەردابوو، دەگەیشتە هەرکوێیەکەوە، سۆراغی ئەوی دەکرد، ((ئەو باڵابەرزو پێ پەتی بوو، کراسێکی شینی لەبەردا بوو کەمەربەندێکی چەرمینی رەشی لەکەمەردابوو، کەسێکی وات نەبینیووە؟)) کەسێ ئەوی نەدیوە، ئەوە کوڕی بچووکی زوبەدی بوو کە ناونیشانی کریستی دابووە مێریۆەوە: ((غەرگەییێکی سپی پۆشیوەو لە حاڵی سوژدە دایە)). یۆحەننا کە دڵی بەژنە سووتا بوو، هەموو شتێکی ئاشکرا کردبوو، ئێستا لەکاتێکا کە تەکیەی بەبازووی ئەودا بوو، چووە ناو حەوشەی زوبەدیەوە تا بەر لە رۆیشتن بۆ بیابان هەندێ بحەسێتەوە. سالومەی پیر بەجیلوەوە هەڵسایەوە گوتی: ((مێریۆی ئازیز بەخێربێی .. فەرموو وەرە ژوورەوە))

مێریۆ چەفیەکەی خۆی هەڵکێشایە سەر برۆکانیو سەری لەبەرخۆنا بەچاوانێ کە دەیڕوانیە سەر زەویەوە بە حەوشەدا رەت بوو، دەستەکانی دۆستەکەی کەزی سپی ئەوی لەدەست گرتبوو کەوتە گریانەوە.

سالومەی پیر گوتی: ((کچم گریان بۆتۆ گوناهێکی گەورەیە)) مێریۆی بەسەر تەختەوە دانیشاندو خۆشی لە کەناریا دانیشت. ((کوڕەکەت ئێستاکە لە ئەمنو ئەمانە، ئەو لەژێر بنمیچی پیرۆزدایە)) مێریۆ بە ئاخێکەوە وەڵامی دایەوە ((سالومە دەردی دایك سەنگینە هەمووی یەك کوڕی بەمن بەخشی ئەویشی کوڕێ کە مایەی نەنگیە)).

زوبەدی پیر گلەییو زاری مێریۆی بیست ((ئەگەر نەبوویتایە بەربەستی بەرژەوەندیەکانی پیاوێکی خراپ نەبوو))

بەسەر سەکۆوە هاتە خوارەوە تا دڵی بداتەوەو گوتی: ((مێریۆ لەبەر خاتری گەنجێتیتی، هەر بیریشی لێ مەکەوە، بەسەردەچێ، گەنجێتی خودا بەرەکەتی پێدات وەکو شەرابە، وەلێ مەستی شەراب هەر زوو لە سەرمان دەپەڕێ، بەبێ جوتکە هاوێشتنی زیاد دەکەوینە ژێر کۆپەرانەوە، مێریۆ مەستی لەسەری کوڕی تۆش دەپەڕێ، هەمان ئەو کوڕەی خۆم کە هەر ئێستا لەبەردەمت وەستاوە، لەبەر چاو بگرە، وا خەریکە مەستی لەسەری دەپەڕێ)) یۆحەننا رەنگاوڕەنگ هەڵگەڕا، بەڵام قسەییێکی نەخستە سەر زمان، چووە ژوورەوە تا جامێ ئاوی ساردو بڕێ هەنجیری گەییو بۆ میوان بهێنێ، دوو ژن لە کەناری یەك دانیشتبوونو سەریان لەبەریەك نابوو،

قسەیان لەبارەی کوڕەکەیەوە دەکرد کە رفاندبووی، ئەوان بەچرپە قسەیان دەکرد، نەبادا پیاوان گوێیان لێبێ‌و ئەوانیش بێنە ناوەوەو لەززەتی قووڵی ژنانە کە دەرد بەوانی بەخشیی بوو لە دەست بدەن.

—سالومە، کوڕەکەت بەمنی گوت کە ئەو هەمیشە نوێژ دەکاتو ئەوەندە دەچێتە سوژدەوە دەستو ئەژنۆکانی غاراوە، هەروا یۆحەننا دەڵێت کە ئەو خواردن ناخواتو خەریکە دەتاوێتەوە، هەروەها ئاڵودەی باڵێ بووە بە ئاسمانەوە، مەعلومە هەتا لە خواردنەوەی ئاویش خۆپارێزی دەکات تا فریشتەکان ببینێ، سالومە ئەو ئازارە بەکوێ دەگات؟ هەتا خاخامی مامیشی نەیتوانی چارەسەری بکات، بیری لێ بکەوە تاوەکو ئێستا خاخام چەندین کەسی چاك کردۆتەوە کە جنۆکە دەستی لێ وەشاندوون، سالومە بۆ خودا نەفرەتی لەمن کردووە، مەگەر چیم لەو کردوە؟ سەری کردە سەر ئەژنۆی دۆستە پیرەکەی‌و کەوتە گریانەوە. یۆحەننا خۆی‌و جامێ پڕ لە ئاوو پێنج شەش دانە هەنجیر بەسەر گەڵا هەنجیرەوە بەدیارکەوت، لە کاتێکدا هەنجیرەکانی دادەنایە کۆشی ئەوەوە گوتی: ((مەگری، نورێکی پیرۆز بەدەوری رووخساری کوڕەکەتەوە شەپۆلدەدا، هەموو کەسێ ناتوانێ ئەم نورە ببینێ، بەڵام من شەوێکیان بینیم. دیتم ئەوی دەلستەوەو دەیخوارد، هەراسان بووم، دوای مەرگی عابید باوکە هەبەکوك هەموو شەوێ ئەوی لە خەوندا دەدیت، دەڵێت هەموو شەوێ دەستی کورەکەت دەگرێ‌و لە ژوورێ بۆ ژوورێکی تری دەباتو بە ئەنگوست هێما بۆ ئەو دەکات، قسەیێکی نەکرد، بەڵام بزەی دەهاتێ‌و بە ئەنگوست هێمای بۆ دەکرد، لە ئەنجامدا باوکە هەبەکوك بەترسەوە لەناو نوێن دەرپەری بوو رەبەنەکانی بێدار کردبۆوە، ئەوان بەیەکەوە هەوڵیاندا کە رازی ئەو خەونە بکەنەوە: عابید چی دەویست بەوان بڵێت، بۆ ئەو هێمای بۆ مێوانی تازەی ئەوان دەکرد؟ لە پڕێکدا پێرێ ئەو رۆژەی کە ئەوێم جێهێشت، خودا زەینی رەبەنەکانی روناك کردەوەو پەردەیان لەسەر رازی ئەو خەونە هەڵگرت.

کابرای مردوو بەوانی دەگوت کە کوڕی تۆ بکەنە عابید، تەواوی رەبەنەکان بەبێ لە دەستدانی کات چوونە سۆراغی کوڕەکەتو دۆزیانەوە، کەوتنە سەرپێکانی ئەو



هاواریان کرد کە ((ویستی خودا لە سەر ئەوەیە تۆ ببیتە عابیدی ئەم دێرە))، بەڵام کوڕەکەت رەتی کردەوە ((نە..نە ئەو رێگەی من نییە، من شایستەی ئەوەنیم، لێرە دەڕۆم)) دەنگی سەرپێچی کردنی ئەوم لە کاتی نیوەڕۆ دروست هەمان ساتێ کە دێرم جێهێشت دەبیست، رەبەنەکان هەڕەشەیان دەکرد کە ئەو لە حوجرە زیندانی دەکەن، پاسەوانێ لەبەر دەرگا دادەنێن تا نەهێڵن رابکات.

سالومەی پیر کە رووخساری چوورچو لۆچی بریقەی دەدایەوە گوتی: ((مێرێ، پیرۆزە، ئەی دایکی خۆشبەخت، خوداوەند بەسەر رەحمی تۆوە هەڵیکردوەو تۆ هەتا ئەوەش دەست نیشان ناکەیت!)) ژنێ کە خودا خۆشیویستووە، سەری خۆی کە هەرگیز هێور نەدەبۆوە راتەکاندو بەبنی لێویەوە گوتی: ((نامەوێ کوڕم پیرۆز بێ، حەزم لێیە وەکو هەموو خەڵکی تربێ، حەزم لێیە ژن بهێنێ‌و ببێتە خاوەنی نەوە، رێگەی خودا ئەوەیە)).

یۆحەننا وەك بڵێی شەرمی لە سکالاکردن دەکرد بەنەرمی گوتی: ((ئەوە رێگەی مرۆڤە ئەویتر رێگەی خودایە، هەمان ئەو رێیەی کە کوڕی تۆ بەدوای کەوتووە)) دەنگی منەمنەو خەندە لە لای رەزەکانەوە گەیشتە گوێ، دوو نەفەر لە سەبەتدارە گەنجەکان، بە هەڵچوونەوە هاتنە حەوشەوە، لە کاتێکدا لەبەر زۆری پێکەنین خەریك بوو شەقیان دەبردو هاواریان کرد ((ئەربابینە خەبەرێکی خراپ، بەراستی یاخی بوونێ لە مەجدەلیە بەرپابووە، خەڵك بەردی هەڵگرتووەو کەوتوونەتە دوای پەری دەریایی خۆیانو بەردبارانی دەکەن)).

ترێچنەکان دووبارە لە سەما کەوتنو هاواریان کرد ((کوڕینە کام پەری دەریایی؟ مەجدەلیە؟))

—بەڵێ مەجدەلیە کە خودا بەرەکەتی پێ ببەخشی، دوو وراغ سوار کە بەوێ رەتدەبوون خەبەریان هێنابوو.

ئەوان گوتیان باراباسی سەرکردەی دزان، هەموو خەڵکی ترساندوەو خستۆتە لەرزەوە، دوێنێ ناصیرەی جێهێشتووە کە شەممەیە مەجدەلی ئابلۆقە داوە، زوبەدی بەنەڕاندنەوە

گوتی: ((ئەوەشیان یەکێکی دیکە، دەڵێت جانبازەو سراییل نەجات دەدات، بەڵێ لەسەروبچمت رادیارە ! حەرام لوقمەی پۆخڵ! ئومێدەوارم لە ئاگری دۆزەخ دا سوور ببێتەوە، باشە پاشان؟

-پاشان دەمەدەمی رۆژاوا دەچێتە لای ماڵی مەجدەلیەو دەبینی حەوشە پڕ لە خەڵکە، ژنکۆکە دەرکراوەکە رۆژی شەممەش کاروکاسبی دەکرد، ئەو هەموو بێ پەروایییە بۆ باراباس گران بوو، خەنجەری لەژێر کراس دەرێناوەو هێرش دەکاتە ژوورەوە، بازرگانان شمشێر هەڵدەکێشن‌و هاوسێکانیش هەڵدەڕژێنە هەمان شوێن‌و دەکەونە ناو یەکتری، لە جەنگەکە سەردەکەون دوو نەفەر لە خەڵکی ئێمە بریندار دەبن، بازرگانان سواری وشتر دەبن‌و تێدەتەقێنن‌و رادەکەن،باراباس دەرگا دەشکێنێ تا مەجدەلیە بگەیەنێتە سزای کاروکردەوەکانی خۆی، بەڵام دەبینێ مەلەکە لەقەفەز فڕیوە، هەموو خەڵکی دێ بۆ بەدواکەوتنی ئەو دەبنە هەرەوزکارو بەڵام هەرزوو هەوا تاریك دادێ‌و شانسی دۆزینەوەی لەبێن دەچێ، رۆژی دوایی هەموو لە لایێ کۆدەبنەوەو دەست دەکەن بەگەڕان‌و سووران، لە ئەنجامدا شوونی هەڵدەگرن، دیارە بەسەر لیمەوە بەدوای شوێن پێی ئەو دەگەڕێن تێدەگەن کە بۆلای کفرناحوم چووە.

-فیلیپ لە کاتێکدا زمانی بەسەر لچی شۆڕەوەبووی بزن ئاسایدا دەردەهێنا گوتی: ((کوڕینە ئەگەر ئەو بێت، نور عەلا نوردەبێ، هەمان ئەو یەکەمان کەمبوو کە بەهەشتەکەمان کامڵ بێت، حەوومان فەرامۆش کردبوو، دڵنیام کە بە بینینی ئەو خۆشحاڵ دەبین)) ناتانیلی ساویلکە کە ردێنی هەڵدەپشاڤت گوتی: ((شەموانیش ئاشەکەی هەر دەگەڕێ)) وەبیری دەهاتەوە کەچۆن جارێکیان لە شەممەدا حەمامی کردبوو، جلی نوێی پۆشی بوو سەروریشی خۆی چاککردبوو، ئەو کاتە وەسوەسەی خۆشوشتنی هاتبووە سۆراغی‌و دەستی ئەوی لە دەست گرتبوو، لەگەڵ یەك چووبوون‌و تەوافی مەجدەلیەیان کردبوو، زستان بوو وەزعی کاسبیش کەساد بوو، ناتانیلیش تەواوی شەممە خۆی تەنها لە ئاش مابۆوەو گەنمی لێدەکرد، بزەیێکی رازی بوون بەسەر لێوەکانیدا نەخشی بەستا. راستیت بوێ، گوناهێکی گەورەبوو، بەڵی گوناهێکی گەورە، بەڵام باشە ئێمە پشت بەخودا دەبەستین‌و خۆشی عەفو دەبەخشێ، ئارام،



هەژارو بێچارەیە ژنی نەهێناوە، ناتانیل بەسەربانەوە تا شام دادەنیشێت، بۆ گوندنیان دەست بەندو بۆ شوانان کلاشی دروستدەکرد چ دەورانێکی لەززەتبەخش بوو! یەکجار بەدرێژایی ژیانی بەسەر هەر شتێکەوە سێ چووار تەکبیری لێدابوو وەکو پیاوێ بۆ خۆی کەیفی کردبوو، شەممەش بووە پاڵەوان، بە هەمان شێوە کە گوتمان، خوداوەند خۆشی لەو جۆرە کارانە دەگات‌و دەبورێ. بەڵام زوبەدی پیر سەگرمەکانی تێکچڕژاندو بەزێمارەوە گوتی: ((دەردەسەر.. دەردەسەر، ئەوان هەمیشە دەیانەوێ شەڕو دەعوای خۆیان بهێننە ئێرەوە، یەکەمجار پەیامبەرەکان، پاشان بەدەکان، یا ماسیگرە عوریانەکان‌و ئێستاش باراباس – بەینی من‌و خودا بێتام بووە- رووی لەترێڕنەکان کردو گوتی: ((ئێوە کوڕە باشەکان ئاگاتان لە کاری خۆتان بێ)).

لەناو ماڵێدا سالومەی پیرو مێریێ ژنی یوسف گوێیان لە هەواڵەکە بوو، سەیری یەکتریان کرد بێ ئەوەی قسەیێ بکەن، سەریان هێنایە خوارەوە، یەهودا چەکوشی خۆی دانایە سەر زەوی، بەلای دەروازەداچوو، پشتی بە چووارچێوەی دەرگادا، هەموو شتێکی بیست بوو لە مێشکی خۆی داگرتبوو، لە کاتی رۆیشتن بۆ لای دەروازەکە سەیرێکی وەحشیانەی کردە زوبەدی. یەهودا لە دەرگادا وەستاو گوێی رادێرا، چەند دەنگێکی بیست‌و چڕە گەردەلوولێکی بینی کە هەڵیکردبوو، پیاوان رایاندەکرد، ژنان بە قیژەوە هاواریان دەکرد، ((بیگرن...بیگرن)) بەر لەوەی کە زوبەدی هەڵی بۆ بڕەخسێ لەسەکۆدا بێتە خوارەوە یا پیاوەکانی بتوانن لە راووکدا بێنە دەرەوە، مەجدەلیە بەجلی پارە پارەو زمانی شۆڕەوەبووی هاتە حەوشەو بەربۆوە سەر پێیەکانی سالومەی پیر، هاواری کرد ((کۆمەگ ...کۆمەگ..وادێن)) سالومەی پیر سگی بەحاڵی ئەو مرۆڤە گوناهکارە سووتا، لە جێوە بەرزبۆوە، پەنجەرەی داخست بە کوڕەکەی گوت، دەرگای جووت گاڵەدەو گوتی: ((بەسەر زەویەوە درێژبەو خۆت حەشاردە)) مێریێ، ژنی یوسف، بۆ پێشەوە لار بۆوە، بەهاودڵی‌و هەراسانیەوە سەیری ئەو ژنە گومڕایەی کرد، کەسێ جگە لە ژنانی پاك نازانێ کە پاکی چەند خزۆکە، بەڵام لە هەمانکاتدا مێریێ ئەسەفی بۆ حاڵی ئەو خوارد، وای هاتە بەرچاو ئەو بەدەنە گوناهاوی‌و جانەوەرێکی وەحشی‌و موویین‌و مەترسیدارە، ئەو کاتەی کە کوڕەکەی بیست ساڵەبوو، ئەو جانەوەرە کەم مابوو بیڕفێنێ، بەڵام ئەو لە مەودای

مویێکەوە رایکردبوو، مێری ئاخێکی هەڵکێشاو لەبەر خۆ گوتی:((بەڵێ ئەو لەدەست ئەو ژنە رایکرد .. ئەی چۆن لە چنگی خودا...؟)) سالومەی پیر دەستی لەسەر رووی گەرمو سوتێنەری مەجدەلیە داناو بە میهرەبانییەوە پرسی: کچم بۆ دەگریت؟)).

مەجدەلیە وەڵامی دایەوە: ((نامەوێ بمرم.. حەزم لە ژیانە .. نامەوێ بمرم))

ژنی یوسف دەستی درێژکرد، ئیدی لەو نەدەترساو رقی لێنەدەبۆوە، لە کاتێکا دەستی لەو دەدا گوتی: ((مەجدەلیە خودا پارێزگاری لەتۆ دەکات.. تۆ نامری، مەجدەلیە بە بروسکێ لە چاوانییەوە پرسی ((مێری تۆ لە کوێ دەزانی؟))

دایکی کریست بەدڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە:

مەجدەلیە ..خوداوەند مۆڵەتی تۆبەی بە ئێمە داوە.

بەلاّم لە هەمان کاتدا کە ئەم سێ ژنە قسەیان دەکردو ئازارو دەرد ئەوانی یەکدەخست، هاوارەکانی ((وادێن.. وادێن..ئەوان گەیشتن!)) لە رەزدا پێچی خواردەوە، بەر لەوەی زوبەدی هەلی ئەوەی بۆ بڕەخسێ لە سەکۆوە دابەزێ، پیاوە زلو زەبەللاحە هەڵچووەکان لەبەر دەرگادا بەدیارکەوتن‌و باراباس، شەلاڵی ئارەقە بەنەڕیتەوە لەبەر دەرگا هەنگاوی نا، ((ئاهای زوبەدی بە مۆڵەت یا بێ مۆڵەت ئێمە وەژوور دەکەوین- بەناوی خودای سراییل)). بە گوتنی ئەم ووشانە بەر لەوەی کە خاوەنماڵی پیر بتوانی دەم بکاتەوە باراباس بە تەکانێ دەرگای لە جێوە هەڵکەندو کەزی مەجدەلیەی گرتە چنگ. لە کاتێکا ئەوی بەلای دەرگادا رادەکێشا، بەنەڕڕەوە گوتی: ((پەتیارە بۆ دەرەوە)) لە هەمان ئەو کاتەدا خەڵکی مەجدەل گەیشتن، مەجدەلیەیان گرت، بەرزیان کردەوە، لەمیانی راکێش‌و داکێش‌و پێکەنین هێنایانە چاڵێکی نزیك دەریاچەو هاوێشتیانە ناویەوە ئەو کاتە ژن‌و پیاو پەرش بوون‌و کۆشیان پڕ لە بەرد کرد، لە هەمان ئەم سەین‌و بەینەدا سالومەی پیر سەرەڕای ئازاری گیانکێشی خۆی کە هەیبوو، بەسەر مێزەوە هەڵسایەوەو بەڕاکێش راکێش خۆی گەیاندە حەوشەکەوە تا سەرکۆنەی مێردەکەی بکات‌و هاواری کرد ((تۆ دەبێ



لەشەرمان بتاوێیتەوە، چۆن لێدەگەڕێ کۆمەڵی بێ سەروپا پێ بنێتە ماڵەکەت‌و ژنێ کە داوای بەزەیی لەتۆ کرد لە دەستی تۆ دەربهێنن)).

سالومە ئەو کاتە رووی لە لای یاکوب ی کوڕی کرد کە بەدوو دڵییەوە لە ناوەندی حەوشەکەدا وەستابوو.

–تۆش هەمان کۆپی باوکتی شەرم ناکەی؟ دەتەوێ خۆت چاکەیتەوە؟ تۆ دەتەوێ هەموو کارەکان بەخودا بسپێری؟ یاللاّ زوبەدی بڕۆ ئەو ژنە بپارێزە، تەواوی دێ هەڵڕژاونەتە سەری‌و دەیانەوێ بیکوژن، بەڵێ تەواوی دێ، شەرمیان بەخۆبێ. کوڕەکەی وەڵامی دایەوە: ((ئارام بە دایە هەر ئێستا دەچم)). ئەو لە تەواوی دونیادا لە هیچ کەسێ نەدەترسا جگە لە دایکی، هەر کاتێ کە دایکی بەتووڕەییەوە هێرشی دەکردە سەریەوە ترس تەواوی وجودی ئەوی داگرت، چوونکە هەستی دەکرد ئەو دەنگە وەحشیە دەنگی ئەو نییە، بەڵکو دەنگی کۆنینەو پڕ توندوتۆڵی قەومی سراییلە. یاکوب گەڕایەوە، بە هێمای سەری گوتیە هاوڕێکانی – فیلیپ، ناتانیل- ((بابڕۆین)) بەدەوراندەوری جەلیکانەکانی شەراب بەدوای یەهودا گەڕا بەلاّم ئاسنگەر ون بووبوو...

مەجدەلیە قیژەو هاواری بوو، خوێناوی‌و مالین کەوتبووەو سوچێکی چاڵەوە بازووەکانی دانابووە سەرسەریەوە تا بەردی پێ نەکەوێ، ژنان‌و پیاوان کاری خۆیان راها کردبوو بە دەوری چاڵەکەوە ئەڵقەیان دابوو...

پێدەکەنین سەبەتداروتری چنەکان، لەتەواوی رەزەکانی دەوربەردا دەستیان لەکار هەڵگرتبوو خەریك بوو دەگەیشتن، کوڕان بەتاسوقی دیتنی حاڵەتی خوێناوی‌و نیوەڕوتی ئەو لەشە ناودارەوەبوون‌و کچانیش بەخاتری ئەوەی کە نەفرەتیان لەو ژنە بوو ئیرەییان پێ دەبرد، بۆ، چوونکە مەززەی هەموو پیاوانی دەچەشت‌و ئەوانیش لە بێبەشبوونێکی تەواودا بوون، باراباس بەهێمای وەستان دەستی بۆ سەرەوە برد، دەیەویست بڕیارەکە جێبەجێ بکات‌و بەردباران دەست پێبکات، لە هەمان ساتدا یاکوب ئامادەبوو دەستیکرد بە پێشڕەوی کردن بۆ لای جانبازی سەرۆکی دزان، بەلاّم فیلیپ بەتوندی بازووی گرت‌و گوتی: ((بۆ کوێ دەڕۆی؟ ئێمەش بەمجۆرە بچین؟ ئێمە

کە لەپەنجەی دەست زێتر نین، لەبەرامبەر تەواوی خەڵکی دێ دەتوانین چی بکەین؟ بەڵام دەنگی وەحشی دایك لە گوێکانی یاکوب دا دەنگیدەدایەوە، هاواری کرد: ((ئاهای باراباس، ئەی مرۆڤکوژ، دیارە هاتویتە دێکەی ئێمە مرۆڤ بکوژی، زۆر باشە، واز لە ژن بهێنە، ئێمە خۆمان دەربارەی ئەوەوە حوکم دەدەین، ریش سپیانی مەجدەلو کفرناحومو هەروەها خاخامی ناصیرە دێنو دەربارەی ئەو بڕیاردەدەن ئەوە یاسایە.

زوبەدی پیر کە بەخۆیو خوترمەی سەنگینی گەیشتبوو، هاتە ناوقسەکانی کوڕەکەیو گوتی: ((هەق بەکوڕی منە، دروست دەڵێت، یاسا ئاووهایە، باراباس لەشی قەبەو زەبەللاحی خستنە جوولەوەو راستەوخۆ لەبەرابەریان وەستا هاواری کرد ((ڕیش سپیەکانی دێ بەرتیل بنو زوبەدیش هەروا، پشت بەوان نابەستم، یاسا منم، ئەگەر کەسێ لەئێوە زات دەکات با بێتە مەیدانو هێزی خۆی تاقی بکاتەوە. خەڵکی مەجدەلو کفرناحوم لەژنو پیاو بەدەوری باراباس ئاپۆڕەیان کرد، خوێن بەرچاوی گرتبوو، یەك فەوج کوڕ کە هەموویان چەکداربوون بەبەردەقانی گەیشتبوونە ئەوێکەوە. فیلیپ بازووی ناتانیل ی گرتو بۆ دواوەی کێشاوە، بۆ لای یاکوب گەڕایەوەو گوتی: ((کوڕی زوبەدی، ئەگەر مەردی خۆت بڕۆ پێشەوە، ئێمە لە شوێنی خۆمان ناجوڵێین مەگەر لێمان تێکچووە؟))

– ترسنۆکینە.. شەرم ناکەن.

– ناوەللاّ خۆت بڕۆ.

یاکوب رووی لە لای باوکی کرد، بەڵام ئەو کۆخیو گوتی: ((من پیرەمێردێکم)) باراباس لە کاتێکا قاقا پێدەکەنی گوتی: ((ها چی بوو؟)) سالومەی پیر کە خۆی دابووە بەر بازووی کوڕە بچووکەکەیەوە گەیشت، لەدوای ئەوان مێرێی ژنی یوسف، بەچاوانی بەفرمێسکەوە دەهات، یاکوب گەڕایەوەو دایکی بینی کەوتە لەرزەوە، مرۆڤکوژێکی ترسناکیان لەبەر دەمیابوو، هەروەها ئاپۆڕەی تووڕە هەڵگەڕوایێ گوندینیان بوونو لەدواییشەوە دایکی بوو، وەحشیو خامۆش. باراباس کە قۆڵی بۆ سەرەوە برد دوبارە کەوتە نەعرەتەوە ((چی بوو؟)) کوڕی زوبەدی لەبەرخۆ کەوتە



زەمزەمەوە ((سەریان شۆڕ ناکەم)) چووە پێشەوەو باراباسیش یەکسەر بۆلای هات. برای بچووکی کە هەولیدەدا بازووی دایکی بەردا تا بچێتە کۆمەگیەوە، گوتی: ((ئێستا دەیکوژێ)) بەڵام دایکی ئەوی پاشەکشە پێ کردو گوتی: ((تۆ ئارام بگرە دەخالەت مەکە)). بەڵام دروست لە هەمان ساتدا کە دوو خەنیمەکە دەیانویست تێکبئاڵێن لە شیرازەی دەریاوە هاوارێکی ئەڤینئەنگیز بەرگوێ کەوت ((خوداوەند وا خەریکە دێت)) گەنجێکی هەتاوەسووت لەبەردەم ئەواندا کەوتە هەڵبەزودابەزەوە، بەهەناسەربڕکێوە دەستی رادەتەکاندو هاواری دەکرد ((وا خەریکە خودا دێت)) هەموو بەدەوری گەنجیلەکە ئەلقەیان بەستاو هاواریان کرد (کێ خەریکە دێ.. کێ؟)) گەنجیلەکە وەڵامی دایەوە (خوداوەند) روی لە پشتی خۆی بەلای بیاباندا کرد: ((خوداوەند.. ئەوانیش)). هەمو گەڕانەوە، خۆرەتاو لە ئاوابووندابوو گەرما پاشەکشەی دەکرد، پیاوێ خەریك بوو لە کەناری دەریاچەوە بۆ سەرەوە دەهات، وەکو رەبەنی دێرێ، سەراپای سپی پۆشی بوو، گوڵە ژاڵەکانی کەنارشوێنی باردانانی دەریاچە غەرقی گوڵ بوون، پیاوەکراس سپیەکە دەستی درێژ کردو گوڵە ژاڵەیێکی قورمزی چنی نایە نێوان لێوەکانیەوە، دوومەلی دەریایی کەبەسەر تاوێرە بەردێکەوە دەهاتنو دەچوون، چوونە کەنارێکەوە تا ئەو بپەڕێتەوە، سالومەی پیر سەری سپی پرچی خۆی هەڵیڕی بۆنی هەوای کرد لە کوڕەکەی پرسی: ((ئەوە کێیە خەریکە دێت.. با گۆڕاوە.

کوڕەکەی وەڵامی دایەوە ((دایە ئارام بەوە، وا ئێستا پێدەکەوم، وا بیر دەکەمەوە کە خۆی بێ)).

– کێ؟

– هش شتێ مەڵێ.

– ئەی ئەوانەی لەدوایەوەن کێن؟ وای خودای گەورە یەك فەوج سەرباز بەدوایەوە رادەکەن.

– دایە ئەوانە فەقیرو فوقەرانە کە هێشووی هەڵڕژاوی باخەکان دەچنن، ئەوانە سەرباز نین مەترسە.

–لەڕاستیدا ئەوەبوو کۆنە پۆشێکی زۆر بەدوای ئەوەوە بوون، لەفەوجێ سەرباز دەچوون، ئەوان یەکسەر لەژنو پیاوو منداڵ خۆیان بە کیسەو سەبەتەوە پەرشوبڵاوی رەزە رنراوەکان بووبوونو کەوتبوونە گەڕانو سوورانەوە، هەموو ساڵێ لە کاتی هەڵگرتنەوەی بەرهەمی رەزەکانی ترێو زەیتوونو جۆخینەکان، ژمارەییێکی زۆر لە گەدا برسیەکان لە تەواوی شوێنەکانی –جەلیل- وەکو کلۆمسکە هەڵدەڕژێن، گەنمو ترێو زەیتونێ کە خاوەن زەویەکانی بەحوکمی شەریعەتی موسا بۆ هەژارەکانی جێ دێڵن کۆدەبنەوە. پیاوە سپیپۆشەکە لەپڕێکا لەجێی خۆی وەستا، دیداری ئاپۆڕەکە هەراسانی کردبوو، لەبەرخۆ گوتی: ((دەبێ لێرە بڕۆم، ئەوە دونیای مرۆڤەکانە من دەبێ بڕۆم، دەبێ بگەڕێمەوە بیابان. شوێنێ کە خودا لەوێیە)). جارێکی دیکەش سەرنویشتی بە تاڵەموێك بەسترابۆوە، بەکام رێدا بڕوات بۆ پێشەوە یا پاشەوە؟ هەموو ئەوانەی کە لەدەوروبەری چاڵەکەوە ئەڵقەیان بەستابوو، سەیری ئەویان دەکرد، یاکوبو باراباس بە قۆڵی بەرزەوەبوویان هێشتاکە لەبەرامبەر یەکتری دا وەستابوون، هەتا مەجدەلیەش سەری بەرز کردەوەو گوێی قولاغ کرد، ئەو بێدەنگیە نیشانەی چی بوو؟ مەرگ یا ژیان؟ بایەکە گۆڕابوو، لەپڕێکا لە شوێنی خۆی هەڵسایەوە، بازووەکانی خۆی بەرز کردەوەو هاواری کرد ((یارمەتی!)) پیاوە سپی پۆشەکە گوێی لە دەنگەکە بوو ناسیەوەو کەوتە لەرزەوە، بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((مەجدەلیە.. مەجدەلیە! دەبێ نەجاتی بدەم)) لە کاتێکا بازووەکانی کردبۆوە بەخێرایی بەرەو لای ئاپۆڕەکە چوو. هەرچەند زیاتر لە ئاپۆڕەکە نزیك دەکەوتەوە هەستی بەچاوانی تووڕەو خەشمینو شکەنجەبارو تاریکی سەرو پۆتەلاکی ئەوان دەکرد، دڵی بەجۆشتر دەبوو بوونی سەبارەت بە هاودڵیو ئەڤین دەکولا، لەبەرخۆ گوتی: ((خەڵکەکان ئەوانەن، هەموو برای یەکترن، بەڵام نازانن، لەبەر هەندێیە کە ئازار دەکێشن، ئەگەر بیانزانیبا چ جەژنو شادیەك بەرپادەبوو، چۆن یەکتریان لەباوەش دەکردو یەکتریان ماچ دەکرد، چ بەختەوەریەك دەبوو!)) لە ئەنجامدا گەیشت، چووە سەر تاوێرە بەردێکەوە، بازووەکانی بۆلای چەپو راست درێژ دەکرد، تەنها یەك وشە، یەك وشەی شادی



خولقێنو پیرۆزمەند لە قولایی گیانیەوە هەڵبەزیە دەرەوە ((**برایان**)) خەڵکەکە بەسەرسامیەوە سەیری یەکتریان دەکرد، کەسێ وەڵامی نەدایەوە هاواری پیرۆزمەند دووبارە دەنگی دایەوە ((برایان دڵخۆشم بەدیداری ئێوە)). باراباس بە هەڵگرتنی گاشەبەردێ لەسەر زەویەوە وەڵامی دایەوە ((خاچ دروستکەر ئێمە بەدیتنی تۆ دڵخۆش نین)). کەسێ بەهاوارێکی دڵبریندارەوە گووی (کوڕم)) مێرێ بۆ پێشەوە تاویداو کوڕەکەی لەباوەشگرت .. پێکەنیو گریا، ئەوی لاواندەوە، بەڵام ئەو بێ ئەوەی قسەیێ بکات بازووەکانی دایکی لە دەوری خۆی کردەوە بۆلای باراباس چووە پێشەوەو گوتی: ((باراباس ی برام بەدیداری تۆ خۆشنوودم من دۆستێکمو پەیامێکی شادی بەخشم پێیە)). باراباس نەڕڕاندی ((نزیکتر مەکەوە)) خۆی دایە پێش مەجدەلیە تا لەبەرچاوان ونی بکات، بەڵام ئەو دەنگی مەعبودی خۆی بیستو هەڵسایەوە سەرپێ، قیژاندی ((کریست.. یارمەتی)) کریست بە هەنگاوێ خۆی گەیاندە چاڵەکەوە، مەجدەلیە چنگی لە تاوێرە بەردەکان گیرکردو بە هۆی پەنجەو نینۆکەکانی خەریکی سەرهەڵگەڕان بوو. کریست لاربۆوەو دەستی درێژکرد، مەجدەلیە دەستی ئەوی گرت، سەرکەوتو بەخرۆشانو خوێناویەوە کەوتە سەر زەوی باراباس بۆ پێشەوە تاویداو پێی لەسەر پشتی ئەو دانا، لە کاتێکا بەری دەستی بۆ سەرەوە دەبردو نەڕڕاندی ((ئەو هی منەو دەمەوێ بیکوژم، حورمەتی شەموانی نەگرتووە، مەرگ بۆ ئەو!)) خەڵکەکە دڵیان توندبووبوو تا نەوەکا قوربانیەکەیان رابکات بەنۆبەی خۆیان هاواریان کرد ((مەرگ بۆ ئەو .. مەرگ بۆ ئەو)) زوبەدیش بە دیتنی کۆنەپۆشانی زۆرەوە کە بە دەوری تازە هاتووەکە ئەڵقەیان بەستابوو بێگومان کەللەی خۆیان بە ئەقیدەی سەد تایەك قاز پڕکردبوو هاواری کرد ((مەرگ بۆ ئەو!)) وای بە حاڵی ئێمە ئەگەر گەدا برسیەکان رێشمەیان بپسێ، بەخوترمەکوتینی زەویەوە دووبارە هاواری کرد ((مەرگ بۆ ئەو)) کریست بەری بازووی بەرزەوەبووی باراباسی گرت بە دەنگێکی ئارامو خەمگین گوتی: ((باراباس، تۆ خۆت هیچ کاتێ یەك لە فەرمایشتەکانی خودات لەژێر پێ نەناوە؟ لە تەواوی ژیانت دزیت نەکردوە؟ کەسێکت نەکوشتووە، زینات نەکردوە، درۆیەکت نەکردوە؟))

ئەو کاتە رووی لە ئاپۆڕە پڕ خرۆشەکە کردو یەك یەك سەیری کردنیو گوتی: ((لە میانی ئێوەدا ئەو کەسەی کە گوناهێکی نەکردوە با یەکەمین بەرد راوەشێنێ)) ئاپۆڕەی خەڵکەکە لەجێوە هەڵبەزیەوە، یەك یەکی ئەوان پێیان لەپاش نا لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە لە شەڕڕی ئەو تیژ نیگایە کە قوولاییی یادگاریو ئەندامەکانی ئەوانی دەپشکنی رابکەن، پیاوان تەواوی ئەو درۆیانەیان کە بەدرێژایی ژیانی خۆیان کردبوویان هێنایەوە سەر زمان، تەواوی ئەو ستەمانەیان کە لە هەقی ئەوانی دیکەدا ئەنجامیان دابوو لەگەڵ ژنانی تر هاوباوەش بووبوون، وەبیرخۆیان هێنایەوە ژنان چەفیەکانی خۆیان هەڵکێشایە سەر رووخسارو بەردەکانیان فڕێ دا، زوبەدی کە هەستی دەکرد هەر ئێستا ئەو ئۆباشە لە مەیدانەکەدا سەردەکەوێ، تووڕەبوو، جارێکی دیکەش کریست رووی لە مێرێ کردو یەك یەکی ئەوانی سەیر کرد.. نیگاییێ کە تا قولاییی دیدەکانیان دەچووە خوارەوە..

-لە نێوان ئێوەدا ئەو کەسەی کە گوناهی نەکردوە با یەکەمین بەردی خۆی راوەشێنێ!

زوبەدی پیر گوتی: ((من.. باراباس بەردێکم بدەرێ، ئەوەی کەحیسابی پاکە لە موحاسەبە بێباکە، من یەکەمین بەرد رادەوەشێنم. باراباس خۆشحاڵ بوو، بەردەکەی بەوداو خۆی چووە سوچێکەوە، زوبەدی بەسەرسەری مەجدەلیەوە وەستا، بەردی گرتە مشتو سوكو سەنگینی دەکرد، تا بەدروستی لەسەری بدات، مەجدەلیە لە کەنار پێی کریست دا خۆی گرمۆڵە کردو بێدەنگ بوو، هەستی دەکرد لێرەوە ترسێکی لەمەرگ نییە.

کۆنەپۆشەکان تووڕەبوونو سەیری زوبەدی پیریان کردو یەکێ لەوان کە لە هەموویان لاوازتر بوو خۆی هاوێشتە پێشەوە، هاواری کرد ((ئاهای زوبەدی خۆت دەزانی کە خودایێ هەیە، دەستت وشك دەکاتەوە.. ناترسێی؟ بیر لە رابردوو بکەوە، بزانە هیچ کاتێ هەقی هەژارانت هەڵنەقورتاندوە؟ هیچ کاتێ لە ژیانتدا نەبوویە هۆی ئەوەی رەزی هەتیوێ بە هەراج بچێ؟ هیچ کاتێ شەوانە پێت نەناوەتە ماڵی بێوەژنێ؟ گوناهکاری پیر وەك چۆن کە گوێی رادەگرت، هەستی بە کێشی بەردەکە کرد لە ناو دەستیداو زۆرترو زۆرتر گران دەبێ بەلاٌم بەسەر خۆیدا نەدەهێنا، لە پڕێکا هاواری



کردو بازووەکانی بەبێ ویستی خۆی بۆ خوارەوە شۆڕبوونەوە بەبێ سوود کەوت، گاشە بەردەکە لە مشتی گلۆربۆوەو کەوتە سەر پێیو ئەنگوستی شکاند.

کۆنەپۆشەکان هاواری شادیان سەردا ((پەرجو.. پەرجو! مەجدەلیە بێ گوناهە)) باراباس لە تووڕەییان شێت بوو، رووخساری خوریکەئاسای وەکو ئاگر سووربووەوە، بۆلای کوڕی مێرێ بازێکیدا، دەستی بەرز کردەوەو زللەییێکی پیاکێشا، بەلاٌم کریست بە ئارامی لایەکەی دیکەی رووخساری گرتو گوتی: **((برام باراباس زللەیەکیش لەم لایە بدە))**.

دەستی باراباس شل بوو، چاوانی لە گلێنە دەرپەڕین، ئەوە ئیدی چ جۆرە مرۆڤێکە.. تارمایی مرۆڤە یا هەرماس؟ ماتو مەبهوت پێی بۆ پاشەوە ناو روانیە کریست.

کوڕی مێرێ دووبارە ئەوی خستە شڵەژانەوە ((برام باراباس زللەیەکیش لە لایەکەی تری روومەتم بدە)) لەم سەینو بەینەدا، یەهودا لەژێر سایەی دارهەنجیرێ کە تەواوی ئەو ماوەیە وەستابوو سەیری دەکرد هاتە دەرەوە، ئەو هەموو شتێکی بینی بوو بەلاٌم قسەی نەکردبوو، کوشتنی یا نەکوشتنی مەجدەلیە بۆ ئەو سودێکی نەبوو، خۆشحاڵ بوو کە دەیبیست باراباسو کۆنەپۆشەکان رووبەڕووی زوبەدی وەستاونو گوناهەکانی بەڕوویا هەڵدەشاخێنن، لەو کاتەدا کریستی لە کەنار دەریادا بەجلی سپی بینی بوو، دڵی کەوتبووە خورپەوە، بەتیژکردنی گوێکانی بەزەمزەمەکردنەوەگوتبووی: ((ئێستا مەعلوم دەبێ ئەو کێیە، کاری چییەو پەیامی چییە؟)) بەلاٌم هەمان سەرەتا .. هەمان وشەی بەرایی (براکان) خۆش نەبوو لەچەشەیدا، دەمو چاوی گرژبوو، لەبەرخۆ کەوتە زێمارەوە ((هێشتاش یەك دەنکە ئەقڵ نەچۆتە ناو کەللەیەوە، نە، ئێمە هەموومان برا نین، سراییلیەکانو رومیەکان برا نین، هەتا سراییلیەکانیش لە میانی خۆیاندا برانین، (صەدوقیەکان) کە خودایان دەفرۆشتە رومیەکان، کوێخوا کە کاری قەیسەری رۆمی دادەپۆشی برایانی ئێمە نین، نە، کوڕی نەجار، کاری خۆت بە خراپ دەست پێکردووە، ئاگاداربە))، بەلاٌم بەدیتنی کریست کە لایەکەی تری رووخساری خۆی بەبێ تووڕەییو بەمیهرەبانیەکی سەروی مرۆیی گرتبوو، ترسو جودی داگرت، بەسەرخۆیا هاواری کرد ((ئەوە ئیدی چ جۆر مرۆڤێکە؟ ئەوە.. راگرتنی لایەکەی

دیکەی رووخساری، تەنها یەك فریشتە دەتوانێ ئەوکارە بکات، تەنها فریشتە، یا... یا سەگێ)) بەبازێ خۆی گەیاندە باراباس کە خەریکی شالاٚوبردن بوو بۆ سەر کوڕەکەی مێرێ، بەدەنگێکی کزەوە گوتی: ((دەستی لێ مەدە، یاڵلاٚ لێرە بڕۆ)) باراباس بەسەر سامیەوە سەیری یەهودای کرد، ئەوان ئەندامی یەك ئەنجومەنی برایەتی بوون.. بەتایبەت لەگەڵ یەکتر چەندین جار چوونەتە گوندەکانەوە، ئەوانەیان کوشتووە کە خەیانەتیان لە سراییل کردووەو ئێستا....

بەزەمزەمەوە گوتی: ((تۆش یەهودا..تۆ؟)) باراباس لە جێی خۆی تەکانی خوارد، یەهودا لە ئەنجومەنی برایەتی دا بالاٚدەست بوو، نەیدەتوانی سەرپێچی ئەو بکات، بەلاٚم لە لایەکی دیکەوە عیززەتی نەفسی نەیدەهێشت لەجێوە تەکان بخوات. ردێن سوور جارێکی دیکە بە ئەمر کردنەوە گوتی: ((بڕۆ)) سەرکردەی دزان سەری لەبەرخۆناو سەیرێکی وەحشیانەی کردە کوڕی مێرێو بەزەمزەمەوە لە کاتێکا مشتی خۆی کردبووە گرێ گوتی: ((ناتوانی خۆت لە چنگم قورتاربکەیت، دیسان یەکتری دەبینینەوە)). ئەو کاتە بەلای خەڵکی ژێر فەرمانی خۆیدا گەڕایەوەو بەمەیلێکی کەمەوە دەستوری پێدان ((یاللاٚ با بڕۆین))



## بەشی سێزدەهەم

خۆرەتاو خەریك بوو سەری لە یەخەی ئاسۆدا دەبردە خوارەوە، گەرمایی رۆژ دابەزی بوو با پاشەکشەی دەکرد، دەریاچە بەڕەنگی شینو ئاڵتونی دەبریقایەوە، چەند لەقلەقێك کە تێربوونیان بەسەر تاوێرە بەردەکانەوە بەسەر یەك قاچ وەستابوونو چاویان بڕیبووە ئاوی دەریاوە، کۆنەپۆشەکان چاویان بڕیبووە کوڕی مێرێەوەو لە چاوەڕوانیدا وەستابوون، نەیاندەویست لەوێ بڕۆن، ئایا ئەوان چاوەڕوانی چی بوون؟ برسیەتیو رووتو قوتی خۆیان لەبیر کردبوو، هەروەها ناپاکی خاوەن موڵکەکانیان، ئەوانەی کە فەرامۆشو سەرپێچیان کردبوو لە بەجێهێشتنی چەند چیلکە ترێیێ لە رەزەکان بۆ دەم شیرینکردنی هەژارەکان، ئەوان لە سپێدەوە لە رەزێ بۆ رەزێ چووبوونو سەبەتەکانیشیان هەر خاڵی بوو، هەمان ئەم جەرەیانەش لە دروێنەی گوندەکان روویدابوو، لە مەزرایێ بۆ مەزرایێ چوو بوونو جەواڵەکانیشیان خاڵی بوو، هەموو شەوێ مناڵەکانیان بەدەمی بەشەوەبوویان لە چاوەڕوانی ئەواندا دادەنیشتن، بەلاٚم ئێستێکە بەبێ ئەوەی بۆیەتیو چۆنیەتیو ئەوە بزانن، وا بەدیاردەکەوێ سەبەتەکانیان پڕە، سەیری پیاوە سپی پۆشەکەیان دەکرد کە لە بەرابەریانەوە وەستابوو نەیاندەتوانی دڵیان لەو هەڵکەنو جێی بهێڵن، لە چاوەڕوانیدا مابوونەوەو خۆشیان نەیاندەزانی لە چاوەڕوانی چیدان، کوڕی مێرێ بەنیگای خۆی وەلاٚمی نیگای ئەوانی دەدایەوە، ئەویش لە چاوەڕوانیدا راوەستابوو، هەستی دەکرد کە هەموو ئەو گیانانە بە گەردەنی ئەوەوە هەڵواسراون، چییان لەو دەویست؟ بەدوای چ شتێکەوە

بوون؟ ئەو کە هیچی نەبوو، دەیتوانی چ بەوان بدات، سەیری ئەوانی دەکردو دووبارە سەیری دەکردنەوە، بۆ ساتێ شەهامەتی خۆی لە دەستداو ویستی دووبارە رابکات، بەڵام شەرم رێی لێگرت، بەسەر سەری مەجدەلیەوە کە بە پێیەکانی ئەوەوە نووسابوو، چی روویدا؟ چۆن دەیتوانی ئەو هەموو چاوانەی کە بەتاسووقەوە دەیانڕوانییە ئەوەوە، هێور بکاتەوە رەها بکات؟ بەڵام بۆ کوێ؟ خودا لە هەموو لایەکدا هەیە، رستەی لوتفی خودایی هاوێشترابووە سەر گەردنیەوە، هەر شوێنێك کە وویستبای دەیبردە ئەوێکەوە، لوتفی ئەو نەك قودرەتی ئەو، قودرەتی هەموو توانای ئەو، کوڕی مێرێ ئێستاکە کە ئەو خاکەماڵی ئەوە، ماڵێکی دیکەی نەبوو، هەستی دەکرد ئەو مرۆڤانە بیابانی ئەوبوون، بیابانێکی دیکەی نەبوو. لەکاتێکا سەری خۆی کەچکردبوو، خۆی تەسلیمی عینایەتی خودا کردبوو بەزەمزەمەوە گوتی: ((خودایە خواست، خواستی تۆیە)) لەمیانی کۆنەپۆشەکان، پیرەمێردێ هەڵسایەوە سەرپێ‌و گوتی: ((کوڕی مێرێ ئێمە برسیمانە، بەڵام نانمان لە تۆ ناوێ، تۆش وەکو ئێمە هەژاری، دەمت بکەوەو وشەیێکی خۆشەویست ئامێزمان بۆ بڵێ‌و ئێمە تێر دەبین)).

پیاوێکی گەنج زاتی دایە بەرخۆو گوتی: ((زوڵم فشارێکی زۆری بۆ هێناوین، دڵی ئێمە زیاتر لەوە توانای بەرگەگرتنی زوڵمی نییە، تۆ گوتت وشەیەکی مەحەبەت ئامێزت هێناوە، ئەو وشەیەمان پێ بڵێ‌و دادویەکسانیمان بۆ بهێنە)). کوڕی مێرێ سەیری خەڵکەکەی کرد، گوێی لە دەنگی ئازادی‌و برسیەتی بوو ناوی حەقیقی خۆی بۆ یەکەمین جار بیست، کە چەند ساڵ بوو لە چاوەڕوانی ئەو دەنگەدا رونیشتبوو، هەمان ئەو دەنگەی کە ئێستا بەناو بانگی دەکات، بەبازووی کراوەوە روی لە خەڵك کردو گوتی: ((برایان با بڕۆین)) یەکجار وەك بڵێی ئەوانیش ساڵەهای ساڵە لەچاوەڕوانی ئەم بانگەشەیەدا دانیشتبوون‌و ناوی حەقیقی خۆیان بۆ یەکەمین جار بیست، دڵیان پڕ بوو لە خۆشی‌و هاواریان کرد: ((بەناوی خودا با بڕۆین)) کوڕی مێرێ لە پێشەوەو ئەوانەی دیکە لەوێنەی یەك لەش بەدوای ئەودا چوون، لە کەنار بەندەری دەریاچەکەدا، گردۆلکەیەکی چاڵدار بوو، سەرەڕای گەرمای ئاگراوی هاوین کە بەدرێژایی رۆژێ بەسەریا دادەباری، هێشتا بە رەنگێکی سەوزەوە رۆشن بوو، ئێستا لە هەوای دڵنەوازی ئاوابووندا کە پڕ لە گوڵە حاجیلەو پوونگی کێوی بوو، بەرزایی



گردەکە وادەهاتە بەرچاو زەمانێ پەرستگای بتپەرستان بووە، چوونکە چەند پارچەیێکی هەڵکەنراوو تاتەکە هێشتا لە شوێنی خۆی مابۆوە، ئەو ماسیگرانەی شەوانە لە دەریاچەدا ماسیگرییان دەکرد، بەردەوام تارماییێکی سەوزیان دەبینی کەبەسەر بەردی مەڕمەڕەوە دانیشتووە، هەتا یونس شەوێکیان بیستبووی کە بەردەکە دەگریت، ئێستا ئەوان بۆلای هەمان ئەو گردەوە دەڕۆن وەك بڵێی لە جیهانێکی کپ‌و بێدەنگدا بەڕێدەکەون، کوڕی مێرێ لە پێشەوەو خانەوادەی گەورە هەژارانیش لەدواوە...

سالومەی پیر رووی لە کوڕە بچووکترەکەی کردو گوتی: ((دەستی من بگرە، ئێمەش دەڕۆین)) پاشان دەستی مێرێی گرت‌و گوتی: ((مێرێ مەگری، مەگەر ئەو نووڕەت لەگەردی رووخساری کوڕەکەت نەبینی؟))

دایکەکە خەریك بوو هۆڕهۆڕ دەگریا وەڵامی دایەوە ((من کوڕم نییە، من کوڕم نییە، تەواوی ئەو کۆنەپۆشانە کوڕیان هەیەو من کوڕم نییە)) بەگریەو زارەوە بۆ لای گردەوە کەوتەڕێ، ئەو ئێستاکە گومانێکی بۆنەمابوو، کوڕەکەی بۆ هەمیشە ئەوی بەجێ هێشتبوو، لەو کاتەوە کە تاوی دابوو تا لە باوەشی بگرێت تا لەگەڵ خۆی بۆ ماڵێی بەرێتەوە، بەسەرسامیەوە سەیری دایکی کردبوو، وەك بڵێی نەیدەناسی، لەو کاتەش گوتبووی: ((من دایکتم بەڵام ئەو)) دەستی دەرهێناو ئەوی لەخۆی دوور خستبۆوە.

زوبەدی پیر ژنەکەی خۆی بینی کە وێڕای ئاپۆڕەکە بۆلای گردەکە دەچێ، بە پرتەوبۆڵەوە گۆپاڵەکەی دەست دایێ‌و رووی لە یاکوب‌و هاوڕێیانی کوڕەکەی فیلیپ‌و ناتانیل کردو هێمای بۆ ئاپۆڕە پڕ لە هەراو هەڵچوونەکە کرد:

((ئەوانە گورگی برسین! نەفرەت لە هەموویان بێت، باشتر وایە بەسەریانا هاوار بکەین، نەوەکا ئێمە لەجێی مەڕ بگرن‌و قورتمان بدەن، دەکەوینە دوای یەکتریەوە، وەلی فەرامۆش نەکەن، بەڵام ئەو کوڕەی ئاشی بایی مێرێ هەرچیەکی ویست بەوان بڵێن، ئێمە ئەو بەتان‌و تەشەرەوە بانگ دەکەین، گوێتان لێیە؟ نەوەکا لێگەڕێین کە دەست هەڵێنێ، یاڵلا هەموو لەگەڵ یەك بۆ پێشەوە بچین ...پەلەکەن)) بەگوتنی ئەو ووشانەوە، بەسستی وولاغێکی شەلەوە، ئەویش دەستی کرد بەسەرهەڵگەڕان بۆ

گردەکەوە، دروست لە هەمان ساتدا، دوو کوڕی یونس بەدیارکەوتن، پەترۆس بازووی براکەی گرتبوو بەنەرمیو ئارامییەوە قسەی لەگەڵ دەکرد، تا نەبادا تووڕەی بکات، بەڵام ئەوەی تر لە شڵەژاندا بوو، چاوی بڕیبووە ەو خەڵکانەی کە وەکو کلۆمسکە سەر هەڵدەگەڕانو پیاوە سپی پۆشەکە کە سەر قافڵەیان بوو. پەترۆس، لەیەهودای پرسی کە هێشتا لە کوچەدا وەستابوو توانای بڕیاری نەبوو ((ئەوان کێن؟ بۆ کوێ دەچن؟)) ردێن سوور بە ئاوازێکی تێز ئامێزەوە گوتی: ((کوڕی مێریەّ))

–و ئەو فەوجەی کە بەدوایەوەن؟

–هەژارەکانن کە هێشوە تریێ هەڵڕژاوەکانی دوای ترێڕنی کۆدەکەنەوە، ئەوانە بەیەك نیگا عاشقی سینەی پارەپارەی ئەو بووینە، وا بیردەکەمەوە دەیەوێ قسە بۆ ئەوان بکات))

–دەتوانی چی بڵێ؟ ئەو کە ناتوانێ هەتا یەك بەستە یۆنجە لە میانی دووکەر دابەش بکات.

یەهودا شانەکانی راتەکاندو بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((دەبینین)) ئەویش دەستی کرد بە سەرهەڵگەڕان بە گردەکەوە، دوو ژنی رەش پێست، ماندوو مردوو، لەڕەز دەگەڕانەوە، هەریەکەو سەبەتەییێکی گەورەیان لە تریێ بەسەرسەرەوە بوو، حەسوودیان بەلەگەڵ یەکبونی ئەوانی دیکەدا بردبوو بڕیاریان دا بۆ کات بەسەربردن خۆیان بگەیەننە ئەوانەوە، بەم بڕیارەوە، بۆ دواوە کەوتنە رێگاوە. یونسی پیر، تۆڕ بەسەر شانەوە، خۆی بۆلای کوختەکەی دەکێشایەوە، برسی بوو، بۆ گەیشتن پەلەی بوو، کە کوڕەکانیو ئاپۆڕەکەی بینی بەسەر گردەکەوە هەڵدەگەڕێن، بەدەمی کراوەوە وەستا چاوانی خڕکەلەو ماسی ئاسایی بڕیە ئەوانەوە، بیری لە هیچ نەدەکرەوە، لە خۆی نەپرسی کە کێ مردووەو کێ زەماوەندی کردووە، یاخود ئەو هەموو خەڵکە بۆ کوێ دەڕوات، ئەو بیری لە هیچ نەدەکردەوە، ئەو تەنها بەدەمی کراوەوە رامابوو، زوبەدی بانگی ئەوی کرد: ((وەرە یونس پەیامبەری ماسی با بڕۆین میوانداربە، وادیارە ...... زەماوەند دەکا وەرە با بڕۆین خۆش بگوزەرێنین)).



یونس لێوە قەبەکانی خستە جوولە، دەیویست شەکرێ بشکێنێ، بەڵام رای خۆی گۆڕی، بۆ جێخۆشکردنی کوڕی سەرپشتی شانەکانی راتەکاند، بە هەنگاوی سەنگین بۆلای کوختەکەی کەوتەڕێ، دوای ماوەیەك، کە لە ئەنجامدا لە کوختەکەیەوە نزیك دەکەوتەوە، زەینی لە دوای دەردی زایین لە ئەنجامدا زەینی بارەکەی داناو زا، بە زەمزەمەکردنەوە گوتی: ((زوبەدی کەرکەللە بڕۆ ونبە)) ئەو کاتە بە لەقە دەرگای کردەوە.کاتێ کە زوبەدیو هاوڕێکانی گەیشتنە بەرزایی گردەکەوە، کریست بەسەر تاتەکەوە چووارمێچك لێیدانیشت، هێشتا دەمی نەکردبۆوە، وابەدیارکەوت کە چاوەڕوانی ئەوان بوو، گەداییێکی زۆر رووبەڕووی بوون، پیاوەکان چووارمێچك بەسەر زەویەوە دانیشتن، ژنان لە پشتەوە وەستابوونو سەیری ئەویان دەکرد، خۆرەتاو دابەزی بوو، بەڵام کێوی (هەبەرون) لە لای باکوردا هێشتا هەتاوی لە ترۆپکی خۆی راگرتبوو مۆڵەتی راکردنی نەدەدا، کریست، بەو دەستانەی کە خاچئاسا بەسەر سینەی دانابوون، سەیری جەنگی نێوان نوورو زولمەتی دەکرد، جارناجار لەسەرخۆ نیگای دەکردە لای رووخسارەی خەڵکەکەوە،ئەو رووخسارانەی کە راستەوخۆ بەرەو لای ئەو وەرسووڕابوون، برسێتی، ئەو رووخسارە پڕ چینو چرکانە خەمگینو هەڵتەکاو، ئەو چاوانەی کە دەیانڕوانیە ئەوەوەو بە مەلامەت باریەوە سەیری دەکردن، وەك بڵێی ئامانجی سەرزەنشتی ئەوبوون.

هەر بە دیتنی زوبەدیو هاوڕێیانی هەڵسایەوە گوتی: ((بەخێربێن، هەموو بەدەوری مندا کۆببنەوەمن دەنگم ئەوەندە بەرزنییە، دەمەوێ قسەتان بۆ بکەم)) زوبەدی بەناونیشانی ئەوەی کە ریش سپی دێکە بوو لە پێش هەمووان کەوتە رێوە، خۆی وا کورماندە سەر بەرزایی بەردێکەوە لە لای راستیەوە هەردوو کوڕەکەیو هەروەها فیلیپو ناتانیل بوون، لە لای چەپیەوەش پەترۆسو ئاندریاس، سالومەی پیرو مێریەّی ژنی یوسف لە پاشتر لە میانی ژنەکانەوە راوەستابوون، مێریەّکەی دیکە.

- مێرێ لە کەنار پێیەکانی کریستدا کەوتبوو سەر زەویەوە، رووخساری خۆی لە میانی ئەژنۆکانی دا شاردبۆوە، یەهودا لە ژێر درەختی کاژی ئەشکەنجە چەشتوودا کە با هەڵیسۆڕاندبۆوە ناویەکەوە بۆ لایەك لاربوو بۆوە، لە چاوەڕوانی دا دانیشتبوو

چاوەشینەکانی لە میانی کەلێنی کاژەکەوە وەك خەنجەر لە کوڕی مێرێ دا دەچوونە خوارەوە. کریست بەنهێنییەوە لەرزی، لە هەوڵو تەقەلاّدابوو بۆ دۆزینەوەی شەهامەت، ئەوە ساتێ بوو، کە ساڵەهای ساڵ لە گەیشتنی دەترسا، ئەو زەمانە تازە گەیشتبوو، خودا سەرکەوتبوو بەزۆرو هێزەوە ئەوی بۆ شوێنێ کە خۆی دەیخوازی — رووبەڕووی مرۆڤەکان — هێنابوو، تا ناچاری بکات یان بەقسە بۆبکات، ئێستا ئەو دەیتوانی چی بەوان بێژێ؟ تۆزێ شادی ژیانی ئەو لەزەینیدا درەوشایەوە، ئەو کاتە خەمە بێ ژمێرەکانی: پێشبڕکێ لەگەڵ خودا، تەواوی ئەو شتانەی کە لە سەرگەردانیەکانیدا بینی بووی، کێوەکان، گوڵو پەڕەندەکان، ئەو شوانانەی کە مەڕێکی پەرتەوازەیان بەسەر شانەکانی خۆیانەوە هەڵدەگرت، ئەو ماسیگرانەی کە تۆڕی خۆیان بۆ راوکردنی ماسی دەخستە ئاوەوە، جوتیارانێ کە زەویان تۆ دەدا، دروێنەیان دەکرد، گەنمیان شەنەبا دەکرد، ئەوسا بەرهەمیان بۆ ماڵەکانیان دەبردەوە، ئاسمانو زەمین ناوەناوە لەناو زەینی دا دەکرانەوەو دادەخران، هەمووی پەرجوی خودا بوونو نەیدەزانی کامیان هەڵبژێرێ، دەیخوازی هەمووان ئاشکرا بکات تا ئەوانەی کە داناسەکنێن بیانسەکنێنێ، ئەو دونیایەی کە بۆ ئەو ئاشکرابووبوو، چیرۆکی پەریەکان خودابوو، پڕ لە شازادەو ئەفسانەبوو، دروست وەکو ئەو چیرۆکەی کەوا دایە گەورەی بۆی دەگێڕایەوە تا لە گریە بکەوێ، خودا لە هەیوانی ئاسمان لاربۆوەو ئەو چیرۆکەی بۆ مرۆڤەکانی دەگێڕایەوە. بزەییێکی هاتێو بازووەکانی کردەوە، بەدەنگێکی لەرزۆك گوتی: ((براکان براکان، لەمن دەبورن، کەبەزمان ی نمونە قسە بۆ ئێوە دەکەم، من مرۆڤێکی سادەو عامیو هەژارو بچووکم وەکو ئێوە، یەك سینەقسەم پێیە، بەلاّم زەینم هێزی گێڕانەوەی ئەوانەی نییە. دەمم دەکەمەوە بێ ئەوەی خۆم بمەوێ، وشە وەکو چیرۆك دەردەپەڕێ، برایانم لەمن دەبورن، بەلاّم بەزمانی نمونە قسەتان بۆ دەکەم خەڵك هاواریان کرد ((کوڕی مێرێ ئێمە سەراپا گۆیین)) کریست جارێکی دی دەمی کردەوە:

- جوتیارێ بۆ تۆدانی زەوی چووە دەرەوە، چوونکە زەوی تۆ دەدا، دانەیەك لەم تۆوە کە کەوتە سەر زەوی باڵدارەکان هاتنو خواردیان، دانەییێکی دیکە لەم تۆوە کەوتە سەر بەردەلاّنەوە هیچ خاکێکی نەدۆزیەوە تا بەسەریا نەشونما بکاتو وشك هەڵگەڕا، دانەی سێهەم لە میانی دڕكو داڵ دا رژاو درکو داڵ شین بوونو ئەویان شاردەوە، لە



ئەنجامدا دانەیەکی دیکە کەوتە سەر خاکێکی میهرەبان، رەگوڕیشەی گرتو گەلاّو بەرهەمی هاوێشتو پەڕوپۆی کردو گەنم بووە دادو قوتی مرۆڤ، هەریەکە لە میانی ئێوە کە گوێ رادەگرێ با بیبیستێ.

هەموو بێدەنگ بوون بە واق وڕماوی سەیری یەکتریان دەکرد، بەلاّم زوبەدی پیر کە بۆ بەهانەیەك دەگەڕا تا جاڕوجەنجاڵ بخاتە ئاراوە، گوتی: ((بەداخەوەم، بەلاّم تێنەگەیشتم، سوپاس بۆ خوا من گوێم هەیە دەبیستم، بەلاّم تێناگەم، دەتەوێ چی بڵێی؟ ناتوانی ئاشکراتر مەبەستەکەت بپێکی؟ خەندەییێکی گاڵتە ئامێزی کردو بە غرورەوە دەستی بەڕیشی سپی خۆی داهێناو پاشان گوتی: ((یا نەکا هەر خۆت بەسوتفە ئەو جوتیارەبیت؟))

کریست بەفروتەنیەوە وەلاّمی دایەوە ((بەڵێ من جوتیارم)) زوبەدی پیر بە گۆپاڵ کوتکردنی زەوی بەدەریخست: ((خوا بمانپارێزی، هەڵبەت دیارە ئێمەش بەردودڕكو مەزراین، کە تۆ تۆوی تیا بلاّو دەکەیتەوە، ها؟ )).

کوڕی مێرێ بەدەنگێکی نەرم وەلاّمی دایەوە ((بەهەمان شێوە)) ئاندریاس گوێی تیژکردبوو گوێی قولاّغ کرد، بە هەمان شێوە کە سەیری کریستی دەکرد دڵی وەکو ئاژەڵێکی وەحشی بەدیواری سینەی دەکەوت، لە یەکەمین دیداری یەحیای پاکشۆردا لە کەناری ئوردن تووشی هەمان حاڵ بوو، یەحیا پێستی ئاژەلاّنی لە خۆی وەرپێچاو خۆرەتاو ئازاری دەدا، نوێژ، شەونوێژی، برسیەتی وا کەوتبووە گیانیەوە کە لەودا جگە لە دووچاوی هیولا، دوو کلپەی داگیرساو — گەروێ کە هاواری دەکرد ((تۆبە بکەن ...تۆبە بکەن)) هیچی دیکەی نەمابوو، لەو کاتەی کە هاواری دەکرد: شەپۆلێکی مەزنو گەورە لە ئوردنەوە هەڵدەستا، کاروان دەوەستا، وشترەکان توانای بەرەو پێشەوەچوونیان نەدەما، ئێستاش لە رووبەڕووی ئەوا ئەوەکەی دی بوو کە بزەی دەکردو دەنگی ئارامو شەپۆلهێن بوو، مەلێکی مەبهوت بوو بۆ یەکەمین جار بوو دەیەویست بکەوێتە چەهچەوە، دڵی ئەندریاس لەمیانی کریستو یەحیادا بۆ پێشو پاش دەچوو باڵیدەگرتو تەواو واقی وڕما بوو.

هێدی هێدی، یۆحەننا لەتەك باوکی دوور دەکەوتەوەو لە کریست نزیك دەبۆوە چەند هەنگاوێك لە گەڵ کریستی نێوان نەبوو، کە زوبەدی ئەوی بینی بوو زیاتر لە جاران تووڕەتروو، ئەو لە دەست پەیامبەرە درۆزنەکان، دڵی پڕ خوێن بوو بوو، پەیامبەرە تازەکان، هەموو رۆژێکی ساڵ، بەسەر زەویەوە دەجۆشان باری زەویان دەهاوێشتە سەرپشتو هەریەك لەوان وەك بڵێی بە لەیەك گەیشتنێکی پێشتر دروست کراو تاویان دەدایە سەرخاوەن مولكو کاهینو پادشاکان، ئەوەی کە لەم دونیا توندو تۆڵو باش بوایە گەرەکیان بوو بێ بونیاتی کەن،ئەوە ئێستاش چاوم روون کوڕی پێ پەتی مێرێ!))

زوبەدی لەبەر خۆ گوتی: ((باشتر وایە هەر ئێستا کە گەنجو تەڕدەستە گەردەنی بشکێنم)) بۆ هەڵسانەوە بەنیشانەی هاندان گەڕایەوە تا بزانێ ئەوانی دیکە چی دەڵێن. یاکوبی کوڕە گەورەی خۆی بینی کە سەگرمەکانی خۆی تێکچڕژاندوە، بەڵام نەیدەزانی ئایا لەبەر پەریشانیە یاتووڕەیی، ژنەکەی خۆی بینی کە ئێستا هاتۆتە پێشەوەو چاوەکانی لە ئەشك دەسڕێتەوە، نیگای خۆی هاوێشتە لای کۆنەپۆشان، بە بینینی ئەوان زەندەقی چوو، ئەو هەموو گەدابرسیانە بەدەمی کراوە وەکو بێچووە مەلەکان کە دایکیان خۆراکیان پێدەدا چاویان بڕیبووە کرِی مێرێەوە، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمە کردنەوە ((هەی سەگ هەرچی گەدا برسیەکانە بخوات)) ئەوکاتە بەخۆی گوت ((باشتروایە بێدەنگ بم ئەگینا دەکەومە دەردەسەریەوە)) دەنگێکی نەرمو خەمەنگیز بەرگوێ کەوت، کەسێ کەلەبەر پێ ی کریستدا رونیشتبوو، دەستی بەقەسەکردن کردبوو، ئەوانەی کە لە دواوە دانیشتبوون، هەڵسانەوە تا ببینن کێیە، کوڕی بچووکی زوبەدی بوو، هێدی هێدی بۆلای پێیەکانی کریست خزی بوو، ئێستا وا ئەو قسە دەکات.

–تۆ جوتیاریو ئێمەش بەردەکان، دڕكو داڵو مەزراکان، بەڵام چ تۆوێکت لە دەست دایە؟ رووخساری تازەموو لێهاتووی گرٍی گرتبوو، چاوانی رەشو بادامی ئەو ئازارمەندانە دەیڕوانیە ئەوەوە، بەدەنی سپیو خزینی بە هەڵچوونەوە سەر هەڵگەڕابوو لەچاوەڕوانیدا مابۆوە، کریست بەمەبەستی بیستنی قسەی ئەو لاربۆوە، وەك چۆن گوێی دابووە دڵی خۆی لە هەوڵی ئەوەی کە قسەیێکی لەبار بدۆزێتەوە، قسەیێکی سادەو ئاساییو ناودار، چەند دانەیێکی ئارەقەی سپی بەسەر چەهرەیەوە هەڵنیشتبوو، کوڕی زوبەدی بەهەڵچوونەوە پرسیاری خۆی دووبارە کردەوە، ((چ تۆوێکت لەدەست دایە؟)) کریست بەیەکجار شێواو شەقو رەق وەستاو بازووەکانی کردەوەو بۆلای ئاپۆڕەکە لاربۆوەو هاوارێ لە قولایی گیانیدا پەڕوپۆی کرد ((**یەکتریتان خۆش بوێ- یەکتریان خۆش بوێ**)).

بەگوتنی ئەو قسەیە هەستی کرد کە لە پڕێکا دڵی خاڵی بوو، بەخەستەڕویی کەوتە سەر تاتەکەوە رازونیاز کەوتە سەرپێ، خەڵکی کەوتنە زەناوە، زۆرانێك لەوان سەریان راتەکاندو هەندێك پێکەینن، پیرەمێردێ کە گوێی گران بوو گوتی: ((چی گوت))

- گوتی: دەبێ یەکتریمان خۆش بوێ؟ پیرەمێرد کە خەریك بوو تووڕەببێ گوتی: ((**ناتوانرێ، ئەو کەسەی لەبرسان خەریکە تەلەف دەبێ، ناتوانێ کەسێکی ورگ پڕی خۆشبوێ، ئەوانەی قوربانی دەدەن ناتوانن جەللادیان خۆش بوێ، ناکرێ باشتروایە بچیتە ماڵەوە**)). یەهودا پشتی بەدارکاژدا بوو بەتووڕەییەوە دەستی بەردێنی قورمزی خۆی دادەهێنا بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((ئاوا کوڕی نەجار؟ ئەوە هەمان ئەو شتەیە کە هاتووی بە ئێمەی بڵێی؟ ئەوە هەمان پەیامی سەرسامهێنە کە بۆ ئێمەت هێناوە؟ داوا لە ئێمە دەکەی کە رۆمیەکانمان خۆشبوێ، وابیرت کردەوە ئێمە بە هەمان شێوە کە لایەکەی تری رووخسارت رادەگری، گەردنمان دەگرینو دەڵێین: برای ئازیز لوتفەن من بکوژە؟!.

کریست ئەو زەمزەمەیەی بیست، رووخسارێکی عەبوسو چاوانی سەرێکی بێ رەنگی بینیو تێگەیشت، تەڵخی تاوی دایە رووخساریەوە، بەوەبەرهێنانی تەواوی هێزی خۆیەوە هەڵسایەوە بەدەنگێکی مکوڕانەو پاڕانەوە ئامێز دووبارەی کردەوە (یەکتریتان خۆش بوێ، یەکتریتان خۆش بوێ، خودا مەحەبەتە، منیش وام بیردەکردەوە کە ئەو وەحشییە، منیش وام بیردەکردەوە کە کێوەکان بەهێمای دەستی ئەو دەبن بە دووکەڵو مرۆڤەکان لە بێن دەچن، لە دێردا خۆم پەنهان کرد تا رابکەم، کەوتمە سوژدەوەو لە چاوەڕوانی دا مامەوە، بەخۆمم دەگوت ((ئێستاکە ئەو دێ، ئێستا ئەو وەکو هەورە تریشقە دادەبەزێ)). رۆژێکیان سپێدە ئەو هات وەك چۆن شنەیێکی فێنك بەسەر

مندا هەڵیکردو گوتی: ((کوڕم هەڵسەوە)) من هەڵسامەوە. من هاتووم وا لێرەم)). دەستەکانی خاچئاسا بەسەریەکەوە دانا تا کەمەری لاربۆوە، وەك بڵێی ڕێرو نەوازش لەوانەی رووبەڕووی دەنێ، زوبەدی پیر لە کاتێکا گۆپاڵەکەی لە دەستیدا دەکوشی، کۆخەییێکی کردو تفێکی هاوێشت، بە تووڕەییەوە کەوتە زەمزەمەوە. ((خودا هەروەك شنەییێکی فێنك! چابلوس بڕۆ بۆ دۆزەخ)) کوڕی مێرێ لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو، ئەو ئێستاکە لەسەر بەردەکەوە دابەزی بوو، چووە ناو خەڵکەکەوە، بە پارانەوەو ئامێزەوە سەیری یەکە یەکەی ئەوانی دەکرد، دەچووە خوارەوەو دەهاتە سەرەوەو بازووەکانی بۆ ئاسمان دەکردەوە، دەیگوت ((ئەو باوکی ئێمەبوو،ئەو هیچ دەردێك بێ چارەسەریو برینێك بە بێ تیمار رەها ناکات، بەو ئەندازەی کە لە دونیادا ئازارو برسیەتی بکێشین، بەهەمان ئەندازەو زیاتریش لەبەهەشت تێر دەبین)) ماندوو بوو، گەڕایەوە لای سەرتاتەکەو دانیشت.

هاوارێ هەستا ((وەختێ کە من مردم بوونو نەبوونی بەهەشت وەك یەکە))، بەلاّم کریست لە خودا غەرق بوو بوو، نەیبیست.

ئێستا ئەو هاواری کرد ((خۆزگەم بە ئەوانەی کە برسیو تێنووی عەدالەتن)) لە ناو برسیە زۆرەکانەوە یەکێ تاویدایە ناو قسەکانی ئەوو گوتی: ((عەدالەت بەس نییە.. ئێمە نانمان دەوێ)). کریست بە هەڵکێشانی ئاخێکەوە گوتی: ((نانیش..نانیش، خۆزگە بەو کەسانەی کە برسیو تێنووی عەدالەتن، چوونکە ئەوان تێردەبن، خۆزگەم بە خەمگینەکان، چوونکە ئەوان بەهێز دەبن، خۆزگە بۆ هەژاران، مەزلۆمان، بۆ ئەوانە، بۆ ئێوەیە، ئێوە ئەی هەژارو خودان سەبرو مەزلومەکان کە خودا مەلەکوتی ئاسمانی ئامادەکردوە)).

دوو ژنی پێسترەش کە هێشتا سەبەتەکانی خۆیان بەسەر سەریانەوە بوو، بەخێرایی سەیری یەکتریان کرد، بێ ئەوەی وشەیێ بخەنە سەر زمان، سەبەتەکانیان هێنایە خوارەوە، یەکیان لە لای چەپو ئەویتر لەلای راست دەستیان کرد بەدابەشکردنی ترێ بەناو هەژارەکاندا، مەجدەلیە کەلەبەر پێی کریست کەوتبوو، هێشتا جورئەتی



نەدەکرد سەری بەرزکاتەوە، بەلاّم جارجارە بەشێوەییێکی نهێنی پێیەکانی مامۆستای ماچ دەکرد کە لە قژی نوقوم ببوون.

کاسەی سەبری یاکوب پڕبووبوو، کەوتە سەرپێو ئەوێ ی جێهێشت، ئاندریاس تووڕەبووبوو، خۆی لە چەنگی براکەی رەها کردو رۆیشتو بەرەو رووی کریست وەستا. هاواری کرد ((هەمان ئێستاکێ لە رووباری ئوردون، لە یەهودا دێمەوە، لەوێ پەیامبەرێ بانگەشەی ئەوە دەکات کە ((مرۆڤ ئاگرەزەنەو منیش ئاگرم، من هاتووم تا زەوی لە پۆخڵی بتاشمو رۆحی مرۆڤ لە ژەنگو ژاڵ پاك کەمەوە تا کریستیانو بێت)).

تۆ ئەی کوڕی نەجار تۆش وەعزی ئەشق دەدەی! بۆ نیگایێ ناکەیتە دەورەبەرت؟ هەموو شوێنێ پڕە لە درۆزنو ئادەم کوژو دز، هەموو ریاکارن- هەژارو دوڵەمەند، زاڵمو مەزلۆم، کاتیبانو فەریسیان- هەموو هەموو، منیش درۆزنم، منیش ریاکارم براکەم پەترۆسیش، زوبەدی، بەخۆیو ئەو ورگە گەورەی بەهەمان شێوە، ئەویش گوێی لە عەشق دەبێ، بیر لە قایغەکانو مرۆڤەکانی خۆی دەکاتەوە، ئێستا باشە ئەی چۆن تا دەتوانێ ئاوی ترێ لە راووك بدزێت)). زوبەدی پیر، بەبیستنی ئەو وشانەوە، تووڕەبوو، پشت ملە خەپڵەکەی وەکو ئاگر سووربۆوە، دەماری هەڵسا، گۆپاڵەکەی بەرز کردەوە هێرشی بردە سەر ئاندریاس، بەلاّم سالومە بازووی ئەوی لە کاتی خۆیا گرتو بەنەرمی پێیگوت: ((شەرمت بەخۆبێ.. شەرمت بەخۆ بێ. یاڵڵا بەڕێکەوە، بۆ ماڵەوە بگەڕێینەوە.

بە هاوارێکی بەرز بەشێوەیەك کە هەموو بیبیستن زوبەدی گوتی: ((هیچ گەداییێکی بێ سەرو پێ لێرە لە ناو موڵکی من ناتوانێ دەست هەڵبڕێ)). لە کاتێکا لە تووڕەیان لێوی کەفی کردبوو، بۆلای کوڕی مێرێ گەڕایەوەو هاواری کرد ((تۆش کوڕی دارتاش تۆ بۆ من دەوری کریستی موژدەهێن مەنوێنە، وای بەد بەحاڵت بێچارە، تۆش لە کۆتاییدا وەکو ئەوانی دیکە بە خاچ هەڵدەواسرێی، ئەو جۆرە گرفتانەت فەرامۆش دەکەی، بەلاّم من دڵم بۆ مرۆڤێکی بێ کەڵکی وەك تۆ ناسووتێ، دڵم بەو دایکە بەدبەختەت دەسووتێ کە تۆ کوڕی تاقانەی ئەوی)).

هێمای کرد بۆ لای مێریێ، کە خۆی لە زەمین کوتابوو سەری دەکوتایە بەردێ. بەلاّم تووڕەیی پیرەمێرد هێشتا نەنیشبۆوە، گۆپاڵی لە زەوی دەداو هاواری دەکرد: ((دەم لە ئەڤین وەردەدا، بەڵی هەموو بۆ پێشەوە، ئێوە هەموو بران لەبەر ئەمە فەرموو هەرچیت دەوێ هەڵیگرە، ماڵ بێ خاوەنە، بەلاّم چۆن دەتوانین دوژمنی خۆمان خۆش بوێ، مەگەر دەکرێ کە گەداییێکم خۆشبوێ لە دەرەوەی ماڵی مندا دێتو دەچیێو دڵی بۆ شکاندنی دەرگاو تالاّنکردنی من لێدەدا؟ دەم لە ئەشق وەردەدا، توخودا ئەو کەللەپوکە بن بەڕاستی بەڕاستی خودا لە باوکی ئەو ڕۆمیانە ببورێت گیرەم باکافربن، هەرچیەك بن خۆ نیزامیان ڕێکخستووە. گوفتاری زوبەدی بەرپەرچی برسیانێکی زۆری وروژاند، بەهاواری تووڕەو توند هێرشیان کردە سەر زوبەدی، یەهودا بەیەك هەڵقۆزینەوە لە ژێر کاژەوە خۆی گەیاندە ئاپۆڕەکە. سالومەی پیر زەندەقی چوو، دەستی لەسەر دەمی مێردەکەی داناو بێدنگی کرد، ئەو کاتە رووی لەلای ئاپۆڕەکە کرد، کە وەکو لافاوی خرۆشو ترس تا دەهات نزیکتر دەبوونەوەو گوتی: ((ڕۆڵەکانم قسەی ئەو بەهەند هەڵمەگرن، لە تووڕەییان شتێك دەڵێت، بەلاّم مەبەستێکی دیکەی هەیە)) سالومە هەروەها بە هێمای سەر بانگی کوڕەکەی کرد کە لەبەر پێی کریستدا بە ئارامیو خۆشحاڵیەوە دانیشتبوو گوتی: ((وەرە کوڕم.. هەوا تاریکە)) کوڕەکەی وەلاّمی دایەوە ((دایە دەمەوێ لێرە بمێنمەوە)) مێریێ خۆی بەسەر بەردەوە بەرز کردەوە، ئەشکی چاوانی پاك کردەوەو بە هەنگاوی لەرزۆکەوە بەرەو لای کوڕەکەی چوو تا لەگەڵ خۆی بۆ ماڵێی بەرێتەوە، دایکی بەدبەختی هەم لەبەر فیدای مەحەبەتی هەژاران لە کوڕەکەی ترسابوو، هەم لەبەر هەڕەشەکانی ریش سپیە سەروتمەندەکان، وەك چۆن کە دەڕۆیشت جارێ بەمو جارێ بەوانی دەگوت ((داوای کۆمەکتان دەکەم کە گوێلە قسەی ئەو نەگرن، نەخۆشە، نەخۆش.

بەترسو لەرزەوە لە کوڕەکەی وەنزیك کەوتەوە، ئێستاکێ ئەو خۆیو دەستە خاچئاساکانی وەستابوو، چاوی بڕیبووەدەریاچەوە، مێریێ بەنەرمی گوتی: ((ڕۆڵەم، وەرە، وەرە تا بچینەوە ماڵەوە)) کریست دەنگەکەی بیست، گەڕایەوە بەسەر سامیەوە سەیری ئەوی کرد وەك بڵێی بپرسێ ئەم ژنە کێیە؟ مێریێ لە کاتێکا دەستی لە دەوری کەمەری ئەو نابوو دووبارەی کردەوە ((وەرە کوڕم وەرە کوڕم، بۆ وا سەیرم دەکەی؟



مەگەر من ناناسی؟ من دایکتم، وەرە براکانت لە ناصیرە لە چاوەڕوانی تۆ دانو باوکی پیرت..)). کوڕە سەری هەڵتەکاندو بەئارامی گوتی: ((کام دایك ... کام دایك؟ دایكو براکانم لێرەن)) لە کاتێکدا دەستی هەڵبڕی بوو، هێمای بۆ ئاپۆڕەی کۆنەپۆشو ژنەکانیان دەکرد، بەتووڕەییەوە سەیری یەهودای قژ سووری دەکرد کە بە خامۆشی لەبەرابەر درەختی کاژەوە وەستابوو. ((و..باوکم)). ئەنگوستی بۆلای ئاسمان بەرز کردەوە ((باوکم خودایە)) چاوەکانی ئەو قوربانیە بەخت رەشەی هەورە تریشقەی خودا پڕ لە فرمێسك بوو ((هیچ دایکێ بیچارەتر لە من لە تەواوی دونیادا نییە؟ من یەك کوڕم هەبوو، ..یەك ئەویش ئێستا..)).

سالومەی پیر ئەو هاوارە دڵتەزێنەی بیست، مێردەکەی رەهاکردو گەڕایەوە دواوەبۆ لای مێریێ هاتو دەستی گرت، بەلاّم مێریێ سەرپێچی کردو دووبارە رووی لە کوڕەکەی کردو هاواری کرد ((نایەیت؟ ئەوە دواهەمین جارە کە بەتۆ دەڵێم وەرە!) لە چاوەڕوانی دا وەستا، کوڕە بێدەنگ بوو، سەر لەنوێ دیسان روی لە لای دەریاچە کردەوە...

–لە نەفرەتی دایك ناترسی؟

کوڕە بێ ئەوەی ئاوڕداتەوە وەلاّمی دایەوە: ((من لە هیچ شتێ ناترسم، لە هیچ شتێ جگە لە خودا)) تووڕەیی پەڕیە رووخساری مێریێەوە، مشتی خۆی بەرزکردەوە هەتا بۆ نەفرین کردن دەمی کردەوە، بەلاّم سالومەی پیر لە کاتی خۆی دەستی دانایە سەر لێویو گوتی: ((ئەم کارە مەکە)) ئەو کات دەستی نایە کەمەری مێریێو بەزۆری ئەوی راکێشایە دوای خۆیەوە ((کچم، مێریێ، وەرە، وەرە، بابڕۆین، دەمەوێ شتێ بەتۆبڵێم)). هەردوو ژن لە گردۆلکەکەوە بەرەو کفرناحوم سەرەو ژێربونەوە، زوبەدی پیری تووڕە لە پێشەوە دەڕۆیشت، بەگۆپاڵەکەی دەستی سەری دڕکەکانی دەپەڕاند، سالومە لەگەڵ مێریێ قسەی دەکرد((کچم مێریێ بۆ دەگریت؟ مەگەر ئەوانت نەبینی؟)) مێریێ بەسەرسامیەوە سەیری ئەوی کرد فرمێسکی خۆی قووتدا، پرسی ((چ شتێ؟)) لە کاتێکا ئەو قسەی دەکرد، چەند باڵێکی شین، هەزاران باڵی شینت لەدوای ئەوەوە نەبینی؟ مێریێ سوێند دەخۆم کە لە شکری فریشتەکان بوو، بەلاّم

مێریّ لە رووی نائومێدیەوە سەری خۆی تەکانداو بەزێمارەوە گوتی: ((من هیچم نەبینی.. هیچ شتیّ)).ئەو کاتە دوای وەستانێکی کورت درێژەی بە قسەکانی خۆیداو گوتی: ((سالومە فرشتەکان چ ئازارێکی من دەرمان دەکەن؟ من کوڕو نەوەم دەویّ...کوڕو نەوە..نەك فریشتەکان))، بەلاّم چاوەکانی سالومەی پیر پڕ لە بالّی شین بوو، لە کاتێکا دەستی هێنابووە پێشەوە، دەستی دایە سینەی مێریّو چرپاندیە گوێی مێریّ- وەك بلّێی رازێکی گەورە بۆ ئەو دەلّێت- ((مێریّ تۆ پیرۆز بوویت)) ((مێوەی رەحمی تۆ بۆتە موتفەرك)) بەلاّم مێریّ هەرگیز دانەدەکەوت.. سەری تەکانداو لەدواوە دەڕۆیشتو دەگریا. لە هەمان ئەم سەینو بەندا، کۆنەپۆشان بەتووڕەییەوە بە دەروری کریست ئەلّقەیان بەستا، ئەوان هەڕەشەیان دەکردو گۆپالّیان لە زەوی دەکوتاو سەبەتەکانی خالّی خۆیان لە هەوادا دەسووراند، هاواریان دەکرد ((مەرگ بۆ سەروەتمەندان، قوربانی قسەت بین، کوڕی مێریّ مەرگ بۆ دەولّەمەندان. کریست بە نائومێدی بازووەکانی خۆی تەکانداو هاواری کرد: ((من ئەوەم نەگوت، من ئەوەم نەگوت، گوتم، برایان، ئەڤین))، بەلاّم مسکێنەکان کە لەبەر کاریگەرێتی برسیەتی شێتو هاربووبوون، چۆن دەیانتوانی گویّ بگرن، ئەوان دەخرۆشان: ((هەق لای ئاندریاسە، یەکەمجار ئاگرو کولّێنگ پاشان ئەشق)) ئاندریاس کە لە کەناری کریست وەستابوو، ئەوەی بیست، بەلاّم سەری لە لاکی خۆی بردبووە خوارەوە وەلاّمی نەدایەوە، لەبەرخۆ دەیگوت ((هەر کاتیّ ئوستاد لە بیابان قسەی دەکرد، وشەکانی ئەو وەکو بەرد بەسەر سەری مرۆڤ دەهاتە خوارەوە، ئەوانی شەتو پەت دەکرد، بەلاّم ئەو پیاوەی لەکەناریا وەستا بوو، وشەکانی وەکو نان لە میانی خەلّك دابەشدەکرد. هەق لای کیّ بوو؟ کام رێگا، بەرێگەی زۆری یارێگەی موحەبەت کۆتایی بەرزگاری جیهان دێت؟ ئاندریاس لە کاتێکا ئەو بیرۆکانەی لە مێشکی خۆیدا کاوێژ دەکرد، هەستی بەدوو دەست کرد بەسەر سەری خۆیدا، کریست هاتە نزیکترو بە نەرمی ناو لەپی دەستەکانی دانایە سەر سەری ئەوەوە، ئەنگوستی ئارموش ئاسای واکشابوون کە لەبەر کاریگەرێتی وێککەوتن بەهەرشتیّ، لەباوەشیان دەگرت، ئێستا ئەو پەنجانە هەلّکشابوونە سەر تەواوی سەری ئاندریاسەوە، ئاندریاس تەکانی نەدەخوارد، هەستی کرد کە کەللەی سەری شەقی بردوەو شەهدیّ بە پاکیو سافی



هەنگوین لە شەقارەکانەوە هەلّدەڕێژێتە ژوورەوەو لە مێشکیدا دەچکێتەوەو دەگاتە دەمو گەردەنو ملیەوە، لەوێشەوە بۆ هەناوی سەرەوژێر دەبێتەوەو لەبنی پێدا گەلاّلە دەبیّ، تەواوی جەستەی تێر دەبیّ، لێوی نەدەبزاوت، چی دەبوو کە ئەو دەستانە هیچ کاتیّ بەسەر سەریەوە لانەچیّ، ئێستاکیّ دوای ئەو هەموو هەولّە، عاقیبەت هەستی بە ئاسایشو ئارامی دەروونی کرد. تۆزیّ دووررتر، فیلیپو ناتانیل، وەك دوو دۆستیّ کە جیابوونەوەیان نییە. لەگەلّ یەك لە گفتوگۆدا بوون.. پینەدۆزی لەندەهۆر دەیگوت: ((ئەوم خۆشدەویّ، وشەکانی دەلّێی شیرینی هەنگوینە، سەرزەنشتم مەکە کاتیّ کە گوێم لەو رادەگرت، لچو لێوی خۆم دەلستەوە. شوان رایەکی دیکەی هەبوو، ((من ئەوم خۆش ناویّ، گوفتارو کرداری یەك نییە، هاوار دەکات ((ئەڤین ..ئەڤین!)) لەو لاشەوە خاچ دروست دەکاتو لە خاچ دەدات)).

-فیلیپ، لێگەڕیّ با بەتۆ بلّێم کە ئیدی ئەوەی چوو چوو، دەبیّ ئەو قۆناخە قۆناخی خاچ تێپەڕینیّ، ئێستا ئەو قۆناخەی تپەڕاندوەو رێی خودای گرتۆتەبەر فیلیپ پیلەی لەسەر قسەی خۆی دەکرد ((من کارم دەویّ، بزنەکانم پسکەیان گرتووە. ئەگەر ئەوانی پیرۆزکردو چاکبوونەوە ئەوە باوەڕ بەو دەهێنم، دەنا خۆیو سندوقبارەکانی بچنە هەمانجێی کە خۆت دەزانی، بۆ سەرت رادەتەکێنی؟ باشە ئەگەر دەیەویّ دونیا رزگار بکات باشتروایە یەکەمجار لە بزنەکانی منەوە دەست پێبکات)).

پەردەی شەو، دەریاچەو رەزو رووخساری مرۆڤەکانی داپۆشی، هرسی گەورە لە ئاسمان بەدیارکەوت، لە ئاسۆی رۆژهەلاّتەوە ئەستێرەیێکی سوور هەروەکو دلّۆپە شەرابیّ لە بەرزایی بیابانەوە هەلّواسرابوو. کریست لە پڕێکا هەستی بە ماندوویيو برسیەتی کرد، گەرەکی بوو تەنها بێت، خەلّکی کەم کەم کەوتەوە یادی رێی گەڕانەوەو مالّەکانو منالّە بچووکەکانی خۆیان، کە لە چاوەڕوانی ئەواندا بوون. نیگەرانی رۆژانەی دووبارە بۆوەی ئەوان سەنگین هەلّگەڕا، رووداوی ئیمڕۆکە لە هەورەتریشقەییّ دەچوو، خۆیان سپاردە دەستی ئەم هەورەتریشقەوە، بەلاّم ئێستا بەرزبۆتەوەو چەرخی پێویستی رۆژانەیان دووبارە ئەوانی لە چەنگالّ گرتەوە، تاك تاكو لەگەلّ یەك وەکو پەیمان شکێنان دەردەپەڕین.

خەمباری کریستی داگرت، بەسەر بەردە مەڕمەڕیەکەوە راکشا، هیچ کەسێ دەستی خۆی بەناونیشانی خوداحافیزی بۆبەرز نەکردەوە، هیچ کەسێ دەربارەی برسیەتیو هەبوونی شوێنی بۆ ئەوەی رۆژی تیا بکەنەوە پرسیارێکیان لێ نەکرد، رووی لە لای زوڵمەتی شەو کردو لە گوێی لە چەند هەنگاوێکی بەپەلە بوو کە دادەکەوێ، ئەو کاتە ئیدی دەنگێ، لە پڕێکا بێدەنگی هەموو شوێنێکی داگرت، سەری هەڵبڕی، کەسێ نەبوو، سەیری دەوروبەری کرد تاریکی بوو، جگە لە ئەستێرەکانی ئاسمان، لە دەروونیا شتێ نەبوو جگە لە ماندووبوونو برسیەتی، دەیتوانی بۆ کوێ بڕوات؟ ئەڵقە لە دەرگای کام کوختە بکوتێ؟ دووبارە بەسەر زەویەوە چۆوە ناو خودی خۆی، هەستی بەسەرزەنشو ئازار دەکر، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە: ((هەتا ریویەکانیش لانەیەکیان هەیە تیایا بحەون، من لانەشم نییە)) چاوەکانی داخست، سەرما رەندانە وێڕای شەو هاتبوو، دەلەرزی، لە پڕێکا لە پشت بەردی مەڕمەڕەوە سەدای ناڵەو پاشان گریانێکی بەدزیەوە بیست، بەکردنەوەی چاوەکانی ژنێکی بینی، کە لە تاریکیدا بۆلای ئەو دەخزێ، کاتێ کە گەیشتە نزیکەوە، ئەڵقەی کەزیەکانی کردەوە، پێەکانی کە بەرد بریندariyan کردبوو پاك کردەوە، لە بۆنی عەتردا ژنەکەی ناسییەوە. لە کاتێکا دەستی لەسەر سەری گەرمو عەتراوی ئەو دادەنا گوتی: ((خوشکم مەجدەلیە، خوشکم مەجدەلیە، بگەڕێوە ماڵەوەت، چیتر گوناه مەکە)). مەجدەلیە بە ماچ کردنی پێیەکانی گوتی: ((برام کریست مۆڵەتم بدەرێ تا دەمی مەرگ بەدوای سێبەری تۆ بکەوم، ئێستا دەزانم کە ئەڤین چ مانایێکی هەیە)) کریست قسەی خۆی دووبارە کردەوە ((بگەڕێوە کوختەکەت، بەهاتنی کاتی موژدەهێن دێمە سۆراغیەوە))

–کوڕم دەمەوێ لەبەرپێی تۆدا بمرم

– مەجدەلیە حەوسەڵەت هەبێ، سەعاتی موژدەهێن دەگات، ئێستا نەگەیشتووە، بەگەیشتنی دێمە سۆراغت، ئێستا بڕۆ.

ژنە دەیەویست پەلپ بکرێ، بەلاّم دووبارە دەنگی ئەوی بیست ئەو جارە بە تەئکیدەوە ((بڕۆ!)) مەجدەلیە دەستی کرد بە دابەزین بەسەرتەپەوە، سەدای هەنگاوە سوکەکانی ئەو بۆ ساتێ دەکەوتە بەر گوێ، بەلاّم پاشان وردە وردە دەنگەکە بڕا ئیدی



شتێ جگە لەبۆنی عەتر لە جێی ئەوەوە نەما، بەلاّم شنەبای شەو هەڵیکردو ئەو عەترەشی لەگەڵ خۆیدا برد، کوڕی مێرێ ئێستا تەواو تەنهایە، لە بەرزایی ئەوەوە خودا بوو، خۆیو چەهرەی ئەبەنوسی شەوی کە ئەستێرەی تیادا پەرشو بلاّوکردبۆوە. کریست گوێکانی خۆی قولاّغ کرد، وەك بلێی دەیەویست دەنگێکی گوێ لێبێ لەم زوڵمەتە ئاوێتە بە ئەستێرەکانەوە، چاوی لەرێ ماوە، هیچ دەنگی نەبوو، ویستی زمانی بکاتەوەو لەو نادیارییە بپرسێ ((ئەی پەروەردگار ئایا لە من رازیت؟ بەلاّم زاتی نەکرد، گەرەکی بوو قسەی زۆر لەگەڵ خودای نابینراو بکات، بەلاّم زاتی نەکرد، لەو سکوتە لەنکاوەدا کە ئەوی گرتبوە خۆیەوە ترسابوو.

لە کاتێکا لەبەرخۆ دەلەرزی بەخۆی گوت((هەڵبەتە خودا لەمن رازی نییە، بەلاّم پەروەردگارا چ کەسێ موستەحەقی سەرزەنشتە؟ چەندین جار بە تۆم گوتوە من ناتوانم قسە بکەم، بەلاّم تۆ منت زیاترو زیاتر بۆ پێشەوە رادا، جارێ بەخەندە جارێ بە تووڕەیی، ئەمڕۆ بەیانیش لە دێردا، ئەو کاتەی کە رەبەنەکان بەدواوەم بوون تا بمکەنە عابید- هەرچەندە کە شایان نیم-و تەواوی دەرگاکانیان کلۆم دابوو تا رێ لە راکردنم بگرن تۆ دەرگاییێکی داپۆشراوی بچووکت نیشاندام، پەنجەکانت حستە ناو قژمو منت هاوێشتە ئێرەو بەردەم ئەو ئاپۆڕەیە، فرمانت بە مندا ((قسەبکە! زەمانی موژدەبەخش گەیشتووە)). بەلاّم من بەتوندی لێوەکانم خستە سەریەكو شتێکم نەگوت، تۆ هاوارت کردو من شتێکم نەگوت عاقیبەت کاسەی سەبرت پڕبوو، تاوت دایە پێشەوەو دەمت کردمەوە، من دەمم نەکردەوە، تۆ بەزۆری کردتەوە، دەمم بەو شێوەی کە شێوەی تۆ لەگەڵ پەیامبەرانە نەك لەگەڵ پشکۆی سوتێنەر کە بەهەنگوێنێ پیرۆزت کرد من قسەم کرد، دڵم تووڕە بوو منت ناچار کرد هاوار بکەم ((خودا ئاگرە)) بەڵی دروست وەکو پەیامبەری پاکشۆرت.

–((خودا ئاگرە .. ئەو وادێت. ئەی مرۆڤانی بێ یاسا، بێ عەدالەت، بێ نەجابەت خۆتان لە کوێ دەشارنەوە؟ ئەو دێت)). بەلێ دڵم منی ناچار کرد، کەوا هاوارم بکەم ((عەشق عەشق)) بەزەمزەمەوە گوتی: ((خودایە، خوداوەند، ناتوانم لەگەڵ تۆدا دەستەو یەخەبم، ئەمشەو چەکم دادەنێم، خواستی تۆیە)).

بەگوتنی ئەو ووشانە هەستی بەئارامی کرد، وەك پەرەندەییێکی خەواڵو سەری لەبەر پەڕی باڵەکانی نا، چاوەکانی داخستو خەوت، هەرزوو بێدرەنگ وای هاتە بەرچاو کە سێوێ لە ژێر کراسی دا هاتە دەرەوە، دولەتی کرد، ناوکەکەی لێ دەرهێنان لە بەرامبەر خۆیدا چاندی، یەکسەر پشکوت، لە میانی زەویدا سەری دەرهێنا، قەدی گرت لقو پۆپی کردو گوڵێ دا پاشان گوڵەکان بوون بە میوەو سەدان سێوی سوور...

بەردەکان بەیەك کەوتن، دەنگی پێی پیاوێ کەوتە بەر گوێ، خەو لەسەری کریست پەڕی، پیلوەکانی کردەوە، بینی نەفەرێ لەبەردەمیا وەستاوە، خۆشحاڵ بوو کە ئیدی بەتەنها نییە، بە ئارامیو بە زمانی بێ زمانی بەخێرهاتنێکی گەرمی ئامادەبوونی ئەو پیاوەی کرد، میوانی شەوگەڕ هاتە پێشو چۆکی دا گوتی: ((هەڵبەت برسیتە، بۆ تۆ نانو هەنگوینم هێناوە)).

برام تۆکێی؟

–ئاندریاس کوڕی یونس.

–ئەوان هەموویان منیان جێ هێشت، بەڵێ دروستەکە من برسیم، چۆنە برام، کەتۆ کەوتیە یادی منەوەو نانو هەنگوینو ماسیت بۆ هێناوم- نیعمەتەکانی خودا؟ هیچ کەموکووڕیەك جگە لە قسەییێکی میهرەبان شتێکی دیکە نییە.

ئاندریاس گوتی: ((ئەویشت بۆ دەهێنم)).

تاریکی هێزی بەدڵی ئەو دەدا، کریست ئاگای لە دەستی لەرزانی گەنجەکە نەبوو، هەروەها ئەو دوو دڵۆپە فرمێسکەی سەر گۆنا بێرەنگەکانی ئەوی نەبینی، کریست لە کاتێکا دەستی بەلای ئەودا گرتبوو پێدەکەنیو گوتی: ((یەکەمی ئەو، یەکەم قسەی میهرەبان))

کوڕی یونس بەزەمزەمەکردنەوە گوتی:

((ئەی ئوستادی رەببانی من)). لاربۆوەو پێیەکانی ئەوی ماچ کرد.



## بەشی چواردەم

زمان نە لە مەزراییێ دەچێ تا بتوانین بەدار ئەندازەی بگرینو نە لە دەریاییێ دەچێت تا بتوانین رووبەرەکە بە مەتر بپێوین، زمان خورپەی دڵە، ئەو دەستگیرانێتیە چەند درێژەی کێشا، رۆژانو مانگانو ساڵان؟ کوڕی مێرێ، سەرخۆشو میهرەبان بوو، بەقسەی باشی سەرزمانی لە گوندێکەوە بۆ گوندێ، لە کێوێ بۆ کوێ یا بە قایغ لە کەنارێ دەریاچەیێ بۆ کەناری دەریاچەییێکی دیکە دەچوو، وەکو زاوا، جلێکی سپی لەبەر دابوو، هەرکە پێی هەڵدەگرتو هەر زەمینێ کە بەسەریدا چووبوو گوڵباران دەبوو، لەوکاتانەی کەسەیری درەختەکانی دەکرد، پڕ لە شکۆفە دەبوون، لەو ساتەی کەپێی دەنایە ناو کەشتییێکی ماسیگری بایێکی لەبار چارۆگەی پڕ دەکرد، خەڵك گوێی لێ رادەگرتو گڵی وجودیان دەبوو بەباڵ، لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە ئەو دەستگیرانییە درێژەی دەکێشا، ئەگەر بەردێکت هەڵدەگرت خودات لەژێریا دەدۆزیەوە، ئەگەر ئەڵقەیەکت لە دەرگا کوتابا، خودا ئەوی بە ڕووتا دەکردەوە، ئەگەر سەیری چاوانی دۆست یا دوژمنت دەکرد خودات دەبینی کە لە گلینەی چاو دانیشتووەو بەڕووتا پێدەکەنی. فەریسیەکان بە تووڕەیی سەریان رادەتەکاند، چاویان لە چاوی ئەو دەناو بەسەرزەنشت کردنەوە دەیانگوت ((یەحیای پاکشۆر رۆژو دەگرێتو دەگریت، ئەو دەترسێنێو پێناکەنێ، بەلاّم تۆ لە هەرکوێ کە زەماوەند هەیە، پێشی هەموو خەڵك ئامادەدەبی، لەگەڵ ئەوانی ترا دەخۆیو دەخۆیتەوەو پێدەکەنی هەمان چەند کاتێ لەمەوبەر لە مەراسیمی زەماوەندێ لە کانا شەرمت نەدەکرد لەگەڵ کچە جاحێڵەکان پێدەکەنی، کێ بیستویەتی پێغەمبەر پێبکەنێو

سەما بکات؟))، بەڵام ئەو بە بزەییێکەوە دەیگوت: برایانم فەریسیەکان من پەیامبەر نیم، من زاوام)). فەریسیەکان کفری دەبوونو لە کاتێکا خەریکی هەیتوهوتی دادڕانی یەخەی خۆیان دەبوون دەیانگوت ((زاوا ؟!))

– بەڵێ برایانم زاوام، ببورن لە من، بەڵام ڕێگاییێکی دیکەم بۆ ڕوونکردنەوە نییە بۆ ئێوە.

کریست ئەو کاتە ڕووی لە هاوڕێکانی یۆحەننا، ئاندریاس، یەهوداو ماسیگرو ڕێنجبەرەکان دەکرد، کە شێتو شەیدای ڕووخساری دولبەری ئەوبووبوون، کاری خۆیان بەپەلە جێدەهێشت، هاتبوون تا گوێ بدەنە قسەکانی ئەوەوە، ژنانێ کە خۆیانو مناڵی شیرەخۆرەی باوەشیانەوە هاتبوون، بەدیاردەکەوتو بە ئەوانی دەگوت:

((مادامەکێ زاوا لە میانی ئێوەیە، شادیو هەڵپەڕکێ بکەن. ڕۆژانێ دێ کە ئێوە هەتیوو بێوە دەبن، بەڵام پشتتان بەباوك ببەستن، سەیری مەلی ئاسمانان بکەن، چاو بخەنە سەر گوڵەکانی سەر زەوی، ئەوانە نەدەڕێسنو نەدەچنن، بەڵام کاك شاهێ دەتوانێ خۆی بە شکۆمەندیو گەورەییەوە بەوان بڕازێنێتەوە؟ ئەندێشەی لەشی خۆی دەکات کە چ بخواتو چ بخواتەوەو چ لەبەر بکات، جەستەی ئێوە خاکەو دەگەڕێتەوە بۆ خاك، دیقەتی خۆتان بدەنە مەلەکوتی ئاسمانو ڕۆحی جاویدانی خۆتان)). یەهودا گوێی لەو رادەگرتو سەگرمەکانی تێکدەچرژان، ئەو لە قەیدی مەلەکوتی ئاسمان نەبوو، هۆشو فیکری پەیوەست بوو بە مەلەکوتی زەوی، ئەویش نەك تەواوی زەوی، بەڵکو تەنها سەرزەمینی سراییل، کەلە مرۆڤو بەرد دروست کرابوو، نە لە ڕۆژو هەور، ڕۆمیەکان ئەو ڕۆمیە بەربەرو کافرانە، ئەو سەرزەمینەیان پێلاقەکوت کردبوو، سەرەتا دەبوایە ئەوانە دەرکرێنە دەرەوە، ئەو کاتە دەتوانین نیگەرانی مەلەکوتی ئاسمان بین. کریست لە تووڕەیی یەهودا بە خەبەر بوو، لە لۆچەکانی توێڵی بیرۆکەی پەنهانی ئەوی دەخوێندەوە، بە پێکەنینەوە بەوی دەگوت:

((برام یەهودا، برام، ئاسمانو زەمین یەکن، بەردو هەوریش، مەلەکوتی ئاسمان لە هەوا نییە لە دەروونی ئێمەدایە، دەروونی دڵمان، من دەربارەی ئەو قسە دەکەم، دەربارەی دڵ،دڵت بگۆڕەو ئاسمانو زەوی یەکتر لە باوەش دەکەن، سراییلیەکانو رومیەکان یەکتر لە باوەش دەکەنو دەبن بەیەك))، بەڵام ڕدێن سوور تووڕەیی خۆی لە دڵدا ڕادەگرت،



دەربارەی ئەوە رادەماو خۆی ناچار دەکرد کە سەبور بێتو لە چاوەڕوانیدا بمێنێتەوە، لەبەرخۆ زەمزەمەی دەکرد ((ئەو نازانێ دەربارەی چی قسە دەکات، ئەو لەدونیای خەیاڵی خۆیدا دەژیت، بچووکترین هاگایی لە ڕووداوەکانی دەوروبەری خۆی نییە، دڵم لە حاڵێکا دەگۆڕێ کە جیهانی دەوروبەرم بگۆڕێ، تەنها لە حاڵەتێ ئارامیم وەبەردێت کە ڕۆمیەکان لەسەر زەوی سراییل دەخزن، ڕۆژێکیان کوڕی جحێڵتری زوبەدی، ڕووی لە کریست کردو گوتی: ((مەولام لێم ببورە، بەڵام بەوە گەیشتم کە ناتوانم یەهودام خۆش بوێ، هەرکاتێ لەو نزیك دەبمەوە هێزی تاریکی لەبەدەنیا وەکو هەزاران سوژنی ورد دەردەپەڕنو برینداربم دەکەن، چەند ڕۆژێ لەمەوبەر، لەکاتی خۆراوابووندا، فریشتەییێکی ڕەشم بینی کە شتێکی دەچرپاندە گوێی ئەوەوە، دەزانی چی دەگوت، کریست بە هەڵکێشانی ئاخ گوتی: ((دەتوانم تەخمینی بکەم کە ئەو چی دەگوت)).

– توخدا چی دەگوت. من دەترسم.

– لە کاتی خۆی تێدەگەی، هێشتا خۆشم بە دروستی نازانم.

– بۆ ئەو لەگەڵ خۆت دەبەی؟ بۆ مۆڵەت دەدەی کە شەوڕۆژ بەدوای تۆوە بێ؟، بۆهەرکاتێ کە قسە لەگەڵ ئەو دەکەی، دەنگت میهرەبانترە لەو کاتەی لەگەڵ ئێمە قسە دەکەیت؟

– یۆحەننا برام، دەبێ وابێ، ئەو پێویستی زیاتری بە مەحەبەت هەیە. ئاندریاس دڵی بە ئوستادی نوێ بەستایەوە، ڕۆژ بەڕۆژ بۆ ئەو دونیا دەگۆڕا، دڵنەوازتر دەبوو: دونیا نا.. ئیدی دڵی ئەو. خواردنو پێکەنین گوناه نەبوو، زەوی لەژێر پێیەکانیدا توندتر دەبوو، ئاسمان وەك باوکێ بەسەریدا لاربۆوە، ڕۆژی خودا ئیدی ڕۆژی تووڕەبوونو قامچی نەبوو،بەڵکو ڕۆژی خەرمان هەڵگرتنەوەو ترێچنیو زەماوەندو هەڵپەڕکێ بوو،: رابوونەوەی هەمیشەیی پاکیزەیی زەوی بوو، هەموو سپیدەیەك نەوازشێ بوو، لە هەردەرکەوتنێکی خۆرەتاودا خوداوەند وادەی خۆی بەسەر بنەمای ڕاگرتنی دونیا لە ناو لەپی قودسی خۆیا نوێ دەکردەوە، بە ڕابردنی ڕۆژان، ئاندریاس ئارامی دەبۆوە، وادەی خۆشەویستی لەگەڵ خەندەو خۆراك دەبەستاو گۆناکانی سوور دەبۆوە، شەوانە لە کاتی نیوەڕۆ، کە لە ژێر درەختەوە خۆراکی لم دەدا، یا لەو کاتانەی

کە هاوڕێکانی داوەتیان دەکردو کریست بەشێوەیەکی ئاسایی نانەکەی پیرۆز دەکردو دابەشی دەکرد، ئاندریاس ئەو نانەی دەخواردو دەزگای هەرس کردنیشی یەکسەر دەیکردە عەشقو خەندە، بەلاّم جاروناجار لەوکاتەی کەدەکەوتەوە یادی خانەوادەو هاوڕێکانی، ئاخی هەڵدەکێشا، رۆژێکیان لە کاتێکا چاوەکانی بۆ دوور هەتەر کردبوو، لە کریستی پرسی ((چی بەسەر یونسو زوبەدی دێت؟)) وەك بڵێی ئەم دوو پیرەمێردە لەوپەڕی دونیا دابن ((ئەی یاکوبو پەترۆس چۆن؟ ئەوان لە کێن، لە چ دەوروبەرێکەوە ئێستی ئازار دەکێشن؟)) کریست بە بزەییێکەوە وەلاّمی دایەوە ((هەموویان دەدۆزینەوە، هەریەك لەوانیش بەدوای ئێمەدا دەگەڕێن، ئاندریاس خەمگین مەبە، حەوشەی باوك ئەوەندە فراوانە کە هەموو جێیان تیا دەبێتەوە)) رۆژێکیان عەسر کریست چووە ناو (بیث صیدا) منالاّن لقەکانی زەیتوونو گەلاّی خورمایان بەدەست گرتبوو بەڕاکردنەوە دەچوونە پێشوازی، دەرگاکان کرانەوە، ژنان هاتنە دەرەوەو، کاری خۆیان بەرەلا کردبوو کەوتنە دوای ئەوەوە، تا قسەی چاکیان گوێ لێ بێ، کوڕان، دایك باوکی نەخۆشی خۆیان لە پشتی دەکردن نەوەکان دەستی باوە گەورەی کوێری خۆیان دەگرت، پیاوانی زلبازوو جنۆکە لێدراوەکانیان بەدوای خۆیان رادەکێشاو بەدوای ئەودا رایان دەکرد تا دەست بەسەری ئەوان دابهێنێو شەفایان پێ ببەخشێ. ئەز قەزا ئەو رۆژە رێکەوتی کاتێ بوو کە کۆماسی دێوەرە بە ناو دێهاتەکانەوە دەستی بە گەڕانو سووران کردبوو، لە حالێکا لە ژێر باری غریلەو، شانەو کەل وپەلی ئارایش، بازنی بڕۆنزی، گوارەی نوقرەی بەلادادەهات، کەرەنای خۆی دەژەنیو کەلو پەلی خۆی جاڕ دەدا، کریست ئەوی بینی، لە پڕێکا باییێك بەسەر تۆماسدا هەلێکرد، ئیدی تۆماس بێورە هەمان ئەو تۆماسە چڕوچاوەنەبوو، یەك تەرازوی دارتاشی لەدەست گرتبوو لەکیشوەری دوورەوە خەلّکی دەورەیانداوبوو، کارگەران بەردو چیمەنتۆیان دەکێشایەوە، بناغەی پەرستگاییێکی گەورەیان دادەڕشت، ستوونەکانی لەمەڕمەڕبوو، بەناونیشانی کارفەرما خۆیو ترازوەکانی بۆ ئەملاو ئەولا رایدەکرد کاری ئەوانی دەنرخاند، کریست چاوی وەرسووراند، تۆماسیش لە پڕێکا خۆی لەگەڵ ئەوانی دیکەو کەلو پەلەکانیەوە لەبەرابەر کریست دۆزیەوە، چاوە وردو لەوچەکانی خۆی هەڵسووراند. کریست دەستی لەسەر سەری داناو گوتی: ((تۆماس



وەرە لەگەڵ من کەلوپەلی دیکەت پێدەم، زێڕو زیوەری رۆح: ئەوکاتە دەچیە دەوری دونیاو کەلو پەلی تازەی خۆت جاڕدەدەیو لە میانی مرۆڤدا دابەشیان دەکەیت.

– دێوەرەی حیسابگر بەخەندەوە گوتی: ((وای بە چاکدەزانم یەکەمجار ئەوانە بفرۆشم، پاشان ئارام دەگرم بزانم چ دێتە پێش، دەنگی خۆی بەرزکردەوەو دووجار دەستی کرد بە جاڕدانی، شانە، غریلەو کەلوپەلی رازاندنەوە، یەکێ لە ردێن سپیە دەولّەمەندەکانی دێ کە ستەمکارو نانەجیب بوو، لە دەرگای ماڵی خۆی وەستاو بە بزۆزیو هەشتاوی دەیڕوانیە ئەو ئاپۆڕەیەی کە نزیك دەبۆوە، منالێکی زۆر لە پێشەوە رایاندەکردو گەلاّی خورماو لقی زەیتووینیان لە دەست دابوو لە هەوادا رایاندەتەکاند، لە دەرگاکانیان دەداو هاواریان دەکرد ((وادێت.. وادێت کوڕی داود وادێت)). لە پشتیانەوە پیاوێ دەهات جلێکی سپی لەبەردابوو، قژی شۆڕ بووبۆوە سەرشانی، بە ئارامیو بزەوە دەستەکانی بەڕاستو چەپ درێژ دەکرد، وەك بڵێی مالەکانی پیرۆز دەکرد، مەردانو ژنانێ کە لە پشت ئەوەوە رایاندەکرد بۆ ئەوەی دەستی خۆیان بگەیەننە دەستی ئەو، لەگەڵ یەکتریدا پێشبڕکێیان بوو، تا قودرەتو پیرۆزی وەدەست بهێنن، تۆزێ دوورتر، گروهی نابیناکانو نەخۆشەکان دەهاتن، دەرگا بەردەوام دەکرانەوەو خەلّکی تازە دەگەیشتن، ریش سپی دێکە کەوتە شلەژانەوە، لە کاتێکا دەستەکانی توند گرتبووە دوولای دەرگاوە تا نەبادا ئاپۆڕەی خەلّك بڕژێنە مالەکەیەوەو سەروسامانی بە تاراج ببەن. پرسی: ((ئیدی ئەوە کێیە؟))

– یەکێ وەستاو وەلاّمی ئەوی دایەوە ((پەیامبەری تازەیە، ئەنانیا، ئەو سپی پۆشەی کەبەرەو رووی خۆت دەبینی، ژیانی لەدەستێكو مەرگی لە دەستێکدایە، هەرچۆنی گەرەك بێ دابەشیان دەکات، کەسێکی کەسە ئەلفێکی بەسە، ئەنانیا، باش خۆت لەگەڵیا رێکخە)).

– ئەنانیای پیر لە بیستنی ئەم قسەیە ترسا، ئازارێکی زۆر رۆحی سەنگین دەکرد، زۆر جاران لە خەو رادەپەڕیو هەولّو هەراسان بێ تاقەتی دەکرد، لە کابوسەکانی خۆیدا وا بەدیاردەکەوت تا گەردەنی لە مەشخەلّی دۆزەخ چۆتە خوارەوەو سوور دەبێتەوە، رەنگە ئەو پیاوە ببێتە هۆی چاکبوونەوەی، لەبەر خۆ گوتی: ((ئەو جیهانە

لەسەر بناغەی جادووسیحر دامەزراوە، ئەو پیاوەش جادوگەرێکە، واباشە دەستووری راخستنی سفرە بدەم، واچاکە مایە گوزاریەك بکەم بۆ ئەوەی خواردنی بدەمیٚ، لەوانەیە پەرجویەك بکات.

-بەم بڕیارە، چووە ناو رێگاو دەستی بە نیشانەی سلاٚو دانایە سەر دلّی، گوتی: ((کوڕی داوود، من ئەنانیای پیرم، گوناهکاریٚ، تۆ مرۆڤێکی پیرۆزی، بیستم دەتەویٚ پیٚ بنێیتە ئەم دێیە، دەستورمدا سفرە راخەن تا لە ماڵی مندا شام بخۆیت، تکا دەکەم، بفەرموو پیٚت لەسەرچاوی من دانیٚ، وەك چۆن کە بۆ هەمووان مەعلومە، پیاوە پیرۆزەکان بۆ خاتری ئێمەی گوناهکاران دێنە ئەم دونیایە، ماڵی منیش تێنوی پیرۆزکردنە)).

-کریست وەستا ((ئەنانیا گوفتاری تۆ مایەی خۆشنوودی منە خۆشحالّ دەبم کە لە خزمەتی تۆ دابم)). چووەناو ماڵی دەوڵەمەندی دێیەکەوە، کۆیلەکان سفرەیان لەحەوشەدا پان کردەوەو سەرینیان هێنا، کریست دانیشت لە هەردوو لای ئەودا یۆحەننا و ئاندریاس‌و یەهوداو تۆماسیش کە بەخاتری خواردن خۆیان بەناونیشانی یەکیٚ لە حیواریەکان لەقەڵەم دابوو دانیشتن، خاوەن ماڵی پیر رووبەڕووی ئەوان دانیشت، ئەو لەو بیرۆکەیە دابوو کە بە نەرمە فێلّ بابەتی قسە بگۆڕێتەوە سەر خەونە ئاشوفتەکانیەوەو داوا لە جادوگەربکات کابوسەکانی بپەڕێنیٚ، خواردن‌و دوو قەرابە شەرابی هێنابوو، خەلّك لە دەرەوەی دەرگاوە وەستابوون، سەیری خواردن‌و قسەکردنی ئەوانیان دەکرد لە بارەی خوداو ئاوو هەواو رەزەکان، بەتەواوبوونی خواردن‌و شەراب کۆیلەکان مەسینەو لەگەنیان هێنا، میوانەکان دەستیان شوشت‌و ئامادەی هەڵسان بوون، لێرەبوو کاسەی سەبری ئەنانیا پڕبوو، لەبەرخۆ گوتی: ((خەرجی شامم لەسەر دەستی خۆمدا تا ئەوو پیاوانی واکیرەش بخۆن‌و بیخۆنەوە، ئێستا دەبیٚ هەقی ئەوانە بدات.

– گوتی: ((ئوستاد من کابوسم هەیە تۆش جادوگەرێکی گەورەی من هەرچیم لە دەست هات بۆ ئێوەم کرد. ئێستا نۆبەتی تۆیە جەنابی پیرۆز کە کارێکم بۆ بکەیت رەحمیٚ بەمن بکەو کابوسەکانم لیٚ بەدوورخەرەوە، دەڵێن تۆ بەزمانی نمونە قسە



دەکەیت‌و جادوویی دەکەیت، لەبەر ئەمە، مەسەلێکم بۆ بێژە. مانای شاراوەی مەسەل تێدەگەم‌و چاك دەبمەوە، دونیا لەسەر بناغەی سیحرو جادووە، لەم حالّەتدا کاری سیحرکاریت دەست پێبکە، کریست بزەییێکی هاتیٚ‌و روانیە چاوەکانی پیرەمێرد، یەکەمجار نەبوو کە شەویلاکی دڕندە لە پشت گەردنی خەپلّەو چاوانی دودوزەنی ورگنەکان دەبینی، بەدیتنی ئەوان دەلەرزی، ئەوانە تالاٚنیان دەکرد، سەمایان دەکرد، ئەجندە بازیان دەکرد قەت لەو ئەندێشە نەبوون کەوا خەریکە لە دۆزەخ دەسووتێن، تەنها لە چەند کاتێکی کەمدا لە خەو کە چاویان دەکردەوە دەیانبینی، کریست سەیری کابرای پیری ورگنی کرد: سەیری لەشی، چاوانی ترساو جارێکی دی حەقیقەتی وجودی ئەو پیاوە بوو بە چیڕۆك گوتی: ئەنانیا گوێکانت بکەوە پەنجەرەی دلّت بکەوە دەمەویٚ قسە بکەم))

– گوێکانم کردەوە، پەنجەرەی دلّم کردەوە، سوپاس بۆ خودا گویٚ دەگرم.

– ئەنانیا، کەسێکی دەوڵەمەندبوو، زاڵم‌و نانەجیب بوو، دەیخوارد ودەخواردەوە ئەرغەوان‌و کەتانی لەبەر دەکرد، هەتا بە قەد گەلاٚیەکی سەوزیشی نەدەدایە ئەلیعازری هاوسیٚ ی کە لەسەرمان دەلەرزی، ئەلیعازر بە دەچوو تا بەو پارچەوپورچەی کە لە خوانی ئەو دەوڵەمەندە هەڵدەڕژا خۆی تێربکات، بەلاٚم کۆیلەکان فڕێیان دەدایە دەرەوە، لەبەردەرگا دادەنیشت سەگەکان دەهاتن برینی ئەویان دەلستەوە، ئەوکاتە ئەجەلی وادەهات‌و هەردووکیان مردن. یەکیان کەوتە ناو ئاگری دۆزەخ ئەویتریان جێی خۆی لە باوەشی ئیبراهیم گرت. رۆژێکیان پیاوە دەوڵەمەندەکە سەری بەرز کردەوە ئەلیعازری هاوسیٚ ی بینی کە بە تاسوق‌و خەندەوە لە باوەشی ئیبراهیم جێی هەیە، ئەوکاتە بە بانگێکی بەرز گوتی: ((ئەی باوکی من ئیبراهیم، ئەلیعازر بنێرە خوارەوە تا بەسەری ئەنگوستی تەڕی خۆی زمانی من فێنك کاتەوە چوونکە من لەناو ئەو ئاگرە وا دەبمە کەباب))، بەلاٚم ئیبراهیم وەلاٚمی دایەوە ((ئەو رۆژانە وەبیرخۆت بهێنەوە کە دەتخواردو دەتخواردەوەو لەززەتت لە خوانی سەرزەمین وەردەگرت، لە کاتێکا ئەو برسی‌و سەرمای بوو، ئایا شتێکت

بەقەد گەلای سەوزیش بەو دەدا؟ ئێستا نۆبەتی ئەوە، کە لەززەت وەرگرێو تۆش تا هەتا لە ئاگر بسووتێی).

کریست ئاخێکی هەڵکێشاو بێدەنگ بوو، ئەنانیای پیر بەدەمی کراوەی دووبارە وەستاو چاوەڕوانی پاشماوەی مەسەلەکە بوو، لێوەکانی وشكو گەروی قاش قاش بووبوو، بە چاوانی پاڕانەوەئامێز روانیە کریست بەدەنگێکی لەرزیو پرسی: ((تەواوبوو پاشماوەی نییە))

یەهودابەخەندەوە گوتی: (سزای خۆی بوو، هەر کەسێ لەم دونیایەدا زیاد بخواو زیاد بنۆشێ، لە دۆزەخدا هەمووی دەهێنێتەوە، بەڵام کوڕە گەنجترەکەی زوبەدی بەسەر سینەی کریستوە لاربۆوەو بە ئارامی گوتی: مەولای من، ئێمەت فێرکردووە کە دژومنانمان ببەخشین، بەئێمەت گوتووە، کە دوژمنی خۆمان خۆشبوێ، لە کاتێکا هەفت سەد وهەفتاو هەفت جار خراپەی لەگەڵ ئێمە کردووە، هەفت سەدو هەفتاو هەفت جار لەگەڵ ئەو چاکەمان کردوە، ئێوە گوتتان کە ئەوە تەنها رێگاییکە بتوانین بەم هۆیەوە نەفرەت لە جیهان بکەین، بەلاّم ئێستا .. ئایا خوداوەند توانایی لێبوردنی نییە؟

ڕدێن سوور لە کاتێکا نێگاییکی تێژئامێزی کردە ئەنانیای پیرو گوتی:

- خودا عادیلە.

یۆحەننا بە پەلپ گرتنەوە گوتی: خوداوەند چاکەییکی رەهایە، خاوەن ماڵی پیر تەتەڵەی زمانەوە گوتی: واتا هیچ ئومێدێ نییە؟ ئایا مەسەل تەواوبووە.

تۆماس لەجێوە هەڵسایەوەو هەنگاوێکی بۆ پێش ناو وەستاو بەتیز ئامێزەوە گوتی: ((نەخێر ئەرباب هێشتا تەواو نەبووە.

- ڕۆڵە، قسەبکە.. دوعات بۆ دەکەم.

-تۆماس گوتی: ناوی ئەو مرۆڤە دەوڵەمەندە ئەنانیایە بەستەی کەلوپەلەکانی هەڵگرتو خۆی گەیاندە کوچەو لەگەڵ هاوسێکانی کەوتە خەندەوە. خوێن هێرشی کردە سەر لاجانگەکانی ریش سپی دێ، چاوەکانی، وەکو هەتاو لە حاڵەتی ئاوابووندا



تاریك هەڵگەڕا، کریست دەستی بەرزکردەوەو بەقژی ئالۆزی یاوەرە خۆشەویستەکەی داهێنا،: یۆحەننا، هەموو گوێیان هەیەو بیستیان، هەموو هۆشیان هەیەو قەزاوەتیان کرد: ئەوان گوتیان خودا عادیلەو نەیانتوانی دوورتر لەوەبڕۆن، بەلاّم تۆش دڵت هەیەو گوتت ئەوە دروستە کە خودا عادیلە، بەلاّم ئەمە بەس نییە، ئەو چاکەیێکی رەهاشە. ((ئەو مەسەلەیە وەك چۆن کە هەیە تەواونییە دەبێ پایانێکی دیکەی هەبێ)).

-گەنجەکە گوتی: مەولای من لەمن ببورە، بەلاّم دڵی منیش بەهەمان شێوە گەواهیدا، بەخۆمم گوت ((وامرۆڤ خەڵك عەفو دەکات مەگەردەبێ خودا عەفونەکات، نا هەرگیز ناکرێ، ئەو مەسەلەیە کوفرێکی گەورەیەو ناتوانێ وەك چۆن هەیە وابێ، دەبێ پایانێکی دیکەی هەبێ.

کریست بەبزەوە گوتی: ((یۆحەننای خۆشەویست، پایانێکی دیکەی هەیە، ئەنانیا گوێ بگرە دڵت پڕ دەبێ لە دڵنیایەوە گوێ بگرن، تۆکە لە حەوشەیتو تۆو هاوسێکان کە لە کوچەدا خەریکی خەندەی، خودانەك تەنها عادیلەو هەرواش کە چاکە بەتەنها چاك نییە باوکیشە، لەوکاتەدا ئیلیازر گوفتاری ئیبراهیمت بیست ئاخێکی هەڵکێشا، لەزەینی خۆیدا خودای بەرەوڕووی گوتارێ کردەوە: ((**خوداوەندا مرۆڤ چۆن دەتوانێ لە بەهەشت بەختەوەربێ لە کاتێکا دەزانێ کە نەفەرێ هەیە تاهەتایە لە ئاگر دەسووتێ خودایا... ئەویش شادکە، تا منیش شادبم، لە عەزابی رەهاکە تا منیش لە عەزاب رەهابم، دەنا منیش هەست بە مەشخەڵی ئاگر دەکەم**))، خودا گوێی لە بیرۆکەی ئەو بوو شادومان بوو فەرمووی ((ئیلیازری خۆشەویست، بڕۆ خوارەوە دەستی ئەو تێنووە بگرە کانیەکانی من هەرگیز وشك نابنەوە، ئەو بهێنە ئێرەوە تاخۆی شاد کاتو خۆت بەو شادکەیت.)).

ئیلیازر پرسی: ((تاهەتایە؟و خودا وەلاّمی دایەوە ((بەڵێ تاهەتایە)) کریست بێ ئەوەی قسەیێکی دیکە بکات، هەڵسایەوە سەرپێ، شەو زەوی گرتبووەخۆ، خەڵکی پەرشو بلاّوبووبوونەوە، پیاوانو ژنان بەپاڕانەوە گەڕانەوە کوختەکەی وێرانی خۆیان دڵیان تێربووبوو لە خۆیان دەپرسی: ((ئایا وشە دەتوانی مرۆڤ تێر بکات؟)) بەڵێ دەتوانێ ئەو کاتەی کە قسە باش بێ، کریست دەستی بۆ خوداحافیزی بەرەو خاوەن

مالّی پیر درێژکرد، بەلاّم ئەنانیا کەوتە سەرپێیو بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((مەولای من لێم ببورە))و کەوتە گریانەوە.

هەمان شەو لەژێر دار زەیتونەکاندا کە بۆ خەو ئاسوودە بووبوون یەهودا چووە سۆراغی کوڕی مێریێ، نەیدەتوانی خۆی ئارام کاتەوە، دەبوایە ئەو ببینێو قسەی لەگەلاّ بکات، تا لەکاتی قسە هەردوو دەستیان بکردایەوەو شتێکیان بۆ یەکتری تەواو رۆشن بکردایە. لەو کاتەی کە لە مالّی ئەو ئەنانیای جانیدا، خۆشحالّ بوو بە عەزابی ئەو دەولّەمەندە لە دۆزەخ هاواری کردبوو ((سزای خۆی بوو)) کریست بە دزیەوە بەتیلەی چاوی بۆ ماوەییێکی درێژ سەیری ئەوی کرد بوو، وەك بلّێی سەرزەنشتی دەکات، ئەو نیگایە هێشتاش ئەو ئازاردەدا، لەبەرئەوە واجیب بوو حیساباتی خۆیان لەگەلّ یەك تەسفیە بکەن، یەهودا حەزی لە گوفتاری نیوەپەزو نیگا بە دزی کردبوو.

کریست گوتی: ((بەخێربێی چاوەڕوانت بووم))

ڕدێن سوور بێ پێشەکی گوتی: ((کوڕی مێریێ، من لەگەلّ ئەوانی دیکە جورنابم، من پاکیزەییو خۆشەویستی.. یۆحەننام نییە، وەکو ئاندریا خەیالّێکی ئاشوفتە نیم تا زەینم وەکو هەلّکردنی با بگۆڕم، من جانەوەرێکی وەحشیو قبولّی خۆبەدەستەوەدان ناکەم، دایکم بەرلەوەی کە بکەوێتە قەبەلّی نیکاحی کەسێ منی هێنایە دونیاو فڕێی دایە بیابانەوە، لەو جێیەی کە شیری گورگم خوارد، من زەبرو نەجیب بووم هەرگیز وەرنەچەرخام، هەر کەسێکم خۆش بوێ دەبمە خاکی ژێرپێی، لە هەر کەسێکیش بێزار بم دەیکوژم)).

یەهودا کە قسەی دەکرد دەنگی دڕتر دەبوو، چاوەکانی لە تاریکیدا بریقەی دەدایەوە، کریست دەستی بەسەرسەری ئەوداهێنا تا ئارامی بکاتەوە، بەلاّم ئەو دەستە ئارامبەخشەی رادا، لە حالّێکدا وشەکانی خۆی سوكو سەنگین(*) دەکرد، بەمجۆرە بەردەوامی بەقسەداو هەتا کەسێکم کەخۆشدەوێ لەحالّەتێکا ببینم لە رێگەی راست لایداوە، دەتوانم بیکوژم..

* هەلّدەسەنگاند



-برام یەهودا رێگەی راست کامەیە؟

-ڕزگاربوونی سراییل.

-کریست چاوەکانی داخستو وەلاّمی نەدایەوە، ئەو دوو مەشخەلّەی کە لە تاریکیدا بەو کەوتبوو، دەیسوتاند، هەرواش وشەکانی یەهودا؟ بۆ تەنها سراییل؟ مەگەر هەموو ئێمە برانین؟ ردێن سوور لە چاوەڕوانی وەلاّمدا مایەوە، بەلاّم کوڕی مێریێ لێوی بۆ قسە نەکردەوە، یەهودا بازووی ئەوی گرتو رایتەکاند، وەك بلّێی دەیەوێ بێداری بکاتەوە.. پرسی ((تێدەگەی چیم گوت؟))

-کریست وەلاّمی دایەوە ((بەلّێ تێگەیشتم))و چاوەکانی کردەوە.

-من ركو راستو بێ پێچو پەنا لەگەلّ تۆ قسە دەکەم چوونکە دەمەوێ بزانی کەمن کێمو چیم دەوێ، تاتۆش بتوانی وەلاّمی من بدەیتەوە، مەیلت لێیە لەگەلّ تۆ بێم یانە؟ دەمەوێ ئەمە بزانم..

-یەهودا برام لەتۆم دەوێ کە لەگەلّ من بێیت.

- و..تۆش دەبێ لێگەڕێی من ئازادانە قسەبکەمو پەلّپ بگرم؟

کاتێ کە دەلّێی بەلّێ، من بلّێم، نە، لێگەڕێی هەموو شتێ بلّێم، تا دوودلّیەك لە زەینتدا نەمینێ، لەوانەیە هەرکەسێکی دی بەدەمێکی کراوەوە گوێ لە تۆڕاگرێت، بەلاّم من یەکێکی وەهانیم من کۆیلەنیم..مرۆڤێکی ئازادم

- بەلاّم یەهودا ئازادی هەمان ئەو شتەیە کە من دەمەوێ.

یەهودا بەتووڕەییەوە دەستی لە شانی کریست کێشایەوە، مشتێکی کوتایە قەدی درەختی زەیتونەکە، لە کاتێکا رووبەڕووی کریست وەستاو بەنەفرەتەوە سەیری ئەوی دەکرد بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: لە هەمان ئەو شوێنەدا رێگەی ئێمە لێك دەبێتەوە، یەکەم جار دەبێ جەستە لە دەستی رۆمیەکان رزگاری بێت پاشان رۆح لە گوناه، رێگە ئەوەیە، دەتوانی ئەوە بگریتە بەر؟ خانە لە سەقفەوە بۆ خوارێ دروست نابێ لە بناغەوە بۆ سەرەوە دروست دەبێت.

-یەهودا بناغە رۆحە.

-بناغە جەستەیە، دەبێ لێرە دەست پێبکەی کوڕی مێرێ، ئاگاداربە جارێکم گوتووەو دووەم جارە دەیلێمەوە ئاگاداربە. ئەو رێگەیەی من دەیلێم تۆ بیگرەبەر، بۆ وابیردەکەیتەوە کە من لەگەڵ تۆ دێم؟ باشتر وایە بزانی بۆئەوەیە کە رێت نیشاندەدەم.

-ئاندریاس لەبن دارزەیتونەکەی تەکیان بوو، لەخەودا گفتوگۆکەی بیستو بێداربۆوە، بەدیقەت گوێی راگرت، کەوتە هاگایی لە قسەی ئوستادو دەنگەکەی تر کە زبرو پڕ لە تووڕەیی بوو وەك چۆن ئاسکێکی ترساو کەوتە لەرزەوە، نەکا خەڵکی درەنگە شەوان هاتبن‌و ئازاری ئوستادبدەن، ئاندریاس دەیزانی کە ئەو بۆ هەرکوێ رۆیشتبا لەدوای ئەوانەوە پیاوان‌و ژنانێکی زۆرو بۆری موسکێنەکان بەدوای دادەهاتن کەخۆشیان دەویست، بەهەمان ئەندازەش ردێن سپی ودەوڵەمەندان کە رقیان لێ دەبۆوەو حەزیان دەکرد بڕوخێ، نەکا ئەو تاوانکارانەو ژمارەیێ ئەوباش‌و خوترمە بەدەستیان بۆ ئازاردانی ئەو ناردبێ؟ لە تاریکیدا بۆ هەرچووارلای دەنگەکان خزی، بەڵام ردێن سوور دەنگی خزینی کەوتە بەرگوێ‌و بەسەر ئەژنۆکانی بەرز بۆوەو بانگی کرد ((کێ لێرەیە؟)).

-ئاندریاس وەڵامی دەنگەکەی دایەوە ((یەهودا منم ئاندریاس))

-کوڕی یونس بگەڕێوە، بگەڕێوە سەرجێت ئێمە کاری تایبەتیمان هەیە.

-کریستش گوتی: (ئاندریاس رۆڵە بڕۆبخەوە)

ئێستا یەهودا دەنگی کز کردەوە، کریست هەناسەی سەنگینی ئەوی لە رووخساری خۆی هەست پێکرد. وەبیرخۆت بهێنەوە کە لە بیاباندا ئەم رازەم بۆ ئاشکرا کردی کە ئەنجومەنی برایەتی منیان کردۆتە مەئموری کوشتنی تۆ، بەڵام لە دوا ساتدا باوەڕی خۆم گۆڕی، خەنجەرم نایەوە ناو کالاّن، وەك دزی سپێدە سەحەر لە دێر رامکرد.

- یەهودا برام، بۆ باوەڕت گۆڕی؟ من ئامادەبووم

- ویستم چاوەڕێ بکەم



- چاوەڕوانی بۆچی؟

یەهودا بۆ ساتێ بێدەنگ مایەوە، ئەوکاتە لەپڕێکا گوتی: ((بۆ ئەوەی بزانم کە تۆ هەمان کەسی کە سراییل چاوەڕوانیەتی؟)) کریست لەبەرخۆلەرزی، پشتی دایە قەدی درختی زەیتونەوە، تەواوی بەدەنی دەلەرزی.

یەهودا لە کاتێکا برۆکانی لە هیکرا ئارەقەی لێ نیشت، پاکی دەکردەوە، هاوای کرد((نامەوێ لەم کارە پەلەبکەم ورزگارکەر بکوژم نە ئەوەم ناوێ)) وەك بڵێی کەسێ قرتقرتۆکی گرتبێ‌و بیخنکێنێ، قیژاندی ((تێدەگەی؟ ..لەوە دەگەی؟)) هەناسەیێکی هەڵکێشاو بەردەوام بوو ((بەخۆم گوت رەنگە ئەو خۆشی ئەوە نازانی چاکتروایە سەبر بگرم‌و لێگەڕێم چەند سپێدەییێکی دیکە بمێنمەوە، لێگەڕێم زیندوو بمێنێتەوە تا بزانم چی دەکاو چی دەڵێ، لە حاڵەتێکا ئەو کەسە نەبێ کە چاوەڕوانی دەکەین هەمیشە کاتێکی تەواو هەیە بۆ رزگاربوون لە شەڕییەوە، ئەوە شتێك بوو کە بەخۆمم گوت، لەبەر هەندێ لێگەڕام بەزیندووی بمێنێیتەوە، خوێن بەری چاوی گرتبوو بە ئەنگوستی گەورە خۆڵی لە پێی دەکردەوە، لە پڕێکا بازووی کریستی گرت، دەنگی دڕونائومێدانە بوو: ((نازانم ناو لە تۆ بنێم چی؟ کوڕی مێرێ؟ کوڕی نەجار؟ دەزانی کە هێشتا نازانم تۆ کێی؟ خۆشت نازانی، هەردووکمان دەبێ ئەو وەڵامە کەشف بکەین‌و ئارامی وەدەست بهێنین، ئەو سوورگومیە ناتوانرێ بەردەوام بێت، چاو لەوانی تر مەکە ئەوان مەڕئاسا بەدوات دەکەون، بەو ژنانە غەرڕا مەبە کە هیچ کارێك ئەنجام نادەن جگە لە فرمێسك رژاندن‌و ستایشی تۆ. هەرچیەك بن ئەوانە ژنن، دڵیان هەیە، ئەقڵیان نییە، لەبەرئەوە ئەوان بەکەڵکی ئێمە نایەن ئەوە ئێمە دوونەفەرین دەبێ کەشفی بکەین کە تۆ کێی، ئەوەی کە ئەو کلێپەیەت لە گیانی بەربووە، خودای سراییلە یا هەرماس، دەبێ ئەو کارە بکەین.. دەبێ)). تەواوی بەدەنی کریست کەوتبوو لەرزەوە ((برام یەهودا، دەبێ چ بکرێ؟ چۆن دەتوانین وەڵام بدۆزینەوە؟ یارمەتیم بدە))

- رێگایێ هەیە

- چۆن؟

-بچێنە سۆراغی یەحیای پاکشۆر ئەو دەتوانێ پێمان بڵێت، هاوار دەکات ((ئەو خەریکە دێت!)) کەتۆ دەبینی بەوە دەکەوێ کەئایا تۆ ئەویت یاخود نا، چاکتروایە برۆم، هەم دەمارەکانی تۆ ئارام دەبنەوە، منیش ئەوەی دەمەوێ روندەکەمەوە.

کریست چووە دەریای ئەندێشەییێکی قوڵەوە، چەند جار ئەم دڵتوندییە کەوتبوە گیانیەوە، بەدەمی کەف کردوویەوە بێ شلەژان سەری نابووە ئاستانەی خوداوە، لەو حاڵەتانەدا خەڵکی وایان دەهاتەبەر زەین کە ئەو خووی گرتووەو یاخود لەسەریدراوەو بەوەحشەتەوە رادەکات، بەڵام ئەو لە ئاسمانی حەوتەم بوو، زەینی لەتەختەبەندی لەش رەهابووبوو عروجی کردوە ئەڵقەی لە دەرگای خودا کوتیوەو پرسیبووی ((من کێم؟ بۆ لە دایك بووم؟ بۆ نەجاتدانی دونیا دەبێ چی بکەم؟ کورتترینی ئەم رێیە کامەیە؟ لەوانەیە مەرگی من بێت؟))

سەری بڵند کرد، یەهود بەسەریا لاربۆوە گوتی: ((برام یەهودا لە کەنار مندا راکشێ، خوداوەند لە هەیئەتی خەون دێتو ئێمە دەبات)) خوا یاربێ بەیانی سپێدە دەکەوێنە رێو دەچینە سۆراغی پەیامبەری یەهودیە، هەرچییەك کە خواستی خودابێ هەر ئەوە دەبێ، من ئامادەم))

یەهوا گوتی: ((منیش ئامادەم)) لە کەناریەکدا راکشان لە رووودا هەردووکیان زۆر ماندووبوون، چوونکە یەکسەر کەوتنە خەوەوە، سپێدەی رۆژی دوایی، ئاندریاس کە زووتر لە هەموویان بێداربووبۆوە، ئەوانی لەوەباوەش یەکتری بینی کە چوونەتە خەوێکی قووڵەوە.

※※※

خۆرەتاو کەوتە سەر دەریاچەوە، جهانی رۆشن کردەوە، ریش سوور کەوتە پێشەوەو کریست لەگەڵ هاورێیانی وەفاداری خۆی، یۆحەنناو ئاندریاسیش، لە دوای ئەوەوە، تۆماس کە هێشتا کەلوپەلی فرۆشتنی پێبوو، لەدێ مایەوە، ئەو دێوەرە رەند کە هەوڵیدەدا هەردوولای مەسەلەکە بە چاکی هەڵسەنگێنێ لەبەرخۆ گوتی: ((حەزم لە قسەی کوڕی مێرێە، باشە هەزاران کاتێ کە ریقی رەحمەت هەڵدەقۆڕێنن تا هەتایە



دەخۆنو دەخۆنەوە. تا ئێرە مەسەلەکە باشە بەڵام لە هەمان کاتدا، سەیرکە لەو دونیایەدا چیمان بەسەردێ، ئەی تۆماسی دەستەپاچە، حەواست کۆکەرەوە، خۆت بە هیچ یەك لەم دوو جێیە پابەند مەکە، بۆ دڵنیاکردنی خاتر باشتر وایە سەبەتی خۆت بەدوو جۆر شت پڕکەیتەوە: بەسەر سەبەتی شانەوە کەلوپەلی رازاندەوە، لەژێر ژێری ژێرەوە، مەلەکوتی ئاسمان بۆ موشتەریەکانی تاکی بالاّ.

خەندەییێکی مەرایی کرد، بەستەکەی دووبارە نایەوە کۆڵی سپێدە کەلەشێر بانگدانێ کەڕەنای خۆی لێداو لەناو کوچەو کۆلاّنەکانی- بیث صەیدا- کەوتە جاڕدانەوە.

لە هەمان کاتدا لە کفرناحوم، پەترۆسو یاکوب یش بێداربووبوونەوە تا تۆڕەکان بخەنە ناو قایغەکانەوە، تۆڕەکان لەبەرماسی پەنگاوەی بوو، دوو ماسیگر لەو کاتەی کە تۆڕییان پڕ لە ماسی دەبوو، هەستیان بە شادومانی دەکرد، بەڵام ئەمڕۆکە حەواسیان لە جێگاییێکی دیکە بوو قسەیان نەدەکرد، ئەوانە لەڕوودا ئارام بووبوون، بەڵام لەناو دەروونیان هەراوزەنابوو، جارێ لەگەڵ سەرنویشت دەجەنگین کە نەوە لەدوای نەوە ئەوانی پایەندی ئەو دەریاچەیە کردبوو، جارێ لەگەڵ زەینی خۆیان، دەکەوتنە قۆچانێو کە حیسابگربوو نەیدەهێشت دڵیان پەڕوباڵ بگرێ، ئەوان لەبەرخۆ بانگەشەیان دەکرد ((ئاخر ئەو ژیانە چ جۆرە ژینێکە! هەر تۆڕ باوێ، ماسی بگرە،بخۆ، بخەوە، هەموو رۆژێکی خودا دووبارە ئەو ژیانە مرداره بەرەسەر- هەموو رۆژێ هەموو ساڵێ، تەواوی تەمەن، ئاخر تاکەی .. تاکەی؟بەمجۆرە دەمانەوێ بمرین؟)) ئەوان تا ئێستا لەمبارەوە ئەندێشەی هیچیان نەکردبوو، دڵیان هەمیشە بێ دەغدەغەبوو رێگەی سوونەتی خۆیان بێگلەیی گرتبووەبەر، باوانیان، باوە گەورەکانو ئەسلافەکانیان پشتاوپشت ئاوەها ژیابوون لە دەوروبەری هەمان دەریاچەو لەگەڵ ماسیدا دەستو پەنجەیان نەرم کردبوو، پاشان رۆژێکیان دەستی قەبەی خۆیان لەسەر یەك دادەناو دەمردن، منالو ئەوەی ئەوان بە هەمان رێدا دەڕۆیشتن، ئەو دوونەفەرە پەترۆسو یاکوب، تا ئێستا بەبێ گلەییو گازاندە لەگەڵ جۆری ژیانی خۆیان باش راهاتبوون، بەڵام لە پڕێکا لەم دواییانەدا دەوروبەریان تەنگ بووبۆوە، خەریك بوو دەخنکان. ئیستاکێ روویان لە ئاسۆییێکی دووربوو، لەپشتی ئەم دەریاچەوە، بەڵام

بۆکوێ؟ بەرەو لای چ شتێ؟ خۆشیان نەیاندەزانی، تەنها ئەوەیان دەزانی کەواخەریکە دەخنکێن.

وەك بلێی ئەو هەموو ئازارە بەس نەبێ، هەموو رۆژێ رێبواران خۆیانو هەواڵی تازە دەهاتن، مردوەکان زیندوو دەبوونەوە، ئیفلیجەکان بەرێدا دەرۆیشتن، کوێرەکان دەیانبینی، رێبواران لەم دوو ماسیگرەیان دەپرسی ((ئەو پەیامبەرە کێیە؟ برایەکەی تۆیان لەگەڵدایە، کەواتە تۆ دەبێ بزانیت، خەبەرمان هەیە کە ئەو کوڕی نەجاری ناصیرە نییە، کوڕی داودە، تۆبە راست دەزانی؟)) بەلاّم پەترۆسو یاکوب شانیان هەڵدەتەکاندو دووبارە لاردەبوونەوە سەر تۆڕەکانیان، حەزیان دەکرد بگرین تا ئارام ببنەوە، جارێ دوای رۆیشتنی رێبوارکان پەترۆس رووی لە هاوەڵەکەی کردو پرسی ((یاکوب تۆ باوەڕ بەم پەرجوانە دەکەی؟)) کوڕە چەنەبازەکەی زوبەدی وەلاّمی دایەوە ((تۆڕەکان راکێشەو هەناسەبڕ بی)) بە تەکانێ تۆڕەکەی پێ نزیکتر کردەوە، ئەمڕۆ سپێدە پەیتونەوانێ بە هەواڵێکی تازە بەتەك ئەوانەوە رەت دەبوو ((دەڵێن پەیامبەری تازە لە (بیث صەیدا)دا لە ماڵی ئەنانیا ئەو پیرە لەئیمە نانی خواردوە، هەرکە لێبوونەتەوەو دەستیان شوشتووە بەناو ئاوێ کە کۆیلەکان دەیانهێنا لە ئەنانیا نزیك دەبێتەوەو شتێکی دەچرپێنێتە گوێی و یەکسەر پیرەمێرد جێبەجێ دەبێو دەکەوێتە گریانەوەو دەستدەکات بەدابەشکردنی سەرو سامانی لەمیانی هەژاراندا. پەترۆس کە جارێکی دیکە لە پشتی ئاسۆ دوورەکانەوە ون بووبوو پرسی ((چی چرپاندە گوێی؟))

پەیتونەوانەکە بەخەندەوە گوتی: ((ئاخ ئەگەر دەمزانی وەکو چەکوش دەمکوتایە گوێی پولدارەکان تا هەژارەکان هەلی هەناسەهەڵکێشانیان هەبێ)) پاشان بەرێکەوتوو هاواری کرد ((خوداحافیز سەرکەوتووبن))

پەترۆس رووی لە هاوەڵەکەی کرد تا شتێ بلێ، بەلاّم یەکسەر بڕوای گۆڕێ، ئاخر دەیتوانی چی بلێ؟ دیسان قسە؟ دەبوایە چەندێك قسە بگات؟ لەسەری خۆیدا تا کاری خۆی رەها بکاو بۆ هەمیشە لێرەوە بەدوورکەوێتەوە بەڵێ دەبوایە ئەم کارە بکات! کوختەکەی یونس ئیستاکێ بۆ ئەو تەنگ بووە، ئەو گومیکلە ئاوە، دەریاچەی گنسارت، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((ئەوەمان نەکردە ژیان، لێرە دەڕۆم)).



یاکوب بەرەو لای ئەو گەڕایەوە، پرسی ((سەبارەت بەچی منەمن دەکەی؟ داکەسێ))

پەترۆس ولاّمی دایەوە: هیچ بابە، بەتووڕەییەوە دەستی کرد بە راکێشانی تۆڕەکەوە.. لە هەمان ساتدا قەلاّفەتی یەهودا بەسەر بەرزایی گردۆلکە سەوزەکەوە بەدیارکەوت کە کریست بۆ یەکەمین جار لەوێ قسەی لەگەڵ خەڵك کردبوو، گۆپاڵێکی کەچ وقەرەجی لەدەست دابوو، کەلەسەر رێگادا لە داربەڕوێکی کێوی کردبۆوە، لە کاتێکا رێی دەبڕی، سێ هاوڕێی دیکە لەپشت ئەو بەدیارکەوتن، بەهەناسەبڕکیوە، بۆ ساتێ بەسەرگردۆلکەوە وەستا تا سەیرێ بکاتە دونیای ژێر پێیەوە، دەریاچە بەخۆشحاڵیەوە دەدرەوشایەوە، خۆرەتاو دەیلاواندەوەو ئەو پێدەکەنی، قایغەکانی ماسیگریو پەروانەی سووروسپی لەناو ئاودابوون، لەسەرەوەی ئەواندا چەند ماسیگرێکی باڵدارو مەلی دەریایی لە فڕین دابوون، لەوان دوورەوە، کفرناحوم وزەوزەی بوو، خۆرەتاو سەر هەڵگەڕابوو، رۆژ لەوپەڕی جیلوەی خۆی دابوو،

ئاندریاس لە کاتێکا هێمای بۆ کەناری دەریا دەکرد بۆ ئەو شوێنەی کەبراکەی تۆڕی لێ رادەکێشا گوتی: ((سەیرکە پەترۆس لەوێیە. یۆحەننا ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی: ((یاکوبیش، ئەوان هێشتاکەش ناتوانن دڵ لە دونیا هەڵکەنو دەست لە دونیا بەردەن)) کریست بەبزەوە گوتی: ((هاوسەفەری خۆشەویست، ئاخ هەڵمەکێشە هەموو لێرە راکشێنو بحەسێنەوە، من دەچمە خوارەوەو دەیانهێنم)). پاشان بەهەنگاوی خێراو چاپوك دەستی کرد بەدابەزین لە گردۆلکەکەوە، یۆحەننا لە کاتێکا ستایشی ئەوی دەکرد لەبەرخۆ گوتی: ((لە فریشتەییێی دەچێت، شتێ جگە لە دووباڵ هیچ لە فریشتە کەمتر نییە، کریست بەپێ هەڵنانی بەسەر بەردێکەوە بۆ بەردێکی دی بۆ خوارەوە دەچوو، کاتێ گەیشتە کەنار هەنگاوەکانی خۆی سست کرد، لەو ماسیگرانەی کەبەسەر تۆڕەوە لاربووبوونەوە نزیك کەوتەوە، لەدوای ئەوانەوە وەستا، بۆماوەیێ بێ ئەوەی تەکانی بخوات کەوتە روانینی ئەوانەوە، سەیری ئەوانی دەکرد زەینی خاڵی بوو لە ئەندیشە بەلاّم هەستی دەکرد دەروونی وشك بۆتەوە، هێزێك لە دەروونی ئەودا خەریکی راکردنە، هەموو شتێ سوکەڵە بووبوو پیاسەی لە هەوا کرد، وەك هەورێ بەسەر دەریاچەوە مەلەوانی دەکردو پیاسەی لەهەودا دەکرد. دووماسیگرەکەش

سوکەڵە بوونو لەهەوادا پیاسەیان دەکرد تۆریش لەگەڵ ئەو شتانەی کەتیای بوو ماهیەتی گۆڕا: ئیدی ئەوەتۆرە نەبوو، ئەوان ئیدی ماسی نەبوون بەڵکو هەزاران مرۆڤی خۆشحاڵو بوون لە پڕێکا دوو ماسیگرەکە بەسەرسەری خۆیان هەستیان بە غەریبیو دڵنەوازییێك کرد، لە جێوە قیت بوونەوەو بەترسەوە گەڕانەوە، لەپشت ئەوانەوە، کریست بە ئارامیو بێ جووڵە وەستابوو تەماشای دەکردن، پەترۆس هاوارێکی بەرزی کرد ((مەولای لێمان ببورە)).

-بۆ پەترۆس؟ مەگەر چیت کردوە کەلێت ببورم

پەترۆس بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ((هیچ شتێ))و لەپڕێکا هاتەبەرو گوتی: ((ئاخر ئەوەش ناوی ژیانە؟ پێیەوە تووشی نەزۆکی بووە!)

یاکوب گوتی:((منیش هەروا))، تۆڕی بە زەوی دادا.

کریست دەستی بۆلای ئەوان درێژکردو گوتی: ((وەرن وەرن ئێوە دەکەمە شوانی مرۆڤەکان)). دەستی هەریەکێ لەوانی گرتەدەستو لەناوەندیان قەراری گرت ((چاکتروایە بڕۆین)).

پەترۆس کە کەوتبووە یادی یونسی پیر پرسی ((خوداحافیزی لەباوکم نەکەم؟))

- پەترۆس ئەسڵەن سەیری دواوەمەکە، ئێمە کاتمان نییە، چاکتروایە بڕۆین.

-یاکوب وەستاو گوتی: ((بۆکوێ؟))

-بۆدەپرسی؟ پرسیارێکی بێ پرسیار. وەرە یاکوب!

یونسی پیر لە هەمان کاتدا خەریکی چێشت لێنان بوو، بەسەر مەقەڵەکەوە لاربۆوە، چاوەڕوانی پەترۆسی کوڕی بوو، تابەڵکو لەسەر ڕێگەوە بگاتو دانیشنو لەگەڵ یەك نان بخۆن، ئێستا تەنها یەك کوڕ کە خودا بیپارێزێ بۆ ئەو مابۆوە، پەترۆس کوڕێکی ئاقڵو کارگێڕەکی باش بوو، پیرەمێرد فاتیحەی بۆ ئەویتری —ئاندریاس- خوێندبوو، ئەو بەدوای ئەو فێڵبازو ئەم فێڵباز دەکەوتو باوکی تەمەنداری خۆی جێدەهێشت تا خۆیو تۆڕەکان چاك کاتەوەو ڕووبەڕوی باو قایغ بێتەوەو چێشت لێنێو ئاگای لەماڵ



بێت، هەر لەوکاتەوەی کە ژنی مردبوو، لەگەڵ ئەو هەرماسەی ماڵدا لە جەنگو جیدال دابوو، یونس لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە. ((بەلاّم پەترۆس کە دوعای خێری من ڕینمایی ئەو بێ پشتی بەپشتی منداوە هێزی دڵم پێدەبەخشێ)) چێشتەکەی تام کرد، ئامادەبوو بوو، سەیرێکی کردە خۆرەتاو، دەمەدەمی نیوەڕۆبوو، لەبەرخۆ گوتی: ((برسیمە بەلاّم ناخۆم تا ئەو دێتەوە))

دەستەکانی نایە سەریەكو چاو لەڕێ مایەوە. تۆزێ دوورتر دەرگای ماڵی زوبەدی کرابۆوە، حەوشە پڕ لە سەبەتو گۆزەبوو، دەزگای عەرقسازی لە سوچێکی حەوشەکەوە بوو، ئەوان ڕۆژان کاتی دروستکردنی عەرەق بوو لە پێستی تریێو ئەو چیلکانەی کەلەناو ڕاووکدا دەمایەوە، دەردەهێنرایە دەرەوە، لەبەر ئەمە ماڵ بۆنی ئەلکۆلی لێدەهات، زوبەدی پیرو ژنەکەی خەریك بوون لە ژێر دارمێو شامیان دەخوارد، زوبەدی پیر بە پدووی بێ ددانی تا ئەو شوێنەی کە دەیتوانی خۆراکی ورد دەکردو قسەی لە بارەی فراوانکردنی کاروباری خۆی دەکرد، ماوەیەك بوو چاوی بڕیبووە کوختەکەی نائومی هاوسێی دیوار بە دیواری خۆی، قەرداری ئەو بوو نەیدەتوانی قەردەکەی بداتەوە، بەفەزلی خودا لە هەفتەی ئایندەدا زوبەدی خانووەکەی دەخستە هەڕاجەوە، ساڵەهابوو کە ئارەزووی بوو دیواری نێوان دوو خانووەکە خراپ بکاتو حەوشەکە فراوان بکات، ڕاوکێکی هەبوو بەلاّم دەیەویست دەسگاییێکی کوشینی زەیتوونیشی هەبێ تا تەواوی دێ بۆ گرتنی ڕۆنی زەیتوون بێنە لای ئەوو بتوانێ دەستهەق وەرگرێو گۆزەکانی بەدرێژایی ساڵ پڕ لە ڕۆنی زەیتوون بێت، بەلاّم ڕاوکەکەی لەکێ دادەنا؟ بەهەرنرخێ بوایە دەبوا خانووەکە لە دەست نائوم دەربهێنێ.

سالومەی پیر گوفتاری ئەوی بیست، بەلاّم زەینی کەوتە سەر یۆحەننای کوڕە خۆشەویستەکەی، تابزانێ ئێستاکە لە کوێ یەو ئەو هەنگوینە چ بووە لە لێوەکانی پەیامبەرە تازەکە دەچکایەوە؟ حەزی دەکرد جارێکی دی ئەوی ببینیباو قسەکانی ببیستێ، جارێکی دی خودای دەخستەناو دڵی مرۆڤەوە، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە((کوڕم کارێکی چاکی کرد، ئەو ڕێگاییێکی دروستی گرتەبەر من دوعای خێری بۆ دەکەم)) کەوتە یادی خەونەکەی چەند ڕۆژی لەمەوبەر، کە دەرگای کردەوەو

لەدوای خۆی دایخستەوە، تەواوی راووكو سەندوقە پڕەكانی بەرەلاكردو تا بكەوێتە دوای پەیامبەرە تازەكەوە لەبەرخۆ گوتی: ((بە پێپەتیو برسیەتیەوەبەدوایەوە رامكرد بۆ یەكەمین جارە لە تەمەنم دەركم بەمانای خۆشبەختی كرد)) زوبەدی پیر كە داكەوتنی چاوەكانی ژنەكەی خۆی دی، گوتی: ((گوێت لە منە؟ حەواست لەكوێیە؟))

سالومە وەلامی دایەوە: ((خەریكە گوێ دەگرم)). وا روانیە ئەوەوە وەك بلێی پێشترێ نەیدیتبێ، لە هەمان كاتدا چەند دەنگێكی ئاشنای بەرگوێ كەوتو سەری بەرز كردەوەو هاواری ((ئەوانن)) بەدیتنی كابرای سپیپۆش كەدوو كوڕی ئەو لە گەڵیا رۆیشتبوون رایكردە دەرگای ماڵو پاروشی لەدەمیدا بوو، هاواری كرد ((ئاهای كوڕینە، ئۆغر بەخێر؟ ئا وا بەدەرگای ماڵی مندا رەت دەبن؟ بوەستن، پەترۆس لە كاتێكا لەگەڵ ئەوانی دیكە بۆ پێشەوە دەچوو وەلامی دایەوە ((زوبەدی بەدوای كارێكدا دەچین))

– چ كارێ؟

پەترۆس گوتی: ((كارێكی زۆر نادیارو خەریك كار)) كەوتە خەندەوە.

چاوەكانی پیرەمێرد لە گلێنە دەرپەڕین لە كاتێكا لوقمەكەی بێ جوێن قورتدا هاوارێ هەڵسا ((تۆش یاكوب))؟ بەگەروی تلۆقیوی چووە ژوورەوەو كەوتە روانینی ژنەكەیەوە، ژنەكەی سەری راتەكاندو گوتی: ((زوبەد مالاوایی لە كوڕەكانت بكە، ئەو ئەوانی لە ئێمە سەندوە)) پیرەمێرد كە مەنگ بووبوو گوتی: ((یاكوبیش))؟ بەلام ئەو زەڕە ئەقلێكی لە مێشك دابووناكرێ))؟ سالومە قسەی كرد. ئاخر دەیتوانی چی بەو بلێت؟

ئەو كە شعوری نەبوو، لە سەر سفرە هەڵساو لە دەرگا وەستا. ئەو كۆمەڵە بەختەوەرەی بینی كە ئەو شارێی هەمایونییان گرتوەتەبەر كە لە ئوردنەوە بە ئورشەلیم كۆتایی دێت، دەستی پیری خۆی بەرز كردەوە بە ئارامی بەشێوەیێ كە مێردەكەی نەیبیسێ گوتی: ((دوعای خێری من رێنمای رێتان بێ))



هاوسەفەرەكان لە رێی چوونە دەرەروەی دێ دا رووبەڕووی فیلیپ بوونەوە كە مەڕەكانی لە كەنارێكی دەریاچەوە دەلەوەڕاند. ئەو چووبووە سەربەردێكەوە خۆی هاوێشتبووە سەر گۆپاڵەكەی، بۆ پێشەوە لاربووبۆوە تاسێبەری خۆی كە شەپۆلێكی رەش بوو بەسەر ئاوی شینو سەوزی دەریاچەوە ستایش بكات، بە بیستنی سەروسەدای تلوەبەردەكانی رێگا قامەتی خۆی قیت كردەوە رێبوارەكانی ناسیو هاواری كرد: ((ئاهای من لێرەم ئۆغر بەخێر؟ ئاندریاس وەلامی دایەوە: ((دەچینە مەلەكوتی ئاسمان تۆ دێی؟ ئاندریاس تەماشابكە وەكو مرۆڤ قسە بكە ئەگەر بۆ زەماوەند دەچیتە مەجدەل منیش لەگەڵتا دێم ئاخر ناتانیل داوەتی كردووم بۆ برازاكەی ژندەهێنێ. یاكوب بانگی لێ هەڵسا ((لە مەجدەل دوورتر ناچیت؟)) فیلیپ وەلامی دایەوە ((من مەڕم هەیە، دەتوانم لە كوێیان بەڕەلاكەم؟))

كریست بێ ئەوەی بگەڕێتەوە گوتی: (لەناو دەستەكانی خودا)

-دەبنە خۆراكی گورگ

یۆحەننا بەهاوارێكی بەرز گوتی: ((لێگەڕێ باوایان لێ بێ، شوانە بەخۆی گوت ((وای خودای میهرەبان ئەو خەڵكە تەواو شێت بووینە)). بۆ كۆكردنەوەی مێگەلەكەی فیكەیێكی لێدا.

هاوسەفەرەكان بۆ پێشەوە دەچوون، یەهوداخۆیو گۆپالی خوارو‌خێچی لە پێشەوە دەڕۆیشت بۆ گەیشتن پەلەی بوو، ئەوانی دی شادبوو، هەروەك تبە شیشە فیكەیان لێدەدا ئەو كە بۆ پێشەوە دەچوون، پێدەكەنیو لە پێشەوەدا دەجولا نیگەرانی گەیشتن بوو)).

پەترۆس بە ئارامی لێی پرسی ((یەهود بەمن بلێ ئەو بۆ كوێ دەچین، خەیالم رەحەت بكە)).

نیوەی رووخساری ردێن سوور پێكەنیناوی بوو ((مەلەكوتی ئاسمان))
- بۆخاتری خوا دەست لە شۆخی هەڵگرە بلێ بۆ كوێ دەچین، دەترسێم لە ئوستاد بپرسم

- ئورشەلیم.

پەرتروس دەستی بە مووی خۆڵەمێشی خۆی داهێناو گوتی: ((ئا..هە، سێ ڕۆژ پیادەڕۆیی! ئەگەر دەمزانی سۆلەکەمو گۆپاڵەکەو لوقمەیێ نانو مەتارەکەی شەرابم لەگەڵ خۆم هەڵدەگرت)).

ئەوجارە تەواوی چەهرەی ردێن سوور پێکەنیناوی بوو گوتی: ((ئاخ پەترۆسی بێچارە ئێستا تۆپەکە لە سووراندایە ناتوانی رایگریو مالاّوایی بکەی لە سۆلەو نانو شەرابو گۆپاڵەکەت، پەترۆس مەگەر نازانی دونیامان رەها کردوە. زەویو دەریامان بەڕەلا کردوەو دەچینە ئاسمان)). پاشان سەری لە گوێی پەترۆس ناو پێداچوو گوتی: ((هێشتاش هەل ماوە بگەڕێوە)). پەترۆس گوتی: ((ئێستا چۆن دەتوانم بگەڕێمەوە، بازووەکانی کردەوە هەڵیسووراندە هەر چووارلاوە، وەك بڵێی حەپس بووەو تووشی خەفەقان بووە، هێمای کردە دەریاچەو قایغو ماسیگرەکانی کفرناحوم گوتی: ((هەموو ئەوانە ئێستاکی لەبەرچاومدا بێ جیلوەن)).

ڕدێن سوور بە راتەکاندنی سەری زلیەوە وەلاّمی دایەوە ((ڕزایم، باشە لەم حاڵەتەدا خۆت مەگرخێنەو لێگەڕێ بابڕۆین)).



## بەشی پازدەم

سەرەتا سەگەکانی دێ بۆنیان کردو دەستیان بە حەپەحەپ کرد، ئەوەندەی نەبرد منالاّن بە جاڕدانەوە رایانکردە مەجدەل، ((ئەو وادێت.. خەریکە وادێت))

-دانیشتوانی دێ بەکردنەوەی دەرگاوە پرسیان ((منالّینە، کێ؟))

-پەیامبەری تازە

ژنە جحێڵو پیرەکان رژانە ئاستانەی دەرگاوە، پیاوان کاریان رەها کردو نەخۆشەکان لە خۆشحالّیان خەنی بوونو خۆیان ئامادە دەکرد بێنە دەرەوە تا دەست بگەیەننە ئەوەوە، ئەو پێشترێ لە دەوروبەری دەریاچەی گنسارت ناوبانگێکی دەرکردبوو، بەهرەو هێزی ئەو لە لایەن نابیناکانو ئیفلیجەکان کەلەسەردەستی ئەو چاك ببوونەوە دێ بەدێ بلاّوببۆوە.

- دەستی بەچاوە تاریکەکانم داهێناو رۆشناییم بینی.

هەرکە پێی گوتم داردەستی ژێر هەنگلّم فڕێدەم دەستم بەسەما کرد.

-یەك ئۆردو هەرماس وجودیان دەخواردم، ئەو دەستی خۆی بەرز کردەوەو فەرمانی پێدان: ((ونبنو بڕۆنە ناو جەستەی بەرازەکانەوە)) ئەوان بێ˝درەنگو بە جووتکە هاوێشتنەوە لەدەروونم هاتنە دەرەوەو چوونە ناو بەرازەکان کە لە کەناردا دەلەوەڕان، بەرازەکان شێت بوون، سواری سەرملی یەکتردەبوونو خۆیان دەهاوێشتە ناو ئاوو دەخنکان. مەجدەلیە بە بیستنی خەبەری خۆش لە کوختەکەی هاتە دەرەوە، لەو رۆژەوەی کە کوڕی مێرێ فەرمانی پێدابوو بگەڕێتەوە ماڵەکەیو چیتر گوناه نەکات، دەم دەرگا هەتاوی لێنەدابوو، ئەو گریابوو ژەنگی رۆحی خۆی بە ئەشك سپی کردبۆوە،

هەولێ دابوو بۆئەوەی رابردوو لە پانتایی زەینی خۆیدا پاك بكاتەوە، هەمووشتێ — شەرم، شادومانی، شەوبێداری_ بسپێرێتە دەسی فەرامۆشیو جەستەیەكی پاكیزەی دیكە لە دایك ببێ. چەند رۆژی یەكەم سەری لەزەوی كوتابوو دەینالاند، بەلام جارجارە كە ئارام دەبۆوە، ئازاری نەدەما كابووسەكانی ون دەبوون. ئێستاكێ هەموو شەوێ كریستی لە خەون دەبینی كە هاتووە، وەكو پیاوێ دەرگای ماڵەكەی ئەو دەكاتەوەو لە حەوشەدا لەژێر داری پڕ شكۆفەی هەناردا دادەنیشێ، لە رێگەیێكی دوورەوە هاتبوو، ماندوو تۆزاوی بوو،مرۆڤ ئازاریان دابوو، هەموو عەسران مەجدەلیە ئاوی گەرم دەكردو پێیە موقەدەسەكانی ئەوی دەشوشت، پاشان بە پەخشانكردنی قژی خۆی ئەوی وشك دەكردەوە، ئەو دەحەسایەوە، بزەی دەهاتێو گەپی لەگەڵ مەجدەلیە دەكرد، هیچ كاتێ گوفتاری ئەوی لەبیر نەدەما، بەلام كاتێ كە بەیانی لە خەو ڕادەبوو، بەشادیو سەرخۆشیەوە دەهاتودەچوو. لە چەند رۆژانێكی دواییدا بەدەنگێكی نزمو وردەوە بەشێوەیێ كە هاوسێكانی ئاگایان لێ نەبێ، وەكو درەنگە شەویان دەستی دەكرد بە گۆرانی چڕین، ئێستاكێ كەبەهۆی سەروسەدای منالان ئاگاداری هاتنی ئەو بوو، هەڵبەزیەوە هەواو چەفیەكەی بەشێوەیێك بەستا كە رووخساری ماچاوی داپۆشی، تەنها دوو چاوی درشتو رەشی دیاربوو، دەرگای گاڵەدا پەلەی كرد لە پێشوازی كردنی.

–ئەمڕۆكە عەسر هەراو زەنایێ لەدێ بەرپابوو، كچە جحێڵەكان زێڕو زیوی خۆیان لەبەركردبوو، خەریكی ئامادەكردنی مەشخەڵ بوون بۆ جەژنی زەماوەند، زەماوەندی برازای ناتانیل بوو، ئەویش وەكو مامی پینەدۆز بوو، مرۆڤێكی خەپڵەو رەنگ قاوەیی بوو، لۆقێكی خوترمە ئاسۆی هەبوو، منالێكی تازە پێگەییو بوو، بووكەكە لەژێر پەردەیێكی ئەستوور دابوو، تەنها چاوەكانیو گوارە گەورەو نوقرەیەكانی لەژێرەوە دیاربوو، بەسەر كورسیەكی بەرزەوە لە ماڵی خۆی دانیشتبوو، چاوەڕوانی جەنابی میوانەكانو كچەكانی دێ بوو خۆیانو مەشخەڵەكانیان، ئەو بەهەمان شێوەچاوی لەرێی گرێبەستەكە بوو تا كتێبی پیرۆز بكاتەوەو گرێبەستی مارەكردن دەست پێبكات، لە لایەكی دیكەشەوە چاوەڕوانی ئەوەبوو هەموو بڕۆن، ئەو لەگەڵ مێردە خوترمەلوتەكەی بمێنێتەوە.



ناتانیل هاواری كرد ((واخەریكە دێت)) گوێی لە منالەكان بوو دەرپەڕیە دەرەوە تا دۆستەكانی داوەتی مەراسیمی زەماوەند بكات، ئەوانی لە كەنار بیرەوە لەدەروازەی هاتنە ژوورەوەی دێكە دۆزیەوە، كە بۆ شكاندنی تێنوەتیان ئاویان دەخواردەوە. مەجدەلیە لەكەنار كریست چۆكی دا، پێیەكانی ئەوی شوشت، ئێستا بەقژی وشكی دەكردنەوە، ناتانیل گوتی: ((ئەمشەو زەماوەندی برازامە، گەورەمان بكەو تەشریف بێنە بۆ زەماوەند، بەیەكەوە ئەو شەرابە دەخۆینەوە كە ترێكەیم لە هاوینی ئەمساڵدا لە ماڵی زوبەدی كوشیوە.

لە كاتێكا رووی لە كریست دەكرد پێداچوو گوتی: ((كوڕی مێرێ)) زۆرمان سەبارەت بە تەقدیسی تۆوە بیستووە ئەو شانازیەمان پێ ببەخشە، زاوای تازە پیرۆزكە تا بۆ گەورەیی سراییل مندالێیان دەسكەوێ.

كریست لە جێوە هەڵسایەوەو وەلامی دایەوە ((شادی مرۆڤەكانی ئێمە خۆشحاڵ دەكا، هاوسەفەران با بڕۆین)) دەستی مەجدەلیەی گرتو بەرزی كردەوەو گوتی: ((مێرێ بەدوامان كەوە)) كریست بەشادیو سەرخۆشی بۆ پێشەوە دەچوو، ئەو حەزی لە جەژنو شادی بوو، عاشقی رووخساری بریقەدارو گەشاوەی مرۆڤ بوو، كەیفی بە دیتنی زەماوەندی جەوانانو گەش راگرتنی سۆپەی ماڵ دەهات، لە كاتێكا بەرەو مەراسیمی زەماوەند دەچوو، لەبەرخۆ كەوتە ئەندێشەوە ((گیاكان، سوسكەكان، مەلەكان، ئاژەڵەكان، مرۆڤەكان، هەموویان پیرۆزن، هەموو ئافەریدەی خودان، ژیانی ئەوان چ بەهرەیەكیان هەیە جگە لەوەی بۆ تەكریمی خوداوەند نەبێ؟ كەواتە لێگەڕێ دوعا بكەم كەتا خودا خودایەتی دەكات بەزیندوویی بمێنمەوە)).ئەو كچانەی كە تازە لە گەرماو هاتبوونە دەرەوە، لە پێشەوە بە جلی سپیان لە دەرەوەی دەرگای داخراوو رازاوەوە وەستابوون، ئەوان مەشخەڵیان لە دەست گرتبوو، ئاوازی دێرینەی جەژنی زەماوەندیان دەچڕی، ئەو ئاوازە لە ستایشی بووك بوو، زاوایان مەتەڵ باران دەكرد. لە خوای دەخوازی كەپێ بنێتە ئەم جەژنەو رەگەڵ ئەوانی دیكە بكەوێت، جەژنی زەماوەندی لەشەرەف ئەنجام دابوو، سراییلییەك زەماوەندی دەكرد، دووكەس كە ئەمشەوە دەكەوتنە باوەشی یەكتریەوە لەوانەبوو تۆوی كریستیانو گرێسازكەن. كچان بۆ كوشتنی كات گۆرانیان دەچڕی، زاوا دوا كەوتبوو، ئەوان چاوەڕوانی ئەوبوون تا دەرگابكاتەوەو

مەراسیم دەست پێبکات، بەلاّم لە هەمان کاتدا کە ئەوان گۆرانیان دەگوت، کریستو دارودەستەکەی ئامادەبوون، پاکیزەکان گەڕانەوە، بەدیتنی مەجدەلیە ئاوازیان یەکجاری بڕیو ئەوان بەڕەنگو رووی سووتاوی خۆیان پاشەکشەیان کرد، لەناو ئاپۆڕەی پاکیزەکان چ دەکات؟ کێخوای پیری دێ لە کوێ بوو تا رێ لەو بگرێ؟ جەژنی زەماوەند بێ حورمەت بوو بوو! ژنانی شوو کردووش گەڕانەوەو بەتووڕەیی سەیری ئەویان کرد، لەمیانی ئاپۆڕەی میوانانی پسەپسکەر کە خانەداری بەڕێز بوو لەدەرەوەی دەرگای داخراو ئەوانیش لە چاوەڕوانیدا وەستابوون، جونبو جۆش کەوتە ئاراوە، بەلاّم مەجدەلیە چەشنی مەشخەڵێکی داگیرساو لە درەوشانەوەدابوو، لە تەك کریستوە وەستا هەستی دەکرد کەرۆحی دووبارە پاك بۆتەوەو لێوەکانی ماچ نەکراوە، لە پڕێکا ئاپۆڕەکە رێی کردەوە کێخوای دێ کە پیرەمێردێکی وردیلەو ئەندام وشکیلەبوو، وەکو بورجی زەهرەمار بەرەو مەجدەلیە دەهات، بە گۆپاڵەکەی لەویداو بە هێمای سەر داوای لێکرد ئەوێ جێبهێڵێ. کریست تەماشای ژەهراوی خەڵکی بەسەر دەستو رووخسارو سینەی خۆی هەستپێکرد، جەستەی ئاگری گرت، وەك بڵێی هەزاران دڕکی تێدەچێ. سەیری کوێخای پیرو خانمانی بەڕێزو پیاوانی روو ترشو پاکیزە پەریشانەکانی کردو ئاخی هەڵکێشا: تاکەی چاوی مرۆڤەکان بەنابینایی دەمێنێتەوەو نازانن کە هەموویان برای یەکن؟))

زەمزەمەکە زیادبوو بوو، یەکەمین هەڕەشە لە تاریکیدا دەنگی دایەوە، ناتانیل بەرەو کریست چوو قسەی لەگەڵدا بکات، بەلاّم ئوستاد بە ئارامی ئەوی وەلاناو لە میانی ئاپۆڕەکەدا رێی خۆی کردەوەو هێشتا لە کچەکان نزیك کەوتەوە، مەشخەڵەکان کەوتنەوە داگیرسان، رێ بۆ تێپەڕینی ئەو کرایەوە، لە ناوەندی ئەواندا وەستاو دەستی بەرز کردەوە((خوشکەکانم ئەی پاکیزەکان، خوداوەند دەستی دایە لێوەکانمو قسەیێکی خۆشەویستی ئامێزی دانایە سەریانەوە، لەو شەوە پیرۆزەی زەماوەند دەیکەم بەدیاری بۆئیوە، خوشکانم ئەی پاکیزەکان گوێکانتان بکەنەوە پەنجەرەی دڵتان بکەنەوەو ئێوەش براکانم ئارام بن کە من دەمەوێ قسەتان لەگەڵ بکەم. هەموو بەناڕەحەتی گەڕانەوە، لە دەنگی ئەوەوە پێکەوتن کە تووڕەیەو ژنان گومانیان کرد کە خەمگینە هیچ کەس قسەی نەدەکرد، لەحەوشەی ماڵدا دەنگێ بەریتمی مۆسیقا زانانی کوێر دەگەیشتە



گوێ، کریست دەستی بەرز کردەوە ((خوشکانم ئەی پاکیزەکان، دەزانن ئاسمان لەچی دەچێ؟ وەکو جەژنی زەماوەند وایە خودا زاوایەو رۆحی مرۆڤیش بووك، لە ئاسماندا جەژنی زەماوەند بەرپادەبێو تەواوی مرۆڤەکان داوەت دەکرێن، برایانم لێم ببورن، بەلاّم خوداوەند بەمجۆرە قسە لەگەڵ من دەکات، بە مەسەلەیە ئێستاکێ قسە لەگەڵ من دەکات))

–بڕیار بوو لەدێ دا جەژنی زەماوەند بەرپابێ، دە پاکیزە مەشخەڵی خۆیان بۆ پێشوازی زاوا هەڵگیرساندو چوونە دەرەوە، پێنج لەوان دانا بوون، بەقاپی خۆیان رۆنیان لەگەڵ خۆیاندا برد، پێنجی تر نادان بوون روونی زیادیان لەگەڵ خۆیان نەبرد بوو، ئەوان لە دەرەوەی ماڵی زاوا وەستانو چاویان لەڕێ بوو، بەلاّم هاتنی زاوا دواکەوت، ئەوان خەواڵوبوونو خەوتن، نیوەشەو بانگێ بەرزیۆوە ((ئێستا زاوا دێت خێراکەن لە پێشوازیکردنی)) تەواوی پاکیزەکان لەجێ وە هەڵسان تا زەیت لەچرایان بکەن، چوونکە چراکان لەماڵی خامۆشی بووندا بوون. بەلاّم پێنج پاکیزەی نادان رۆنیان نەبوو بەپێنج پاکیزە داناکانیان گوت (خوشکان کەمێ روون بە ئێمە بدەن واخەریکە مەشخەڵی ئێمە خامۆش دەبێ)) بەلاّم دانایان لە وەلاّمدا گوتیان ئێمە بۆ ئێوە رۆنمان هەڵنەگرتووە، بڕۆن بڕێ پەیدا بکەن)) لە کاتێکا پاکیزە نادانەکان بۆ دۆزینەوەی رۆن پەلەیان دەکرد، زاوا گەیشت پاکیزە داناکان لەگەڵ ئەودا چوونە ژوورەوەو دەرگا داخرا، پاش ماوەیەك ئەو پاکیزە نادانایانە گەڕانەوە، مەشخەڵەکانیان هێشتا هەرگەش بوو، لە دەرگایان داو هاواریان کردو پاڕانەوە ((دەرگامان لێ بکەنەوە)) بەلاّم لە ژوورەوە، پاکیزە داناکان پێدەکەنین وەلاّمی ئەوانیان دایەوە ((سزای ئێوە هەر ئەوەیە، ئێستا دەرگا داخراوەو بڕۆن!))، بەلاّم ئەوان فرمێسکیان هەڵدەڕشتو گریەو زاریان دەکرد ((دەرگا بکەنەوە، دەرگا بکەنەوە)). پاشان کریست لە قسەکردن وەستا، جارێکی دیکەش کوێخوای پیرو میوانانو کابانە بەڕێزەکانو پاکیزە مەشخەڵ بەدەستەکانی بەسەر کردەوەو بزەیێکی کرد. ناتانیل کە بەدەمی کراوەوە گوێی دەگرتو گوتی: ((پاشان؟)) زەینی سادەو تەمبەڵی ئەو کەوتبووە جونبوشەوە ((ئەی پاشان، ئەنجام چی بوو؟ کریست لە کاتێکا چاوانی درشتو ئەفسوناوی خۆی بڕیبوە ئەوەوە، پرسی ((ناتانیل ئەگەر تۆ لە جێی زاوا بوای، چیت دەکرد؟)) ناتانیل بێدەنگ مایەوە، لە زەینی خۆیدا هێشتا ئەندێشەیێکی

دروست لەوەی کە دەبوا چی بکات نەبوو، بۆساتێ بیری کردەوە لێیدەدان، چوونکە بەیەقینی دەرگا داخرابوو، یاسا وای پێویست کردوە، بەلاّم بۆ ساتێکی دیکە دڵی بەحاڵی ئەوان دەسووتاو لەبەرخۆ دەیگوت ((مۆڵەتی بەوان دەدا تا بێنە ژوورەوە)) کریست دووبارە پرسی ((ناتانیل ئەگەر تۆ لە جێی زاوا بوای چیت دەکرد؟)) هێدی هێدیو بەردەوام چاوانی پاڕانەوەئامێزو رووخساری بێ غەلوغەشی پینە دۆزی دەلاواندەوە. ناتانیل بە دەنگێکی کپ بەشێوەیێ کە کوێخای دێ ئاگای لێ نەبێ وەلاّمی دایەوە ((دەرگام دەکردەوە)) ئەو ئیدی توانای رووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ چاوانی کوڕی مێرێی لە دەست دابوو، کریست بەخۆشحاڵی گوتی: ((ناتانیل پیرۆزبایی لەتۆ دەکەم)) دەستی بۆ پێشەوە درێژ کرد وەك بڵێی پیرۆزی بکات.

–لە هەمان ساتدا، هەرچەند کە هێشتا زیندووی، دەچیتە بەهەشت، زاوا دروست بەهەمان شێوەی کە گوتت، وابکە، نۆکەرانی بانگ کرد تا دەرگا بکەنەوە، بانگی سەردا((ئەوە زەماوەندە لێگەڕێن با هەموو بخۆن، بخۆنەوەو دڵیان شاد بێ، دەرگا بۆ پاکیزە ناداناکان بکەنەوە، کە زۆریان راکردوە)). ئەشك لە چاوانی مەجدەلیەدا رێچکەی بەستا ((ئاخ چی دەبوو ئەگەر دەمتوانی دەمێ کە ئەو وشانەی لێ دەچکێتەوە، ماچباران بکەم!)) ناتانیل قەندی لە دڵ دەتاواوە وەك بڵێی پێشترێ چۆتە بەهەشت، بەلاّم کوێخای دێ ئەو بورجە زەهرەمارە گۆچانی خۆی بەرز کردەوە، دەنگێکی گوێکاسکەر لە هەوادا دەنگی دایەوە ((کوڕی مێرێ تۆ بە پێچەوانەی شەریعەت کاردەکەی)) کریست بە ئارامی وەلاّمی دایەوە ((شەریعەت بە پێچەوانەی دڵی من کار دەکات)) کریست هێشتا خەریك بوو قسەی دەکرد کە زاوای حەمامکردوو عەتراوی بە باقەگوڵێکی سەوزی سەرقژی گلوازەی هاتە ژوورەوە، بەچەند گلاسێ کەیفی کۆك کردبوو، لووتی دەبریقایەوە، بەزەرپەیێ دەرگەی کردەوە، میوانان لە دوای ئەوەوە رژانە ژوورەوە، کریستش لە کاتێکا دەستی مەجدەلیەی گرتبوو هاتە ژوورەوە، پەترۆس بە دەنگێکی کپ لە یۆحەننای پرسی ((پاکیزە نادانەکان کامەیانو پاکیزە داناکان کامەن؟ چی لەو مەسەلەیە تێگەیشتی؟

–کوڕی زوبەدی وەلاّمی دایەوە((ئەوەیە کە خودا باوکی ئێمەیە)) گرێبەندساز گەیشت مەراسیمی مارەکردنی جێبەجێ کرد، دوای ئەمە زاوا هاتە ناوەندی حەوشەکەوەو





میوانەکان سەفیان بەست، ماچیان کردو ئارەزووی ئەوەیان کرد کوڕێکیان ببێ کە سراییل لە کۆیلێتی رزگار بکات، بەیەکەوە کەوتنە گۆرانی، میوانەکان کەوتنە نۆشو هەڵپەڕکێوە،، کریستو هاوڕێکانی بەشداری ئەو کارەیان کرد، چەند سەعاتێك تێپەڕی بە هەڵکشانی مانگ، سەفەریان دەست پێکرد، ئێستاکێ پاییزە بەلاّم گەرمای رۆژ دانەبەزیبوو، سەفەرکردن لە فێنکایی نمناکی شەوی دڵدا چەسپ بووبوو .

رووخساریان بەرەو سراییل بوو بۆ پێشەوە دەچوون، ئەوان مەست بووبوونو هەموو شتێ جیلوەییێکی گۆڕاوی هەبوو، چاوەکانیان وەکو رۆح سوکباڵ بووبوون، بەپێی باڵدارەوە بەڕێدا دەڕۆیشتن: ئوردن لەلای چەپیان بوو، لەلای راستیان دەشتایی (زبولون) کە لەژێر مانگدا بە هەرمێنی بەرهەمو خاکەڕا خەوتبوو، دوای بەجێهێنانی وەزیفەیێ کە خوداوەند چەندین سەدە کردبوویە ئەمانەتی ئەستۆی ئەوەوە کە گەنم بە بەرزایی مرۆڤ سەرهەڵگەڕێنیو درەختی مێوە لەگەڵ تریو درەختی زەیتوون لەگەڵ زەیتون بگونجێنێ، ئەمساڵیش ماندوو رازی بوو، ئێستا ئەو وەك چۆن دایکێ کە تازە منالّی بووبێ ماندوو رازیو ئاسودە بووبوو، پەترۆس چەندین جار دەیگوت ((برایان چەند مایەی خۆشحاڵیە)) شادی ئەو لەو رێگایەداو شەوانەو صەفای پێکەوە بوون بێ کۆتایی بوو ((ئایا ئەوە راستی هەیە؟ نەکا جادوومان لێکرابێ؟ بەو حاڵەتەی کە ئێستا تیایام، غەریبی گۆرانی گوتنم کردوە دەنا شەق دەبەم. کریست بانگی کرد ((هەموبەیەکەوە)) لە پێشەوەی ئەوان دەڕۆیشت سەری بەرزکردەوەو پێشی هەموان دەستی پێکرد، دەنگی کزبوو، بەلاّم دڵنەوازو پڕ لە هەست بوو، لای راستو چەپی ئەو سەدای ئاهەنگ ئامێزو ئارامی یۆحەنناو ئاندریاس بوو، بۆ ماوەیەك ئەم سێ سەدا بەرزەی میلۆدی دڵخۆشکەری خۆیان لە فەزا رەها دەکرد، دەنگەکان ئەوەندە پڕ لە هەنگوین بوون کە دڵت خالّی دەبوو، لەبەرە خۆ دەتگوت ((ناتوانن وابەردەوام بن ئەو هەموو شەهدە بەیەقین ئەوان گێژو ناڕەحەت دەکات)) بەلاّم دەنگەکان لە کانییێکی قوڵەوە دەجۆشایە بالاّوە، هەرکاتێ کۆتایی دەنگەکە دادەبەزی دووبارە دەستیان پێ دەکردەوە، هەر لە پرێکاچ لەززەتێ چ قودرەتێ! زیلو بەمی دەنگی پەترۆسو یاکوبو یەهودا، سەنگینو پیرۆزمەندو پڕلە قودرەت هەوای دەلەرزاندو هەموو بەیەکەوە، هەریەکەو بە

وەبەرهێنانی هێزی دەنگی خۆی، هاواری زەبور- زەبوری تەرەب ئەنگێزی سفری پیرۆز یان بەرەو گومەزی فەلەك سەردا:

وای کە هیچ شتێ چاکترو بەسەفاتر نییە

لەسەفەر برایان لەگەڵ یەکتریدا

لە رۆنێکی موقەدەس دەچێت

کەلەڕیشی هاروون دەچکێتەوە

وەکو شەونمی-حەرمون-ە

کەبەسەر کێوی سەهیوندا دەبارێ

ئا لەوێ خودا تاهەتایێ بەرەکەتو زیندەگی خۆی دەنێرێ

چەند سەعاتێك رەت بوو، ئەستێرەکان ون بوون، خۆرەتاو بەرزبۆوە بە جێهێشتنی خاکی (جەلیل) چوونە ناو سامیرای خاکی رەشەوە، یەهودا لە جولە وەستا، پێشنیازی کرد: باشتروایە ئاقارمان بگۆڕین، ئێرە سەرزەمینی ئیلحادو نەفرەت لێکراوە، باشتروایە کەلە پردی ئوردن بپەڕینەوەو بەکەنارێکی دیکەدا بڕۆین، پەیوەندی دروست کردن لەگەڵ خەڵکانێ کەشەریعەت دەخەنە ژێر پێیان گوناهە، خودای ئەوان پیسە، نانو ئاویشیان، دایکم بەمنی گوت: لوقمەیێکی نانی سامیرا لوقمەی گۆشتی بەرازە، باشتروایە ئاقارمان بگۆڕین)). بەلاّم کریست بەئارامی دەستی یەهودای گرتو پێکەوە بەردەوامیان بەرێدا، پێی گوت ((برام یەهودا لەو کاتەی کە مرۆڤی پاك دەست دەداتە دەستی مرۆڤی ناپاك، ئەو مرۆڤەش پاك دەبێتەوە، پەلپ مەگرە، ئێمە بۆ خاتری ئەوان، بۆ خاتری گوناهکاران هاتووین، زاهیدی پێشینان، چ پێویستیان بە ئێمە هەیە؟ لێرە لە سامیرا قسەیێکی گەرم لەوانەیە مرۆڤێ نەجات بدات، یەهودا، قسەی گەرم، کرداری باش، بزەیێکە بەڕووی سامیراییێك کە تێدەپەڕی.. تێدەگەی؟)) یەهودا نیگاییێکی بەدزی کردە دەوروبەر تا دڵنیابێ کە ئەوانی دیکە نایبیسن، لەسەرخۆ گوتی: ((ڕێگەی دوورست ئەوەنییە، بەلاّم سەیر دەکەم تا بگەمە زاهیدی وەحشی، ئەو فەتوا دەدات، کۆن بووبوو، تا ئەوکاتە بۆهەرجێیەك دەڕۆی بڕۆ، هەرچیەك حەزت لێیە بیکە، تۆ ئازاد ناکەم)) گۆپاڵەکەی نایەسەر کۆڵو خۆی بەتەنها کەوتە ڕێگاوە.



ئەوانی دیکە، کەبەڕێدا دەڕۆیشتن لەگەڵ یەك قسەیان دەکرد، کریست بۆ ئەوان دەربارەی عیشقو باوكو مەلەکوتی ئاسمان قسەی دەکرد، ئەو روونی دەکردەوە کە پاکیزە نادانەکان کامانەنو پاکیزە داناکان کامانەن، مەشخەڵەکان چ بوون، رۆنەکە چ شتێ، زاوا چ کەسێکەو بۆچی پاکیزە نادانەکان نەهەر بەتەنها وەکو دانایان چوونە ناومالّەکە،بەڵکو تەنها کەسانێ بوون کەپێی ماندووی خۆیان لەلایەن نۆکەرانەوە شوشتبوو، کاتێ کە چووار هاودەمانی گوێیان راگرتبوو، زەینیان فراوان دەبوو، لەتەواوی قسەکان دەگەیشتو دڵنیادەبوو ئێستا گوناه بۆ ئەوان لە پاکیزە نادانەکان دەچوو، کەبەمەشخەڵی خامۆشەوە وەستانو لەبەرابەر دەرگای خودا دا ئەشك دەڕێژنو دەپاڕێنەوە. ئەوان وەك چۆن ڕێیان تەی دەکرد ئاسمان لە بەرزایی سەری ئەوانەوە هەوراوی هەڵگەڕا زەوی تارو تیرەبوو، هەروا بۆنی بارانی لێدەهات، لەبناری –گێزریم-ی کێوی پیرۆزی باوانیان گەیشتە یەکەمین دێ، لە بنەی دەروازەی چوونە ژوورەوەی دێ بیری دێرینەی یاکوبی لێ بوو کە بە دارخورماو قامیشەلاّن دەورە درابوو، لە هەمان ئەو جێیە دابوو کە هەمان ئەو سالاری هۆزە، خۆیو مەڕەکانی هاتبوو بۆ ئاوهەڵکێشان، لە کەنار بەردێکەوە بیرەکەو ئەو گوریسە دێرینەی کە نەوە لەدوای نەوە دەستیان پێدا هێنابوو رزی بووبوو، کریست هەستی بە ماندووبوون کرد، بەردەکان پێیان بڕی بوو خوێنیان لێ هەڵدەفیچقا، گوتی: ((من هەر لێرە دەمێنمەوە، ئێوە بڕۆنە ژوورەوەو لە دەرگاکان بدەن، مرۆڤێکی باش پەیدادەبێ کە لوقمەیێ نان وەکو سەدەقە بدات بە ئێوە، ژنێکیش بۆلای بیرەکە دێو بۆ ئێمە ئاو هەڵدەکێشێ تا بیخۆینەوە، پشت بەخوداو مرۆڤیش ببەستن. هەر پێنج نەفەر بەرێکەوتن، بەلاّم لە میانی رێدا یەهودا باوەڕی خۆی گۆڕیو گوتی:((من نایێمە ناو دێی پیس، لێوم لەنانی پیس نادەم، هەرلێرە لەژێرئەو دارهەنجیرە دەمێنمەوەو چاوەڕوانی ئێوە دەبم)).

لە هەمان کاتدا کریست لەسێبەری قامیشەلاّنەکاندا راکشا، تێنوو بوو، بەلاّم بیرێکی قووڵ بوو، چۆن دەیتوانی ئاو بخواتەوە؟ سەری لارکردەوە زەینی خۆی سپاردە دەستی ئەندێشەکانەوە. لەبەردەمی ئەودا هیچ گرفتێ لەمیان نەبوو، چاوی کزبوو، ماندوودەبوو، ئەژنۆکانی دەچەمینەوە توانای کێشانی رۆحی نەبوو، بێچارە دەبوو، بەلاّم بێدرەنگ خودا شنەییێکی فێنكو نەرمی هەڵکرد، دووبارە چاوەکانی گڕوتینیان

تێکەوت، هەڵدەستایەوە بەردەوامی بە ڕێی خۆی دەدا، تاکەی؟ تادەمی مەرگ؟ تا ئەو لای مەرگ؟ لەکاتێکا دەربارەی خودای گەورەو مرۆڤ لە ئەندێشە دابوو، قامیشەلاًنەکان کەوتنە بزاوتەوە، ژنێکی گەنج کە گوارەی لە گوێدابوو وگۆزەییێکی لە سەرسەربوو نزیك بیر کەوتەوەو گۆزەکەی نایە سەر لێوی بیر، کریست لەمیانی قامیشەلاًنەوە بینی کە ئەو گوریسێکی لەدەستدایەو لە دەولکی بەستاو ڕەوانەی ناوبیری کرد، ئاوی هەڵکێشاو گۆزەکەی پڕ کرد، تێنویەتی کریست زیادی کرد، لەکاتێکا لەنێوان قامیشەلاًن هاتە دەرەوە گوتی: ((ئەی ژن کەمێ ئاوم بدەرێ)) ژنە هەراسان بوو کریست گوتی: ((مەترسە من مرۆڤێکی شەرەفمەندم تێنوومە، کەمێ ئاوم بدەرێ)).

ژنە گەنجەکە وەلاًمی دایەوە ((چۆن کە تۆ خەڵکی جەلیلی بەم شێوە کە لەجلت بەدیار دەکەوێ، داوای ئاو لە منی سامیرایی دەکەی؟

- ئەگەر دەزانی کە چ کەسێ بەتۆ دەڵێت — ئەی ژن تۆزێ ئاوم بدەرێ- دەکەوییتە سەر پێییەکانی‌و داوات لێدەکرد کە هەتاهەتاییت پێ ببەخشێ بۆ ئاو خواردنەوەی. ژنە هاروهاج بووبوو، ((تۆ گوریس‌و دەولکت پێ نییەو بیریش قووڵە، چۆن دەتوانی ئاو هەڵکێشی‌و بیدەیتە من بۆ خواردنەوە، کریست وەلاًمی دایەوە ((ئەو کەسەی کە ئاوی ئەم بیرە دەخواتەوە، دووبارە تێنوو دەبێتەوە، بەلاًم کەسێ کە ئەو ئاوەی من بەوی دەدەم تا بینۆشێ ئەبەد تێنوی نابێ ئەوکاتە ژنە گوتی: ((ئەی ئاغا لەم ئاوەم پێ ببەخشە تا بۆ ئەبەد تێنوم نەبێ ئیدی هەموو ڕۆژێ بۆ هێنانی ئاو بێمە ئێروکانەوە.

کریست گوتی: ((بڕۆ مێردەکەت بانگکە)).

قوربان من مێردم نییە.

-کە دەڵێی ((من مێردم نییە)) ڕاستە چوونکە تا ئێستا پێنج مێردت هەبووە، ئەوکەسەی کە حاڵی حازر لەگەڵ تۆدایە مێردت نییە. ژنەکە لەستایشدا بوو پرسی ((ئاغا تۆ پەیامبەری؟ ئاگات لە هەمووشتێ هەیە؟ کریست بزەییێکی هاتێ ((ئەگەر مەیلت هەیە شتێ لەمن بپرسی ئازادانە قسەبکە))



-بەڵی ئاغا شتێ هەیە کە مەیلم هەیە وەلاًمی ئەوم پێ بڵێی، تا ئێستا باوکانی ئێمە لەوکێوە پیرۆزەی —گێرزیم- خودایان پەرستووە، ئێستا ئێوە پەیامبەران دەڵێن کە ئێمە دەبێ تەنها لە ئورشەلیم خودا بپەرستین، کامیان ڕاستە؟ لەکوێ خودا دەدۆزرێتەوە؟ بۆ من ڕوونی کەوە.

- کریست سەری خۆی هێنایە خوارەوەو شتێکی نەگوت، ئەو ژنە گوناهکارە کە بەدوای خودا دەگەڕێ وا ئازاری دەدا، لە ناخەوە ڕا کاری کردە سەردڵی کریست، لەبەر خاتری ئەو لەگەڵ خۆی کەوتە گفتوگۆوە، تا چەند وشەییێکی لەبار بۆ ئارام کردنی ئەو بدۆزێتەوە، لەپڕێکا سەری بەرزکردەوە ڕووخساری درەخشایەوە. ئەی ژن ئەوەی کە دەیڵێم جێی لە قولاًیی گیانت بکەوە، ڕۆژێ دێ پێشتر ئەو ڕۆژە گەیشتووە، کە مرۆڤ نەلەم کێوەو نەلە ئورشەلیم ستایشی خودا ناکات، خودا ڕۆحە، ڕۆحیش دەبێ تەنها لە ڕۆحدا ستایش بکرێ.

ژنە هێدمەی گرت، بۆ پێشەوە لاربۆوە لەڕووی نیگەرانییەوە ڕووی کردە کریستوە، لەسەرخۆو بەدەنگێکی لەرزیوەوە پرسی ((نەکاتو.. نەکا تۆ هەمان کەسێ بیت کە لە چاوەڕوانی ئەوداین؟))

-لە چاوەڕوانی چ کەسێکدان؟

- تۆ خۆت دەزانی، بۆ لەمنت دەوێ کە ناوی بێنمە سەرزمان، لێوەکانی من گوناهکارن.

کریست سەری لەیەخەی بردە خوارەوە، وەك بڵێی گوێ لەدڵی ڕادەگرێ‌و لە چاوەڕوانیدایە، بۆ ئەوەی وەلاًم لە دڵی وەربگرێ، ژنە بەلاربوونەوە بەسەریا بەتاسوقەوە چاوەڕوانی دەکرد، بەلاًم لە هەمان حاڵدا کە ئەم دووە بەپەرێشانی لەناو بێدەنگیدا لە جێوە وەستابوون، چەند دەنگێکی خۆشحاڵ دەبیسترا، حەواریەکان، لەکاتێکا سەرکەوتوانە نانیان لە هەوادا ڕادەتەکاند بەدیارکەوتن، کاتێ کە ئوستادیان لەگەڵ ژنێکی نەناس دیت وەستان، کریست بە دیتنی ئەوان شادومان بوو، بۆ؟ چوونکە لەوەلاًمدانەوەی پرسیاری سەرسوورهێنەری ئەو ژنە ڕزگاری بوو، بە هێمای سەر داوای لە هاوڕێکانی کرد نزیك ببنەوە، بانگی کرد. ((وەرن ئەو ژنە باشە هاتووە، خوا ئەوی ناردووە تا ئاومان بۆ هەڵکێشێ، بەلاًم یەهودا چووە سووچێکەوە تا لەشەڕی پیس بوون

بەو ژنە سامیراییە لە ئاماندابێ، ژنە گۆزەکەی لارکردەوەو تێنوەکان ئاویان خواردەوە، دووبارە گۆزەکەی پڕکردو بەکارامەیی داینایە سەری وبەبیرکردنەوەو ئارامییەوە بەرەو لای گوندەکە کەوتەڕێ.

پەترۆس پرسی ((مەولای من ئەو ژنە کێ بوو؟ وا لەگەڵ یەکتر قسەتان دەکرد وەك بڵێی ساڵەهای ساڵە یەکتر دەناسن)).

کریست لە وەڵامدا گوتی: ((ئەو یەکێ لە خوشکەکانم بوو، داوای ئاوم لێکرد، چوونکە تێنوو بووم‌و تێنوێتی ئەو بوو کە نەما.

پەترۆس لە کاتێکا کەللەی زلی خۆی دەخوراند گوتی:- تێناگەم- کریست بەلاواندنەوەی قژی خۆڵەمێشینی دۆستەکەی وەڵامی دایەوە:

–چ قەیدیە، پەلەمەکە، لەکاتی خۆی تێدەگەی، هێوا هێواش لەحاڵی حازر برسیم، باشتروایە شتێ بخۆین)).

–ئەوان لەژێر دارخورمادا خەوتن، ئاندریاس دەستی کرد بە گێڕانەوەی داستانی چوونە ناو گوندو داواکردنی سەدەقە ((لە دەرگای ماڵەکانمان دەدا، بەڵام هۆیهایان لێدەکردین‌و سەریان لەدوو دەنایین، لە ئەنجامدا لەوبەری دێدا، پیرەژنێکی وردیلە دەرگای نیوەکردەوە، خوارەوەو سەرەوەی کوچەی بەدیقەت تەماشاکرد، هیچ کەسێك دیارنەبوو، لەدرزی دەرگاوە نانێکی بەئێمەداو یەکسەر دەرگای داخست، نانەکەمان قەپاندو یەکسەر تێمان تەقاند)).

– پەترۆس گوتی: ((شەرمەزاریە کەناوی ئەو پیرەژنە نازانین، لەخودا دەخوازین کەلەبیری نەکات)).

کریست پێکەنی‌و گوتی: ((پەترۆس نیگەران مەبە، خوداوەند ناوی ئەو دەزانێ)) ئەوکاتە نانی لە دەست گرت، پیرۆزی کرد، سوپاس بۆ خوا ئەوژنەی مەئمورکرد تا نان بگەیەنێتە ئەوانەوە، ئەوکاتە نانیان بۆ شەش پارچەی گەورە بە ژمارەی هەریەکێکیان دابەشکرد، بەڵام یەهودا بەشی خۆی بە گۆپاڵەکەی فڕێدا پشتەوە، رووی وەرگێڕاو گوتی: من نانی سامیرا ناخۆم. من گۆشتی بەراز ناخۆم. کریست لەگەڵیا بڵێ‌و مەڵێی نەکرد، دەیزانی دڵی یەهودا سەختەو نەرم کردنی پیوێستی بەزمان هەیە، زمانی



مەهارەت‌و خۆشەویستی مرۆڤ، بەوانی دیکەی گوت ((باخەریکی خواردن بین، نانی سامیرا وەکو هەموو نانەکانی تر خۆشمەزە بوو، ئەوان بەتەواوی حەزەوە خواردیان، چوونکە ماندووبوون خەوتن، بەڵام یەهودا بەبێداری مایەوە، بە گۆپاڵەکەی دەستی کرد بەکوتینەوەی زەوی، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشە ((برسێتی باشترە لەشەرم)). ئەم ئەندێشەیە ئارامی کردەوە.

یەکەمین دلۆپەی باران دای بەسەر قامیشەلانەکانەوە، ئەوانەی چووبوونە خەو هەڵسانەوە، بەڵام لە کاتێکا کە ئەوان خەریکی دۆزینەوەی ئەشکەوتێك بوون تا خۆیان لێ پەنادەن باییێك بەلای باکوورەوە هەڵساو هەورەکانی رادا. ئاسمان رۆشن بۆوە، ئەوان رێیان گرتەبەر.

ئەو هەنجیرانەی کەبەسەر درەختەکانەوە مابوون، لەهەوای شێداردا بریقەیان دەدایەوە، درەختی هەنار پڕلەمیوە بوو، هاوسەفەرەکان گەیشتن، بڕێ هەناریان رنی‌و چەشەی خۆیان گۆڕی، جوتیاران سەری خۆیان لەزەوی قیت کردەوە بەسەرسامیەوە:- ئەوە چیان دەکرد؟ بۆ خۆیان لە خەڵکی سامیرا داوە؟

نانیان دەخۆن‌و مێوە لە درەختەکانیان دەچنن؟ باشتروایە هەرچەند زووتربێ چارەیان بزرکەن! پیرەمێردێ نەیتوانی بەرگەی ئەم بابەتە بگرێ.

لە باخەکەی خۆی هاتە دەرەوەو بەرەو رووی ئەوان وەستا، هاواری کرد، ((ئاهای جەلیلیەکان، شەریعەتی حەڕامی ئێوە، لەوسەر زەویە پیرۆزە کە ئێستاکێ ئێوە بەسەریا دادەڕۆن، بێ حورمەتی لەگەڵ دەکات، لەم حاڵەتەدا ئێوە بەسەر خاکی ئێمەوە چی دەکەن؟

پەترۆس وەڵامی دایەوە ((ئێمە ئارەزووی زیارەتکردنی ئورشەلیممان هەیە))و رووبەڕووی پیرەمێرد وەستاو سینەتی خۆی کردە سپەر.

پیرەمێرد نەڕڕاندی ((کافرینە، ئێوە دەبێ هەمان ئەو جێیە زیارەت بکەن، هەمان کێوی —گێزریم- کە خودا پێی پیاناوە، مەگەر کتێبی ئاسمانیتان نەخوێندۆتەوە؟ هەمان ئەو جێیە لەبناری —گێزریم- لە ژێر درەختەکانی بەڕوودا، کە خودا بۆ ئیبراهیمی ئاشکرا کرد، کێوو دەشتاییەکان لەم سەرەوە بۆ ئەوسەر، هەرلە کێوی-حبرون- ەوە تا —

ئەدومیە-و سەرزەوی- (میدیەن) ی نیشان دابوو گوتی: ((ئێستا ئەو سەرزەویە موژدەهێنە، سەرزەویێ کە شەهدو شیری لیێ دەتکێ، وادەم دابوو کە بیکەم بە دیاری بۆتۆو پابەندم بەوادەی خۆم)) ئەوان دەستیان نایە ناودەستی یەکترو پەیمانیان ئیمزا کرد، گوێتان لێیە، جەلیلیەکان؟ کتێبی ئاسمان ئاوەها دەڵێت، لەبەر ئەمە، هەرکەسێ ئارەزووی زیارەتی هەیە دەبێ زیارەتکاری ئەم سەر زەمینە پیرۆزە بێت نەك ئورشەلیم کە پەیامبەرانی دەکوشت!))

کریست بە دەنگێکی ئارام گوتی: ((پیرەمێرد هەموو سەرزەمینێ پیرۆزە،خودا لە هەموو شوێنێ هەیەو ئێمە هەموو براین)).

پیرەمێرد لەڕووی سەرسامیەوە گەڕایەوە ((سامیراییو جەلیلیەکانیش؟))

-بەڵێ سامیراییو جەلیلیەکانیشو خەڵکی یەهودیەش .. هەموویان!

پیرەمێرد لە کاتێکا دەستی بەڕیشی خۆی داهێناو نوقمی دەریای قوڵی ئەندێشە بوو کریستی بەسەر دەکردەوەو پرسی ((خوداو هەرماسیش؟))

ئەو بەدەنگێکی ورد قسەی دەکرد، نەبادا هێزی نادیار بیبیستن.

وەحشەت کریستی داگرت، هیچکاتێ بەدرێژایی ژیانی، رووبەڕووی ئەم پرسیارە نەبووبۆوە، کە ئایا رەحمەتی خوداوەند ئەوەند گشتگیرە کە هەتا لێبووردەیی (لوسیفر) یش بگرێتەوەو دووبارە لەمەلەکوتی ئاسماندا پێشوازی لیێ بکرێت؟

وەلامی دایەوە ((پیرەمێرد نازانم... نازانم، من مرۆڤێکمو روم لە مرۆڤە، ئەولای مرۆڤ پەیوەندی بە قودرەتی خوداوەیە))

پیرەمێرد شتێکی نەگوت، لە کاتێکا هێشتا دەستی بەڕیشی خۆیا دادەهێنێت هەر مەلەی لە دەریای ئەندێشەدا دەکرد.

سەیری پێشڕەوی ئەو دوونەفەرە غەریبەی دەکرد کە لە ژێر درەختەکانەوە ونبوون.

شەوڕاشکا، بایێکی سارد هەڵیکرد، ئەوان ئەشکەوتێکیان دۆزیەوە کردیان بە پەناگەو بەمەبەستی گەرم بوونەوە سەریان لە دڵی یەکتر بردە خوارەوە، نیوەی نانیان خوارد، ریش سوور چووە دەرەوە، داری کۆکردەوەو ئاگرێکی داگیرساند، هاوسەفەرەکانی



گیانیان وبەرهاتەوە، ئەلقەوار لە کاتێکا سەیری مەشخەڵیان دەکردو نانی خۆیان دەخوارد.

فیکەی با، لورەی چەقەڵان، دەنگی هەورە تریشقەی دوور، دەگەیشتە گوێیان، لە قەڵەشتی ناو ئەشکەوتدا، ئەستێرەیێ خەریك بوو لە ئاسماندا دەبینرا، بەلاّم هەرزوو هەورەکان گەیشتنو داپۆشین، هاوسەفەران، چاوانیان داخست، سەری خۆیان بەسەر شانی یەکتریەوە نا، یۆحەننا بەدزی خەرگەی پەشمینی خۆی بە کریست داداو هەموو سەریان لەبەردڵی یەکتر ناو وەك ئەو باڵندانەی بەشەو دەفڕن چوونە خەوەوە.

ڕۆژی دوایی چوونە ناو یەهودیەوە، ئەوان ئاگاداری گۆڕانی وردەوردەی درەختەکان بوون، ئێستاکێ ئەسپیندارەکان بە گەلای زەردەوە لەرێگاوە سەفیان بەستابوو، کەبەری پڕ لەمیوەو داری سەرووی کۆنەساڵیش، زەوی چەقێن بەیارو زبر بوو، هەتا ئەو جوتیارانەی کەلە ئاستانەی دەرگا نەویو تاریکەکان وەدەردەکەوتن لەبەردە چەخماخ هێوێن بووبوون، جارناجار، گولێکی کێوی شین بە خاکەڕاییو ویقارەوە لەمیانی بەردەکاندا بەدیاردەکەوتن، جارجارەش لەتەنیایی پڕ بێدەنگیدا، لەناو دۆڵێکی قوڵدا کەوێ دەیخوێند، کریست بە بیستنی دەنگی کەو لەبەرخۆ گوتی: ((حەتمەن قومە ئاوێکی دۆزیوەتەوە بۆ خواردنەوە)) هەستی بەسینەی ئەو مەلەکرد لەناو دەستەکانیدا، شادومان بوو.

بەنزیکتر کەوتنەوە لە ئورشەلیم، ئەو سەرزەویە دڕندەخوتر دەبوو، خوداش دەگۆڕا، لەوجێ زەویە وەك چۆن لە جەلیل پێنەدەکەنیو خودا خۆشی وەك چۆن دێهاتیەکانو خەڵکان لەبەردی چەخماخ دروست بووبوون.

لە سامیرادا ئاسمان لانی کەم بۆ ساتێ هەولێدابوو تا بارانێ بنێریو زەوی تێراو بکات، لێر ئاسن داغ بووبوو، لەو دۆڵە قووڵەدا هاوسەفەرەکان بە هانکە هانك دەڕۆیشتن.

بەهاتنی شەو، چەند ریزە گۆڕێکی گەورەیان بینی کەلەناو بەردەکان هەڵکەنرابوون، لەتەواوی رەشێتی خۆیان دەبریقانەوە، هەزاران تەن لەباوانیان لەناو ئەم گۆڕانەوە لەیەکتردا ون بوونو سەر لەنوێ ببوونەوە بەرد، ئەوان لەناو گۆڕە خاڵیەکاندا پەنایان داو راکشانو زووتر خەوتن تا رۆژێ دوای (کوبراك) بچنە ناو شاری پیرۆزەوە.

کریست تەنها نەفەریّ بوو کە خەو نەچووە چاوانییەوە، ئەولەناو گۆڕەکانەوە کەوتە گەردش‌و گوێی قولاّغی شەوکرد، دڵی نائارام بوو، لەناخیا چەند دەنگێکی لاڵ‌و شێوەنێکی گەورە هەبوو، وەك بڵێی هەزاران مرۆڤ تووشی بەلاّ بووینەو هاواردەکەن، لەدەمەدەمی نیوەشەودا با راوەستاو شەو ئارامی گرت، ئەو کاتە لەو تاریکیەدا دەنگێکی دڵتەزێن هەوای شەق کرد، سەرەتا بیری کردەوە کە چەقەڵی برسیەتی، بەلاّم دوایی بەترسەوە پێکەوت کە دڵی خۆیەتی، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە:

((خودای میهرەبان، ئەوە کێیە لە دەروونم دا هاوار دەکات؟ ئەوە کێیە دەگریت؟))

ماندوومردوو ئەویش چووە ناو گۆڕێکەوە، دەستەکانی خاچئاسا نایە سەریەك‌و خۆی سپاردە دەستی رەحمەتی خوداوەندییەوە،

لەکاتی سەحەردا خەونێکی بینی، وا دیاریدەدا کە لەگەڵ ......دایەو هەردووکیان ئارام‌و بێدەنگ بەسەر شارێکی گەورەو بەسەر بانەکانەوە هەڵدەفڕن، بەگەیشتنە کەناری شار، دوا دەرگا دەکرایەوەو پیرەمێردێکی زلجەستە بەدیاردەکەوت، ریشێکی درێژی هەبوو، چاوە شینەکانی وەك ئەستێرە دەبریقانەوە، قۆڵەکانی بەرز کردەوە بازووەکانی بە قوڕ داپۆشرابوو، کە سەری بەرز کردەوە، ئەوانی بەسەر سەری خۆیەوە لە فڕیندا دەبینی، هاوار دەکات ((بوەستن، دەمەویّ شتێکتان پیّ بڵێم)). ئەوان دەوەستن.

- پیرەمێرد بڵیّ.. ئێمە گویّ دەگرین.

- کریستیانو کەسێکە کە عاشقی تەواوی دونیایە، کریستیانو کەسێکە کە دەمرێت، چوونکە عاشقی هەموو جیهانە.

مەجدەلیە دەپرسیّ: (هەمان پیرەمێرد؟)) بەتووڕەییەوە هاوار دەکات: ((ئەوە بۆ تۆ بەس نییە؟)) مەجدەلیە دەپرسیّ ((مۆڵەتمان پێدەدەیت بێینە ناو کارگەی تۆوە؟))

–نە مەگەر نابینی دەستەکانی من بەقوڕ داپۆشراوە؟ لەناو کارگەدا خەریکی دروست کردنی کریستیانوم.

کریست راجفری‌و بێداربۆوە، جەستەی بەڕاستی بێکێش بوو، هەستی دەکرد لەفڕیندایە، رۆژ دەرکەوت، هاوسەفەرەکان پێشتریّ هەڵسابوون‌و لەرێگەی ئورشەلیم دا چاوەکانیان لەبەردێکەوە هەڵدەبەزیەوە سەر بەردیّ، تەیاربوون‌و نیگەرانی گەیشتن بوون، ئەوان



رێیان تەیدەکرد، بەلاّم کێوی رووبەڕوویان وابەدیاردەکەوت کە دوورتر دەبێتەوەو ریّ دوورترو دوورتردەبێتەوە.

پەترۆس بەنائومێدی گوتی: ((وابیردەکەمەوە کە قەت ناگەینە ئورشەلیم، چیمان بەسەرهاتووە؟ مەگەر نابینی شار دوورترو دوورتر دەبێتەوە، کریست وەلاّمی ئەوی دایەوە ((نزیکترو نزیکتر دەبێتەوە، پەترۆس ئازا بە، بۆ دۆزینەوەی ئورشەلیم ئێمەیەك هەنگاو هەڵدەگرین‌و ئەویش هەنگاویّ بۆ دۆزینەوەی ئێمە، وەك چۆن کریستیانو))

یەهودا لەپڕێکا ئاوڕی دایەوەو پرسی — کریستیانو؟- کریست بەدەنگێکی قووڵ گوتی: ((کریستیانو واخەریکە دێت، برام یەهودا، تۆ دەبیّ بزانی کە ئایا ئێمە لە کۆڕەوێکی دروست داین بۆ دۆزینەوەی ئەو یانا؟ ئەگەر کرداری باش‌و گەورە هیمەت لە ئێمە سەرهەڵبدا، ئەگەر قسەی خۆشەویست ئامێز بەسەر زمانماندا بێت، کریست هەنگاوی خێراتر هەڵدێنیّ‌و نزیکتر دەبێتەوە. چوونکە ئەگەر دروستکار نەبین‌و مایەی شەڕ بین‌و لە هەموو شتیّ بترسین، کریستیانو پشتمان تێدەکاو دوورتر دەبێتەوە، برایان، کریستیانوی ئورشەلیمی لە حاڵەتی بزاوتن دایە، ئورشەلیم بەپەلەیەو ئێمەش وەرن خێراتر جوولە بکەین‌و بیدۆزینەوە، پشت ببەستین بەخوداو رۆحی جاویدانەی مرۆڤ، بەم دڵگەرمیەوە، هەنگاوەکانی خۆیان خێراتر کرد، یەهودا دووبارە بۆ پێشەوە دەچوو، ئێستا تەواوی رووخساری خۆشحاڵ بوو، بەخۆی دەگوت ((ئەو چاك قسە دەکات، هەق لای کوڕی مێریۆە، خاخامی پیریش ئەوەی لەبەر گوێمان دەخوێند: ((ڕزگاری پەیوەستە بەخوودی ئێمەوە، ئەگەر دەست لەسەر دەست دابنێین سەر زەمینی ئسرائیل ئازاد نابێت ئەگەر هەموو چەك هەڵگرین ئازاد دەبین)) لە برۆ ئاگراویەکانیدا کە شۆڕشۆڕ ئارەقەی هەڵدەڕشت، رەنگە تەواوی خەڵك بیّ؟ یەکەمین جار بوو کە ئەم بیرۆکەیە هاتبووە زەینییەوەو هەستی بەشڵەژان کرد چەندین جاروجار لە خۆی پرسی بوو: ((ئایا کریستیانو دەتوانیّ تەواوی خەڵك بێت؟ باشە لەم حاڵەتەدا چ پێویستیەکمان هەیە بەم هەموو پەیامبەرە درۆزنانە؟ بۆ دەبیّ ناخی ئەشکەنجەدارمان کوێر کوێرانە بەدوای کریستا بگەڕیّ؟ دۆزیمەوە، خەڵك کریستیانون، من، تۆ، هەریەك لە ئێمە تەنها کاریّ کە دەبیّ بیکەین ئەوەیە چەك هەڵگرین))

دووبـاره بـەردەوام بـوو لـە پێـشڕەوی کردنـدا، گۆپاڵەکـەی لـە هـەوادا هەڵدەسـووراند، لـە حاڵێکدا بـەم فیکـرە تـازەوە هـەروەکو گۆپاڵەکـەی یـاری دەکـرد، لـە پڕێکـا هـاواری دەکـرد، لـە رووبـەڕوویا ئورشـەلیمی پـیرۆز، جـوان وسـپیی‌و مـەغرور بەسـەر کێـوی دوو لوتکـەوە بریقـەی دەدایـەوە، بـە هاوسـەفەرەکانی دیکـەی کـە لـەدوای ئـەوەوە دەهـاتن نـەگوت، دەبویـست تـا ئـەو شـوێنەی کـە دەکـرێ خـۆی بـە تـەنهایی لـەززەت لـەم دیمەنـە وەرگـرێ، تـەلارەکان، بورجـەکان، دەرگاکـانی تـەلار لـە بیلبیلـەی چاوەشـینەکانیدا دەدرەوشـانەوەو لـە ناوەنـدێ لـە نـاو باوەشـی پاراسـتنی خـودا، پەرسـتگاییێ بـوو، هـەموو زێـڕو درەختـی سەرونیازنیازوو مەڕمەڕ.

پەترۆس بە خۆش ئاوازیەوە پێشنیاری کرد:

((وەرن تا بەیەکەوە سرودی (جوانی خاتوونەکانمان) بچڕین، ئامادەبن ئێستا بەیەکەوە))

هـەر پێـنج نەفـەر لەبـەر گـەردی کریـست دەسـتیان کـرد بـە سـەماکردن کـە بـێ جولـە لـە سەنتەردا وەستابوو، سروودی پیرۆزییان دەست پێکرد.

ئەوکاتەی کە بانگیان کردم:

((ڕابە تا بچینە ماڵی خوا))

بەخەبەر بووم

ئێستا ئەی ئورشەلیم هاتوومەتە پێشگاهت

ئەی ئورشەلیم کە قەلاّیەکی سەختو ستوارت هەیە

با لەناو بورجە بەهێزەکانت سولّحو سەفا

بەرقەرار بێ

بەختەوەریش لەناو تەلارەکانت

بۆ خاتری براو هاوسەفەرەکانم

با هەر لە ئاشتیو ئارامیدا بیت ئەی ئورشەلیم.

## بەشی شانزەهەم

لە ئورشەلیمی سەوزپۆشدا، لە شەقامو سەربانو حەوشەو مەیدانەکانیدا جەژنێکی گەورەی پاییزی بوو، خەڵکی ئورشەلیم هەزاران خێمەیان لە گەڵای زەیتونو مێوو دارخورماو کاژو درەختی سەرونیاز هەڵدابوو بەپێی فەرمانی خوای سراییلو بەیادی ئەوەی کەچل ساڵێك باوانیان لەژێر خێمەدا لە بیاباندا ژیانیان بەسەر بردبوو.

کاتی خەرمان هەڵگرتنەوەو ترێچنی تەواوببوو، دیماهی ساڵ بوو خەڵکی تەواوی گوناهەکانی خۆیان بەدەوری گەردەنی نێریێ قەڵەو هەڵواسیبوو بە بەرد بارانکردنەوە سەریان ڕەدووی نابوو لەبیابان بەڕەلایان کردبوو،

ئێستا هەستیان بە ئارامییێکی مەزن دەکرد، ڕۆحیان پاك بووبۆوەو ساڵی تازە دەستی پێکردبوو، خوداوەند دەفتەری ئەعمالی تازەی کردبۆوە، بۆ ماوەی هەشت ڕۆژ لەژێر خێمەکاندا سەوزەیان دەخواردو دەیانخواردەوەو ستایشی خودای سراییلیان دەکرد کە بەرەکەتی داوە بە بەرهەمو ڕەزەکانیان، هەروەها نێرەبزنێکیشی دەنارد بۆ ئەوەی گەردەنیان لە گوناهەکانیان ئازاد بکات گۆرانیان دەچڕی.

ئەویش هەرکریستی نێردراوبوو لەلایەن خوداوە، باری گوناهەکانی خەڵکی دەگرتە ئەستۆ، لەبیابان لەبرسان لەبێن دەچوو لەگەڵ ئەویشا گوناهی خەڵك لەبێن دەچوو.



حەوشەی فراوانی پەرستگا پڕاوپڕبوو لەخوێن، هەموو ڕۆژێ چەندین مێگەل دەکرانە نەزرو دەکوژرانەوە، شاری پیرۆز بۆنی گەنیوی گۆشتو سەرگینو قشپلی لێدەهات، دەنگی کەڕەنا لە هەوای پیرۆزدا دەنگی دەدایەوە، خەڵکی زۆریان دەخواردو زۆریان دەخواردەوەو ڕۆحیان سەنگین دەبوو، ڕۆژی یەکەم بە خوێندنەوەی مەزامیرو پەرستنو پاڕانەوە بەسەر دەچوو، یەهوە کە نەدەبینرا بە شادومانی پێی دەنایە ناو خێمەکانەوە. دەکەوتە جێژنو خۆشییەوە، لەگەڵ مەیخانەچییەکانی مەیخانەی جیلوەداری خۆی لەنزیك دەروازەی داود دیخواردو دەیخواردەوە، شایستەی ئەوەنییە کەلێوی تەڕنەکاتو دەستی بەریش دانەهێنێ، بەلاّم بەدەست پێکردنی ڕۆژی دووەمو سێیەمی خواردنی گۆشتو شەراب خۆشخوبی خەڵك بەرزدەبۆوە، ئیدی شۆخی بێ تام خەندەی بێهودە دەستی پێکرد، پیاوانو ژنان بەوەقاحەت لە ڕۆژی ڕۆشندا لەگەڵ یەك جووت دەبوون: سەرەتا لەناو خێمەکانو پاشان لە ڕێگاکانو بەسەر سەوزەزارەکانەوە، سۆزانیە تەڕو خاسەکانی ئورشەلیم بەحەوت جۆر سووراوو سپیاو شەلاڵ بە ڕۆنی عەتراوی بەدیارکەوتن، جووتیارانو ماسیگرانی سادە دڵ کە لەوپەڕی سەرزەوی کەنعانەوە دەهاتن تا پیرۆزترین پیرۆز بپەرستینو ستایشی بکەین، دەکەوتنە ناو باوەشی بەئەزمونو سەرسام دەبوون، ئەوان لەخەویشا نەیانبینی بوو کە ماچێ دەتوانی هونەرێکی واو مەزەییێکی وا بگرێتە خۆ.

کریست بە حەبسکردنی هەناسە لەسینەی خۆیدا بەپەلەپڕۆزیو تووڕە بەناو شەقامەکان، کە مەستە نائاقڵەکان بەسەر زەویەوە دەخزینو گلۆر دەبوونەوە، بۆنی گەنیوو پۆخڵیو پێکەنینی کرێت تووشی هێڵنجی دەکرد، هێی دەکردە هاوسەفەرەکانی ((زووتر..زووتر))و بە بازووی ڕاستی لەکەمەری یۆحەنناو بازووی چەپی لەکەمەری ئاندریاس دەچووە پێشەوە، بەلاّم پەترۆس دەمبەدەم دەوەستا، چاوی دەکەوت بەزیارەتکەرانی جەلیلو ئەوانیش پیاڵەیێ شەرابو پارچە گۆشتێکیان پێشکەش دەکرد، لەگەڵ یەك خەریکی خۆشیو باشی دەبوون، یەهودای بانگ دەکردو یاکوبیش دەهات، ئەوان نەیاندەویست هیچ بەهانەییێك بۆ گلەو گازاندە کردن بدەنەدەست دۆستەکانیان، بەلاّم سێ نەفەر لە پێشەوە لەپەلەدابوونو دەمبەدەم هاواریان دەکردە ئەوانەی دواکەوتبوونو ناچاریان دەکردن کە بکەونە ڕێگاوە.

پەترۆس کە کەیفی خۆش بووبوو، دەسەنگرایەوە ((سوپاش بۆخوداتان ناهێڵن وەکو مرۆڤ هەناسەییێکی رەحەت هەڵبکێشین، تەماشاکە خۆمان هاوێشتۆتە ناو چ دەردەسەرییێکەوە؟))

یەهودا بە راتەکاندنی سەری دەیگوت: ((پەترۆسی بێچارەی من، تەواوی ئەو ماوەیە لەکوێ بووی؟ خەیاڵ دەکەی بۆ خۆشگوزەرانی هاتینە ئێرە؟ واخەیاڵ دەکەی بۆ زەماوەند بچین؟)).

بەلاّم لە کاتێکا ئەوان بەپەلە رێیان دەبڕی دەنگێکی زبریان لەیەکێ لە خێمەکانەوە بیست ((ئاهای پەترۆس ی کوڕی یونس ئەی جەلیلی بێ مەعریفەت، رێو رەسمی هاوڕێیەتی ئەوەیە؟ مەگەر لەمەرگی ئێمە بێزاری؟ یاڵلاّ وەرە لێوت تەڕکە)).

پەترۆس دەنگەکەی ناسیەوەو وەستا ((هێی سیمۆنی کەیرەوانی ی پیسو پۆخڵ خۆشحاڵم کە دەتبینم)).

پەترۆس رووی لە هەردوو هاوڕێکانی خۆی دەکاو دەڵێت ((کوڕینە ئەمجارە ناتوانم قورتاربم باشتروایە بوەستمو لێوم تەڕکەم، سیمون ئارەق خۆرێکی قەهارە، مەیخانەچی مەیخانەی جیلوەداری نزیك دەروازەی داودە دەبێ لەدار بدرێ، هەقیەتی، بەلاّم مرۆڤێکی نازەنینە دەبێ گەورەی بکەینو شانازی پێوە بکەین))

راستی کارەکە وابوو کە سیمون مرۆڤێکی پۆشتە بوو، لەکاتی گەنجێتیدا لە کەیرەوان هاتۆتە دەرەوە مەیخانەییێکی کردۆتەوە، هەرکاتێ پەترۆس دەهاتە ئورشەلیم یەکسەر دچووە ماڵی ئەو، دوو نەفەر دەیانخواردو دەیانخواردەوە، فشەو گاڵتەیان دەکرد، جارێ گریان دەگرتو جارێ شەڕیان دەکرد، دووبارە ئاشت دەبوونەوەو کەمێکی تر شەرابیان دەخواردەوە، ئەوکاتە پەترۆس خۆی لە لێفێکی ئەستوردا وەردەپێچاو بەسەر مێزێکەوە رادەکشاو دەنووست، ئێستا سیمون لەژێر خێمەکەیدا کە لە گەلاّی مێو دروست کرابوو، دانیشتووە قەڕابەییێکی لەژێر بازوو پیاڵەییێکی مسینیشی لەدەست دایە، بۆ خۆی خەریك بوو مەشروبی دەخواردەوە.



دوو دۆستەکە یەکتریان لە باوەش کوشی، هەردووکیان نیوە مەست بوونو هەریەك بۆ ئەوەی دیکە وا رایاندەپەڕمووە یەکتری کە چاویان پڕ لە ئەشك دەبوو، دوای کۆتاهاتنی ئەحواڵپرسیو چاکو چۆنی سەرەتاییو بەسەلامەتی سەر لەبەریەك نان، سیمون دەستی بەپێکەنین کردو گوتی ((مەرج دەکەم بۆ دۆزینەوەی تەعمید کەوتویتە رێ، کارێکی راستو دروست دەکەی، دوعای خێر بۆ هەمووتان دەکەم، چەند رۆژێ لەمەوبەر خۆم ئاوەمۆر (تەعمید)[*] کردو پەشیمانیش نیم تەواو رەزایەتبەخشەوە، یەهودا دەیخوارد، بەلاّم مەشروبی نەدەخواردەوەو گوتی ((ئاگات لێیە باشتربووی؟ ئەو دستەو یەخەی شلەژانێکی گەورەبوو

–وەللا دۆستی من چ بڵێم؟ سالاّنێکە لە ئاو دورکەوتومەتەوە، پەیوەندییێکی باشم نییە لەگەڵ ئاو، بۆ شەراب دروست بوویم، ئاو تایبەتە بە بۆقەکان، بەلاّم چەند رۆژێ لەمەبەر بەخۆمم گوت: ((چ پێویست دەکات، بابڕۆین بۆ پاکشۆری، هەموو وادەچن، هەڵبەتە کە لەمیانی ئەوانەی کەبەهۆی پاکشۆری دووبارە لەدایك دەبنەوە، چەند نەفەرێکیش هەیە شەراب دەخۆنەوە، خۆ هەموویان ناتوانن کەربن، لەبەرئەمە دەتوانم، لەگەڵ چەند نەفەرێ ئاشنایەتی بکەمو بیانکەمە موشتەری تۆڕ، هەموویان مەیخانەی من لە دەروازەی داود دەناسن)).

سەرتان نەیەشێنم، سەرەنجام رۆیشتم، پەیامبەر جانەوەرێکی وەحشییە، چۆن بۆتان بگێڕمەوە؟ مەشخەڵی ئاگر لەلووتی دەردەهێنێ، خودایا خۆت رەحم بکەی، جارێکیان گەردەنی گرتم منی قەپاندە ناو ئاو، من قیژاندم، ئەو لە خودا بێ خەبەرە، کەم مابوو بمخنکێنێ، وەلێ هەرچۆنێ بێ زیندوومام، لەئاو هاتمە دەرەوەو ئێستاش لە خزمەتی ئێوەم. یەهودا قسەی خۆی دووبارە کردەوە ((ئاگات لێیە باشتر بووی))

–بەو شەرابە قەسەم مەرگ بەڕاستی حاڵی هێنامەوە جێ، هەستم بە ئارامی کرد، پاکشۆر دەڵێت لە دەست گوناهەکانم ئاسوودەم، بەلاّم بەینی خۆمان بێت واخەیاڵ

---

[*] تەعمید: ئاوەمۆر کردن، ئەم وشەیەم لە ئێزدییەکان وەرگرتووە، کە مناڵیان دەبێ لە ئاوی هەڵدەکێشنو دەڵێن مۆری دەکەین.

دەکەم لەدەست چرکو چەوری لەشم رزگاریم بوو، چونکە کە لەئاو هاتمە دەرەوە بە ئەندازەی ئەنگوستێ رۆنی بەسەرەوە بوو، بەژێر لێوەیەوە پێکەنی، پیاڵەکەی پڕکردو نۆشی، پەترۆسو یاکوبیش نۆشیان، دووبارە پیاڵەکەی پڕ کرد رووی لە یەهودا کرد: ((تۆی ئاسنگەر، مەشروب ناخۆیتەوە؟)) گەمژەڵ گیان، ئەوە شەرابە نەك ئاو))

ردێن سوور بە بۆ دواوەبردنی پیاڵەکە وەڵامی دایەوە: ((من هیچ کاتێ شەراب ناخۆمەوە)).

چاوانی سیمون دەرپەڕیو بەدەنگێکی نەرم گوتی: ((تۆش یەکێ لەوانی؟))

یەهودا گوتی ((بەڵێ یەکێ لەوانم))

دوو ژن روویان هەڵگرتبوو رەتبوون، ساتێ وەستانو چاویان لەوان هەڵتەکاند، سیمون بەسەرسامیەوە گوتی: ((ژنیش نا؟)) یەهودا بە ئاوازێکی وشك گوتی: ((نا))

سیمون کە ئیدی نەیدەتوانی بەرگەی ئەو بگرێت، هاواری کرد (( بێچارە، باشە تۆ چ کار دەکەی؟ دەتوانی بەمن بلێی خودا بۆ شەرابو ژنی دروست کردووە؟ لەبەر خاتری خۆی بوو یا ئێمە؟

لەهەمان ساتدا ئاندریاس بە راکەڕاك هاتو هاواری کرد: یاڵڵا زووبن، ئوستاد پەلەیەتی

مەیخانەچی پرسی: کام ئوستاد؟ هەمان ئەوەی کە سپی پۆش بوو، هەمان پێپەتیەکە؟

بەڵام سێ هاوسەفەرەکە پێشترێ رۆیشتبوون، سیمون ماتو مەبهوت لەدەرەوەی خێمەکەی وەستابوو، پیاڵەییێکی خاڵی لەدەست بوو قەرابەی لەژێر هەنگڵ دابوو سەیری ئەوانی دەکردو سەری رادەتەکاند، ((ئەوەش دەبێ پاکشۆرێکی دیکە بێت، شێتو وێتێکی دیکە کەتازە وەکو قارچك دەڕوێن. چاکتروایە بەسەلامەتی ئەو بخۆینەوە، هیوادارم خودا زەرە ئەقڵێکی پێبدات، لەهەمان ئەم سەینو بەینەدا بوو کریستو هاوسەفەرەکانی گەیشتبوونە گومەزی گەورەی پەرستگا وەستابوون، دەستو پێو دەمی خۆیان شوشت تا بۆ زیارەتکردن بچنە ژوورەوە، نیگاییێکی خێرایان کردە



ژوورەوە، ریزەی کورسیەکان یەك لەدوای یەك پڕبوو لە خەڵكو ئاژەڵو — ستونی سپیو شینی مەڕمەڕی کە مێوو ترێی زێڕینی گرتبووەخۆو لە هەموولایەك، سایەبان، خێمە، چەرخ، دارتاش، شەراب فرۆش، قەساب، دەنگی هاوار، جوێنو خەندە لە فەزا پێچی دەخواردەوەو ماڵی خودا بۆنی گەنیوی عەرەقو پیسیو پۆخڵی دەدا، کریست دەستی نایە سەر لووتو دەمیەوە، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، بەڵام خودا لە شوێنێ نەبوو، ((بێز لە جەژنی ئێوە دەکەمەوە، بێزم لە بۆنی گەنیوی گوڵکە قەڵەوەکانی بۆم دەکوژنەوە دەبێتەوە، هێڵنجم دێتێ شەڕی قاڵو قیلی سروودو کەم کەنەوە لەسەرم)) ئەوە ئیدی نە پەیامبەرو نەخودا بەڵکو دڵی کریست بوو کە تێکچڕژا بوو بانگی دەکرد، لە پڕێکا سەری گێژبوو، هەموو شتێ ون بوو، ئاسمانەکان کرانەوە، فریشتەییێکی قژ ئاگرین هاتە خوارەوە، بەمەشخەڵو دووکەڵێ کە لە قژی سەری هەڵدەسا، بەسەر بەرزایی بەردێکی رەش لە ناوەندی سەحن دا قەراری گرت، نووکی شمشێری کردەلای پەرستگای مەغروورو گومەزی زێڕینی.

کریست بەملاو بەولادا هات، خۆی بەبازووی ئاندریاس گرتەوە، کە چاوی کردەوە پەرستگاو خەڵکی پڕ بگرەوبەردەی بینی، فریشتە خۆی لەبەر رۆشناییێکی مەزن حەشاردابوو، کریست دەستی خۆی بۆلای هاوسەفەرەکانی درێژ کردو هاواری کرد: ((لێم ببورن، بەڵام ناتوانم هێزم وەبەربێ، لەخۆ دەچمو باشتروایە بچمە دەرەوە)).

یاکوب گوتی ((بێ زیارەتکردن))

کریست لەوەڵامدا گوتی ((یاکوب ئێمە لە ناو دەروونی خۆماندا زیارەت دەکەین، بەدەنی هەریەك لە ئێمە پەرستگایە)). ئەوێیان بەجێ هێشت، یەهودا لە پێشەوە دەڕۆیشتو گۆپاڵەکەی لەزەوی دەدا، خەریك بوو لەبەر خۆ دەیگوت: ((ئەو بەرگەی پۆخڵیو خوێنو هاوار ناگرێ، ئەو کریستیانونییە)).

فەریسییێکی وەحشی بەسەر دوا پەیژەی پەرستگاوە کەوتە سوژدەوە، بەمکوڕی وتاسوقەوە مەڕمەڕی ماچدەکردو فیغانی دەکرد، چەند نووشتەییێکی بە ئایاتی وەحشەتناکی تەوراتەوە بە بەنێکی ئەستور هاوێشتبووە دەوری گەردەنو بازووەکانی، لەبەر کاریگەرێتی سوژدەکردنی بەردەوامدا ئەژنۆکانی وەکو ئەژنۆی وشتر غارا بوون،

رووخسارو گەردەنو سینەی بەبرینی سەرکراوەو ناسوور داپۆشرابوو: هەموو کاتێ کە تۆفانی خودا لەزەوی دەدا، چەند بەردێکی تیژی هەڵدەگرتو دەکەوتە گیانی خۆیەوە، ئاندریاسو یۆحەننا بەخێرایی پێشی کریستیان گرت تا ئەو فەریسییە نەبینێ، پەترۆس بۆلای یاکوب هاتو سەری لەگوێی نا ((دەیناسی؟ یاکوب، کوڕی گەورەی یوسفی نەجارە، تەڵەسمو نوشتە دەفرۆشێ، هەموو دەقیقەیەك رۆحی هەرماسێ دێتە سۆراغیەوەو خۆی بەزەوی دادەو تا سەرحەدی مەرگ لەسەرو سینەی خۆی دەدا)).

یاکوب پرسی ((ئەوە هەمان کەسێ نییە کە بە دوای ئوستاد دا دەگەرێ؟

- چۆن؟ دەڵێت کە گوایە ئەو مایەی نەنگی خانەوادەی خۆیەتی.

ئەوان لە دەرگای زێڕینێ پەرستگادا چونەوە درەوە، بەنێوان دۆڵی —سیدرون- دا تێپەڕین، بەرەولای دەریای مردوو- کەوتنە رێگەوە، لەلای راستدا، ئەوان بەکەناری باغو زەیتونستانی - گیتسمانی- داڕەت بوون، ئاسمان لەسەرەوەی سەریاندا سپیو ئاگرناك بوو، گەیشتنە کێوی زەیتونەوە، هەوا کەمێك دڵخۆشکەربوو، لەگەڵای درەختەکانی زەیتوندا نوور دەچکایەوە، رەوەی قەلان سەریان لەدوای یەك نابوو، بەرەو لای ئورشەلیم لەجولە دابوون، ئاندریاس دەستی لە کەمەری کریستدا وەرێناو دەربارەی ئوستادی پێشتری خۆی — پاکشور- قسەی دەکرد.

- ئەو ئەلیاسێکی بەڕاستی بوو، لە کێوی کەرمل دابەزی تا رۆحی مرۆ جارێکی دی بە ئاگر چارەساز بکات، شەوێکیان بەچاوی خۆم بینیم کە داشقەی ئاگرین بە دەوری سەریا دەسوورایەوە، شەوێکی دیکە قەلێکم بینی کە رەژوێکی داگیرساوی بەدەنووکی خۆی گرتبوو، بۆ ئەوی دەهێنا، رۆژێکیان زاتم هێنایەبەرخۆو پرسیم ((تۆ کریستیانو نیت؟)) وا راجفری وەك بڵێی پێی لەمار نابێ، بە ئاخێ وەڵامی دایەوە: ((نا من گاییێکم کە هەوجار رادەکێشێ، کریستیانو توخمو تۆیە..

- ئاندریاس بۆ جێت هێشتن؟

- دەمخوازی تۆوەکە بدۆزمەوە.

- دۆزیتەوە؟



- ئاندریاس دەستی کریستی لەسەر دڵی خۆی داناو سوور هەڵگەڕا، وەڵامی دایەوە (بەڵێ) بەڵام وا هێدی قسەی دەکرد کە کریست نەیبیستێ.

بەهەناسەبڕکێوە، هێواش هێواش بەرەو دەریای مردوو دادەبەزین، خۆرەتاو ئاگری هەڵدەڕشتە سەر سەری ئەوانەوە، لە بەرەو رووی ئەوان کێوەکانی — موئاب- بوو . کەواتە لەپشتی ئەوانەوە کێوە سپیەکانی ئەدومیە بوو، جادە لۆفەی دەکردو زیاترو زیاتر دادەبەزین، دەچونە ناو چاڵێکی قووڵەوە، هەموو هەناسەیان لەسینە راگرت، لەبەرخۆ دەیانگوت: ((ئێمە بە دۆزەخدا دەچینە خوارەوە)) بۆنی قیرو گۆگرد بەر لووتیان دەکەوت.

رونایی نابینای کردبوون، بەپێی بریندارو چاوانی سووتاویان کوێرانە بۆ پێشەوە دەڕۆیشتن، سەدای زەنگۆڵەیان دەهاتە بەرگوێ، دوو وشتر رەت بوون، وشتر نەك ئەو سەرابانەی کە لە گەرمایی سووتێنەردا وندەبنو نامێنن.

کوڕی جحێڵ تری زوبەدی بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((من دەترسم ئێرە دۆزەخە)).

ئاندریاس وەڵامی ئەوی دایەوە ((ئازابە مەگەر نەتبیستووە بەهەشت لەناو دڵی دۆزەخدایە؟

- بەهەشت؟

- هەر زوو دەیبینی

- عاقیبەت خۆرەتاو سەری خۆی بردە چاڵدانی مەغریبەوە. کێوەکانی موئاب، رەنگ ئەرخەوانی وتیرە هەڵگەڕان، کێوەکانی ئەدومیە بۆربوون، بوونە مایەی ئارامی چاوانی خەڵکەکە، لەپڕێکا لە پێچی جادەوە جەستەو نیگایان شادبوو، وەك بڵێی پێیان نایە ئاوێکی فێنکەوە، ئەو چەمەنانەی کە بەشێوەیێکی چاوەڕواننەکراو لەبەر چاویان لەمیانی زیخو لیمدا فراوان بووبوونەوە، ئەو ئاوانەی کە خوڕەو قاقایان بوو ئەو دارهەنارانەو ئەو خاونوە سپیانە سایەداری چی بوون؟ لەپڕێکا؟ هەوا پڕ بوو لەبۆنی گوڵی سوورو یا سەمیندا.

ئاندیارس بەخۆشحاڵی هاواری کرد: (( ئەریحا)) شیرینترین خورمای دونیاو دڵنەوازترین گوڵی سووری هەیە، ئەو گولاڵنە هەرکاتێ کەسیس دەبن تەنها کارێ کەدەبێ بکرێ ئەوەیە لەناو ئاویان ببەینە خوارەوەو دووبارە گەش دەبنەوە، شەوێکی ناگەهانی دامەنی خۆی کردەوە یەکەمین مەشخەڵ داگیرسابوو، کریست کە بۆ لەززەت وەرگرتن لەم ساتە پیرۆزەدا وەستابوو گوتی ((سەفەرکردن، دانیشتن بۆ سەیرکردنی شەو، لەکاتی باڵکێشاندا، گەیشتن بەدێ، یەکەمین مەشخەڵە داگیرساوەکانو شتێ بۆخواردنو نەبوونی شوێنێ بۆ خەوتنو هەموو شتێ لە دەستی کەرەمی خوداو بەباش زانینی مرۆڤەکان- بەڕای من یەکێکە لە گەورەترینو نایابترین لەززەتی دونیا. بۆنی غەریبەکان بەرلووتی سەگەکانی دێ کەوتو کەوتنە وەڕینەوە، دەرگاکان کرانەوە، هاوسەفەرەکان بۆلای دەرگاکان چونو لەدەرگایاندا بە رووخۆشیەوە لێرە لوقمەنانێکو هەنارێ، لەوێ مشتێ ترێ یا زەیتونی تازە درا بەوان، تەواوی ئەو سەدەقانە لەلایەن خوداو مرۆڤەوە پێشوازیان لێکرا، خزینە گۆشەی باخێکەوەو خواردیانو بێ چەندو چون چونە خەوەوە، شەو هەموو شەوێ لەخەونیاندا دەنگی وەرچەرخاوی بیابانیان دەبیست، کە وەکو دەریا لایلایەی بۆ دەکردن.

بەڵام کریست لەخەوی خۆیدا گوێی لە دەنگی ئەو کەرەنایانە دەبوو کە دیوارەکانی ئەریحایان دەڕوخاند.

***

دەمەدەمی نیوەڕۆبوو، هاوسەفەرەکان بەرەنگو رووی پەرپوەو زمانی شۆڕەوەبویان گەیشتنە دەریای مرووی نەفرەت لێکراو، ئەو ماسییانەی کەبە هەڵڕژانی زێی ئوردون دەهاتن هەر کە دەگەیشتنە دەریای مردوو لەبێن دەچون، تەکو توك چەند درەختێکی کورتیلە لە کەناریەوە لەو ئێسکانە دەچون کە بەسەرپێوە وەستاون، ئاو، خۆڵەمێشیو توندو بێ جووڵە، ئەگەر زاهید بوای بەسەر پا لار دەبوویەوە، دەتتوانی هەردوو سۆزانییە رزییەکەی سەدوم ئەموورە ببینی کە لە قولایی رەشی دەریادا یەکتریان لە باوەش گرتووە، کریست بەسەر بەرزایی بەردێکەوە وەستاو چاوی بڕیە دوورەوە، داکشانێکی رەهابوو، زەمین دەسووتا، کێوەکان دەتاوانەوە، بازووی



ئەندریاسی گرت وپرسی ((یەحیای پاکشۆر لە کوێیە؟ من کەسێ نابینم .. هیچ کەس)).

ئاندریاس وەڵامی دایەوە ((لەوێ لەپشت قامیشەڵانەوە، رووبار ئارامو هێور دەبێتەوە، ئاو لە گۆڵێ دەکاتو پەیامبەر ئاوەمۆر دەکات با بچین بیدۆزینەوە، من رێیەکە شارەزام)).

- ئاندریاس تۆ ماندووی لای ئەوانی دیکەبە من خۆم دەڕۆم.

- ئاخر ئەو وەحشیە، لەگەڵت دێم.

- ئاندریاس دەمەوێ خۆم بڕۆم لێرەبە.

کریست لە کاتێکا دڵی بەتوندی لێیدەدا، بەرەو قامیشەڵان کەوتەڕێ، دەستی لەسەر دڵی خۆی داناو لاواندیەوە، تا ئارام بگرێت، رەویەکی تازەی قەلەکان لەبیابانەدا بەدیار کەوتن، کە بە پەلە بەرەو ئورشەلیم هەڵدەفرین لەپڕێکا دەنگی پێهەڵنانی چەند کەسێکی لەدوای خۆیەوە بیست، گەڕایەوە، یەهودابوو. ردێن سوور بە تیزخەندەیێ گوتی ((لەبیرت چوو بانگم بکەی ئەوە بەگێچەڵترین کاتە کە من دەمەوێ لەگەڵت دابم)).

کریست گوتی "وەرە"

کریست لە پێشو یەهودا لەپاش، بە ئارامی بۆ پێشەوە دەچون، ئەوان قامیشەڵانیان بەرکەنار دەکردو پێیەکانی خۆیان لە زەنەکو زەنویردا دەبردە خورەوە، لەپڕێکا مارێکی سپی بەسەر بەرزایی بەردێکەوە هەڵخزیو سەروگەردەنی بەرزکردەوە، بەچاوانی وردیلەو ئەفسونگەری خۆیەوە سەیری ئەوانی کردو کەوتە هیسەهیسەوە نیوەی لەشی چەسپایە سەر بەردو نیوەکەی دی رەقو تەق وەستابوو ، کریست بۆ ساتێ لەشوێنی خۆیدا مایەوە، دەستی خۆی بەمیهرەبانی بۆ مارەکە تەکاند، وەك بڵێی بەخێرهاتنی دەکات، یەهودا گۆپاڵەکەی بەرزکردەوە، بەڵام کریست نەیهێشتو گوتی ((برام یەهودا ئازاری پێ مەگەیەنە، ئەویش وەزیفەی خۆی ئەنجام دەدات، - بەپێوەدان)).

گەرما دادوبێدادی بوو، بای باشوور کەلەلای —دەریای مردوو-دا هەڵیکرد، بۆنی لاشەی گەنیوی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا، کریست ئێستا دەیتوانی دەنگی درو وەحشی ببیستێ، جارناجار، چەند وشەیێکی دەناسیەوە ((ئاگر..تەور، درەختی مەزن)). ئەو کاتە بەدەنگێکی بەرزترەوە: تۆبە بکەن...!یەکسەر ئاپرییێکی مەزن کەوتنە هاوارو فیغانەوە.

کریست لەسەرخۆتر بەفێڵەوە بۆ پێشەوە دەڕۆیشت، وەك بڵێی لە ئەشکەوتی جانەوەرێکی وەحشی نزیك دەبۆوە، قامیشەلاْنەکانی وەلانا، هەمهەمە زیادبوو، لەپڕێکا بۆ رێگرتن لەهاوار، لێوەکانی خۆی گەستەوە، بۆ ئەو لەوێیە، پێی نایە سەر بەردێکەوە وەستا، کەوتە سەر ئاوەکانی ئوردن، ئەو مرۆڤێك بوو لەگەڵ کلۆیەك، فریشتەییێکی برسی بوو یا فریشتەییێکی تۆڵەستێن؟ مرۆڤە نەعرەت لێدەرەکان بەسەر بەردەکانەوە شەپۆلیان دەدا: حەبەشیەکان بەنینۆکو پێڵوی رەنگکراویان، کلدانیەکان بە ئەڵقەی درشتی مسینی لووتیان، سراییلیەکان بەخەتی ردێنی چەوریان، پاکشۆر دەمی کەفی کردبوو، لەکاتێکا بای باشوور ئەوی دەلەرزاند، هاواری دەکرد (( تۆبە بکەن... تۆبە بکەن! یەهوەی سەبایوت گوتویەتی ((لەم رۆژەدا فەرمان بە خۆرەتاو دەدەم، کە تا نیوەڕۆ ئاوابێ، نوکەکانی هیلالی مانگ دەچنم)و تۆوی تاریکی بەئاسمانو زەمین وەردەکەم، پێکەنیننتان دەکەمە گریانو گۆرانیەکانتان دەکەم بە سەردولکە، من هەڵدەکەمو دەستو پێو لووتو گوێو پرچی سەری ئێوە هەڵدەڕژێنمە سەر زەویەوە))

یەهودا پێیەکی بۆ پێش ناو بازووی کریستی گرت ((گوێت لێیە؟ سەیرکە کریستیانو بەمجۆرە قسەدەکات! ئەو کریستیانویە؟))

کریست وەلاْمی دایەوە ((نەیەهودا برام! ئەو کەسەی کە تەوری هەڵگرتووە ئەوە رێ بۆ کریست دەکاتەوە، واقسە دەکات، بەلاْم کریستیانو نییە، خودی کریستیانو واقسە ناکا)). لاربۆوە، گەلاْیێکی سەوزی لێکردەوەو نایەناو ددانەکانی.

ردێن سوور بەزەمزەمەکردنەوە گوتی : ئەو کەسەی کە رێ دەکاتەوە کریستیانویە))
کریستی پاڵ پێوەنا تا لەمیانی قامیشەلاْنەکان بێتە دەرەوەو خۆی نیشان بدات،



ئەوکاتە فەرماندەرانە گوتی: ((یاڵلاْ بڕۆ پێشەوە)) لێگەڕێ بابتبینێ، ئەو قەزاوەت دەکات)) کریست هاتە پێشەوە، بەدوودڵیەوە دوو هەنگاوی هەڵێنا، ساتمەی کرد، وەستاو چاوانی بڕیە پەیامبەر تەواوی رۆحی بووبووە نیگا، کە پەیامبەری بەسەر دەکردەوە، خزیە سەر پێیەکانیو سەری ئاگرینی ئەو پاشان بالاْتر، تەواوی جەستەی خستە ژێر نیگاوە، لەپشت پاکشۆردا سوورایەوە، هەستی کرد کە تەواوی بەدەنی لەبەرانبەر نیگای سوتێنەردا رووت دەبێتەوە، تووڕەبوو، بۆ دەوروبەر سووراو چاوەکانی خڕو شاهین ئاسای نیوە داخستبوو تا باشتر ببینێ، ئەو گەنجە بێدەنگو بێ جولەکە بەجلی سپی کێیە واسەیری ئەو دەکات ئەوی لە شوێنێ دی بوو، بەلاْم کەیو لەکوێ؟ هەوڵیدا وەبیر خۆی بهێنێتەوە نەکا لە خەودا بێت؟ زۆرجاران خەوی بە سپی پۆشەکان دەدی.

خەوی دەبینی، ئەوان هێچکات قسەیان لەگەڵ نەدەکرد، تەنها دەیانڕوانییە ئەوو دەستیان رادەتەکاند، وەك بڵێی سەلامی لێدەکەنو مالاْوایی لێدەکەن، ئەوکاتە کەلەشێری سەحەر دەیخوێندو دەبوونە رۆشناییو ون دەبوون.

لەپڕێکا پاکشۆر کە هێشتا رووی لەلای ئەوبوو هاواری کرد، وەبیری هاتبۆوە کە رۆژێ دروست لەکاتی نیوەڕۆدا لە کەنار رووبارێکدا راکشابوو، کتێبی ئەشعیا پەیامبەری کە بەسەر پێستی بزنەوە نووسرابوو دەخوێندەوە، یەکسەر بەردوئاوو خەڵكو قامیشەلانو رووبار نەمان، هەوار پڕ لە ئاگر بوو وشەکانی ئەشعیا پێغەمبەر وەك چۆن دەرگا کرایەوە، کریستیانو پێی نایە دەرەوە، وەبیری هاتەوە کە ئەو جلی سپی لەبەرەو جەستەییێکی ئێسقانیو سووتاوو پێخواست بوو، لەهەمان کاتدا گەلاًیێکی سەوزی بەددان گرتبوو، چاوەکانی زاهید پڕبوو لە ئەشکی شەوقو خۆشحاڵی، لەسەر تاوێرە بەردەکە هاتە خوارەوە، لەکاتێکا گەردەنی کەچی خۆی بۆ پێشەوە هێناوو، نزیك بۆوە، بەدەنگی سامناکی خۆیەوە کە دەلەرزی پرسی ((تۆ کێی؟))

کریست بەر لە دانانی پێیەك گوتی ((من ناناسی؟) خۆشی دەنگی دەلەرزی، دەیزانی سەر نویشتی ئەو پەیوەستە بەم وەلاْمەی ئەو .

پاکشۆر لەبەرخۆ دەیگوت: (( خۆیەتی)) دڵی بەتوورەیییەوە لێی دەداو نەیدەتوانی، زاتی نەدەکرد، بڕیاربدات، جارێکی دی گەردەنی هێنایەوە پێشەوەو ((تۆ کێی؟))

کریست بەدەنگێکی دڵنەواز بەڵام گلەیی ئامێز وەك بڵێی سەرزەنشتی ئەو دەکات وڵامی دایەوە ((مەگەر کتێبی پەیامبەرانت نەخوێندۆتەوە؟ ئەشعیا چی دەڵێت؟ ئەی پێشەنگ وەبیرت نایەتەوە؟))

زاهید بەڕازەوە وەڵامی دایەوەو گوتی: ئەوە تۆی، تۆ؟ دەستەکانی لەسەر شانی کریستدا داناو چاوەکانی ئەوی دەپشکنی، کریست بەدوودڵیەوە گوتی: ((من هاتووم)). ئەوکاتە لەتوانای هەناسەدانی نەماو نەیتوانی بەردەوام بێ لە قسەکردن، دووبارە وەستا، وەك بڵێی خەریکی بۆ پێش بردنی پێی بێ لە هەوڵو تەقەلا دابوو بزانێ کە ئایا دەتوانی، بێ ئەوەی بکەوێتە سەر زەویەوە هەنگاوێکی دیکەی هەڵگرت، پەیامبەری کێوی بەسەریا لاربۆوە بەخامۆشی بەسەریدەکردەوە، تا ئێستا وشەی سەرسام ئەنگیزترو سەرسوورهێنتری لەو وشانەی کەبە سەر زمانی کریستدا دەهات بەرگوێ نەکەوتووە.

کوڕی مێرێ دووبارە گوتی ((من هاتووم)). وا بە ئارامی قسەی دەکرد هەتا یەهودا کە لەدوای ئەوانەوە گوێ قولاغ وەستا بوو نەیبیست، ئەوجار پەیامبەر راجفری، تێگەیی بوو، گوتی: ((چی؟)) مووی لەشی زیت بۆوە.

قەلێ بە سەریانەوە رەتبوو، هاوارێکی زبر وەك هاواری غەرق بوێ کە تانە لەشتێ بدا یا پێدەکەنێ سەردا، پاکشۆر تووڕەبوو، لاربۆوە تابەردێ هەڵگرێو بۆلای ئەوی باوێ، قەلەکە پەڕی هەڵکێشا بوو رۆیی بوو، بەڵام ئەو هێشتان بەدوایدا دەگەڕا، خۆشحاڵبو بەلابردنی زەمان، بۆ، چونکە بەم هۆیەوە کەم کەم زەینی ئارامی دەگرت.. لە کاتێکا لەجێوە هەڵدەستایەوە بەئارامی گوتی: ((بەخێر بێی)) سەیری کریستی کرد، بەڵام چاوەکانی پڕ لە موحیبەت بوو.



دڵی کریست داڕما، ئایا گوێچکەکانی زەنگیان دەژەنی یا لە حەقیقەتدا پەیامبەر بەخێراتنی ئەوی کردبوو؟ ئەگەر ئەوە حەقیقەتی هەیە چەند سەرسامو لەززەت بەخشو چەند ترسناك بوو پاکشور سەیری دەوروبەری خۆی کرد، چاوەکانی هەڵسووراندە لای رووباری ئوردنو قامیشەلانو خەڵکەکەوە، کە بەناو زێلاقەوە ئەژنۆیان دابوو دانیان بەگوناهەکانی خۆیان دەنا. باوەشی بە قەڵەمڕەوی خۆی کردو بەپەلە ماڵاوایی کرد، ئەوکاتە رووی لە کریست کردو گوتی ((ئێستاکێ دەتوانم بڕۆم)) کریست بەدەنگێ کە لێنیاو مکوڕانەبوو وەڵامی دایەوە ((ئەی پێشەنگ ئێستاکێ نا یەکەمجار دەبێ من ئاوەمۆر بکەیت)).

- من؟ ئەی خوداوەند، تۆ کە دەبێ ئاوەمۆری من بکەیت.

- ئەوەندە بەرز قسە مەکە، لەوانەیە گوێتان لە قسەی ئێمە بێ، زەمانی دەرکەوتنی من هێشتا نەگەیشتووە، باشتروایە بڕۆین.

یەهودا هەرچەند هەوڵیدەدا ببیستێ، هیچی جگە لەڕازی سەماو شادی ئەنگیز نەبیست کە وەك بڵێی لەبەیەك پەیوەستی دوو رووبار هەڵدەستا.

ئەو ئاپۆڕەی کە هاتن لە کەناردا رێیان کردەوە، بە بەدیارخستنی جلی سپی خۆی، ئێستاکە، ئەوەی کە تەنی ئەوی داپۆشی بوو هەتاو بوو، چ کەسێ بوو؟ ئەو پیاوەی کە بەبێ دانپیانان بەگوناهەکانی خۆی بەمجۆرە جیلوەو دڵنیاییەوە پێ دەنێتە ئاو، چ کەسێ بوو؟ لەگەڵ پاکشۆردا کە لە پێشەوە بوو، رێی خۆیان لەناو هەڵڕژانی شیندا کردەوە، پاکشۆر چووە سەر ئەوەبەردەی کە سەری لەئاو دەرهێنابوو، کریست لە کاتێکا ئاو بەدەنی تا ژێر چەنەی گرتبوو، بەسەر رۆخانەی زیخو لیمی رووباردا لەتەك ئەودا وەستا لەساتێکا پاکشۆر دەستی بۆ هەڵڕشتنی ئاوو ئەدای پیرۆزکردن بەسەر رووخساری کریستدا بەرزکردبۆوە، خەڵك هاواریان دەکرد، رووباری ئوردن لە پڕێکا لە هەڵڕژان وەستابوو، دەستەی ماسی رەنگاو رەنگ لە هەموو لایەکا بە بالای ئاو هەڵدەگەڕان، بەدەوران دەوری کریستەوە دەستیان بەسەما کرد، ئەوان باڵەکانیان دەکردەوەو دادەخستو کلکیان رادەتەکاند، مارماسییێکی مووین لە هەیئەتی پیرەمێردێ بە لاولاوەوە ئالا بوو

لەبنی رووبارەوە هەڵسایەوەو پشتی بەقامیشەلاّن داو بەدەمی کراوەو چاوانی دەرپەڕیوی لەبەر شادیو ترس روانیە ئەوەی کە لەبەرەوڕووی ئەودا دەگوزەرا، خەڵکی بەدیتنی ئەو سەرسامییە، وشك هەڵگەڕابوون، زۆر لەوان بۆ داپۆشینی چاویان بەسەر کەنارەوە خۆیان هاوێشتبووە سەر رووخساریان. ئەوانەش کەلە جێی خۆیان مابوونەوە لەگەرمای زۆر بەتینەدا دەلەرزین، یەکێ لەوان بەدیتنی وەدرەکەوتنی پیرەمێردێ- لاولاوپۆش لەقولاّیی دەریا هاواری کرد ((رۆحی ئوردن))و لەخۆچوو.

پاکشۆر، صەدەفی- چاڵی- ی پڕ ئاو کردو بەدەستی لەرزیویەوە دەستی کرد بە هەڵڕشتنی ئاو بەسەر رووخساری کریستەوە، ((بەندەی خودا ئاوەمۆر کرا)) لە دووبارەکردنەوە وەستا، نەیدەزانی چ ناوێکی لێ بنێ، گەڕاوە تا لە کریست بپرسێ بەلاّم لەکاتێکا خەڵکی بەسەر پاژنەی پێیەکانی خۆیاندا وەستابوونو لە چاوەڕوانی بیستنی ناوبوون، دەنگی چەند باڵێ کە لە ئاسمان هاتنە خوارەوە گەیشتە گوێ، مەلێکی سپی باڵ- مەل یا یەکێ لە سەرافیمەکانی(*) یەهوە؟ بەهەڵفڕینەوە هاتو بەسەرسەری پاکشۆردا قەراری گرت، بۆ چەند ساتێ بێ جولە مایەوە، ئەوکاتە لەپڕێکا سێ جار لەبەرزایی سەری ئەودا سوورایەوە، سێ باقە نوور لەهەوادا درەوشایەوەو مەلەکە هاواری کرد، وەك بلّێی تاوی نهێنی ئامێزی ئەو کە بەر لەمە هیچ کاتێ نەبیسترابوو بانگەشە دەکا وابەدیار دەکەوت کە ئاسمانەکان وەلاّمی پرسیاری خامۆشی پاکشۆر دەدەنەوە.

هەراوزەنا لەناو ئاپۆڕەی خەڵکدا پێچی خواردەوەو جێبەجێ بوو.

دەنگی وێك کەوتنی باڵەکان وشەیان دەگەڵدابوو، دەنگی خودا؟ دەنگی مەل؟ پەرجوویێکی عەجیب بوو کریست بەهەموو گیانیەوە گوێی راگرتبوو تا ببیستێ، دڵی گەواهی دەدا کەناوی حەقیقی ئەو دەخوێندرێتەوە، بەلاّم نەیدەتوانی بیگرێتو بزانێ چیە، ئەوەی کە دەیبیست دەنگی هەڵڕژانی شەپۆلو باڵ، وشە

* سەرافیم: فریشتەیەکە گوایە باڵی هەیەو سیمبولی سروشە.



تاڵەکانی دەروونی بوو، سەری هەڵبڕی مەلەکە لەوپەڕی بەرزایی ئاسمانەوە باڵی کردەوە نوور لەناو نوور بوو. پاکشۆر کە مانەوەی دێرینی لە بیابانو گەرمەسێری ستەمگەردا ئاشنای خودای کردبوو تەنها کەسێ بوو کە تێگەیشت، لەکاتێکا دەلەرزی لەبەرخۆ زەمزەمەی دەکرد ((ئەمڕۆ بەندەی خودا، کوڕی خودا ئومێدی مرۆڤایەتی ئاوەمۆر کرا)) ئەوکاتە بەسەری ئەنگوستی خۆی فەرمانی بە ئاوی ئوردندا دووبارە هەڵڕژێ.. رێوڕەسمی پیرۆزکردن دیماهی هاتبوو.

## بەشی حەڤدەهەم

خۆرەتاو وەکو شێرێ لە بیابان هاتە دەرەوە، دەستیکرد بە کوتانەوەی دەرگای ماڵەکانی سراییل، لەتەك تەکی ماڵەکانی یەهودیان، نوێژی سپێدان بەرەو خودای گەردەن کەشی کەلیمیان پەڕوباڵی خۆی هەڵکشاند،

((ئەی خودای ئێمەو خودای باوانی ئێمە، سوپاسی تۆ دەکەین، ئەی ئەو کەسەی زاڵو گەورەی بەسەر هەموو شتێکا، تەنها تۆی یارو یاوەری ئێمە، تۆ جاویدانی، سوپاسی تۆ دەکەین کە پشتیوانی ئیبراهیمی، چ کەسێ لە قودرەتدا دەتوانێ لەگەڵ تۆ بۆ رکابەرێتی رابێت، تۆ کە مرۆڤ دەمرێنیو دووبارە زیندووی دەکەیەوەو رەهایی دەبەخشی؟ ئەی رەهابەخشی سراییل، سوپاس بۆ تۆ، مادامەکێ زیندووین پەلە بکەو دوژمنانمان پەراگەندە بکەو هەڵگرە لەمیاندا)). لەکاتی دەرکەوتنی خۆر، کریستو یەحیای پاکشۆر بەسەربەردێکەوە لەناو چالاَییێکی سەروی ئوردنەوە دانیشتبوون، ئەو شەوەو هەموو شەوێ دونیایان لەناو دەستی خۆیاندا دەگرتو لەکاری بەیەکەوە مەشورەتیان دەکرد، کە چی لێبکەن، جارێ یەکێ لەدەستی دەگرتو جارێ ئەویتر، رووخساری یەکێکیان درو موکرِ بوو، بازووەکانی وابۆسەرەو خوارەوە دەبرد دەتگوت لە راستیدا تەورێکی لەدەست گرتووەو دایدەبەزێنێ، رووخساری ئەویتر ئارامو دوودڵ بوو چاوەکانی پڕ لە بەزەیی.



پرسی: ((مەگەر ئەڤین بەس نییە))

پاکشۆر بەتووڕەییەوە وەلاَمی دایەوە: ((نە، درەخت رزی بووە، خوداوەند منی بانگ کردو تەورێکی دادەستمو منیش وەرمگرتو لەکەنار ریشەکانی درەختی ئەوم داناو وەزیفەم بەئەنجام گەیاند، ئێستا تۆ وەزیفەی خۆت ئەنجام بدە، تەور هەڵگرەو بیوەشێنە)).

- ئەگەر ئاگر دەبووم، دەمسوتاند، ئەگەر دارشکێن بووام تەورم دەوەشاند، بەلاَم من دڵێکمو عاشقاتی دەکەم.

- منیش خاوەن دڵێکم، بۆیە ستەمو قەباحەتو نەنگیم گەرەك نییە، چۆن دەتوانی ستەمگەرو قەبیحو نەنگیەکانت خۆشبوێ؟ زەربەی خۆت بوەشێنە، یەکێ لەگەورەترین ئەرکی مرۆڤ تووڕەییە. کریست بەدڵێکی پەلپینەوە گوتی: ((تووڕەیی؟ مەگەر هەموو برا نین؟)) پاکشۆر بەتانەوە وەلاَمی دایەوە: ((برام؟ وا بیر دەکەیتەوە کە ئەشق رێگەی خودایە، ئەشق؟ ببینە)).

دەستی موویینو ئێسقان ئاسای درێژکردو هێمای کردە دەریای مردوو، کە بۆنی لاشەی گەنیووی دەداو گوتی: ((تۆ قەت بە رووی ئەو دەریایەدا تووڕە بووی تا ئەو دوو سۆزانییە- سەدومو ئەمورە- لە قولاَییەکەیدا ببینی؟ خودا تووڕەبوو، ئاگری هاوێشت، زەوی سەرەوژوور کرد، خاك وشك هەڵگەڕابوو بوو بەدەریاو سەدومو ئەمورەی قووت دا، رێگەی خودا ئەوەیە، بەدوای دابچۆ، پەیامبەران چ دەڵێن؟ ((لەڕۆژی خودادا خوێن لەدار هەڵدەڕژێ، بەردی بناغە زیندوودەبنەوەو رادەبنو خاوەن ماڵ لەناو دەبەن،)) رۆژی خودا لە رێگەیەو خەریکە دەگات، من یەکەمین کەس بووم ئاگادار بوومەوە. هاوارێکم کرد، تەورم دەست دایێ، لەکەناری دونیام داناو بانگی تۆم کرد، بانگم کردی کە بێیت، هاتیو ئێستا من کۆچ دەکەم)).

دەستی کریستی گرتو وەك بلێی تەورێکی سەنگینی لەناو دەستی ئەو دادەنا، کریست ترساو پاشەکشەی کردو گوتی:

- تەمەننا لە تۆ دەکەم کە کەمێکی دیکە سەبر بکەیت، پەلە مەکە، من دەچمەوە بیابان تا لەگەڵ خودا قسە بکەم، دەنگی ئەو لەوێ رونتر دەبیسترێ.

- هەروەهاش دەنگی وەسوەسە، ئاگاداربە هەرماس بەنەزمێکی تەواوی هێزەوە لەکەمیندا رونیشتووە، ئەو بەچاکی ئاگادارە کە تۆ ئارەزووی گیانی ئەوت هەیە، ئەو بەتەواوی وەحشیگەری‌و تەواوی نەرم‌و نیانییەوە دەکەوێتە رووبەڕووی تۆوە، ئاگاداربە بیابان تژی دەنگی نەرمی‌و مەرگە.

- دۆستی من دەنگی نەرم‌و مەرگ ناتوانێ فریوم بدات، پشت بە من ببەستە.

- دڵنیام لەتۆ، واوەیلا ئەگەر دڵنیا نەبم لەتۆ، بڕۆ لەگەڵ هەرماس قسە بکە، لەگەڵ خوداش، بڕیاربدە، ئەگەر تۆ ئەو کەسەی کە لە چاوەڕوانی ئەودا بووم، خوداوەند پێشتر بڕیاری داوەو ناتوانی رابکەیت، ئەگەر ئەویش نەبی، باکم بە فەنای تۆ چییە؟ بڕۆ پێشەوە تا بزانم چ دەکەی، بەڵام زووبە، ناتوانم دونیا بەحاڵی خۆی لێگەڕێم.

- ئەو کۆترە کێولکەیەی کە لەکاتی ئاوەمۆرکردنمدا، بەسەر سەرمەوە باڵی لێکدەدا چی دەگوت؟

- کۆترە کێویلکە نەبوو، ئەو رۆژە دەگات کە قسەیان ببیستی، بەڵام تا ئەو زەمانە، ئەو وشانە وەك شمشێری هەڵواسراو بەسەر سەرتەوە دەبێ.

کریست هەڵسایەوەو دەستی بۆ پێشەوە برد، لەکاتێکا دەنگی دەلەرزی‌و گوتی : ((ئەی پێشەنگی خۆشەویست، خودا حافیز، رەنگە بۆ هەمیشە بێت)) پاکشۆر لێوەکانی خۆی فشاردایە سەر لێوەکانی کریست، دەمی پشکۆیەکی سووتێنەربوو لێوەکانی کریستی سووتاند، لەکاتێکا دەستە زەریفەکانی کریستی توند دەگوشی گوتی: ((ئەوە تۆی کە عاقیبەت رۆحی خۆمی پێ دەسپێرم، ئەگەر تۆ ئەو کەسەی کە لە چاوەڕوانی دابووم، دواهەمین رێنمایی من ببیستە: ((چونکە گوماندەکەم، هیچ کاتێکی دیکە تۆبەسەر ئەم سەر زەمینەوە نابینمەوە)). کریست بەلەرزینەوە کەوتە زەمزەمەوە ((سەراپام گوێیە، ئەو رێنماییانە چین؟)).



- حاڵەتەکە بگۆڕە، بازووەکانت بەهێزکە، دڵت بکە پۆڵاین، باری ژیانی تۆ سەنگینە، خوێن‌و دڕك لەتوێڵی تۆدا دەبینم، برام، مەولام... بەرگە بگرە، ئازابە، دوو رێگە بەڕووتا کراوەتەوە: رێگەی مرۆڤ کە هەمووارەو رێگەی خودا کە رۆدەچێ‌و دادەتەپێ، رێگەی بەگرفت هەڵبژێرە، مالاوا! لە فیراقدا خەمگین مەبە، وەزیفەی تۆ فرمێسك رشتن نیە، وەزیفەی تۆ وەشاندنە، بیوەشێنە دەستت نەلەرزێ، لەبیر نەکەی کە هەردوو رێگا، کچانی خودان، بەڵام لەسەرتادا ئاگر لەدایك بوو، ئەو کاتە ئەشق، لەبەر ئەمە باشترە بەئاگر دەست پێبکەین، بۆ پێشەوە، سەرکەوتن یارو یاوەرت بێ.

خۆرەتاو سوورهەڵگەڕابوو، لەبیابانی عەرەبستاندا کاروانی وشتر بەدیار کەوت، پێشڕەوان زیارەتکەری تازەبوون‌و دەسماڵی رەنگاوڕەنگیان لەسەری تاشراویان پێچابوو، هەندێکیان تەڵسمی کەوان‌و وێنەیان پێوەبوو، کە لە ددانی بەراز دروست کرابوو بەملیان شۆڕبووبۆوە، هەندێکیان خودای برونزی بچووکیان هەبوو هەندێکی دیکەیان گەردەنبەندی بەرگەردەنیان هەبوو، کە لە ددانی دوژمنەکانی خۆیان دروستیان کردبوو، ئەوانە جانەوەری وەحشی خۆرهەڵات بوون، بۆ دۆزینەوەی پاکشۆر هاتبوون، پاکشۆر بەدیتنی ئەوانەوە هاوارێکی دڵ ورشێنەری سەرداو بەسەر تاوێرە بەردەکەوە بازی دایە خوارەوە، وشترەکان بەسەر لیتاوی رووباری ئوردندا چۆکیانداو دەنگی بیابان بەدەنگدانەوەییێکی بێ بەزەییانە دەگەیشتە بەرگوێ: ((تۆبە بکەن، تۆبە بکەن، رۆژی خودا گەیشتووە)). لەهەمان کاتدا کریست هاوسەفەرەکانی خۆی دۆزیەوە، ئەوان بە خامۆشی‌و خەمزەدەوە بەسەر کەناری رووبارەوە دانیشتبوون. چاوەڕوانی ئەویان دەکرد، سێ رۆژو سێ شەو بوو هەواڵێ لەوەوە نەبوو، ئەو رۆژو شەوانەی کە پاکشۆر دەستی لە کاری ئاوەمۆرکردندا هەڵگرتبوو تا لەگەڵ ئەو قسە بکات، هەردەیگوت‌و دەیگوتەوە کریستیش بەسەری لارەوەبووی گوێی دەدایێ، ئەوەی کە دەیگوت، وەکو خەرتەڵ دادەبەزیە سەر گیانی کریستەوە، ئەرێ بەڕاستی بۆ یەکێکیان ئەوەندە کێوی بوو ئەویتر ئەوەندە خەمگین؟ یەهودا تووڕەو توند، بۆ سەرەوەو خوارەوە دەهاتودەچوو، ئەو دووە سەریان لە بن گوێی یەکتر ناو قسەیان دەکرد، یەهودا گوێکانی قولاغ دەکرد، بەڵام تەنها دەنگی زەمزەمە، زەمزەمەیێکی توندی دەبیست کە لە هەڵرژانی

ئاو دەچوو، ردێن سوور، شێتانە بەسەر بەردەکەوە هەڵدەخزیو جارێکی دیکە لەتاریکیدا ڕێگەی تەی دەکرد، لەبەرخۆ دەکەوتە زێمارەوە ((شەرمەزاری بۆمن، شەرمەزاری، کە ئەوانە رەها بکەم تا لە غیابی منەوە دەربارەی سراییل بڕیار بدەن، پاکشۆر دەبوایە سەنگینی رازی خۆی بهاوێتە سەر ئەستۆی منەوەو تەورەکەی بەمن بەخشیبا، من تەنها کەسێکم کە هەست بە ئازاری سراییل دەکەم، منم کە توانای بەکارهێنانی تەورم هەیە، ئەو سەرەڕۆیە، بە وەقاحەتەوە بانگ رادەدێرێ کە ئێمە هەموو براین، زاڵمو مەزلووم، سراییلیەکانو رۆمیەکانو یۆنانیەکان، هەی سەگ هەموویان بخوات))[*]. یەهودا لەپای بەردێك دوور لە هاوسەفەرەکانی دانیشتبوو، دەیخوازی سەربە تەنی ئەوان نەبێ، بۆ ساتێ چووە خەوەوە، وای هاتەبەرچاو کە دەنگی پاکشۆرو چەند وشەییەکی پەڕاگەندەو تێکچڕژاوی گوێ لێدەبێ، ((ئاگر)) ((سەدومو ئەموردە)) ((داوەشێنە)) لەخەو راپەڕی، بەڵام بە بێداربوونەوە شتێکی نەبیست، جگە لە دەنگی مەلو شەوگەردو چەقەلو زەمزەمەی رووباری ئوردن لەمیانی قامیشەلانەکانەوە، بەرەو رووبارەکە چوو، سەری مەشخەڵداری خۆی لە ئاو بردەخوارەوە تا ئاگرەکە دامرکێنێتەوە، بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((حەتمەن بەسەر بەردەکەوە دادەبەزیو ئەوکاتە سەرەڕای مەیلی ئەو پەی بەڕازی دەبەم.

لەبەرئەمە کە کریست نزیك کەوتەوە، وەکو هاوسەفەرەکانی دیکە لەجێوە هەڵبەزیەوە، ئەوان بە شادومانیەوە پەلەیان کردە پێشوازی کردنی، دەستیان دانایە سەرشانو پشتییو لاواندیانەوە، چاوانی یۆحەننا پڕ لە فرمێسك بوو، ئێستاکێ ناوەندی توێڵی ئوستاد لۆچێکی قووڵی تێکەوتبوو.

پەترۆس نەیتوانی خۆی راگرێت، گوتی((مەولای من بۆچی پاکشۆر شەوو رۆژ قسەی لەگەڵ تۆدا دەکرد، چی بەتۆگوت؟ کە ئاوا خەمبار بوویت. رووخسارت گۆڕاوە؟

کریست وەڵامی دایەوە ((کە ئەو کاتێکی زۆری نییە، هەموو ئێوە لای ئەو بمێننەوەو خۆتان مۆر بکەن، من دەڕۆم)).

---

[*] لە دەقە فارسییەکەدا دەڵێت: مردووشۆر بیانبات، بەڵام لە کوردەواریدا دەڵێن: سەگ بیانخوات.



کوڕە گەنجترەکەی زوبەدی دامەنی کریستی گرت هاواری کرد ((مەولای من بۆ کوێ دەڕۆی؟ ئێمەش لەگەڵ تۆدا دێین)).

- خۆم بەتەنها دەچم بۆ بیابان، شوێنێکە پێویستی بەهاوسەفەر نییە، دەچمە ئەوێکەوە تا لەگەڵ خودا گفتۆگۆ بکەم.

پەترۆس بە داپۆشینی دەمو چاوی خۆی گوتی: ((لەگەڵ خودا؟ کەواتە لەم حاڵەتەدا تۆ هیچکاتێ ناگەڕێیتەوە!))

کریست بە هەڵکێشانی ئاخێ گوتی (( من دەگەڕێمەوە، دەبێ بگەڕێمەوە، دونیا بەتاڵەموێکەوە بەستراوەتەوە، خوداوەند رێنماییم دەکاتو دەگەڕێمەوە)). حەواریەکان لە کاتێکا دەستیان بە دامێنیێ ئەوەوە گرتبوو رەهایان نەدەکرد، هاواریان کرد ((چەند وەخت؟ دیسان چەند وەختی دیکە ون دەبی؟

بەڵام کریست خۆی لەوان دوورخستەوە، بەخامۆشیو سەرزەنشت ئامێزەوە سەیری ئەوانی کردو لەبەرخۆ گوتی ((مەڕەکان ..مەڕەکان.. سوپاسی خوای سراییل دەکەم کە من گورگم)).

- برایان، ئەوکاتەی کە خودا بیەوێت دەگەڕێمەوە، مالاوا، لێرە چاوەڕوانی من بکەن، خوا ئاگادارتان بێت)). براکان بەماتو مەبهوتی لەجێوە وەستان، هێدی هێدی رۆیشتو ئەوانیش سەیری بیابانیان دەکرد.

ئەو ئیدی لەکاتی رۆیشتندا وەك بڵێی هەڵدەفڕی، وەك جاران بەڕێدا نەدەڕۆیشت، وەك چۆن بەسەنگینیو بیرکردنەوە رێی تەی دەکرد، لقە قامیشێکی چنی، تا تەکیەی پێبدات، بەسەر پردە کەوانەییەکەوە داچوو، لەناوەندێ وەستاو کەوتە روانینی خوارەوە، لەهەموو لایەکدا زیارەتکەرانی دێ، کە لە هەڵڕژانی قوڕاوی رووباردا چوبوونە خوارەوە، رووخساری هەتاوەسووتیان لەشادیان بریقەی دەدایەوە، لەبەرامبەر ئەوانەوە لە کەنار، ئەوانی دیکە هێشتا سینەی خۆیان دەکوتایەوە، دانیان بە گوناهەکانی خۆیان دەناو چاوانی مەشخەڵداریان بڕیبووە پاکشۆرەوە، تا نۆبەیان بگاتو هێمایان بۆ بکات بچنە ناخی ئاوی پیرۆزەوە، زاهیدی کێوی، لەکاتێکا تا

کەمەر لەئاودا چووبووە خوارەوە، مێگەلی خەڵکی شەستو شوودەدا، ئاوەمۆری دەکردن، ئەو کاتە تووڕەو بێ سۆز رایدەدانە کەنارو مێگەلی دیکە دەهاتنە پێش، ردێنی رەشو نوك تیژو پرچی تیرەی کە هیچکاتێ مقەستی بەخۆوە نەبینی بوو، لەهەتاودا بریقەی دەدایەوە لەدەمی گەورەو هەمیشە کراوەیدا هاواری بەردەوام بەرزدەبۆوە، کریست چاوی لەخەڵكو رووبارو ئەو دەوروبەرەو دەریای مردو و کێوەکانی عەرەبستان وەرسووراندو بۆ پێشەوە لاربۆوە، سێبەری خۆی بینی کە بە هەلڕژانی ئاو شەپۆلی دەدا بۆلای دەریای مردو دەچوو، لەبەرخۆ گوتی: ((دانیشتن لەکەناری رووبارو تەماشاکردنی هەڵبەزینەوەی ئاو بەرەو دەریا لەگەڵ درەختو مەلو هەواو شەوانە لەکاتی گەشانەوەی ئەستێرەکاندا لە ناخی دەریادا رەنگدەدەنەوەو هەڵدەڕژێن چ خەسڵەتێکی هەیە! چەند باش بوو ئەگەر دەمتوانی منیش هەلڕژێمو نیگەرانیم بۆ ئەم دونیایە وەکو خورە نەدەکەوتە گیانم)). بەلاّم ئەو بیرۆکانەی لەخۆدا دوورکردەوەو وەسوەسەی لەخۆدا پەڕاند، بەهەنگاوی خێرا لە پردەکە دابەزیو لەپشت بەردەکانەوە ون بوو.

***

ڕدێن سوور لە کەنارێکەوە وەستابوو ئەوی خستبووە ژێر نیگای خۆیەوە، بە ونبوونی، قۆڵی خۆی هەڵبڕیو بەدوای کەوت، دروست لەو ساتەی کە ئەو دەیویست بچێتە ناو دەریای بێ پایانی زیخو لمی بیابانەوە خۆی گەیاندە ئەوو، بانگی کرد ((کوڕی داود بوەستە بۆچی وا رەهام دەکەی؟))

کریست گەڕایەوەو بەخۆبەدەستەوەدانەوە گوتی: ((برام یەهودا زیاتر لەوە مەیە پێشەوە دەبێ تەنها بم)).

یەهودا کە بۆ پێشەوەتر دەڕۆیشت گوتی: ( دەمەوێ لەڕازی تۆ خەبەردار بم)

- پەلەمەکە لەکاتی خۆی خەبەرداردەبی، بەلاّم هەمان ئەو قەدەرە کە پێت دەڵێم: خۆشحاڵبە هەموو شتێ بەپێی ویستو خواستە.



- ئەوە بۆمن کافی نییە، برسیەتی گورگە بە وشە نارەوێتەوە، لەوانەیە تۆ ئەوە نەزانی، بەلاّم من دەزانم

- ئەگەرە منت خۆشدەوێ، دەبێ سەیر بکەیت، سەیری درەختەکان بکەیت ئەوان هیچ پەلەیەکیان بۆ گەیینی میوەکانیان نییە؟

ڕیش سوور لەکاتێکا نزیکتر دەکەوتەوە، بەپەلپەوە گوتی:

(( من درەخت نیم، من مرۆڤم، واتە شتێ کە پەلەیەتی، من پابەندی یاساکانی خۆمم.

– یەهودا، یاسای خودا بۆ درەختو مرۆڤ وەکو یەکە.

ڕیش سوور ددانی قرمساندە سەریەكو بە تانەوە پرسی: ((فەرموو ناوی ئەو یاسایە چییە؟))

– زەمان

یەهودا ئارامی گرتو مشتی خۆی کووشی، بەلاّم ئەو یاسایەی قبوڵ نەدەکرد، ئەو یاسایە زیاد لە ئەندازە ستە، لە حاڵی ئەوەی کە ئەو هیچ هەلێکی تایبەتی نەبوو تا لە دەستی بدات، قولاّیی وجودی ئەو یاسایێکی دیکەی لەخۆدا شاردبۆوە کە تایبەت بەخودی ئەو بوو جیاوازبوو لەگەڵ یاسای زەمان، هاواری کرد: ((خودا ساڵەهای ساڵ بەزیندوویی دەمێنێتەوە، ئەو جاویدانەیە لە بەرئەمە دەتوانێ سەبر بکاتو لەچاوڕوانیدا بمێنێتەوە، بەلاّم من مرۆڤم شتێکم لە پەلەدایە، بەر لەدیتنی ئەو شتەی کە تەنها ئێستا لەزەینم دایە، نامەوێت بمرم، نەك تەنها دەبێ ئەو شتە ببینم، بەڵکو دەبی دەستیشی لێبدەم)).

کریست بە تەکاندنی دەستی بۆ ئارام کردنەوەی ئەو وەلاّمی دایەوە: ((دەبینی برام یەهودا دەیبینی، ئەو دەبینیو دەستیشی لێدەدەی باوەڕت بێ، خوداحافیز، خودا لەبیاباندا چاوەڕوانیم دەکا))

–من لەگەڵ تۆدا دێم

– بیابان جێگەی دوو کەسی تیا نابێتەوە بگەڕێوە.

ڕدێن سوور نەڕڕاندی وەکو سەگ ی مێگەل کە دەنگی خاوەنی خۆی ببیستێ، کەلبەی دەرخستو سەری لارکردەوەو گەڕایەوە، لەکاتێکا لەگەڵ خۆی قسەی دەکرد بەهەنگاوی گران گران بەسەر پردەوە کەوتەڕێ، ئەو زەمانەی وەبیرخۆی هێنایەوە کە باراباسو خودا بیپارێزی —و شۆڕشگێرەگانی دیکە لە کێوەکان دەگەڕان. چ فەزایەکی پڕ تووڕەییو ئازادی بوو خودای سرایيل چ رابەرێکی شکۆمەندبوو بۆ شۆڕشگێران، ئەو پێویستی بە رابەرێکی وابوو، بۆ بەدوای ئەو سەرەڕۆیە کەوتووە کە لەخوێن دەترسێو وەکو کچێکی جحێڵ هاوار دەکات: ((ئەشق.. ئەشق؟))، یەهودا لەگەڵ خۆی کەوتە ئەندێشەوە ((چاکتر وایە سەبر بکەمو بزانم لە بیاباندا چ شاکارێك لەگەڵ خۆیدا دەهێنیێ؟))

کریست ئێستاکێ چۆتە بیابانەوە، هەرچەند زیاتر بۆ پێش دەچوو، زیاتر هەستی دەکرد کە دەچێتە ناو بێشەی شێرەوە، لەرزی بەلاّم ئەو لەرزە ترس نەبووە، بەڵکو لەززەتێکی نادیارو وەسف نەکراو بوو، خۆشحاڵ بوو، بەلاّم نەیدەزانی بۆ؟ لەپڕێکا لە خەونێکا هاواری کرد کە لەکاتی منداڵیدا لەو کاتەی بەزەحمەت دەیتوانی رێبکەوێ بینی بووی، وا بەدیاردەکەوت کە بەر لە هەزار ساڵ ئەم خەونەی بینیوە، رێی کەوتبووە ناو ئەشکەوتێکەوەو لەوێ شێرێکی مێینەی دۆزیبۆوە کە بێچووی هەڵێنابوو شیری دەدایە بێچوەکانی، بەبینینی ئەوە برسی بووبوو، راکشاو لەگەڵ بەچکەشێرەکان دەستی بەمژین کرد، وا بە دیاردەکەوت کە پاشان هەموو چونە دەرەوەو چونە ناو چەمەنێکەوەو لەژێر هەتاودا دەستیان بەیاری کرد، بەلاّم لەهەمان کاتدا مێرێی دایکی لەخەونەکە بەدیارکەوت، کاتێك ئەوی دەگەڵ شێرەکان بینی، هاواری کرد، ئەو بێداربۆوەو بەتووڕەیی بەسەردایکیەوە کە لەکەناریا خەوتبوو هاواری کردبوو، ((بۆ بێدارت کردمەوە؟ لەگەڵ براو دایکمدا بووم!)) لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە، ((ئێستا دەزانم بۆ خۆشحالّم، دەچمە لای دایکمو لانەی شێرو ئەشکەوتی تەنهایی)). کیفەکیفی ئارامنەگرتووی مارانی بیستو بای گەرمو رۆحە نادیارەکانی بیابان هاتوهاواریان بوو.



کریست لاربۆوەو قسەی لەگەڵ رۆحی خۆی کرد: ((ئەی رۆحی من لێرە نیشانی دەدەی کە تۆ جاویدانی یا نا)) بەبیستنی دەنگی پێی پشت خۆی گوێکانی قولاّغ کرد، گوێی لە دەنگی وێککەوتنی وردەبەرد بوو، کەسێ ئارامو دڵنیا بەرەو لای ئەو لەجولەدابوو، لەکاتێکا دەلەرزی بەخۆی گوت (ئەوم فەرامۆش کردبوو، ئەو منی فەرامۆش نەکردووە، لەگەڵ مندا دێت، دایکم لەگەڵ مندا دێت)).ئەو باش دەیزانی کە ئەوە نەفرەت بوو، بەلاّم ئێستا ماوەیەك بوو ناوی ئەوی جێهێشتبوو.

بەردەوامی بەرێداو بیریشی لە شوێنێکی دیکە بوو، کۆترە کێوییەکەی وەبیر خۆی هێنایەوە، وا بەدیاردەکەوت ئەو مەلە کێویەی لە ناخیدا زیندانی کراوە، نەکا رۆحی ئەوبێ، هەوای راگرتنی هەبوو؟ لەوانەیە رایکردبێ، رەنگە ئەو کۆترە کێوییە کە لەتەواوی ماوەی ئاوەمۆربوونی ئەودا بەدەوری سەری ئەودا سووڕابۆوە، رۆحی بووبێو نەك پەرەندەیێ یا فریشتەیێ، بەڵکو رۆحی خۆی.

وەلاّمی هەر ئەوەبوو، دووبارە بە ئارامی کەوتە رێوە، گوێی لە دەنگی هەنگاوەکان دەبوو کە لەدوایەوە بەسەر زیخەوە هەڵدەنران، بەلاّم ئێستاکێ دڵ ئارام بوو، لانی کەم دەیتوانی بەویقارەوە بەرگەی هەموو شتێ بگرێت لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە.

((ڕۆحی مرۆڤ هەمووی توانایيە، دەتوانێ بە هەر شێوەیێ کە بیەوێ وابێتە بەر، لەوساتەدا مەلێك هات بەسەر بەرزایی سەرمەوە کەوتە فڕین)). بەلاّم لە کاتێکا کە بە ئارامی رێی تەی دەکرد، لە هیکەوە هاوارێکی کردو وەستا، زەینی واختورەی کردبوو کە لەوانەیە کۆترەکە لەزەنکردن یاخود هەمهەمەیێ یا چەرخەلەی بایێ زیاتر نەبووبێ، چونکە وەبیری هاتەوە چۆن چۆنی بەدەنی وەك رۆحێکی نوورانی بەرز کەوتبووە درەوشانەوە، چۆن چۆنی هەرچییەك ویستبای گوێی لێبێ دەیبیست، تەلارەکان لە ئاسمان دروست کرابوون، زەمزەمەی کرد ((خودایا خودایا ئێستا کە تەنها دەبم حەقیقەتم پێ بڵێ، فریوم مەدە ماندوو بووم ئەوەندەی دەنگەکانی فەزا ببیستم)). ئەو بۆ پێشەوە دەچوو خۆرەتاویش لەگەڵ ئەودا، عاقیبەت خۆرەتاو گەیشتە تۆقەڵەی ئاسمان راستەوخۆ بەسەر سەریەوە، پێیەکانی لە زیخو لمی بیاباندا داغ دەبوو، سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد تا سێبەرێ بدۆزێتەوە، گوێی لە دەنگی

چەند باڵێ بوو بەسەرسەریەوە، ڕەوەقەلێکی بینی کە بە پەلە بەرەو چاڵێ دەچون کە چەند شتێکی رەش و گەنیوو لەبەر هەتاو لەبەریەك ترازابوونی تیابوو.

بەگرتنی لووتی خۆی نزیك کەوتەوە، قەلەکان کەوتبوونە سەر لاشەکەو خەریکی خواردنی بوون، بەدەنگی نزیك کەوتنەوەی پێی مرۆڤێ، هەریەکەو خۆیو پارچەگۆشتێ لە دەنووکیان بەتووڕەیی ترسانو رایانکرد، لەهەوادا دەسوورانەوەو بانگی نەهێشتنی شەڕی ئەم سەربارەیان دەکرد، کریست لاربۆوە، ورگی پارچە پارچەو پێستی رەشو قۆچی خاڵچێنو کورتو بەنی تەڵەسمی بەدەوری گەردەنی گەنیوەکە بینی لەبەرخۆ گوتی (بزن، بزنی پیرۆز کە گوناهەکانی خەڵکی گرتۆتە ئەستۆ، دێ بەدێو کێو بەکێو عاقیبەت تا بیابان بەدوای کەوتنو لێرە لەبێن چوو)

لاربۆوە تا ئەو شوێنەی کە دەیتوانی، ناخی بیابانی هەڵکەندو لاشەکەی داپۆشی گوتی (برام تۆ وەکو هەموو ئاژەڵێك بێ گوناهو پاك بووی، بەلاّم مرۆڤەکان ترسنۆکانە گوناهەکانی خۆیان هاوێشتە گەردەنی تۆو تۆیان کوشت، لە ئارامیدا بۆنی خۆت فرێدە، کینە لە دڵ مەگرە لەوان، مرۆڤەکان، ئەو مەخلوقاتە بێ دەسەلاّتانە، شەهامەتی ئەوەیان نەبوو تا خۆیان سزای گوناهەکانی خۆیان وەرگرن، باری گوناهەکانی خۆیان داوێنە سەر بێگوناهان، برام تاوانی گوناهەکانیان وەپاشدە، مالاّوا) رێی خۆی گرت، بەلاّم دوای کەمێ، بەشلەژانەوە لەڕۆیشتندا وەستا، لە کاتێکا دەستی رادەتەکاند بانگی کرد (تا ئەو کاتەی کە دووبارە یەکترە دەبینینەوە) قەلەکان دێوانەئاسا سەریان لەدونا، ئەو ئەوانی لەلاشەی خۆشمەزە بێبەش کردو ئێستا وەدوای دەکەوتنو چاوەڕوانی ئەوەبوون کە ئەو کەسەی دەبێتە لاشەو ورگی پارچە پارچە بکەنو بیخۆن، چ هەقی ئەوەی هەبوو کە ئەو ستەمە بەوان رەوا ببینێ؟ مەگەر خودا قەلەکانی بۆخواردنی لاشە خەڵق نەکردووە؟ لەبەر ئەوە دەبێ ئەو تۆڵەکەی بداتەوە.

ئەن ئاخیری شەو لەحاڵی هاتن دابوو، ماندوو مردوو، بەسەر بەردێکەوە وەکو خڕیو گەورەیی بەرداشێك بوو دەستەوئەژنۆ دانیشت کە لە گەورەییو خڕیدا وەکو بەرداشێ



بوو بەچپەوە گوتی: (ئیدی زیاتر لەوە بۆ پێشەوە ناڕۆم، ئەلێرە بەسەر ئەم بەردەوە سەنگەر دەگرمو خەبات دەکەم)).

لەپڕێکا لە ئاسماندا تاریکی بۆ خوارەوە هەڵخزی، لەخاك هەڵساو زەمینی داپۆشی، لەگەڵ تاریکیدا، پای شەونم کرایەوە، ددانەکان لە بەر سەرما وێکدەکەوتن، خۆی لەکراسە سپییەکەی پێچاو چاوانی داخست، بەلاّم بەداخستنی چاوی ترس لێیدا، قەلەکانی وەبیرهاتەوە، لورەی چەقەلە برسییەکان لە هەموو لایەك دەبیسترا، هەستی کرد کە بیابان وەك جانەوەرێکی وەحشی لە دەروبەری ئەودا لەگەڕاندایە بەدوای نێچیر، چاوەکانی دووبارەکردەوە، ئاسمان ئەستێرەباران بوو، هەستی بە ئارامی کرد لەبەرخۆ گوتی((فریشتەکان هاتونەتە دەرەوە تا هاوڕێیەتیم بکەن، ئەوان چەند نوورێکی شەش باڵن کە لە دەوروبەری تەختی خودادا سروودو گۆرانی دەچڕن. بەلاّم ئەوەندە دوورن ناتوانم گوێم لە دەنگیان بێ)). رووناکی زەینی ئەوی ئەستێرەباران کرد، برسیەتیو سەرمای لەبیرکرد، ئەویش بوونەوەرێکی زیندووبوو، شەهابێکی تیژ لەتاریکیدا سروودی بۆ خودا دەچڕی، رۆحی ئەو فانۆسێکی بچووك بوو خوشکی بچووك کۆنەپۆشی فریشتەکان بوو، بیری بەردەوامی دۆزینەوەی خودا ئەوی دڵنیاکرد، رۆحی خۆی بینی کە دەگەڵ فریشتەکان لە دەوراندەوری تەختی خودا وەستاوە، ئەو کاتە ئارامو بێ ترس، چاوی خستە سەریەكو خەوت.

کە بێداربۆوە، رووی لە رۆژهەلاّت کردو هەتاوی بینی: کورەیێکی سوورەوەبووی بەرووتی بینی کە لەبەرزایی بەردەلاّنەکانەوە دەهات، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە (رووخساری خودایە) دەستی نایە سەرچاوی تا نەیڕوانیتێ، بەچپەوە گوتی (خودایە من جگە لە دەنکە زیخێ هیچی دیکە نیم دەتوانی لەم بیابانەدا من ببینی؟ دەنکە زیخێکم کە قسە دەکاتو هەناسە هەڵدەکێشێو عەشق لەگەڵ تۆ دەکات. عاشقی تۆیەو (باوکە) بانگت دەکات، جگە لە ئەشق چەکێکم پێ نییە، بەهەمان چەك هاتومەتە جەنگەوە، یارمەتیم بدە. هەڵسایەوە بە قامیشەکەی دەستی بازنەیێکی بەدەوری ئەوبەردە کێشا کەبەسەریەوە خەوتبوو، ئەوکاتە بەدەنگێکی بەرز بەشێوەیێ کە هێزە نادیارەکان لە کەمینی ئەودابن گوتی: (ئەو جۆخینە جێ ناهێڵم تا گوێم لە

دەنگی خودا نەبێ، وەلێ دەبێ بەڕۆشنی ببیستم، نەك بەزێماری ناپایەدار یا چەهچەهە یا بەگەواڵە رازی نابم، داوای لێدەکەم کە بە ڕون‌و ئاشکرا، لەگەڵ مندا قسە بکات‌و بە زمانی مرۆڤ لەگەڵم بدوێ‌و پێم بڵێ کە چی لەمن دەوێ‌و من چیم لەدەست دێ، تەنها ئەو کاتە ئەو جۆخینە جێدەهێڵم‌و دەگەڕێمەوە لای مرۆڤ، ئەگەر فەرمانی وایە یا ئەگەر خواستی ئەوەیە کە من بمرم دەمرم، گەردەنم کەچ دەکەم بۆ خواستی ئەو، بەلاّم دەبێ ئاگام لە چۆنیەتی ئەوەبێ، یا هەق! بەرووخساری روو لەهەتاو، بەرەو بیابانی مەزن، بەسەر بەردەوە چۆکیدا، چاوانی داخست ، ئەو بیرۆکانەی کە لە ناصیرەو مەجدەل کفرناحوم، دۆڵی یاکوب‌و رووباری ئوردن لەزەینیدا دەچکایەوە، خۆی سەنتەرهێز کردو کەرەستەی جەنگی پێدان، بۆ نەبەرد خۆی ئامادە دەکرد. بەملی درێژکردوو چاوانی داخراو، لەخۆیا رۆچوو، دەنگی خوڕڕەی ئاو، خشەخشی قامیشەلاّنەکان‌و ناڵەی ژنان دەگەیشتە گوێ، لەڕووباری ئوردنەوە شەپۆل شەپۆل هاواری وەحشەت‌و ئومێدەکانی خەون‌و خەیاڵی دووردرێژ بەرزدەبۆوە، لەزەینیدا سەرەتا ئەو سێ شەوەی کە بەسەر تاوێرەبەردەکەوە لەگەڵ زاهیدی وەحشی بەسەری بردبوو قەدی قیت کردەوە، ئەوان شەوان، بە غەرقی چەکەوە هێرشی کردە بیابان تا لە کەناری ئەودا بێتە ناو جەنگەوە. یەکەمین شەو، وەك چۆن کلۆیێکی هەیولا بەچاوان‌و باڵی زەردو ستەم وپیشەو کلکی وەك کلکی دەریای مردوو پیتی سەوزی سەرپشتی بەسەر ئەوا هەڵبەزیەوە، باڵەکانی بەتووڕەیی پەردەی هەوای هەڵدەدڕی، کریست هاوارێکی کردو ئاوڕی دایەوە، پاکشۆر بەبازووی ئێسقان ئاسای کە لە تاریکییێکی شەوەزەنگدا بەرەو ئورشەلیم هێمای دەکرد لەکەناریا وەستا.

– سەیری بکە چی دەبینی؟

– هیچ شتێ!

– هیچ شتێ؟ لەخوار رووی تۆوە ئورشەلیمی پیرۆز، ئەو سۆزانییە نابینی؟ بەسەر ئەژنۆی قەڵەوی رۆمەوە دانیشتوەو پێدەکەنێ، خودا هاوار دەکات ((ئەوم ناوێ، ئایا ژنی ئەو ژنی منە؟ ئەوم ناوێ))، منیش، وەك سەگێ لەبەر پێی خودا، دەحەپم:



((ئەوم ناوێ)). لە دەوروبەری بورج‌و دیوارەکاندا دەڕۆم‌و پێی دەحەپم: دۆڵچە.. دۆڵچە!)).

قەلاّی ئەو چوار دەروازەی هەبوو کە لە کەنار دەروازەی یەکەمدا برسیەتی دانیشتوە، لەکەنار دووەمدا ترس، لەکەنار سێیەمدا ستەم‌و کەناری چوارەمیش دەروازەی باکور...نەنگی......... دەچمە ژوورەوە، لە شەقامەکانیدا دەچمە سەرو خوارەوە، دەگەمە دانیشتوانەکانی‌و بەسەریان دەکەمەوە. رووخساریان ببینە: سێ رووخساری خڕوخەپان زیاتر لە ئەندازە تێرە، سێ هەزار رووخسار لەبرسیەتیدا تەکاون، مەگەر دونیایەك چۆن ون دەبوو، جارێکی دیکە سەیری رووخساریان بکە، ترس بەسەر رووخسارەکاندا هەڵنیشتووە، پەڕڕەی لووتیان دەلەرزی بۆنی رۆژی خودا دەکەن، سەیری ژنان بکە هەتا نەجیبترینیان بەنهێنییەوە سەیری کۆیلەتی خۆیان دەکەن، زمان لەدەم دەگێڕن‌و هێما بۆ ئەو دەکات کە ((وەرە)) بنمیچی تەلارەکانیانم هەڵگرت، سەیرکە، پاشا، ژنی براکەی بەسەر ئەژنۆوە داناوە دەست بەسەر بەدەنی رووتی ئەودا دەهێنێ، کتێبی پیرۆز چی دەڵێ؟ ((ئەو کەسەی سەیری جەستەی رووتی ژنی برای بکات —مەرگ!)) ئەوا زیناکارە پاشا نییە، بەڵکو ئەوە منم منی زاهید کە دەبێ بکوژرێم. بۆ؟ چونکە رۆژی خودا گەیشتووە!

کریست بەدرێژایی ئەو شەوە لەکەنار پێیەکانی پاکشۆردا دانیشت‌و سەیری برسیەتی‌و ترس‌و ستەمی دەکرد، کە لە چوار دەروازەی کراوەی سراییلدا دەهاتودەچوو، بەسەر بەرزایی سۆزانیی پیرۆزدا وەکو هەورێکی پڕ لە تووڕەیی‌و تەرزەوە گەلاّڵە دەبوون.

دووەمین شەو، پاکشۆر جارێکی دی دەستی لاوازی خۆی درێژ کردو زەمان‌و مەکانی بەیەك هێما لەنووردا بینی،

– گوێ بگرە... چی دەبیستی

– هیچ شتێ نابیستم

– هیچ شتێ؟ دەنگی تەبەهکاری هەمان ئەو ژنە بەدکارە کە بەوەقاحەت چۆتە ئاسمان‌و لەکەنار دەرگای ماڵی خودا دەحەپێ، نابیستی؟ مەگەر نەچوویە ناو

ئورشەلیم؟ مەگەر کاهینە واقواقیەکان، کاهینە گەورەکان، کاتبو فەریسیەکانت نەبینی کە پەرستگایان ئابلۆقە دابوو؟ ئیدی خودا تەمبەڵی زەمینی ناوێ، ئەو هەستاوەتەوە، لە دامێنی کێوەکانەوە سەرەوژێربۆتەوە، دێت. لەپێش ئەودا تووڕەیی هەیە، لەپشتو پێشی ئەودا بەدکاری ئاسمان: ئاگر، جوزامو شێتی، ئەو پەرستگایە لە کوێیە؟ یاخود ستونە مەغروورو زێڕ نیشانەکان کەبەرز دەبوونەوە هاواری جاویدانی سەردا: دەبا ببێتە خۆڵەمێش پەرستگایان، با ببێتە خۆڵەمێش کاهێنەکانیان، کاهینە گەورەکانی، کاتبو فەریسیەکان.

دەبا ببێتە خۆڵەمێش تەڵسمی پیرۆزیانو کۆنە ئاوریشمیەکانیانو ئەڵقەی زێڕینیان، ئورشەلیم لەکوێیە؟ چراییێکی رۆشنم هەڵگرتووە، لەکێوەکانی لەتاریکیدا دەگەڕێمو دەسوورێم، هاوار دەکەم ((ئورشەلیم ئورشەلیم!)) بەڵاّم بەتەواوی جێهێڵراوە، هەتا قەلێکیش وەڵاّم ناداتەوە، قەلەکان خواردویانەو رۆیشتون، هەتا ئەژنۆکانم دەچمە ناو کەللەسەرو ئێسقانەکان، فرمێسکم لەچاودێن، بەڵاّم ئێسقانەکان بەرکەناردەکەمو رەهایان دەکەمو پێدەکەنم، لاردەبمەوە، درێژترین ئێسقان دەگرمەدەست شمشاڵ دروست دەکەمو سروودی جیلوەوجەلالی خودا دەژەنم بەدرێژایی شەوی دووەم پاکشۆر لەتاریکی خودا وەستا، پێدەکەنیو جوزامو شێتی ستایش دەکرد، کریست چۆکی پەیامبەری گرتو پرسی ((ئایا ناتوانرێ رزگاری لەڕێگەی ئەشقو شادیو میهرەوە بەدیاری بۆ دونیا بهێنرێت؟)) پاکشۆر بێ ئەوەی بۆ سەیرکردنی ئاوڕ بداتەوە، وەڵاّمی دابۆوە: مەگەر کتێبی پەیامبەرانت نەخوێندۆتەوە؟ رزگارکەر کەمەریان دەشکێنێ، ددانەکانمان دەشکێنێ، ئاگر پەرش دەکاتو مەرزەکان دەسووتێنێ، هەموو ئەوەش بۆیە ئەنجام دەدات تا زەوی تۆ بدات، دڕكو داڵو گەڵاّو گەزنە لەڕیشەوە دەردەهێنێ چونکە ئەگەر درۆزنانو ستەمگەرانو ناپاکان لەناونەبەیت چۆن دەتوانی درۆو نەنگیو ستەم لەسەر زەویدا لەناوبەری؟ زەوی دەبێ پالودە بێت، دەبێ رەحمی پێ بکرێ، دەبێ پالودە بێتو بۆ پەرشکردنی تۆوی تازە شۆبدرێتەوە.

دووەمین شەو رابرد کریست هیچی نەگوتبوو، چاوەڕوانی شەوی سێهەم بوو: رەنگە ئاوازی پەیامبەر شیرین بێت.



سێهەم شەو پاکشۆر بەشڵەژانەوە بەسەر بەردەوە خۆی هەڵگێڕو وەرگێر کرد، بەبێ پێکەنینو گفتو گۆ، کریستی لەڕووی نیگەرانیەوە بەسەر دەکردەوە، بازوو دەستو شانەکانی ئەوی بەڕوانین دەپشکنی، ئەوکاتە سەری تەکاندو بێدەنگ مایەوەو هەوای بۆن دەکرد. لەپرتەوی نووری مانگدا، لە چاوانی دەرپەڕیویدا دەتوانی ئەوە ببینیت، کە زەمان جارێ سەوزو جارێ زەرد دەدرەوشێتەوەو خوێنی تێکەڵ بەئارەقەی لە توێڵی هەتاودا بازرقەی دەدا، عاقیبەت سپێدەدەمان رۆشنایی سپی سەحەریان بەسەردا هەڵاّتبوو دەستی کریستی گرت، سەیری چاوانی ئەوی کردو رووخساری تێکچرژاند ((سەرەتا کە تۆم بینی لەنێوان قامیشەلاّنەکاندا هاتیە دەرەوەو راستەوخۆ بۆلای من هاتی، دڵم وەك دڵی گوێرەکەیێ گەنج دەستی بەخورپە کرد، بینینی ساموائیل بەبیر خۆت بهێنەوە، کە داودی شوان چۆن بەدیتنی قژی سووروو رووخساری بێ موی ئەو دڵی لەخۆشیاندا باڵیگرت، منیش بەدیتنی تۆ هەمان حاڵم هەبوو، بەڵاّم دڵ گۆشتەو گۆشتی خۆشدەوێ من باوەڕم بەدڵ نیە، دوێنێ تۆم بەسەرکردەوە، تۆم بۆن کرد وەك بڵێی بۆیەکەمین جارە دەتبینم، بەڵاّم نەمتوانی بگەمە ئارامی، سەیری دەستەکانتم کرد، ئەو دەستە دارشکێنانە دەستی فریادڕەس نەبوون، زۆر بەلووتفو میهرەبان بوون، چۆن دەتوانن تەور بخەنە جریوەوە، سەیری چاوەکانتم کرد: پڕ لە هاودەردی مەزن، لەچاوانی فریادڕەس نەدەچوون، هەستامەوەو ئاخم هەڵکێشا بەزەمزەمەکردنەوە گوتم ((خودایە ئێمە سەر لەکاری تۆ دەرناکەین تۆ توانای ئەوەت هەیە کۆترێ بنێری تا دونیا بسووتێنێو بیکات بە خۆڵەمێش، ئێمە سەیری ئاسمان دەکەین لە چاوەڕوانی هەورەتریشقەییێ، بازێ، قەلێ داین، بەڵاّم تۆ کۆتری سپیمان دەدەیتێ، پرسیارکردنو موكڕ بوون چ سوودی هەیە؟ بەبەشمان رازین)) ئەو کاتە بەکردنەوەی بازووەکانیو لە باوەش کردنی کریست شانی راستو چەپی ئەوی ماچکردو گوتبوی ((ئەگەر تۆ ئەو کەسە بی کە لە چاوەڕوانی ئەو دابووم، بەو شێوەیەی کە ئەندێشەم دەکرد وا نەهاتی. کەواتە ئەو تەور هەڵنەگرتنەمو دانانی لەکەنار ریشەی درەخت هەمووی بێهودەبوو؟ ناکا ئەشقیش توانای هەڵگرتنی تەوری هەبێ؟ بۆ ساتێ لەگەڵ خۆی کەوتە ئەندێشەوە، لە ئەنجامدا بەبنی لێویەوە گوتی ((ناتوانم قەزاوەت بکەم، بێ ئەوەی شاهیدی ئەنجامی کاربم، سەرم دەخەمە ژێر

روبەندی خاك، بەلاّم باکم بەچییە سەرنویشتی من ئەمەیە : سەرنویشتێکی سەخت، حەزم لێیەتی)).

دەستی کریستی کوشی بوو: ((خودات لەگەڵ بێ، بڕۆ لەبیابان لەگەڵ خودا قسەبکە، بەلاّم هەرچەند دەتوانی زووتر بگەڕێوە، تا دونیا وەکو خۆی نەمێنێتەوە)) کریست چاوەکانی کردەوە، رووباری ئوردن، پاکشۆرو مۆرکراوەکان، وشترەکانو نالّەی خەڵك، هەموو وەك پونگ چونە هەواو ون بوون، ئێستا بیابان بەرەو رووی ئەو کراوەبوو، خورەتاو سوور هەڵگەڕابوو دەیسوتاند، تاوێرەبەردەکان وەکو نان هەڵمیان لێ هەڵدەستا، هەستی کرد کەبرسیەتی چەنگ لە دەروونی دەگرێ، بەسەیر کردنێکی بەردەکان بەبنی لێوەیەوە گوتی ((برسیمە، برسیمە)) ئەو نانەی کەوتەوە یاد کە پیرێژنە سامیرایییەکە دابووی پێیان، چەند بەتام بوو، لەشیرینی هەنگوینی دەکرد، کەوتە یادی هەنگوین، زەیتونو خورماوە، کە هەرکاتێ بە گوندێکدا رادەبرد بەویان دەدا، ئەو تێشتە پیرۆزە نالّیی کە لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی لەکەنار دەریاچەی — گنسارت- دا خواردیان؟ ماسیەکان، کەبەسەر ئاگرەوە هەڵدەگیران چەند خۆشبوو! پاشان ترێو هەنجیرو هەناری هاتە زەینو زیاتر ئازاریدا. گەرووی وشك بوو تێنوێتی قاش قاشی کردبوو، ئەرێ بەڕاستی چەند رووبار بە دونیادا هەڵدەڕژێن! تەواوی ئەو ئاوانە لەبەردێکەوە بۆ بەردێ لە سوچێکی خاکی سرایيلەوە بۆ سوچێکی دیکە هەڵدەخزینو دەچنە ناو دەریای مردو ون دەبن، ئەو هەتا دڵۆپێکیشی بۆ خواردنەوە نییە، بیرۆکەی ئەو ئاوانە تێنوێتی ئەوی زیاتر کرد، هەستی بەسەرگێژی کرد، چاوەکانی هەڵدەزۆقینەوە، هەرماسی مەکرباز لە شێوەی دوو کەروێشکی گەنج لەناخی زیخو لیمی سووتێنەردا هاتنە دەرەوە، بەسەر پاژنەی پێیەکانیان وەستان، دەستیان کرد بە سەما، گەڕانەوە، بەبینینی ئەمە تەرککەری دونیا هاوارێکی خۆشحالّی سەرداو بەرەو لای ئەو بۆ پێشەوە چوو. بەسەر ئەژنۆکانیدا هەڵگەڕانو چونە سەرشانیو هەڵبەزینەوە، یەکیان وەك ئاوی فێنك بوو ئەویتر وەك نانی عەتراوی، بەلاّم لەهەمان حالّدا کە ئەو بەتاسوقەوە دەستی درێژکرد تا بیانگرێ، بەهەڵبەزینێکەوە لەمیاندا ون بوون، چاوەکانی داخست کەوتە جەمو جۆرکردنی بیرۆکەکانی، کە برسیەتیو تێنوێتی پەرشو بلاّوی کردبوون، خودای خۆی هێنایەوە



یاد، ئیدی برسیو تینووی نەبوو، کەوتە ئەندێشەی رزگاری دونیا: ((چ دەبوو ئەگەر رۆژێ خودا لەگەڵ عەشقدا دەگەیشت! مەگەر خودا هەمووی توانایێکی نییە؟ کەواتە دەست لە پەرجوو ناداو لاواندنەوەی دڵی مرۆڤ نایانپشکوێنێ، سەیرکە چۆن هەموو سالّێ لە جەژنی — پوسح- دا قەدی وشکی درەختەکان، چەمەن و دڕکودالّەکان بەنازی پەنجەکانی ئەو سەوز دەبن، چ دەبوو کە رۆژێ مرۆڤ چاوی بکاتەوەو خودی خۆی بەشکۆفە کردوویی ببینێت؟)) بزەیێ بەسەر لێوەکانی نەخشی بەستا، دونیا لە ئاوێنەی خەیالّی گوڵباران بووبوو، پادشای زیناکارت مۆرکرابوو رۆحی پاك بووبۆوە، هرودیای ژنی براکەی بۆلای مێردی خۆی رەوان کردبۆوە، کاهینە گەورەکانو ورگنەکان دەرگای سندوقچەکانی خۆیان کردبۆوەو کالاّکانی ناویان بەسەر هەژارەکاندا دابەش کردبوو، هەژارەکانیش ئازادانە هەناسەیان هەڵدەکێشاو دڵیان لەبەر نەفرەتو حەسوودی ترس پاك کردبۆوە، کریست سەیری دەستەکانی خۆی کرد، ئەو تەورەی کە پێشەنگ لە دەستی ئەوی نابوو، شکۆفەی کردبوو، ئێستاکێ لقێکی بادامی پڕ لەمیوەی لەدەست دابوو.

رۆژی بەو هەستەوە بەئارامی بەسەربرد، بەسەر بەردەوە راکشاو چووە خەوەوە، شەو، تەواوی شەو دەنگی ئاوی هەڵڕژاو سەمای کەروێشکە بچووکەکانی دەبیست، دوو لووتی نمناك کە بۆنی ئەویان دەکرد، دەمەدەمی نیوەشەو واهاتە بەرچاوی کە چەقەلێکی برسی هاتۆتە بالاّی سەریەوەو بۆنی دەکات، ئایا ئەوە لاشەیێ نەبوو؟ جانەوەرەکە بۆ ساتێ دوودڵ وەستا، کریست لە خەودا میهری بەو کرد، دڵی دەیخوازی کە سینەی بکاتەوەو خۆراکی پێبدا، بەلاّم نەیکرد، گۆشتی خۆی بۆ مرۆڤ دانابوو، بەرلە سەحەر بێداربۆوە، تۆڕێ لە ئەستێرە گەورەکان ئاسمانیان داپۆشی بوو، هەوا کورکنو شین بوو، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((لەم کاتەدا، کەلەشێرەکان بێداردەبنەوە، دێیەکان چاویان دەکەنەوە، پیاوان چاویان دەکەنەو لەکلاّوڕۆژنەی بنمیچدا سەیری پرتەوی نوور دەکەن، منالّە شیرەخۆرەکان بەنۆبەی خۆیان بێدار دەبنەوەو دەزریکێنن، دایکیان دێنو مەمکە پڕ شیرەکانی خۆیان لە دەمیان دەنێن)). بۆ ساتێ دونیا، هەموو خەڵك، مالّەکان، کەلەشێرەکان، منالاّنو دایکان، بەسەر بیابانەوە شەپۆلیاندەدا، هەمووی لەشەونمی سوبحەگاهانو شنەبادا سروشتە بووبوون،

بەلاّم ئێستاکێ بەهەلاّتنی خۆر هەموویان هەلّدەمژین وازهێنی دونیا، خالّی دەبوو لە دلّی خۆیا گوتی چ دەبوو ئەگەر دەمتوانی ئەو شەونمە بکەم بەجاویدانی، بەلاّم زەینی خودا گەرداوێکی مەرموزەو ئەشقی ئەو تەلاّنێکی سامناك، دروست لەو کاتەی کە میوە دەدەن، دارمێوەکانی دونیا نیشاندەداو لەمیاندا هەلّیاندەگرێو دارمێوێکی دی پیشاندەدا، وشەکانی پاکشۆری هاتەوەیادو کەسێ چ دەزانێ، لەوانەیە ئەشق تەوری لەگەلّدابێ)). لەبەرخۆ لەرزی، رەنگی سووری وەحشی ژێر خۆرەتاو کە بەتووڕەیی بە تریفەیێ لە تۆڤان سەرهەلّگەڕابوو دەیجریواند، با هەلّیکرد، بۆنی قیڕو گۆگردی بەرلووت کەوت، سەدومو ئەمورەو تەلارەکان، نمایشی مالّەکان، فریوەکان، سۆزانییەکانیان کە لە قیڕ چووبوونە خوارەوە، کەوتە بەر زەینی. ئیبراهیم هاواری کردبوو ((خودایا رەحم بکە، ئەوانە مەسووتێنە، مەگەر تۆ خێری رەها نیت؟ لەبەر ئەمە میهرەبانبە دەرهەق بەوانەی دروستت کردوون)) خودا لە وەلاّمی ئیبراهیمدا گوتبووی ((من عادیلم تەواوی ئەوانە دەسووتێنم))

کەواتە رێبازی خودا وایە؟ لەم حالّەتەدا چ جەسووریێکی، گەورەیە بۆ دلّ، ئەو پارچەنەرمو لیتاوە کە راپەڕێتە سەرپێو هاوار بکات ((بەس کە!)). لەخۆ ی پرسی ((وەزیفە چییە؟)) وەزیفەمان ئەوەیە کە چاومان لە خاك بدوورینو لەسەر زەوی بەدوای شوێنپای خودا بگەڕێین، بێحالّی بکەین، من چاو لە خاك دەدوورم شوێن پێی خودا لەسەدوم ئەمورە دایەو بەچاکی دەبینم، دەریای مردو شوێنپێی خودایە، بەهەلّگرتنی پێی خۆی تەلارەکان، نمایشی مالّەکان، گوندەکان، تەواوی سەدومو ئەمورە غەرق بوون، جارێکی دیکە پێی خۆی دادەنێو ئیدی تەواوی زەوی بە پادشاکانو کاهینە گەورەکانو فەریسیەکانو سەدوقیەکان دەخزێنە بنی دەریاوەوە))
کریست بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێ دەستی بە هاوارکردن کرد، تووڕەیی تێکەوتبوو، غافلّ بوو لە بێ توانایی ئەژنۆکانی خۆی، هەولّیدا هەلّستێتەوە، پێی نایە شوێنپێی خودا، بەلاّم بەهەناسەبڕکێوە بەسەر زەویەوە هەلّخزی، بەهەلّبڕینی سەر بۆ ئاسمان هاواری کرد : ((من ناتوانم مەگەر نابینی؟ من ناتوانم، بۆچی من هەلّدەبژێری؟ من خۆم لەبەر دەردەهێنم)) لەکاتێکا کە هاواری دەکرد ئاپۆڕەیێکی رەشی بەسەر زیخەوە لەڕووبەڕووی خۆیا بینی، بزنێکی وا بوو کە بەدلّو ریخۆلّەی هەلّڕژاویەوەو پەلی لە



هەوادا بوو، بەبیری هاتەوە کە بەسەر بزنێکەوە لاربۆوەو رووخساری خۆی لەچاوانی خۆلّەمێشی ئەوا بینی بوو، بەبنی لێویەوە گوتی ((من ئەو بزنەم، خودا ئەوی ناردە سەر رێی من تا نیشانم بدات من کێمو مەبەستم چییە؟))

لەپڕێکا کەوتە گریە ((حەزم لێ نییە، حەزم لێ نییە، حەزم لی نییە بەتەنها بم کۆمەگی بکە!)) ئەو کاتە لە هەمان حالّدا کە ئەو سەری نابووە یەخەوەو دەگریا، شنەیێ دەستی بەهەلّکردن کرد، بۆنی گەنیوی قیڕو لاشەی لەبێن چوو عەترێکی دلاّوێز پەرشی دونیا بوو، دەنگی ئاوو خەندەو خرنگەی بازنی لە دوورەوە بیست، نزیك لە پێلّوەکانو ژێر هەنگلّو گەرووی هەستی بەشادی کرد، چاوەکانی کردەوە، بەسەر بەردێکەوە لەبەرابەریا، مارێ چاوو مەمکەکانی هەروەکو ژن بوو، زمانی خۆی بەسەر لێوەکانی دادەهێناو سەیری ئەوی دەکرد، ئەوەی دونیای تەرك کردبوو بەترسەوە پاشەکشەی کرد، ماربوو، ژن بوو، یا هەرماسی حیلەبازی بیابان؟ مارێکی وا خۆی بەدەوری درەختی قەدەغەکراوەوە پێچابوو یەکەمین پیاوو ژنی رێ بەدەرکردبوو، بە ئاوێزانبوونی ئەوان گوناه لەدایك بوو، سەدای خەندەو هاواری شیرینی ژنێ کەوتە بەرگوێ ((کوڕی مێرێ، دلّم بەحالّت سووتا)) ((حەزم لێ نییە تەنها بم کۆمەکم بکە)) رەحمەتم بۆ تۆ هێناو هاتم، دەتوانم چی بکەم؟

– من تۆم ناوێ، بانگت نەکردم، تۆ کێی؟

– ڕۆحی تۆم

– کریست گوتی ((ڕۆحی من؟)) چاوەکانی لەترسان داخست

– بەلّێ رۆحی تۆم، تۆ لەتەنهایی دەترسی، ئادەمی باپیرە گەورەشت هەمان ترسی هەبوو، ئەو هاواری کرد، جەستەو رۆحی بەیەکگەیشتن، ژنە لە ئێسقانی پشت هاتە دەرەوەو بوو بە هاودەمی.

–من تۆم ناوێ، ئەو سێوەی کە بەئادەمت بەخشی لەبیرمە هەروەها ئەو فریشتە شمشێر بەدەستەکەشم لەبیرە.

- هەمان ئەو یادەورەیە دەبێتە هۆی دەردو هاوارتو دەبێتە مایەی گومڕا بوونت، ڕێگەت پێ نیشاندەدەم دەستت بدە من، مەگەڕێوە بۆ رابردوو، هیچ شتێ بانگ مەکەوە، بکەوە دوای کۆڕەوی مەمکەکانم، جووتی من ئەوان بەتەواوی شارەزای ڕێگەن.

- تۆ دەتەوێ بە گوناهی لەززەتبارو دۆزەخیش ڕێنماییم بکەی، من نایەم، ڕێگەی من ڕێگەیێکی دیکەیە، مار بەخەندەییێکی تیزئامێزەوە ددانە تیژو ژەهراویەکانی نیشاندا، ((ئەی کرم تۆ دەتەوێ شوێن پێی خودا بکەوی، شوێنپێی باز، تۆ کوڕی نەجارِ، ئارەزوومەندی کە باری گوناهەکانی نەوەیێ بگریتە ئەستۆ، گوناهەکانی خۆت بەس نییە؟ بیری ئەوەی کە وەزیفەی تۆ نەجاتدانی دونیایە، ئەوە هەزار مایەی جەسووری دەوێ!))

کریست لەکاتێکا دەلەرزیو لەبەرخۆ گوتی: (هەق لای ئەوە.. هەق لای ئەوە، ئارەزووی نەجاتدانی دونیا جەسووریو دلێرییە)).

مارەکە چاوەکانی بریقەی دەدایەوە بە ئاوازێکی پڕ لە کرێشمەو نازەوە گوتی ((کوڕی مێرێی ئازیز، دەمەوێ رازێکت پێ بڵێم)). وەکو ئاو بەسەر بەردەوە بۆ خوارەوە هەڵخزی بە زەرقو بەرقەوە بۆلای ئەو چووە پێش، گەیشتە کەنار پێیەکانی ئەوەوە، بەئەژنۆیدا سەرهەڵگەڕا، خۆی جەمکردو بە هەڵبەزینێ لە ڕانو کەمەرو سینەیەوە سەرهەڵگەڕاو تەکیەی بەشانیدا، کریست، سەرەڕای مەیلی خۆی سەری لارکردەوە تا قسەی مار ببیستێ، مار بە زمانی خۆی گوێی کریستی لستەوە، دەنگی رەزینی دینو دڵ بوو لە دوورەوە دەهات: لە جەلیل، لە کەنار دەریاچەی گنسارت.

- مەجدەلیە....مەجدەلیە........مەجدەلیە....

کریست بە لەرزینی ئەندامەکانیەوە گوتی ((چی؟ چ پەیوەندی بە مەجدەلیەوە هەیە؟))

مار فەرماندەرانە گوتی ((ئەو مەجدەلیەیە کە دەبێ نەجاتی بدەی، نەك دونیا، دونیا لەبیر بکە، ئەوە مەجدەلیەیە کە دەبێ نەجاتی بدەی)). کریست هەوڵیدا



مارەکە لەخۆی بەدوورکاتەوە، بەلاّم ئەو سەری بۆ پێشەوە هێناو بەزمان گوێی کریستی دەلستەوە ((جەستەی ئەو جوانە، فێنكو ئەزموندارە تەواوی میللەتان بەسەر جەستەی ئەودا رەت بووینە، بەلاّن گرێبەندی تۆیان لە ئاسمان بەستاوە، ئەو بگرە، خودا ژنو مێردی دروست کردووە تا وەك کلیلو قفل لەگەڵ یەك جۆر بن، بیکەرەوە، منالاّنی تۆ لە دەروونی ئەودا بێ هەست سەریان لەبەردڵی خۆیان ناوە، لە چاوەڕوانی تۆدا دانیشتون تا بێهەستی ئەوان نەهێڵیو بتوانن رابنو لە هەتاودا پێ هەڵگرن...گوێت لە گوفتارمە؟ سەرهەڵبڕەو هێماییێکم پێبدە، ئەزیزم، تەنها سەرت تەکان بدەو هەمان ئێستا ژنەکەت بەسەر تەختەخەوێکی نەرمەوە بۆ دەهێنم...

- ژنی من؟

- بەڵێ ژنی تۆ، سەیرکە خودا چۆن چۆنی ئورشەلیمی سۆزانی هێنا، میللەتان بەسەر ئەودا رەت بووینە، بەلاّم خودا زەماوەندی لەگەڵ کردو نەجاتی دا، سەیرکە یەشوع ی پەیامبەر چۆن لەگەڵ (گومەری) بەدی کچی (دوبالیم) زەماوەندی کرد، بەهەمان ئەم رەوشە خوا فەرمانت پێ دەدا تا لەگەڵ ژنت- ...... هاوباوەش بیتو نەجاتی بدەیت.

ئێستاکێ مارەکە سینەی رووتو فێنکیو گەردەنی خۆی بەسەر سینەی کریستدا فشار دەدا، بە هەڵخزینی لەسەرخۆو حیلەبازی خۆیەوە بەدەوریا لوولدەخوا، رەنگی رووخساری کریست پەڕی، چاوانی خۆی داخستو ......ی بینی کە بە کەفەڵی بەرزەوە لەکەنار دەریاچەی گنسارت نازوفیز دەکات، ئەوی بینی کە دەڕوانێتە رووباری ئوردنو ئاخ هەڵدەکێشێ، مەجدەلیە دەستی درێژکردو بەدوایدا دەگەڕا، منالەکانی مەمکیان گرتبوو، یەك هێمای چاو بەس بوو، کە ئەو هەموو بەختەوەریەی لەبەر پێیدا هەڵڕێژێ، دەگۆڕا، خۆشبەخت دەبوو، مرۆیەکی تردەبوو..ڕێ ئەوە بوو، ئەوە! دەگەڕایەوە ناصیرە، دەگەڕایەوە ماڵی دایکیو لەگەڵ براکانیدا ئاشتی دەکرد، نەجاتدانی دونیای خەڵك بۆ مرۆڤایەتی شتێ نەبوو، جگە لە گەمژەڵی گەنجێتیو شێتی، لەسایەی عینایەتی ...... چاك دەبۆوە، دەگەڕایەوە کارگەی خۆیو جارێکی دیکە پیشەی خۆشەویستی خۆی دەگرتەوە دەست، هەوجارِو

لەلووگو تراری دروست دەکرد، منالّی دەبوو، دەبوو بەگەورەی مالّیّ، جووتیاران ڕێزیان دەگرت، لەکاتی رابردنی دا لەبەردەمی هەڵدەستانەوە، تەواوی هەفتەکاری دەکردو ڕۆژانی شەممە بەجلێکی خاوێن کەمەجدەلیە لە کەتانو ئاوریشم بۆی دروست دەکردو بەدەسمالّی گرانبەهاو ئەلّقەی زێڕینی ئەنگوستی دەچووە کەنیسەوە، لەگەلّ ردێن سپیان لەشوێنیّ دادەنیشت، بە تەواوی ئارامییەوە، بەبیّ جیاوازی گوێی لە کاتبو فەریسیەکانی نیوەشێت رادەگرت، کە چۆن بەجۆشو خرۆشو تەبو لەرزەوە لەکاری شیکردنەوەو راڤەکردنی کتێبی پیرۆزدا بوون. ژەهرەخەندەییێکی دەکردو بە هاودلّیەوە سەیری ئەوانی دەکرد: خودایە کاری ئەو خوداییانە دەگاتە کویّ؟ لەسەرەخۆ کتێبی پیرۆزی شی دەکردەوەو راڤەی دەکرد بەیەقین دەگەنە ژن هێنانو منالّ هەبوونو دروست کردنی لانكو لەلوگو ترار. کریست چاوەکانی کردەوەو بیابانی دیت، خەبەریّ لە ڕۆژ نەبوو خۆرەتاو ئیدی جارێکی دی بۆ لای ئاسۆ لار بووبۆوە، مار لە چاوەڕوانی دابوو، ئارامو فریودەر کیفەکیفی بوو، لایلایەییێکی نەرمو خەمبار هەڵدەڕژایە هەوای عەسرانەوە، تەواوی بیابان وەك دایکیّ لانکی دەژەنیو دەیجوولاندەوە.

مار بەعیشوەوە کیفە کیفی کرد ((من چاوەڕوانم.. من چاوەڕوانم شەو ئێمەی داگرتووە، سەرمامە، بڕیاربدە، هێماییێکم بدەریّ، دەرگاکانی بەهەشت بەڕووتا دەکرێنەوە، ئەزیزم بڕیاربدە مەجدەلیە چاوەڕوانە)).

کریستی وازهێنەر لەدونیا هەستی کرد لە ترسان ئیفیلیج بووە، لە کاتێکا دەمی دەکردەوە تا وشەی (بەلّی) ئەداکا، هەستی کرد یەکیّ لەسەرەوە دەیگریّ، بەترسەوە سەری هەلّبڕیو دوو چاوی لە فەزا بینی، تەنها دوو چاو، وەك رەشی شەوو دوو ئەبرۆی سپی کە هەڵدەتەکینو هێما بۆ ئەو دەکەن ((نا..نا..نا!)) دلّی کریست لە خورپە کەوت، بەنیگاییێکی پاڕانەوەئامێز سەیری بەرزایی کرد، وەك بلّێی گەرەکی بوو هاوار بکات ((من بسپێرە حالّی خۆمو مۆلّەتم بدەو تووڕە مەبە))، بەلاّم چاوەکان تووڕە دەبوونو ئەبرۆکان هەڕەشەئامێز بۆ سەرەوەو خوارەوە دەچوون، ئەو کاتە کریست هاواری کرد (نا..نا...نا) دوو دلّۆپ فرمێسك لە چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە،



یەکسەر مار خۆی پێچایەوەو خۆی لەو جیاکردەوەو بە هاوارێکی خامۆش شەقی برد، بۆنی گەنیو لە هەوادا پێچی خواردەوە

– کریست بەسەر رووخساریا کەوتە سەرخاك، دەمو لووتو چاوی پڕلە خۆلّ بوون، زەینی خالّی بوو، بەفەرامۆش کردنی برسێتیو تێنوێتی وەك بلّێی ژنو رۆلّەکانی مردبنو ژیانی تووشی فەنابووە، لەکاتێکا گازی لە زیخو چەو دەگرت بەزەمزەمەکردنەوە گوتی :خودایە، خوداوەند، ئەی باوکە مەگەر تۆ رەحمەت نییە؟ خواستی خواستی تۆیە، چەند جار تا ئێستا ئەم قسەیەم گوتووە، چەند جاری دی دەلّێمەوە؟ بەدرێژایی عومری خۆم بەلەرزو موکڕیەوە دەلّێمەوە- خواست خواستی تۆیە))

بەم حالّەتەوە چووە خەوەوە، وەك چۆن چاوانی جەستەی چووە خەوەوە، چاوانی رۆحیشی کرایەوە، تارمایی مارێکی گەورەی وەك جەستەی مرۆڤی بینی کە لە مەرزی شەوەوە تا ئەو مەرزی شەو بەسەر زیخەوە درێژ ببۆوە، لەکاتێکا دەمی قورمزی رۆشنی ئەو لەکەنار کریستدا بوو، راکشابوو، لەبەرابەر ئەم دەمە کەوێکی لەرزیوو خۆش خەتو خالّی بێهودە هەولّیدەدا تا بالّەکانی بکاتەوەو رابکات، بۆ پێشەوە هەڵدەخزیو هاواری کزو کورتی سەردا، لە ترسان پەڕەکانی قیت بووبوونەوە، مار بەبیّ جوولە بەدەمی کراوە چاوی بڕیبووە ئەوەوە، پەلەی نەبوو دلّنیابوو لە دابینکردنی خۆراکی خۆی، کەوەکە لەسەرخۆ بەرەو دەمی کراوەی مار دەهاتە پێش، کریست لە کاتێکا وەکو کەو دەلەرزی، بێدەنگ وەستابوو سەیری دەکرد، وەك بلّێی داوای کۆمەگی دەکرد، ئەوکاتە لەپڕێکا ملی درێژکردو چووە ژوورەوە، دەم داخرا، کریست دەیتوانی کەوەکە ببینیّ تۆپ ئاسا پەڕو گۆشت، پێی یاقوتی هێدی هێدی هەڵدەخزیە ناو ورگی ئەم دڕندەیەوە بەترسەوە لەجێوە هەلّبەزیەوە، بیابان کەلّەکەییێك بوو لە شەپۆلّی پف کردووی گولّڕەنگ، خۆرەتاو لە حالّی سەرهەلّگەڕان دابوو، کریست کە جەستەی دەلەرزی بەزەمزمەکردنەوە گوتی:

((ئەو ئەژدیهایە خودایەو ئەم کەوەش...))

دەنگ لە گەروویدا شکستی خوارد، توانای تەواوکردنی ئەندێشەی نەبوو، بەڵام لە دەروونی خۆیا گوتی: ((ڕۆحی مرۆڤ..ئەو کەوە رۆحی مرۆڤە)) چەندین سەعات بەنوقم بوون لەو ئەندێشەیەدا لە جێی خۆیدا مایەوە، خۆرەتاو بەرزبۆوەو ئاگری لەزیخو چەو بەردا، پێستی سەری کریستی کون کردو چووە ژوورەوە، مێشكو گەروو سینەی قاش قاش کرد، گەدەو هەناوی وەك هێشووی هەڵڕژاوی ترێی چینی پاییزی بەهەڵواسراوی مایەوە، نووکی ئەنگوستەکانی شین هەڵگەڕابوون، لەناخیا زمان وەکو خورپەی دڵ بچووك بووبۆوەو وەکو مەرگی گەورە ئیدی برسیو تێنووی نەبوو، ئیدی ئارەزووی ژنو منداڵی نەبوو، تەواوی رۆحی لە چاوانیدا لوولی خواردبوو، ئەوی دەدی، تەنها ئەو، بەڵام دروست لەکاتی نیوەڕۆدا نیگای تاریك بوو، دونیا مەحوو بوو دەمی گەورەی جێگایێ لە بوونیدا کرایەوە، کە شەویلاگی خوارەوەی زەمینو شەویلاگی سەرەوەی ئاسمان بوو، بەلەرزینەوە خۆی بۆلای دەمی کراوەوە پەلکێش کرد، ملی بۆ پێشەوە بردبوو....

ڕۆژانو شەوان وەکو درەوشانەوەی رەشو سپی هەورەتریشقە بەسەردەچوو، نیوەشەوێ شێرێ هاتو لەبەرابەریا وەستا، بەغروورەوە کلکی رادەتەکاند، دەنگی وەکو دەنگی مرۆڤ وابوو، ((بەخێربێی بۆ لانەی من، ئەی زاهیدی پیرۆزمەند، من درووددەنێرم بۆ مرۆڤێ کە بەسەر کەمینەی فەزیلەتو شادیو لەززەتی بچووك زاڵ دەبێ. ئێمەش شتی سانامان خۆشناوێ، ئێمە چاو دەبڕینە شتی سەختەوە، مەجدەلیە بۆ ئێمە بەس نییە، دەمانەوێ تەواوی زەمین بەژن بگرین ئەی زاوا، بووك ئاخی هەڵکێشاوە، مەشخەڵی ئاسمان رۆشن بۆوە، میوانان گەیشتن بابڕۆین

–تۆ کێی ...

– خۆت: شێری برسی ناو دڵو دەروونی تۆ، کە شەوان لەکەنار ئاخوڕی مەڕانو مەلەکوتی ئەم دونیایە پیاسە دەکاتو لەناو ئەم مەلەکوتەدا بازدانو خواردن سوكو سەنگینی دەکات، بەپەلە لەبابل بۆ ئورشەلیم، لە ئەسکەندەریە بۆ رۆما دەچمو هاوار دەکەم:



– ((من برسیم هەموو شتی هی منە)) سپێد دووبارە دێمەوە ناو سینەتو لەوێ هەڵدەتۆقێم، شێری دڕندە دەبێتە بەرخێك، رۆڵی زاهید دەبینم، کە هەموویان مەیلی هیچیان نییەو بەدەنکە گەنمێ رازین، قومە ئاوێکی خوداییو پاكو خۆشو ئامادە بەناوی ((باوك)) دەکەم بەلایلایە. بەڵام لە پەنای ناخی دڵمدا شەرمەزارم، تووڕە دەبم بەتاسووقەوە لە چاوەڕوانی هەڵکێشانی شەودا روودەنیشم، زەمانێ کە بتوانم جلی مەڕ داکەنم جارێکی دی بگۆڕێنمو پانتایی شەو تەی بکەمو پێیەکانم بکوتم بەسەر بابلو ئەسکەندەریەو رۆمو ئورشەلیم.

– من تۆ ناناسم، من هیچ کاتێ ئارەزووی مەلەکوتی ئەم جیهانەم نەبووەو مەلەکوتی ئاسمان بۆ من بەسە.

– وانییە دۆستی من، تۆ خۆت فریودەدەی، بەس نییە، زاتی ئەوەت نییە سەیری ناخی قووڵایی دڵت بکەی تامن بدۆزیتەوە.. بۆ حەپ حەپ تەماشام دەکەیو دەربارەی من فیکری خراپ دەکەی؟ وابیردەکەیتەوە کە من وەسوەسەمو نێرراوی — خەناس- م هاتووم تا گومڕات بکەم؟ ئەی ئەو کەسەی گۆشەگیریت هەڵبژاردووە مێشك بۆش، چ قودرەتێ دەتوانێ وەسوەسەی دەرەکی هەبێ؟ تەنها لە دەرووندا قەڵای گرتووە، من قوڵترین دەنگی خودی خۆمی تۆم، من شێری دەروونتم، تۆ خۆت لە پێستی بەرخێ وەرپێچاوە تا خەڵکی بەرەو لای خۆت پەلکێشکەیو هەڵیاندڕی، بەبیرت دێ لە کاتی منداڵی سیحربازە کلدانیەکە سەیری ناو لەپی کردیو گوتی ((چەندین ئەستێرەو خاچ بێ ژمێر دەبینم، تۆ دەبیتە پاشا)) بۆ وا خۆت لە گێلی داوە؟ تۆ شەوو رۆژ ئەم بابەتە وەبیر خۆت دێنیتەوە. ئەی کوڕی داود، رابە بچۆرە ناو مەلەکوتت.

کریست بەسەری لارەوە گوێی راگرتبوو، کەم کەم دەنگەکەی ناسیەوە، هێدی هێدی وەبیری دەهاتەوە کە زەمانێك ئەو دەنگەی لە خەوندا بیستبوو: جارێکیان لە رۆژانی منداڵی کە یەهودا لێی دابوو، جارێکی دیکەش کە ماڵێی جێ هێشتبوو چەندین شەوو رۆژ بە چەنگاڵی برسیەتی ناوگیانییەوە چووبووە ناو مەزراو ئەو کاتە بەشەرمەزاری گەڕابۆوە ماڵەوە براکانی، سیمونی شەلو یاکوبی زوهدپیشە کە لە

دەرگا وەستابوون‌و ئەویان بەستایەوە، ئەوکاتە بوو کە بەڕاستی دەنگی نەڕڕەی شێرێکی لە دەروونی خۆیدا بیستبوو، هەمان چەند رۆژی پێشتریش لەوکاتەی کە خاچی بۆ لەداردانی ئەو جانبازە هەڵگرتبوو، بەرەو رووی ئاپۆڕەکە تێدەپەڕی‌و ئەوان بەنەفرەتەوە سەیریان دەکردی‌و لەسەر رێ بەدوور دەکەوتنەوە، شێرێکی دەروونی بەهێزێکی وا هەڵبەزیبۆوە کە ئەوی کردە نەخشی سەر زەوی. ئێستاکێ سەیری ئەم شەوە درێژە بکە کە وەکو نەڕڕەشێر ناخی هاتۆتە دەرەوەو رووبەڕووی بۆتەوە! خۆی لەو هەڵدەسووی، ون دەبوو دووبارە بە دیاردەکەوتەوە، وەك بڵێی لە دەروونی ئەوا دەچێتە ژوورو دێتە دەرەوە، کلکی لەو دەدا، کریست هەستی دەکرد کەوا دڵی زیاترو زیاتر تووڕە دەبێ، لەبەرخۆ گوتی ((هەق لای شێرە، ئیدی بۆ حەفت پشتم بەسە، لەبرسیبوون‌و خاکەڕایی‌و نمایشی لایەکەی دی رووخسارم بۆ زیللەلێدان بێزار بووە، ئیدی لە ستایشی ئەو خودایە ئادەمخۆرەو ناوهێنانی بە باوکە باوکە تا میهرەبانتر بێت تەنگەتاو بووم. لە نەفرینی براکانم، گریانی دایکم، خەندەی خەڵك ماندوو بووم، بە پێپەتی رۆیشتن‌و نەبوونی شتێ بۆ کڕینی شەهدو شەراب‌و ژن کە لە بازاڕدا دەیانبینم، دۆزینەوەی شەهامەت تەنها لە کاتی خەودا، ناچارکردنی خودا بۆ هێنانی ئەوانە بۆ من تا بتوانم هەوای خاڵی بەچاوو باوەش بگرم تولێخامەوە، تووشی نەزۆکی بووم، دەمەوێ خواستی خۆم بەشمشێری باوانم بڕازێنمەوە.. مەگەر من کوڕی داود نیم؟ دەچمە ناو مەلەکوتەوەش، هەق لای شێرە، خواحافیزی بکە لە ئەندێشەو هەورو ئاسمان بەردو خاك‌و لەش‌و مەلەکوتی منە)) هەڵسایەوە، لەشوێنێکی وجودیدا قودرەتی دۆزیبۆوە تا هەڵبەزێ‌و خۆی بە شمشێرێکی نادیار بەهێز بکات‌و وەك شێر بنەڕێنێ.

هاتبوو، هاواری کرد (( بۆ پێشەوە)) بەڵام شێر ون بوو، قاقای خەندەییێکی لەبەرزایی سەریەوە بیست، دەنگێ کە دەیگوت (( سەیرکە)) هەورە تریشقەیێ شەوی شەق کردو چەسپاوو بێ جوڵە وەستا، ژێر تاقی ئاسمان شارێك بوو، بە بورج‌و بارو خانەو رێ‌و مەیدان‌و خەڵك بوو دەوروبەریشی دەشتایی‌و کێوو دەریا، بابل لەلای راست بوو، ئورشەلیم‌و ئەسکەندەریەش لەلای چەپ، بە درێژایی رووباریش رۆم، جارێکی دیش دەنگەکەی بیست ((سەیرکە)) کریست سەری بەرزکردەوە فریشتەیێکی باڵ زەرد



بەسەر لە ئاسمان کەوتە خوارەوە، سەدای شیوەن دەهاتە بەرگوێ، لە چارێکی دانیشتوان خەڵکی دەستیان بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوە، بەڵام دەستیان کەوت: جوزام ئەوانی خواردوو لێوانیان کردەوە تا هاواری کۆمەك بکەن. لێوانی جوزام خواردوویان کەوتە خوارەوە، شەقامەکان پڕبوون لە دەست‌و لووت‌و دەم.

لە هەمان کاتدا کریست بەدەستە بەرزەکانیەوە هاواری کرد ((خوداوەند رەحم بە بەشەریەت بکە!)) فریشتەی دووەم بەباڵی رەنگاو رەنگ بەسەر دووپێ‌و گەردەنی لە ئاسمان بردە خوارەوە، بە یەکجار دەنگی خەندە لەسەراسەری زەویدا پێی خواردەوە، جوزام گرتووەکان، شێت‌و هار بەملاو بەولادا رایاندەکردو ئەوانەش کە مابوونەوە لەبەر زۆر پێکەنین شەقیان دەبرد:

کریست لە کاتێکا دەلەرزی، گوێی خۆی گرت تا نەبیستێ، ئەوکاتە فریشتەی سێهەمی باڵ قورمزی وەك شەهابێ لە ئاسمان کەوتە خوارەوە، چوار چاوی ئاگرو چوار ستونی دووکەڵ هەڵسا، ئەستێرەکان لەبەر نەبوونی هەوا خامۆش هەڵگەڕان، بایێکی سووك هەڵیکردو دووکەڵەکانی پەرش‌و بڵاوکردەوە، کریست سەیری کرد، زەوی بوو بە چوار خۆڵەمێش. دەنگ جارێکی دی دەنگی دایەوە: ئەی فەلەکزەدە، مەلەکوتی دونیا، کە ئارەزووی بەموڵك کردنیت هەیە، ئەوان ئەو سێ فریشتە خۆشەویستەی من، جوزام‌و شێتی‌و ئاگرن، رۆژی خودا گەیشتووە- رۆژی من! رۆژی خۆم)) هەورە تریشقە بەدوا گوڕڕەی گەواڵە ون بوو، سەحەر، بەرووخساری رووچووی لە زیخەوە، وابەدیار دەکەوت کە شەو کاتێك کە بەردی گلۆرکردبۆوە، های های‌و گریەی کردبوو، چونکە چاوەکانی سووتابۆوەو هەڵسابوو، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، نەکا ئەو زیخ‌و لمە بێ کۆتاییە رۆحی ئەو بێ؟ بیابان خەریك بوو دەگۆڕاو گیانی وەبەر دەهات، دەنگی هاواری توند، خەندەی تێزئامێزو گریە دەهاتە گوێ، ئاژەڵی بچووکی وەکو کەروێشك‌و سمۆرەو راسو بە چاوی وەك یاقوتیانەوە بۆ لای ئەو هەڵدەبەزینەوە، لەبەرخۆ گوتی : ((ئەوەشێتیە کە ئارەزووی گیانمی هەیە)) هاوارێکی کردو ئاژەڵەکان ون بوون، فریشتەیێ کە مانگی هیلالی بەگەردەنەوە هەڵواسرابوو، ئەستێرەییێکی

شادانی نێوان ئەبرۆکانی پێش چاوی ئەو دانیشتە سەر زەوی‌و باڵە سەوزەکانی کردەوە.

کریست لەبەرامبەر نووردا بەڕوانینەوە دەستەکانی خستە سەر چاوەکانیەوە، بەڕازەوە گوتی: ((ئەی فریشتە ئەی فریشتە)) فریشتەکە باڵەکانی خۆی کردەوەو بزەییێکی هاتێ ((من ناناسی؟ منت بەبیرنایەتەوە؟))

– نا..نا تۆ کێی ؟ ئەی فریشتە بۆ دواتر بڕۆ، نووری تۆ نابینای کردووم.

– لەبیرتە لە ڕۆژانی منالێدا ئەو کاتە کە هێشتا نەتدەتوانی بڕۆی، خۆت بەدەرگای ماڵ‌و دامەنی دایکت هەڵدەواسی تا نەکەویتە سەر زەوی، لە ناخەوە هاوارت دەکرد ((خودایا، من بکە بەخودا، خودایە بمکە بەخوا، خودایە بمکە بەخوا))

–ئەو کفرە پیسەت لەبیرە؟

– ئەو دەنگە دەروونیە من بووم کە ئەوکاتە هاوارم دەکردو ئێستاش هاوار دەکەم، بەلاّم تۆ دەترسێی خۆت لەکەڕی دەدەی، بەلاّم ئێستا بتەوێ یا نەتەوێ، دەبێ گوێ لەمن بگری، زەمانی موژدەهێن گەیشتووە، بەر لەوەی کە لەدایك بی تۆم لە میانی تەواوی بەشەریەت هەڵبژاردووە، من لەناو دەروونی تۆ کار دەکەم‌و دەدرەوشێمەوە، ئاگادارت دەکەمەوە کە نەکەویتە داوی کەمینەی فەزیلەت‌و شادی‌و خۆشیە بچووکەکانەوە، ئەو بیابانەی تۆم پەلکێشی ناوی کردووە، ببینە چۆن ئەو ژنەم دەرکرد، هاتن، ئەوانیشم دەرکرد، ئەوە من کردم نەك تۆ، من تۆم بۆ سەرنویشتێکی گرنگترو مەترسیدارتر ڕاگرتووە.

– گرنگترو مەترسیدارتر؟

– لەکاتی مندالّی ئارەزووی چیت دەکرد؟ بوون بەخودا، کە دەبیە خودا

– من من

– خۆت وەپاش مەدە، گریەو زاری مەکە، تۆ پێشتر بوویتە خودا، تۆ بیر لەوە دەکەیتەوە کە ئەو کۆترە کێویە لە ڕووباری ئوردن چی بەتۆ گوت؟



– پێم بڵێ ... بۆمن بڵێ.

– تۆ کوڕی منی، تۆ کوڕی منی، ئەوە پەیامێ بوو کە کۆتری کێوی بۆتی هێنابوو، بەلاّم ئەم کۆترە کێوی نەبوو جوبرائیل بوو، لەبەر ئەمە سەلام لە تۆ دەکەم ئەی کوڕ، ئەی تەنها کوڕی خودا.

دووباڵ لە سینەی کریستدا کەوتنە شریخەوە، هەستی بە گەشانەوەی ئەستێرەییێکی سیحری سەرپێچکارکرد لە میانی ئەبرۆکانیدا، هاوارێ لە دەروونی هەڵسا ((ئەدونیا.. منی مرۆڤ، فریشتە، بەندەی تۆ نیم، من کوڕی تۆم، من بەسەر تەختەوە دادەنیشم تا داوەری مردوو زیندووەکانم بکەم، گۆی دونیا دەگرمە دەستی ڕاستم‌و یاری پێدەکەم، جێی من بکەوە تا دانیشم)). سەدای قاقای خەندەییێکی لە فەزا بیست، کریست ڕاجفری، فریشتە ون بوو، هاوارێکی جگەرسۆزی سەردا- لوسیفر کەوتە سەر زیخەوە.

بە دەنگێکی تیزئامێزەوە گوتی (( دووبارە بەخزمەتت دەگەم، ڕۆژێ دووبارە یەکتری دەبینینەوە.. هەزوو)).

کریست بەرووخساری رووچووی لە زیخدا هاواری کرد ((ئەی هەرماس هیچ کاتێ.. هیچ کاتێ ... یەکتری نابینینەوە)).

دەنگەکە دووبارە گوتی ((هەرزوو .. لە هەمان جەژنی پوسح دا ئەی فەلەکزەدە)) کریست دەستی کرد بە شین‌و زاری فرمێسکەکانی بە دڵۆپی گەرم دەکەوتە سەر زیخ‌و چەوەوەو ژەنگی ڕۆحی خۆی شوشت‌و پاك کردەوە، دەمەدەمی عەسر بایەکی فێنك هەڵیکرد، خۆرەتاوێکی نەرم‌و بۆر هەڵڕژایە سەر کێوەکان، ئەو کاتە کریست فەرمانێکی میهرەبانی گوێ لێبوو دەستێکی نادیار بەسەر شانیەوەو قەراری گرت.

- رابە ڕۆژی خودا گەیشتووە، پەلەکە ئەم پەیامە بگەیەنە مرۆڤەکان ((من بەدیار دەکەوم))

## بەشی هەژدەهەم

وای کە کریست بە چ خێراییەك بیابانی لە دوای خۆیەوەی جێهێشت! گەیشتە دەریای مردوو، بەدەوریا سووڕایەوە، دووبارە پێی نایە سەر زەوی کێڵراوو ئەو هەوا پیسەی هاتە ناو هەناسەی مرۆڤەوە.. بەبێ یارو یاوەر ڕێی تەی نەدەکرد، ئاخر لەکوێ دەیتوانی ئەو توانایە بدۆزێتەوە؟ دوو دەستی نادیار بن باڵی ئەویان گرتبوو، هەورێکی ناسك بەسەر بیابانەوە وەدیارکەوتبوو، گەورەبوو، ڕەش داگەڕاو ئاسمانی داپۆشی، دەنگی گوڕڕەی گەواڵە دەگەیشتە گوێ، لەدوای ئەوەوە یەکەمین دڵۆپە باران کەوتە سەر زەوی، زەوی ڕەش داگەڕا، ڕێگاکان ون بوون، لە هیکەوە تاڤگەکانی ئاسمان هەڵڕژان، کریست ناولەپی خۆی کردە پیاڵەو پڕ ئاو بوو خواردیەوە، وەستا نەیدەزانی بەکام ڕێدا بڕوات، هەورەتریشقە هەوای شەق کرد، بۆ ساتێ ڕووخساری زەوی بەڕەنگی شینی زەردی کەم ڕەنگەوە کەوتە درەوشانەوە، بەڵام دووبارە ڕەش بۆوە، ڕێی ئورشەلیم کامەیان بوو، کام ڕێ بۆ لای یەحیای پاکشۆر بوو؟ هاوسەفەرەکانی کە لەناو قامیشەڵاندا لە کەنار ڕووبارەوە چاوەڕێی ئەویان دەکرد چییان بەسەر هات؟ بە رازو پاڕانەوە گوتی ((خودایە، هەورەتریشقەیێ بنێرە خوارەوە، ڕێم پێ نیشان بدات)) لە کاتێکا قسەی دەکرد لەبەرەو ڕووی ئەودا مەشخەڵێ لە ئاسمان هەڵسا، خودا نیشانەیێکی بەو دابوو، ئەو بەدڵنیاییەوە بە هەمان لادا بۆ پێشەوە دەچوو سێڵاوی باران هەڵدەڕژا، ئاوی نێری ئاسمان هەڵدەڕژانە خوارەوە، لەگەڵ ڕووبارو دەریاچە، ئاوی مێینەی زەوی پەیوەست دەبوون، زەمینو ئاسمانو باران بوونە



یەك، سەریان لەدوای ئەو نابوو تا ڕێنمایی بکەن بەرەو مرۆڤ، لە ناخی گڵو لیتەدا بازیدەداو پێیەکانی لە ڕەگوڕیشەو لقی دار گیردەبوو، ڕێگەی خۆی لە چاڵەکانەوە لادەداو لە ڕۆشنایی هەورەتریشقە هەنارێکی لێکردەوە، دەستی پڕ لە یاقووت بوو گەرووی تازەبۆوە، یەکێکی دیکەی رنیو دیسان یەکێکی دیو خواردی، دەستخۆشی لەو دەستە کرد کە چاندبووی، بە هێزێکی تازە دووبارە کەوتە ڕێ، هەوا تاریك بوو، ڕۆژ بوو یا شەو؟ پێیەکانی لەبەر گڵ سەنگین بوو، وا بەدیار دەکەوت کە لەگەڵ هەر پێیەکدا تەواوی دونیا هەڵدەگرێ، ناگەهان لە درەوشانەوەی هەورەتریشقەیێ، دێیەکی بچووکی بەسەر بەرزایی گردۆلکەیێکەوە بینی، ماڵە سپیەکانی ئاگر تێبەردەداو دووبارە خامۆش دەکردەوە، دڵی لە بەرشۆق کەوتە خورپە، مرۆڤ لەوماڵانە دانیشتبوون- برایان- و ئەو بە تاسوقی ساوی دەستی مرۆڤ بوو، هەناسە هەڵکێشان لە هەوای مرۆڤو خواردنی نانو خواردنەوەی شەرابو گفتوگۆو کە چەندین ساڵ بوو لە تاسوقی تەنهایی، کێوو مەزراکانی دەنایە ژێر پێو لەگەڵ مەلو ئاژەڵە کێویەکان قسەی کردبوو خۆی لە دیتنی مرۆڤ بەدوور گرتبوو بەڵام ئێستا چەند خۆش بوو ئەگەر دەست ساو داتە دەستی مرۆڤەکان، پێیەکانی توندکردو دەستی کرد بە سەرهەڵگەڕان بەسەر تاوێرە بەردەکانەوە، لە کوێ ئەنجامی دەگرت، لە کاتێکا سەرهەڵدەگەڕا هەورەکان نەرم بوونو پارچەیەك لە ئاسمان بەدیارکەوت، خۆرەتاو بەهەمانحاڵ کە ئاوا دەبوو، لە ئاسمان بەدیارکەوت، دەنگی کەڵەشێری گوند، وەڕینی سەگەکانو ئەو ژنانەی کە بەسەربانەکانیانەوە بانگی یەکتریان دەکرد بیست ، لە دووکەڵکێشەکانەوە دووکەڵێکی شین بەرزبۆوە ئاسمان، بۆنی داری کرد کە لە حاڵەتی سووتاندا بوو.

لە کاتێکا بەکەناری یەکەمین ماڵی دێکەدا ڕەت دەبوو، بە بیستنی گفتوگۆی مرۆڤەکان، بەبنی لێویەوە گوتی ((پیرۆز بێت تۆوی مرۆڤ))

بەردو ئاوو ماڵەکان بریقەیان دەدایەوە، چی دەڵێم! پێدەکەنین، زەوی شەقی بردبوو، تێنوێتی خۆی شکاندبوو، تۆفان مرۆڤو ئاژەڵی زەندەق بردبوو، بەڵام ئەوکاتە هەورەکان بەپەرشو بڵاوبوونەوەی خۆیان ئاسمانیان شین کردو خۆرەتاو کە ون بو

جارێکی دیکە گەڕایەوە، مەیدانی ئاسمان دڵنیاییان دەکردە دیاری بۆ دنیا، کریست خۆشحاڵو سەرتاپا تەڕ، بەکوچە باریکەکانەوە دەگەڵ شوڕەشوڕی ئاو بازی دەدا، کچێکی گەنج وەدیارکەوت، بزنێکی گوان گەورەی بۆلەوەڕگا رادەکێشا، کریست بە بزەی لێویەوە گوتی(( ناوی ئەم گوندە چییە؟))

– بیت ئنیا.

– بۆ دۆزینەوەی شوێنێکی باش دەتوانم لە کام دەرگا بدەم، من لێرە غەریبم

کچەکە بە خەندە وەڵامی دایەوە (( لە هەر شوێنێ کە دەرگاییێکی کراوەت دۆزیەوە بڕۆ ژوورەوە)). لە هەر جێگاییێ دەرگای کراوەت بینی بڕۆ ژوورەوە، کریست لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((مرۆڤی ئەم دێیە میهرەبانو میوان دۆستن))

بۆ پێشەوە چوو تا دەرگاییێکی کراوە بدۆزیتەوە. کوڵانەکان ببوونە رووبارێکی بچووك، بەڵام بەردەزلەکان سەریان لە ئاو دەرهێنابوو، دەرگاکان لەبەر باران رەش بووبوونو داخرابوون، لە یەکەمین سووچدا سوورایەوەو دەرگاییێکی بچووکی تاقداربوو رەنگی نیلی بوو، کراوە بوو، ژنێکی کورتەباڵای چوارشانەی غەبغەبەداری لێو ئەستوور لە دەرگای ماڵ وەستابوو، ژنێکی گەنجی دیکە، لەناو ماڵدا کە نوورێکی کەمڕەنگی لێدەهاتە دەرەوە، لەکەنار کارگەی چنین دانیشتبوو، کاری چنینی دەکردو بەنەرمۆکەیی گۆرانی دەچڕی، کریست نزیك کەوتەوە لە ئاستانەی دەرگا وەستاو دەستی بە نیشانەی سەلام بەرزکردەوەو داینایە سەر دڵیو گوتی غەریبەمو خەڵکی جەلیلم سەرمامەو برسیمە، شوێنێکیشم بۆ خەوتن نییە، من مرۆڤێکی شەرەفمەندم مۆڵەت دەفەرمووی کە ئەمشەو لە ماڵی ئێوە بم، دەرگام کراوە بینیو هاتمە ژوورەوە لە من ببوورن)).

ژنە جحێڵەکە گەڕایەوە دەستەکانی پڕ لە دانەوێڵەی پەلەوەر بوو، بە ئارامی ئەوی بەسەر کردەوە، بزەییێکی هاتیۆ گوتی ((بۆ خزمەتگوزاری حازرین، پێت لە سەرچاوان، فەرموو)) جۆلاکە دەستی لەکارکێشایەوەو لە حەوشەدا بەدیارکەوت، ئێسقانێکی وردیلەی هەبوو رەنگی پەڕی بوو، کەزی رەشی خۆی بەکلکی کەروێشك



بەستابۆوە، چاوەکانی گەورەو خەمناك بوو، گەردەنبەندێکی پیرۆزەیی بەدەوری گەردەنی لاوازی وەکردبوو بەنیشانەی نەزری قوربانی، سەیری میوانی کردو رووخساری سووربۆوە گوتی (( ئێمە تەنهاین ئیلیازری برامان لێرە نییە چۆتە ئوردن تا خۆی ئاوەمۆر بکات))

ئەویتر گوتی ((چ فەرقی هەیە خۆ ئێمە ناخوات، ئاغای ئازیز فەرموو وەرە ژوورەوە گوێ مەدەرە ئەو، ئەو لە سێبەری خۆشی دەترسێ، خەڵکی دێ بانگ دەکەین تا ببنە هاوسوحبەتتو ریش سپییەکانیش بۆ بەخێرهاتن کردنو چاكو چۆنی ، کەواتە لووتف بکەو وەرە ناو ماڵی بچووکی ئێمەوە؟ چیت بەسەرهاتووە؟ سەرماتە؟

– کریست وەڵامی دایەوە گوتی (( سەرمامەو برسیمەو خەواڵووشم))

ژنە گوتی ((ئەوە هەرسێکیان چارەسەریان هەیە، ترس لە خۆت بار مەکە ئێستا دەمەوێ بزانی کە ناوی من (مارتا)یە، ئەوەشیان خوشکم، ناوی مێریۆە، ناوی تۆ چییە؟

– کریستی ناصیرەیی.

مارتا پێکەنیو لە کاتێکا دەستی بۆلای ئەو رەوانە دەکردو گوتی ((ئادەمێکی باشی؟

کریست بە سەروپۆتەلاکێکی جیدی گوتی ((بەڵی خوچە مارتا باش باش تا حەدی تواناییم))

چووە ناو کوختەکەوە، مێریۆ مەشخەڵێکی داگیرساند، ژوورەکە بەدەرو دیواری سپییەوە پڕ لە نوور بوو، لەناو ماڵەکەدا دوو سندوقی درەختی سەرونیازی لێبوو، چەند دانەیێ چوارپایە، بە راستایی دیوار سەکۆییێکی دارین هەبوو دۆشەكو سەرینی بەسەرەوە بوو، دەسگای چنین لە سووچێکەوە بوو، لە سووچەکەی دی چەند شەربەییێکی گڵێنی تایبەت بە زەیتونو رۆن، شەبەرییێکی ئاوی فێنك لەلای راست بوو لە کەناریا پارچە کەتانێکی درێژ بە بزمار هەڵواسرابوو، ماڵەکە بۆنی درەختی سەرونیازو بەهێی لێدەهات، بەشی ئاگردان ژوورەکە بەپانو تاریکی مابۆوە،

کەرەستەی چێشت لێنان لەو دەوروبەرەدا هەڵواسرابوو. مارتا هات‌و گوتی ((دانیشە ئێستا سۆپا بۆ هەڵدەکەم تا جلەکانت وشك بێتەوە)) ئەو کاتە تەختێکی بۆ هێناو لەکەنار سۆپاکە داینا، پاشا چووە حەوشە یەك باوەش دارمێوی هێنا، گەڵای دارغارو دوو چلە زەیتونی هێنا، دەستەویەخە دانیشت ئاگرودووەکەی وەك کوختەیێکی بچووك لێکردو ئاگری تێبەردا. کریست لە کاتێکا خۆی هەڵکورماندبوو سەری لەمیانی دوو دەست نابوو، ئانیشکی نابووە سەر ئەژنۆکانی، سەیری دەکردو لەبەرخۆ ئەندێشەی دەکرد ((ڕێ‌و ڕەسمێکی چەند پیرۆزە کۆکردنەوەی دارو دەوەن‌و داگیرساندنیان لە ڕۆژی سارددا، مەشخەڵ وەك خوشکێکی میهرەبان بۆ لای تۆ دێت تا گەرمت کاتەوە، چوونە ناو ماڵێکی غەریب، بەبرسیەتی‌و تێنوێتی‌و بینینی دوو خوشکی غەریبی دیکە کە دێن وەسیلەی حەسانەوەی تۆ ڕێکدەدەنەوە))، چاوەکانی پڕلە ئەشك بوو.

مارتا هەڵسایەوەو چووە لای یەخدانەکەوە، نان‌و هەنگوین‌و پەیمانەی شەرابی هێناو لەبەر پێی غەریبەکەی دانا گوتی ((بۆ ئەوەی تامی دەمت بگۆڕی لەمانە بخۆ، ئێستاکە مەنجەڵ دێنمە سەر ئاگرەوە تا خۆراکێکی گەرم بخۆی‌و گیانت وەبەربێتەوە، دەبێ لە ڕێگەیێکی دوورەوە هاتبێ))

کریست وەڵامی دایەوە (( لەوسەری زەویەوە هاتوم)) بەتاسووقەوە لاربۆوە سەر نان‌و زەیتون‌و هەنگوین، وای کە لەززەتبەخش بوو، خودا بەسەخاوەتەوە تەواوی ئەم نیعمەتانە بۆ مرۆڤ دەنێرێ، خواردی‌و سوپاسی خوای کرد. مێریێ لە تەواوی ئەم ماوەیەدا لە کەنار جێگای مەشخەڵەوە بەخامۆشی وەستابوو، سەرەتا سەیری ئاگری دەکرد. پاشان سەیری میوانی نەناسراوی دەکرد، پاشان سەیری خوشکی دەکرد کە چۆن چۆنی بە هەبوونی پیاوێك لە ماڵ‌و میوانداری پەڕوباڵی لێ هاتبوونە دەر.

کریست پیاڵەی شەرابی هەڵگرت‌و سەیری ئەم دوو ژنەی کردو گوتی ((خوشکەکانم مێریێ‌و مارتا حەتمەن بیستوتانە کە لە زەمانی نوح تۆفان هات، خەڵکی هەمووی گوناهکار بوون‌و هەموویان غەرق بوون، تەنها ئەو چەند کەسە کارڕاستانەی کە لەناو کەشتی بوون ڕزگایان بوو، مێریێ‌و مارتا سوێند دەخۆم کە ئەگەر تۆفانێکی دیکە هەڵسێ‌و من سەرپشك بم لە داوەت کردنی ئێوە بۆ ناو کەشتی نەناسیاوی کۆنەپۆش‌و



پێ پەتی کە لەکەنار دەرگای ماڵی ئێوە بەدیارکەوت‌و ئێوە ئاگرتان بۆ کردەوەو گەرم بۆوە، خواردنتان پێداو تێربوو، بەقسەی موحیبەت ئامێز قسەتان لەگەڵ ئەو کرد ئەوە ئێوە هەڵدەبژێرم، مەلەکوتی ئاسمان دابەزی‌و چووە دڵیەوە، خوشکانم، بەسەلامەتی ئێوە دەخۆمەوە، بەدیتنی ئێوە خۆشحاڵم.

مێریێ نزیك کەوتەوەو لە بەرپێی کریست دانیشت، بەرووخسارێکی شەرمنی گوڵ گۆناوە گوتی: (( ئەی غەریبە دەنگی تۆ نابیستم تۆ قسەمان زیاتر بۆ بکە)).

– مارتا چێشتی هێناو سفرەی ڕاخست‌و ئاوی ساردی لە بیری ناو حەوشەکەوە هەڵکێشا، ئەوکاتە هاوسێیەکی جاحێڵی نارد تا خەبەر بداتە ڕیش سپی دێ کە مەرحەمەت بفەرموونە ماڵی ئەوو تەشریف بهێنن، چونکە ئەوو خوشکەکەی میوانێکیان بۆ هاتووە.

مێریێ کە کریستی بینی بێدەنگە، گوتی (( زۆرتر قسەمان بۆ بکە))

کریست پرسی (( مێریێ حەزت لە چییە بۆت بڵێم؟)) بە ئارامی دەستی بەسەر کەزی ڕەشی ئەو داهێنا ((بێدەنگی جوان‌و بە سەد زمان قسە دەکات))

– بێدەنگی ژنان ڕازی ناکات، ژن وەك منداڵان پێویستیان بە وشەی ئەڤین ئامێزەوە هەیە.

– مارتا کە لەبەر خاتری شەونشینی زەینی لە مەشخەڵەکان بوو، قسەی مێریێی بڕی‌و گوتی ((گوێ مەدەرە قسەی ئەو، هەتا قسەی موحیبەت ئامێزیش ژنان ڕازی ناکات)).

– بەڵی قسەی موحیبەت ئامێزیش ژن ڕازی ناکات، ژن دەیەوێ گوێی لە دەنگی پێی مێردەکەی بێ، کە ماڵی خستۆتە لەرزەوە، دەیەوێ شیر بدات بەمناڵ تا مەمکەکانی ئارام بگرن، ئەی کریستی جەلیلی، ژن زۆر شتی دەوێ، بەلام پیاوان چ لەو بابەتانە دەگەن؟))

– مارتا هەولێدا بخەنێ، بەلاّم نەیتوانی، سی ساڵ عومری بوو کەچی شووی نەکردبوو، ئەوان بێدەنگ بوون، گوێیان لە ئاگر راگرت کە داری زەیتونی قووتدەداو نێڵەی دەکردە سەرقاپی دارینی خۆراك کە ئاوەکەی جۆشیدەدا، چاوانی هەرسێکیان لەمەشخەڵدا گوم بووبوون. عاقیبەت مێریێ بێدەنگی شکاند: ((چ دەبوو ئەگەر تەنها دەتزانی کە ژن لە کاتێ کەدانیشتووەو کاری چنین دەکات چی بەدەروونی دا تێپەڕێ، کریستی ناصری ئەگەر دەزانی دڵت بە حاڵی ئەو دەسووتا))

کریست بە بزەییێکەوە گوتی ((دەزانم، منیش زەمانێ، لە ژیانێکی تردا، ژن بووم‌و کاری چنینم دەکرد)).

– بیرت لە چی دەکردەوە؟

– بەخودا بیرم لە هیچ شتێکی دیکە، جگە لە خودا نەدەکردەوە مەریم، ئەی تۆ چۆن؟

مێریێ وەلاّمی نەدایەوە، بەلاّم سینەی بەرزبۆوە، مارتا گفتوگۆی ئەوانی بیست‌و ئاخی هەڵکێشا، بەلاّم هیچی نەگوت، لە ئەنجامدا نەیتوانی خۆی راگرێ، بەدەنگێکی زبرەوە گوتی: ((مەترسە جانم، مێریێ‌و من‌و تەواوی ژنانی بێ مێرد لەگەڵ خودا قسە دەکەین، ئەو وەکو مێردێ بەسەر ئەژنۆی خۆمانەوە دادەنیشێنین)).

کریست سەری هێنایە خوارەوەو هیچی نەگوت، مارتا مەنجەڵی بەسەر ئاگرەوە هەڵگرت، شام ئامادەبوو، بەرەو لای یەخدان چوو تاکاسە بهێنێ‌و خۆراکی تێکا، مێریێ لە کاتێکا بەچرپەوە قسەی دەکرد تا خوشکەکەی گوێی لەقسەی ئەو نەبێت گوتی : ((دەمەوێ شتێ بەتۆ بڵێم کە جارێ لە جاران لە کاتی چنینکاری دا هاتە زەینم، منیش ئەو رۆژە بیرم لە خودا کردەوەو لەگەڵیا قسەم دەکرد، دەمگوت: ((خودایا... ئەگەر کاتی بەهاتنە ناو کوختە بچووکەکەی ئێمەوەو منەتێکمان لەسەر بکەیت، تۆ دەبیە خاوەن‌و ئێمەش میوان‌و ئێستاکێ)). قسە لەگەروی شکاو خامۆش بوو: کریست سەری هێنایە پێشەوە تا ببیستێ: ئێستاکێ؟ مارتا خۆی‌و کاسەکەی گەیشت.



مێریێ بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((هیچ))و لەجێوە هەڵسایەوە.

مارتا گوتی ((وەرن بخۆن، ئێستا سەروسەکوتی ریش سپییەکان بەدیاردەکەوێ، نەوەکا ئێمە لەکاتی خواردن ببینین)) هەرسێ نەفەر دانیشتن، کریست نانی گرت‌و بەرزی کردەوە رێوڕەسمی پیرۆزکردنی وا بەگەرمی‌و پڕ هەستەوە ئەداکرد کە ئەو دوو خوشکە سەرسام بوون‌و سەیری ئەویان دەکرد، بەدیتنی ئەو ترسان، چونکە رووخساری نوورانی هەڵگەڕاو فەزای دواوە هەڵگیرساو جریوەی دەهات.

مێریێ دەستی هێنایە پێش‌و هاواری کرد ((ئەی پەروەردگار تۆ خاوەنی ماڵی‌و ئێمە میوان، فەرمانمان پێبدە)) کریست سەری هێنایە خوارەوە تا ئەوان ئاگایان لە شڵەژانی ئەو نەبێ، ئەوە یەکەمین هاوار بوو، یەکەمین جار بوو کە نەفەرێ پەی بەو بردبوو.

بەتاریك بوونی دەرگای ماڵ‌و وەدیارکەوتنی پیرەمێردێکی زەبەلاح لە ئاستانەی دەرگادا ئەوان لەسەر سفرە هەڵسانەوە، پیرەمێردەکە ریشێکی پەرشوبلاّوی هەبوو، پیاوێکی ئێسقاندار، بازووێکی توندوتۆڵ‌و سینەییێکی بەمووی هەبوو لە سینەی بەرانێکی شاخدار دەچوو، گۆپالێکی خواری درێژی لەدەست دابوو، بۆ ئەوەی خۆی بەسەردا بدا، بەکاری نەدەهێنا، بەلاّم بۆ پاراستنی نەزمی گوندەکە سوودی لێ وەردەگرت.

هەردوو ژن بە عیززەت‌و رێزەوە بەویان گوت ((باوکە مەلەك یەسدوق پێی خێرت نایە کولیەی بچووکی ئێمەوە))

پیرەمێرد هاتە ژوورەوەو لەدوای ئەوەوە پیرەمێردێکی دی لەدەرگا بەدیار کەوت، ئەوەی دواییان وردیلە بوو سەرێکی درێژی ئەسپینی بێ ددانی هەبوو، چاوە وردەکانی مەشخەڵیان لێ بەرزدەبووەوە، کە نەتدەتوانی زۆر تەماشای بکەی، دیاربوو ژەهری ماری لەپشت چاودا هەبوو، پیرەمێردێ پشتی چاوی ئاگربوو، لەپشتی ئەو ئاگرەوە زەینێکی بەدو پۆخلّ هەبوو. ژنەکان حورمەتیان لەویش گرت‌و ئەویش هاتە ژوورەوەو لەدوای ئەویش پیرەمێردی سێهەم کە کوڕێکی خەپڵەو قەڵەو بوو بەدیارکەوت.

گۆپاڵەکەی دەنایە پێش، چاوەکانی گۆپاڵ ڕێنمایی ئەویان دەکردو نەیاندەهێشت بکەوێتە خوارەوەو پیاوێکی باش بوو، حەزی لە شتی بەتام بوو هەموو کاتێ کە لە دادوەری سەبارەت بە دێهاتیەکان دەهاتەوە، دڵی نەدەهات کەس تەنبێ بکات.

دەیگوت: ((من خودا نیم، کەسێ کە بۆ دادوەری دادەنیشێ، خۆشی هەردەبێ جێگەی دادوەری کردن بێت، ڕۆڵەکانم خۆتان بەدوور بگرن لە شەڕو گێچەڵ تا لە دونیای دی تووشی دەردەسەری نەبن)).

هەندێ جار پارەی دادوەری لەبەرکی خۆی دەدا، هەندێ جاریش بۆ نەجاتی سەرپێچیکار خۆی دەچووە زیندانەوە، هەندێ ئەویان بەگەلحۆ دەزانیو هەندێکیش بە پیرۆز لە قەڵەمیاندەدا، مەلەك یەسدوقی پیر گەرەکی بوو خۆی لەو بەدوور بگرێ، بەلاّم ئەو دەیتوانی چی بکات، سەروکاری لەگەڵ کەسێ بوو کە لە پشتی ڕەوحانی هارون بوو، یەکێ بوو لە مولّکدارە ملەستوورەکانی دێ، مەلەك یەسدوق کە گۆچانەکەی دەگەیشتە قسپی بنمیچ گوتی (( مارتا کوا ئەو غەریبەی هاتۆتە ناو ئێمەوە؟ کریست لەکەناری دووکەڵکێشەکەوە مابۆوەو سەیری ئاگری دەکرد، هەڵسایەوە، بەڕوانینو بەسەرکردنەوەی ئەو گوتی تۆی؟)) کریست گوتی (( بەڵێ منم خەڵکی ناصیرە))

پیرەمێردی دووەم گوتی ((خەڵکی جەلیل؟ قەت شتێکی باش لە ناصیرەوە بەدەرناکەوێ، کتێبی پەیامبەران وادەڵێت. ریش سپیە نابیناکە تاویدایە ناوقسەکانو گوتی ((باوکە ساموائیل، تانە لەو مەدە، دروستە کە جەلیلیەکان خەڵکی چەنەبازو گێلو سەرەڕۆن، بەلاّم خەڵکی باشن، ئەو میوانەی ئێمەش لەقسەی را دیارە باشە)). پاشان رووی لە کریست کردو گوتی ((بەخێر بێیت رۆڵەم)) مەلەك یەسدوق پرسی ((بازرگانی؟ چی دەفرۆشی؟))

لەهەمان کاتدا کە ریش سپیەکان گفتوگۆیان دەکرد، ملەستورانی دێو زەویدارانی ناودار دەهاتنە ژوورەوە، خەبەرداربووبوون لە هاتنی غەریبەکە، خۆیان تاسو لووس (نونوار)دا بوو بەمەبەستی کات بەسەربردنو بۆ بەخێرهێنانو پرسیارو چۆنیو چاکی، ئەوان هاتنە ژوورەوەو لەدوای ریش سپیەکانەوە دانیشتن.



کریست گوتی ((من هیچ شتێ نافرۆشم، رۆژێ لەڕۆژان نەجارِ بووم، بەلاّم کاری خۆم جێهێشت، ماڵی دایکم جێهێشتو خۆم وەقفی خودا کرد))

پیاوە نابیناکە گوتی (( کوڕم کارێکی باشت کرد کە دونیات تەرك کردووە))

بەلاّم ئاگاداربە، چونکە ئێستا خۆت لەگەڵ هەرماسێکی بەد، لەگەڵ ئەم خودایە قاتی کردووە، دەتەوێ لە جەنگی ئەودا راکەیت؟)) کەوتە خەندەوە.

مەلەك یەسدوقی پیر بەبیستنی ئەم قسەیە، خەریك بوو شەق بەرێ لە تووڕەییان، بەلاّم بێدەنگ بوو، ریش سپی دووەم بەتیز پێکردن منە منێکی کرد((ئەی رەبەن؟ تۆش یەکێ لە (لاویان) ی ؟ جانبازی؟ پەیامبەرێکی درۆزن؟

کریست بەشڵەژانەوە گوتی ((نەخێر.... نەخێر باوکە

– ئەی چکارەی؟

خانمانی گوندەکە ئەوکاتە بە زێڕو زیوی خۆیان هاتنە ژوورەوە تا غەریبە ببیننو خۆشیان نیشان بدەن، تا بزانن ئەو غەریبە پیرە یا گەنجو خۆش سیمایە چی دەفرۆشێت، لەوانەشە بۆ خوازبێنی ماراتا یا مێرێ یەکێ لەو دوو خوشکە جوانە هاتبێ، بەلاّم کچی ماڵێ بوو، چەندین سەدە بوو ئەو منالاّنە کەسیان لەباوەش نەکردبوو، ئاخیری باشتروایە بڕۆینو ببینین، ئەوان خۆیان تاسو لووسو شیك کردو هاتن، ئێستاکێ هەمو وبەیەکەوە لەیەك رێزدا لەپشت پیاوان وەستابوون.

پیرەمێردی دەروون پیس جارێکی دی پرسی ((کەواتە چکارەی؟))

کریست لەپڕێکا هەستی بەسەرما کردو دەستی بردە بەرئاگر، جلەکانی ئەو کە هێشتا تەڕبوون، هەڵمیان لێ هەڵدەسا، بۆ ماوەیەك بەبێدەنگیو بیرکردنەوە لە جێوەمایەوە، لەبەرخۆ گوتی (( ئەوە باشترین ساتە بۆ قسە کردن، باشترین ساتە بۆ ئاشکراکردنی رازێ کە خوداوەند بۆ منی ئاشکرا کردووە، تا خودای خەوتوو لە دەروونی ئەم ژنو پیاوانە کە بەدوای پەیوەندی بێهودەی خۆیان تەباهیان دەکرد، بێدار بکاتەوە. لە من دەپرسن کەچی دەفرۆشم، وەلاّم دەدەمەوە: مەلەکوتی ئاسمان، رزگاری رۆح، ژیانی

جاویدانیی)) لێگەڕێ با بۆ کڕینی ئەو ((مرواریە گەورەیە)) جلی بەریشیان بفرۆشن)). بەخێرایی سەیری دەوروبەری کرد رووخسارەکانی لەنووری مەشخەڵی رۆشنایی ئاگادار بینی، ((هەموو دڕندەخوو حیلەباز، فەرسودە لە پروپوچی رۆژانە کەوەکو خوریکە بەگیانیان وەربووەو لەترسان وڕبووینە رەحمی بەحاڵی ئەوان کردو ویستی هەڵستێتەوەو قسە بکات. بەڵام ئەمشەوە زۆر ماندوو بوو، ئێستاکێ چەندین رۆژبوو کە لەماڵی مرۆڤێ نەحەساوەتەو سەری بەسەرین نەکردووە، بەخەواڵوییەوە پشتی بەدیواری دوکەڵاوی داو چاوەکانی داخست.

مێرێ تاوی دایە ناو قسەکانو بەنیگاییێکی پاڕانەوەئامێز سەیری پیرەمێردەکانی کردو گوتی ((سەروەران، ئەو ماندوو بووەو ئازاری مەدەن))

مەلەك یەسدوق بەبنی لێویەوە گوتی ((ڕاست دەبێژێ)) بەتەکیەدان بەسەر گۆچانەکەیەوە ئامادەی هەڵسانەوەو رۆیشتن بوو ((مێرێ هەق تەواو بەتۆیە، بەشێوەیێ قسە لەگەڵ ئەو دەکەین وەك بڵێی مەحکەمەی دەکەین، لەبیر دەکەین)). رووی لە ریش سپی دووەم کرد ((لەبیر دەکەی باوکەساموائیل کە فریشتەکان زۆربەیان بەجلی هەژاریەوە دێنە زەویەوە... بەکراسێکی سادە بێ گۆچانو جانتاو پێڵاو، دروست وەکو ئەو پیاوە، لەبەر ئەمە، چاکتروایە ئاگاداربین با لەگەڵ ئەم غەریبەیە بەجۆرێ بێینە رایێ وەك فریشتەییێ، تەنها ئەوە دووربینیە))

ڕیش سپیە نابیناکە بەخەندەوە گوتی ((کەرایەتیە، وا دیتە بەرچاو کە دەبێ هەموو مرۆڤێ بەفریشتە دابنێین، بەڵێ هەموو مرۆڤ هەتا ساموائیلی پیریش)).

پیرەمێرد ژەهرالود بوو لە تووڕەییان شێتو هار بوو، خەریك بوو دەمی بکاتەوە پەشیمان بۆوە، ئەو شاهینە پیرە دەوڵەمەند بوو، رەنگە رۆژێ پێویستی بەو دەبێ، چاکتروایە مرۆڤ خۆی لە بێدەنگی بدات. ئەوەش هەر دووربینیە.

مەشخەڵی دڵنەوازی ئاگر کەوتە سەر قژو رووخساری ماندوو سینەی کراوەی کریست، تیشکی شین کەوتە سەر ردێنی رەشو ئاڵۆزیەوە خانمانی دێیەکە دەیانچرپاندە گوێی یەکتریو دەیانگوت ((هەرچەندە هەژارە، بەڵام دڵ دەرفێنێ، چاوەکانیت دیت؟ سەرنج



راکێشترین چاون کە تائێستا دیومانە، هەتا لە چاوەکانی مێردیشم کە من لە باوەش دەکات. سەرنج راکێشترە)).

یەکێکی دی تاوی دایە ناو قسانو گوتی ((تا کریست کەسێکی وا کێویم نەبینیوە هەمووی ترسو وەحشەتە، مرۆڤ هەست دەکات کە هەموو شتێ بەرەڵلا دەکاو تێدەتەقێنێتە گردۆلکەکانەوە)).

– خانم جان، دیتت کە مارتا چۆن بە چاوەکانی خەریك بوو ئەوی دەخوارد، فەراژەییێکی تر گوتی ((بەڵام بەتیلەی چاو سەیری مێرێی دەکرد، لەمنت گوێ لێ بێ کە ئەودوو خوشکە ئەمشەو دەکەونە گیانی یەکتریەوە، من هاوسێیانم گوێم لەسەروسەدایان دەبێ)).

مەلەك یەسدوق ی پیر فەرماندەرانە گوتی ((باشتروایە بڕۆین بەخۆڕایی زەحمەتی هاتنمان کێشا، میوان خەواڵوە، هەستن ریش سپیەکان بابڕۆین)) بە گۆچانەکەی ژنو پیاوەکانی راداوە تابتوانێ تێپەڕێ، بەڵام هەرکە گەیشتە دەرگا، سەدای شەقاوی بەپەلەی لە حەوشە بەرگوێ کەوت، پیاوێکی رەنگ پەڕیو هاتە ژوورەوە خۆی لەبەرامبەر ئاگر هەڵکورماند، بەهەناسەبڕکێوە دوو خوشکەکە بەترسەوە لە باوەشیان کردو هاواریان کرد:

– برام چیت بەسەرهاتووە؟ کێ سەری لەدونای؟

مەلەك یەسدوق کە تازە هاتبۆە بە گۆچانەکەی خۆی دەستی بەقسەکرد: ئیلیازر کوڕی مەناکیم، ئەگەر خەبەرێکی خراپت پێیە تا ژنان ژوور بەجێبهێڵنو پیاوان بمێننەوە تا ببیستن، ئیلیازر بەیەك هەناسە هاواری کرد: ((پاشا یەحیای پاکشۆری دەستگیرکردو سەریان لەلەش کردەوە)) لە کاتێکا دەلەرزی، هەڵسایەوە

ئەو مرۆڤێکی زردنبو بوو، بەڕەنگی خاك، گۆناکانی هەڵتەکابوو شۆربووەوە، چاوەکانی سەوزو رەنگ پەڕیو لەبەردەم ئاگردا مایەوە وەکو چاوی پشیلەییێکی وەحشی بریقەی دەدایەوە

ڕیش سپی نابینا بە رازی بوونەوە گوتی ((ئەن ئاخیری ئەمشەومان خراپ نەبوو، هەر لەوکاتەوەی کە بێداربووینەوە تا ئێستا، کە دەمانەوێ بڕۆینو بخەوین، لە ئەنجامدا شتێك روویدا، دونیا تەکانی خوارد، لەم حاڵەتەدا باشتر وایە بەسەر تەختەکانەوە دانیشینو گوێ بگرین، من حەزم لەو هەواڵەیە هەرچەند کە خراپیش بێ)). بۆ لای ئیلیازر لاربۆوەو گوتی ((دۆستی من لووتف بکە قسەمان بۆ بکە، پێمان بڵێ کە ئەو موسیبەتە چۆنەو بۆ روویدا، رێك لەسەرەتاوە بۆمان بگێڕەوەو پەلەش مەکە، شەوچەرەیێکی باشە، هەناسەت تازەکەوە، ئێمە هەموو لەشمان گوێیە؟))

کریست بە راجفرینەوە لەشوێنی خۆی هەڵسایەوەو سەیری ئیلیازری کرد، ئەوەیان نیشانەیێکی تازەبوو کە خودا بۆی رەوانە کردبوو، پێشەنگ مالآوایی کردووەو ئیدی پێویستی بەو نییە، رێی هەموار کردووەو کۆچی کردووە، ئەرکەکەی ئەنجامی هەبووە، کریست لە کاتێکا دەلەرزی، لەبەرخۆ گوتی ((زەمانی من هاتووە، زەمانی من هاتووە))، بەلآم بێدەنگ لە شوێنی خۆیدا مایەوەو چاوی بڕیە لێوی سەوزو رەنگ پەڕیوی ئیلیازرەوە. مەلەك یەسدوقی پیر کە بەتووڕەییەوە گۆچانی بەزەویدا دەکوتا گوتی ((ئاوا کەواتە ئەویان کوشت؟! سەیرکە کار گەیشتۆتە کۆیکەوە کەزیناکارانی بەدکار پیرۆزەکان دەکوژنو بەدکاران زاهیدەکان دەکوژن.. دونیا گەیشتۆتە کۆتایی. وەحشەت زاڵ بوو بەسەر ژنەکانو قیژاندیانو وەڕێکەوتن، ریش سپی نابینا دڵی بەوان سووتاو گوتی:

– مەلەك یەسدوق زێدەڕۆیی دەکەی دونیا بەسەر پێکانیەوە توندو قورس وەستاوە، خانمەکان مەترسن، ئیلیازر کە وەکو سێلاوی بارانێ فرمێسکی هەڵدەڕشت بە هۆقە هۆقو گریانەوە گوتی: گەرووی دونیا بڕاوە، سەدای بیابان خامۆش بووە، ئێستا چ کەسێ بۆ خاتری ئێمەی گوناهکاران، خودا بانگ دەکات؟ دونیا بێ باوك بووە)).

ڕیش سپی دووەم بەپسەپسەوە گوتی ((مرۆڤ نابێ دەست بەڕووی دەسەلآتداران بەرزکاتەوە، چاو بەسەر کارەکانیان داخەو سەیرکە، چونکە خودا سەیر دەکات، ئەو پاکشۆرە لەو فزولیانە نەدەوەشایەوە، سزای کاری هەر ئەوەیە)) مەلەك یەسدوق



قیڕاندی ((مەگەر ئێمە دیلین؟ بەمن بڵێ مەگەر خودا بۆ دەستی داوە بە مرۆڤ؟ من دەڵێم بۆ، بۆ ئەوەی کە بەڕووی زۆرداراندا بەرزیان بکەینەوە))

ریش سپییە نابینایەکە گوتی (( باوکان بێدەنگ بن لێگەڕێن بزانین ئەو شەڕە چۆن روویداوە.. ئیلیازر قسە بکە))

ئیلیازر دەستی پێکرد ((من لەگەڵ ئەوانی دیکە چووبووین خۆمان ئاوەمۆر بکەین، ئومێدەوار بووم کە ئەو کارە بۆ چاك بوونم کاریگەربێ، وەك چۆن دەزانن، دوایش حاڵێکی دروستو رێکم نەبوو، راستیەکەی ئەوەبوو رۆژ بەڕۆژ حاڵم خراتر دەبوو، سەرم گێژدەبوو، چاوەکانم هەڵدەمسانو گورچیلەکانم...)).

ڕیش سپیە نابیانەکە بە تیزبزەیێکەوە گوتی ((زۆر باشە زۆرباشە هەموو ئەوە دەزانین، وەرە ناو ئەسلی باسەکەوە)).

– گەیشتمە ئوردنو لەکەنار پردی دووەم کە خەڵك بۆ ئاوەمۆر دەهاتنو کۆدەبوونەوە، گوێم لە دەنگی هاوارو گریەو زاری بوو، بەخۆمم گوت ((شتێ نییە، لەوانەیە خەڵك بەفرمێسكو ئاخەوە دان بەگوناهەکانیان بنێن)) کەمێ بۆ پێشەوە چووم ژنانم بینی کە بەسەر رووخساریانەوە کەوتبوونە سەر قوڕو لیتاوی رووبارەوە شێوەن دەکەن، پرسیم ((براکان چی روویداوە؟ بۆ دەگرین؟))

– پەیامبەر کوژراوە!

– کێ ئەم کارەی کردووە؟

– ئەو تاوانکارە .. ئەو خەتاکارە -هیرودیس-

– چۆنو کەی؟

– ئەو مەست بووەو سالومەی ناکچی سوورتکی رووتو قووت لەبەردەم ئەودا سەمای کردووە، جوانی ئەو کچۆڵەیە هۆش لەسەری ئەو بەدکارە پیرە رفاندووەو بەسەر ئەژنۆکانی خۆیەوەی دادەنیشنێو دەپرسێ کە چ داوایەکی هەیە، نیوەی قەڵەمڕەوی؟ کچەش دەڵێ نە، کەواتە چ داواکارییێ؟ ئەویش خوازیاری سەری یەحیای

پاکشۆر بووه، پێی دەڵێ ((ئێستا خواستی تۆ دەهێنمە دی))و دەستوور دەداتو سەری یەحیا لەناو قازانێکی نوقرەیی بۆ کچە دەهێنن. قسەکردن ئیلیازری هیلاك کردو دووبارە کەوتە سەر زەمینەوە، هیچ کەسێ قسەی نەدەکرد، مەشخەڵ کەتبووە پرتەپرتەوە، نزیك بوو خامۆش بێ کە مارتا هەڵسایەوەو دووبارە پڕی کردەوە لە زەیتو رووناکی گرتەوە.

– مەلەك یەسدوقی پیر دوای وەستانێکی دوورو درێژ دووبارە بەدەرکەوتو گوتی ((دونیا گەیشتۆتە ئاخیری)) لە تەواوی ئەم ماوەیەدا، دەستی بەڕدێنیدا دەهێناو تەباکاریو فەزاحەتی دونیای هەڵدەسەنگاند، رێكو بەردەوام هەواڵ لە ئورشەلیمەوە دەهات کە بتپەرستان پەرستگای پیرۆز پیس دەکەن، هەموو رۆژێ بەیانیان کاهینەکان گاییێكو دوو بزن دەکەنە قوربانی، بەلاّم نەك بۆ خوای سراییل، بەڵکو بۆ ئیمپراتۆری بێ خوداو نەفرەتی رۆم... دەوڵەمەندەکان هەموو رۆژێ بەکردنەوەی دەرگای ماڵەکانی خۆیان بەسەر پەیژەکانەوە خەڵکێکیان دەدی کە شەو لەکاتی برسیەتیدا مردبوون، بەلاّم ئەوان کەوای ئاوریشمینی خۆیان هەڵدەتەکاندو بەسەر جەنازەکانەوە رادەبردنو بەدرێژایی هەیوانەکانی دەوری پەرستگا نازوفیزیان دەکرد.

مەلەك یەسدوق هەموو شتێکی لەزەینی خۆیدا هەڵدەسەنگاند، گەیشتە ئەو بڕیارە کە بەڕاستی دونیا کۆتایی هاتووە. رووی لە کریست کردو گوتی ((ڕای تۆ چییە؟ کریست بەدەنگێکی وا قووڵو لەناکاوییدا کە هەموویان گەڕانەوەو سەیری ئەویان کرد: وەلاّمی دایەوەو گوتی ((من لە بیابانێکەوە دێم کە ئەوانم بینی، بەڵێ سێ فریشتە پێشتر لە ئاسمانەوە هاتبوون، تا بکەونە سەر ئەم زەویەوە، بە چاوانی خۆم ئەوانم بینی کە لە شیرازەی ئاسمان را دیاربوون، ئەوان وا خەریکە دێن، یەکەمین فریشتە جوزامەو دووەمیان شێتیو سێهەمیان، میهرەبانترینی ئەوان ئاگرە، هەروەها دەنگێکم بیست گوتی ((کوڕی نەجاڕی کەشتییەك دروست بکە، بەهەر ئەندازەیێ مرۆڤی چاکەخوازت دۆزیەوە جێی تیا بکەرەوە، بەلاّم بەخێرایی)) رۆژی خودا گەیشتووە.. رۆژی من.. من بەدیاردەکەومو خۆم ئاشکرا دەکەم...



سێ ردێن سپییەکە هاواریان کرد، ئەوانی دیکە کە بەسەر زەویەوە دانیشتبوون هەڵسانەوە، ددانەکانیان لێك دەقرمساند، ژنان بەگێژو وێژی هاتنە لای دەرگاوە، مێریو مارتا لە کەناری کریستدا جێی خۆیان گرت، وەك بڵێی بەدوای پاراستنی ئەو دەگەڕان، مەگەر ئەو سوێندی نەخواردبوو کە ئەوان بەکەشتیی دەبات؟

زەمانەکە هاتبوو.

مەلەك یەسدوقی پیر رووخساری خۆی سڕیەوەو هاواری کرد

((ئەو غەریبەیە حەقیقەتی هێنایە سەر زمان، برایان گوێ لەم پەرجوویە بگرن، ئەمڕۆ لە کاتی دەرکەوتنی سپێدەوە هەڵسامەوە، کتێبی پیرۆزم وەك عادەتی کردەوە، وشەکانی یوئیلی پەیامبەر هات (( کەڕەنای سەهیۆن لێرە تا کێوی پیرۆز دەنگ بداتەوە، هەموو ئەوانەی کە لە سەر زەوی دەژین بلەرزێنە، چونکە رۆژی خوداوەند هاتووە، رۆژی هەورو تاریکی، لەبەردەمی ئەو ئاگرە لە پاشو پێشەوەشدا مەشخەڵەکانی کە وەك ئەسپەکان تاو دەدەن، وەکو پەیتونی جەنگی بەسەر کێوەکانەوە هەڵدەبەزنەوە، بەسەر ترۆپکی کێوەکان، ئەو مەشخەلاّنە دەنگی تەقینەوە بەرهەم دێنیو لەم کاتەدا کە دەگەنە قایمشەلاّنەکانەوەو دەیانسوتێنن.. رۆژی خودا وایە)). ئەو هەواڵە ترسناکەم دوو سێ جار خوێندنەوە، بە پێخواستی لەحەوشەدا کەوتمە خوێندنەوەی، ئەو کاتە کەوتمە سوژدەو هاوارم کرد: ئەگەر ئارەزووتە وا زوو بێیت، نیشانەییێکم بۆ بنێرە دەبێ خۆم ئامادەکەم، دەبێ میهرەبانی بۆ هەژاران بهێنمو دەرگای سندوقچەکانم بکەمەوە سزای گوناهەکانم بدەم، هەورەتریشقەییێك بنێرە، دەنگێ یا مرۆڤێ کە ئاگادارم کاتەوە لە وادەی خۆیدا خۆم ئامادە بکەم)).

ئەوکاتە رووی لە کریست کردو پێداچوو (( تۆ ئەم نیشانەیەی کە، خوداوەند تۆی ناردووە، ئایا هەلێك بۆ من ماوەتەوە، رۆڵەم؟ دەرگای ئاسمان کەی دەکرێتەوە..؟))

کریست وەلاّمی دایەوە ((باوکە هەر سانیەیێ کە رەت دەبێ، ئاسمان ئامادەی بوونەوەیە، بە بەسەر چوونی هەر ساتێ جوزامو شێتیو ئاگر پێیەك دێنە پێشەوە، باڵەکانیان لە پەرچم دەدەن)).

ئیلیازر کە چاوانی سەوز ڕەنگو پەڕیوی خۆی کردەوەو ڕوانیە کریست، بە دوودڵیەوە هەنگاوێکی نا پرسی ((نەکا تۆ کریستی ناصیری بیت، دەڵێن کە جەلاد ساتوری خۆی گرت تاسەری پاکشۆر لە لەشی جیاکاتەوە، پەیامبەر دەستی بۆلای بیابان درێژ کردو هاواری کرد ((ئەی کریستی ناصیرەیی بیابان بەجێبهێڵە بگەڕێوە بۆ لای مرۆڤ، وەرە دونیا بگرە دەست)) ئێستا ئەگەر تۆ کریستی ناصیرەیی بیت، ئەو زەویەی کە تۆ هەنگاو بەسەریا دەنێی دەبێە موتفەرك، ماڵی من پیرۆز بووە، من ئاوەمۆر کراومو چاك بوومەتەوە، خۆم داوێمە سەرزەویو ستایشی تۆ دەکەم)) بە گوتنی ئەم وشانە کەوتە سوژدە تا پێی شین هەڵگەڕاوی کریست ماچ بکات.

بەڵام ساموائیلی پیر بەخێرایی خۆی لەبەریەك هەڵکێشا، بۆ ساتێ تووشی ئەفسون بوو، بەڵام خۆی جەمو جۆر کردبوو، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((خواستی دڵی خۆم لە بوونی پەیامبەراندا دەدۆزمەوە، لەیەك لاپەڕەدا خوداوەند، لە دەست ئوممەتی خۆی تا سەرحەدی شێتی تووڕەبووە، دەیەوێت لەناویان بەرێت، لە لاپەڕەیێکی دی خودا هەمووی شەهەدو شیرە، پەیامبەرێتی بەدروستی لەبەرامبەر حاڵی سپێدەیی خۆمان دەبینین لەبەر ئەمە سەبارەت بەم بابەتەوە خەو لەخۆم حەرام نەکەم)) سەری ئەسپئاسای راتەکاندو تیزبزەییێکی کرد، بەڵام هیچی نەگوت ((چاکتروایە خەڵك بترسێ، بەسوودی ئەوانە، بەبێ ترس ژمارەی هەژاران رو لەزیاد بووندایەو ملیان ئەستوورتر دەبێت، ئەو کاتە فاتیحەی ئێمەیان خوێندووە))

لەبەرئەمە، بێدەنگی هەڵبژاردو بە قێزەونەوە سەیری ئیلیازری دەکرد کە پێی میوانی خۆی ماچدەکردو لەگەڵیا قسەی دەکرد.

– مەولای من، ئەگەرئەو جەلیلیانەی کە لە ئوردندا بینیانم، حەواریەکان تۆبن، پەیامێکیان بۆ تۆ هەیە، ئەوان گوتیان کە لەوێ دەڕۆنو لە ئورشەلیم دا لە دەم دەروازەی داوود، لە مەیخانەی- سیمۆنی قەیرەوانی، لە چاوەڕوانی تۆدا دەمێننەوە، کوشتنی پەیامبەر دیار بوو ئەوانی تووشی وەحشەت کردبوو ورایانکرد تا خۆیان بشارنەوە. کوشتار دەستی پێکردووە.



لە هەمان ئەو کەینوبەینەدا بوو، ژنان بەمەبەستی ڕۆیشتن، نوقرچەیان لەمێردەکانیان دەداو لە هەموو شت گەیشتبوون، لەبەرخۆ دەیانگوت: ((چاوی ئەم غەریبەیە لەمار دەکات، بەنیگایێ هۆشت لەسەر دەرفێنێ، قسەدەکاتو پایەی دونیا دەڕوخێنێ، چاکت ڕوایە دەرپەڕین!))

ریش سپیە نابیناکە دڵی پێ سووتان، هاوارای کرد ((ڕۆڵەکانی من ئازابن، شتی وەحشەتناك دەبیستم، بەڵام مەترسن، دەبینین کە چۆن هەموو شتێ جارێکی دی ڕووبەڕوو دەبێ، دونیا سەنگینو توندوتۆڵە، بناغەییێکی چاکی هەیە تا خودا خودایی خۆی دەکات ئەویش پێی لە جێی خۆیا دەمێنێتەوە، گوێ لە قسەی ئەوانەی کە دەیانبینن نەگرن، گوێ بدەنە قسەکانی نابینا کە سەرەڕای نابینایی خۆی چاکتر لە ئێوە دەبینێ، نەژادی سراییل جاویدانییە، لەگەڵ خودا ڕێکەوتنی مۆرکردووە، خوداوەند مۆری کردووەو لەگەڵیا تەواوی زەوی بە ئێمە دراوە، لەبەر ئەمە مەترسن، نزیك نیوەشەوە، چاکتر وایە بچینە سەر جێگەی خەوتنەوە گۆچانی خۆی بۆ پێش برد تا دەم دەرگا بۆخۆی بکاتەوە. سێ ریش سپیەکە بەر لە هەموویان ئەوێیان جێهێشت ئەوکاتە پیاوەکانی دیو لەدوای هەمووشیانەوە ژنەکان چونەوەو ماڵەکەیان خاڵی کرد.

دوو خوشکەکە جێی خەوتنی میوانانیان بەسەر سەکۆی دارینەوە دانا، مێرێ چووە سەر سندوقچەی خۆیەوەو، کلافەکانی ئاوریشمیو کەتانی خۆی هێنایە دەرەوە کە بۆ شەوی بوکێنی خۆی ئامادەی کردبوو مارتاش لێفی ئەتلەسی خۆی هێنا کە چەندین ساڵ بوو بەدەست لێنەدراوی لە جێی خۆیدا مابۆوە بەو ئومێدەی کە زەمانێ بێ بەسەرخۆیو هاوسەرەکەی دابدات، هەروەها بڕێ ڕێحانو نەعناع ی لەناو سەرینی کریستدا دانا. مارتا ئاخێکی هەڵکیشاو گوتی (( ئەو ئەمشەو وەکو زاوا دەخەوێ)). مێریێش ئاخێکی هەڵکێشاو بەڵام هیچی نەگوت، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((خودایە، گوێ ڕاگرە، سەرەڕای ئاخەکانی من دونیا هەرباشە، بەڵێ، بەڵام من لە تەنهایی دەترسم ئەو میوانەم زیاد لە ئەندازە خۆشدەوێ)).

خوشکەکان چونە ژووری بچووکی ناوەوە، بەسەر حەسیرە رەقەکانەوە راکشان، دوو پیاو بەسەر سەکۆی دارینەوە راکشا بوون، یەکێکان روو لە سەرەوەو ئەویتر روو لە خوارەوە، پێیەکانیان وێك دەکەوتن، ئیلیازر خۆشحاڵ بوو، وای کە چ هەوایێکی پیرۆزو جوان کەوتبووە سەر تەواوی ماڵەکە! بە ئارامیو قووڵ هەناسەی هەڵدەکێشا، بن پێی خۆی بە ئارامی لەبن پێی پیرۆزی خۆی فشاردەداو هێزێکی مەرموز، یەقینیو خودایی هەست پێدەکردو کە هەڵدەستایەوە لە تەواوی جەستەیدا دەسوورایەوە، گورچیلەکانی ئیدی ئازاری ئەویان نەدەدا، دڵی کەوتبووە گەرموگوڕیەوە، رەزامەندییێك لەسەرتاپای ئەوا لە تاودان بوو لەشی لەڕولاوازو زەردڕەنگی ئەوی ئاو دەدا، لەبەرخۆ دەیگوت ((ئاوەمۆری حەقیقی هەر ئەوەیە، منو خۆشکەکانمو ئەو ماڵە هەموومان ئاومۆرکراین، ڕوباری ئوردن هاتۆتە ماڵەکەی ئێمە)) وەلێ هەیهات کە هەردوو خوشکەکە نەیانتوانی چاو لەسەریەك دانێن، چەندین ساڵ بوو کە پیاوێکی غەریبە لە ماڵی ئەواندا نەخەوتبوو، میوانەکان هەمیشە لەماڵی یەکێ لە ڕیش سپیەکان دەحەوانەوە، هیچ کاتێ پێیان نەدەنایە کولیەی بچووكو دووری ئەوانەوە، زێدە لەوەش برای بیماریشیان، هەوایێکی خۆشی نەبوو، بەلاّم ئەمشەو وای کە شەوێکی لەزەتبەخشی چاوەڕوان نەکراوە! بەلووتی لەرزیوی خۆی بۆنی هەوای دەکرد، هەوا چەند گۆڕا بوو، چەند عەتراوی بوو، بەلاّم عەتری نەعناعو ڕێحان نا، بەڵکو عەتری پیاوێ.

– دەڵێت کە خودا ئەوی رەوانە کردووە تا کەشتی دروستکات، وادەی داوە کە جێگەی ئێمەش لەو کەشتیە بکاتەوە، مێرێ گوێت لێیە یا خەوتووی؟

مێرێ وەلاّمی دایەوە: ((نەخەوتووم)) مەمکەکانی لەناو دەستی خۆیا گرتبوو، چونکە ئازاریاندەدا، مارتا پێداچوو گوتی ((خودا گیان لێگەڕێ زووتر دونیا بگاتە ئاخیری، تا بتوانین لەگەڵ ئەودا بچینە ناو کەشتی، من خزمەتگوزاری دەکەم، قەت دڵیشم بەوە نارەنجێ، تۆش مێرێ تا خودا خودایی خۆی بکات دەبیتە هاودەمی ئەو، کەشتی بەسەر ئاوەوە بۆ پێشو پاش دەچیّو منیش جاویدانە خزمەتی ئەو دەکەم، تۆش بۆ هەمیشە لەبەرپێی ئەودا دادەنیشیو دەبیتە هاودەمی، لە خەیاڵی مندا بەهەشت



ئاوایە، تۆش واخەیاڵ دەکەیتەوە مێرێ؟)) مێرێ وەلاّمی دایەوە ((بەڵێ)) و چاوەکانی داخست

ئەوان قسەیان دەکردو ئاخیان هەڵدەکێشا، لەهەمان کاتدا، کریست لەناو جێگادا دانیشتبوو، هەرچەندە هێشتا لەناو خەوێکی قووڵدا بوو، هەستی دەکرد کە ئەسڵەن هەر خەونیە، بەڵکو بەجەستەو گیان لەناو ئاوی ئوردندا بەشادی وەستاوە، زیخو لیمی بیابان لە جەستەیو خێرو شەڕی مرۆیی لە ڕۆحیدا لە دەروونی رووباردا پاك دەبوونەوەو تازەیی جێی دەگرتنەوە، لە پڕێکا لەخەودا وای هاتە بەرچاو کە لە ڕووباری ئوردندا هاتۆتە دەرەوەو شەقامێکی سەوزی گرتۆتە بەر کە پێی هیچ کەسێکی پێ نەکەوتووە. دەچێتە ناو باخێ کە پڕ لە شکۆفەو میوەیە، وا دیاری دەدا کە ئیدی ئەو خۆی نیە: کریستی کوڕی مێرێی ناصیرەیی، بەڵکو ئادەمە یەکەمین مرۆڤی خەڵقکراو، دروست لە هەمان ساتدا، دەستی خودا ئەوی دروست کردووە، چونکە جەستەی هێشتا قوڕی تەڕبوو، بەسەر گیاو گوڵ پڕژێندا راکشا تا لەژێر نووری هەتاودا وشك بێتەوە، ئێسقانەکانی بەیەك پەیوەست بنو رەنگی بێتە بەر رووخسارو هەفتاو دوو بەندی بەدەنی توندوتۆڵ بن، تا بتوانێ بەسەر پێوە بوەستێو بەڕێدا بڕوات، لەهەمان کاتدا لەژێر نووری خۆرەتاودا راکشابوو مەلەکان بەسەر سەریەوە لە شەققەی باڵیاندەدا، لەدرەختێکەوە بۆ درەختێ دەچوون، بەسەر گیای بەهارێدا نازیان دەکردو لەمیانی خۆیان گفتوگۆیان دەکرد، چەهچەهەیان بوو، سەیری ئەو ئافەریدە تازەیەیان دەکرد کە بەسەر گیاو گوڵەوە راکشاوەو بەهەشتاوی بەسەریاندەکردەوە، هەریەکەیان قسەی خۆی دەکردو بەردەوامی بەکاری خۆیدەدا، ئەویش کە بەڕازی زمانی ئەوان کەوتبوو، بەبیستنی گفتوگۆی ئەوان لەززەتی وەردەگرت.

تاوس کە پەڕی خۆی بەغرووڕەوە چەتر کردبوو، بۆ سەرەوەو خوارەوە نازو عیشوەی دەکرد، نیگای ئەفسونگەری دەکردە ئەو ئادەمەی کە بەسەر گیاوە راکشاوەو ئەندازەی دەکردو دەڵێت ((من مەلێ بووم بەلاّم فریشتەییێکم خۆش دەویست هیچ مەلێکی دیکە لەمن قەشەنگتر هەیە؟ هەڵبەتە کە نا، قومری لەدرەختێکەوە بۆ درەختێکی دی هەڵدەبەزیەوە، گەرووی بۆ ئاسمان بەرز دەکردەوەو بانگی دەدا

((ئەشق، ئەشق، ئەشق)) سۆفیلکەکان دەڵێن ((لەمیانی تەواوی مەلەکان تەنها من گۆرانی دەچڕم لەناو گەورەترین دلۆپی شەونمدا بەگەرمی دەمێنمەوە))

پەرەسێلکە دەڵێت ((ئەگەر بەخاتری من نەبوا، هیچ کاتێ درەختەکان شکۆفەیان نەدەدا)).

کەلەشێر دەڵێت ((ئەگەر بەخاتری من نەبوا سپێدە هەرگیز گزنگی نەدەدا)). هەوێردە دەڵێ ((بەیانیان کە بەئاسماندا دەفڕم تا نەغمە سەربدەم خۆمو منداڵەکانم مالاَوایی لێك دەکەین، چونکە نازانم کە ئایا لەو نەغمەچڕینە دووبارە زیندوو دەبمەوە یا نا؟))

بولبول دەڵێت (( حاڵو رۆژی ئێستاکێم مەبینە کە جلی هەژارەکانم لەبەرە، منیش باڵی گەورەو درەوشاوەم هەبوو، بەلاّم هەموویانم کردە نەغمەوە)).

کلك تەقێنە دەنووك درێژەکان دێن خۆیان بەشانی یەکەمین مرۆڤی ئافەریدەبوو هەڵدەواسنو سەریان لەبن گوێی دەنێنو بە ئارامی لەگەڵیا قسە دەکەن، وەك بڵێی نهێنییێکی گەورە دەخەنە میانەوە (( دەرگاکانی بەهەشتو دۆزەخ لەتەك یەکترنو هەردووکیان یەکسانن، سەوزو جوان، ئەی ئادەم ئاگاداربە، ئاگاداربە!))

دروست لەم کاتەدا لەکاتی سەحەر بەنەغمەی سۆفیلکەکان زەینی کریست بێدار بۆوە.





## بەشی نۆزدەهەم

لەو کاتەی کە خودا پەیوەست دەبێ بە مرۆڤ، رووداوی گەورە روودەدا، بەبێ مرۆڤ، خوداوەند هیچ زەینێکی بەسەر ئەم زەویەوە نەدەبوو تا بەشێوەییێکی ماقوڵ خوڵقاوەکانی خۆی ئەندێشە بکات، بەترسناکیو لەهەمان کات جەسوورانە هەموو توانایێکی ئەو ئەزمون بکات، هیچ دڵێکی لەسەر زەمین نەدەبوو تا بۆ نیگەرانی ئەوان میهرەبانی بنوێنێ، لەهەمان کاتدا لە هەوڵی لەدایك بوون چاکەو پەیوەندییێ کە خودا ئارەزووی لێنەبوو یا فەرامۆشی کردبوو یا دەترسا، تا ئەوان بخاتە بەرقەڵەمی خوڵقاندن، رۆحی خۆی خستە ناو جەستەی ئادەمەوە قودرەتو جەسارەتی پێدا تا خوڵقاوەکانی خۆی بەردەوام بن، بەلاّم مرۆڤ بەبێ خودا چونکە بێ چەك لەدایك دەبێ لە برسیەتیو ترسو سەرما فەنا دەبوو، ئەگەر لە دەستی ئەواندا گیانی بەسەلامەتی دەربهێنێ وەك سەدەف لە شوێنێ لەمیانی شێرو پێشکەدا قەراری دەگرت، لە کاتێکا بە هەوڵو تەقەلاّی بێ وەستان بۆ ئەوەی بەرز بنیشێ بەسەر پاژنەی پێیەکانیدا هیچ کاتێ توانای نییە تا لە باوەشی تەنگو گەرمی میهرەبانی دایکی پیرۆزمەندانە رابکات، کریست بە ئەندێشە کردنەوە سەبارەت بەو بابەتانەی قوڵتر لە هەمیشەو زیاتر لە جاران هەستی دەکرد کە خوداو مرۆڤ دەتوانن ببنەیەك.

سپێدە زوو کریست رەهسپاری ئورشەلیم بوو، خودا لەلای راستو چەپی ئەوبوو، بە بازووەکانی دەیتوانی دەست لە خودا بدات، ئەوان هاوسەفەر بوونو نیگەرانی

هەردووکیان یەکسان بوو، دونیا گومڕابووە، لە جیاتی ڕۆیشتن بۆ بەهەشت بەرەو دۆزەخ دەچووە خوارەوە، هەردووکیان لەگەڵ یەك (خوداو فەرزەندەی خودا) دەبوایە هەوڵبدەن دونیا بخەنە سەر ڕێگەی ڕاستەوە، لەبەرئەوە بوو کە کریست وا پەلەبوو، بەهەنگاوی درێژ شەقامی تەی دەکرد، خولیای دیداری هاوسەفەرەکانی بوو، تابتوانێ بەکۆمەکی ئەوان دەست بەنەبەردی بکات، خۆرەتاو لە دەریاچەی مردوودا بەدەرکەوت، مەلەکان بەنەغمەسەرایی لە ژێر تیغەی نوورو گەڵای لەریوەی درەختەکانو شەقامی سپی کە تا دیوارەکانی ئورشەلیم هەڵدەخزیو ئەوی بەدوای خۆیا پەلکێش دەکرد، هەر هەمووی بۆ ئەو بانگیان سەردەدا: پەلەکە.. پەلەکە وا نابود دەبین.

کریست وەڵامی دەدایەوە ((دەزانم... دەزانم.. دەزانم واخەریکە دێم))

لەهەمان سپێدەدا دروست دوای دەرکەوتنی سەحەر بەپەلە بەکەناری کوچەو کۆڵانە جێهێڵراوەکانی ئورشەلیمدا ڕەتدەبوون، هەموو لەگەڵ یەك نەدەبزاوتن، بەڵکو دوو دوو دەڕۆیشتن، یاکوبو یۆحەنناو ئاندریاسو پەترۆس بەیەکەوەو یەهودا بەتەنها بەڕێکەوتبوو، ئەوان بەترسو لەرزەوە رایاندەکرد، بەگۆشەی چاو سەیریان دەکرد تا دڵنیا بن لەلایەن کەسێکەوە تاقیب ناکرێن، دەروازەی قەڵای داود بەرەو روویان بوو، سەری بەرز کردبۆوە، یەکەمین کۆڵانی دەستە راستیان گرتو بەدزییەکەوە چونە ناو مەیخانەی سیمۆنی قەیرەوانی. مەیخانەچی قەڵەوو چوارشانە، هێشتا نیوە خەواڵو بوو، تازە لەناو بالینگانی کاوە هەڵسابوو، چاوەکانو لووتی سوور هەڵگەڕابوو، چونکە بەدرێژایی شەو دەگەڵ پیرە عادەتیەکەی بە رابواردنو گۆرانیو هەرزەگۆیی شەو زۆر درەنگ چوو بووە ناو جێگاوە.

ئێستا بێ حاڵو عەبووسانە خوانی لە بەرماوەی جەژن پاك دەکردەوە هەرچەند کە بەسەر پێیەکانیەوە وەستابوو، بەڵام هێشتا بێدار نەبووبۆوە، خەریکی کاربوو، وابەدیار دەکەوت کە لە خەودا دەستی کردبوو بەپاك کردنەوە. بەڵام لە کاتێکا کە لەمیانی خەوو بێداریدا خەریکی کار بوو، سەدای هەناسەی توندی چەند کەسێکی بیست دەهاتنە ناو مەیخانەکەوە، گەڕایەوەو چاوەکانی هێشتا هەڵمساوە دەمی تاڵ بوو،



سەرو ڕیشی پڕبوو لە توێکڵی تۆ کودی. گەڕایەوە، گوتی ((کێیە؟ سوپاس بۆ موسیبەتتان، لێمگەڕێن، بەو سپێدەوە هاتوون کە بخۆنو بنۆشن.. ها؟ من کە حاڵی ئەوەم نییە، یاڵلاّ لە خۆتان هەڵدەن!))، بەڵام کەم کەم لەسەدای هاواری خۆیدا بێداربۆوە، هێدی هێدی دۆستی کۆنینەی پەترۆسو جەلیلیەکانی تر هاتنە پێشەوە، بە دیقەت بەسەری کردنەوەو تێیان راماو دایە قاقای پێکەنین: بەه..بەه چاوم روون، جەلیلیە ئازادەکان، مەگەر ئێوە غروورتان نییە؟))

پەترۆس بە دانانی دەستی خۆی بەسەر دەمی سیمۆنەوە وەڵامی دایەوە ((بۆ خاتری خوا سیمۆن با هاوارت دونیا نەخاتە ناو ئاشوبەوە، دەرگا داخە، پاشا یەحیای پاکشۆری کوشتووە، هێشتا لەوە نەگەیشتووی؟ سەری بڕیو داینایە ناو تەشتەوە)).

- کارێکی باشی لێکردووە، پاکشۆر بە مەسەلەی براژنەکەی، مێشکی خوارد بە ئێمە چی! ئەو پاشایە لێگەڕێ هەر کارێ کە دڵی دەخوازێ با بیکات، بە ئێمە چی! پاشانیش بەینی خۆمان بێ، بەهاتو هاواری (تۆبە بکەن تۆبە بکەن) خۆشی مێشکی ئێمەی خوارد، تەحا، من دەمەوێ بەحاڵی خۆم بم)).

- وەلێ ئێمە بیستوومانە کە ئەو دەیەوێت، تەواوی ئاوەمۆرکراوەکان بخاتە بەر دەمی تیغەوە، ئێمەش ئاوەمۆرکراوین تێناگەی؟

- کێ بە ئێوەی کەڵلەپوکی گوتووە خۆتان ئاوەمۆر کەن؟ باشە هەقتانە! پەترۆس بە تانەوە گوتی (( هەی کوندەی شەراب تۆش ئاوەمۆرکراوی مەگەر خۆت بە ئێمەت نەگوتوە، ئێستا بۆچی بەسەر سەری ئێمەوە هاوار دەکەی؟))

- ماسی فرۆشی سنگ دەرپەڕێنماڵی من جیاواز بوو، من ئاوەمۆر نەکراوم، ناو لەوە دەنێی ئاوەمۆر، من بە هەمان جۆر بدە بەرێ چوومە ناو ئاو هەرچیەك ئەو پەیامبەرە قولابیە دەیگوت، بەم گوێیەم دادەهاتو لەوی دیکەی ترم دەچووە دەرەوە، هەرکەسێ یەك زەڕڕە ئەقڵی لەناو کەڵلە دابێ، دەبێ هەمان ئەوە بکات، بەڵام چی بە ئێوە، ئێوەی کەڵلەپوك بڵێم، ئەو لاقرتانە بە ئێوە دەڵێن کە دەتوانن لە تەگەبزنیش شیر بدۆشن، ئێوە یەکەمین کەسانێکن کە باوەڕ دەکەن، فەرمان بە ئێوە دەدەن کە

خۆتان فڕێدەنە ناو ئاوەوە، ئێوەش — بێ چەندوچون دەچنە ناویەوەو دەردی بێ دەرمانی سیل دەگرن، بەئێوە دەڵێن رۆژی شەممە، ئەسپێی لەشتان دەرمەهێنن، سەرانە مەدەن، باشە ئێوەش نایدەنو سەرتان بەبا دەدەن، هەقتانە، ئێستا وەرن دانیشن، با قومێ شەراب فڕکەین بۆ ئێوەش هەر پێویستە، ئێوە بۆ ئەوەی هێزتان بێتەوە بەرو منیش تا بێدار ببمەوە دوو جەلیکانی قەبەی شەراب لە سندوقخانەی مەیخانە رەشدەچونەوە، بەسەر یەکێ لەو جەلیکانە کەلەشێرێکی قورمزیو بەسەر ئەویترەوە بەرازێکی خۆڵەمێشی نەخشێنرا بوو، سیمۆن قەرابەیێکی لە جلیکانی کەلەشێرنیشان پڕکرد، شەش دانە پیاڵەی هەڵگرتو بۆ ئەوەی پاکی بکاتەوە لەتەشتی ئاوی پۆخڵی بردە خوارەوە، کە بۆنی شەراب لە لووتیدا بێداربۆوە.

نابینایێ لە مەیخانەدا بەدیارکەوت، بەدانانی گۆچانێ لەمیانی پێیەکاتی دەستی کرد بە ژەنینی سێتارو ئاهەنگی کونینەوە کە ناوی — ئیلیاکم- بوو لە جحێڵیدا وشترانی دەکرد، بەلاّم رۆژێکیان نیوەرۆ کە لە بیابان گەڕابۆوە، لە ژێر درەختەوە ئافرەتێ لەناو چاڵە ئاوێ دەبینێ کە خەریکی خۆشوشتنە لە جیاتی ئەوەی رووی وەرسووڕێنێ، چوار چاو دەکەوێتە سەیرکردنی ژنە جوانەکەوە، لەبەختبەدی ئەوەوە مێردی ژنە بیابانشینەکە لە پشت بەردێکەوە دانیشتووەو بۆ چێشتلێنان خەریکی ئاگرکردنەوە بوو، کە دەبینی ئەو وشترەوانە لە ژنەکەی نزیك دەبێتەوەو ئەندامی رووتی ئەو بەنیگاکانی دەخوا بەدوو کەلّبە رەژووی داگیرساوەوە بۆ لای ئەو هێرشی کرد تا لە چاوەکانیدا خامۆشیان بکات، لەو رۆژەوە بەدوا- ئیلیاکیم- ی نگون بەخت خۆی دەخاتە باوەشی سروودو گۆرانی، سێتاری خۆی هەڵدەگرێو بەرێدا دەرواو دەچێتە مەیخانەکانو ماڵەکانی سراییل، جارێ سروودی میهرەبانی خودا سەردەداو زەمانێکیش سەبارەت بەوەسف کردنی رووتی ژنەکەوە گۆرانی دەڵێت، پارچە نانێکی وشك مشتێ خورما دوو دانە زەیتون بە دەست دەهێنێ، ئێستا سێتاری خۆی خۆش دەکاو سینەی ساف دەکاو دەنگی بەرز دەکاتەوەو دەکەوێتەوە ئەو سروودەی کە جێ پەیوەندی ئەوە: بەمیهرەبانی فراوانی خۆت خودایە .. میهرم پێ ببەخشە، بە بەخشندیی گەورەی خۆت سەبارەت بە شەرارەتی من قەڵەمێکی پیابکێشە.



لەهەمان ساتدا مەیخانەچی بەقەرابەو پیاڵەی شەرابەوە دەرکەوت بەبیستنی سروود وەکو بۆمبێ تەقیەوە: ((باشە باشە! تۆش یەکێ لەوانەی کەمێشکم دەخۆی، هەمیشە

خوداش بە ئاهەنگ ((میهرم پێ ببخشە، میهرم پێ ببخشە)) یاڵلاّ لەخۆت هەڵدە، ئاخر مەگەر من بووم گوناهم کرد؟ من بووم سەرم بەرز کردەوە تا سەیری ئەو ژنە نامەحرەمە بکەم؟ خودا بۆ ئەوە چاوی بە ئێمە بەخشیوە کە دایانخەین؟ لەوەناگەی؟ باشە هەقتە، ئێستا بارتان هەڵگرنو بڕۆن مێشکی یەکتر بخۆن)).

نابینایێك گۆچانەکەی لەمیانی پێیەکانی خۆی دەرهێنا، سێتاری لەژێر هەنگڵی نا بێ ئەوەی شتێ بڵێ رۆیشت. مەیخانەچی بەتووڕەیی ئەدای نابینای دەردەهێناو دەیگوت ((خودایە رەحمان پێ بکە))و گوتی ((داود سەیری ژنی خەڵكان دەكات، ئەو گەمژە بێ چاوەش هەمان کاری کردووە- ئەوکاتە دەبێ ئێمە عەزابی ئەو بکێشین.. خودایە من دەمەوێ بەحاڵی خۆم بم)). عاقیبەت پیاڵەیان پڕکردو نۆشیان، پیاڵەی خۆی دووبارە پڕکردەوەو هەڵیدا.

– ئێستا بە یارمەتی ئێوە من دەڕۆم، کەللەسەری بەرخێکتان بۆ بخەمە تەنوور، دایك ئەوە لە دەمی بەچکەی خۆی دەفڕێنی. بەپەلە چووە حەوشەکەوە، تەنوورێکی بچووکی لێبوو، کە خۆی تەنها دروستی کردبوو، بڕێ لقو گەڵای مێوی هەڵڕشتە تەنوورو رۆشنی کردەوە، کەللەبەرخێکی نایە ناو مەنجەڵو داینایەوە تەنوورو بەرەو لای هاوەڵەکانی گەڕایەوە، دڵی شوری شەرابو سوحبەت بوو، بەلاّم هاوسەفەرەکانی دڵو دەماغیان نەبوو، لەکەنار ئاگردا هەڵکورمابوون، بەبێ حەوسەڵەیی چەند وشەیێکیان دەهێنایە سەر زمانو دووبارە خامۆش دەبوونەوە، وەك بڵێی بەسەر رەژووی داگیرساودا دەۆیشتن، چاویان بڕیبووە دەرگاوەو نیگەران بووبوون، یەهودا لە جێوە هەڵسایەوە، چوو لە دەروازەی دەرگادا وەستا، لەتەمەشا کردنی ئەو ترسنۆکانە کە لە ترسان نەدەحەوانەوە، دەهری بوو بوو، سەیرکە چۆن چۆنی رایانکردبوو بەچ شێوەیەك خۆیان لە ئوردنەوە گیاندبووە ئورشەلیم، سەیرکە لە حاڵێکا کە خوێنیان لە دڵدا نەمابوو، خۆیان لەم مەیخانە دوردەستەوە شاردەوە، ئێستا وەکو کەروێشك گۆێیان قولاّغ کردووە، دەلەرزنو بەسەر پەنجەی پێیانەوە وەستاونو ئامادەی راکردنن،

هەی سەگ بتانخوات، خودای سراییل من سوپاسی تۆ دەکەم کە منت ووەکو ئەوان دروست نەکروە، من لە دایك بووی بیابانم، لەبەردی خارای دەشت، نەخاکی نەرمو تەڕی جەلیل، سروشتە بوویمە، هەریەك لە ئێوە مەرایی بۆ ئەو دەکات، بە سوێندو ماچ شۆڕشتان بەرپاکردبوو، کەچی ئێستا دەتانەوێ خۆتان نەجات بدەن، بەلاّم منی وەحشیو هەرماسکوژ ئەو جێ ناهێڵم، لە هەمان جێدا دەمێنمەوە تا ئەو لە بیابانی ئوردن بگەڕێتەوە تا بزانم چ قسەییێکی هەیە بۆ گوتن، ئەوکاتە بڕیاری خۆم دەدەم، من بۆخۆم تەققەی سەرم دێ تەنها شتێ عەزابم دەدات ئەویش ئازاری سراییلە.

لەناو مەیخانەدا دەنگێکی کزی دەمەقاڵێ بیست گەڕایەوە. پەترۆس دەیگوت ((من دەڵێم کە دەبێ بچمە جەلیلەوە، لەوێ ئارامی بەرقەرارە، کوڕینە دەریاچەی خۆمان لەبیر نەکەین)).

بەم قسەیەوە ئاخێکی هەڵکێشا، قایغی سەوزی خۆی دەبینی کەبەسەر شەپۆلی شینەوە بۆ پێش دەچوو، دڵی توندبوو، تاوێرە بەردو ژاڵەی دەبینیو تۆڕی پڕ لە ماسی دەبینی، فرمێسك هاتە چاوەکانی ((یالّلاّ کوڕینە با بڕۆین)).

ئاندریاس بەپەلپ گرتنەوە گوتی ((نە....نەچۆن دەتوانین ئەو لەم شارە وەحشیە بەرەللاّ کەین؟ هەرلێرە چاوەڕوانی ڕوودانی دەبین، یاکوب گوتی ((ئێمە قەولی مەردانەمان بەو داوە لەو مەیخانەدا لە چاوەڕانی ئەودا دەمێنینەوە، دەبێ وەفامان هەبێ بۆ قەوڵی خۆمان)) پەترۆس هاتەبەرو گوتی (( دەتوانین مەسەلەکە ڕێکخەین، ئەم سیمۆنی قەیراوینە حاڵی دەکەین کە ئەگەر ئەو هات پێی بڵێت. ئاندریاس بەپەلپ گرتنەوە گوتی ((نە... نە، چۆن دەتوانین ئەو لەم شارە وەحشیە بەرەلاّ کەین... هەرلێرە لە چاوەڕوانیدا دەمێنینەوە.

پەترۆس بەسەرسەختی دووبارە گوتی ((من دەڵێم دەبێ بگەڕێینەوە جەلیل)). یۆحەننا دەستەو دامێنی ئەوان بوو بەپاڕانەوە گوتی ((برایان دوا وشەکانی پاکشۆر وەبیر خۆتان بهێننەوە، لە ژێر شمشێری جەللاد بازووەکانی خۆی بەرزکردەوەو هاواری کرد ((کریستی ناصیرەیی بیابان ڕەهاکە من کۆچ دەکەم بەرەو مرۆڤ بگەڕێوە، وەرە... دونیا بەتەنها جێ مەهێڵە،)) دۆستان ئەم وشانە بایەخێکی قوڵیان هەیە،



خوداوەند ئێمە ئەبەخشێ ئەگەر کفرێ بخەینە سەر زمانەوە)) وەلێ دڵی وەستا ئاندریاس دەستی ئەوی توند گوت (یۆحەننا قسە بکە دڵت گەواهی چ ڕازێکی وەحشەتناك گەواهی دەدا کە جورئەتی ئاشکرا کردنیت نییە؟

– وەلێ ئەگەر ئوستادی ئێمە... بێ..

– چی بێ؟

دەنگی یۆحەننا نەرمو لەرزیوو تژی وەحشەت بوو (کریستیانو!) لەرزە بەسەر جەستەی ئەواندا زاڵبوو.. کریستیانو! ئەوان ماوەییێکی دوورو درێژ لەگەڵ ئەودا بوون، بەلاّم وەك بڵێی قەت ختورەی نەکرد بووە زەینیان، سەرەتا ئەویان بەنیشانەی پیاوچاکێ گرتبوو، وەك پیرۆزێ کە ئەشقی بۆ دونیا دەهێنا! ئێستا ئەویان بە ناونیشانی پەیامبەری گرتووە نەك وەکو پەیامبەرانی پێشوو وەحشی، بەڵکو شادو شەنگوڵو ئەهلی بوو، ئەو مەلەکوتی ئاسمانی بۆ زەوی دەهێنا، بۆ بیانوێکی دی، ئەو عەدالەتو شێوە ژیانێکی ڕازسازی دەهێنا، ئەو ئابا ئەژدادی سراییل بە (باوك) بانگ دەکرد.

هێندەی نەبرد کە یەهوەی زبرو سەرسەخت نەرم دەبوو هەموو دەبوونە فەرزەندەی ئەو... بەلاّم ئێستا ئەوە چ قسەیێ بوو کە لە دەمی یۆحەننا دەردەپەڕینە دەرەوە: کریستیانو بە گوزارشتێکی دیکە، یانی شمشێری داود، مالیکی ڕەققابی سراییل، جەنگ! ئەوان، واتە حەواریەکان، یەکەمین موریدەکان، ئەربابە گەورەکان، حاکمو مەشایخی لە دەوروبەری تەختی شاهی ئەو کۆدەبوونەوە، وەك چۆن خوداوەند فریشتەو مەلایەکی نزیکی خۆی هەیە هەرواش حەواریونو سەرۆکی هێزەکانو مەشایخی سەر زەمین، چاوەکانیان درەوشانەوە، پەترۆس کە رووخساری وەك گوڵ لێ هاتبوو بەدەریخست ((کوڕینە من قسەکانی خۆم دەکێشمەوەو هیچکاتێ ئەو جێناهێڵم)).

– ١منیش

– منیش

– منیش

یەهودا بەتووڕەییەوە تفی روکردە سەر زەوی بەمشت لە دەرگای کوتی بەسەریانا هاواری کرد: ((هەی نەفرەتینە، مادام کە خەیاڵتان دەکرد کە ئەو بێ توانا و رەنجورە، دەتانویست تێتەقێنن، کەچی ئێستا کە بۆنی گەورەییتان بەر لووت کەوتووە دەڵێن ((من هیچکاتێ ئەو جێ ناهێڵم)) ئەوەتان لەلای من پێبێ کە رۆژی تاك تاکی ئێوە ئەو بەتەنها جێ دەهێڵێ، تەنها منم کە ناپاکی لەو ناکەم، سیمۆنی قەیرەوانی تۆ شایەدم بە)).

مەیخانەچی گوێی خۆی سپاردبووە ئەوانەوە، لەژێر سمێڵەوە بەوان پێدەکەنی، نیگای لەگەڵ نیگای یەهودا یەکیان گرتەوە.

– توخوا سەیریان کە ئەوانە دەیانەوێ دونیا رزگار بکەن بەلاّم بۆنێ لەتەنوورەوە کەوتە بەرلووتی، هاواری کرد ((وا کەللە دەسووتێ)) بە بازێ خۆی گەیاندە حەوشەکەوە.

هاوسەفەرەکان بە سەرسامی سەیری یەکتریان دەکرد پەترۆس لە حالێکدا دەستی بەنێو چاوانی دادەهێنا گوتی ((کەواتە بۆ ئەوە بوو کە پاکشۆر بەدیتنی لەجێوە بزمارکوت بێ)).

کە دەستیان پێکرد لووتیان پڕ بابوو.

– بەڕاستی کاتێ کە ئاوەمۆری دەکرد ئەو کۆترەی لەبەرزایی سەریەوە بینی؟

– کۆتر نەبوو، تیشکی هەورە تریشقە بوو.

– نا......نا کۆتر بوو خەریکی گمەگم بوو

– گمەگمی بوو، خەریك بوو قسەی دەکرد، بەگوێی خۆم بیستم کە دەتگوت ((پیرۆز، پیرۆز، پیرۆز)) پەترۆس کە چاوەکانی پڕ بوو بوو لە باڵی زێڕین گوتی ((ڕۆحی قودس بوو، رۆحی قودس کە لە ئاسمان هاتە خوارەوەو هەموویان بوون بە بەرد، مەگەر وەبیرتان نایەتەوە؟ دەمویست پێ هەڵگرم نزیکتر بچم، بەلاّم پێیەکانی بێهەست بوون دەمویست هاوار بکەم بەلاّم لێوەکانم لێك نەدەبوونەوە، بایەکان ئارامیان گرتبوو، قامیشەلانەکان، خەڵکان، مەلان، هەریەك لەوان لەترسان هێدمەیان گرتبوو، دەستەکانی پاکشۆر تەنها شتێ بوو کە لە جولەدا بوون، ئارام ئاوەمۆری دەکرد)).



– یەهودا بەتووڕەییەوە گوتی ((من نەهیچم بینیو نەهیچم بیست، چاوەکانو گوێیکانی ئێوە مەست بوون)) پەترۆس بە لۆمەکردنەوە پێی گوت ((ڕدێن سوور تۆ نەتدی چونکە نەتویست ببینی)).

– وە حەزرەتی تۆ، ئاغای ریش سوور دیتت چۆن ویستت ببینی، هەوەسی دیتنی رۆحی قودست کردبوو، ئەوە رۆحی قودس بوو کە بینیت، لە کوێ دیتت؟ ئێستا دەتەوێ ئەو میشك سووکانەش ناچار کەیت کە ئەوانیش ببینن، دەبێ ئەنجامەکەشی بخەیتە گەردەنی خۆتەوە؟))

یاکوب لە تەواوی ئەو ماوەیەدا نینۆکەکانی دەقرتاندو بێ ئەوەی قسەیێ بکات گوێی دەگرت، ئێستێ ئیدی کاسەی سەبری پڕ بوو گوتی ((کوڕینە سەبر بکەن وەکو باروت مەتەقنەوە، وەرن تا بە شێوەییێکی ماقولانە سەبارەت بەم بابەتە قسە بکەین، ئیدی بەڕاستی وابیردەکەنەوە کە پاکشۆر بەر لەوەی کە سەری لەلەشی جیابێتەوە ئەم وشانەی گوت: زۆر دوور دێتە بەرچاوم، یەکەمینی هەمووان کێ لە ئێمە لەوێ بووین تا ببیستین؟ پاشان گریمان ئەو وشانە هیچ کاتێ نابێ کە بە بەرزی ئەدای بکات، لەبەر ئەوە دەیزانی کە دەگاتە گوێی پاشا بۆیە سیخوڕی دەنارد تا سەردەرکا لە کاری ئەو مرۆڤە (کریستی کوڕی مێرێ). ئەویان دەگرتو دەگەیشتنە خزمەتی ئەویشەوە، بەقسەی باوکم دوو دووتا چوارتا لەبەر ئەمە باشتر وایە مۆڵەت نەدەین ئەوەندە کەللەمان پڕ با بکات)).

بەلاّم پەترۆس تووڕە بوو (بە باوەڕی من دوو دووتا چواردەتا، لێگەڕێ مەنتیقو مێشکی ئێمە هەر هەڵەیێ دڵیان دەخوازێ بکەن، ئاندریاس شتێکمان پێبدە بیخۆین، زەینمان غەرق دەکەین تا دیدگاکانمان رۆشن بکەین))

پیاوە درێژو لەڕولاواز ئەندامەکە بە گۆنای کەوتوو پێی پەتییەوە کە پارچەیێکی سپی لە دەوری کەمەری بەستابوو تەڵسمێکیشی بەگەردەنیەوە هەڵواسیبوو، بەپەلە چووە ناو مەیخانەو دەستی بەنیشانەی سەلام نایە سەر سینەیەوە ((برایان خوداحافیز من بەرەو لای خودا دەچم هیچ کارێکیان نییە بەمنی بسپێرن؟)) بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێ بەپەلە دەرپەڕیە دەرەوەی مەیخانەو چووە مەیخانەیێکی دی.

لەهەمان کاتدا مەیخانەچی بە خۆیو سینییێ خۆراك دەرکەوتو بۆنێکی بەتام فەزای ژووری گرتەخۆ، چاوی کەوت بەدێوانەی لەندەهۆرو هاواری کرد ((سەفەر سەلامەت، سەلاّمی خاڵیسانەی من بگەیەنە)) پاشان بەخەندەوە گوتی (ئەوەش یەکێکی دیکە، بەها! راستە دونیا گەیشتۆتە ئاخیری! ئێرە پڕ لە دێوانە بووە، ئەو یەکەیان دەڵێ دوو شەو بەر لەوکاتەی بۆ ڕێژتنی گولاّو بچێتە دەرەوە خودای دیوە، لەهەمان ئە وساتە بەدوا ئیدی ژیانی کۆت کردووە، هەتا خواردنیش ناخواتو دەڵێت: ((من داوەتی بەهەشت کراوم، لەوێ خۆراك دەخۆم)) ئەو شێتەی کە دەیبینی کفنی لەبەر کردووەو بەپەلە سەر لەهەموو ماڵێ دەدات هەر ئیشێ پێی بسپێری قەبوڵ دەکاتو خوداحافیزی دەکاو دەڕوات.

دەبینی کە مرۆڤ کاتێ لە خودا نزیك دەکەوێتەوە چی ڕوودەدات! کوڕینە بۆ خاتری خۆتان پێتان دەڵێم، حەواستان هەبێ، ئەوەندە لێی نزیك مەکەونەوە، من ستایشی ئەو دەکەم بەلاّم لە دوورەوە)). سینی خۆراکی لە ناوەندی مێز دانا، لێوو چاوو گوێی پێدەکەنی. بانگی کرد ((کەللەیێکی تازەم هەیە، کەللەی یەحیای پاکشۆر! بخۆ نۆشی گیانت بێ))

یۆحەننا دووچاری هێڵنج هاتو پاشەکشەی کرد، ئاندریاس کە دەستی بۆ پێشەوە بردوو لە هەوای ڕاگرت، کەللە بە چاوانی بێ جولە تەواو کرابۆوەو سەیری تەك تەکی ئەوانی دەکرد. پەترۆس هاتە میانو گوتی ((سیمۆنی بەدفیترەت، ئاخیری کارێکی وا دەکەی کە نەتوانین لەڕووی بێزاریەوە دەستی لێ بدەین! ئێستا من چۆن ئەم چاوانە دەربهێنم؟ بۆ وروژاندنی حەز بێ هاوتان، بەلاّم خواردنیان وەك ئەوەیە کە مرۆڤ چاوانی پاکشۆر بخوات)).



مەیخانەچی قاقا کەوتە خەندەوەو گوتی ((پەترۆسی ئازیزم خۆم دەیانخۆم بەلاّم یەکەمجار ئەو زمانە بەتامە دەخۆم کەقەرەبووی بکەمەوە، هاواری کرد ((تۆبە بکەن.. تۆبە بکەن! پایانی دونیا گەیشتووە) بەدبەختانە یەکەم جار خۆی کۆتایی هات.. سەبیلۆکە..!)) چەقۆییێکی هێنایە دەرەوە، زمانی بەرخەکەی بڕی بەیەك لوقمە کۆتایی پێهێنا، پاشان پیاڵەیێکی پڕی یەکسەر هەڵقۆڕاندو ئیدی لەناو قسەکاندا جەلیکانەکانی شەرابی خۆی هەڵدەدا.

– زۆر چاکە کوڕینە فەرامۆشی کەن، بەداخەوەم بۆ ئێوە، باسەکە دەگۆڕم تا کەللەی پاکشۆر لە زەینتان بهێنە دەرەوەو بتوانن کەللە بەرخ بخۆن.. باشە، دەتوانن هەڵێنن کە چ کەسێ ئەو کەلەشێرو بەرازە رازاوەی بەسەر ئەم جەلیکانەوە نەخشاندووە؟ بەمۆڵەتی ئێوە ئەو میوانداره گەورەیەی ئێوە بەدەستەکانی خۆی نەخشاندوە، ئێستا دەزانن هەڵێنن کە بۆ کەڵەشێرو بەراز؟ من سەرم لە ئێوەی جەلیلیە گەمژەڵەکان سووردەمێنێ کە ناتوانن هەڵێنن؟ لەبەر ئەمە دەبێ خۆم ئەم رازە بۆ ئێوە ئاشکرا بکەم، پەرتەوێ لە نوور بهاوێژنە ناو مێشکی بێ نیهایەتی وردی خۆتانەوە، پەترۆس نیگاییێکی کردە کەللەکەوە دەمی پڕ لە ئاو بوو، بەلاّم هێشتا زاتی ئەوەی نەکرد کە بۆ دەرهێنانی چاوی کەللەکە دەستی درێژ بکات، هەمیشە پاکشۆری دەهاتە بەرچاو، چاوەکانی ئەو وەکو چاوەکانی بەرخ دەرپەڕی بوون!

مەیخانەچی بەردەوام بوو لەسەر قسەی خۆی:

– باشە گوێ بگرن وەك چۆن گوتم، رۆشناییێ باوێنە ناو مێشکی بێ دیماهی وردیلەتان، کاتێ خوداوەند لە دروستکردنی دونیا بۆوە (نازانم ئەو کەسە پیرۆزە بۆوا خۆی هاوێشتە ناوئەم دەردەسەریەوە)و دەستی بەقوڕی خۆی شوشت، تەواوی ئەو ئافەریدە تازە لە دایك بووانەی بانگ کردو بە غرووورەوە لێیانی پرسی (( مەلەکان، بلەوەڕەکان، بڵێن بزانم کە ئەم دونیا دروست کراوەی من چۆن دێتە بەرچاوتان؟ هیچ کەمو کوڕییێکی تێدا دەدۆزنەوە؟ بێ درەنگ هەموو دەستیان کرد بە باعەباعو عەرعەرو بۆڕینو میاوەمیاوو چەهچەهەوە گوتیان:

((نەخێر...نەخێر....نەخێر))

خوداوەند گوتی ((ئافەرین بۆ ئێوە! خودای منیش هیچ کەموکوڕیەکی تێدا نادۆزمەوە، بەڕاستی دەستم نەیەشێ، بەلاّم کە شێرو بەراز بەسەری شۆڕەوەبوویان لێویان نەجولاندەوە، سەرنجی خوایان راکێشا، هاواری کرد (( ئاهای بەرازەکان، تۆ جەنابی کەلەشێر ئێوە بۆ شتێ نابێژن؟ لەوانەیە ئەم دونیا دروستکراوەی من تامی خۆش نەبێ لە دەمی ئێوە؟ رەنگە شتێ لەقەلّەم کەوتبێ، بەلاّم ئەوان دیسان هیچیان نەگوت، خەیالّتان جەمکەن هەرماس شتێکی لە گوێی ئەوان خوێندووە: (( بەو بلّێن کە لە راستیدا شتێ لە قەلّەم کەوتۆتە خوارەوە، درەختێکی کورتەبالاّ کە ترێ دەداتو بە کوشینیان نایەنە ناو جەلیکانەکانەوە، دەبێتە شەراب)) خوداوەند بە بەرزکردنەوەی دەستە زەبەللاحەکان هاواری کرد (( ئاهای جانەوەرەکان کەواتە بۆ شتێ نالّێن؟))

ئەو کاتە لە دیماهیدا هەردووکیان، کە هەرماس زاتی پێدابوون، سەری بەرزکردەوە: (( ئەی دروستکەری بەتوانا، چی بەسەر زمانی ئێمەدا دێت؟ دەستخۆش، ئەگەر دونیای تۆ بەتەختەوەکەین قەشەنگە، بەلاّم درەختێکی کورتەبالاّ کەمە کە ترێ بداتو بە کوشینیان لە ناو جلیکانەی دابنێنو بوویێتە شەراب!! خوداوەند بەتووڕەبییەوە گوتی : ((ئاوا؟ ئێستاکێ بە ئێوەی بەدفیترەت نیشان دەدەم کە ئێوە شەرابو مەستیو شەڕو رشانەوەتان لەمن دەوێت؟ باوابێ، قۆلّەکانی هەلّبڕیو قوڕی هەلّگرت دارمێویێکی دروست کردو لەزەویدا بردیە خوارەوەو گوتی (( گوێتان لە نەفرەنیم بێت هەموو ئەوانەی لە خواردنەوەی شەراب زێدەڕۆیی دەکەن، هیوادارم مێشکی کەلەشێرو پۆزی بەرازی پێوە بێت)).

هاوسەفەرەکان کەوتنە خەندەوە، پاکشۆریان لەبیرکردو کەوتنە گیانی کەللەی برژاوەوە بەرخەوە یەهودا بەرلەهەموویان دەستی پێکرد، جوجمومەکەی لەت کرد دەستی پڕکرد لە مێشك، مەیخانەچی کە ئەو تاراجەی بینی تووشی وەحشەت بوو، لەبەرخۆ گوتی (( یەك ئێسقانیش بۆ من ناهیلّن)) هاواری کرد (( دەلّێم کوڕینە خواردنو خواردنەوەی ئێوە لە شوێنی خۆی، بەلاّم یەحیای پاکشۆر خواعافوی کات لەبیرنەکەن، ئاخ بۆ کەللەی هەژاری ئەو!)) لەکاتێکا هەر هەموویان بەشی خۆیان لەناو دەست بوو، تووشی هێدمە بوون، پەترۆس کە چاوەکانی دەجوویو لەحالّی قورت دانی بوو لە گەرویدا



رایگرت، قورت دانی مایەی هێلّنج بوو تف کردنەوەشی مایەی داخ بوو، دەبوایە چی بکات؟ ئەوە یەهودا بوو کە تەقەی سەری دەهات، مەیخانەچی پیالّەی پڕکرد.

– دوعا بکەین کە ناوی ئەو جاویدانە بێتو لەیادمانا پیرۆز بێت، ئەفسوس بۆ ئەو کەللە هەژارو بڕاوەی، بەلاّم کوڕینە بەسەلامەتی ئێوە دەخۆینەوە. پەترۆس لەکاتێکا پێکەکەی قورت دەدات گوتی ((بەسەلامەتی تۆ ئەی پیرەڕێوی)).

مەیخانەچی وەلاّمی دایەوە (( نیگەران مەبە، من یەك زەڕڕە ترسم نییە، من دەست ناخەمە کاری خوداوە بۆ رزگارکردنی دونیاش تەقەی سەرم دێت، پەیوەندی بە منەوە چییە. من خاوەن مەیخانەیێکمو وەکو حەزرەتی عالی فریشتە یا مەلائیکەی موقەڕڕەب نیم، لانی کەم خۆم لەم سەرنویشتە درۆینییەوە نەجات داوە)) بەگوتنی ئەو وشانەوە، هەرچییەك لە کەللەکەدا مابوو هەلّیکێشا پەترۆس دەمی کردەوە، بەلاّم لە پڕێکا هەناسەی بڕی، پیاوێکی نەناسیاو رووخسار وەحشی گەمژەلّ لە ئاستانەی دەرگادا بەدیارکەوت، سەیری ژوورەوەی دەکرد، هاوسەفەرەکان چوونە سوچێکەوە.

پەترۆس خۆی لەپشت شانەپانەکانی یاکوب قایم کرد.

یەهودا کەوتە زەمزەمە ((باراباس!)) لە حالّێکا رووی ترش بووبوو گوتی ((وەرە ژوورەوە))

باراباس گەردەنی قەبەی لار کردبۆوەو لەپەرتەوی رۆشنایی نیوەڕەنگدا حیواریەکانی بینی، رووخساری ناشیرینی ئەو خەندەییێکی تانەئامێزی بەخۆوە گرت ((بەرخەکانی من بەدۆزینەوەی ئێوە خۆشحالّم لە گەڕانو سووران بەدوای ئێوە تا ئەوسەری دونیا چووم)).

مەیخانەچی بەبۆلّەبۆلّەوە پیالّەییێکی بۆ ئەو هێناو بەزێمارەوە گوتی: ((باراباس پالّەوان تەنها تۆمان کەم بوو)) سەبارەت بە باراباس کینەی لە دلّ بوو، چونکە ئەو هەرکاتەی کە دەهاتە مەیخانە مەست دەبوو، توانجی لەسەربازانی رۆمی دەدا کە بەوێدا تێدەپەڕین ئەوە مەیخانەچی بوو کە دەکەوتە دەردەسەریەوە، ((بەرپاکە دووبارە جرِوجەنجالّ بەرپا نەکەی، هەی کەلّەشێری جەنگی))

– گوێ بگرە، مادامەکێ کە دزەکان پێ دەنێنە سەر خاکی سراییل مشتم بەرزدەکەمەوە، لەبەر ئەمە، هەموو بیرۆکەییێکی دیکە لە کەللەت بهێنە دەرەوە، خۆراك بهێنە، هەی خۆبەزلزانی پۆخڵ)). مەیخانەچی سینی خۆراکی بردە پێش ((بخۆ، ددانی سەگت هەیە کە ئێسقان دەشکێنن)) باراباس گلاسەکەی خۆی بەیەك فڕ سەردا، سمێڵی باداو رووی لە هاوسەفەرەکان کرد: ((باشە بەرخەکانم ئەی شوانی نازەنین لە کوێیە. وردە حسابێکم لەگەڵ ئەودا هەیە کە دەبێ پاکی بکەمەوە)). ئاگری لەچاو دەباری.

یەهودا بەتوندی پێی گوت ((تۆ مەشروبت نەخواردۆتەوە مەستی، ئەو دەستە گولانەی پێشتر بە ئاوت داداوە بەسە، دەردەسەریت بۆ ئێمە دروست کردووە)).

یۆحەننا زاتی وەبەرخۆ هێناو پرسی مەگەر چ خراپیەکت لەو دیوە؟ ئەو مرۆڤێکی پیرۆزە کاتێ بەرێدا دەڕوات، سەیری زەوی دەکات تا پێ لەمێرولە نەنێت مەبەستت ئەوەیە کە مێرولە پێ لەو دەنێ، ئەو دەترسێ، پێشی دەڵێن پیاو، یاکوب شەهامەتی ئەم قسەی بینیو گوتی ((ئەو مەجدەلیەی لە چنگی تۆ نەجات داو ئێستاش بەسەر شیری رژاودا دەگری؟))

باراباس کە چاوەکانی تاری بووبوون ((ئەو خیانەتی لەمن کرد بەڵێ فێڵی لەمن کرد، سزاکەی وەردەگرێتەوە)).

بەلاّم یەهودا بازووی ئەوی توند گرتو رایکێشایە گۆشەییێکەوە، نەرمو بەپەلەو تووڕە قسەی لەگەڵ ئەودا کرد (( تۆ لێرە چی دەکەی؟ بۆ کێوەکانی جەلیلت جێهێشتووە؟ ئەنجومەنی برایەتی، ئەو کێوانەی بەناوی حەشارگەی تۆ هەڵبژاردووە، ئەوانی دیکە بۆ ئورشەلیم دەستنیشان کراون)).

باراباس بەتووڕەییەوە پەلپی گرت ((بزانم، ئێمە بۆ ئازادی دەجەنگین یا نا؟ ئەگەر کە بۆ ئازادی دەجەنگین، من ئازادم لەوەی کە هەر کاتێ بێتە زەینم ئەنجامی بدەم، من بۆ خۆم هاتووم تا ئەو پاکشۆرە بەنیشانەی سەرسوورهێنەرو گەورەیی ببینم، بەخۆم گوت ((شایەد ئەو هەمان کەس بێ کە لە چاوەڕوانی ئەو دابووین، ئەگەر وایە لێگەڕێ با بێ هیچ دواکەوتنێکی دی بێتو بچێتە پێشەوەو دەست بەکوشتو کوشتار بکات، بەلاّم



زۆر درەنگ گەیشتم، گۆشاوگۆش سەریان بڕی بوو، کۆ رابەری منی چ دەستورێك دەدەیت؟))

– من دەستورت پێدەدەم کە هەڵسیو لێرە بڕۆو خۆت لە کاری ئەوانی دیکە هەڵمەقورتێنە)).

– تۆ بەڕاستیتە دەڵێیت ئێرە جێ بهێڵمو لێرە بڕۆم؟ من بۆ خاتری پاکشۆر هاتوومو کوڕی نەجاڕ هاتە سەر ڕێم چەندین ساڵە بەدوایەوەمو ئێستا کە خودا ئەوی لە چەند پێیەك لە نزیك من داناوە تۆ دەڵێی دەبێ دەست لەو هەڵگرم.

– یەهودا فەرماندەرانە ئەمری کرد (( لێرە بڕۆ ئەو کارە لە ئەستۆی منە تۆ خۆتی تێهەڵمەقورتێنە)).

– مەبەستت چییە؟ هەر بۆ ئاگاداریت ئەنجومەنی برایەتی دەیەوێت بیکوژێت، چونکە مەئموری رۆمیەکانە؟ ئەو ئەرکەیان خستۆتە سەرشانی کە دەربارەی مەلەکوتی ئاسمان هاوار بکات تا خەڵکی رەنگ بگرنو زەویو کۆیلێتی خۆیان فەرامۆش بکەن، بەلاّم تۆ ئێستا مەبەستت چییە؟

– هیچ، من دەبێ حیساباتی خۆم پاك بکەم یاڵلاّ لە خۆت هەڵدە؟ باراباس گەڕایەوە، بۆ دواجار نیگاییێکی کردە ئەوانەوە کە گوێی خۆیان قولاّغ کردبوو، بە زۆڵی بەسەریانا نەڕاندی. (( بەرخەکانی من، هەر زوو پێکدەگەینەوە هیچ کەسێ بەم سادەییەوە لە دەست باراباس رزگاری نابێت. ئێستا دەبینن کە دووبارە سەبارەت بەم مەسەلەیە قسە دەکەین)). لەلای دەروازەی داد ون بوو.

مەیخانەچی چاوێکی لە پەترۆس هەڵتەکاندو بە گوێی چرپاندی ((دەستورانی خۆی بەو داوە، ناوی لێ بنێ ئەنجومەتی برایەتی، ئەوان یەك رۆمی دەکوژن، رۆمیەکان دە سراییلی دەکوژن، نە دەکەس، پازدەکەس، کوڕینە ئاگاداربن!)) پاشان سەری بردە بن گوێی پەترۆسو گوتی: ((گوێ بگرە پشت بە یەهودای ئەسخەریوتی مەبەستە، ئەو ریش سوورانە)). بەلاّم قسەی خۆی خواردەوە چونکە لە هەمان کاتدا ریش سوور هاتو بەسەر تەختەوە دانیشت.

یۆحەننا لە حاڵەتی شڵەژاندا بوو، لەجێوە قیت بۆوە، لە دەم دەرگادا وەستا، سەیری سەرەوەو خوارەوەی دەکرد، ئوستاد بەدیارنەکەوت، رۆژ دەستی پێکردبوو، شەقامەکان پڕبوون لە ئاپۆڕەی خەڵك، ئەوبەری دەروازەی داود تەواو دابڕا بوو، هەرچییەك هەبوو تاوێرەبەردو خۆڵەمێش بوو، گەڵایەکی سەوزیش نەبوو، جگە لە بەردی سپی کێڵەکان هیچی دیکە بەرچاو نەدەکەوت، هەوا بۆنی گەنیوی لاشەی سەگو وشتری دەدا، ئەو هەموو وەحشیگەرییە یۆحەننای خستبووە وەحشەتەوە، لێرە هەموو شتی بەردبوو:

رووخساری مرۆڤەکان، دڵەکانیان، ئەو خودایەی دەیانپەرست، هەمووی لەبەرد بوو، ئەدی ئەو خودایە میهرەبانە لە کوێ بوو کە ئوستادی بۆ ئەوان ناردبوو؟ باشە چ وەختی ئوستادی خۆشەویست وەدیاردەکەوێ تا لەگەڵ یەك بگەڕێینەوە بۆ جەلیل!؟

پەترۆس هەڵسایەوە، ئیدی جڵەوی سەبری لەدەست دابوو (برایان چاکتر وایە بڕۆین..ئەو نایەت)). یۆحەننا بەترسو لەرزەوە، بەبنی لێوەیەوە گوتی ((دەنگی نزیك بوونەوەی دەبیستم)).

یاکوب کە بۆ وەهمی خەیاڵی براکەی تەقەی سەری دەهات گوتی ((لە کوێ دەنگی دەبیستی.. سەرەڕۆ؟)) ئەویش وەکو پەرترۆس بۆ جارێکی دی دۆزینەوەی دەریاچەو قایغەکانی بێ تاقەت بووبوو. ((لە کێ گوێت لە دەنگی دەبێ؟ دەکرێ بفەرمووی پێمان بڵێی؟))

برا جحێڵ ترەکە وەڵامی دایەوە ((لە ناخی دڵم، هەمیشە دڵە کە دەبیستێو پاشان دەبینێ)).

یاکوبو پەترۆس شانەکانیان هەڵتەکاند، بەڵام مەیخانەچی هاتەبەرو گوتی: تیزبازی وەڵانێن، ئەو کوڕە راست دەبێژێ، بیستوومە کە....

– سەیر کەن، ئەو شتەی کە پێی دەڵێن کەشتی نوح، ئێوە بیردەکەنەوە چیێ بێت؟ هەڵبەتە دڵی مرۆڤە! خودا خۆیو تەواوی ئافەریدەکانی لەناویا دادەنیشێ، هەموو شتی غەرق دەبێو دەچێتە قوڵایی تەنها ئەوە کە بە کەژاوەی خۆی بەسەر ئاوەوە دەچێتە پێشەوە، دڵی مرۆڤ ئاگای لە هەموو شتێ هەیە، بەڵێ پێنەکەنی، هەموو شتێ دەزانێ)). کەڕەناکان کەوتنە دەنگەوە تۆزەبایێ هەڵساو خەڵکی رێی کردەوە،



هاوسەفەرەکان دوودڵ بوونو بۆلای دەرگا رایانکرد، چەند نەوجەوانێکی تەڕوتازە کەژاوەییێکی رازاوەو بەرێزیان هەڵگرتبوو، لەناو کەژاوەدا ردێن سپییێکی خەپەو چەوریلە بەجلێکی ئاوریشمیو ئەڵقەی زێڕو رووخساری نازپەروەری نیعمەت، بە ئارامی دانیشتبوو دەستی بەڕیش دادەهێنا.

مەیخانەچی گوتی (( گۆ بزنی گەورە، کوڕینە لووتتان بگرن ماسی سەرەتا لەسەرەوە بۆگەن دەکات)). خۆی لووتی گرتو تفی رووکرد((دووبارە دەچێتە سەیری باخ وباخاتەوە تا بخواو بنۆشێ لەگەڵ ژنانو کوڕە جوانەکانی خۆی یاری بکات، ئەگەر لەجێی خودا دەبووم... دونیا بەتاڵە موێکەوە بەستراوە، ئەو تاڵە مووەم دەچنی، بەڵێ بە شەرابم قەسەم کە دەمچنیو دونیام رەوانەی ئەسفەلە سافلین دەکرد. پەترۆس دووبارە گوتی: چاکتروایە بڕۆین لێرە ئاسایش نییە دڵی من، هەم چاوو هەم گوێی هەیە هاوار دەکات ((بڕۆن..هەمووتان بڕۆن، ئەی بوونەوەرە مەفلوجەکان))

قسەی ئەو بوو کە بەڕاستیش دەنگی دڵی بیست، بەترسەوە لەجیوە هەڵسا خۆی گەیاندە گۆچانێ کە لە گۆشەییێکەوە بوو گرتیە دەست، ئەوانی دیش بە دیتنی ئەو، لەجێوە قیت بوونەوە، ترسی پەترۆس درمی بوو، پەترۆس سیمۆنی راسپاردو گوتی (( ئەو دەناسی، ئەگەر هات پێی بڵێ حونە جەلیل))

مەیخانەچی بەنیگەرانیەوە گوتی ((ئەی کی گەرەکیەتی کە پارەی کەللەو شەراب بدات؟ پەترۆس پرسی ((سیمۆنی قەیرەوانی باوەڕت بەو دونیای دیکە هەیە؟))

باشە وادەی مەردانە بەتۆ دەدەم کەلەم دونیا بتدەمەوە، ئەگەر بشتەوێ ئەوا لە نامەی کاری خۆمدا دەینووسم.

مەیخانەچی سەری خۆی خوراند

پەترۆس بەتوندی گوتی (( تێنەگەیشتم مەگەر باوەڕت بەم دونیا نییە؟

– پەترۆس... باوەڕم پێ هەیە. بەڵی بابە، بەڵام ئەوەندە نا.

## بەشی بیستەم

لەوکاتەدا کە ئەوان خەریکی گفتوگۆ بوون، لە پڕێکا سێبەرێکی شین کەوتە سەر ئاستانەی دەرگاوە، پاشەکشەیان کرد، کریست بە پێی خوێنینو جلی تۆزاویو رووخساریٚ کە دەستنیشان نەدەکرا، لەدەم دەرگادا وەستابوو، ئەو کێ بوو، ئایا ئوستادی میهرەبان بوو یا پاکشۆر؟ بوکڵەی تێکئالۆزاوی کەوتبووە سەر شانەکانی، پێستی ئێستاکیٚ هەتاوەسووتو زبر هەڵگەڕابوو، گۆناکانی کەوتبوونو چاوەکانی لەبەر درشتی تەواوی رووخساریان داگرتبوو، مشتی گرمۆڵە کردبوو، پرچو گۆناو چاوەکانی وەکو هی پاکشۆر وابوون، حیوارییەکان، بە دەمی کراوە لەسەرسامیان، بەخامۆشی سەیری ئەویان دەکرد، نەکا ئەو دوو پیاوە تێکەڵ بەیەك بووبنو بووبنە یەك.

یەهودا، لەکاتێکا کە دەچووە کەنارەوە ئەو ریڤینگە تازە هاتووە بیٚ ئۆقرە تێپەڕیٚ، لەبەرخۆ گوتی ((ئەو پاکشۆری کوشت، ئەو ...ئەو)). دەیڕوانیە کریست کە بەسەختی لە دەروازەی دەرگادا رەت دەبوو، هەروا دەیڕوانیە یەك یەکی ئەوانو گەستنی لێویان، یەهودا لەبەرخۆ گوتی ((هەموو شتێکی لەو وەرگرتووە، جەستەی ئەوی بە تاراج بردووە، بەڵام رۆحی ئەوو وشە وەحشیەکانی چۆن؟ ئێستا کە قسە بکات دەیبینین)). بۆ ماوەیەك خامۆش بوون، فەزای مەیخانە گۆڕا، مەیخانەچی لە گۆشەیەکەوە مات بوو، سەیری کریستی دەکرد کە لێوەکانی خۆی دەگەستو لەسەرخۆ بۆ پێشەوە دەهات، دەمارەکانی لاجانگی هەڵمسابوون، لە پڕێکا سەدای زبرو وەحشی ئەویان بەرگویٚ کەوت، لەرزە کەوتە جەستەی هاوسەفەرەکان، چونکە ئەم دەنگە، دەنگی ئەو نەبوو، بەڵکو دەنگی -پەیامبەری ترسناك- یەحیای پاکشۆر بوو.

– ئەوە لێرە دەڕۆیشتن؟

هیچ کەسیٚ وەڵامی نەدایەوە.



بەتووڕەییەوە گوتەی خۆی دووبارە کردەوە ((لێرە دەڕۆیشتن، پەترۆس قسە بکە!))

پەترۆس بە دەنگێکی نادڵنیا وەڵامی دایەوە ((ئەی مەولای من، یۆحەننا دەنگی تۆی لە دڵی خۆیدا بیستو ئێمە مەبەستمان بوو پێشوازیت لیٚ بکەین)).

کریست رووخساری تێکچڕژاند، تاڵیو تووڕەیی وجوودی داگرت، بەڵام دانی بەخۆیا گرت، لە کاتێکا بەرەو لای دەرگا وەردەسوورا گوتی:

– یاڵلا بڕۆین......!))

یەهودای بینی لەکەناریا وەستاوەو چاوەشینەکانی بەتوندی بڕیوەتە ئەو، لێی پرسی ((یەهودا تۆش دێیت؟))

– تادەمی مەرگ لەگەڵ تۆم.....ئەوە دەزانی

– بەس نییە، گوێت لێیە؟ بەس نییە، تا ئەوپەڕی مەرگ! یاڵلا بڕۆین مەیخانەچی لەمیانی تونگەی شەرابەوە دەرپەڕیو بانگی کرد ((کوڕینە بەختو رزگاری یارو یاوەرتان بیٚ، جەلیلیەکان ئارەزووی سەفەرێکی خۆشتان بۆ دەکەمو ئومێدەوارم بەگەیشتنی رۆژێکی بەختەوەربەخش کە دەچنە بەهەشتەوە، بەخاتری شەرابو کەللە بەرخ من لەبیرنەکەن)).

پەترۆس بە سەروپۆتەلاکێکی جیدیو لەهەمانکاتدا شەکەت وەڵامی دایەوە ((وادە بەتۆ دەدەم) لەبەرئەوەی لەترسان درۆی کردبوو هەستی بەشەرم دەکرد، رووخساری تووڕەو ترشڕوی کریست نیشانی دەدا کە رووبەڕوی درۆبۆتەوە، بەدەنگێکی لەسەرخۆ کەوتە سەرزەنشتی خۆیەوە ((پەترۆس ئەی ترسنۆکی درۆزن، ناپاك! کەی دەتەویٚ ببیە پیاو؟ کەی دەتەویٚ زاڵ بی بەسەر ترس؟ کەی دەست لە تەڵەکەبازی هەڵدەگری؟ لە دەرگای هاتنە ژوورەوەی مەیخانە وەستابوو چاوەڕوان بوو ببینیٚ ئوستاد بەکام لادا دەڕوات، بەڵام کریست بیٚ جولە، بەگوێی قولاغی خۆیەوە گوێی سپاردبووە ئاهەنگی ئاڵو یەکنەواوە، کە بە تەواوی بەرزو شکستەوە لەولای دەروازەی داودەوە دەهاتن، جوزامیەکان بوون، ئەوان خۆیان هاوێشتبووە سەر خاكو بازووەکانی خۆیان روو لە رێبواران کردبۆوە، سروودی شکۆمەندی داودو رەحمەتی خوداوەندیان سەردەدا کە

جوزامی داوه بەوان تا سزای گوناهەکانی خۆیان لە سەر دونیا وەرگرنو لە رۆژی پەسنانیش رووخساریان وەکو خۆرەتاو جاویدانە بدرەوشێتەوە، کریست خەمناك بوو، بەرەو شار گەڕایەوە، مەغازەکان، کارگاو مەیخانەکان کرابوونەوە، شەقامەکان پڕ لە خەڵك بوون، سەیرکە چۆن رادەکەن، هاوار دەکەنو ئارەقە لە جەستەیان هەڵدەڕژێ! نەعرەتەییێکی ترسناکی بەرگوێ دەکەوت، شاری پیرۆز وەك جانەوەرێکی ترسناك دەهاتە بەرچاو کە بیمارەو گەدەو هەناوی پڕ دەبوو لە جوزامو شێتیو مەرگ.

سەدای نەعرەتە زێتر دەبوو، لەملاولەملا راکردنی خەڵك بوو، کریست لەخۆی پرسی ((ئەو پەلەیە بۆ چییە؟ بۆ رادەکەنو بۆ کوێ دەچن؟)) ئاخێکی هەڵکێشاو بەبنی لێویەوە گوتی ((هەموو..هەموو رەوانەی دۆزەخ دەبن)) کریست لە شلەژاندا بوو، ئایا ئەرکی بوو کە لەم شارە ئادەمخۆرەدا بمێنێتەوە، بچێتە منارەی پەرستگاوەو هاوار بکات ((تۆبە بکەن، رۆژی خودا هاتووە؟)) ئەو خەڵکە بەدبەختە کە بە هەناسەبڕکێوە لە راکەڕاکدا بوون، پێویستیان بە تۆبەو ئارامی زۆرتری ماسیگرانو زەوی کێڵەرانی ئارام وکپی جەلیل بوو، کریست لەبەرخۆ گوتی: هەر لێرە دەمێنمەوە، لێرەیە کە دەبمە بانگەشەکاری نەمانی دونیاو موژدەهێنی مەلەکوتی ئاسمان.

ئاندریاس نەیتوانی خەمی خۆی پەنهان کات خۆی گەیاندە کریستو گوتی: ((مەولای من پاکشۆر دەستگیرکراو کوشتیان))

کریست بە ئارامی وەلامی دایەوە ((رێ لە هیچ ناگرێ، پاکشۆر بۆ ئەنجامدانی وەزیفەی خۆی هەلێکی تەواوی هەبوو ئاندریاس، ئێمەش ئومێدەوارین کە بۆ ئەنجامدانی وەزیفەمان هەلێکی تەواومان بۆ بڕەخسێ)). بەبینینی چاوانی ئەشکباری ئاندریاسی بۆ حەواری پێشووی پێشەنگ گوتی ((ئاندریاس خەمگین مەبە ئەو نەمردووە، مردوان کەسانێکن کە بۆ جاویدانەیی زۆر درەنگ دەگەن، ئەو زۆر درەنگ نەگەیشت خوداوەند هەلی بەو بەخشی))

بەگوتنی ئەم وشانە زەینی کریست رۆشن بۆوە، حەقیقەت هەمان ئەوەیە کە هەموو شتێ لە دونیا پەیوەستە بەهەل، هەل مایەی پوختەیی هەموو شتێکە، ئەگەر مرۆڤ



هەلێ بدۆزێتەوە لە گۆڕینی لیتاوی بوونی خۆیدا رۆحی سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ، ئەو کاتە ئیدی ناکەوێتە هەراسانی مەرگەوەو مرۆڤ لەناو دەچێت.

کریست بەدەنگێکی لەسەرخۆ داوای لەخوا کرد کە هەلی پێببەخشێ، هەمان ئەو هەل بەخشینە.. هەستی دەکرد هێشتا بوونی لە لیتاو پاك نەبۆتەوە، هێشتا هەر لەوانەیە تووشی تووڕەییو ترسو ئێرەیی بێ، هەر کاتێ بیری لە مەجدەلیە دەکردەوە، چاوەکانی گەردیان دەگرت، هەمان دوێنی شەو لەکاتێکا بەنهێنییەوە سەیری مێرێی خوشکی ئیلیازری دەکرد، لەشەرمان رووخساری وەك گوڵ سووردەبۆوە بۆیە یەکسەر بڕیاریدا ئەو شارە بەجێبهێڵێ، زەمانی مەرگی هێشتا نەگەیشتبوو، هێشتا ئامادەنەبوو، دووبارە داوای لە خودا کرد کە هەلی بۆ بڕەخسێنێ، هێمای بۆ هاوسەفەرەکانی خۆی کرد ((یارانی من، وەرن بەناوی خودا دەگەڕێینەوە بۆ جەلیل)).

هاوسەفەرەکانی وەکو ئەسپێکی بێ تاقەتو برسی کە دەگەڕێنەوە ئاخوڕی خۆشەویستی خۆیان، بەرەو دەریاچەی گنسارت شۆڕبوونەوە. یەهودای ردێن سوور دووبارە کەوتە پێش، فیکەی لێدەدا، چەندین ساڵ بوو هەستی بەدلێکی واخۆشو رازی نەکردبوو، رووخسارو سەدای زێڕینی ئوستاد هەر لەو کاتەی لە بیابان گەڕابۆوە مایەی خۆشدڵی لە وەسف بەدەری ئەو بوو، چەندین جاروجار بەخۆی دەگوت. ((پاکشۆری کوشتووە، ئەوی لەگەڵ خۆی برد، بەرخو شێر پەیوەست بوونو بوونەیەك؟ بەفیکەو چاوەڕوانییەوە بۆ پێشەوە دەچوو، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((ئەو بێدەنگیە ناتوانێ ئەوەندە بخایەنێ یەکێ لە هەمان ئەو شەوانە بەر لە گەیشتن بەدەریاچە دەمی دەکاتەوەو قسە دەکات، رازی خۆی کە لە بیابان چی کردووەو ئایا خودای سراییلی دیوە یا نەیدیوە، گفتوگۆی میانی خۆیو خودای سراییل بەدایکی دەڵێ، ئەوکاتە قەزاوەت دەکەم. یەکەمین شەو بەسەرچوو، کریست بێ ئەوەی قسەیێ بکات سەیری ئەستێرەکانو دەوروبەری دەکرد، هاوسەفەرەکان ماندووبوونو خەوتبوون، بەلام چاوە شینەکانی یەهودا لە تاریکیدا بریقەی دەدایەوە، ئەوو کریست بەدرێژایی شەو رووبەڕووی یەکتر بەبێداری مانەوە، بەلام وشەییێك لەدەمیان دەرنەچوو.

لەكاتی سەحەردا دووبارە کەوتنەوە ڕێ، گاشەبەردی یەهودیەیان لەدوای خۆیان جێهێشت، گەیشتنە خاکە سپی سامیرا، بیرەئاوی یاکوب جێهێڵرابوو، هەتا ژنێکیش نەهات تا ئاویان بۆ هەڵکێشێ، بەخێرایی ئەو خاکە بەکوفر پیسبووەیان جێهێشت، ئەو کاتە چاویان بە جوانی کێوە خۆشەویستەکانی حەرمۆنی دەسماڵ بەفراوی، تابوری نازوفیز، کەرملی پیرۆز رۆشن بۆوە.

رۆژ تاریك داهات ، ئەوان لەژێر درەختی سەرونیازنازی پڕ لقو گەڵاوە ئارامیان گرتو سەیری خۆراوایان کرد، یۆحەننا دوعای خۆراوابوونی کرد ((پەروەردگارا دەرگاکانت بەڕووی ئێمەدا بکەوە رۆژ کۆتایی دێت، خۆرەتاو ئاوا دەبێ، خۆرەتاو ون دەبێ، پەروەردگارا دەرگاکانت بەڕووی ئێمەدا بکەوەو هاتووینەتە دەرگات، دەرگابە رومان بکەوە، ئەی جاویدانی، بە پاڕانەوە لەتۆمان دەوێ، کە لێمان ببووری، ئەی جاویدانەیی، بەدەستە پاچەیی لەتۆمان دەوێ کە رەحمەتمان بۆ بهێنی، ئەی جاویدانیی، ئێمە نەجات بدە)).

هەوا رەنگی شین بوو، ئاسمان خۆرەتاوی لەدەست دابوو هێشتان ئەستێرەکانی نەدۆزیبۆوە، بەبێ زیڕوزیو کەوتبوە سەر زەوی، دەستە نەرمو بەرزەکان ئەنگوستی کریستیان بەسەر زەویەوە فشاردەداو لەنیوە رەنگی دوودڵی خۆراوا درەوشانەوەییێکی سپی هەبوو، دوعای خۆراوابوون هێشتا لە دەمارەکانیدا دەگەڕا، دەنگی کوتانەوەی دەستە لەرزۆکەکانی مرۆڤ دەگەیشە دەرگاکانی خودا، بەڵام دەرگاکان نەدەبوونەوە، مرۆڤەکان لە دەرگایان دەداو هاواریاندەکرد، هاواری چییان دەکرد؟

کریست چاوەکانی داخست تا ئاشکراتر ببیستێ، مەلەکانی رۆژ گەڕابوونەوە هێلانەو مەلانی شەو هێشتا چاویان نەکردبۆوە، هەتا هێلانەی مرۆڤ مەودایێکی زۆری هەبوو. نەدەنگی قیلو قالی مرۆڤ هەبوو نە وەڕینی سەگەکان، هاوسەفەرەکانی دوعای خۆراوایان بەبنی لێوەوە کرد، بەڵام لەوێ کە خەواڵوو بوون، وشەکانی قودسیان بەبێ دەنگدانەوە لە دەرووندا هەڵنیشت، بەڵام کریست لە ناو دڵی خۆیدا سەدای ئەڵقە کوتانەوەی دەرگای مالانی بیست کە مرۆڤ دەیکوتایەوە، ئەوان بەدڵی گەرمو مرۆیی دەیانکوتایەوەو هاواریان دەکرد ((دەرگا بکەرەوە، بکەرەوە، نەجاتمان



بدە)) کریست چنگی لەسینەی خۆی گیرکرد وەك بڵێی خۆی ئەڵقەی دەرگای دڵی خۆی دەکوتێتەوە، دەستەپاچە دەیویست بکرێتەوە.

لەحالێکا هەوڵو تەقەلایان بوو بیری دەکردەوە کە خۆی تەنهایە هەستی کرد کەسێ لەدواوە سەیری دەکات، گەڕایەوە، چاوانی سادوبریقەداری یەهودا لەو دابڕابوو، کریست لەرزی، ئەو ریش سوورە جانەوەرێکی مەغرووورەو هەرگیز ئارام نابێتەوە، لەمیانی هەموو هاوسەفەرەکانی ئەوی لە هەموان نزیکتر لەخۆیو لە هەمان کاتدا دوور هەست پێدەکرد، وابەدیار دەکەوت کە بۆ ئەوانی دیکە پێویست بە روونکردنەوە نییە، بەڵام بۆ ئەو چۆن، دەستی راستی بۆ پێشەوە بردو گوتی (برام یەهودا چیم لە دەست دێ؟))

یەهودا لە نیوە رەنگی رۆشنایی خۆراوادا، گەردەنی کەچ کرد تا ببینێ، وەڵامی دایەوە ((هیچ شتێ...من هیچ شتێ نابینم)). کریست بە بزەییێکەوە گوتی ((بەزوویی ئەو دەبینی))

- ئاندریاس گوتی: مەلەکوتی ئاسمان.

یۆحەننا گوتی ((تۆو، مەولای من، لەبیرتە کە یەکەمین جار لێوانت کردەوەو لەگەڵ ئێمە قسەت کرد چیت گوت؟))، (( تۆدەر هاتووە تا تۆوی خۆی پێوەرکا))

کریست پرسی ((پەترۆس تۆچی دەڵێی؟))

– ئوستاد چی بڵێم بە چاوەکانم بڵێم گەواهی بدەن، هیچ شتێ، دڵم بەشاهێد بگرم بەهەموو شتێ، سەیرکە لەمیانی ئەم زەینم وەکو تۆپ دەلەرێتەوەو دێتو دەچێ))

– یاکوب؟

– هیچ شتێ مەولای من لێم ببوورە، بەڵام تۆ هیچ شتێکت لەدەستدا نیە.

کریست گوتی (سەیرکەن) بازووەکانی تووڕەییەوە بۆ سەرەوە برد، کاتێ کە بازووی خۆی بۆ سەرەوە بردو بەهێز هێنایە خوارەوە هاوسەفەرەکان کەوتنە وەحشەت، یەهودا ئەوەندە خۆشحاڵ بوو شاگەشکەبوو تەواوی رووخساری بریقەی دایەوە، دەستی

کریستی گرتو ماچی کردو هاواری کرد (مەولای من بینیم... من بینیم، تۆ تەورەکەی پاکشۆرت لەدەست دایە)) بەلاّم بێدرەنگ شەرمەزارو تووڕەبوو، چونکە نەیتوانی شادی خۆی بحواتەوە، دووبارە پاشەکشەی کرد پشتی بەقەد درەختدا سەدای کریست بە ئارامیو ڕێزەوە بیستراو ئەو تەوری بۆ من هێنا لەکەنار درەختە کالّبۆوەکانی دانا، بەڵگەی هاتنە دونیای ئەو هەر ئەوە بوو: هێنای تەور بۆ من، نەزۆرو نەکەم، من هاتم، لاربوومەوە تەورەکەم هەڵگرت، بەڵگەی هاتنە دونیای من هەر ئەوەیە، ئێستاکێ وەزیفەی خودی من دەست پێدەکا ڕماندنی درەختی ڕزی، بیرم دەکردەوە من زاوامو لقو پۆپی پڕ لە گوڵی بادامم لە دەست گرتووە، بەلاّم لەتەواوی ئەو ماوەیە زیاتر لە دارشکێنی هیچی دیکەم نەبوو، وەبیرت دێتەوە کە چۆن چۆنی لە جەلیل سەمام دەکردو دەستمان دەکرد بە پیاسەی ناو گولاّن، جیهانمان جوان دەکردو یەکیەتی ئاسمانو زەمینو کردنەوەی دەرگای بەهەشت کە دەچووینە ناویەوە؟ هەموو ئەوە لە خەونو خەیاڵ زیاتر نەبوو.. ئێستاکێ بێداربووینەوە)). پەترۆس بەترسەوە هاواری کرد (( کەواتە مەلەکوتی ئاسمان بوونی نییە؟))

چۆن پەترۆس چۆن، بەلاّم لەناو دلّمان، مەلەکوتی ئاسمان لە دەروونی ئێمەیە، مەلەکوتی هەرماس لە دەرەوەی ئێمەیە، ئەم دوو مەلەکوتە لەگەڵ یەکدا لەململانێن، جەنگ جەنگ! یەکەمین وەزیفەی ئێمە لێدانی هەرماسە بەم تەورە.

– کام هەرماس؟

– هەمان ئەو دونیایەی دەوروبەرمان، هاوڕێیان ئازابن من ئێوەم بۆ جەنگو بۆ میوانی داوەت کردووە، چونکە من خۆم نەناسیوە، بەلاّم لێگەڕێن لەمیانی ئێوە ئەوەی لە بیری ژنو منالّو خۆشبەختیە بابڕوات ناچاری لە کاردا نییە، لێگەڕێ با رابێو لەسەرخۆ مالاّوایی لە ئێمە بکاتو ئێمەش دوعای خێریان بۆ دەکەین، هێشتا هەل ماوە، کریست بێدەنگ بوو.

– سەیری هاوسەفەرەکانی خۆی کرد، هیچ کەسێ لە جێوە نەبزاڤت، ئەستێرەی ڕۆژاوا وەك دلۆپەییێکی گەورەی ئاو، لە پشت لقو پۆپی سەروی نازدا هەڵدەخزی، مەلەکانی شەو بالّە رەشەکانیان هەڵدەتەکاندو بێداردەبوونەوە، شنەییێکی فێنك لە کۆسارانەوە



هەڵیدەکرد، لە پڕێکا لە شیرینی خەوی شەوان پەترۆس بۆ پێشەوە هەڵبەزیەوەو هاواری کرد، ((مەولای من، لەم جەنگەدا تا کاتی مەرگ لەگەڵ تۆدا دەبین)).

– پەترۆس ئەوە فشەگوتنە من میانەییێکی خۆشم لەگەڵ ئەوە نییە، ئێمە لە کۆڕەوێکی دژوار داین، پەترۆس مرۆڤ رووبەڕوومان دەبنەوە، چونکە چ کەسێ ئارەزووی نەجاتیانی هەیە؟، کام وەخت پەیامبەرێ بۆ نەجاتی خەلّك رابووەو خەرلّکی بەردبارانیان نەکردووە؟ ئێمە لە کۆڕەوێکی دژوار داین، ڕۆحی خۆتان بچەسپێنن پەترۆس تا رانەکات، جەستە لاوازە، پشتی پێ مەبەستە... گوێت لێیە؟ لەگەڵ تۆ قسە دەکەم پەترۆس لەپڕێکا فرمێسك لە چاوەکانی پەترۆس ئەڵقەی بەست، بەبنی لێویەوە گوتی ((مەولای من مەگەر متمانەت بەمن نییە، ڕۆژێ گیانی فیدای پێی تۆ دەکات))

– کریست دەستی بەسەر ئەژنۆکانی پەترۆسدا هێناو بەبنی لێویەوە گوتی ((لەوانەیە .... لەوانەیە) پەترۆس ئازیز لێم ببوورە))

– کریست ئەو کاتە رووی لەوانی دیکە کردو گوتی ((یەحیای پاکشۆر خەلّکی ئاوەمۆری دەکرد، ئەویان کوشت، من بە ئاگر ئەمشەو دەمەوێ ئەوەتان بۆ ڕۆشن کەمەوە تا بزاننو شکایەت لەو ڕۆژانە مەکەن کە تووشی ڕۆژانی رەشی هاتین گلەیی مەکەن هەتا بەر لەوەی دەست بەکاربببن بە ئێوە دەلّێم ئارەزووەکان لە کوێن: مەرگ، پاش مەرگ، جاویدانی، مەبەست ئەوەیە ئامادەن؟

– هاوسەفەرەکان بێ هەستو خوست بووبوون، ئەو دەنگە تووڕە بوو، ئیدی هەڵبەزودابەزی نەبوو، پێنەدەکەنی، ئەوانی بۆ هەڵگرتنی چەك داوەت دەکرد، لەبەر ئەمە بۆ چوونە ناو مەلەکوتی ئاسمان دەبوایە بە دەراوی مەرگدا بڕۆن؟ ڕێگاییێکی دیکە لەمیاندانەبوو؟ ئەوان خەلّکی سادە، هەژار، کارگەربوون، دونیا پڕ نیعمەت وقودرەت بوو، چۆن دەیانتوانی لەبەرابەر ئەو دەست بۆ چەك ببەن؟ مەگەر فریشتەکان لە ئاسمان دابەزن بێنە یاری ئەوانەوە، بەلاّم هیچیەك لە حەواریەکان تا ئێستا فریشتەیێکیان نەدیووە کەبەسەر زەویەوە هەنگاو هەلّێنن یاوەری هەژارو بێچارەکان

بکەن، لەبەر ئەمە بێدەنگ مانەوە، بەنهێنییەوە کەوتنە پێوانەو دووبارە پێوانەکردنی مەترسی، یەهودا بەتیلەی چاوی سەیری دەکردن دڵی لە غرووریان کرێشمەی دەکرد.

تەنها ئەو بوو کە حیسابو کتابی نەدەکرد، بەنەفرەتەوە لەمەرگ دەچوو بۆ شەڕی مەرگو بایەخی بەجەستەو رۆحی نەدەدا، ئەو جگە لە یەك سەودای گەورە سەوداییێکی دیکەی نەبوو، فیداکردنی سەرو گیانی لەڕێی ئەو سەودایەدا لەززەتێکی باڵای هەبوو. پەترۆس لە دیماهیدا دەمی کردەوە: مەولای من، ئایا فریشتەکان بۆ یاری کردنمان لە ئاسمان دێنە خوارەوە؟))

کریست وەڵامی دایەوە ((پەترۆس ئێمە فریشتەکانی خوداین بەسەر زەویەوە، هیچ فریشتەییێکی دیکە لەمیاندا نییە)).

یاکوب پرسی ((ئوستاد ئاخر بە تەنهایی. چ کارێکمان لەدەست دێت؟))

کریست هەڵسایەوە پەڕەی لووتی دەلەرزی هاواری کرد ((بڕۆن من جێبهێڵن!))

یۆحەننا هاواری کرد ((من تۆ جێناهێڵم تا دەمی مەرگ لەگەڵ تۆدام))

ئاندریاس بەدەریخست ((مەولای من، منیش هەروا)). ئەژنۆکانی ئوستادی لەباوەش کردو دڵۆپە فرمێسکی درشت لەگۆناکانی پەترۆس هەڵخزی، بەڵام قسەییێکی نەکردو یاکوب کە نەوجەوانێ زیاتر نەبوو لەشەرمان سەری لەبەرخۆنا. کریست کە ئاگاداربۆوە لە نیگای خامۆشو وەحشی ریش سوورەکە لەوانی پرسی ((تۆ چۆنی برام یەهودا))

یەهودا بە هاوارەوە گوتی (( من میانەم نییە لەگەڵ قسە وەکو پەترۆسیش ناسكو نارنج نیم، مادامەکێ تەورت لەدەست بێ لەگەڵ تۆم، ئەگەر تەورەکە دانێی، لەکەنارتا نامێنم، بەهەمان شێوە کە خۆت باش دەزانی من پەیڕەوی لەتۆ ناکەم، من پەیڕەوی لە تەور دەکەم)).



پەترۆس گوتی (( شەرم ناکەی بەمجۆرە قسە لەگەڵ ئوستاد دەکەی؟)) بەڵام کریست خۆشحاڵ بوو گوتی ((هەق لای یەهودایە، دۆستان من خۆشم پەیڕەوی لە تەور دەکەم)).

ئەوان بەسەر زەوی راکشانو پشتیان بەسەرونیازکرد، لە ئاسمان ئەستێرەییێکی زۆریان بینی کریست گوتی ((لەم ساتەوە بەدوا بەیداخی خودا دەخەینە شەکینەوە دەست بەکاری جەنگ دەبین، ئەستێرەو خاچ بەسەر بەیداخی خوداوەند دەزووچنی کراوە، خوداوەند مەدەدکارمان بێت!))

هەموویان بێدەنگ بوون، ئەوان بڕیاری خۆیان دابوو، دڵیان بووبوو بە جەنگاوەر. کریست بەهاوسەفەرەکانی خۆی کە لە دیماهیدا غەرقی تاریکی بوون گوت: جارێکی دی بەزمانی مەسەل قسەدەکەم، دواهەمین مەسەل، بەر لەچوون بۆ جەنگ.... بزانن کە زەمین بەسەر حەوت ستونەوە قەراری گرتووە، ستونەکان بەسەر ئاو، ئاو بەسەر هەورو، هەور بەسەر باو با بەسەر تۆفانو تۆفان بەسەر هەورەتریشقەو هەورەتریشقەش لەبەرپێی خودا قەراری گرتووە.

یۆحەننا کە وەك گوڵ سوور هەڵگەڕابوو گوتی ((من تێناگەم)) کریست لەکاتێکا قژی حەواریە خۆشەویستەکەی خۆی دەلاواندەوە وەڵامی دایەوە ((یۆحەننا، کوڕی هەورە تریشقە، لەوکاتەی کە پیردەبیو دەچی تا لەدورگەیێ ببیت بەزاهیدو ئاسمانەکانی سەرت دەکرێتەوە، زەینت ئاگر دەگرێو تێدەگەی)).

کریست بێدەنگ بوو، یەکەمین جار بوو کە ئاوا بەئاشکرایی ببینێ، کە هەورەتریشقەی خودا چییە: تەورێکی ئاگرین لە کەنار بەر پێی خودا، لەوتیشەدا، تۆفان با، هەورو با، واتە تەواوی زەوی وەکو دانەکانی تەسبیح هەڵواسرابوون، هەرچەند کە ساڵەهای ساڵ بوو لەگەڵ مرۆڤو کتێبی پیرۆز ژیابوو، هیچ کەسێ ئەو رازە سەرسوورمێنەی بۆ ئەو نەکردبۆوە، ئەو ڕازە ئەوەبوو کە ئەو هەورەتریشقەی کوڕی خودا. کریستیانویە، ئەوە کریستیانو بوو کە ئارەزووی پاك کردنەوەی جیهانی هەبوو، گوتی (یارانی من -و پەترۆس بینی کە دوومەشخەڵ وەکو شاخ لەپڕێکا لە توێڵی ئەو هاتنە دەرەوە- بەم شێوەی کە خەبەرتان هەیە، من چوومە بیابان.

تادیداری خودا بکەم، برسیو تێنو بووم لە گەرمای هەڵقرچێنەردا بەسەر تاوێرە بەردێکەوە هەڵکورمامو خودام بانگکرد تا بۆمن ئاشکرا بێت، شەپۆڵ شەپۆڵی هەرماس هەڵدەڕژانە سەرمو هاواریان دەکرد، شکستیان خوارد، پاشان هەڵسووڕانە دەوروبەرو پاشەکشەیان کرد، یەکەمجار هەرماسی جەستەو پاشان هەرماسی زەین، لەدوای هەموویان هەرماسی قودرەتمەندی دڵ، بەلاّم من خودام کردە زرێپۆشی خۆمو زیخو لیمی دەوروبەرم پڕ بوو لە چەنگو ددانو شەیپوور:

ئەو کاتە دەنگێکی بلیمەتم بەسەرسەرمەوە بیست (ڕابە ئەو تەورەی کە لەلایەن پێشەنگەوە بۆتۆ هاتبوو، هەڵیگرەو رایووەشێنە))

پەترۆس هاواری کرد ((ئایا هیچ کەسێ نەجاتی نابێ؟))

بەلاّم کریست نەیبیست ((یەکسەر بازووەکانم سەنگین بوو، وەك بڵێی کەسێ تەوری نایە دەستم، ویستم لەجێوە هەڵستمەوە، جارێکی دی سەداکەم بیست ((کوڕی نەجاڕ تۆفانێکی تازە هەڵدەستێ، بەلاّم ئەمجارە لە ئاو نا، بەڵکو ئاگر، کەشتییێکی تازە دروست بکە پیرۆزەکان هەڵبژێرەو لەناو کەشتیان دانێ)).

دۆست هەڵبژاردن دەستی پێکردووە، کەشتی ئامادەیە، دەرگا هەمووی کراوەیە، بچنە ناویەوە)).

هەموو کەوتنە هەڵەداوان لەکاتێکا بۆ پێش دەچوون بەدەوری کریست گردبوونەوە وەك بڵێن ئەو کەشتی بێو ئەوانیش هەوڵیان دەدا بچنە ناویەوە.

دووبارە دەنگەکەم بیست ((کوڕی داود هەرکە مەشخەڵەکان نیشتنەوەو کەشتی لە ئورشەلیمی تازەدا لەنگەری گرت بەسەر تەختی باوانی خۆت دانیشە فەرمانڕەواییێتی مرۆڤایەتی بکە، زەمینی کۆن لەناوچووە، ئاسمانی کۆنینە نەماوە، ئاسمانو چاوی مرۆڤ حەوت جاران تیشکدارتر لە پێشوو دەدرەوشێنەوە. پەترۆس دووبارە هاواری کرد: ((مەولای من هەموو ئێمە کە لە تەك تۆدا جەنگیوین. تا ئەو زەمانە نابێ بمرین لەڕاستو چەپی تەختی تۆدا دابنیشین.



بەلاّم کریست نەیبیست، غەرقی سروشی ئاگرینی بیابان بووبوو بەردەوام بوو لەسەر قسەی خۆی ((بۆ دواجار دەنگەکەم بەسەر بەرزایی سەرمەوە بیست ((کوڕی خودا پیرۆز کردنی من وەرگرە!))

هەریەك لەوان لەبەرخۆ بانگیان دەکرد ((کوڕی خودا، کوڕی خودا)) بەلاّم هیچ یەکیان زاتی کردنەوەی لێویان نەبوو. تەواوی ئەستێرەکان ئێستاکێ هەلاّتبوونو ئەمشەو لەخوارەوە لە نیوە ڕێی نێوانی ئاسمانو مرۆڤ هەڵواسرابوون.

ئاندریاس پرسی ((مەولای من ئێستاکێ ژیانی نیزامی خۆمان لە کوێوە دەست پێدەکەین؟))

کریست وەلاّمی دایەوە ((خوداوەند بۆ دروستکردنی جەستەی من خاکی ناصیرەی گرتە دەست بۆیە وەزیفەی من ئەوەیە کە لە ناصیرەدا دەست بە جەنگ بکەم، لەوێیە کە جەستەی من دەبێ کاری گۆڕانیی خۆی بۆ رۆح دەست پێبکات)).

یاکوب گوتی ((پاشان دەچینە کفرناحوم تا دایكو باوکم نەجات بدەم))

ئاندریاس پێشنیازی کرد: ((پاشانیش دەچینە مەجدەل، تا مەجدەلی بێنەوا بخەینە ناو کەشتیەوە)).

یۆحەننا بە هێما بۆ رۆژهەلاّتو رۆژئاوا هاواری کرد ((پاشان بۆ تەواوی دونیا!))

پەترۆس گوفتاری ئەوانی بیستو پێکەنی، گوتی ((من لە پرسەی ورگم دام لەناو کەشتی چ بخۆین؟ پێشنیاز دەکەم کە تەنها ئەو ئاژەلاّنەی گۆشتیان حەلاڵە لەگەڵ خۆماندا بیبەین، ئاخر قوربانی رووخساری مانگ ئاساتان بم شیرو پێشکە بە چ کەڵکێکی ئێمە دێن؟))

ئەو برسی بوو بیرو زەینی لای خۆراك بوو، ئەوانی دیکە هەموویان پێکەنین.

یاکوب بە تانەوە گوتی ((تۆ تەنها لە بیری ورگدای، ئێمە لێرە دەربارەی رزگارکردنی دونیا قسە دەکەین)).

پەترۆس بە پەلپ گرتنەوە گوتی (( هەموو ئێوە هەمان بیری منتان هەیە، بەلاّم دانی پیانانێن، من هەرچیەك بەزەینمدا بێت، چ باش‌و چ خراپ رك‌و راست دەیلێم، زەینی من بۆ هەرلاییێ. بسووریێ لەگەلّی دەسووڕێم هەر لەبەر ئەمەیە (( پێم دەلّێن ئاش، مەولای من دروست دەلّێم یا نا؟))

خەندەییێك لە رووخساری کریستدا پشکووت، چیرۆکێکی کۆنینەی هاتەوە زەین ((هەبوو نەبوو، خاخامێ هەبوو کە حەزی لێ بوو نەفەرێ پەیابێ کەڕەنای وا کارامەو بەرز بخاتە سەداوە کە باوەڕداران ببیستن‌و بێنە کلّیساوە. بانگی رادێرا کە هەموو کەڕەناژەنەکان بۆ تاقیکردنەوە ئامادەبن، خاخام خۆی باشترینیان هەلّدەبژێرێ، پێنج نەفەر کە شارەزاترینی شەیپورژەنانی شاربوون، کاتێ کە تاقیکردنەوە تەواو بوو، خاخام یەك یەکی ئەوانی خستە بەر پرس: ((رۆلّە کە شەیپور دەژەنی بیر لەچی دەکەیەوە؟))

یەکەمیان گوتی ((بیر لە خودا دەکەمەوە))

دووەمیان: (بیر لە رزگارکردنی سراییل دەکەمەوە)

سێهەمین (بیر لە هەژارانی برسی دەکەمەوە)

چوارەمیان (بیر لەبێ باوك‌و بێوەکان دەکەمەوە)

تەنها یەك نەفەر کۆنەپۆشترین ئەوان بوو، لەگۆشەیێ لەدوای ئەوانی دیکە دانیشتبوو قسەی نەدەکرد، خاخام لێی پرسی تۆ رۆلّە کە شەیپور دەژەنی بیر لەچی دەکەیەوە؟))

ئەو لە حالّێکا سوور هەلّگەڕابوو وەلاّمی دایەوە

((باوکە من مرۆڤێکی هەژارو بێسەوادم، خاوەنی چوار کچم ناتوانم جەهێز بۆئەو مندالاّنە پەیدا کەم، تا ئەوانش وەکو هەریەکێکی دی زەماوەند بکەن لەبەر ئەوە کاتێ کەشەیپور دەژەنم بەخۆم دەلّێم (خودا تۆ شایەتی کە چۆن بۆ خاتری تۆ گیانم هەلّدەتەکێنم لووتف بفەرموو چوار مێرد بۆ کچەکانم بگەیەنە)) خاخام گوتی ((دوعای خێرت بۆ دەکەم من تۆ هەلّدەبژێرم))



کریست رووی لە پەترۆس کردو پێکەنی ((پەترۆس دوعای خێری من بۆتۆ بێ))

تۆ هەلّدەبژێرم، تۆ خۆراکت لە زەیندایەو دەربارەی خۆراك قسە دەکەی؟ هەرکاتێ خودات لەزەیندا بێت سەبارەت بەخودا قسەدەکەی، ئافەرین بۆ تۆ، لەبەر ئەمەیە کە تۆ بە (ئاش) بانگ دەکەن، من تۆ هەلّدەبژێرم، تۆ ئاشێکی کە گەنم دەکا بە ئاردو دەیکا بە نان تا مرۆڤ بیخۆن.

ئەوان پارچە نانێکیان پێبوو، کریست دابەشی کرد، بەشی هەریەکەیان لوقمەیێ زیاتر نەبوو، بەلاّم چونکە ئوستاد تەبەرووکی کردبوو تێربوون، دوای ئەمە خۆیان بەشانی یەکداو خەوتن.

لەکاتی شەودا هەموو شتێ دەخەوێ، دەحەسێتەوەو گەشە دەکا هەتا بەردەکان‌و ئاوو رۆح، ئەوکاتە هاوسەفەرەکان لەگەلّ سپێدەی بەیاندا لە خەو هەلّسان، رۆحیان لق‌و پۆپی دابوو زەڕڕە زەڕڕە وجودی ئەوی داگرتبوو، تژی دلّنیایی‌و شادی کردبوون.

بەر لە سەحەر رێسپار بوون، ئەمڕۆکە هەوا فێنك بوو، هەورەکان لە ئاسمان گەلاّلّە دەبوون، ئاسمان پاییزی بوو، ماسیگرە درەنگ گەشتەکان لەفڕیندابوون، پەڕەسێلکەکان رێسپاری باشوور بوون، حەواریەکان بەدلّنیاییەوە رێیان تەی دەکرد، ئاسمان‌و زەوی لە دلّیاندا پەیوەست بووبوون، هەتا ماتترین بەردو پڕ لە خوداوە بریقەی دەدایەوە، کریست تەنها لە پێشەوە دەڕۆیشت، زەینی بەستی پشتی بەخودا بەستابوو، دەیزانی کە عاقیبەت تەواوی پردەکانی دواوەی خۆی خراکردووەو رێگەی گەڕانەوەی نییە، چارەنووسی ئەو پێشتر لە جولە دابوو خۆی بەدوایدا دەچوو، هەرچییەك کە خودا بڕیاری لێداوە هەر ئەوە روودەدات، چارەنووسی ئەو؟ لە پڕێکا دووبارە دەنگی هەنگاوێکی رازداری بیست کەوا بێڕەحمانە لەم ماوەیەدا لەدوای ئەودا هاتبوو، گوێی قولاّغ کردو گوێی دایێ، هەنگاوەکان توندوموحکەم‌و موکڕبوون، بەلاّم ئێستا بەدوایەوە نەبوون، لە پێش ئەودا لە بزاوتن دابوون‌و رێنماییان دەکرد، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە (واباشترە، باشتر، ئیدی رێ ون ناکەم)) بەشادمانیەوە هەنگاوەکانی درێژتر هەلّدێنا، وای دەهاتە بەرچاو کە پێیەکان پەلەیان دەکرد، بۆ پێشەوە دەچوو بەبنی لێویەوە بە رێنمایی نادیاری دەگوت ((بۆ پێشەوە بۆ پێشەوە)) بەسەر بەردو

چاڵەکانەوە بازی دەداو پەلەی دەکرد، لە پڕێکا هاواری کرد، ئازارێکی وەحشەتناکی لەدەستو پێیدا هەست پێدەکرد، وەك بڵێی بزمار رۆچۆتە جەستەیەوە، کەوتە سەربەردێکەوە، ئارەقەیێکی سارد لەسەرو رووخساریدا هەڵڕژا، بۆ ساتێ سەری گێژ بوو، زەمین لە ژێر پێکانی نەماو ئۆقیانووسێکی رەش لەبەرابەریا پان پۆڕ بۆوە، لە پانتایی بێ سنووری ئەو ئۆقیانووسە شتێ جگە لەیەك بەلەمێکی چارۆگەدار هیچی دیکە نەبوو کە بێباکانە بۆ پێشەوە دەچوو، کریست سەیری کردو دووبارە سەیری کردەوە، ئەوکاتە بزەیێکی کرد بەبنی لێویەوە گوتی ((دڵی منە...دڵی من)) سەری ئارامی گرت، ئازارەکان پاشەکشەیان کرد، لەو کاتەدا کە حەوارییەکان گەیشتنو ئەویان بەسەر بەردەوە بینی کە بە ئارامی دانیشتوە بزە دەکاو گوتی ((کوڕینە بۆ پێشەوە... خێراتر))و هەڵسایەوە.



## بەشی بیستو یەکەم

هێنایان، شەممە کوڕێکی نازپەروەرە بەسەر ئەژنۆکانی خوداوە ئارامی گرتووە، ئاوەکان هەمڕاهی ئەو ئارام دەگرن، مەلەکان دەست لە دروستکردنی هێلانە هەڵدەگرن، مرۆڤەکان کارناکەن، جل دەپۆشنو خۆیان دەڕازێننەوەو دەچنە کڵێساوە، تا دانیشنو تەماشای خاخام بکەن کە کتێبی پیرۆز، کتابی سوورو رەشی وشەکانی شەریعەتی خودا دەکاتەوە، دەچێتە ناو دووتوێی هەر وشەیێ، هەر بەشێ بە هونەرمەندییێکی گەورەبوو ویستی خودا کەشف دەکاو دەیچرپێنێتە گوێچکەی ئەوانەوە.

ئەمڕۆ شەممەیە، لە هەمان ساتدا باوەڕداران کڵێسای ناصیرە جێدەهێڵن، چاوەکانیان کە هێشتا لەژێر پەردەی ئەو سروشانە بوو کە خاخامی پیر بەسەر رووخساریانا قەراری دابوو، لە چاوەکانیاندا نوور زۆر بەهێزە، وەکو نابیناکان هەڵدەخزن لەمەیدنی دێدا پەرشو بڵاودەبنەوەو لەژێر درەختە بەرزەکانی کاژەوە لەسەرخۆ دەکەونە پیاسەوە تا پارسەنگی خۆیان وەدەست بێننەوە. ئەمڕۆ خاخام کتێبی پیرۆزی خۆی دانابوو کە رێکەوت ببێتەوەو بەسەر ناحوم پێغەمبەرا کرایەوە دیسان بە رێکەوت پەنجەی خۆی درێژ کردو بەسەر ئەو ئایەتە پیرۆزەوە قەراری گرتبوو ((ئێستا بەسەر بەرزایی کێوەکانەوە دەنگی پێی کەسێ دەبیستریێ کە هەڵگری موژدەیە))

خاخامی پیر ئەم وشانەی دووبارەو دووبارە دەخوێندەوە، لە هەوڵی دۆزینەوەی مانا شاراوەکاندا بە ئارەقەوە دانیشتو هاواری کرد.

-کریستیانو، ئەو لە حالّەتی دەرکەوتندایە، سەیری دەوروبەری خۆتان بکەن، لەناخی خۆتان تەماشا کەن، نیشانەی هاتنی لە هەموو شوێنێکەوەیە، لە دەروونی ئێمەدا، تووڕەیی، نەنگ، ئومێدو هاوار ((ئیدی بەسە))و سەیری دەرەوە بکە! هەرماس بەسەرتەختی جیهانەوە دانیشتووە، جەستەی رزیوی مرۆڤی بەسەر ئەژنۆیەوەیەو دەیلاوێنێتەوە، بەسەر ئەژنۆکەی تریشی رۆحی سۆزانی هەڵگەڕاوی مرۆڤ، ئەو سالأنەی کە پەیامبەرەکان پێشبینیان کردبوو، گەیشتوون، ئەمە خودایە بەدەمی پەیامبەران قسە دەکات کتێبی پیرۆز بکەوە، چی دەڵێن؟ هەر لەوکاتەی کە سراییل لەتەختی خۆی دابەزیو خاکی پیرۆزی ئێمە کەوتبووە بەر لەقەی وەحشیان دیماهی دونیا هاتووە))و دیسان ((دواهەمین پاشا، پاشاییێکی خراپکارو بێ دینو مولحید دەبێ، کوڕەکانی ناشایستە دەبنو تاجی سراییل دەکەوێ)). پاشای خراپکارو بێ دین هات: هرودیس! کاتێ کە بۆ چارەسەری خۆی منی بانگ کردە (ئەریحا) بەچاوانی خۆم ئەوم دیت، گیا شفابەخشەکانم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتو چوومو لەو ڕۆژەوە بەدوا نەمتوانیوە لێو لە گۆشت بدەم، چونکە جەستەی گەنیوی ئەوم بینی، لێوم لە شەراب نەدا چونکە خوێنی کرماوی ئەوم بینی، سی ساڵ دەبێ بۆنی گەنیوی ئەوم لە لووت ماوە،... ئەو مردو جەستەی بۆگەنی بوو، کوڕەکانی هاتن: هەموویان پاشماوەییێکی ناشایستەو بێتام بوون، تاجی شاهانەیان لەسەر کەوتەخوار)). لەبەر ئەمە پێشبینیەکان گەیشتنە ئەنجام، کۆتایی دونیا هاتووە. دەنگێ لەکەناری رووباری ئوردن دەنگی دایەوە کە ((ئەو لە حالّی دەرکەوتن دایە))و سەدایی لە دەروونمان دەنگی دایەوە کە ((ئەو لەحالّەتی دەرکەوتن دایە)) من پیر بووم، چاوانم تار بووەو ددانەکانم وەرینو ئەژنۆکانم سست بوون، بەلأم پڕ لە شادیم، چونکە خوداوەند وادەی بەمن داوەو گوتی:

((شەمعون بەر لە دیتنی کریستیانو تۆ دونیا جێناهێڵی)) بەمجۆرە هەر چەند لەمەرگ نزیکتر دەبمەوە کریستیانو ئەوەندە نزیکتر دەبێتەوە، رۆڵەکانم ئازابن کۆیلەتی بوونی نییە، هەرواش هەرماسو رۆحەکان، تەنها کریستیانو هەیەو ئەویش لە حالّەتی دەرکەوتن دایە. پیاوان چەك بگرنە دەست: ئەوە جەنگە! ژنان مەشخەڵەکان داگیرسێنن، وا زاوا دەگات! ئێمە سەعاتو دەقیقەی نازانین، رەنگە ئەمڕۆبێ، رەنگە



سبەی، بێدار بمێنینەوە، دەنگی دەرپەڕینی بەردی ژێر پێی ئەو دەبیستم، ئەو لە حالّەتی دەرکەوتندایە، بڕۆنە دەرەوە، لەوانەیە ئەو ببینن. خەڵکی چوونە دەرەوەو لەژێر درەختە بڵندەکانی خورماوە پەرشو بلأوبوونەوە. وشەکانی خاخام لەڕادەبەدەر نارێك بوون، گوێگرەکانی ئەو لە هەوڵی ئەوە دابوون، تا تەواو لە بیری بکەن، تامەگەر مەشخەڵە خرۆشاوەکان کزببنەوەو رۆحی ئەوان جارێکی دی ببێتە پەیوەندی رۆژانە، لە هەمان حالّدا کە ئەوان پیاسەیان دەکردو بەنیگەرانیەوە چاوەڕوانی نیوەڕۆ بوون تا بگەڕێنەوە ماڵەکانیانو بە قسەوباسو خواردن وشە پیرۆزەکان لەبیر بکەن، سەیرکە یەکسەر کوڕی مێرێ بەجلی پارەپارەو پێی پەتیو رووخساری وەك هەورەتریشقە، لەبەردەم ئەواندا سەوزبوو، چوار کەس لە یاوەرەکان لەدوای ئەوەوە بوونو لەدوای ئەوانیشەوە یەهودای ریش سوور بوو.

دێ نشینەکان سەریان سوڕما، ئەو زبڵو خاشاگانە هی کێن؟ ئەرێ ئەوەی لە پێشەوە جولە دەکا، کوڕی مێرێ نییە؟

- سەیری ری رۆیشتنی ئەوان بکەن، بازووەکانی دێنێتە پێشەوە وەکو باڵ وەبەر هەمووان دەنێ، خودا کەللەی پڕ لە با کردووەو خەریکە دەفڕێ.

- چۆتە سەر بەردێکەوەو هێمایان بۆ دەکا ئارەزووی قسانی هەیە.

- باشتر وایە بڕۆینو خۆمان خەریك بکەین.

لە راستیدا کریست لە ناوەندی مەیدانەکەوە چووبووە سەر بەردێکەوە، خەڵکی بەخەندەوە کۆببوونەوە، بەپەیدابوونی ئەو سەرەڕۆیە خۆشحاڵ بوون، ئێستا ئەوان توانایان هەبوو کە قسە پڕ هەیبەتەکانی خاخام لەبیربکەن، بەوانی گوتبوو ((ئەوە جەنگە، بێدار بمێننەوە ئەو لەحالّەتی دەرکەوتندایە)).

ساڵەهای ساڵ بوو ئەو نەغمەیەی دەچرپاندە گوێیان ئیدی بێزار بووبوون ئێستاش سوپاس بۆ خودا، کە کوڕی مێرێیان دۆزیەوەو یارمەتیاندەدا لە هێمن کردنەوەی زەینیان، کریست بە راتەکاندنی بازووەکانی خۆی هێمای بۆ کردن کە کۆببنەوە، شوێنەکە پڕ بوو لە ردێنو کلأوو جلی کراوە، هەندێ لەوان بۆ فەرامۆشکردنی

برسیەتی خەریکی خواردنی خورما بوون، هەندێکیان تۆ گولەبەرۆژەیان دەقرتاند پیرترین و لەخودا ترساوترینیان تەسبێحیان هەڵدەسووڕاند، چەند گرێیەکی وردیان بەپارچەیێکی شین لە دانەکانی تەسبێح دابوو کە هەریەك لەو گرێیانە هەڵگری ئایەتێکی کتێبی پیرۆز بوون.

چاوانی کریست بریقەی دەدایەوە، سەرەڕای ئەوەی کە بەرەو رووی ئەو هەموو حەشاماتە وەستابوو، زەڕڕەیێکی ترس لەدڵ نەبوو، لێوەکانی لێك کردەوەو هاواری کرد (برایان، گوێکانتان بکەنەوە، پەنجەرەی دڵتان بکەنەوە، ئەو قسانەی کە دەیخەمە سەر زمان ببیستن: ئەشعیا هاواری کرد:

ڕۆحی خودا بەناو مندا هەڵدەڕژێ ئەو منی هەڵبژاردوە تا بۆ هەژارەکان مژدە بهێنم، ئەو منی ناردوە تا چاوەشی چڕینی ئازادی بم بۆ کۆیلەو نووربم بۆ نابیناکان)) برایان ئەو رۆژە موژدە بەخشە هاتووە، خودای سراییل منی ناردوە تا موژدەتان پێ ببەخشم، ئەو لەبیابانی یەهودیە منی چەور کردو لەوێوەیە کە دێم، رازێکی گەورەی نایە سەر ئەستۆی منەوە، وەرمگرت و لەمیانی دەشت و کێوەکانەوە راهاتم- مەگەر گوێتان لە دەنگی پێم نەبووە بەسەر گردەکانەوە؟ پەلەم کردە ئێرە کە زادگای خۆمە تا بۆیەکەمین جار بانگەشەی ئەو خەبەرە خۆشە لێرە بکەم.. ئەو خەبەرە خۆشەچییە؟

((مەلەکوتی ئاسمان گەیشتووە!))

پیرەمێرد کە قەمبوری دووقوچەی لە گردی پشتی وشتر دەچوو، تەسبێحی بەرز کردەوەو گوتی ((کوڕی نەجاڕ ئەو قسانەی کە دەیکەیت نادیار بێ پایەن (مەلەکوتی ئاسمان) (عەدالەت)و ((کوڕینە هەرچییەك دەگاتە دەستتان هەڵیگرن هەمووی بۆ ئەوە)). گوێم لەوانە پڕ بووە، موجیزە ...موجیزەم لەتۆ دەوێ کەلێرەو هەر ئێستا کاربکەی، پەرجوویێ دەرخە تا باوەڕت پێ بکەین دەنا ونبە، کریست وەلآمی دایەوە ((پیرەمێرد هەموو شتێ پەرجوویە چ پەرجوویەکی دیت گەرەکە؟)) سەیری ژێرپێیەکانت بکە هەتا بچووکترین رمەگیایێ فریشتە ئاگاداری دەکات ولەکەناریا وەستاوەو یارمەتی رزگاربوونی دەدات، سەیری بالآی سەرت بکە ئاسمانی پڕ ئەستێرە چ پەرجوویێکەو دڵی ئێمە ئاسمانێکی چەند پڕ ئەستێرەیە!))



خەڵکی بەسەر سامی گەڕانەوە بۆ یەکتری و گوێیان لەقسەی ئەو رادەگرت.

– ئەو کوڕەی مێریێ؟ چۆن بەم قودرەتەوە قسە دەکات؟

– ئەوە هەرماسێکە لە دەمی ئەو قسە دەکات، براکان لەکوێن تا ببینن کە قەپ لەکەسێ نەدا؟

– قسە مەکە دووبارە دەمی کردەوە.

برایان رۆژێ خودا هاتووە، ئایا ئامادەن؟ چەند سەعاتێ زیاتر هەڵتان بۆ نییە؟ هەژارەکان بانگ کەن و شتەکانی خۆتان دابەش کەن، ئێوە چ خەمێکتان بۆ حاڵی دونیا هەیە؟ ئێوە چ خەمێکتان بۆ حاڵی دونیا هەیە؟ وا ئاگرد دێت بۆ سووتاندنی، بەر لە مەلەکوت، مەلەکوتی ئاگرە لە رۆژی خودا، بەردی ماڵەکانی دەوڵەمەندان لە جێوە رادەبن و هەڵدەکوتنە سەر دانیشتوانەکانی، لە سیمی زێری ناو سندوقچەی دەوڵەمەندان عەرەق دەردەهێنێ و بەسەر رووی پارەدەرانی عەرەقەوە خوێنی هەژاران هەڵدەڕژێ، ئاسمان دەبێتەوە، لافاوو ئاگر هەڵدەڕژێتە خوارەوەوکەشتییێکی تازەبەسەر بەرزایی مەشخەڵەکانەوە مەلەدەکات، کلیلەکان لە دەستی منن، دەرگای کەشتی دەکەمەوەو هەڵدەبژێرم، برایانی ناصیرەیی من لە ئێوەوە دەست پێدەکەم، ئێوە یەکەم کەسانێکن کە داوەتتان دەکەم، وەرن، بچنە ناویەوە، مەشخەڵی خودا پێشتریێ دابەزینی خۆی دەست پێکردووە.

ئاپۆڕەکە لە میانی قاقاوە هاواریان کرد ((هێ....هێ! کوڕی مێریێ بۆ رزگار کردنی ئێمە بەدەرکەوتووە!)) چەند نەفەریێ لاربوونەوە بەردیان گرتە دەست و لە چاوەڕوانی دا مانەوە.

لە شیرازەی مەیداندا سەروپۆتەلآکێکی بەپەلە بەدیار کەوت. فیلیپ ی گەنج بوو، هەرکە خەبەری هاتنەوەی هاوڕێکانی بیستبوو، بەغار هاتبوو، چاوەکانی وەك بڵێی لەبەر کاریگەرێتی گریان هەڵمسابوو وەکو مەشخەڵی لێهاتبوو، گۆناکانی شۆڕبووبوونەوە، دروست هەر لەو رۆژەی کە هاوڕێکانی دەریاچەیان جێهێشتبوو

خوداحافیزیان کردبوو بە خەندەوە هاواری کردبوو کە ((من نایەم، من مەڕم هەیە، لەکوێ دەتوانم رەهایان بکەم))

دەستەی دزان لە لوبنان سەرەوژێر بووبوونەوەو ئەویان دەستگیر کردبوو، شتێ جگە لە شوانی بۆ ئەو نەمابۆوە، هێشتا گۆچانەکەی پاراستبوو لە گوندێکەوە بۆ گوندێو لەکێوێکەوە بۆ کێوێ، وەکو پاشاییێکی لێخراو دەڕۆیشتو بەدوای مێگەلەکەی خۆی دەگەڕا، جوێنی دەداو هەڕەشەی دەکرد، خەنجەری تیژ دەکردو دەیگوت دەیەوێت بچێتە لوبنانەوە، بەلاّم شەوانە کە تەنها دەمایەوە دەگریا، ئێستا ئەو بەپەلە بوو تا بگاتە دۆستەکانیو ماجەراکە بگێڕێتەوەو هەموو بەیەکەوە بچینە لوبنان، دەنگی خەندەو هەراو هۆریای بیست، لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((لەوێ چ خەبەرە؟ بۆ پێدەکەنن؟ نزیکتر کەوتەوە.

کریست ئێستاکێ تووڕە بوو بوو، هاواری کرد: ((بە چ پێدەکەنن؟ بۆبەرد کۆدەکەنەوە، تا لەسەری کوڕی مرۆڤ بدەن؟ بۆچی بۆ مالّەوەتان، زەیتونستانو مێوستانی خۆتان گەورە دەکەن؟ دەبا ببێتە خۆلّەمێش.. خۆلّەمێش! کوڕانو کچانتان ببنە خۆلّەمێش، مەشخەلّی تاراجکەری گەورە گەورە لە کێوکانەوە هێرش دەکاتە سەرتان تا مەڕەکانتان بڕفێنن، فیلیپ کەخۆی هاوێشتبووە سەر گۆچانەوە، بەبنی لێویەوە گوتی ((کام تالاّنکەر..کام مەڕ؟)) ئەو مەشخەلاّنە ئیدی کامیانن کە دادەبەزێتە سەر ئێمەوە؟ لە کاتێکا کریست قسەی دەکرد ئاپۆڕەی خەلّکی رووخسار زەردو خاراو دەگەیشتن، ئەوان بە وەدیارکەوتنی پەیامبەری تازەی هەژاران خەبەرداربوونەوەو بەغار هاتبوون، دەگوترا کە لەناو دەستێکیدا ئاگری ئاسمانی بۆ سووتاندنی دەولّەمەندان راگرتبوو لەناو دەستەکەی تریشدا تەرازوو هەبوو، تا سەروسامانی ئەوان لەمیانی هەژاران دابەش بکات، ئەو موسای تازەبوو، کە یاساییێکی تازەترو عادیلانەتری هێنابوو، خەلّکی بەسەر سامی وەستابوونو گوێیان لێ ڕادەگرت، گەیشتبوو گەیشتبوو! مەلەکوتی هەژاران گەیشتبوو!

بەلاّم لەوکاتەی کە کریست دووبارە ویستی لێو بۆ قسە بکاتەوە چواربازوو کەوتە سەریەوە، دەستگیریان کردو لەسەربەرد هێنایانە خوارەوە بەپەلە لە کندڕێکی قەبەیان



پێچایەوە، کریست گەڕایەوەو کوڕانی یوسفی بینی- برایانی خۆی، سیمونی گۆجەو یاکوبی پارس، ئەوان لە کاتێکا ئەویان بەدوای خۆیان پەلکێش دەکرد هاواریان کرد ((بڕۆ مالّەوە یالّلاّ بڕۆ ژوورەوە، هەرماس تۆی تەسخیرکردووە!))

کریست هاواری کرد ((من مالّم نییە رەهام کەن، مالّی من ئێرەیە، ئەوانە براکانمن))- هێمای بۆ ئاپۆڕەکە کرد.

دێنشینەکانیش بە خەندەوە هاواریان کرد (( بڕۆ مالّەوە بڕۆ مالّەوە)) یەکێ لەوان بەردەکەی دەستی بۆ لای ئەو هاوێشت، بەردەکە بەنێوچەوانی کریست کەوت یەکەمین دلّۆپە خوێن رژا.

پیرەمێردی قەمبوور بەقیژەو هاوارەوە گوتی ((بابمرێ، با بمرێ ئەو ساحیرێکەو دەیەوێ سیحرمان لێ بکات، بانگی ئاگر دەکات تابێتو سوورمان کاتەوەو ئاگریش دێت!))

دەنگی (بابمرێ.. بابمرێ)) لە هەموو لاییێکەوە دەهات. پەترۆس بۆ پێشەوە رایکرد هاواری کرد (شەرم لە خۆمان بکەینەوە مەگەر ئەو چی لە ئێوە کردووە؟ ئەو بێگوناهە).

گەنجێکی زەبەللاح هێرشی کردە سەر ((هەبێو نەبێ تۆ لایەنگیری ئەوی ها؟))
قوڕقوڕاگەی ئەوی گرت.

پەترۆس لە کاتێکا هەولّیدەدا تا دەستی زەبەللاحەکە لەگەروی بکاتەوە قیژاندی (نە...نە من لایەنگیری ئەو نیم، سێ یاوەرەکەی دیکەی کریست لە ترسان ئەژنۆیان شل بوو بوو، یاکوبو ئاندریاس لە کەنارێ وەستابوونو خۆیان بەسەر دەکردەوە، چاوانی یۆحەننا پڕ لە ئەشك بووبوو، بەلاّم یەهودا لەمیان ئاپۆڕەکەوە رێی خۆی کردەوە، هەردوو برایە تووڕەکەی لەئوستاد دوورکردەوە، کندڕەکەی کردەوە، هاواری کردە سەریان (یالّلاّ بڕۆن گوم بن، دەنا لەگەلّ مندا دەبنە لایەنگیر!))

سیمۆنی گۆج بەقیژەوە هاواری کرد (بۆ فەرماندان فەرموو بڕۆوە شارەکەی خۆتان)).

یەهودا هاتە نێوەوەو گوتی: لەهەر کوێیەك مشتەکۆڵەم کاربکات لە هەمان جێگادا فەرماندەدەم)) ئەو کاتە رووی لەچوار یاوەرەکە کرد ((شەرم ناکەن کە پێشتر نکوڵی ئەو دەکەن؟ یاڵلاّ بۆ پێشەوە، بەدەوریا ئەڵقەیاندا تادەستی کەسی نەگاتی!)) چوار یاوەرەکە شەرمیان لەخۆ کردەوە، هەژارو کۆنەپۆشان بۆ پێشەوە هەڵبەزینو هاواریان کرد: (( برایان ئێمە لایەنگیری ئێوەین وەرن با بیانکوژین!)) دەنگێکی کێوی هاواری کرد ((منیش لەگەڵ ئێوەم)) فیلیپ گۆچانەکەی لە هەوادا رادەوەشانو لەمیانی ئاپۆڕەکەدا رێی کردەوە ((منیش وادێم))

ڕیش سوور وەلاّمی دایەوە ((فیلیپ بەخێر بێی، وەرە بەگەڵمان بکەوە، هەژارو مەزلوومەکان هەموو بەیەکەوەن)). لادێنشینەکان کە ئەو کەپرنشینانەیان بینی لەدژی ئەوان شۆڕش دەکەن لە تووڕەییان شێت بوو بوون ((کوڕی نەجاڕ هاتووە تا ئەو بیرۆکانە لەزەینی هەژاران، چێ کات تا نەزمی چەسپاوی دونیا تێکهەڵرێژن، مەگەر نەتانبیست کە گوتی یاساییێکی تازە دەهێنێ؟ (بابمرێ بابمرێ) وەکو ئەسپوند بازیان دەدایە هەواوە، هەندێکیان بە گۆچانو هەندێکیان بە چەقۆوە هەندێکیشیان بەبەرد هەڕەشەیان دەکرد، پیرەمێردەکان لەکەنار وەستابوونو هانیاندەدان، دۆستانی کریست لە شیرازەی مەیدان دا لەپشت دارچنارەکان سەنگەریان گرت، ئەوانی دیکە هێرشیان کردە مەیدان، کریست خۆشی چووە پێشو لەمیانی دوو گروپی دژ بەیەك وەستا، بازووەکانی کردەوەو هاواری کرد ((برایان برایان!))، بەلاّم کەس گوێی پێنەدەدا، ئێستاکێ بەردەکان لەڕووی تووڕەییەوە دەهاوێشترانو یەکەمین بریندارەیان نالەی سەردابوو،

لە کووچە باریکەکاندا ژنێ هاتە دەرەوە، چەفیەیێکی ئەرخەوانی تەواوی رووخساری جگە لە نیوەی دەموچاوی رەشو درشتی کە لە ئەشك غەرق بووبوو داپۆشی بوو، بەتەواوی هێزەوە هاواری کرد ((بۆ خاتری خودا.. نەیکوژن)) خەڵکی بەبنی لێویانەوە گوتیان ((دایکی .. مێرێ!))، بەلاّم پیرەمێردەکان لەو کاتەدا چۆن دەیانتوانی رەحم بەحاڵی ئەوی دیکە بکەن، ئەوان هار بووبوونو هاواریان دەکرد ((بابمرێ..بابمرێ! ئەو هاتووە خەڵك وریا بکاتەوە شۆڕشێ بەرپابکەن، تا سەروسامانمان لەمیانی بێ



سەروپێکان دابەش بکەن... بابمرێ)) غەنیم بە یەکەکان ئێستاکە دەستەویەخە بووینە، دوو کوڕی یوسف بەسەر زەویەوە هەڵدەخزینو هاواریان دەکرد، یاکوب بەردێکی هەڵگرتبوو، سەری ئەوان شەقی بردبوو، یەهودا بەخەنجەر هەڵکێشانەوە لەبەردەم کریست وەستابوو،مادۆنی کەسی نەدەدا لە کریست نزیك ببێتەوە، فیلیپ بە یادەوەری مەڕەکانی ئیدی نەیتوانی خۆی راگرێ، کوێرانە گۆچانی بەسەر سەری غەنیمەکاندا دەدا، دەنگی مێرێ دووبارە بیسترایەوە ((ئەو نەخۆشە ئەقڵی لەدەست داوە، ئێوەوخودا رەحمی پێبکەن)) بەلاّم سەدای ئەو لەنێون هەراوزەنادا ون بوو، یەهودا ئێستاکێ بەهێزترین تاکی گروپەکەی بەسەر زەویدا درێژکردبوو خەنجەرەکەی دانابووە سەر گەرووی، بەلاّم کریست لە کاتی پێویست خۆی گەیاندێ تا پێش لە یەهودا بگرێت: برام یەهودا، خوێن...، نا... خوێن.. خوێن.. نا

یەهودا بەتووڕەییەوە هاواری کرد ((ئەی چی...ئاو؟ لەبیرت کرد کە تەورت لەناو دەستە؟ زەمانی موژەدەبەخش گەیشتووە)) هەتا پەترۆسیش لەبەر کاریگەرێتی ئەو لێدانەی کە بەو کەوتبوو، تووڕە بووبوو بەردێکی گەورەی دەست دایێ کەوتە گیانی پیرەمێردەکانەوە، مێرێ خۆی هاوێشتە ناوەندی شەڕەکەوەو لەکوڕەکەی نزیك کەوتەوە، دەستی ئەوی گرتو گوتی ((ڕۆڵەم چیت بەسەر هاتووە؟ بۆ کەوتویتە ئەم رۆژەوە؟ بگەڕێوە ماڵەو، خۆت بشۆ جلت بگۆڕە، سۆلەکانت لەپێ بکە، پۆخڵی لەسەرورووخسارت دەبارێ!))

– من ماڵم نییە.. من دایکم نییە تۆ کێی؟

دایکە کەوتە گریانەوەو، گۆناکانی دەڕنیەوەو ئیدی قسەی نەدەکرد. پەترۆس بەردەکەی هاوێشتو بەرد بەپێی پیرەمێردە قەمبورەکە کەوت، ئاخێ لە بەدەروونی پیرەمێرد هەڵسا بەلینگە لینگ لەمیانی کووچە دوای کووچە بۆلای ماڵی خاخام چوو بەلاّم خاخام لە هەمان ساتدا لە حاڵێکا هەناسەبڕکێ بووبوو، گەیشت، ئەو کە لەناو کلێسادا سەری بردبووە ناو کتێبی پیرۆزەوە لە هەوڵی ئەوەدابوو کە ویستی خودا لە وشەکان دەربهێنێ، بەبیستنی هەراوزەنا لە جێوە هەڵبەزی بۆوە، بەلاّم لەوکاتەی کە

لە هەراوزەنا ئاگادار بووبۆوە گۆچانەكەی دەست دايیٚو بە سەراسيمەيی رايكرد تا ببينیٚ چ خەبەرە.

لەرێگادا رووبەڕووی چەند كەسێكی بريندار بۆوەو لە هەموو شتیٚ گەيشتبوو، ئەو ئێستاكە ئاپۆڕەكەی وەلاناو خۆی گەياندە كوڕی مێرێەوە، بەتووڕەيی گوتی:

كريست ئەوە چ بەزمێكە داتناوە، ئەوە تۆی هەڵگری عەشق؟ ئەوە ئەو عەشقەيە، كە هێناوتە؟ شەرم ناكەی ؟

ئەوكاتە رووی لەلای ئاپۆڕەی خەڵك كرد گوتی:

((رۆڵەكانم بگەڕێنەوە ماڵەكانتان، ئەوە برازای منە، مرۆڤێكی نەخۆشو بەدبەختە، ساڵەهايە نەخۆشە، بە قسەكانی ئەو كينە لەدڵ هەڵمەگرن، لێی ببوورن، ئەوە ئەو نييە كە قسە دەكات، بەڵكو كەسێكی ديكەيە كە بەزمانی ئەو قسە دەكات.

كريست گوتی ((ئاخ خودای من!))

خاخام هاتە ميانو گوتی (( بێدەنگ بە)) بەسەرزەنشت ئامێزەوە گۆچانێكی لێدا، جارێكی دی رووی لە ئاپۆڕەكە كرد (( كوڕەكانم لەو گەڕێن، رقی لیٚ هەڵمگرن چونكە نازانی چی دەڵیٚ، هەموو ئێمە لە هەژارو دەوڵەمەندان، لەپشتی (ئيبراهيم)ين، كێشە مەخەنە ميانی خۆتانەوە، نيوەڕۆيە، بگەڕێنەوە ماڵەكانتان وا من ئەو مرۆڤە بەدبەختە چارەسەردەكەم)).

پاشان رووی لەمێریٚ كرد ((مێریٚ بگەڕێوە ماڵەوە من هەر ئێستا دێم)) دايكە دوا نيگای خۆی كردە كوڕەكەی، نيگايێكی پڕ لە تاسوق، وەك بڵێی بۆ هەميشە ماڵاوايی دەكات، ئاخی هەڵكێشا قەپی لە چەفيەكەی خۆی گرتو لەميانی كۆڵانە باريكەكانەوە ون بوو.

لەهەمان كاتدا كە خەڵك خەريكی يەكتر كوشتن بوون، هەور ئاسمانی داپۆشیو باران باریو زەوی تێركرد.



بايێك هەڵيدەكرد، چلی دواهەمين گەڵای دارچنارو هەنجير لە لقەكان دەبوونەوە، گەڵاكان بەسەر زيودا پەرشو بڵاو دەبوونەوە، مەيدانەكە خاڵی بوو بوو.

كريست بەرەو فيليپ گەڕايەوەو دەستی درێژ كرد (برام فيليپ بەخێر بێی) فيليپ بە گوشينی دەستی كريست وەڵامی دايەوە: ((مەولای من خۆشحاڵم بەديدارت، ئەوكاتە گۆچانی خۆی بەوداو گوتی ((ئەو بگرەو پاڵی پیٚ بدە))

كريست گوتی ((وەرن يارانی من باشترە بڕۆين، پێتان لە تۆز پاك كەنەوە ماڵاوا ناصيرە!

خاخامی پير گوتی ((تا شيرازەی دیٚ لەگەڵ ئێوە دێم تا كەسیٚ بەخەتان نەگریٚ)) دەستی كريستی گرتو لەگەڵ يەك بۆ پێشەوە كەوتنە ریٚ، خاخام هەستی كرد كە لەپی كريست خەريكە دەسووتێت گوتی: ((كوڕم ئەوەندە سەودای ئەوانی ديكە مەبە، لەناودەچيت)).

باوكە من خۆم سەوداييێكم نييە، كەواتە لێگەڕیٚ با سەودای ئەوانی دی فەنام بكەن.

ئەوان ناصيرەيان لەدوای خۆيانەوە جێهێشت، باخەكانو پشتی باخەكان، كێڵگەكان، بەدياركەوتن، حەوارييەكان لەكەنار كانييیٚ وەستابوون، تا برينی خۆيان بشۆنەوە، ژمارەييێكی زۆر لە هەژارو نەخۆشەكان لەگەڵ ئەواندا بوون، جگە لە دوو نابينا، چەنەبازيان دەكردو لە چاوەڕوانی دابوون، كە پەيامبەری تازە دەست بكات بە پەرجووكانی. وەك بڵێی لە جەنگێكی گەورە دەگەڕانەوە، بەڵام چوار حەوارييەكە بە بێدەنگی رێيان تەی دەكرد، لە حاڵەتی شڵەژاندا بوونو پەلەيان دەكرد بگەن بەكريستو ئاراميیان پیٚ ببەخشی، زادگای ئوستاد دەريكردبوون، نەبەردە گەورەكە سەرتاييێكی خۆشی نەبوو، لەبەرخۆوە دەيانگوت: ((ئەگەر لە كاناو كفرناحومو هەر جێگاييێكی دی لە دەوروبەری دەرياچەی گنسارت دەركراين چيمان بەسەردێت؟ دەبیٚ بۆ كویٚ بچين؟ قسەی خودا بچرپێنينە گوێی چ كەسیٚ؟ لە شوێنێك كە خەڵكی سرائيل ئێمە قبوڵ نەكەن دەبیٚ روو لە چ كەسیٚ بكەين؟ گاورەكان؟)) چاويان بڕيبوە كريستەوە، بەڵام هيچ يەكێكيان دەميان نەكردەوە، وەڵیٚ كريست ترسی لە چاوانی

ئەوان خوێندەوەو دەستی پەترۆسی گرت ((ئەی پەترۆسی کەم باوەڕ، جانەوەرێکی ڕەش بەپرچێکی ڕەشی بریقەدارەوە بەسەر گلێنەتەوە هەڵکورماوەو دەلەرزێ، ئەو جانەوەرە ترسە، ترس، دەترسی؟

– مەولای من کە لە تۆ دوورم بەڵێ دەترسم هەر بۆیە هاتوومەتە نزیکتەوە، لەبەر ئەمەیە کە ئێمە هەموومان هاتووینەتە نزیك، قسەمان بۆ بکەو دڵنیایی ببەخشە دڵمانەوە.

کریست پێکەنی‌و گوتی: کاتێ کە سەرم لە قووڵایی ڕۆحم دەبەمە خوارەوە، نازانم چۆن ڕاستی تیادا بەشێوەی مەسەل بەدیاردەکەوێ، لەبەر ئەمە دۆستان جارێکی دیکە بەمەسەل قسەتان بۆ دەکەم:

– کێ لە گەورەکان دەستوریدا تا بۆ زەماوەندی کوڕەکەی میوانداریێکی مەزن بەرپا بکات، هەرکە سەری گاکانیان دەبڕی‌و سفرەیان ڕاخست، غولامانی خۆی نارده دوای داوەتکراوەکان کە ((هەموو شتێ ئامادەیە لووتف بکەن‌و وەرنە زەماوەندەوە)) بەڵام هەموویان بەیەك ڕا عوزرخوازیان کرد، یەکەمین گوتی ((من مەزراییێکم کڕیوەو دەبێ بچم بیبینم))

دووەم گوتی ((من خۆم تازە زەماوەندم کردووەو ناتوانم بێم)) سێهەمیان گوتی: من پێنج جووتەگام کڕیوە دەچم تا سەیریان بکەم‌و تاقیان بکەمەوە)) غولامەکان گەڕانەوە بەمەولای خۆیان گوت ((هیچ یەك لە داوەت کراوەکان ناتوانن بێن‌و دەڵێن گرفتاریمان هەیە)). مەولای ئەوان تووڕەبوو گوتی ((یەکسەر پەلەکەنە مەیدان‌و ڕێگاکانی هەژارو شەوکوێر کۆکەنەوە ماڵەم پڕ لە داوەت نەکراوەکان دەکەم تا لە جەژنی زەماوەندی کوڕەکەم بخۆنەوەو شادی بکەن))

کریست لەقسەکردندا دووبارە وەستا: قسەی خۆی دەستپێکردبوو، بەڵام هەرچەند زیاتر قسەی دەکرد، زیاتر ئەندێشەی خەڵکی ناصیرەو یەهودیەی دەکرد، تووڕەیی لەچاوەکانی هەڵدەبەزیەوە، حەواریەکان بەسەرسامی سەیری ئەویان دەکرد، پەترۆس کە لە ڕووی نائومێدیەوە سەری دەخوراند گوتی: ((داوەت کراوەکان‌و داوەت



نەکراوەکان چ کەسانێ بوون؟ چ جۆر زمانێکە مەولای من لێمان ببوورە، بەڵام ئێمە تێناگەین)).

کریست گوتی ((تێدەگەی، لەوکاتەی کە داوەتکراوەکان بانگ دەکەم تا بێنە ناو کەشتیەوە ئەوان سەرپێچی دەکەن، تێدەگەی، ئەوان دەڵێن کە مەزراو ڕەزو ژنیان هەیە، چاووگوێ‌و لێوو لووت‌و دەستیان پێنج جووت گان کە خەریکی کێلان دەبن، ((چ شتێ؟ چاڵێکی قووڵ!)) ئاخێکی هەڵکێشا، لە کاتێکا سەیری هاوڕێکانی دەکرد هەستی کرد کە چەند تەنهایە بەبنی لێویەوە گوتی ((من قسە دەکەم بەڵام بۆ کێ؟ بۆ هەوا، خۆم تەنها کەسێکم کە گوێ دەگرم، کەی بیابان گوێ پەیدا دەکات تا گوێی لەقسەم بێت؟))

پەترۆس دووبارە گوتی : مەولای من لێمان ببورە، بەڵام زەینی ئێمە پڕە لە چلك...سەبرت هەبێ، دەپشکوێ

کریست گەڕایەوەو سەیری خاخامی کرد، بەڵام پیرەمێرد چاوی بڕیبوە زەویەوە ئەو لەمانای نادیارو وەحشەتناکی مەسەلەکە بە ئاگابوو، ئەشك لە چاوە بێ برژانگەکانی ئەڵقەی بەستابوو

لەکۆتایی ناصیرەدا لەبەردەم کوختەییێکی دارینەوە-باجگر- دانیشتبوو، ناوی مەتی بوو، تەواوی بازرگانانێ کە دەهاتنە ناصیرە یا لە ناصیرە دەچوونە دەرەوە دەبوایە پارەوپول بدەن بە ڕۆمیەکان، مەتی پیاوێکی کورتەباڵای چوارشانەو رووخسار زەردبوو، دەستەکانی زەردو نەرم بوون، ئەنگوستەکانی ڕەنگی‌و نینۆکەکانی ڕەش بوون، گوێچکەییێکی موویین‌و دەنگێکی وەك دەنگی خواجەی هەبوو، تەواوی خەڵکی ناصیرە رقیان لەو دەبۆوە، کەس تەوقەی لەگەڵ ئەو نەدەکردو کە بەکەنار کوختەکەی ئەو ڕەت دەبوون روویان وەردەسووڕاند، مەگەر کتێبی پەیامبەران ناڵێت: ((وەزیفەی ئێمەیە تەنها باج بدەین بە خودا نەك مرۆڤ)) ئەو پیاوە باجگر بوو، باجگریی لەخزمەتی قەیسەری ڕۆمدا، ئەو شەریعەتی خودای نابووە ژێر پێ، پارەی حەرامی دەخوارد، فەزای دەوروبەری ئەو تاحەوت فەرسەخ پیس بوو بوو.

پەترۆس گوتی ((کوڕینە خێراتر جولە بکەن، هەناسەتان بگرن رووتان وەرگێڕن))

بەلاّم کریست وەستا، مەتی لەکاتێکا لە دەرەوەی کوختەکەوە وەستابوو، قەلّەمی نابووە میانی ددانەکانیەوە، بەخێرایی هەناسەی هەلّدەکێشاو نەیدەزانی چی بکات، لەوە دەترسا لە دەرەوەی دەرگای کوختەکەوە بوەستێ، بەبوونی ئەوانیشەوە مەیلی نەبوو بچێتە ناو کوختەکەوە، چەندین سالّ بوو ئارەزووی دیتنی پەیامبەری تازەی دەکرد، کە بانگەشەی مرۆڤایەتی دەکرد، لەنزیکەوە بەدیارکەوتبوو، مەگەر ئەو نەبوو کە رۆژێ دەیگوت ((خودا ئەو گوناهکارەی کە تۆبە دەکات زیاتر خۆشدەوێ لەوەی کە هەرگیز گوناهی نەکردووە؟)) هەمان چەند رۆژی پێشتر مەگەر نەیگوتبوو ((من لەم دونیایەدا بۆ پەرهیزکارەکان نەهاتووم، بەلّکو بۆ گوناهکاران هاتووم)) حەزم لێیە لەگەلّ ئەوان دانیشمو خۆراك بخۆم؟)) رۆژێکی دیکە کاتێ پرسیاریان لێکرد:

((مەولای من ناوی راستی خودا چییە؟)) وەلاّمی دایەوە ((ئەشق!)) ئێستا چ رۆژو شەوانێ بوو کە مەتی ئەم قسانەی لەدلّی خۆیدا کاوێژ کردبۆوە، بەئاهێکەوە گوتبووی ((بزانە چ کاتێ ئەو دەبینم، چ کاتێ دەکەومەسەر پێیەکانیەوە؟))و ئێستا ئەو رووبەرووی وەستاوە، بەلاّم مەتی، شەرمی لەخۆی دەکردەوە کە سەر بەرز بکاتەوەو سەیری ئەو بکات، بەبێ جولە، بەسەری شۆڕەوە، لەشوێنی خۆی مابۆوە، لە چاوەڕوانی چی دابوو، ئێستاکێ هەمان پەیامبەر لەوێ دەڕواتو بۆ هەمیشە ئەو لەدەست دەدات. کریست هەنگاوێکی بەرەو لای ئەو هەلّگرت، ناوی ئەوی وا بە ئارامیو میهرەبانییەوە هێنایە سەرزمان کە باجگر هەستی کرد دلّی دەتاوێتەوە، چاوانی بەرز کردەوە، کریست رووبەڕووی وەستاو سەیری کرد، نیگاکانی ئەو نەرمو قودرەتمەند بوو، تا ناخی بوونی باجگر چووە خوارەوە، ئارامی بەدلّو رۆشنی دەبەخشیە زەینیەوە، تەواوی وجودی لەحالّی لەرزیندا بوو، بەلاّم خۆرەتاوی کەوتە سەرو گەرمی دەکردەوە، واهـ کە چ لەززەتێكو دلّنیاییو دۆستایەتی بوو! ئەرێ دونیا ئەوەندە سادەو رزگاربوون ئاوا ئاسان بوو؟



مەتی چووە ژوورەوە، دەفتەری حسابی خۆی داخست، دەفتەر حسابێکی سپی نایە ژێر باخەلّی خۆی، دەواتی نایە بەرشالّیو قەلّەمی دانایە پشتگوێی، پاشان کلیلی لەبەرشالّی دەرهێناو کوختەکەی داخستو کلیلی هاوێشتە ناو باخێکەوە،کەکاری تەواوبوو، بەئەژنۆی لەرزۆکەوە لە کریست نزیك بۆوە وەستا بچێ یا نەچێ؟ ئایا ئوستاد دەستی لەناو دەست دەنێ، چاوانی هەلّبڕیو سەیری کریستی کرد، وەك بلّێی بەدەستەپاچەییەوە داوای لێدەکرد کە رەحمی پێ بکات.

کریست بزەییێکی هاتێو تەوقەی لەگەلّ کرد ((مەتی بەخێر بێی لەگەلّ مندا وەرە))

حەوارییەکان کەوتنە شلّەژانەوەو چوونە کەنارەوە، خاخامی پیر سەری لە گوێی کریست ناو گوتی ((ڕۆلّەم باجگر گوناهێکی گەورەیە، تۆ دەبێ گوێ لەشەریعەت بگری)).

کریست وەلاّمی دایەوە ((باوکە من گوێ لەدلّم دەگرم))

ئەوان ناصیرەیان جێهێشت، بە رەت بوون لەباخەکان گەیشتنە مەزراکانەوە، بایێکی سارد هەلّیکرد، کێوی حەرمۆن لەوان دەورانداد لە پەردەی ناسکی یەکەمین بەفردا دەدرەخشایەوە.

خاخام دەستی کریستی جارێکی دی گرتە دەست، مەیلی لێبوو بەر لەوەی لەیەك جیاببنەوە قسەی لەگەلّ بکات، بەلاّم دەیتوانی چی بلّێ؟ لەکوێ دەست پێبکات؟ کریست دەیگوت لەبیابانی یەهودیە خودا ئاگری لەدەستێك دایەو تۆویشی لەدەستەکەی دیکە داناوە، دەیگوت ئەو دونیا دەسوتێنێو پاشان تۆوی دونیایێکی دیکە بەسەر وێرانەکانیەوە پێوەر دەکا، خاخام بەدزییەوە سەیری ئەوی کرد، باوەڕی پێ بهێنی؟ مەگەر کتێبی پەیامبەران نەیاندەگوت، هەلّبژێردراوی خودا دەبێتە جێی نەفرەتو تەکفیری خەلّکەکانەوە. وەك چۆن درەختێکی پەژموردە لەمیانی زورگو بەردەلاّنەکانەوە سەردەردەهێنێ؟

لەبەر ئەمە لەوانەیە ئەو پیاوە هەمان کەسێ بێ کە.....

خاخام پالّی بەکریستداو بەئارامی بەشێوەیەك کە ئەوانی دیکە نەبیستن پرسی: ((تو کێی؟))

- مامە شەمعون لە ساتی لەدایك بوونم تا ئێستا لەگەڵ مندا بووی هێشتا منت نەناسیوە؟

دڵی پیرەمێرد دیسان لە جولە وەستا بەبنی لێویەوەگوتی

((بەدەرە لەوەی کە لە زەینمدا جێی ببێتەوە))

مامە شەمعون، ئەی دڵت چۆن؟

- کورِم من گویَ لەدڵم راناگرم، مرۆڤـــ تووشی گێچەڵ دەکات

کریست بەنێگاییێکی هاودڵییەوە بەپیرەمێردی گوت، تووشی گێچەڵی خودا، گێچەڵی نەجات بوون)). دوای ساتێك گوتی ((باوکە خەونی دانیاڵ پێغەمبەرت دەربارەی قەومی سراییل لەبیر نییە؟ لە دێرزەمانەوە بەسەر تەختی خۆی دانیشتبوو، جامەییێکی وەك بەفر سپی لەبەربوو سەری وەکو سپێتی خوری بەران وابوو، تەختەکەی لەمەشخەڵ دروستکرابوو رووبارێ لە بڵێسەکان لە بەرپێی هەڵدەڕژا، دادوەران لە چەپو راستی دانیشتبوون، ئەوکاتە ئاسمان کراوە، بەسەر هەورەکانەوە باوکە لەبیرتە چ کەسێ دابەزی؟))

خاخامی پیر کە چەندین نەوەی یەك لەدوای یەکی بەمە گۆش کردبوو، وەڵامی دایەوە ((کورِی مرۆڤـــ))

ئەو خەونەی لە شەوانی خۆش بینی بوو..

- کورِی مرۆڤـــ کێیە باوکە؟

- ئەژنۆکانی خاخام سست بوو، بەوەحشەتەوە سەیری گەنجەکەی کرد، لەحاڵێکا چاوی بریبووە لێوەکانی کریستەوە بەبنی لێویەوە گوتی ((کێیە؟ کێیە؟))

کریست بە ئارامی وەڵامی دایەوە ((مـن)) ودەستی دانایە سەرسەری پیرەمێرد وەك بڵێی پیرۆزی دەکات.



خاخامی پیر خواستی شتێ بڵێ، بەڵام نەیتوانی دەمی بکاتەوە. کریست دەستی هێنایە پێشو گوتی ((باوکە..ماڵاوا، شەمعون تۆ مرۆڤێکی بەختەوەری، چونکە خوادوەند وەفای بە وادەی خۆی کردو بەر لەمەرگ تۆی کردە شایستەی دیدەنی کەسێ کە لە تەواوی تەمەنی خۆیدا ئارەزووی دیداریت هەبوو.

خاخام بەچاوانی کەوتووی خۆیەوە کەوتە سەیرکردنی، ئەو تاجو باڵانەی کورِی خودا بەسەر هەورەکانەوە لەدەوروبەری بوون چی بوو؟ خەونی دەدی؟ ئایا ئەو دانیاڵ پێغەمبەر بوو؟ ئایا دەرگاکانی ئایندە بەرِووی ئەودا دەبوونەوە؟ ئەویان بەتوانا دەکرد تا نیگایێ بکاتە دەروونەوە؟

ئەو نە بەسەر خاکەوە، بەڵکو بەسەر هەورەوە وەستابوو، ئەو پیاوە گەنجە کە دەستی درێژکردبوو پێدەکەنی، کورِی مێرێ نەبوو بەڵکو کورِی مرۆڤـــ بوو.

سەری گێژ بوو، گۆچانی خۆی لەزەوی بردە خوارەوەو خۆی بەسەردادا تا نەکەوێ، ئەوکاتە سەیری کرد، سەیری کریستی کرد کە بەگرتنە دەستی گۆچانەکەی شوانی خۆی بەژێر درەختەکانی پاییزیدا رەتدەبێ.

جلی خاخامی پیر تەرِبوو بوو بەلەشیەوە نووسا، ئاو لەپرچی دەهاتە خوارەوە، هەرچەند دەلەرزی لەناوەندی رێدا لە شوێنی خۆیدا مایەوە، کریستو هاوسەفەرەکانی لەدوای ئەو لەپشت درەختەکانەوە ون بوون.

بەڵام لەکاتێکا خاخامی پیر لەمیانی بارانو بادا وەستابوو، ئەوانی دەدیت کە کۆنەپۆشو پێخواست بەرِێدا دەرِۆیشتنو سەرهەڵدەگەرِان، دەچوونە کوێ؟ روو لە کام لا؟

ئایا ئەو کۆنەپۆشو پێ پەتیو بۆرە خەڵکە ئاگر لەدونیا بەردەدەن؟ نەخشەکانی خوداوەند گەرداوو مەرموزێکی گەورەن...

بەبنی لێویەوە گوتی : ((ئەدۆنیا... ئەدۆنیا)). فرمێسك لە چاوەکانی هەڵرِژانە خوارەوە.

## بەشی بیستو دوو

ڕۆم بە بازووی کراوەو قودرەتمەندێتی هەرگیز تێرنەبوو، بەسەر عەرشی شارەکان دانیشتووەو کەشتیو کاروانچیو خودایانو کەلوپەلی تەواوی دونیاو هەموو دەریاکان داوەتی ئامادەبوون دەکات، لەهەمان کاتدا کە باوەڕی بەهیچ خودایێ نییە، بێ واهیمەو بەڕازیبوونێکی تەنزئامێزەوە تەواوی خوداکان داوەت دەکاتە دەرباری خۆی. لە ئێرانی ئاگرپەرست میترای کوڕی خۆرەتاو کە لە سەرپشتی بەرزی گایێکی پیرۆزدا بەسەر ئاهورامەزداوە هەڵدێت، ئەو گایەی هەر زوو دەکرێنە قوربانی. لەسەر زەمینی میسر ئیزیس شێری نیل کە لە بەهاراندا بەسەر مەزرا پشکووتووەکاندا لەگەڕانو سووڕاندا دەبێ بەدوای چوارپارچەی لەشی مێردەکەی، ئیزیسی براکەی، لە سووریا لەمیانی شیوەنی دڵتەزێنی ئەدونیسی پاکیزەدا، لە فریژیە، ئاتیس کە بەسەر تەختەییێکی ڕەوانەوە راکشاوەو بە وەنەوشەی چرمساوی هەزار زاوای خوداو هەرماسەکانی ئاسیاو ئەفریقیا، لە یۆنانی ئۆلیمپی سپیو لووتکەکانو هادیسی رەشدا تەواوی خوداکان بە ئامادەبوون قەبوڵ دەکات، ڕێیەکانی کردۆتەوە، دەریاکانی بۆ دزانی دەریاییو زەوی بۆ ڕێگرەکان ڕەها کردووە، ئاشتیو نەزمی بەخشیوە بەدونیا، لەبەرزایی ئەوەوە هیچ کەسێ هەتا خوداش بوونی نییە، لەژێر پاکانیشیەوە هەموو کەسێ، خوداوەندو مرۆڤەکان هەموویان، هەموو شارنشینەکان کۆیلەی ڕۆمن، شوێنو کات دەفتەری پڕ زێڕو زیون کە لە مشتی ئەودا لوولدراوە، لەکاتێکا بازی دووسەر کە بە کۆکردنەوەی باڵە شەلاڵ بەخوێنەکانی خۆی لەبەر پێیەکانی



خانمەکەی ئەودا ئارامی گرتووە دەلاوێنێتەوە، لافی ئەوە لێدەدا کە ((من جاویدانم)) ڕۆم بەخۆی دەڵێت، چەند شکۆمەندو لەززەتبەخشە ئەو هەموو توانا و جاویدانییە، ئەو کاتە بزەیێ بەسەر رووخساری سوورو گۆشتنی نەخشە دەبەستێ. بەڕازیبوونەوە پێدەخەنێ، ئەو پرسیارە لەبیر دەکات کە ڕێگاکانی زەمینیو دەریایی بۆ کێ کردۆتەوە؟ هەوڵو تەقەلاّی سەدەکانی خۆی بەمەبەستی ئەوەی ئاساییش ببەخشێتە جیهان بۆ کێی ئەنجام داوە. هەرگیز نایەتە زەینیەوە کە ئەو فەتحی کردووەو یاسای داناوە، دەوڵەمەندبووەو بەسەر تەواوی جیهاندا روونیشتووە، بۆ چ کەسێ، بۆ کێ؟ بۆ مرۆڤێکی پێخواس کە لە هەمان ساتدا بە ئاپۆڕەی ئەو کۆنەپۆشانەی وەدوای ئەو کەوتوون لە شەقامی جێهێڵراوی ناصیرەو کانادا بەرەوپێش دەچێ، شوێنێ بۆ خەوتن، جلێ بۆ لەبەرکردنو شتێ بۆ خواردنی نییە.

تەواوی سندوقچەکانو ئەسپو ئاوریشمی گرانبەهای ئەو هێشتا لە ئاسمانە، بەلاّم ڕێی دابەزینیان گرتۆتە بەر.

گۆچانێکی لەدەستدایەو لەمیانی بەردەلاّنەوە بەپێی خوێناویەوە ڕێی تەی دەکرد، جارێ دەوەستێو خۆی بەسەر گۆچانەکەی خۆیدا دەدا، بێ ئەوەی کە قسەیێ بکات، چاوەکانی خۆی بەسەر دامێنی کێوە سپییەکاندا هەڵدەخاتو ئەو کاتە گۆچانەکەی بەرزتر لەکێوەکان بۆ نوورو خودا کە بەسەر عەرشەوە دانیشتووەو کرداری مرۆڤەکان تەماشادەکات بەرز دەکاتەوەو سەلام لەو دەکات، ئەوکاتە سەفەری خۆی سەرلەنوێ دەست پێدەکاتەوە.

عاقیبەت گەیشتە کانا، لە کەناری بیردا لەدەرەوەی دێدا ژنێکی زگپڕی جحێڵی ڕەنگ پەڕیو بەخۆشحاڵییەوە ئاوی هەڵدەکێشاو شەربەکەی پڕ دەکرد، ئەویان دەناسی، هەمان ئەو کچە بوو کە لەهاویندا شووی کردبوو، ئەوکاتە ئارەزووی ئەوەیان بۆ کردبوو کە ببێتە خاوەن کوڕێك.

کریست لەکاتێکا بزەی دەهاتێ پێی گوت ((ئارەزووی ئێمە هاتە دی)) ژنەکە سوورهەڵگەڕا کەوتە دوای تێنوویەتی ئەوانەوە، ئەوان تێنوو نەبوون، بۆیە شەربەکەی

نایە سەر سەریەوە، بەرەو لای دێ ڕۆیشتو ون بوو. پەترۆس بەڕاکردن کەوتە پێشەوە لە ئاستانەی دەرگاییێکەوە بۆ ئاستانەی دەرگاییێ دەستی کرد بە دەرگا لێدان.

مەستییێکی مەرموز ئەوی لەخۆی بێخود کردبوو، بەسەماوە هاواری دەکرد: ((بکەنەوە، بکەنەوە)) دەرگاکان دەبوونەوە ژنان بەدیاردەکەوتن، شەو باڵی کێشابوو، جووتیارەکان لە مەزراکان دەگەڕانەوە، بەسەرسامیەوە دەیانپرسی ((هاوڕێ چ خەبەرە؟ بۆ لەدەرگاکان دەدەی؟)) پەترۆس وەلاّمی دەدایەوە (((ڕۆژی خودا هاتووە، تۆفانێ بەڕێوەیە هاوڕێ ئێمە کەشتییێکی تازە هەڵدەگرین تەواوی باوەڕداران دێنە ناویەوە، ئەو ئوستادە کە کلیلی لەدەست دایەو ئێستا بەشادیەوە هەنگاو هەڵدێنێ.

ژنان بەترسەوە، پیاوان، نزیکی کریست دەبوونەوە کە ئێستا بەسەر بەردێکەوە دانیشتووەو بەگۆچانەکەی خۆی خاچو ئەستێرە لەخاك دەتراشێ. بێمارو گۆجو ڕەنجکێشەکانی تەواوی دێ گردبوونەوە.

-مەولای من، دەست لە ئێمە بدە تا چاك بینەوە، قسەییێکی مەحەبەتئامێز بکە تا لە بیری کەین کە نابیناو فەلەجو جوزامین، خاتونێکی بالاّبەرزو ئەشرافخوو لەناو جلی ڕەشدا هاواری کرد (( من کوڕێکم هەبوو لەخاچیاندا، زیندووی کەوە)). ئەو خانمە ئەشرافییە کێ بوو؟ جووتیارەکان بەسەرسامیەوە گەڕانەوە، هیچ کەسێ لەدێی ئەوان لەخاچ نەدراوە، بەنیگایان کەوتنە دوای شوێنی دەنگەکەوە، بەلاّم خانمە پیرەکە لەهەوای گورگو مێشو خۆڵەمێشیدا ون بوو.

کریست لاربۆوە بەسەر خاکەوە خاچێكو ئەستێرەییێکی کێشاو گوێی دایە شەپوری جەنگ، کە لە گردۆلکەکانی بەرامبەردا دادەبەزی، گوێی ڕاگرت، دەنگی قەبەو ڕێکی پێیەکانی بەرگوێ کەوت لەپڕێکا قەڵغانو کلاّوخودەی بڕونزی لە ڕۆشنایی خۆرەتاوی خۆراوا بریقەیان دایەوە، لادێییەکان گەڕانەوە، ڕووخساریان تاریك هەڵگەڕا.

- شکارچی نەفرەتی، لەتاقیب کردن دەگەڕایەوە، دیارە دووبارە چۆتەدەرەوە تا شۆڕشگێرەکان دەستگیر بکات.



- بەو جۆرەی کەخۆی دەیگوت، کچە پەککەوتەکەی خۆی هێنابووە دێ تا بە هەوای پاك چارەسەری بکات، بەلاّم خودای سراییل کتێبو تەرازووی خۆی هەیەو نابوورێ، خاکی کانا ئەو کچە لەورگی خۆیدا دەنێژێ.

- ئاهای فتنەکان هاوار نەکەن، وادێ.

سێ سوار لە پێشەوەی ئەواندا رابردن لە ناوەندێ روفوسی یوزباشی ناصیرە بوو، قامچی لە ئەسپەکەی دەداو لە ئاپۆڕەکەی جووتیاراندا نزیك کەوتەوە، لەکاتێکا قامچی بەرز دەکردەوە هاواری کرد ((بۆ کۆبوونەتەوە؟ یاڵلا بلاّوەی لێ بکەن)) ڕووخساری خەمناك بوو، لەماوەی چەند مانگێ پیر بووبوو پرچی سپی بووبوو، خەمی تاقە کچەکەی کە سپێدەی ڕۆژێکیان لەپڕێکا خۆی بەسەر تەختی ئیفلیجی دۆزیبۆوە، چنگی لەدەروونی گیرکردبوو وردوخاشی کردبوو، لەکاتێکا دەستووری بلاّوەلێکردنی بە لادێییەکان دەدا ڕووخساری ڕۆشن بۆوە ئەسپی خۆی ڕەها کردو لەو نزیك بۆوە:

- کوڕی نەجاڕ لە یەهودیەوە بۆ ئێرە بەخێربێی بەدوای تۆدا دەگەڕام؟.

ئەوکاتە ڕووی لە لادێییەکان کرد ((قسەییێکم لەگەڵ ئەودا هەیە بۆیە ئێوە بڕۆن))

یاوەرە کۆنەپۆشەکانی دیت کە لە ناصیرەوە کەوتبوونە دوای ئەوەوە هەندێکی لەوان ناسیەوەو ڕووخساری تێکچرژا.

- کوڕی نەجاڕ تۆ کۆمەکی لەخاچدانی کۆمەڵێکت کردووە، ئاگاداربە خۆت لەخاچ نەدرێی، ئەوەندە خەڵکی جۆش مەدە، هیچ بیروباوەڕێ لەمێشکیان مەکە، دەستی من گرانەو ڕۆم جاویدانیە، کریست بزەی هاتێ، ئەو چاك دەیزانی کە ڕۆم جاویدانی نییە؟، بەلاّم قسەی نەکرد.

- جووتیاران بە بلموبۆڵەوە پەرشو بلاّوبوونەوە، لەمەودایێکی دووردا وەستاو سەیری ئەو سێ کەسە شۆڕشگێڕەیان دەکرد کە پیرەمێردێکی بالاّبەرز بە ردێنی وشەکەوەو دوو کوڕی لەلایەن سەربازەکانەوە دەستگیر کرابوونو ئێستا لەزنجیر بەسترابوونەوەو بۆ شوێنێکی دیکە دەگوازرانەوە، هەر سێ نەفەر بەسەری هەڵبڕیویان سەیری کلاّوی

خودەی نیزامیان دەکردو هەوڵیاندەدا کە ئاپۆڕەکە ببینن، بەڵام شتێ نابینن، شتێ جگە لە خودای سراییل کە بالأبەرزو هەڵقرچاو لە هەوادا وەستابوو، نەیاندەبینی.

- یەهودا ئەوانی ناسیەوە، بۆ زەمانێك تەنیشتو تەنیشت لەگەڵ ئەواندا جەنگی بوو، سەری بۆ ئەوان راتەکاند، بەڵام ئەوان کە لە جیلوەی خودا نابینابووبوون ئەویان نەدیت، یوزباشی کە هێشتا بەسەر ئەسپەوە بوو، لاربۆوەو گوتی ((کوڕی نەجاڕ خودایانێ هەنە بێزیان لە ئێمە دەبێتەوەو ئێمە دەکوژن، ئەسڵەن دەیانەوێ هەر سەر بەلەشمانەوە نەبێت، هێندێکی دیکە لەڕادەبەدەر میهرەبانن‌و نەخۆشی فانییە بەدبەختەکان چارەسەدەکەن، کوڕی نەجاڕ خودای تۆ پەیوەستە بەکام یەك لەم گوتانە؟

کریست وەڵامی دایەوە ((یوزباشی تەنها یەك خودا هەیە کوفر مەکە)) روفوس بەتەکاندانی سەریەوە گوتی (( من مەبەستم نییە لەگەڵ تۆ بچمە نا باسی مەزهەبیەوە، من رقم لە یەهودیەکان دەبێتەوە ئەگەر پێت ناخۆشی نەبێ، دەڵێم هەموو ئێوە بەتێکڕا خودا بەردەدەنە رۆحی هەمووانەوە، تەنها شتێ کە دەمویست لەتۆی بپرسم ئەوەیە کە ئایا خودای تۆ دەتوانێ)). لەقسەکردن دیسان وەستا، شەرمی دەکرد کە خۆی بچووك کاتەوە داوا لە یەهودیێ بکات، بەڵام بەبێ درەنگ تەختەخەوێکی باریك بێ ئاڵاییش لەزەینیا نەخشی بەستاو تەماشای ئەو دەکاو داوای لێدەکات.

غرووری خۆی قووتداو بەسەر زەینەوە لاربۆوەو گوتی ((کوڕی نەجاڕ ئایا خودای ئێوە دەتوانێت نەخۆش چاك بکاتەوە؟ کە کریستی دیت بێدەنگە دووبارە پرسی ((ئایا دەتوانێ؟ کریست لەسەرخۆ بەسەر ئەو بەردەی کە بەسەریەوە دانیشتبوو هەڵسایەوەو لەسوارەکە نزیك کەوتەوە ((باوکان ترێی ترشیان خواردبوو، کوڕەکانیان ددانییان کەل دەبوو- ئەمە یاسای خودای ئێمەیە)).

یوزباشی لەرزەییێکی کەوتە گیانیەوەو هاواری کرد ((نە، ئەوە بێ عەدالەتیە)). کریست لەگەڵ ئەو یەك نەبوو ((نە تەواو عەدالەتە کوڕو باوك لە یەك رەگو رچەڵەکن، هەردووکیان بەیەکەوە دەچنە بەهەشتو هەر دوو بەیەکەوە دەکەونە دۆزەخەوە، ئەگەر لەیەکیان بدەیت ئەویکە بریندار دەبێ، ئەگەر یەکێ هەڵە بکات



هەردووکیان سزا دەدرێن، ئەی یوزباشی تۆ بەدوای ئێمە دەکەوی‌و دەمانکوژی، خوای سراییلیش کچی تۆ پەککەوتەو فەلەج دەکات))

- کوڕی نەجاڕ ئەوانە وشەی قورسن، جارێکیان بەرێکەوت لەناصیرە گوێم لەقسەی تۆ بووە، ئەوکاتە قسەت بۆ چەشەی رۆمیەك خۆش بوو، ئێستا؟

- ئەوکاتە مەلەکوتی ئاسمان قسەی دەکرد، ئێستا کۆتایی دونیا، یوزباشی لەو رۆژەوە کە گوێت لەقسەم بوو قازی عادیل بوو لە سەرتەختی خۆی دانیشتووە.

سندوقچەکانی کردۆتەوە، بانگی عەدالەتی کرد، شمشێر بەدەستەوە هات لەکەنار ئەودا وەستا.

- ئایا خودای تۆش یەکێ لەو خودایانەیە کە پێ لەعەدالەت درێژتر ناکات؟ ئایا لە هەمان جێدا دەوەستێ؟ ئەی ئەو پەیامە تازەیەی عەشق کە هاوینی رابردوو لە جەلیل موژدەت بۆ دەدا کوا؟ کچی من پێویستی بەدادپەروەری خوداوە نییە پێویستی بەعەشقی ئەوە، من بەدوای خودایێ دەگەڕێم کە دوورتر لە دادپەروەری دەڕواو شەفا بەکچەکەم دەبەخشێ. لەبەر ئەمەش تەواوی سراییلم بەدوای تۆوە لەژێر پێ ناوە... عەشق؟

گوێت لێیە؟ ئەشق نەك دادپەروەری.

- یوزباشی بێ عەشقو بێ بەزەیی رۆم چ کەسێ ئەم وشانەی لەدەمی وەحشی تۆ ناوە؟ -ڕەنجو عەشقی من کچەکەم، من بەدوای خودایێ دەگەڕێم کچەکەم چاك بکاتەوەو باوەڕی پێ بهێنم.

- خۆش بەحاڵی ئەوکەسانەی کەباوەڕ بەخودا دەهێنن بەبێ ئەوەی داوای پەرجوو بکەن.

- بەڵێ خۆش بەحاڵی ئەوان، بەڵام من مرۆڤێکی درم بەم سادەگییەوە دانانیشم، من خودایێکی زۆرم لە ڕۆمدا بینیووە، هەزارەها نەفەر لەوان لەناو قەفەسدایە ئیدی بەسمە.

- کچەکەت لەکوێیە؟

- هەمان جێ لەباغێ لەبەرزترین خاڵی ئەم دێیە؟ لەباغێکدا لەبەرزترین شوێنی ئەم دێیە

- بابڕۆین

یوزباشی خۆی جەمو جورکردو لەئەسپ هاتە خوارەوە، ئەو کریست لە پێشەوە دەڕۆیشتن، لەپشت ئەوانەوە بەمەودایێ، یاوەرەکانو لەپاشتری ئەوان ئاپۆڕەی گوندینیان دەهاتن. لەهەمان ساتدا تۆماس کە لە شادیان جێی لە پێستی خۆی نەدەبۆوە. لەدوای سەربازانی لای دواوەهاتە دەرەوە، بۆ فرۆشتن چوو بووە ئەوێکەوە کەلوپەلی خۆی بەنرخێکی گران بۆ سەربازەکان لە قالب دابوو.

حەواریەکان هاواریان کرد ((ئاهای تۆماس تۆ هێشتا لەگەڵ ئێمە نایەیت؟ ئێستا پەرجوویێ دەبینیو باوەڕ دەهێنی.

تۆماس وەڵامی دایەوە ((یەکەم جار دەبێ ببینمو دەستی لێدەم))

- چ شتێ هەی دێوەرەی نەقۆلا؟

- ڕاستی

- مەگەر حەقیقەت جەستەی هەیە کەللەپوك، ئەوقسەیە قسەیێکی قۆڕە بۆ دەیکەیت؟

- تۆماس بەخەندەوە گوتی ((ئەگەر حەقیقەت جەستەی نەبێ بەکەڵکی چی دێت؟ من پێویستم بەساوی شتەکان هەیە، متمانەم بەچاووگوێم نییە، متمانەم بەدەستمە)).

- ئەوان گەیشتنە بەرزترین بەشی دێکەوەو چونە ماڵێك کە بە (گەچ - دۆغاب[*] سپی کرابوو. کچێکی تەمەن دوازدە ساڵ بەسەر تەختە خەوێکی سپی راکشابوو،

* دوغاب: بە مانای دۆ دێت، بەڵام لێرە لە جیاتی گەچ بەکارهاتووە.



چاوانی سەوزو درشتی کرابۆوە، بەدیتنی باوکی، رووخساری کرایەوە. رۆحی بەزبریەوە تەکانی خواردو هەوڵیدا لەشی پەککەوتەی بجاتە جولەوە، بەڵام بێهودە بوو، شادی لە رووخساری نەما، کریست لاربۆوەو دەستی کچەی گرت تەواوی قودرەتو عەشقو میهرەبانی لەناو لەپی کۆبۆوە، بێ ئەوەی قسەیێ بکات، چاوی بڕیە دوو چاوی سەوزیو هەستی کرد کە رۆحیش لە نووکی پەنجەکانی ئەوەوە هەڵدەڕژێتە ناخی جەستەی کچەکەوە.. کچە بەمیهرەبانیەوە سەیری ئەوی کرد، لێوەکانی کرایەوەو بزەی هاتێ. یاوەرەکان وردەوردە چوونە ناو ژوورەکەوە، تۆماس لە پێشەوە هەموان بە خۆیو بەستەکۆڵو کەڕەنای بەرشاڵێ چوونە ژوورەوە.

لادێییەکانی ناوباغو کووچەی باغەکان پەرشو بلاوبوونەوە، هەموو هەناسەبڕکێ بوون لە چاوەڕوانیدا وەستابوون، یوزباشی پشتی بە دیوار دابوو، سەیری کچەکەی خۆی دەکردو هەوڵیدەدا نیگەرانی خۆی بشارێتەوە.

گۆناکانی کچە، هێدی هێدی سوور هەڵگەڕان، سینەی قیت بۆوە، هەستی بە خورانێکی دڵنەوازکرد کە لە دەست بۆ دڵو لەدڵ بۆ ژێر پێیەکانی ئەو دەچوو، سەراسەری جەستەی داگرت، ئەندامو جەستەی ئەو وەك گەڵای درەختی ئەسپیندار کە لەبەرکارێگەرێتیی بایێکی نەرم دەوەرێ تەکانی دەخوارد، کریست هەستی کرد دەستی کچە لەناو دەستی ئەودا وەك دڵ لێدەداو ژیانی بۆ دەگەڕێتەوە، تەنها لەوکاتەدا بوو کە دەمی کردەوەو بەئارامی فەرمانی پێدا ((کچم هەڵسەوە)) کچە بەئارامی تەکانی خوارد وەك بڵێی بێ هەستیەکەی چاك دەبێتەوە، خۆی لێك راکێشاو کەوتە سەرپێو بەیەك هەڵبەزینەوە پەڕیە باوەشی باوکیەوە. چاوە سووڕاوەکانی تۆماس لەکاسە دەرپەڕین، دەستی درێژکردو دەستیدا کچە وەك بڵێی گەرەکی بوو دڵنیایی بەدەست بهێنێ کە ئاخۆ ئەوە راستیە. یاوەرەکان بەهێدمە گرتوویی هەرایان بوو، ئاپۆڕەکە کەکۆببوونەوە بۆ ساتێ هاواریان کردو ئەوکاتە بەترساوی خامۆش هەڵگەڕان، شتێ جگە لە دەنگی خەندەی کچیژکە کە باوکی لەباوەشی کردبوو ماچی دەکرد نەدەگەیشتە گوێ.

یەهودا نزیکی ئوستاد بۆوە، رووخساری تووڕەی هەرماسی بوو.

- تۆ هێزی خۆت بۆ گاوران بە هەدەر دەدەی، تۆ یارمەتی دوشمنانت دەدەی. ئایا ئەوە کۆتایی دونیایە کە بۆ ئێمەت هێناوە؟ ئایا ئەوانە مەشخەڵەکانن؟

بەڵام کریست کە لەوان دووری ئاسمانی تاریکەوە دەسووڕایەوە، ئەوخۆی زیاتر لەوانی دیکە بە دیتنی کچەکە کە لەتەختە خەوی هاتبووە دەرەوە، تووشی وەحشەت بووبوو، یاوەران کە توانای شاردنەوەی لەززەتی خۆیان نەبوو، ئەڵقەیەکیان بەدەوریا ڕێکخستو خەریکی هەڵپەڕین بوون، پاش ئەوەی هەموو شتەکانیان رەهاکردو پەیوەندیان بەو کرد بەوەی کارێکی چاکی ئەنجام دابوو، پەرجوویێکی هێنابووە ئاراوە، تۆماس لەزەینی خۆی تەرازوویێکی داناو کێشی کرد، کەلوپەلەکانی لەتایێك داناو لەتاییەکەی دیکە مەلەکوتی ئاسمان، تای تەرازوو بۆ ماوەییێك چووە سەرەوەو خوارەوەو عاقیبەت وەستان، مەلەکوتی ئاسمان سەنگینتربوو، بەڵێ ئەو جۆرە مەترسیکردنە بێ وێنەیە، پێنج دەدەم هەزار وەردەگرم لەبەرئەمە بەناوی خودا بۆ پێشەوە.

لە مامۆستا نزیك کەوتەوە، گوتی ((مەولای من لەبەرخاتری تۆی ئازیز کەلوپەلەکانم لەمیانی هەژاراندا دابەشدەکەم. لووتف بکە بەیانی لەکاتی گەیشتنی دەسەڵاتی ئاسمان لەبیرنەکەی من هەموو شتێ دەکەمە قوربانی تا لەگەڵ تۆ بێم، چونکە ئەمرۆکە راستیم دیتو دەستم لێدا، بەڵام کریست دیسان لەم دونیایە نەبوو، بیستی، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، دێوەرەی پێشوو بەردەوام بوو،

((تەنها کەڕەنام هەڵدەگرم تا بۆ کۆکردنەوەی خەڵك بیژەنم، ئێمە کەلوپەلی تازە دەفرۆشین، کەلوپەلی جاویدانیو بەلاش.

یوزباشی لەکاتێکا کچەکەی لەباوەشی بوو، هاتەلای کریست گوتی ((پیاوی خودا، تۆ کچی منت دووبارە زیندووکردەوە، دەتوانم چ کارێکت بۆ ئەنجام بدەم؟)) کریست وەڵامی دایەوە ((من کچی تۆم لەزنجیرەی هەرماس رزگارکرد، تۆ ئەی یوزباشی ئەوسێ یاخییە لەزنجیری رۆم رزگاربکە))

ڕوفوس سەری هێنایە خوارەوەو ئاخێکی هەڵکێشا، بەخەمەوە کەوتە زەمزەمەوە: ((من ناتوانم.... بەڕاستی ناتوانم، من بۆ ئیمپراتوری رۆما سوێندی وەفادارییم



خواردوە، وەك چۆن تۆ بۆ خودایی کە دەیپەرستی سوێندی وەفادارایت خواردووە. ئایا ئەوە دروستە کە سوێندی خۆت بشکێنی؟ هەرشتێکی دیکەت لەمن بوێ داوابکە، دووسبەی دەچمە ئورشەلیمو بەرلە رۆیشتن دەمەوێ ئەم داوایە بکەی)).

کریست وەڵامی دایەوە ((ڕۆژێکیان لە کاتێکی دژواردا لە ئورشەلیمی پیرۆز یەکتر دەبینین، ئەوکاتە داواکەم لەتۆ دەکەم تا ئەوکاتە سەبر بکە)). دەستی بەسەر پرچی خورمایی کچە هێناو بۆ ماوەییێکی درێژ رایگرت، چاوانی داخست، گەرمایی پرچی نەرمو شیرینی ژنانەی کچەی هەست پێکرد، بەکردنەوەی چاوی لەئەنجامدا گوتی: رۆڵەم دەمەوێ شتێ بەتۆ بڵێم کە هەمیشە لەیادت بێت، دەستی باوکت بگرەو بەڕێی راستی دا بەرە.

کیژۆڵە پرسی (( ئەی پیاوی خودا، رێی راستی کامەیە؟))

- ئەشق

یوزباشی دەستووری شامێیدا، خۆراكو مەشروبیان هێناو سفرەیان راخستو بەکریستو یاوەرەکانی گوت ((مێوانی من بن، لەمماڵەدا بخۆنو بخۆنەوەو بۆ ژیانی دووبارەی کچم جەژن دەگێڕم، ساڵەهایە خۆشحاڵ نەبوویمە، ئەمشەو دڵم لێوانلێوی بەختەوەریە، بەخێربێن)).

ئەوکاتە بۆلای کریست چوو لاربۆوەو گوتی ((من رەهینەی منەتی ئەو خودایەم کە تۆ دەیپەرستی، ئەو خودایە بەمن بدە تابتوانم لەگەڵ خودایەکانی دیکە بۆ رۆمای بنێرم)).

کریست وەڵامی دایەوە ((لەکاتی خۆی دەگاتە ئەوێکەوە، چووە حەوشەکەوە تا هەناسەیێ هەڵکێشێ.

شەو دامەنی خۆی کردەوە، ئەستێرەکان لەسەر هەڵگەڕاندا بوون بۆ ئاسمان، لە خوارەوە لەودێیە بچووکەدا مەشخەڵەکان رۆشن بوبوونەوەو چاوانی خەڵك بریقەیان دەدایەوە، ئەوشەو قسەی هەریەك لەوان پلەییێك بالاتر رۆیشتبوو، چونکە هەستی دەکرد کەخودا وەك شێرێکی میهرەبان هاتۆتە گوندەکەیانەوە. سفرە راخراو کریست

لەمیانی یاوەرەکانی خۆیدا دانیشتو نانی دابەش کرد، بەلاَم لێوی بۆ قسە نەکردەوە، ترسێ لەناخیدا هێشتاکە بەشپڕزەیی باڵی لێکدەدا، وەك بلێی تازە لە مەترسییێکی گەورە رزگاری بووە یا شاکارێکی گەورەو چاوەڕواننەکراوی تەواو کردووە، حەواریەکانیش هیچیان نەگوت،

بەلاَم دڵیان لە خۆشیانا دادەخورپا، ئەو کۆتایی دونیاو فریشتەی ئاسمانو خەونو هەڵچوونێك نەبوو بەس، بەڵکو راستی بوو، ئەو گەنجە رووخسار رەشەی کەنار دەستیان کە وەکو مرۆڤ دەخواتو قسە دەکاتو پێدەکەنیٚو دەخوا، بەڕاستی نێردراوی خودا بوو، لەوکاتەدا کە تێشتیان خواردو هەموو بۆ خەو راکشان، مەتی لەژێر مەشخەڵدا دانیشت، دەفتەری سپی لەکراسی دەرهێناو قەڵەمی پشت گوێی گرتو بەسەر لاپەڕەکانەوە لاربۆوەو بۆ ماوەییێکی درێژ لەبیرکردنەوە دا مایەوە، دەبوایە چۆن دەست پێبکات؟ لەکوێوە دەبوا دەست پێبکا؟ خوداوەند ئەوی ئەژنۆ بە ئەژنۆ لەگەڵ ئەم پیاوە پیرۆزە دانیشاند بوو، تائەو قسانەی ئەو دەیکرمو ئەو موجیزانەی کەئەنجامی دەدا بەئەمانەتی تەواوە تۆمار بکات، کە لە بەین نەچنو نەوەکانی ئایندە بتوانن لەوانە ئاگاداربنو بەنۆبەتی خۆشی رێگەی رزگاری هەڵبژێرێ، وەك دیاربوو ئەوە کارێ بوو کە خودا باری ئەمانەتی خۆی بەسەر شانی ئەوەوە نابوو، ئەو خوێندنو نووسینی دەزانی، بۆیە بەرپرسیارتیەکی سەنگینی هەبوو: بەرپرسێتی جێگیرکردنی هەموو ئەو شتانەی کە لەبێن دەچون، بەقەڵەمی خۆیو جاویدانکردنی بە وەسیلەی نووسینەوەیان، لێگەڕێ با یارانی کریست لەو بێزاربن، لێگەڕێ با روو لەو وەربگێڕن، بۆ؟ چونکە زەمانێ باجگربووە، ئەو بەوانی نیشاندەدا کە گوناهکاری مرۆڤێکی باشترە بۆ کارو هیچ کاتێ گوناهێ ناکات. قەڵەمی نایە ناو دەوای بڕونزیو زەنگی زبری چەند باڵێ لەلای راستی خۆیەوە بیست، وابەدیار دەکەوت کە فریشتەیێ هاتووەو ئیملا لەناو زەینی دەکات، بەدڵنیاییو خێراییەوە دەستی کرد بەنووسین:



(( کتێبی درەختنامەی کریست کوڕی داود کوڕی ئیبراهیم، ئیبراهیمی...هێنا )). ئەو نووسیو نووسی تا ئەوکاتە لەخۆرهەلاَت لە رۆشنایی سیمائاسا درەوشایەوەو یەکەمین کەلەشێر خوێندی.

ئەو لەگەڵ تۆماسو کەرەناکەی لە پێشەوە رۆیشتن، تۆماس کەرەنای لێدەداو دێ بێدار دەبۆوە، هاواری دەکرد ((مالاَوا.. بەئومێدی دیداری هەرچەند زووتر لەناو مەلەکوتی ئاسماندا)). .. دوای ئەوانەوە کریست لەگەڵ یاوەرانو کۆنەپۆشانو فەلەجیەکانی ناصیرە، کە هێشتا لەدوای ئەو دەرۆیشتن ژمارەشیان بە هاتنی خەڵکی تازە لە زیاد دەبوو، ئەوان چاوەڕوان بوون بە خۆیان دەگوت (( لەوانەیە ئەو ئێمە فەرامۆش نەکات، ئەوکاتە پیرۆزە دەگات کە بۆ لای ئێمەش دەگەڕێتەوەو لەبرسیەتیو نەخۆشی رزگارمان دەکات)). ئەمڕۆکە یەهودا لە دوا رێز مابۆوە، ئەو خورجینییێکی گەورەی دۆزیبۆوەو لەبەردەم ماڵەکان دەوەستا بەسەداییێکی نیوە پاڕانەوەو نیوە هەڕەشەئامێز لەگەڵ ژنان قسەی دەکرد (( لەسەرشانی ئێمەیە گیان ببەخشین تا ئێوەی مندالٚ رزگارتان بێ، لەسەرشانی ئێوەشە یارمەتیمان بدەن تا لەبرسان نەمرین. ئەوە بزانن کە هەتا پیاوە پیرۆزەکانیش پیوستیان بە خۆراك هەیە تا گیانیان وەبەر بێتو مرۆڤایەتی رزگار بکەن، نان، پەنیر، کشمیش، خورما، مشتێ زەیتون، هەرچیەك بێ، خودا تۆماری دەکاتو لە رۆژی پەسلاَنێ پاداشتتان دەداتەوە، بەیەك قلە زەیتون کە دەیبەخشن خودا یەك زەیتونستانتان پێ دەبەخشێ)). ئەگەر ژنێ لەکردنەوەی سندوقی خۆی سەرپێچی کردبا بەسەریا هاواری دەکرد (( بۆ ئەوەندە رەزیلی خانم؟ سبەی یا دووسبەی یا هەتا ئەمشەو ئاسمانەکان دەکرێنەوەو ئاگر دێتە خوارەوە لە هەموو ئەو شتانەی کەتۆ هەیتت جگە لەوەی کە بە ئێمەی دەدەیت هیچ شتێ نامێنێتەوە، تۆی مەوجوودی بێچارە ئەگەر رزگارت بێ ئەو رزگاری تۆ قەرزاری ئەو نانو زەیتونو شوشە روونەیە کە بەمنت داوە. ژنەکان بەترسەوە سندوقیان دەکردەوە، کە یەهودا گەیشتە پەراوێزی دێکەوە، خورجینەکەی پڕبوو لە سەدەقە، زستان دەستی پێکردبوو، زەمین دەلەرزی، درەختەکان زۆریان کە رووت بووبوونەوەو بەڕووتی تەواوەوە بەسەرپێوە وەستابوون، سەرمایان بوو، درەختەکانی دیکە-زەیتونو دارخورماو سەرونیاز.. خودا پیرۆزی کردبوونو لەزستانو هاویندا زێڕو

زیوەری خۆیان هەر پێوەبوو کەس دەستی پێ نەکەوتبوو. مرۆڤەکانیش هەر وابوون، تەواوی هەژارەکان، وەك چۆن درەختی رووت سەرمایان بوو.

یۆحەننا کۆنەپەشمینی خۆی بەسەر کریستداداو ئێستا کە لەبەرخۆ دەلەرزی، پەلەی بوو بگاتە — کفرناحوم-و سندوقی دایکە بکاتەوە، سالومەی پیر لەماوەی تەمەنی خۆی زۆر شتی چنی بوو دڵێکی گەورەو سەخی هەبوو، جلی گەرمی بەهاوسەفەرەکانی دەبەخشی، بەڵام لەو وەختەوە کە زوبەدی پیری پولپەرست پرتەوبۆڵەی بوو جوێنی دەدا ئەو سالومە بوو کە بەسەرسەختیو لەهەمان کاتدا میهرەبانی ماڵێی بەرێوەدەبرد.

فیلیپیش بەپەلەبوو ئەندێشەی دۆستی گیانی بەگیانی خۆی —ناتانیل- دەکرد، ناتانیل درێژایی رۆژێی لەکفرناحومدا خەرجی پینەکردنی نەعلو سۆلە دەکرد، ژیانی ئەو لەم رێیەدا لەنادەچوو، لەکێ دەیتوانی کاتێ بدۆزێتەوە تا زەینی خۆی بۆلای خودا هەڵبڕی، یا پەیژەی یاکوب هەڵواسێتە ئاسمانو سەرهەڵگرێ! فیلیپ لەبەرخۆ دەیگوت ((کەی دەگەمە ئەوێکەوە تا نهێنی گەورەی بۆ بدرکێنم تا ئەویش بی نەوایە رزگاری بێ)).

سوورانەوەو تەبەریەیان جێهێشت تەبەریە شارێك بوو خودا لێی تووڕە بوو بوو لەگەڵ حاکمەکەی کە بکوژی پاکشۆربوو بەئاگر مەحکومی کردبوون، مەتی خۆی گەیاندە پەترۆس تا ئەو شتانەی لێ بپرسێ کەلەبیری ماوە دەربارەی رووباری ئوردونو پاکشۆرو هەروا رووداوەکان تا بەش بەش بیاننووسێتەوە. بەڵام پەترۆس خۆی کشاندەوە نەوەکا هەناسەی پیسی باجگری پێ بکەوێ.

مەتی دڵگیر بوو دەفتەرەکەی نایە ژێر باخەڵی، لەوانی دیکە خۆی وەپاشدا، بەدیتنی دوو پەیتونوان کە خەڵکی تەبەریە بوونو دەچوونە ئەوێکەوە، دەربارەی کوشتنی پاکشۆرو روودانی کوشتارەوە پرسیاری لەوان کرد، تا یاداشتی بکات، ئایا راست بوو کە حاکم مەستی بوو زڕکچەکەی —سالومە- بەڕووتی لەبەرچاوی ئەو سەمای کردووە؟ مەتی دەبوایە ئاگاداری وردەکاریەکان بووایە تا بە وێنەکردنیان جاویدانیان بکات.



لەوکاتەدا ئەوان دەگەیشتنە چاڵێکی گەورەی دەرەوەی مەجدەل، تاریکییێکی کەمڕەنگ کەوتە سەر رووی زەوی، بەنی رەشی باران هەڵواسراو زەویو ئاسمانی بەیەکەوە گرێدا. مەجدەلیە چاوی خۆی بڕیە کلاوڕۆژنەی ماڵەکەیو لەڕەش بوونی ئاسمان وەئاگا هاتو لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە.

((زستان هاتووە دەبێ پەلەکەم)). تەشی سووڕاندو بەخێراییێکی تازەوە دەستی کرد بە رستنی خوری کەپەیدای کردبوون، لەبەرچاوی بوو کە بۆ مەعبودی خۆی بیچنێ تا لەشەڕی سەرما بەدووربێ، جاروبار سەرێکی هەڵدەخستە حەوشەکەوەو هەنارێکی گەورەی پڕ لەوانە ستایش دەکردو نەیدەڕنی، هەمووی نەزری کریست کردبوو، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە: خوداوەند بەمیهرو دلۆڤانە، رۆژێ دێ کە مەعبودم دووبارە بێرەدا رەت دەبێو دامەنم پڕ هەنار دەکەمو لەبەر پێکانی دادەنێم، ئەویش لاردەبێتەوە بە هەڵگرتنی هەنارێك گەرووی خۆی تازە دەکاتەوە)). لەکاتێکدا خورییەکەی دەچنیو دارهەناری ستایش دەکرد، ژیانی خۆی بەرێدەکرد، ژیانی ئەو لەگەڵ کریستی کوڕی مێرێ دەستی پێکردبوو دەگەیشتە ئەنجام، تائێستاش چەند ئازارو سەرمەستی چەشتووە! بۆ کریست لەم دوا شەوەدا، سەرەتا خۆی پیشاندا ئەوکاتە وەکو دز رایکردبوو ئەوی جێهێشتبوو. ببینە دەبێ ئێستا لەکوێ بێ؟ ئایا لەجیاتی زەوی کێلان، نەجاڕی، ماسیگری، هەڵبژاردنی هاوسەر (ئێ باشە ژنانیش ئافەریدەی خودابوون) ئێستا لەگەڵ سێبەرەکان شەڕ دەکات؟ چ دەبوو ئەگەر یەکجاری تر بەمەجدەلدا تێپەڕێ تا بەلای ئەودا رابکاتو هەنارێ لەبەرپێی روو بکاتو گەرووی تازە بکاتەوە.

مەجدەلیە لەهەمانحاڵدا لە غەرقی ئەم بیرۆکانە بوو بەدەستی چاپووكو کارامەی خۆیەوە تەشی دەسووڕاند، دەنگی هاوارو شەیپور گەیشتە گوێی ((مەرج دەکەم کە ئەوە تۆماسی دێوەرەیە؟))

ئەوکاتە بیستی کە کەسێ هاوار دەکات: ((دەرگای ماڵەکانتان بکەنەوە دەسەڵاتی ئاسمان گەیشتووە)). مەجدەلیە لەجێوە هەڵسا، مەلی دڵی لەخۆشیانا هەڵدەفڕی، (ئەو هاتبوو ئەو هاتبوو) تاو لەرزە بەناو ئەندامەکانیدا تاویدا، بەبێ چەفیە رایکردە

دەرەوە، خەرمەنی کەزیەکانی بەسەر شانەکانیەوە پەرش‌و بلاۆبۆوە، بەحەوشەدا رەت بوو گەیشتە دەروازە، ئەوکاتە خوداوەندی بینی، بەهاوارو خۆشحالیەوە کەوتە سەر پێیەکانی‌و بەهەناسە برکێوە گوتی: ((مەولای من... مەولای من، بەخێر بێی!)) هەنارو نەرزی خۆی فەرامۆش کردبوو، پێیە پیرۆزەکانی لەباوەش گرت‌و پرچی شین‌و رەشی کە هێشتا بۆنی عەتری سەردەمی بەدکاریدەدا پەرش‌و بلاۆی سەر زەوی بۆوە، دووبارە گوتی:

((مەولای من.... مەولای من بەخێربێی)). بەئارامی ئەوی بەرەو کوختەی بچووکی خۆیەوە راکێشا، کریست لاربۆوە، دەستی ئەوی گرت‌و لەسەر زەوی بەرزی کردەوە، گوڵ ئاساو سیحراوی کریست لە زاواییێکی بێ ئەزمون دەچوو کە دەستی بووکی خۆی لەدەست گرتبێ تا ناخی بوونی خۆی غەرقی لەززەت بوو، ئەوە مەجدەلیە نەبوو کە ئەو بەسەر زەویەوە بەرزی کردبۆوە بەڵکو رۆحی ئینسان بوو ئەو زاواکەی. مەجدەلیە دەلەرزی، سووردەبۆوە، پرچی خۆی دەهاویشتە سەرشان تا دایپۆشێ، هەموو سەرسام بووبوون‌و سەیری ئەویان دەکرد، ئۆخ کە چەند سیس بوو رەنگی پەڕیوە! ئەڵقەی ئەرخەوانی رەنگی دووچاوانی ئەوی داگرتبوو، دەمی سفت‌و گۆشتنی ئەو، وەکو گوڵێکی بێ ئاو پەژموردە بووبوو، هەر لەو کاتەی کە مەجدەلیەو کریست قۆڵ لەناو قۆڵ بەرێدا دەرۆیشتن خەڵکی وایان بیردەکردەوە کە خەو دەبینن ئەو دووە بەسەر زەویدا هەنگاویان هەڵدەهێنا، بەڵکو لە هەوادا مەلەیان دەکردو بۆ پێشەوە دەچوون، ئایا ئەوە جەژنی زەماوەند بوو ئەو ئاپۆڕەی کۆنەپۆشانیش کە کوچەو کۆلانەکانیان پڕکردەوە میوانەکان بوون؟ ئەو دارهەنارە پڕ لەمیوەیە کە لەناو حەوشەی بینی بوو ئایا رۆحی میهرەبان بوو؟ یا خودای خانەوادە، یا رەنگە ژنێکی خۆشبەختتر لەو رۆح‌و خودایە؟ کە کوڕو کچانی هێناوەتە دونیاو ئێستا لەناو حەوشی خۆیدا وەستاوەو دەبێتە قوربانی‌و سەدەقەیان؟

کریست بەئارامی گوتی ((مەجدەلیە تەواوی گوناهەکانت بەخشراوە، چونکە لەئەندازەبەدەر ئەڤینیت کردووە)). مەجدەلیە بە تاسووقێکی لەوەسف بەدەر بۆ پێشەوە لاربۆو، دەیەویست بلێ کە ئەو پاکیزەیە، بەلاٚم هێندە تژی لەززەت بوو کە





دەمی کردەوە نەیتوانی. بەرەو دارهەنار رایکردو کەوتە گیانیەوە، کۆشی خۆی پڕکردو بەرپێی خۆشەویستەکەی پڕکرد لە هەناری قورمزی.

ئارەزووی دێرینەی دڵی هاتەدی، بۆیە کریست لاربۆوەو هەنارێکی دەست دایێ، شەقی کرد دەستی پڕ لەدانە کردو گەرووی خۆی تازە کردەوە، ئەوکاتە یاوەرانی هەریەکەو بەنۆبەتی خۆی لاربوونەوەو هەنارێکیان دەست دایێ‌و گەرووی خۆیان تازەکردەوە.

کریست گوتی ((مەجدەلیە، بۆ وا بەمجۆرە بەچاوانی شڵەژاوت سەیری من دەکەی، دەڵێی مالاٚواییم لێدەکەی؟

– ئەی مەعبوودی من، هەر لەو زەمانەوە کە هاتوومەتە دونیا، هەمیشە لە هەموو ساتێ سەلامم لەتۆ کردوەو خواحافیزیم کردووە. ئەوەندە بەئارامی قسەی کرد کە تەنها کریست‌و یۆحەننا کە نزیکی ئەو بوون، بیستیان، دوای ساتێك بێدەنگی بەردەوام بوو لە قسە ((دەبێ سەیری تۆ بکەم، چونکە ژن لەجەستەی پیاو خەڵق بووە، هێشتاش ناتوانم لەشی خۆم لە لەشی پیاو جیابکەمەوە. بەلاٚم تۆ دەبێ سەیری ئاسمان بکەیت، چونکە تۆ پیاوی‌و پیاویش خودا خەڵقی کردووە، لەبەرئەمە کوڕم رێم پێ بدە تا سەیری تۆ بکەم.

وشەی — کوڕم- ی بەدەنگێکی وا هێنایە سەر زمان کە هەتا کریستش نەیبیست، بەلاٚم مەمکەکانی خودی ئەو پڕبۆوەو تەکانی خوارد، وەك بلێی شیر بە کوڕەکەی دەدا.

زەمزەمەیێ لەمیانی ئاپۆڕەکەوە هەڵسا، لەناکاو نەخۆشی تازە هاتن‌و حەوشەیان پڕ کرد، پەترۆس گوتی ((مەولای من خەڵکی سەبریان نەماوە کەوتونەتە بلمەو بۆڵەوە.

– چییان دەوێ؟

– قسەیێکی موحیبەت ئامێز، پەرجوو سەیریان کە.

کریست گەڕایەوە، لەهەوای شپرزەی رێژنەدا کە هەڵدەڕژا سەیری ئاپۆڕەکەی کرد کە بەدەمی نیوەکراوەیان، پرس‌و تەمەنناو بەچاوانی پڕ لە ئازارو دەردەوە سەیریان

دەکرد، پیرەمێردێ لەمیانی ئاپۆڕەکەدا هاتە پێش، ئەو لەبەین چوو بوو، پێڵوەکانی لەدوو بڕبێ دەچوون. دە نووشتە بەدەوری گەردەنی ئێسقان ئاسای شۆڕبوبۆوە کە هەریەك گوزارشتی لە دەفەرمان دەکرد، خۆی دابووە سەر گۆچانە دوو فلیقانەکەی لە دەرگای ماڵدا وەستا بەدەنگێکی پڕ لە ناچاریو ئازارەوە گوتی ((مەولای من... من پیرەمێردێکی سەد ساڵەم، دە فەرمانم بەگەردەنمەوە هەڵواسیوە تاهەمیشە لەبەرچاوم بێ، سەرپێچیم لەهیچ یەك لەو فەرمانانە نەکردووە، هەموو ساڵێ دەچمە ئورشەلیم قۆچێکی قوربانی پێشکەش بە صەبایوتی پیرۆز دەکەم، مۆم دادەگیرسینمو بخور دەسووتێنم، شەوانە لەجێی خەوتن مەزامیرەکانی داود دەخوێنمەوە، جارێ سەیری ئەستێرەکان دەکەمو جارێ کێوەکان- لە چاوەڕوانی دابەزینی خوداوەند دەمێنمەوە تا دیداری بکەم، ئەو تەنها پاداشتێکە کە بە دوایدا دەگەڕێم، ئێستا ساڵەهای ساڵە کە لە چاوەڕوانیدا ماومەتەوە، بەلاّم چ چاوەڕوانیەکی بێهودە، پێم لەسەر لێوی گۆڕە، بەلاّم هێشتا ئەوم نەبینیووە، بۆ...بۆ؟! ناچاری من ناچارییێکی گەورەیە، کەی خودا دەبینم؟ کەی ئارام دەبمەوە)) وەك چۆن قسەی دەکرد دەم بەدەم تووڕەتر دەبوو، درێژەی نەکێشا کە گۆچانی دووگوێی لەزەوی کوتاو هاواری دەکرد. کریست بزەییێکی هاتێ، وەلاّمی دایەوە ((پیرەمێرد یەکێ بوو یەکێ نەبوو، لەدەروازەی رۆژهەلاّتی شارێکی گرینگ، تەختێکی مەڕمەڕی هەبوو، هەزار پاشا کە چاوی راستیان نابینابوو هەزار پاشای نابیناش لە چاوی چەپیانەوە بەسەر ئەم تەختەوە دانیشتبوون هەموو ئەوانە بانگی خودایان دەکرد کە دەرکەوێ تابیبینن، بەلاّم هەموویان بەحەسرەتەوە سەریان بردە ژێر گڵ، لەو کاتەی کە پاشا مردبوون گەداییێکی پێپەتیو برسی هاتو بەسەر تەختەکەوە دانیشت لەبەرخۆ گوتی ((خوادوەند چاوانی مرۆڤ ناتوانێ راستەوخۆ سەیری خۆرەتاو بکات، چونکە کوێر دەبێ، کەواتە ئەی بەرزو بەتوانا، چۆن دەتوانێ راستەوخۆ سەیری تۆ بکەن؟ ئەی پەروەردگار میهرەبانیم پێ ببەخشە دەست لە گەورەیی جەبەڕوتی خۆت هەڵگرە تا منی هەژارو بێ سەواد بتبینم)) ئەوکاتە — گوێ بگرە پیرەمێرد- خوداوەند پارچە نانێك، جامێ ئاوی سارد، کراسێکی گەرم، کوختەییێکی گەرمو لەبەردەم کوختەکەوە ژنێ کی شیری دەدا بە منالەکەی نانێکی بۆ نارد، گەدا دەستەکانی درێژ کرد بەخۆشحالّیەوە بزەییێکی کرد بەزەمزەمەکردنەوە



گوتی: سوپاسگوزاری تۆم خودایە، تۆ لەبەر خاتری من فەروتەنیت کردو بووی بە نانو ئاو کراسێکی گەرمو ژنو منالّم، تابتوانم تۆ ببینم من تۆم دیت، من خۆم داوێمە سەرخاك جوانی هەزار رووخساری خۆشەویستی تۆ ستایش دەکەم)).

کەس دەنگی لێوە نەهات، پیرەمێرد وەك گاییێکی کێوی ئاخی هەڵکێشا بە بۆپێشەوە بردنی گۆچانی دوو فلیقانەی لەمیانی ئاپۆڕەکەدا ون بوو، دوای ئەو تازە زاوایە هاتە پێش، مشتی خۆی بەرز کردەوەو هاواری کرد ((دەڵێین تۆ ئاگرت لەدەستێکدا گرتووە تا دونیا بسووتێنی، ماڵو منالاّنی ئێمە بسووتێنی، ئایا ئەوەیە ئەو عەشقەی کە بانگەشەی هێنانی دەکەی بۆ ئێمە؟ ئایا ئەوە عەدالەتە: ئاگر؟

چاوانی کریست پڕ لە ئەشك بوو زگی بەو تازە زاوایە سووتا، راستی ئەوە عەدالەت بووکە دەیهێنا: ئاگر؟

ئایا رێگاییێکی دیکە نەبوو بۆ گەیشتن بەڕزگاری؟

دوای ئەم گەنجە، خاوەن ماڵێ لەمیانی ئاپۆڕەکەوە رێی خۆی کردەوە تا بۆ بیستن نزیکتر بێت، چونکە گوێکانی گران بوون هاواری کرد : ((بە ڕوونی بەئێمە بڵێ بۆ رزگاربوون چ بکەین؟))

کریست وەك گەواڵە نەڕاندی ((پەنجەرەی دلّتان بکەنەوە سندوقەکانتان بکەنەوە، سەرو سامانتان دابەشی سەر هەژاران بکەن، رۆژی خوداوەند هاتووە، ئەو کەسەی کە لە ڕووی دلّڕەشیەوە پارچە نانێ، گۆزە رونێ، یا پارچە زەویێ بهێڵێتەوە لە دواینی تەمەنیدا ئەو نانو رۆنو زەویەوە وەك رستەیێ کە گەردەنی خۆی هەڵدەواسێ بۆ بنی دۆزەخ رادەکێشێ.

خاوەن ماڵ گوتی ((گوێکانم وزەوز دەکەن ببوورە دەڕۆم هەست دەکەم سەرم گێژ بووە)). بەتووڕەییەوە بۆلای دەرگای ماڵی ئەعیانی خۆی راسپاربوو ((تووخودا گوێ بگرن سەروسامانمان لەنێوان هەژارە ئەسپێونەکان دابەش کەین، ئەوە عەدالەتە؟ نەفرەتی خوای لێ بێ)).

لەکاتێکا لەبەرخۆ قسەی دەکردو جوێنی دەدا بەردەوامی بە رێی خۆیدا.

کریست سەیری ئەوی کردو ون بوو، بەهەڵکێشانی ئاخێ گوتی ((دەروازی دۆزەخ کراوەیەو ڕێگاش کراوەو گوڵڕێژ، بەڵام ئەو دەروازەیەی کە کۆتایی بەمەلەکوتی خودا دێ تەنگەو ڕێگە پڕ گردو لێژە، لە ژیاندا دەبووایە هەڵبژێرم بۆ کە ژیان یانی ئازادی، بەڵام کاتی مەرگ چەندو چۆنی نییە، هەرچییەك بووبێ ڕێی نەجات نییە پیاوێ بە گۆچانی ژێر هەنگڵیەوە هاواری کرد ((ئەگەر دەتەوێ باوەڕ بەتۆ بهێنین، پەرجوویێ بکەو من چاکەوە، مەگەر دەتوانم بەپێیە شەلەکانم بچمەناو مەلەکوتی ئاسمانەوە؟

– هەروەها منی جوزامی

– منی بێ بازووش

– منی نابیناش

نەخۆشەکان بەیەکەوە بۆ پێشەوەچونو بەحاڵەتێکی هەڕەشە ئامێز لەبەردەم ئەودا وەستان، لەکاتێکدا کارامەیی خۆیان لەدەست دابوو دەستیان کرد بە هاوار کردن.

پیرەمێردێکی نابینا گۆچانەکەی خۆی بەرز کردەوەو هاواری کرد ((چارەسەرم بکە دەنا لەو دێیە بەگیانی سەلامەتەوە ناچیتە دەرەوە))

پەترۆس گۆچانەکەی لەدەست پیرەمێرد دەرهێناو گوتی ((بەم ڕۆحەی کە تۆ هەیتت هیچ کاتێ ڕۆشنایی نابینی)) نەخۆشو پەککەوتووەکان وەبەریەك هاتنو تووڕەبوون. یاوەرەکانیش بەنۆبەتی خۆیان تووڕەبوونو لەتەك کریستەوە قەراریان گرت، مەجدەلیە بەوەحشەتەوە دەستی درێژکرد تا دەرگا داخات. بەڵام کریست نەیهێشتو گوتی ((خوشکم مەجدەلیە، ئەم نەوەیە، نەوەییێکی بەدبەختە، هەموو لەش، نەرێت، گوناهەو چەوری ڕۆحی وردکردون، من گۆشتو ئێسقانو بەدەن وەلا دەنێم، تا ڕۆح پەیدا بکەم، بەڵام شتێ نادۆزمەوە، ئەفسوس! وابیردەکەمەوە کە تەنها ڕێگەی چارەسازی ئاگرە)).

ئەوکاتە بەچاوانێ کە ئێستا وشكو بێ بەزەیی بووبوون، رووی لە ئاپۆڕەکە کردو گوتی ((بەهەمان شێوە کەئێمەی جووتیار بەر لە تۆو پێوەکردن مەزرا دەسووتێین، تا ببینە مایەی تۆوێکی ڕەونەقدار، بەهەمان جۆر خوداوەند زەوی دەسووتێنێ، ئەو



ڕەحم بەدڕكو داڵو داسو ترخێنە ناکات، مانای عەدالەت ئەوەیە، ماڵاوا، تۆماس شەیپورت بژنە.. لێرە دەڕۆین)). گۆچانەکەی رادایە پێشو خەڵکە بێ هۆشەکە ڕێیان کردەوە بەنێوانیان ڕەتبوو. مەجدەلیە رایکردە لای ژوورەکەیو چەفیەکەی هەڵگرتو خوریە نیوەڕستراوەکەی داناو قاپە قوڕاوییەکەی دانایە ڕەفو مریشکە دان پێنەدراوەکان لەحەوشەو کلیلی فڕێدایە سەر زەوی. ئەوکاتە بێ ئەوەی سەیرێ بکاتە دواوە بەخامۆشی لەکاتێکا چەفیەکەی توند دەکرد کەوتە دوای کوڕی مێرێەوە.

## بەشی بیستو سێیەم

لەم کاتەدا کە گەیشتنە کفرناحوم، شەو تازە پێی نابووە دونیا ڕێژنەیێ بەسەریانا رەت بووبوو، بای شەماڵ هەڵیکردبوو، هەورەکانی بەرەو لای باشوور رادابوو.

هەردوو کوڕەکەی زوبەدی گوتیان ((ئەمشەو هەموو لە ماڵی ئێمە دەخەوین، ماڵ گەورەیە بە ئەندازەی تەواو بۆ هەمووان جێ هەیە لەهەمان جێدا بار دەخەین)).

پەترۆس لەکاتێکا پێدەکەنی گوتی: ((چ بەزوبەدی پیر دەڵێی؟ ئەو یەك دڵۆپە ئاو ناداتە فریشتەش)).

یۆحەننا سوور هەڵگەڕاو گوتی ((پشت بەئوستاد ببەستە هەناسەی گەرمی ئەو زوبەدی دەخاتە ژێر کاریگەریێتی خۆیەوە، بەڵام کریست نەیبیست، ئەو لەپێشەوەدا رێی تەی دەکرد چاوەکانی تژی نابیناو شەلو جوزامی بووبوو، لەبەرخۆ دەیگوت ((چ دەبوو ئەگەر دەمتوانی دزە بکەمە رۆحی مرۆڤ هەڵێمو بەسەریانا هاوار بکەم: بێداربنەوە، ئەوسا لە کاتی بێداربوونەوە جەستە دەبو بە رۆحو چاك دەبۆوە)). هەمان ئەوکاتەی چونە ناو بازاڕی گەورەی شار، تۆماس شەیپوری خۆی نایە سەر لێو تا تێی هەڵکا، بەڵام کریست نەیهێشتو گوتی ((ئەم کارە مەکە من ماندووم)). بەڕاستیش رووخساری سپی بووبوو دەوروبەری دەمو چاوی شین هەڵگەڕابوو. مەجدەلیە لەیەکەم دەرگای ماڵی دا تا داوای جامێ ئاو بکات، کریست خواردیەوەو هێزی وەبەرهاتەوە، بەبزەییێکەوە گوتی ((مەجدەلیە من جامە ئاوێکی فێنك قەرداری تۆم)) ئەوەی کە لە کەناری بیرەئاوی یاکوبدا بە ژنە سامیراییەکەی گوتبوو هاتەوە بیرو پێداچوو گوتی ((بە جامە ئاوێکی جاویدانی لەبەر قەرزی تۆ دێمە دەرێ))



مەجدەلیە بەرووخسارێ کە وەك گوڵ سوور هەڵگەڕابوو وەڵامی دایەوە:

((مەولای من چەند ماوەیەك لەمەوبەر ئاوێکی جاویدانیت بەمن داوە)). لەکەنار کوختەی ناتانیلدا ڕەت بوون، دەرگا کراوەبوو، خاوەن ماڵ، لەحەوشەی لە ژێر دارهەنجیردا وەستابوو، بەداسێکی بچووك گەڵا مردووەکانی درەختی جیادەکردەوە، فیلیپ بەخێرایی خۆی لەگروپی سەفەرکارەکان جیاکردەوەو چووە ژوورەوە گوتی ((ناتانیل دەمەوێ شتێ بەتۆ بڵێم لەکوتە زاخکردن گەڕێ)) بەرەو ماڵ چوو، ناتانیل لەدوای ئەو چووە ژوورەوە، مەشخەڵی داگیرساند ((مەشخەڵو دارهەنجیرو ماڵەوە لەبیرکەو وەرە....))

– بۆ کوێ؟

– بۆ کوێ؟ مەگەر هەواڵت نەبیستووە؟ کۆتایی دونیا هاتووە، ئەمڕۆ سبەی ئاسمانەکان دەکرێنەوە.

دونیا دەبێتە خۆڵەمێش، زوو بجولێ تا بچینە ناو کەشتیو رزگارت بێ..

– کام کەشتی؟

– باوەشی کوڕی مێریەی کوڕی داود، مەولای ئێمە لە ناصیرە، ئەوتازە لەبیابان هاتۆتەوە لەو جێیەی کەخودای دیوە، خودا لەگەڵ ئەوگفتوگۆی کردووە بڕیاری نابوودیو رزگارکردنی دونیایان داوە، خوداوەند دەستی خۆی لەسەر سەری مەولای ئێمە داناوەو گوتویەتی ((بڕۆ ئەوانەی کە شایستەی رزگاربوونن هەڵبژێرەو تۆ نوحی تازەی ئەو کلیلەی کەشتی بگرە تا بتوانی بیکەیتەوەو دایبخەی)). ئەوکاتە کلیلە زێڕینەکەی دابوو بەوەوە، کلیلی بەگەردەن هەڵواسیوە، بەڵام چاوانی ئێمەی مرۆڤ ناتوانن بیبینێ)).

– فیلیپ روونتر قسە بکە، تەواو سەرم لێ شێواوە، ئەوەکەی ئەو سەیرو سەمەرەیە روویداوە؟

– لەمن دەبیستی هەر ئێستا لەبیابانی ئوردن، پاکشۆر کوژراوە رۆحی ئەو چۆتە ناو جەستەی مەولای ئێمەوە، ئەو گۆڕاوەو کێوی بووەو نوور لەدەستەکانیدا دەگەشێتەوە، هەر ئێستا لەکانادا کچی ئیفلیجی یوزباشی ناصیرەی دەست لێداو کچیژگە یەکسەر لەجێوە هەڵساوەو دەستی بەسەما کرد، بەڵێ سوێند بەدۆستایەتیمان دەخۆم ئێمە نابێ ئەو هەلە لەکیس خۆمان بدەین... وەرە.

ناتانیل ئاخێکی هەڵکێشا ((بزانە فیلیپ، من تەواو کەوتبوومە رێوە، راسپاردەی زۆرم هەیە.. سەیرکە هەموو ئەو نەعلەو پێڵاوە پێست مامزانە دەبێ چاکرێنەوە، کەسبو کارم بەخێرایی رەونەق وەردەگرێ ئێستا)).

نیگاییێکی لەڕووی رامانەوەکردە دەوروبەری خۆیو سەیری ئەو کەرەستانەی کرد کە لەگیانی خۆی ئازیزتربوون، سەیری ئەو چوارپایەی کرد کە لەسەری دادەنیشتو پینەدۆزی دەکرد، کەتەر، شوژن، دەزوو، بزماری سەرپان...و دووبارە ئاخێکی هەڵکێشاو بەبنی لێویەوە گوتی ((ئاخر چۆن دەتوانم دەسبەرداری ئەوانە بم؟))

– نیگەران مەە، لەو بەرزاییەدا کەرەستەی زێڕین وەدەست دێنیێ، سۆلەی زێڕینی فریشتان چاك دەکەیتەوە، راسپاردەی جاویدانەی بەدەر لەژمارەت بۆ دێت، بەبێ کاری نامینێیتیەوە، تەنها زووتر جولە بکەو وەرە بە ئوستاد بڵێ ((من لەگەڵ تۆم)). تەنها ئەوە ((من لەگەڵ تۆمو بۆ هەر شوێنێ بڕۆی بەدوای تۆ دێم تا دەمی مەرگ)) شتێکە کە ئێمە سوێندمان پێ خواردوە پینەدۆز بەلەرزێکەوە لەگیانی گوتی ((تادەمی مەرگ!)) ئەو لەشێکی زلو زەبەللاحی هەبوو، بەلاّم دڵی وەك دڵی بچووکی پەروانە وابوو.

شوانە بۆ ئەوەی دڵنیای بکات گوتی ((کوڕێژگە، لەرێگەی قسەوە گوتم ئەوە شتێکە سوێندمان پێ خواردەوە، بەلاّم دڵێکی بەهێزت هەبێ کە ئێمە بەرەو گەورەیی دەچین نەك مەرگ، دۆستی من، ئەو پیاوە مرۆڤێکی ئاسایی نییە ئەو کوڕی ئینسانە)).

– مەگەر نەئەوەی کە مرۆڤو کوڕی مرۆڤ وەك یەکن؟



– یەکن؟ شەرم لە قسەی خۆت ناکەیتەوە؟ مەگەر هیچ کاتێ قسەی دانیال پێغەمبەرت نەبیستووە؟ ((کوڕی ئینسان)) واتە کریستیانو، بەگوزارشتێکی دیکە واتە پادشا ئەو هەر زوو دەیەوێ بەسەر تەختی جیهانەوە دانیشێ، ئێمەش واتە هەموو ئەوانەی لەڕووی تێڕوانینەوە بەدوای کەوتووین شانازیو نیعمەتەکانی دابەش دەکەین، ئیدی بەپێی پەتی بەرێ ناکەوێ، سۆلەی زێڕین لەپێ دەکەیو فریشتەکان لاردەبنەوەو تا قەیتانی پێلاّوت دابخەن، ناتانیل لەمنت گوێ لێ بێ، ئەوە مامەڵەییێکی چاکە لێنەگەڕێی لەدەستت بچێ، ئیدی زیاتر لەوە دەتەوێ چیت پێ بڵێم، تۆماسیش هاتە رێزی ئێمەوە، ئەو پیسکەیە لە بۆنێکی خۆشی بەرلووت کەوت هەتا کراسەکەی خۆشی دایە هەژارانو تاویدا، تۆش راکە، ئێستا ئەو لە ماڵی زوبەدیە.... یاڵڵا وەرە بابڕۆین.!

ناتانیل هێشتا بەدوودڵی لەشوێنی خۆیدا مایەوە، عاقیبەت گوتی ((تەماشاکە فیلیپ، تۆ لە ئەنجامی کار بەرپرسی من هوشیارت دەکەمەوە کە لە حاڵەتی ئەوەی هەست بەمەترسی بکەم تێی دەتەقێنم من بۆ هەموو شتێ ئامادەم تەنها لە خاچدان نەبێ. فیلیپ گوتی ((زۆرباشە... زۆرباشە، لەو حاڵەتەدا هەردووکمان تێی دەتەقێنن، ئەگەر وا بیر دەکەیتەوە کەوا ئەقڵم لە دەستداوە، قەبوڵە؟ کەواتە یاڵڵا بڕۆین)).

– ئێستا کەوایە پشت بەخودا بابڕۆین.

ناتانیل دەرگای داختو کلیلی نایە باخەڵی دوو نەفەری قۆڵ لەناو قۆڵ چوونە ماڵی زوبەدی.

کریستو یاوەرانی لەتەك ئاگر دانیشتنو خۆیان گەرم دەکردەوە، سالومەی پیر لێوانلێوی لەززەت بووبوو لەهاتو چۆدابوو، تەواوی ناخۆشیەکانی نەمابوو، دەهاتو دەچوو، سفرەی رادەخستو غرووری ئەو بەهەموو کوڕەکانیو خزمەتکردنی مرۆڤی پیرۆز کە هاتووی مەلەکوتی ئاسمان بوو، وەسف نەدەکرا، یوحەننا سەری لەبن گوێی دایکی نا چپەییێکی کرد، بەسەیرکردنی یاوەران دایکی ئاگادار کردەوە کە چۆن ئەوان بە لەبەرکردنی جلی کەتانی زستانی دەلەرزین دایکی پێکەنی، چووە ژوورەکەیو سندوقی کردەوە جلە خوریيەکانی دەرهێنا، ئەوکاتە بەخێرایی بەر لە گەڕانەوەی

مێردی جلەکانی لەمیانی ئەوان دابەش کرد، قەبەترین عەبا کە لەخوری سپی بەهادار دروست کرابوو بەئارامی بەسەر شانی کریستی دادا.

کریست گەڕایەوە بزەییێکی بۆ کردو گوتی ((دایە سالومە خودا پاداشتت بداتەوە، تەواوی هەق‌و دادپەروەرییە کە مرۆڤ بایەخ بەجەستە بدات، جەستە وشترێکە کە رۆح سواری دەبیٚ‌و تا لە بیابان بپەڕێتەوە، لەبەر ئەمە بایەخی پیٚ بدە تا توانای بەرگەگرتنت هەبیٚ. زوبەدی پیر هاتە ژوورەوەو سەیری میوانە نەناسیاوەکانی کرد، لە رووی بیٚ مەیلیەوە سەلامی لیٚ کردن‌و لەسوچێکەوە دانیشت، قەت کەیفی بەو دزانە نەدەهات ((ئەو وای پێدەگوتن)) بەداوەتی چ کەسیٚ هاتوون‌و مالّی ئەویان داگیرکردووە؟ ژنە دەست‌و دلّ کراوەکەی پێشتریٚ سفرەییێکی شاهانەی بۆ ئەوان راخستبوو، نەفرەت لەو رۆژەی کە ئەو موتەعەسیبە نوێیە هاتبووە ئاراوە، قەیدی ناکا دوو کوڕی دزیوە، ئەوە چ فەرمایشتێك بوو؟ تازە دەبیٚ هەموو رۆژیٚ لەگەلّ ئەو گەمژەڵەی کە لایەنی کوڕەکانی دەگرت سەر لەبەر سەری یەکتر بنێن، گەمژەلّ خانم دەیگوت ئەوان کارێکی چاکیان کروە، ئەو پیاوە پەیامبەرێکی بەڕاستی بوو کە دەبێتە پاشا رۆمیەکان دەردەکاو بەسەر تەختی شاهانە دادەنیشیٚ پاشان یۆحەننا لەلای راستی‌و یاکوب لەلای چەپی ئەوەوە بەسەر تەخت دادەنیشیٚ، نەك بەناونیشانی دوو ماسیگر لەناو کەشتی، بەلّکو بەناونیشانی خاوەن گەورەو بەرز واخەیالّ دەکەی کە ئەوان دەبیٚ تەواوی ژیانیان لیٚرە لەسەر ئاو لەناوببەن؟ ژنیژکە گەمژەلّەکە پێی لەزەوی دەکوتاو دادوبێدادی دەکرد هەمیشە سەری زوبەدی دەکوتایەوە، زوبەدی جاریٚ جوێنی دەداو هەرچیەك بکەوتایە بەر دەستی دەیشکاند، جارێکیش ناچار دەبوو بچێتە دەرەوە تا کەناری دەریاچە، وەکو دێوانەکان پیاسە بکات، لە ئەنجامدا خۆی مەست دەکرد، تەنها یەك شت کەم بوو ئەویش بەهاتنی ئەو یاساشکێنانە تەواو دەبوو. ئەوساکە خودی ئەوان نۆ نەفەربوون، بەس نەبوو، ئەو پەتیارە هەزار زاوایە، مەجدەلیەشی لەگەلّ خۆی هێنابوو، بەدەوری سفرە دانیشتبوون وهەتا نیگایێکیشیان نەدەکرە ئەو کەخاوەن مالّ بوو، داوای مادۆنیشیان لێنەدەکرد، سەیرکە بە چ دوا عاقیبەتێك گرفتار بوینە، کەواتە خودی ئەوو باوانی سالّەهای سالّ بەخاتری ئەو مشەخۆرانە گیانیان داوە؟ لەبەر زۆر تووڕەیی شێت بوو، بەهەلّبەزینەوە لەجێی خۆی



هاواری کرد ((سەبر بکەن بزانم، ئەو مالّە مالّی کێیە؟ مالّی منە یا ئێوە؟ دوو دووتا چوارتا دەتوانن بفەرموون پێم بلّێن؟))

پەترۆس کە چەند پیالّەییێکی لێکدەداو شەنگولّ بووبوو، وەلاٚمی دایەوە (مالّی خودایە، مالّی خودا، زوبەدی مەگەر هەوالّت نەبیستووە؟ ئیدی هیچ شتیٚ مالّی من یا مالّی تۆ نییە هەموو شتی مالّی خودایە)) زوبەدی گوتی ((یاسای موسا))، بەلاٚم موسا تاوی دایە ناو قسان‌و گوتی ((ئەوە چی دەبیستم؟ زوبەدی، یاسای موسا ئیدی فاتیحەی لیٚ بخوێنە، ئەو یاسایە تەواو بووەو چۆتە گەردشێکی دوورو درێژ ئیدی ناگەڕێتەوە، ئێستا ئێمە یاسای (کوڕی ئینسان)مان هەیە تێگەیشتی؟ هەموومان براین دلّمان فراوان بووە لەگەلّ دلّیشمان یاسا فراوان بووە، ئێستا یاسا تەواوی مرۆڤایەتی دەگرێتەخۆ، تەواوی زەوی، زەوی موژدەپێدراو، سنوورەکان نەماون زوبەدی، هەمان ئەو کەسەی من کە لەبەردەم خۆم دەبینی تا دەچێتە تەواوی دونیاوە تا بانگەشەی قسەکانی خودا بکات. دەچمە رۆما- بەلّیٚ پێمەکەنە- گەرووی ئیمپراتۆر دەگرم بەزەوی دادەدەم‌و خۆم بەسەر تەختەوەدادەنیشم بۆنا؟ وەك چۆن ئوستاد گوتی ئێمە ئیدی ئەو جۆرە ماسیگرە نین کە تۆ دەتەویٚ، ئێمە راوەماسی ناکەین، ئێمە راوچی مرۆڤین، بائەوەش بلّێین، شەراب‌و خۆراکی زۆرمان بۆ بهێنە، چونکە رۆژیٚ کە بەم زووانە دەگات ئێمە دەبینە خاوەنی شکۆو گەورەیی، ئێوە پارچە نانێکی وشك بەئێمە دەدەن‌و ئێمەش لەباتی ئەمە لە ماوەی چەند رۆژیٚ یەك تەنوور نان بەئێوە دەدەین، ئینجا چ نانیٚ! هەمیشەیی! هەرچەندی لیٚ بخۆیت تەواوبوونی بۆ نییە.

زوبەدی کە دووبارە خزایە سوچێکەوە، لەوەلاٚمدا گوتی، بێچارە من لەپێشدا دەبینم کە سەراوبن لە خاچیان داوی)) بەو قسانەی کە لە پەترۆسی گویٚ لیٚ بوو، هێدی هێدی هەستی بە ترس دەکرد، لەبەرخۆ گوتی ((باشتر وایە دەرگای دەمم داخەم، مرۆڤ ئاگای لەرووداوان نییە، دونیا خڕەو دەسووریٚ، لەوانەیە رۆژیٚ هەمان ئەو شێتانە... لەبەرئەمە باشتروایە عاقیبەت بین بم،

یاوەرەکان چاپلوسیان دەکردو ئەوان تەواو کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە پەترۆس شنگۆلّەو شۆخیەکەی بۆ چۆتە سەر، بەلاٚم هەمان ئەو بیرۆکانە بەزەینی ئەواندا

رادەبرد، هەرچەندە کە بەم ئەندازەیە مەست نەبوون کە بیرۆکەی خۆیان بخەنە سەر زمان، مەلەکوتی ئاسمان بریتی بوو لەو بەرزیو گەورەییە، بریتییە لە جلی ئاوریشمین، ئەلقەی زێرینو خۆراکی زۆری دونیا کە لەژێر چەکمەی یەهوددا هەستیان پێدەکرد، زوبەدی پیر پیاڵەییێکی دیکەی سەرهەڵگەڕانو دڵو زای پەیداکردو گوتی ((ئوستاد تۆ ناتەوێ دەمت بکەیتەوە؟ هەموو ئەو شتانە لەژێر سەری تۆنو ئێستاش زۆر بێ جیاوازی لەپشتەوە دانیشتیو ئێمەش خەریکە شۆڕش دەکەین.. سەیرکە بۆ خاتری ئەو خودایەی کەتۆ دەیپەرستی، دەکرێ بەمن بڵێی کە بۆ کاتێ دەبینم دەمخەنە خاکی رەشەوە نابێ لام تاکاق قسەیێ بکەم. کریست وەڵامی دایەوە (( زوبەدی زەمانێ پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو دروێنەی دەکرد ترێی چنی زەیتونی کۆکردەوە، گۆزەکانی پڕ دەکرد، دەیخواردو تێردەبوو بەسەر رووەوە لەحەوشە رادەکشا دەیگوت: ((ڕۆحی من تۆ ماڵو نیعمەتێکی زۆرت هەیە، بخۆو بنۆشەو سەرخۆش بە))، بەڵام بەم گوتنەی ئەو سەدایێ لە ئاسمان بیسترا: ((ئەی گەمژەڵ هەمان ئەمشەوە رۆحت بۆ دۆزەخ سەرەوژێر دەبێتەوە، ئەو هەموو ماڵو نیعمەتەی کە دوریتتەوە بەکەڵکی چی تۆ دێ؟)) زوبەدی تۆ گوێت هەیەو ئەوەی کە بە تۆ دەڵێم دەیبیستی، ئەقڵت هەیەو لەمەبەستم دەگەی، ئومێدەوارم کە ئەم سەدایەی ئاسمان شەوو ڕۆژ لە بالآی سەرت بێ)). خاوەن ماڵی پیر سەری هێنایە خوارەوە هیچی نەگوت: دروست لەهەمان کاتدا دەرگا کرایەوەو فیلیپ لەئاستانەی دەرگا وەدیارکەوت، لەدوای ئەو ناتانیل بوو، لەو جێیەی کە ناتانیل بڕیاری دابوو، ئیدی دڵی دوو جۆر سازی نەدەژەنی، لەکریست نزیک بۆوە، لاربۆوەو پێیەکانی ئەوی ماچ کردو گوتی ((مەولای من، من تادەمی مەرگ لەگەڵ تۆدام))

کریست دەستی بەسەر قژی ئاڵۆزو رەنگ خۆڵەمێشی ئەو داهێنا ((ناتانیل بەخێر بێی، بۆ ئەوانی دیکە سۆلە دروست دەکەیو خۆشت بە پێخواستی بەڕێدا دەڕۆی، ئەو کارە من زۆر شادومان دەکات. لەگەڵ مندا وەرە)). ئەوی لەتەنیشت خۆی دانیشاندو پارچە نانێك، پیاڵە شەرابێکی بەودا (( ئەو لوقمە نانە بخۆو ئەم پیاڵە شەرابە بنۆشە، تا لە وجودی تۆدا ببێتە جەستەو خوێنی من)) ناتانیل نانی خواردو شەرابی نۆشی یەکسەر هەستی کرد کە هێز وەبەر رۆحو ئێسقانەکانی دادێ، شەراب هەروەکو



خۆرەتاو هەڵات زەینی وەك گوڵ لێهاتو شەرابو خوێنو ڕۆح بوونەیەك، ئەو بەسەر تاوەییێکی داغدا دانیشتبوو، دەیویست قسەبکات، بەڵام شەرم ئەوی داگرتبوو.

ئوستاد پێی گوت : ناتانیل قسەبکە، پەنجەرەی دڵت بکەوەو خۆت ئاسوودە بکە)).

– مەولای من دەمەوێ بزانی کەمن هەمیشە مرۆڤێکی هەژار بوویمە، بەشێوەی رۆژانە ژیانم بەسەر بردووە هیچ کاتێ هەلی موتالای شەریعەتم پەیدا نەکردووە، مەولای من، من کوێرم لێم ببوورە، تەنها دەمەوێ بزانی هەرچیەك لەدڵم بوو گوتمو حەسامەوە.

کریست سەری لاواندەوەو دەستی نایە سەرشانی پانو پۆڕی ئەم پیاوە تازە بینایە بە پێکەنینەوە گوتی ((ناتانیل ئاخ هەڵمەکێشە دوو ڕێگا لەباوەشی خودادا کۆتاییان پێ دێ، یەکیان ڕێی ئەقڵەو ئەوی دیکە ڕێگەی دڵە، ئێستاگوێ بگرە لەو داستانە، هەژارێكو دەوڵەمەندێكو هەرزەیەك لەیەك رۆژدا مردنو لەیەك سەعاتدا ئامادەی دۆسیەی دادوەری خودایی بوون، هیچیان شەریعەتیان نەخوێندبوو، خوداوەند برۆکانی تێکچڕژاندو لە هەژارەکەی پرسی ((تازیندوو بووی بۆ شەریعەتت نەخوێند؟ وەڵامی دایەوە ((پەروەردگارا من هەژارو برسی بووم، شەوو رۆژ گیانم هەڵدەقرچا تا خۆراکی ژنو منالم دابین بکەمو کاتم نەبوو)). خوداوەند بەتووڕەیی گوتی ((یانی تۆ لە — هەلیلی بەندەی من هەژارتر بووی؟ ئەو پارەی نەبوو بیدات کە دەچووە کلێسا تا گوێی لەراڤەی شەریعەت بێ، لەبەر ئەمە دەچووە سەربانی کلێسا بەسەر کلاوڕۆژنەی بنمیچدا رادەکشاو گوێی رادەگرت، بەڵام بەفر دەباریو وا نقوومی بیستن دەبوو کە ئاگای لەبەفر نەدەما، سپێدە کاتێ خاخام دەهاتە کلێسا دیتی هەوا تاریکە، سەری بەرزکردەوەو بەسەر کلاوڕۆژنەوە لەشی مرۆڤێکی بینی، چووە سەربان، بەفری لادا هەلیلی دەرهێنا بەسەر بازووەکانی خۆی داناو هێنایە خوارەوە، ئاگرێکی داگیرساند گەڕاندیەوە ژیان، ئەوکاتە مۆڵەتی بەو دابوو لەمەودوا بەبێ پارە بێتە ناو کلێساوە، هەلیل بووە خاخامێکی ناودار کە هەموو خەڵك ئاگادارن لەو، ئێستاچۆن دەتوانی خۆت بێ گوناه دەرێنی.

هەژارەکە بەبنی لێویەوە گوتی ((خودایە ناتوانم)). کەوتە گریەوە. خودا رووی لە دەوڵەمەندەکە کرد ((ئەی تۆ تا زیندوو بووی بۆ شەریعەتت نەخوێند؟))

– من پارەو پوڵم زۆرزۆر بوو، باغو غولامو سەودای زۆرم هەبوو، ماوەم نەبوو. خوداوەند گوتی (( واتە تۆ لە ئیلیازری کوڕی هارشوم، کە هەزار دێو هەزار کەشتی بەمیرات بۆ مابۆوە دەوڵەمەندتر بووی؟ کاتێك زانی کە حەکیمێ لەشوێنی راڤەی شەریعەت دەکا، هەموو شتێکی رەهادەکرد باشە چ پاساوێکت بۆ بێگوناهی خۆت هەیە؟ دەوڵەمەندەکەش بەنۆبەی خۆی گوتی ((پەروەردگارا، هیچ))و کەوتە گریانەوە.

ئەوکاتە خودا رووی لە پیاوە هەرزەکە کرد ((تۆش کوڕی قۆز شەریعەتت نەخوێند؟))

– من لەڕادەبەدەر جوان بوومو ژنان دەبوورانەوە، بەو هەموو خۆشگوزەرانیەوە کە هەمبوو لەکێ ماوەی وەدەستهێنانی شەریعەتم پەیدادەکرد؟

– خۆ جوانی تۆ لە یوسف کە ژنی موتیفار گیانی بۆ دەدا زیاتر نەبوو؟ یوسف ئەوەندە جوان بوو کە بە هەتاوی دەگوت ((ئەی هەتاو هەڵێ تا منیش هەڵێم)) لەوکاتە کەشەریعەتی کردەوە، وشەکانی لەبەر چاوی دەبوونەوە ماناکان لەشێوەی نوورو مەشخەڵ دەردەهاتن.. چیت هەیە بیڵێی؟

– پیاوە هەرزەکارەکە بەبنی لێویەوە گوتی ((خودایە هیچ شتێ))و کەوتە گریە.

ئەوکاتە خودا وشەکانی لێکدا هەلیلو ئیلیازرو یوسفی بانگ کردە بەهەشت، کەهاتن گوتی ((ئەو پیاوانە دادگایی بکەن کە لەبەرخاتری هەژاریو سامانو جوانی شەریعەتیان نەخوێند)).

هەلیل تۆ هەژارەکە دادگایی بکە.

هەلیل وەڵامی دایەوە ((خودایە چۆن دەتوانم مەحکومی کەم کاتێکدا کە دەزانم بەدبەختیو برسیەتی مانای چییە، ئەو دەبێ ببەخشرێ. خودا گوتی: ئیلیازر ئەو دەوڵەمەندە دەخەمەژێر دەستی تۆ تا دادگایی بکەی؟))



ئیلیازر وەڵامی دایەوە ((خودایە، چۆن دەتوانم مەحکومی بکەم لەحاڵێکا دەزانم دەوڵەمەندبوون چ مانایێکی هەیە- مانای مەرگ، ئەو دەبێ عەفو بکرێ)).

– تۆ یوسف؟ نۆبەتی تۆیە کە ئەو پیاوە جوان رووخسارە دادگایی بکەی؟

– خودایە چۆن دەتوانم تاوانباری کەم لەکاتێکا دەزانم زاڵ بوون بەسەر جوانی، جەنگو جیدال بەرپا دەکاتو چ شەهادەتێکی وەحشەتناکە، دەبێ ئەو عەفو بکرێت.

کریست لەقسەکردن وەستا، بزەییێکی هاتێو سەیری ناتانیلی کرد، بەڵام پینەدۆز لە شپرزەیی بیری خۆیدا پرسی ((پاشان خودا چی کرد؟))

کریست بەخەندەیێ وەڵامی دایەوە (( ئەگەر لەجێی ئەو بای چیت دەکرد؟))

پینەدۆزی سادەدڵیش پێکەنی ((واتە ئەوەی کە من رزگار بووم)) هەردوو دەستی ئوستادی گرتو لەناو دەستەکانی خۆیا کوشیو هاواری کرد ((مەولای من تێدەگەم، تۆ گوتت دوو رێ لەباوەشی خودا کۆتاییان دێ رێی ئەقڵو رێی دڵ. من رێی دڵم هەڵبژاردو تۆم دۆزیەوە. کریست لەجێوە هەڵساو بۆلای دەرگا چوو، بایێکی توند هەڵیکردو دەریاچە شەپۆلی دەدا، ئەستێرەکانی ئاسمان، چەند دانە زیخێکی نەرمو بێ ژمار بوون، بیابانی وەبیر هاتەوەو کەوتە لەرزەو دەرگەی داخست گوتی ((شەو دیاری گەورەی خودایە، دایکی مرۆڤە، لەسەرخۆو ئارام دەگات تا داپۆشێ، دەستی فێنکی لەسەر توێڵی مرۆڤەوە دادەنێ چەرمەسەری رۆژانە جەستەو رۆح پاك دەکاتەوە، یان کاتی ئەوەیە کە خۆمان بسپێرینە باوەشی شەوەوە))

سالومەی پیر قسەی ئەوی بیستو هەڵسایە سەرپێ، مەجدەلیەش لەکەناری ئاگر لە شوێنێ کە سەری لارکردبۆوەو بەشادومانی گوێی لەدەنگی مەعبودی خۆی بوو هەڵسایەوە، ئەوان دۆشەگو لێفیان هێناو رایانخست یاکوب چووە حەوشەو یەك باوەش داری لەگەڵ خۆی هێناو لە سۆپای کرد، کریست بە باڵابەرزییەوە لە ناوەندی حەوشەکەوە وەستا، رووی لەئورشەلیم کردبوو، دەستەکانی بەرزکردەوەو بەدەنگێکی قووڵ نوێژی پاشێوانی کرد ((خودایە دەرگای رەحمەتت بۆ ئێمە بکەوە، رۆژ دەچێتە خوارەوە، خۆرەتاو دەکەوێتە خوارەوەو ون دەبێ، ئەی پەروەردگاری جاویدانی ئێمە

پەنامان بۆ بەردەرگای تۆ هێناوە، ئومێدی بەجێهێنانی پاڕانەوەمان لەتۆ دەوێ، بمان بەخشە، بەزەییت بەئێمە بێتەوەو رزگارمان بکە)).

پەترۆس فەرمووی ((خوداوەند، خەون فورسەتێکی چاکە، لێگەڕێ با لە خەوی قایغی سەوزی کۆنینەمەوە، سەرلەنوێ چارۆگەی قورمزی ببینم)). زۆری خواردبۆوە شادوشەنگەڵ بوو. کریست لەناوەندێو یاوەرانیشی لەدەروبەریدا خەوتبوون، درێژیو پانی حەوشە گیرابوو، زوبەدیو ژنی بێبەش مابوونەوە، لەبەر ئەمە چوونە مالّی هاوسێوە، مەجدەلیەش لەگەڵ ئەواندا رۆیشت، پیرەمێرد بۆڵەبۆڵی دەکرد، بێبەش مابۆوە لەهێمنی، لەکاتێکا بە توڕییەوە بۆلای ژنی دەگەڕایەوە، بەدەنگێکی بەرز کە مەجدەلیەش بیبیستێ گوتی ((باشە ئیدی چی؟ لەماڵی خۆم لەلایەن چەند کەسی غەریبەوە دەرکرام... سەیرکە کەوتووینەتە چ حاڵو رۆژێکەوە!))

- بەلاّم خانمی پیر بۆلای دیوار گەڕایەوەو وەلاّمی نەدایەوە.

مەتی ئەو شەوە دووبارە بەبێداری مایەوە، لەژێر نووری مەشخەلّدا چوارچمکی دانیشتو دەفتەری یادداشتی خۆی لەناو کراسی دەرهێنا، دەستی کرد بە نووسین، رووداوی چوونی کریست بۆ کفرناحوم، پەیوەندی کردنی مەجدەلیە بەوانەوەو ئەو مەسەلەی کە ئوستاد گێڕایەوە هەمووی وێناکرد، بەتەوابوونی نووسین، مەشخەلّی خامۆش کردو چووە سەرجێگەی خەوەوە، جێی خەوی دوورتر لەجێی خەوی ئەوانی دیکە بوو، چونکە یاوەران هێشتا لەبۆنی هەناسەی ئەو رانەهاتبوون پەترۆس، چاوی لەسەریەك داناو چووە خەوەوە، بێ درەنگ فریشتەیێ لەئاسمان دابەزی، دەرگاکانی خۆی کردەوەو لەجلی خەونو خەیالّدا ئەوی بردە ژوورەوە، وا دەهاتە بەرچاو کە ئاپۆڕەییێکی زۆر لە کەناری دەریاچەدا گردبووبوونەوە، ئوستادیش لەوێ بوو، غەرقی تەماشای قایغی سەوزی تازە دروست کراو بە چارۆگەییێکی قورمزی بووبوو کە لەناو ئاودا قەراری گرتبوو، لە بەشی دواوەی لووتی قایغەکە ماسییێکی گەورە نەخشێنرابوو کە تاکی هەمان ئەو ماسیەبوو کە بەر سەرسینەی پەترۆسەوە نەخشێنرابوو. کریست پرسی ((ئەو قایغە جوانە هی کێیە؟))و پەترۆس بەغرووڕەوە وەلاّمی دایەوە ((هی منە))، کریست گوتی: ((پەترۆس بڕۆ یاوەرەکانی دیکە بهێنەو لەناوەندی دەریاچەوە



چارۆگە هەلّکێشە تا ببینم بایی چەندی! پەترۆس گوتی ((مەولای من بەکەماڵی مەیلەوە))

یاوەران بازیان دایە ناو قایغو بایێکی لەبار دەستی بەهەلّکردن کرد، بایەوان هەلّمساو ئەوان بەگۆرانی چڕینەوە دەگەیشتنە دەریای ئازاد، بەلاّم لەپڕێکا تۆفانێ هەلّسا، قایغ بەدەوری خۆیدا دەسووڕا، دەنگی دەهاتو خەریکی شەق بوون بوو، ئاو هەلّڕژایە ناویەوەو دەستی کرد بە غەرق بوون، یاوەران بەسەر روویانا کەوتبوون دەیاننالاّند، پەترۆس دارچارۆگەی گرتو هاواری کرد ((مەولای من مەولای من، کۆمەگ)). ئەوکاتە لەتاریکییێکی چڕدا کریست بەجلی سپییەوە بینی کە بەسەر ئاوەوە بۆلای ئەوان دێ، یاوەران سەریان هەلّبڕیو ئەویان بینی بە لەرزینەوە هاواریان دەکرد ((تارمایی .... تارمایی)) کریست پێی گوتن مەترسێن منم)).

پەترۆس لەوەلاّمدا گوتی ((خوداوەندا ئەگەر بەڕاستی ئەوە تۆی فەرمان بدە تامنیش بەسەر ئاودا بڕۆمو بێمە دیدارتەوە)).

کریست فەرمانی پێدا ((وەرە)) پەترۆس لەقایغ بازیدا پێی نایە سەر شەپۆلەکانو دەستی کرد بە رۆیشتن، بەلاّم بەدیتنی دەریای کەفچەر، هەموو گیانی پڕ بوو لە ترس دەستی کرد بە غەرق بوونو هاواری کرد ((خودایە نەجاتم بدە وا غەرق دەبم)) کریست دەستی بردەپێشو بەرزی کردەوەو گوتی ((ئەی مرۆڤی کەم باوەڕ بۆ دەترسی؟ مەگەر لەمن دلّنیا نیت؟ سەیرکە!)) دەستی بەسەر شەپۆلەکانەوە درێژ کردەوەو گوتی ((ئارام بگرن!)) یەکسەر با کشایەوەو ئاوەکان ئارام بوونەوە)).

پەترۆس کەوتە گریانەوە ئەمجارەش رۆحی کەوتە ژێر ئەزمونەوە، جارێکی دیکە بەرووڕەشی لەئاو هاتە دەرەوە، بەهاوارکردنێکی بەرز لەخەو رابوو، ردێنی شەلاڵی فرمێسك بوو بوو هەستایەوەو دانیشت، پشتی بەدیوار داو ئاخێکی هەلّکێشا. مەتی کە هێشتا بێداربوو دەنگی ئەوی بیستو پرسی ((پەترۆس بۆ ئاخت هەلّکێشا؟ پەترۆس بۆ ساتێ خۆی لەگورە نەبرد، راستیت بوێ ئەو قسەی لەگەڵ باجگرەکان نەدەکرد، بەلاّم خەونەکە خەریك بوو دەیخنکاند، بۆ ئارام بوونەوە، دەبوایە هەلّبڕێژێ، لەبەرئەوە خۆی کشاندە لای مەتیو خەونی خۆی بۆ گێڕایەوە، مەتی بەتێرنەبوونەوە،

گوێی راگرتبوو، هەمووی لەزینی خۆیدا دەگوتەوە، بەیانی لەکاتی دەرکەوتنی سپێدە، بەئومێدی خودا هەمووی پاداشت دەکرد.

پەترۆس قسەی خۆی کۆتایی پێهێنا، بەلاّم دلّی وەکو قایغی خەوناوی هێشتا لوولی دەخوارد. لەپڕێکا راجفری ((نەکا ئوستاد بەڕاستی شەوەنگاوان هاتبێ‌و منی بردبێتە دەریای ئازاد تا تاقیم بکاتەوە؟ هیچکاتێ لەژیانم دەریاییێکم بەم گەورەییەو قایغێکم بەمجۆرە واقیعی‌و ترسێکی وام هەست پێنەکردووە)).

– مەتی رای تۆ چییە؟

مەتی وەلاّمی دایەوە : ((بەدلّنیاییەوە ئەمە خەون نەبوو، ئەوە پەرجوویێ بوو بەڕاستی روویدا)). غەرقی ئەندێشە بوو کە چۆن بەیانی بیخاتە قەلّەمەوە، ئەو لە بەرزەخی بڕیاردانی نێوان خەون‌و راستی نەخشکردنی ئەوە بوو، وێناکردنی مایەی گرفتێکی زۆرە، هەم خەون بوو هەم راستی، پەرجووەکە روویدابوو، بەلاّم لەسەر زەوییەوە نا بەسەر دەریاوە، لەجێگاییێکی دیکە- لەکوێ؟

چاوەکانی داخست تا دەربارەی ئەو شتانە دانیشێ‌و بیریان لێ بکاتەوە، بەلاّم خەو ئەوی رفاند.

ڕۆژی دوایی، باران لەگەلّ باییێکی سەخت دەم نادەم دەهاتە خوارەوە، ماسیگران نەیانتوانی چارۆگە هەلّدەن، خۆیان لە کوختەکانی خۆیاندا زیندانی کرد، تۆڕەکانی خۆیان چاك دەکردەوە، کەوتبوونە راڤەو گفتوگۆ دەربارەی ئەو میوانە سەیرەی کە لە مالّی زوبەدی دابەزی بوو، وابەدیار دەکەوت کە یەحیای پاکشۆر دووبارە هاتۆتەوە ژیان، بێ چەندوچون دوای دابەزینی وەشانی جەللاد، پاکشۆر سەری بڕاوی خۆی نایەوە سەرمل‌و بەخێرایی برووسك رۆیشتبوو، بەلاّم بەمەبەسی دووبارە دەستگیر نەکردن‌و جیابوونەوەییێکی دیکەی سەر لەلەش لەلایەن هرودیسەوە، لە لەشی کوڕی نەجارِ دۆناودۆن بووەو بوونەتە یەك.

بەسەرسامی لەخۆی دەپرسی کە ئایا ئەو یەك نەفەر یا دوو نەفەر، لەڕووبەڕوودا کە سەیری بکەی، وادێتە بەرچاو کە مرۆڤێکی سادەیەو بزەت بۆ دەکات، بەلاّم



هەرکاتێ زەڕڕەیەك دووردەکەوێتەوە، یەکێ لە چاوەکانی تووڕە دەبێ دەیەوێ تۆ بخوات، چاوەکەی دیکەشی دەتخاتە ئارەزووی ئەوەی کە نزیکتر بکەویتەوە، نزیك دەبیەوە سەرت گێژ دەبێ، ئەگەر دیقەت بکەی کە چ رووداوێ لە بوونت روودەدات مالّ‌و مندالّت جێدەهێلّی‌و بەدوای دەکەوی! ماسیگرێکی پیر بەبیستنی ئەم قسانە سەری راتەکاندو گوتی ((ئەو رووداوە دەربارەی کەسانێ روودەدا کە ژنیان نەهێنابێ، فیکرو زکری ئەوان نەجاتدانی دونیایە بەقولاب یا گۆچان، هێزێ لە بوونیان دەکولّێ‌و لە سەریاندەدا، بۆ خاتری خوا هەموو ئێوە ژن بهێنن‌و لێگەڕێن هێزی ئێوە لەژنان بگەڕێ تا منالّتان ببێ‌و ئاگرتان ساردبێتەوە)). یونسی پیر، عەسری رۆژی پێشتر لەو خەبەرە ئاگادار بووبۆوە، لە کوختەکەیدا بەچاوەڕوانی دانیشتبوو لەبەرخۆ دەیگوت: ئەوەندە ناخایەنێ، بەدلّنیاییەوە کوڕەکانی دێنە سۆراغیەوە. تابزانن مردووە یا ماوە، بەدرێژایی شەو چاوەڕوان بوو، ئومێدەوار بوو پاشان ئومێدی بڕا، سپێدە زوو پۆتینی کەشتیڕانی خۆی کە لە کاتی زەماوەندی خۆی دووریبووی لەکاتە گرینگەکاندا لەبەری دەکرد، کردە پێی‌و تەشکەبەڕی کردە بەرو لەمیانی باراندا بۆلای مالّی زوبەدی دۆستی خۆی کەوتەڕێ، دەرگای کردەوەو چووە ژوورەوە، ئاگر داگیرسابوو، دەوروبەری دە پیاوو دوو ژن لەبەردەم ئاگرەکە دانیشتبوون، یەکێ لە ژنەکانی ناسیەوە کە سالومەی پیر بوو، ئەویدیکە گەنج بوو، لەشوێنێ ئەوی بینی بوو، بەلاّم نەیدەتوانی وەبیر خۆی بهێنێتەوە. ژوور نیوە تاریك بوو، دوو کوڕەکەی، پەترۆس‌و ئاندریاس کە بۆ ساتێ سەریان وەرسووڕاند، لەڕۆشنایی ئاگردا ناسیانەوە، بەلاّم هیچ کەس ئاگای لێنەبوو کە هاتە ژوورەوەو هیچ کەسیش بۆ دیتنی ئەو ئاوڕی نەدایەوە هەموویان ملیان درێژ کردبوو دەمیان بەش کردبۆوە گوێیان دابووە پیاوێ کە رووبەڕوویان بوو، یونسی پیر هەموو لەشی بوو بەچاوو دەم، گوێی قولاّغ کرد تا ئاگای لەقسەی ئەوبێ، جارناجار وشەییێکی وەردەگرت،

((عەدالەت، خود، مەلەکوتی ئاسمان..دیسانیش هەمان قسەی دووبارەو هەمیشەیی، بەم وشانە سەخلّەت دەبوو، لەجیاتی ئەوەی بەتۆ بلّێن، چۆن ماسی راودەکەی، چارۆگە چادەکەیتەوەو قایغ رەنگ دەکەی، چۆن خۆت لەسەرما دەپارێزی، تەڕو برسی نەبی، دادەنیشن دەربارەی ئاسمان مڕەمڕ دەکەن، شوکر بۆ موسیبەتی، ئاخر

نەیاندەتوانی قسەیەك لەبارەی زەوی‌و دەریا بکەن. یونسی پیر تووڕەبوو، کۆخی تا لە هاتنە ژوورەوەی ئەو وەئاگابێن‌و ئاوڕ بدەنەوە، هیچ کەس ئاوڕی نەدایەوە، پێی زەبەلاحی درێژ کردو پۆتینەکەی لەزەوی کوتا، بەلاّم سوودی نەبوو، ئەوان چوارچاو لەدەمی قسەکەری رەنگ پەڕیودا مرِ دامابوون، سالومەی پیر تەنها کەسێ بوو کە ئاوڕی دایەوە، سەیرێکی کردە ئەوەوە، بەلاّم نەیدیت، لەبەر ئەمە یونسی پیر چووە پێشەوە بۆ بەردەم سۆپاکە، دروست لەدوای کوڕەکانی چوارمێخەکی دانیشت، دەستی قەبەی خۆی لەسەرشانی پەترۆس داناو رایتەکاند، پەترۆس وەرسووڕاو باوکی دیت، ئەنگوستی خۆی بەنیشانەی بێدەنگ بوون لەسەر لێوی داناو جارێکی دی رووی کردە ئەو گەنجە رەنگ پەڕیوە، وەك ئەوەی یونس هەر باوکی ئەو نەبێ، چەند مانگە ئەوی نەدیتووە. یونس سەرەتا دلّی رەنجا ئەوکاتە تووڕەبوو، پۆتینەکانی ((کە پێیان دەگرت، داکەلاند تا بۆ رووخساری ئوستاد رایووەشێنێ‌و بێدەنگی کات، تا بتوانێ لەگەلّ منالّەکانی خۆی قسە بکات، پۆتینەکانی بەرزکردەوە دەوری سەری‌و هەلّیسووڕاند، بەلاّم دەستێ لە دواوەڕا ئەوی گرت، گەڕایەوەو زوبەدی پیری دی، زوبەدی بەبنی لێوەوە چرپاندیە گوێی ((یونس هەستە باشتر وایە بڕۆین قسەم لەگەلّت هەیە)). ماسیگری پیر پۆتینەکانی لەباوەش ناو بەدوای زوبەدی دا کەوتە رێ، چوونە ژوورەوەی بنەبانێ، لەتەك یەك بەسەر سندوقی سالومەوە دانیشتن.

زوبەدی لەبەر ئەوەی تووڕەیی خۆی دەخواردەوە زۆری خواردبۆوە، بەمنەمن کردنەوە قسەی کرد ((یونس دۆستی فەلەکزەدەم دوو کوڕت هەیە، دەستیان لێ بشۆ، منیش جووتە کوڕێکم هەیە دەستم لێ شوشتون بەقسەی خۆیان خوا باوکی ئەوانە لەبەر ئەمە دەبێ ئێمە لەخۆمان هەلّدەین، ئەوان بەجۆرێ سەیری ئێمە دەکەن وەك بلّێی بپرسن ((ڕدێن سپی تۆ کێی؟))

ئاخیر زەمانە یونسی بێچارەی من.

((سەرەتا منیش تووڕە دەبووم، دلّم دەیخوازی خەنجەرەکەم بێنم‌و هەلّکوتمە سەریان، بەلاّم پاشان دیتم کەرێگەچارەیەك نییە، لەبەرئەمە سەرم لەکاسەی خۆم بردە خوارەوەو وازم لێهێنان.



ژنەکەشم، ئەو منالّیچکەیە وەکو ئەوان بیر دەکاتەوە، تۆ باش دەزانی واخەریکە دەخەرفێ، بەسەر ئەم راستیەوە بەخۆم گوت باشتر وایە بێدەنگ بم‌و هەمان شتیش بەتۆ دەلّێم، سوودی چییە کە سەرمان نایەشێ دەسمالّی لێ بئالّێنین ((دووتا دووتا چوارتا ئێمە دۆڕاندمان)).

یونسی پیر جارێکی دی پۆتینەکانی لەپێ کردو خۆی لەناو تەشکەبەڕی خۆی پێچایەوە، ئەوکاتە چاوی بڕیە زوبەدی تا ببینێ قسەیێکی تری هەیە بۆ گوتن، زوبەدی قسەیێکی دیکەی نەبوو، لەبەر ئەمە یونس دەرگای کردەوە، سەیرێکی ئاسمان‌و زەوی کرد، وەکو قیر تاریك بوون، باران‌و سەرما بوو، لێوەکانی جولاو بەبنی لێویەوە گوتی ((ئێمە دۆڕاندمان، دۆڕاندمان)). لەنێو گلّ و لیتەدا بەرەو کوختەکەی خۆی کەوتە رێ. لەهەمان حالّدا کە یونس بە تووڕەییەوە رێی تەی دەکرد، کوڕی مێرێ دەستی بۆلای ئاگر درێژ کرد، وەك بلّێی دوعا بۆ رۆحی خودا دەکا کە لەناو مەشخەلّەکان پەنهان بووەو گەرمایی دەبەخشێ بە مرۆڤ، دەرگای دلّی کرابووەوە، دەستەکانی بەرز کردبۆوەو قسەی دەکرد:

– وابیر نەکەیتەوە من هاتووم تا شەریعەت‌و پەیامبەران رەشکەمەوە، من بۆ دژایەتی فەرموودەکانی کۆن نەهاتووم، بەلّکو بۆ ئەوە هاتووم تا فراوانی بەوان ببەخشم، لە ستوونەکانی موسا هاتووە کە (( کوشتار مەکەن))، بەلاّم من بەئێوە دەلّێم مرۆڤ هەتا ئەگەر لەدەستی براکەی تووڕە بوو نابێ دەست بەڕوویا بەرزکاتەوە یاخود قسەی ناشیرینی پێ بلّێ، دەنا فڕێ دەدرێتە ناخی دۆزەخەوە، لە ستوونی موسا هاتووە ((زینا مەکەن))، بەلاّم من بەئێوە دەلّێم کە هەتا ئەگەر کەسێ نیگاییێکی شەهوەت ئامێز بکاتە ژنێکەوە، ئەوە لەدلّی خۆیا زینای کردووە، نیگای ناپاك، مرۆڤ بەرەو دۆزەخ دەبات. شەریعەتی کۆن ئێوە فێردەکات کە : ((ڕێزی دایك‌و باوکتان بگرن)) بەلاّم من دەلّێم دلّی خۆتان لەناو مالّی دایك‌و باوك زیندانی مەکەن، لێگەڕێن دلّتان پەڕ بگرێ‌و بچێتە تەواوی مالّەکان‌و تەواوی سراییل- لەکێوی حەرمونەوە تا بیابانی یەهودیە هەتا ئەولاتریش، رۆژهەلاّت‌و رۆژاوا- تەواوی جیهان لەباوەش بگرن، باوکی ئێمە ئاسمانەو زەویش دایکمانە، ئێمە نیوە خاك‌و نیوە

ئاسمانین، ریزی دایكو باوك یانی ریزی ئاسمانو زەوی، سالومەی پیر ئاخێكی هەڵكێشاو گوتی ((مەولای من وشەكانی تۆ گرانبارە، گرانبارە بۆ دایك)).

كریست وەلامی دایەوە ((پەیڤی خوداش گرانبارە))

دایكی پیر لەحاڵێكدا دەستەكانی خۆی وەك خاچ بەسەریەكەوە دانا بەبنی لێویەوە گوتی : ((دوو كوڕی من بگرە ئەوان هی تۆن)). كریست قسەی دایكە كوڕە لەدەستداوەكەی بیستو هەستی كرد كە تەواوی كوڕانو كچانی دونیا بەگەردەنی ئەو هەڵواسراون، ئەو بزنە ڕەشەی وەبیرهاتەوە كە لە بیابان بینی بووی لە تەواوی گوناهەكانی خەڵك وەرپێچرابوو، نووشتەی شینی بەگەردەنی هەڵواسرابوو، بێ ئەوەی قسەیێ بكات بۆلای سالومەی پیر كە دوو كوڕی بەودابوو لاربۆوەو بەسالومەی گوت ((ببینە، ئەوە گەردەنمو كوڕەكانت باوێ دەوریەوە)).

كریست مشتێ گەلای زەیتونی هەڵڕشتە سەر ئاگر، گەلاكانی لەنێواندا گرت، ماوەییێكی درێژ ئاگر كە گەلاكانی دەسووتاند كەوتە روانینەوە، ئەوكاتە دووبارە رووی لەلای یاوەرەكان كردو گوتی:

– هەركەسێ كە دایكو باوكی زیاتر لەمن خۆش دەوێ شایستەی ئەوە نییە لەگەڵ مندا بێت، هەركەسێ كە كوڕو كچی خۆی زیاتر لەمن خۆشدەوێ شایستەی ئەوە نیە لەگەڵ مندا بێت، فەرموودەكانی كۆن ئیدی فراوانییێكی تەواویان نییە بۆ ئەوەی ئێمە بگرنە خۆ، عەشقەكانی كۆنیش، بۆ ساتێ لەقسەكردن وەستاو پاشان بەردەوام بوو:

– مرۆڤ سنوورێكە، ئەو شوێنەی كە زەوی كۆتایی دێتو ئاسمان دەست پێدەكات، بەلام ئەم سنوورە هەرگیز لە گۆڕانو پێشڕەویدا بەرەو ئاسمان ناوەستێ فەرموودەكانی خوداش لەگەڵ ئەوا خۆیان دەگۆڕنو بۆ پێشەوە دەچن. من فەرموودەكانی خودا لە ستوونەكانی موسا وەرناگرم رایاندەخەم، ناچاری پێشڕەوییان دەكەم

– یوحەننا بەسەرسامی پرسی ((مەولای من، كەواتە بەمجۆرە خواستی خودا دەگۆڕێ؟

– یۆحەننای ئازیز نا، بەلام دڵی مرۆڤ فراوان دەبێو توانا و جێ بوونەوەی زۆرتری خواستی خودا پەیدادەكات. پەترۆس لە كاتێكا لەجێوە راپەڕی هاواری كرد ((كەواتە



بۆ لێرە دانیشتووین یاڵلا با بڕۆین بانگەشە بۆ فەرمایشتە تازەكانی خودا بكەین لە دونیادا))

تۆماس بە تیزئامێزەوە گوتی ((لێگەڕێ با باران بوەستێ تا تەڕ نەبین)) یەهودا بەتووڕەییەوە سەری راتەكانو گوتی ((سەرەتا دەبێ رۆمیەكان دەرپەڕێنین، ئێمە دەبێ بەر لە ئازادكردنی رۆحی خۆمان جەستەمان ئازاد بكەین، بە نۆبەت، تەلار لەسەرەوەڕا بۆ خوارەوە دەست پێ نەكەین، یەكەم جار بناغە لەئارادایە.

– یەهودا رۆح بناغەیە

– من دەڵێم لەش بناغەیە.

– یەهودا ئەگەر رۆحی ناو دەروونی ئێمە نەگۆڕێ دونیای دەرەوەمان هیچ كاتێ ناگۆڕی، دوژمن لەناو دەروونمان دایە، رۆمیەكان لە دەروونماندان، رزگاربوون لە دەروونەوە دەستپێدەكات.

یەهودا وەكو ئەوەی ئاگری گرتبێ لە جێوە هەڵبەزیەوە بۆ ماوەییێكی درێژ، دانی بەخۆیا گرت، گوێی لە هەمووان گرتو هەموو شتێكی لەسینەیا عەمبار كرد،

بەلام ئیدی نەیتوانی زیاتر لەمە بەرگە بگرێو دووبارە هاواری كرد ((یەكەم جار رۆمیەكان)).

ناتانیل كە كەوتبووە شڵەژانەوەو بەتیلەدزەی چاویەوە سەیری دەرگای دەكردو پرسی (( بەلام چۆن دەریان بكەین؟ ئەسخەریوتی دەكرێ پێمان بڵێیێ؟))

–شۆڕش! مەكابیەكان وەبیرخۆت بهێنەوە! ئەوان یۆنانیەكانیان دەركردە دەرەوە، ئێستا نۆبەتی ئێمەیە نۆبەتی مەكابیە تازەكانە كە رۆمیەكان دەركەنە دەرەوە، پاشان هەموو شتێ دووبارە دەكەوێتە دەستی ئێمەوە، دەتوانین بە حسابی هەژارو دەوڵەمەندو زاڵمو مەزلووم رابگەین.

هیچ كەس قسەی نەدەكرد یاوەرەكان نەیاندەزانی كام یەك لەم دوو رێگایە بگرنەبەر، ئەوان سەیری ئوستادیان دەكردو چاوەڕوان بوون، ئوستاد بە ئەندێشەوە سەیری

مەشخەڵەکانی دەکرد، کەی مرۆڤ بۆی روون دەبێتەوە کە تەنها یەك شت لە دوو جیهانی غەیبو بینراودا هەیە ئەویش — رۆحە!

پەترۆس هەستایەوە گوتی ((دەبەخشی، بەڵام ئەم باسانە ئاڵۆزە من تێناگەم با سەیر بکەینو بزانین چی دێتە پێش، ئوستاد مۆڵەتمان بدەرێ بەتەنها بڕۆین تا مۆژدەدەری خەبەری خۆش بین بەمرۆڤ، لەکاتی گەڕانەوە دووبارە دەکەوینەوە سەرباسەکەوە))

کریست سەری بەرز کردەوەو سەیری یاوەرانی کرد، بەهێمای سەریەوە یاکوبو پەترۆس هاتنە پێشەوە، دەستی خۆی بەتوندی دانایە سەری ئەوانەوەو گوتی ئەمانەتی خودا بن بڕۆنو بانگەشەی هەواڵی خۆش بکەن، هەراسان نەبن، خوداوەند ئێوە لە فەنا دەپارێزێ. بەبێ خواستی ئەو هیچ گەڵایێ لەدرەخت ناکەوێتە خوارەوە، خوداتان لەگەڵ بێ، زوو بگەڕێنەوە ئومێدەوارم بەهەزاران رۆحی بەگەردەن هەڵواسراوتانەوە بگەڕێنەوە ئێوە نێردراوی منن، هەرسێ نێردراو لەدوای یەك رابردن، حەوشەی ماڵی زوبەدی بەیانیان پڕدەبوو لە خەڵكو عەسران خاڵی دەبوو، بێمارو ئیفلیجو دەست لێوەشاوەکان لە هەموو لایەك دەهاتن، هەندێ دەگریان، هەندێ تووڕە دەبوونو بەسەر سەری کوڕی ئینسان هاواریان دەکرد، کوە پەرجوویێ بکاتو شەفایان پێ ببەخشێ، مەگەر خودا ئەوی بۆ ئەوان نەناردبوو؟ کەواتە لێگەڕێ با بێتە حەوشەو دەست بە پەرجوو بکات. کریست بەبیستنی گوفتاری ئەوان خەمگین دەبوو، دەچووە حەوشەکەوەو دەستی بەسەری ئەواندا دەهێناو پیرۆزی دەکردنو دەیگوت ((برایانم دوو جۆرە پەرجوو هەیە: پەرجووی لەشو پەرجووی رۆح، تەنها باوەڕتان بە پەرجووی رۆح هەبێ، تۆبە بکەنو رۆحی خۆتان پاك بکەنەوە. لەشەکانیش پاك دەبنەوە، رۆح درەختە، نەخۆشی سەلامەتی، بەهەشتو دۆزەخ میوەی ئەم درەختەن. زۆرانێ باوەڕیان دەهێنا باوەڕهێنانێکی رووت، هەستیان دەکرد کە خوێنیان دەجمێو لەشی بێ هەستیان پڕدەبێ، گۆچانی ژێر هەنگڵیان دوور فرێ دەدا سەمایان دەکرد، ئەوانەی کە کوێر بوون هەر کە کریست دەستی بەسەر چاوی خامۆشی ئەواندا دەهێنا هەستیان دەکرد لە نوکی پەنجەکانیەوە نوور دەتکێتە دەرەوە، پێڵوی خۆیان بەرز دەکردەوە لە شادیان هاواریان دەکرد، چونکە ئەوسا دونیایان دەدیت. مەتی دەفتەرو گوێی



بەکراوەیی رادەگرت، هەتا نەیدەهێشت یەك وشە لەقەڵەم بکەوێ، هەمووی کۆدەکردنەوە سەر رووی کاغەز، بەمجۆرە رۆژ بەڕۆژ کتێبی مۆژدەی دادەنا، رەگاژۆ بوو، لقو گەڵای وەبەرهات، بوو بەدرەخت تا ئەوانەی کە هاتوونو ئەوانەیش کە دوایی دێن لەمیوەکەی بخۆن، مەتی تەواوی کتێبەکانی پەیامبەرانی پاراستبوو، ئەو دەیدیت کە چۆن چۆنی گوفتارو کرداری ئوستاد دروست وەکو راگەیاندنی پەیامبەرەکانی پێشوو بوو، ئەگەر جارناجار بەسەریەکەوە پیادە نەبوونایە بۆ ئەوەبوو کە زەینی مرۆڤ ناتوانی بچێتە بنجو بناوانی کتێبی پیرۆز، قسەی خودا حەوت لایەنی هەبوو، مەتی هەوڵیدەدا تا بۆی دەرکەوێ کە ناهەماهەنگی لەکام لادا دەکەوێتەوە، ئەگەریش جارجارێ، لەڕووی ناچاریدا ئەو کارەی دەکرد ئەوە خودا میهرەبانی دلۆڤانانە، نەك بەتەنها دەیبەخشی کە خۆی دەیویست، هەموو کاتێ کە مەتی قەڵەمی دەگرتە دەست، مەگەر ئەوە فریشتە نەبوو دەهات دەیچرپاندە گوێی کە چی بنووسێ؟ ئەمڕۆکە یەکەمین جار بوو کە مەتی بەئاشکرا بۆی وەدەرکەوت دەبێ لەکوێ دەست پێبکاتو چۆن ژیانو زەمانی کریست هەڵڕێژێتە بەر قەڵەمەوە، دەبوایە لەشوێنی لەدایك بوونو دایكو باوانی هەتا چوار نەوە دەست پێبکات لەناصیرە لەدایك بوو بوو دایكو باوکی هەژار بوون یوسفی نەجارو مێریۆ یەواکیمو ئانای کچ، ... مەتی قەڵەمی گرتە دەستو لەسەرخۆ داوای لەخودا کرد تا زەینی رووناك کاتەوەو هێزی پێ ببەخشێ وەلێ تا هاتنی یەکەمین وشەو بەخەتێکی جوان بنووسێتەوە پەنجەکانی لەشوێنی خۆیدا مانەوە، فریشتە دەستی ئەوی راگرتبوو، دەنگی وێك کەوتنی تووڕەی باڵەکانی لە هەوادا بیستو دەنگێ لەناو گوێکانیدا دەنگی دایەوە: ((کوڕی یوسف نا مەگەر نازانی ئەشعیای پەیامبەر چی دەڵێ ((ئیستا تۆوی لەڕەحمی پاکیزەدا گرێبەست دەبێ کوڕێ دێتە دونیاوە، بنووسە مێرێ پاکیزەبوو بەر لەوەی دەستی هیچ پیاوێك بیگاتێ جوبرایل هاتە ماڵەکەیو گوتی درود لەتۆ کە ئاوێنەی شەرەفیو خوداوەند لەگەڵ تۆدایە)). بێ درەنگ شیر پەڕیە مەمکەکانی.. گوێت لێیە؟

ئەوەیە کە دەبێ بینووسی.. ناصیرە لە کوێ بوو؟ ئەو لە ناصیرەدا لە دایك نەبووە، قسەی مەکانەبی لەبیرنەکەی.

(( تـۆ ئـەی —بیـث لـەحم- هەرچـەندە لـەمیانی هـەزارەها یـەهودی بـچووکی، کەسـێ لـە تـۆوە رادەبـێ کـە فـەرمانڕەوای سـراییل دەکـات، کـە رەگوڕیـشەی لـە دیـرۆك‌و ئەزەلـە)) لەبەر ئەوە کریست لـە بیث لـەحم لـە ئـاخوڕێ لـە دایـك بـوو، کەواتـە ئـەو سـروودەی کـە هـەرگیز هەڵـە قبـوڵ ناکـا چـییە کـە دەڵێیـت (( ئـەو- خـودا- لـە تەویلـەیێ کـە بەرخۆڵـەکان گـوانی دایکیـان دەمـژی هێنایـە دەرەوە تـا ببێتـە شـوانی مێگەلـەکانی یاکوب)) بۆ نانووسی؟ دەستتم ئازاد کردووە بنووسە!)).

بـەڵام مـەتی تووڕەبـوو، بـەرەو لای باڵـە نادیارەکـانی لای راسـتی خـۆی گەڕایـەوەو بـە ئـارامی‌و بەشـێوەیێ کـە یـاوەران چـووبوونە خـەوەو گوێیـان لـە دەنگـی نـەبێ‌و بـەبنی لێوەوە گـوتی بنووسـم‌و نامـەوێ بنووسـم خەنـدەیێکی تیـز ئـامێز لەفـەزا بیـستراو دەنگـێ کـە دەیگـوت ((تـۆ ئـەی مـشتێ خـاك، چ تێدەگـەی کـە راسـتی چییە؟ راسـتی حـەوت لای هەیـە، لـە حەفتـەمین تەبەقـە، راسـتی راسـتی خودایـە، کـە زەڕڕەیـەك لـە راسـتی مرۆڤـەکان ناچـێ بەسـەر تەختـەوە دنیـشتووە، ئـەی مـەتی موژدەنـووس ئـەوە راسـتیەکە لە گوێکانتی دەخـوێنم.. بنووسـە ((سـێ مـوغ بـە پـەیگیری ئەسـتێرەیێکی گـەورە هـاتن تـا ئەو نـەوزادە سـتایش بکـەن. ئارەقـە لـە تـوێڵی مـەتی دا هاتـە دەرەوە، هـاواری کـرد ((مـن نانووسـم مـن نانووسم!))، بـەڵام دەسـتی بەسـەر کاغـەزەوە دەلـەرزی‌و دەینووسـی، کریـست لەخـەودا ئاگـاداری کێشمەکێـشمی مـەتی بـوو چـاوی کـردەوە، ئـەوی بینـی کـە لـەژێر مەشخەڵدا لاربۆتـەوەو بـە هەناسـەبڕکێوە، تـا سـەرحەدی شـکان قەڵـەم بەسـەر کاغـەزدا تـاو پێدەدا. لـە سـەرەخۆ پێـی گـوت ((بـرام مـەتی بـۆ دەنـاڵێنی؟ کـێ لەبـەرزایی تۆیـە؟ مـەتی لەهـەمان حاڵـدا کـە قەڵـەمی تـاو دەدایـە سـەر کاغـەز وەڵامـی دایـەوە ((مـەولای مـن، مەپرسە مـن بەپەلـەم.. بـڕۆ بخـەوە)) دڵـی کریـست گـەواهی دەدا کـە خـودا بەسـەر بـەرزایی سەری مەتی وەستاوە، چاوەکانی داخست تا ئەو شێتیە پیرۆزە دەوروژێنێ.



## بەشی بیست‌و چوارەم

رۆژو شـەو بەسـەر دەچـوون، مـانگێ دەهـات‌و دەڕۆیـشت، مـانگێکی دیکـە دەهاتـەوە، باران، سەرما، ئاگری نـاو سـۆپا، شـەوە بێدارییـەکانی لـە مـاڵی سـالومەی پـیر، هـەژاران‌و دڵ بـەئازاری کفرنـاحوم، هـەموو عەسـران دوای کـارکردن دەهـاتن تـا گـوێ لـە قـسە ئارامبەخـشەکانی تـازەی ئـەو بگـرن، هـەژاران‌و ئەوانـەی حەوانـەوەیان بـۆ نـەبوو دەهـاتن‌و دەوڵەمەنـدو ئـارام دەگەڕانـەوە نێـو کوختـە نالەبارەکانیانـەوە. ئـەو رەزو کەشـتی‌و شادیەی ئـەوانی لەزەمینـەوە بـۆ ئاسمـان دەبـردو لـەوێ گەشـەی دەکـرد، پێـی دەگـوتن کـە ئاسمـان چـەند دڵنیـاترە لـە زەمـین، دڵـی ئـەو بێـچارانە پڕدەبـوو لـە ئومێـد، هـەتا دڵـی زوبـەدی کێـویش دەسـتەمۆ دەبـوو، هێـدی هێـدی قـسەکانی کریـست دزەیـان دەکـردە نـاو دەروونیەوە ئـارام ئـارام مێـشکیی یـاوەر دەکـرد، ئـەم دونیـا نـەرم‌و نیـان دەبـوو، لـەبالآی سـەری ئـەوا جیهـانێکی تـازەی هێـوێن بـە ئەبەدیـەت‌و سـامانێکی هـەرگیز تـەواو نـەبوو پیاسـەی دەکـرد، لـەم دونیایـە سەرسـامە تازەیـەدا زوبـەدی‌و دوو کوڕەکـەی‌و سـالومەی پـیرو پێـنج قایغـەو سندوقـچە پڕەکـان، هـەتا خـودا خـودایی خـۆی بکـات دەژیـن، لەبـەر ئەمە، چـەند باشـتر دەبـوو ئەگـەر وازی لـە هـەرزەگۆیی بهێنایـەو بـەدیتنی میوانـە داوەت نەکراوەکان کە شەوو رۆژ لەماڵی ئەو دابـوون یـا لـە تـەك سـفرەی ئـەو دانیـشتبوون قـسەی نـەکردبا، پاداشـتی ئـەم هـەمووە دەگـات. مـەلی دەسـتەمۆنەکراوی تۆفـان لـە ناوەڕاسـتی زسـتانەوە گەیـشت رۆژەکـان کەوتنـە خواردنـەوەی خۆرەتـاو، خۆرەتـاو دەدرەوشـایەوە، ئێـسقانی رووتـی زەوی گـەرم دەکـردو داربـادەمی ناوەنـدی حەوشـەی زوبـەدی چـرۆی

دەکرد، داربادەم وای بەخەیاڵ دادەهات کە بەهار هاتووە دەستی دەکرد بەچرۆ کردن، مەلە ماسی خۆرەکان دانیشتبوونو چاو لەڕێی ڕۆژانی گەرمو میهرەبان بوون، تا بە ئارەزووی خۆیان بەسەر تەختە تاوێرەکانەوە کاری هێلکە دانانەوە دەست پێبکەن، ئیدی پەرەندەکانی خودا لە بەهاران هێلکە دادەنێنەوە، بەلاّم ماسی خۆرەکان لەناوەڕاستی زستان دەست بەم کارە دەکەن، خوداوەند ڕەحمەتی بۆ دەناردنو وادەی دەدا کە بۆخاتری ئەوان چەند ڕۆژێ لەزستان خۆرەتاو بەگەرمیەوە دەردەکەوێت، ئەم خنیاگران دەریا بە شادی بەسەر ئاوو بەردەکانی گنسارت هەڵدەفڕێن، نەغمەی سوپاسی خۆیان بۆ دەرگای خوداوەند سەردەدا کە جارێکی دیکە وادەی خۆی بەجێهێناوە، بەدرێژایی ئەم ڕۆژە دڵنەزانە، ئەو یاوەرانەی کە مابوون بەقایغی ماسیگری دەچوونە دێهاتە نزیکەکانەوە تا ئەوانیش باڵی خۆیان ئەزمون بکەن، فیلیپو ناتانیل دەچوونە دیتنی دۆستەکانی خۆیان لە جووتیارو شوانەکانەوە تا قسەی خۆیانیان پێ ڕابگەیەنن. ئاندریاسو تۆماس بۆ ڕاوی ماسیگرەکان دەچونە دەریاچەوە، یەهودای لەمرۆڤ هەلاّتوو بەتەنها دەکەوتە کێوان تا تووڕەیی خۆی هەڵڕێژێتە دەرەوە، پێشتر ڕەفتارەکانی ئوستاد ئەوی شاد دەکرد، بەلاّم شت گەلێك بوون ئەو هەرسی نەدەکرد، جارجار پاکشۆری کێوی لە دەمی کریستدا دەینەڕڕاند، بەلاّم جارجارەش هێشتا کە هەر کوڕی نەجاڕ بوو وەکو مەڕ باعەباعی عەشقی دەکرد، ئاخر هەی سەرەڕۆ کام ئەشق؟ عەشقی چ کەسێ دونیا قانقریای هەیەو پێویستی بەچەقۆیە..قسەی من ئەوەیە)). مەتی تەنها کەسێ بوو کەلەماڵ دەمایەوە، دڵی نەدەهات بچێتە دەرەوە، چونکە لەوانەبو ئوستاد قسە بکات، مەتی دەبوایە نەهێڵێ قسەکانی ئەو بەبابچێ، لەوانەبوو پەرجوویی ئەنجام بدات، مەتی دەبوایە بەچاوی خۆی بیانبینێ تا بیانخاتە بەر قەڵەمی خۆیەوە، پاشانیش دەیتوانی بچێتە کێندەرێکەوە؟ دەیتوانی لەگەڵ کێ قسەبکات؟ هیچ کەس لەو نزیك نەدەکەوتەوە، بۆ چونکە ڕۆژێ لەڕۆژان باجگرێکی پیس بووە، لەبەرئەمە مەتی لەماڵەوە دەما بەدزیەوە سەیری کریستی دەکرد کەلەژێر درەختی بادامی چرۆکردودا دانیشتبوو، مەجدەلیە لەبەرپێی کریستدا بوو بە ئارامی قسەی بۆ دەکرد، مەتی گوێکانی قولاّغ دەکردتا قسەیێك بقۆزێتەوە، بەلاّم بێهودە بوو، تەنها کارێ کە



دەیتوانی بکات ئەوەبوو کە سەیری ڕووخساری سەختو شەکەتی ئوستادو ئەو دەستەی کە بەناو کەزیەکانی مەجدەلیەدا دەگێڕا بکات. ڕۆژو شەو زیارەتکەران- جووتیارانی تەبەریەو ماسیگرەکانی گنسارت، شەوانە لە کوێستانەکانەوە- سپێدە زوو دێهاتیەکانی دوور دەهاتن تا گوێیان لە قسەکانی پەیامبەری تازەیێ لەبارەی بەهەشتو دۆزەخو مرۆڤایەتی بەدبەختو میهرەبانی خوداوەندەوە، لەو جێیەی کە هەتاو هەڵدەهاتو ڕۆژێکی بەشکۆ بوو، ئارەزوویان بوو تا ئەو لەگەڵ خۆیان ببەنە دامێنی سەوزی کێوو بەسەر گیای گەرمەوە ڕاکێشنو.گوێ لەو ڕابگرن، لەوانەیە بەسەر چەمەنی بەهارەوە بچنە خەوێکی شیرینەوە، لەبەر ئەمە لە دەرەوەی دەرگا گردبوونەوە- لەبەر ئەوەی دەرگا داخرابوو- هاواریان دەکرد کە ئوستاد بێتە دەرەوە.

کریست گوتی ((خوشکم مەجدەلیە گوێ بگرە خەڵك هاتون من ببەن) بەلاّم مەجدەلیە کە غەرقی چاوی ئەو بووبوو هیچی نەبیست تەنها لەززەتی لە دەنگدانەوەی هاواری وەردەگرت، ئەم هاوارە هەموو شتێکی بەو دەگوت، ئەو پیاو نەبوو بۆیە پێویستی بەقسە نەبوو، جارێکیان گوتبووی (مەولای من، بۆ دەربارەی ژیانی ئایندە قسە لەگەڵ من دەکەیت؟ ئێمە پیاو نین کە پێویستمان بەژیانی ئەبەدی هەبێ، ئێمە ژنین لەبەر ئەوە ئەگەر یەك سات لەگەڵ پیاوێدا بین کە عاشقی ئەوین بەهەشتێکی جاویدانیە، ساتێکی جوداییش دۆزەخێکی هەمیشەییە، لێرە بەسەر هەمان زەویەوەیە کە ئێمەی ژنان بە ئەبەدی دەژین)) کریست دووبارە گوتی ((خوشکم مەجدەلیە خەڵکی بۆ بردنی من هاتوون، دەبێ بڕۆم)) هەڵسایەوەو دەرگای کردەوە، شەقام پڕی بوو لە چاوی پر تاسوقو دەمی بەهاوارو ناڵەی بێماران، کە دەستیان درێژ دەکرد. مەجدەلیە لەتەك دەرگا وەدیارکەوت دەستی نایە سەردەمی خۆی تا هاوار نەکات. لەوکاتەی کە سەیری ئەوی دەکرد بە ئارامی لە پێشەوە دەڕواو ئاپۆڕەکەش لەدوای ئەوەوە بەبنی لێویەوە گوتی: ((خەڵکی جانەوەرێکی کێوین، جانەوەرانی خوێنخۆری کێوی کە تۆ هەڵدەدەڕن)) کریست بە هەنگاوی درێژو لەسەرخۆ، بەرەولای کێوێ کە بەسەر بەرزایی دەریاچەوە سەرهەڵگەڕابوو، کێوێ کە تەنها یەکجار بەسەر بەرزاییەکەدا بازووەکانی خۆی بۆ ئاپۆڕەکە کردبۆوەو هاواری عەشقی کردبوو، بۆ پێشەوە دەچوو، بەلاّم لە مەودای ئەوێ ڕۆژو ئەمڕۆکە زەینی زبر

بووبوو بیابان دڵی رەق کردبوو، هێشتا دەمی پاکشۆری وەك پۆلیە ئاگر بە سەردەمی خۆیەوە هەست پێدەکرد، پێشبینییەکانی ئەو روویانددەداو خامۆش دەبوونەوە، هاواری خودایی‌و نامرۆیی دووبارە زیندوودەبوونەوە ئەو جوزام‌و شێتی‌و ئاگر — سێ کچی خودا- ی دەدیتن کە ئاسمانیان شەق دەکردو دەهاتن بەگەیشتن بە ترۆپك دەمی بۆ قسەکردن کردەوە، پەیامبەرە کۆنەکان لە دەروونیا هەڵدەبەزینەوەو هاواری دەکرد ((لەشکرێکی ترسناك لەو سەری دونیاوە دێت، ترسناك‌و خۆشبەز دێت، هیچ یەك لە جەنگاوەرەکانی لە بەرماندووبوون ناشەلێ- خەواڵونین، هیچ کەمەربەندێ شل نییەو قەیتانی هیچ پێڵاوێ پارچە پارچە نەبووە، تیرەکان تیژو کەمانەکان بە ژێی کشاویان، سمی ئەسپەکان وەك بەرد رەق‌و سەختن، تایەی پەیتونەکان گردبادن ئەم لەشکرە وەك شێرێکی مێینە دەنەڕێنێ هەر کەسێك بگرێ بە ددانەکانی قووتی دەدات کەس ناتوانی نەجاتی بدات. پیرەمێردێ کە مووی سپی بە جەستەیا زیت بووبۆوە هاواری کرد ((ئەوە کام لەشکرە؟))

کریست دەستی بۆ ئاسمان بڵندکرد ((ئەی خەڵکی کەڕو کوێرو گەمژە دەپرسێت ((کام لەشکر؟)) لەشکری خودایە ئەی بەدبەختینە، جەنگاوەرانی خودا، لە دوورەوە لەفریشتە دەچن، بەلاّم لەنزیکەوە مەشخەڵی ئاگرن، بەسەر هەمان تاوێرەوە کە ئێستا وەستاوم هاوینی رابردوو ئەوانم لەجێی فریشتەکان گرت‌و هاوارم کرد (عەشق...عەشق!)) بەلاّم ئێستا خودای بیابان چاوی کردمەوە دیتم، ئەوان مەشخەڵن، خوداوەند هاواری کرد ((ئیدی ناتوانم بەرگە بگرم دادەبەزم!)) ئەوکاتە دەنگی ناڵەو شیوەن لە ئورشەلیم‌و رۆم بەسەر کێوو گۆڕەکان دەگاتە گوێ.

زەوی بۆ رۆڵەکانی خۆی دەگریا، فریشتەکانی خودا دادەبەزنە سەر زەوی سووتاو، بەمەشخەڵەکانیان دەگەڕێن‌و دەسووڕێن تا ببینن رۆم لە کوێ بوو ئورشەلیم لە کوێ، خۆڵەمێش دەخەنە نێوان پەنجەکانیان‌و وردی دەکەن‌و بۆنی دەکەن، دەڵێن، ((دەبێ ئەوە رۆم بووبێ‌و ئەوەش سراییل‌و خۆڵەمێشەکە بەبادەکەن.

دایکێکی گەنج کە مناڵەکەی دەچەسپاندە سینەیەوە هاواری کرد ((ئایا هیچ رێگەیێك نییە بۆ رزگار بوونی؟ من ئەو پرسیارە بۆ خۆم ناکەم، بەڵکو بۆ کوڕەکەم دەکەم)).



کریست وەلاّمی دایەوە: ((بۆ نا! لە هەموو تۆفانی خوداوەند بیر لە کەشتییێ دەکاتەوە هێوێنێ کە مایەی دونیای ئایندەیە لەناو ئەو کەشتیە دادەنێت، من کلیلی ئەو کەشتیەم پێیە)).

پیاوێکی پیر کە شەویلاگی ژێرەوەی دەلەرزی هاواری کرد ((کێ رزگاری دەبێ؟ کێ رزگار دەکەی؟ ئایا ئێمە هەلی رزگاربوونمان هەیە؟))

جیهان بەبەرامبەری مندا رەت دەبێ‌و منیش هەڵدەبژێرم، لە لایێکدا زێدە مەسرەفەکان لە خواردن‌و خواردنەوەو ماچ کردنن لەلایەکەی دیکە، نەهامەتی لێدراوەکان‌و مەزلوومەکانی دونیا، ئەوانەن ئەو نەهامەتحالاّنەو ئەو مەزلوومانەن کە هەڵیاندەبژێرم، ئەوانە ئەو بەردانەن کە ئورشەلیمی تازە بەهۆی ئەوانەوە دروست دەکەینەوە.

- خەڵکی بەچاوانی بریقەدارەوە هاواریان کرد ((ئورشەلیمی تازە))

- بەڵی ئورشەلیمی! تازە خۆشم نەمدەزانی کە خوداوەند لە بیاباندا رازی خۆی بۆ ئاشکرا کردم، عەشق تەنها دوای مەشخەڵەکان دێت، سەرەتا ئەم دونیایە دەبێتە خۆڵەمێش، ئەوکاتە رەزی تازەدەچێنێ، هیچ پەینێ لە خۆڵەمێش باشتر نییە.

دەنگێکی زبرو شادان کە بەدەنگی خۆی دەچوو، بەلاّم قوڵتر دەنگیدایەوە: ((پەینێ باشتر لە خۆڵەمێش نییە)) کریست گەڕایەوەو یەهودای لەدوای خۆی بینی هەستی بەترس کرد، چونکە رووخساری ریش سوور هەورەتریشقەی دەردەدا وەك بلێی مەشخەڵی موژدەهێن پێشتر لەو بەربووبوو. یەهودا بۆ پێشەوە رایکردو دەستی کریستی گرت، بەلووتفێکی چاوەڕواننەکراو بەبنی لێویەوە قسەی کرد: ((مەولا..مەولای من)). یەهودا بەدرێژایی تەمەنی خۆی هیچکاتێ وا بەنەرمی لەگەڵ کەسێ قسەی نەکردووە، هەستی بەشەرم کرد، لاربۆوەو واخۆی پیشاندا کە دەیەوێ شتێ بپرسێ، هەرچەندە خۆی لەماهیەتی پرسیاری خۆیدا بێ خەبەربوو، ئەوکاتە کولیلە سوورێکی تازە رسکاوی دۆزیەوە لەڕیشەوەی هەڵکێشا.

عەسر لە کاتێ کە کریست گەڕایەوەو جارێکی دی بەدانیشتن بەسەر چوارپایەکەی خۆیەوە چاوی بڕیە ئاگرەوە، لەپڕێکا هەستی کرد کە خودای ناوەوەی لەپەلەدا بوو، ئیدی چیتر ماوەی چاوەڕوانی بەو نادا تووڕەییو خەمو شەرم زاڵ بوو بەسەریا، ئەمڕۆ جارێکی دی قسەی کردبوو مەشخەڵێکی بەسەر سەری خەڵکەوە وەرسووڕاند بوو، ماسیگرانو جووتیارانی سادەدڵ بۆ ساتێ زەندەقیان چوو بوو، بەلاّم یەکسەر دانیان بە خۆدا گرتبوو ئارام بووبوونەوە، تەواوی ئەم هەڕەشانە بەرای ئەوان وەکو چیرۆکی پەریان وادەهاتە بەرچاو، ژمارەییێکی زۆر لەوان بە لایلایەی دەنگی ئەوەوە بەسەر گیای گەرمەوە چووبوونە خەو. کریست بەئارامیو بەدڵێکی پڕ لە شڵەژان سەیری ئاگری دەکرد، مەجدەلیە لەگۆشەییێکەوە وەستابوو سەیری ئەوی دەکرد، حەزی لێ بوو قسەیێ بکات، بەلاّم زاتی نەدەکرد، جارجارە دەبێ کە قسەی ژن پیاو خۆشحاڵ دەکاتو زەمانێکیش دەبێتە مایەی تووڕەیی ئەوەوە، مەجدەلیە لەوە بەئاگابوو لەبەر ئەوە قسەی نەدەکرد.

دەنگێ لەئارادا نەبوو، ماڵ بۆنی ماسیو ئەکلیلی کێوی دەدا، پەنجەرە رووبەڕووی حەوشە کرابۆوە، لەو نزیکانەوە درەختی ئەزگیل شکۆفەیان کردبوو، چونکە عەتری دلاّوێزو توندی ئەوان، لەگەڵ شنەی خۆراوا دەهاتە ماڵەوە.

کریست هەڵسایەوەو پەنجەرەی داخست، تەواوی ئەم عەترەی بەهاران هەناسەی وەسوەسە بوو، عەترێکی لەبارنەبوو بۆ رۆحی ئەوا، زەمانی ئەوە هاتبوو کەبچێو هەوای داواکراوی خۆی بدۆزێتەوە خودا بەپەلە بوو. دەرگا کرایەوە یەهودا هاتە ژوورەوە، چاوە شینەکانی بەدەوری ژووردا گێڕا، ئوستادی دیت کە چاوی بڕیوەتە ئاگرەوە، مەجدەلیەی —لمبر- قیتو زوبەدی کە چووبووە خەوەو پرخەی دەهاتو لەژێر رووناکایی مەشخەڵدا خۆشنووس کە دەینووسیو کاغەزی خۆی بە لەکە پڕدەکردەوە..سەری راتەکاند، ئایا خەباتی گەورە ئەوەبوو؟ ئاوەها دەیانویست بچن بۆ فەتحی دونیا؟ یەك سەرەڕۆ، میرازییێکی نووسەر، ژنێکی بەدناو چەند ماسیگرێ، پینەدۆزێ، دێوەرەیێ، کە هەموویان لەکفر ناحوم دا کەنگریان خواردوەو لەنگەریان گرتووە، لە سوچێکەوە مات بووینە، سالومەی پیر سفرەی راخستبوو. یەهودا



بەزەمزەمە کردنەوە گوتی ((من برسی نیم، خەوم دێت)) چاوەکانی خۆی داخست تا ئەوانی دیکە نەبینێ کە یەکسەر بەسەر سفری شامەوە دانیشتن، پەپوولەیێ لە کلاّوڕۆژنەی دەرگا هاتە ژوورەوە، بەدەوری بڵێسەی مەشخەڵدا پەڕوباڵی لێکدا، بۆ ساتێ رۆیشتو بەسەر سەری کریستەوە پەڕوباڵی لێکدا، ئەوکاتە بە دەوری ژووردا دەستی کرد بە هەڵفڕین...

سالومەی پیر گوتی ((میوانێکمان بۆدێ هەموومان بەدیتنی ئەو دڵخۆش دەبین))

کریست نانی دابەش کرد، پیرۆزی کردو دەستی کرد بەخواردن، هیچ کەسی قسەی نەدەکرد، زوبەدی پیر کە بۆ شام بێداربووبۆوە. ساحێب ماڵ خەفەتخان بوو، پیاڵەی خۆی پڕکرد لە شەراب بەیەك قوم هەڵیقوڕاندو لەبەرخۆ گوتی ((بەڕاستی ئەومیوانە ژیانی مرۆڤ پڕ لەخەم دەکات، هەست دەکەی لەگەڵ شێرێ بەسەر سفرەوە دانیشتووی)). بەو بیرۆکەیەی کە بەزەینی داهات یەکسەر زەندەقی چوو هەڵسایەوە، لەکاتێکا بەلای دەرگادا دەڕۆیشت گوتی: من دەڕۆم تا یونیسی پیر بدۆزمەوەو وەك دوو مرۆڤ بەیەکەوە گەپێ بکەین)). بەلاّم لەهەمان ساتدا چەند دەنگێکی سوکی پێی بەرگوێ کەوت (سالومەی پیر کە لە جێوە هەڵسا گوتی) (ئەوەش هی میوانمان) هەموو ئاوڕیان دایەوە. لە ئاستانەی دەرگادا خاخامی پیری ناصیرە وەستابوو، بەڕاستی چەند پیرو شکست بووبوو! لەودا جگە لە مشتێ ئێسقانو پێستی هەتاوەسووتی کە ئێسقانەکانی لەبنەوە داپۆشی بوو، بەهەر جۆرێ مایەی ئەوەبوون کە رۆح هەڵنەفڕێ، هیچی دیکەی تێ نەمابوو، خاخام لەم دواییەدا نەیدەتوانی بخەوێ، هەرکاتێ جاجار لەکاتی سپێدەدا خەو ئەوی دەرفاند، خەونی عەجیبو غەریبی دەدیت کە ناوەڕۆکیان هەمووی یەك بوو ((فریشتەکان، مەشخەڵەکان..ئورشەلیم لەشێوەی جانەوەرێکی بریندارو هاوارکردن. کە بەهەوڵو تەقەڵلاوە لەکێوی —سەهیون- دا سەرهەڵدەگەڕا. بەکوتانەوەی سفرەکە بەمشتی خۆی گوتی ((کوڕینە قسە بکەن مەگەر چی روویداوە؟ نەکا جەستەی رووبەڕووی ئێمە ببێتەوە؟ مەگەر نەتانبیستووە هەرکاتێ سێ یا چوار نەفەر بۆ خواردن دانیشتن ئەگەر دەربارەی خودا قسە بکەن، وەك بڵێی لەسەر سفرەی خێزانی دانیشتون، خاخامی پیری

ناصیره کە خودا سەلامەتی بکات جارێکیان ئەو قسەی گوتووە من باشم لەبیرە، لەبەرئەمە قسەبکە کوڕی مێریێ خودا بهێنە خوارەوە بۆ مالّی من، دەبووری کە بە کوڕی مێریێ بانگت دەکەم ئاخر هێشتاش نازانم چیت ناوبنێم، هەندێ تۆ بە کوڕی نەجارِ بانگ دەکەن، ژمارەییێ بەکوڕی داود، کوڕی خودا، کوڕی ئینسان. هەموو قاتیان کردووە بەقسەی خۆیان دونیا هێشتاش بڕیاری خۆی نەداوە)).

کریست وەلاّمی دایەوە ((زوبەدی پیر لەشکرێکی بێ شوومار لە فریشتەکان لەدەوروبەری خوداوەند هەلّدەفڕن هاواریان دەنگی زێڕو زیوو ئاوی زولاّلّی هەلّڕژاوەو خودا دەپەرستن، بەلاّم لە دوور، هیچ فریشتەییێ زاتی نزیکبوونەوەی نییە، جگە لە فریشتەییێ)). زوبەدی بە کردنەوەی چاوە شەراب لێدراوەکەی پرسی ...کێ؟

کریست وەلاّمی دایەوە ((فریشتەی بێدەنگی)) خاموّش بوو. خاوەن مالّ بێدەنگ بوو، پیالّەی پڕ شەراب کردو هەلّیقوڕاند، لەبەرخۆ گوتی: ((بە راستی ئەو میوانە ژیانی خەلّك ناخۆش دەکاتو هەست دەکەی لەگەلّ شێری لەسەر سفرە دانیشتووی...)) بە ختورەکردنی ئەم بیرۆکەیە بۆ زەینی یەکسەر ترساو هەلّسایەوە، لە کاتێکا بۆ لای دەرگا چوو گوتی: ((من دەچم تا یونسی پیر بدۆزمەوە، کە وەکو دوو مرۆڤ گالّتەییێ بکەین بە یەکەوە))، بەلاّم لە هەمان ساتدا دەنگی چەند هەنگاوێکی سووکی بەر گوێ کەوت.

سالومەی پیر لە جێوە هەلّسایەوەو گوتی: ((ئەوەش لە میوانەکانمان)) هەموو گەڕانەوە لە ئاستانەی دەرگادا خاخامی پیری ناصیرە لە دەرگا وەستابوو، وای چەند کەنەفتو شکستەبوو، جگە لە مشتێ ئێسقانو پێستێکی سووتاو کە ئێسقانەکانی داپۆشیبوو بە هەر جۆریش بێ ماوەییێك بوو بۆ ئەوەی رۆح هەلّنەفڕێ، هیچ شتێ لە جێگای خۆی نەمابوو، خاخام بەم دواییانە نەیدەتوانی بخەوێ، هەر کاتێ کە جارجار لە کاتی سەحەردا خەو رفاند خەونی سەیرو غەریبی هەمووی یەك بوو، فریشتەکانی دەدیت، کە ناوەرۆکەکانیان هەمووی یەك بوو، فریشتەکان بە هەولّو تەقەلّلاوە بەسەر کێوی سەهیۆن هەلّدەگەڕا)).



چەند رۆژی پێشوو لەکاتی سەحەردا دووبارە هەمان خەوی دی بوو، ئیدی کاسەی سەبری پڕبوو بوو، بەهەلّبەزینەوە لە شینی خۆی مالّی جێهێشتبوو گەیشتبووە مەزراو دەشتی — ئیسدرلون- ی لەدوای خۆیەوە جێهێشتبوو، -کەرمول- بەشوێن پێی خوداوە لەبەرەو رووی ئەودا سەری بەرزکردبۆوە، بەیەقینەوە ئەلیاسی پەیامبەر بەسەر ترۆپکی کێوەوە وەستابوو، ئەمە بوو کە خاخامی بۆ پێشەوە رادەکێشاو توانای سەرهەلّگەڕانی پێدەبەخشی، بەگەیشتنی پیرەمێرد بۆ سەر ترۆپکی خۆرەتاو دابەزی، دەیزانی کێ سێ تاوێرە بەردی سەخت بەناونیشانی —قوربانگا- بەسەر ترۆپکی پیرۆزەوە قیت بووبوونەوەو لەدەوروبەریانا ئێسقانو قۆچی قۆربانیەکان هەبوو، بەلاّم کە نزیك بۆوەو سەری بەرزکردەوە، هاوارێکی کرد، بەردەکان تاوانەوەو چووبوونە ناو زەوی! ئەمرۆ عەسر سێ پیاوی زەبەللاح بەسەر ترۆپکەوە وەستابوون، جلیان وەك بەفرسپی بوو رووخساریان تێکەلّ بەنوور بوو، کریستی کوڕی مێریێ لەناوەندیان بوو، لەلای چەپی ئەودا ئەلیاسی پەیامبەر بوو کە موشتی پڕ لە پشکۆ بوو، لەلای راستەوەی ئەو موسابوو بەقۆچی لوول خواردوو دوو ستوون بەپیتی ئاگرین. خاخام کەوتە سوژدەوە، لەکاتێکا دەلەرزی بەبنی لێویەوە گوتی: ((ئەدۆنیا..ئەدۆنیا)) دەیزانی ئەلیاسو موسا نەمردبوونو لەڕۆژی ترسناکی خودادا دووبارە بەسەر زەمینەوە دەرکەوتبوون، ئەوەش نیشانەی دیماهی هاتنی دونیابوو، ئەوان بەدەرکەوتبوون، لەوێ بوونو خاخام لەترسان دەلەرزی، سەری بەرزکردەوە، سێ تاوێرەبەردی گەورە کە لە تیشکی هەتاوی خۆرئاوابووندا دەدرەوشانەوە. خاخام سالّەهای سالّ کتێبی پەیامبەرانی کردبۆوەو لەهەوای یەهوەدا هەناسەی هەلّکێشا بوو، فێربووبوو کە چۆن مانای شاراوە لەپشتی دیارو نادیاردا بدۆزێتەوە، ئێستا تێگەیشی، گۆچانەکەی لەزەوی هەلّگرت- چەند سەرسام بوو کە ئەو لەشە لەڕولاوازە ئەم قودرەتەی هەبوو؟ چووە ناصیرەو کاناو مەجدەلو کفرناحوم تا بەدوای کوڕی مێریێدا بگەڕێ، بیستبووی کە لە یەهودیە گەڕاوەتەوەو ئێستا بەناوەندی جەلیلدا رەتدەبێو وچۆن جووتیارانو ماسیگران دەستیان کردبوو بە دروست کردنی ئەفسانەی پەیامبەری تازە: لەبارەی پەرجووەکانی، ئەو قسانەی کە دەیخستە سەرزمانو ئەو بەردەی کەلەکاتی قسەکردن دا رووبەڕووی دەبۆوەو پاشان لەکەنار بەردەکە بەگولّ

دادەپۆشرا.. لەرێگەدا رووبەرووی پیرەمێردێ بۆوەو دەستی بەپرسیار کرد، پیرەمێرد دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە: ((من کوێربووم ئەو دەستی دایە پێڵوەکانمو بینایی بەمن بەخشی. هەرچەند کە بە منی گوت لەمبارەوە شتێ نەڵێم، بەلاّم لەدێهاتەکاندا دەسوورێمەوەو بەهەموویان دەڵێم:

- پیرەمێرد دەتوانی بەمن بڵێی کە لەکوێ دەتوانین بیدۆزینەوە؟

- کە جێمهێشت لەماڵی زوبەدی بوو لەکفرناحوم ، خێراتر برۆ تابەر لە سەرهەڵگەڕانی بۆ ئاسمان بتوانی بیگەیتێ؟

خاخام خێراتر هەنگاوی هەڵێنا، شەو ئەوی داگرت، ماڵی زوبەدی پیری لەتاریکیدا دۆزیەوەو چووە ژوورەوە، سالومەی پیر لەجێوە هەڵسایەوە تا بە خێرهاتنی بکات.

خاخام بە رابردن لە ئاستانەی دەرگاوە گوتی: ((سالومە رەحمەتی خوداوەند لەم ماڵە بێو سامانی ئیبراهیمو ئیسحاق هەرزانی خاوەنیان بێ)) ئەوکاتە ئاوڕی دایەوەو لەدیداری کریستدا راما ((مەلێکی زۆر بەسەر بەرزایی سەرمەوە هەڵدەفڕنو هەواڵی تۆم بۆ دەهێنن، کوڕم ئەو رێگایەی گرتۆتتە بەر ناهەموارو لەرادەبەدەر دوورو درێژە، خوداوەند هەمڕاهت بێ)).

کریست بەدەنگێکی پڕ لە ویقارەوە وەلاّمی دایەوە- ئامین.

زوبەدی پیر دەستی نایە سەرسینەیو سلاّوی لە میوان کردو پرسی ((باوکە ئەوە رۆژ لەکوێ هەلاّتووە؟)) بەلاّم خاخام بێ ئەوەی وەلاّمی بداتەوە لە کەنار ئاگر دانیشت، رەنگە داشنەنیشتبێ، سەرمای بوو خەستەو برسی بوو، بەلاّم مەیلی لە خواردن نەبوو، دوو یا سێ رێ لەبەردەمیا کرابوونەوەو نەیدەزانی کام رێگا بگرێتەبەر، بۆچی هاتبوو؟ هاتبوو تا خەونەکانی بۆ کریست بگێڕێتەوە، بەلاّم ئەگەر ئەم خەونە لەلایەن خوداوە بووبن، ئەوکاتە چۆن؟ خاخام چاك دەیزانی کە هەرماس رووخساری خودا دەگرێتە خۆی تا مرۆڤەکان هەڵخەڵەتێنێ، ئەگەر ئەوەی کە بینی بووی بۆ کریستی گێڕابووەوە.

***



لەوانەیە کە دێوی غروور زاڵ بێ بەسەر رۆحیاو گومڕای بکات، ئەوکاتە وەلاّمی ئەوە دەبێ کە خاخام بیداتەوە، ئایا ئەو ئەرکی بوو کە ئەو ڕازە داخراوە راگرێو بەدوای ئەودا بکەوێ؟ بەلاّم بۆ خاخامی ناصیرە ئەوە راست بوو، کە ئەو وەدوای ئازاترین شۆڕشڤانو هەموو ئەوانەی لافو گەزافی ئەوە لێدەدەن کە شەریعەتێکی تازەیان هێناوە بکەوێ؟ بۆ چونکە کریست شتێکی بەپێچەوانەی شەریعەت گوتبوو؟ بەقسەی ئەوان رۆژی شەممەی پیرۆز بۆ دیتنی نەفەرێ چۆتە مەزراوە، کە خەریکی پاك کردنەوەی چاڵو ئاوەڕۆی باغی خۆی بووە، گوتبووی:

((پیاوەکە ئەگەر دەزانی تۆ چ کاردەکەی، ئومێدەوارم کە شادی بتگرێتەخۆ، ئەگەر نازانی نەفرەت لەتۆ بێ کە بۆچی شەریعەت لەژێر پێ دەنێی)) بەبیستنی ئەم خەبەرە خاخامی پیر کەوتە شڵەژانەوەو لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((ئەو یاخییە مرۆڤێکی ترسناکە، شەمعون، ئاگاداربە دەنا کفرو نەفرەت بۆ خۆت دەکڕی.. ئەویش لەتەمەنی تۆدا)).

کریست هاتو لەکەناریا دانیشت، یەهودا بەسەر زەوی ڕاکشاو چاوەکانی داخستبوو، مەتی چووە شوێنی خۆی لەژێر مەشخەڵدا قەڵەمی گرتە دەستو لەچاوەڕوانیدا مایەوە، بەلاّم کریست هیچی نەگوت، سەیری ئاگری دەکرد کە چۆن دار دەسوتێنێ، هەستی کرد خاخامی پیر هەناسەبڕکێی بووە وەك بڵێی هێشتا لەرێگایە. سالومەی پیر لە هەمان ئەم سەینو بەینەدا جێگەی بۆ خاخامی پیر راخست، خاخام پیرەمێردێ بوو دەبوایە دۆشەگو سەرینی نەرمی هەبێ، گۆزە ئاوێکیشی لەتەك نوێنەکەی دانا تا ئەگەر تێنوو بوو بتوانێ ئاو بخواتەوە، زوبەدی پیر لەوە بەئاگا هات کە میوانی نوێ بەخاتری ئەو نەهاتووە، گۆچانەکەی دەست دایێو چووە سۆراغی یونسەوە، تا دووبارە لەهەواییێکی مرۆیانەدا هەناسە بدا، شێران ماڵەکەیان پڕکردبوو، مەجدەلیەو سالومە چوونە ژوورەکانیان تا کریستو خاخام بەتەنها بمێننەوە، دڵیان گەواهی دەدا کە ئەم دوو نەفەرە چەند رازێکی گرانباریان پێ یە لەسەریا بکەونە گفتوگۆوە.

بەلاّم کریستو خاخام گفتوگۆیان نەکرد، ئەوان دڵنیایی تەواویان هەبوو کە هیچ کاتێ ناتوانن رازی دڵ هەڵڕێژنە دەرەوەو باری سوك بکەن، ئەوان بێدەنگیان هەڵبژارد، چەندین سەعات لە دوای یەکتری رابردن، مەتی بەدەستی بەقەڵەمەوە خەوت، زوبەدی

دوای چەنەبازییێکی زۆر گەڕایەوەو لەکەنار پیرەژنەکەی راکشا، نیوەشەوبوو، خاخام تۆژی بێدەنگی بوو، هەڵسایەوە، بەبنی لێویەوەو گوتی ((کریست ئەمشەو بەئەندازەییێکی تەواو قسەمان کرد، بەیانی سپێدە دەست پێدەکەینەوە)) بەئەژنۆی لەرزیوەوە خۆی بۆلای نوێنەکە پەلکێش کرد. خۆرەتاو هەلاتوو لە ئاسمان بەرزبۆوە، دەمەدەمی نیوەڕۆبوو، بەلام خاخام چاوی نەکردەوە، کریست چووبووە کەناری دەریاچە تا لەگەڵ ماسیگران قسە بکات، چووە ناو قایغی یونس تا یارمەتی بدات لەماسی گرتندا، یەهودا تەنهاو تەنها وەکو سەگی مێگەل بەبێ ئامانج لەدەوروبەردا دەسووڕایەوە.

سالومەی پیر بەسەر خاخامەوە لاربۆوە تا گوێی لەدەنگی هەناسەی بێ، هەناسەی دەدا بەبنی لێویەوە گوتی ((سوپاس بۆ خوا هێشتا زیندووە)) سالومە خەریکی رۆیشتن بوو کە خاخام چاوانی کردەوە، ئەوی بینی بەسەریان لاربۆتەوە، تێگەیشتو بزەییێکی کرد.

گوتی سالومە هەراسان مەبە نەمردووم هێشتا ناتوانم بمرم، سالومە بەتوندی وەلامی دایەوە ((هەردووکمان پیربووین هەرچەند زیاترو زیاتر لەمرۆڤ دووردەکەوینەوە لەخودا نزیك دەبینەوە، هیچ کەسێ ئاگای لەساتی ئەجەلی خۆی نیە، بیر دەکەمەوە کە گوتی ((هێشتا ناتوانم بمرم)) گوناهە.

خاخام پیلەی کرد لە سەر قسەی خۆی ((سالومەی ئازیز هێشتا ئەجەلم نەهاتووە، خودای سراییل خۆی وادەی بەمن داوە: شەمعون تۆ نامری، مەگەر ئەوکاتەی کە کریستیانو ببینی)). بەلام لەکاتێکا ئەم قسانەی دەهێنایە سەرزمان چاوانی لەترسان دەکرایەوە، نەکا ئەو پێشتر کریستیانوی بینی بێ؟ ئایا دەبێ ئەمە خەونێك بێت کەرمول خەونێکی لەلایەن خودا بۆ من هاتبێ؟ ئەگەر وابێ ئەو ئەجەلی هاتووە، ساردی نیشتە تەواوی لەشیەوە، نەیدەزانی شادبێ یا بناڵێ؟ رۆحی شادبوو، کریستیانو هاتبوو، بەلام جەستەی لەرزۆکی گەرەکی نەبوو بمرێ، بەهەناسەبڕکێوە، هەڵسایەوە، بۆلای دەرگا خزی، لە ئاستانەی دەرگا دانیشت تا خۆری بەسەردا هەڵێتو غەرقی ئەندێشە بوو. کریست دەوروبەری شەو ماندوو مردوو گەڕایەوە،



بەدرێژایی رۆژ لەگەڵ یونس ماسیگریی کردبوو، قایغ پڕبوو بوو لەماسیو یونس غەرقی شادی بووبوو دەمی بەش کردەوە تا قسە بکات، بەلام پەشیمان بۆوە تا ئەژنۆی چووە ناو ماسیەکانەوە، نیگاییێکی کردبووە کریست پێکەنی بوو.

هەمان شەو یاوەران لەدێهاتە نزیکەکانەوە گەڕابوونەوە، بەدەوری کریستدا چوارمێخەکی دانیشتبوون دەستیان کرد بە گێڕانەوەی هەموو ئەوەی کە بینی بوویانو ئەنجامیان دابوو، لەکاتێکا بۆ ترساندنی جووتیارو ماسیگران گەروویان کەوتبوو گەیشتنی رۆژی خوداوەندیان پێڕاگەیاندبوون، گوێگران ، بە ئارامی بەردەوامییان بە چاکردنەوەی تۆڕ یا هەڵکەندنی باخی خۆیان دابوو، جارناجار بەسەرتەکاندنەوە دەیانگوت ((دەبینین... دەبینین)) ئەوکاتە بابەتیان دەگۆڕێ.

لەهەمان کاتدا یاوەران سەرگوزشتەی خۆیان دەگێڕایەوە لە پڕێکا سێ نێردراو گەڕانەوە، یەهودا بەبێ دەنگی بەسەر دەستێکەوە پاڵ کەوتبوو، بەدیتنی ئەوان نەیتوانی بەر لە پێکەنینی خۆی بگرێ، هاواری کرد ((ئەی نێردراوان، ئەوە چیتان بەسەر هاتووە؟ منالە ورتکەکان خۆ دەبێ پارەو پولی باشتان وەدەست هێنابێ!))و لەڕاستیدا چاوی راستی پەترۆس هەڵمسابوو ئاوی لێ هەڵدەڕژا گۆناکانی یۆحەننا پڕ لە وروشانو خوێن بوو، یاکوب دەلەنگی، پەترۆس ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی ((مەولای من، قسەی خودا دەردەسەرییێکی گەوریە، بەلێ دەردەسەرییێکی گەورە!)) هەموو لەژێرەوە پێکەنین، بەلام کریست بەئەندێشەوە سەیری ئەوانی دەکرد. پەترۆس کە پەلەی بوو هەموو شتێ بلێ خۆی حەساندەوەو بەردەوام بوو: ((ئەوان بەڕاستی دەخلی خۆیان بەدەست هێنا یەکەم جار گوتمان هەریەکەمان بچینە رێی جودا، بەلام دوایی ترساین هەرسێکمان لەگەڵ یەك کەوتینەرێو دەستمان کرد بە بەپەندبێژی، لەمەیدانی شاردا دەچووینە سەربەردێکەوە یا بەسەر درەختێ هەڵدەگەڕاین، دەستمان لێکدەدا، یا پەنجەمان لەدەم دەناو فیکەمان لێ دەداو خەڵکی کۆدەبوونەوە، هەرکاتێ ژنێکی زۆر هاتبا یۆحەننا قسەی دەکرد، لەبەر ئەمەیە کە رووخساری وروشاوە، کاتێ کە زۆرینە پیاوبوون یاکوب بەدەنگی قوولی خۆی قسەی دەکرد، گوفتاری من دەق وەکو گوفتاری خۆت بوو، بەلام بەلیمۆی گەنیوو هەیهو پێشوازیان لێکردین، چونکە

بەقسەی خۆیان، ئێمە مالۆیرانی دونیامان بەدیاری هێناوە، هەلڕژانە سەرمانو ژنان بەنینۆکو پیاوان بەمشتو ئێستا توخوا سەیری پۆتەلاکی ئێمە بکە!))

یەهودا دووبارە پێکەنی، بەلاّم کریست گەڕایەوەو بەنیگاییێکی توند ئەم دەمە بێ ئەدەبەی داخستو گوتی ((دەزانم کە ئێوە وەکو بەرخ دەنێرمە ناو گورگان، جەفاتان پێدەکەن، بەردتان لێدەدەنو ئێوە بە بەدرەوشت ناوزەد دەکەن، بۆیە دژی بەدڕەوشتی دەجەنگن، تۆمەت بەئێوە ڕەوا دەبینن‌و دەلێن ئێوە دەتانەوێ باوەڕو خانەوادەی سەر زەوی باوکمان هەلوەشێننەوە، چونکە باوەڕی ئێمە پاکترە، مالّمان فراحترو سەرزەوی باوکمان تەواوی دونیایە! هاوڕێیان کەمەربەندتان توند ببەستن مالاّوایی لەشادیو ئاسایش بکەن، ئێمە بەرەو جەنگ دەچین)) ناتانیل گەڕایەوەو بەنیگەرانی نیگاییێکی کردە فیلیپ، بەلاّم فیلیپ هێماییێکی بۆ کرد وەك بلێی دەیگوت ((هەراسان مەبە ئەم جۆرە قسانە دەکات تا تاقیمان بکاتەوە)) خاخامی پیر زۆر ماندوو بوو سەرلەنوێ راکشا، بەلاّم زەینی کراوەبوو، هەستی بەئارامی دەکرد، سەدایێ لە دەروونی هەلّسا، ئایا سەدای خۆی بووە یا سەدای خودا؟ شایەد هەردووکیان، فەرمانی پێدا ((شەمعون هەر جێیەك کە ئەو بۆی دەڕوا بەدوای بڕۆ) پەترۆس خەریك بوو دووبارە دەمی بکاتەوە کە کریست دەستی هێناپێش‌و گوتی ((ئیدی بەسە))

کریست هەلّسایەوە سەرپێ، ئورشەلیم لەبەر چاوی قەدی هەلێنا: کێوی‌و تژی خوێن‌و لەوپەڕی نائومێدی دابوو، کە مەنزلّگای ئومێدە، کفرناحوم، لەگەلّ ماسیگرو جووتیارانی سادەدلّ لەبێن دەچوو، دەریاچەی گنسارت لە دەروونیا غەرق دەبوو، مالّی زوبەدی تەنگ بوو: چوار دیواری مالّ هاتنە بەریەك‌و ئەویان گرتەخۆ، خەریك بوو دەخنکا بۆ پێشەوە چوو دەرگای کردەوە، بۆ لێرە مابۆوە؟ دەخواو دەنۆشێ، ئاگر بۆ ئەو دادەگیرساو نیوەڕۆیان‌و شەوان سفرەیان بۆ ئەو دەکرایەوە، کاتی خۆی بێ ئامانج بەسەر دەبرد، ئایا بەمجۆرە بڕیاری رزگارکردنی دونیای داوە؟ شەرمی لەخۆی نەدەکردەوە؟

چووە حەوشەوە، باییێکی گەرم‌و بۆنی درەختانی چرۆکردووی لەگەلّ خۆی دەهێنا ئەستێرەکان بووبوونە رشتەی مرواری بەگەردەن‌و بازووی شەو، لەژێر پێیدا زەوی



مورەموری بوو، وەك بلێی چەند دەمێکی بێ ژمارە مەمکی ئەو هەلّدەمژن. رووی لە لای باشوور، (ئورشەلیمی پیرۆز) کرد، وابەدیاردەکەوت بەدیقەت گوێ رادەگرێ‌و لەتاریکیدا هەولّدەدا تا رووخساری سەختی تاوێرەبەردە خوێناویەکان بناسێتەوە، لەهەمان حالّدا کە زەینی تاسوق‌و نائومێدی وەك چۆن رووبارێ رەوانەی دەشت‌و کێو بووبوو، خەریکی داڕماندنی شاری پیرۆزبوو. لەپڕێکا هاتە بەرچاو کە لە ژێردار بادامی تازە چرۆکردوودا سێبەرێکی گەورە کەوتە جولە، یەکسەر شتێکی رەش تاریکتر لە خودی شەو هەلّسایەوە، هاوسەفەری زەبەلاحی خۆی بوو. لەمیان شەوی ئارامدا دەیتوانی سەدای هەناسەبڕکێی سەنگینی ئەو ببیستێ، بەلاّم نەترسا، زەمانێ بوو عادەتی بەهەناسەی ئەو گرتبوو، لە چاوەڕوانی ئەوا وەستا، ئەوکاتە لەسەرخۆو فەرمانەدەرانە، سەداییێکی ئارام لە ژێر درەختی بادامەوە گوتی ((چاکتر وایە بڕۆین!)) یوحەننا بەشلّەژانەوە لە تاریکیدا دەنگێکی بیست‌و بەبنی لێویەوە گوتی ((مەولای من، لەگەلّ کێ قسە دەکەی؟)) بەلاّم کریست هاتە ژوورەوە، دەستی درێژکردو گۆچانی شوانی خۆی لەسوچی ژوورەوە هەلّگرت، گوتی ((دۆستان وا من کەوتمەڕێ، خاخامی پیر لەناو نوێن هەلّساو کەمەربەندی توند کردو گۆچانی خۆی دەستدایێ ((کوڕم من لەگەلّ تۆ دێم)) یەکەمین کەس بوو بۆلای دەرگا چوو. سالومەی پیر خەریکی رستنی بەن بوو، تەشی خۆی نایە سەر سندوق‌و گوتی ((منیش دێم، زوبەدی کلیلەکانت بۆ جێدێلّم خودا حافیز)) کلیلەکانی لە دەوری کەمەری کردەوەو دای بەمێردەکەی . ئەوکاتە خۆی بەتوندی لە لەچەکی پێچا، مالّەکەی خۆی بەسەر کردەوەو بەهێمای سەر خودا حافیزی لێکرد، لە پڕێکا دلّی وەك دلّی کچێکی بیست سالّەی لێهات.

مەجدەلیە بێدەنگ‌و خۆشحالّ هەلّسایەوە، یاوەران وروژان، هەلّسانەوەو کەوتنە سەیری یەکتریەوە، تۆماس کە کەڕەنای لەبەر شالّی دەنا گوتی ((ئارەزووت کێندەرە؟)) ناتانیل گوتی ((لەم کاتەی شەودا؟ بۆ بەپەلەی؟ مەگەر نابی سبەی سپێدە ئەم کارەبکەین؟ وەك بەرخۆلّە سەیری فیلیپی کرد، بەلاّم کریست بە هەنگاوی درێژ لەحەوشەدا رێگەی خۆی بەرەو باشوور دەست پێکرد.

# بەشی بیست و پێنجەم

بناغەی دونیا لەرزۆك بوو... چونکە دڵی مرۆڤ لەرزۆکە، لەژێر هاواری ئەو تاوێرەبەردانەی کە خەڵكو ئورشەلیمی خۆی بانگ دەکرد، لەژێر هاواری پێشبینییەکانو بەدیارکەوتنی رزگارکەر، رێو رەسمی مەزهەبی ژێرکۆتی فەریسیو سەدوقیەکان، ئەو دەوڵەمەندانەی کە دەیانخوارد، ئەو هەژارانەی کە برسی بوون، لەژێر دەستی خوداوەندی یەهوە، کە لە سمێڵو ردێنی ئەودا خوێنی مرۆڤایەتی، چەندین سەدەو سەدە هەڵدەڕژایە دەروونی گەرداوی مەرموز، لەهەموو دەرگایێ کە لەگەڵ ئەو خودایەدا پێی دەچوویە ژوورەوە، هاوارێ بەرزدەبۆوە، ئەگەر قسەیێکی ئەڤین ئامێزت دەکرد، هاواری دەکرد: ((من گۆشتم دەوێ)) بەرخ یا یەکەم نۆبەرەت کە بەنیشانەی قوربانی دەتکردە دیاری، هاواری دەکرد ((من گۆشتم ناوێ، جلتان مەدڕێنن دڵتان بدڕێنن، جەستەی خۆتان بەڕۆحو رۆحتان بەپەرستن بگۆڕنەوەو بیدەنە دەست با)). دڵی مرۆڤ لەژێر هاواری شەش سەدو سێزدەوە فەرمانی نووسراوی رێبازی یەهود، جگە لە فەرمانە نەنووسراوەکان وردوخاش ببوو، بەڵام خورپەیێکی نەبوو، لەژێر ئاوازی سەرەتای پەیدابوون سەرەتای لاویان، سەرەتای ژمارە، کتێبی دادوەران، کتێبی پاشایان وردوخاش بووبوو، بەڵام دانەدەخورپا ئەوکاتە لە پڕێکا لەچاوەڕواننەکراوترین ساتەکاندا بایێکی نەرم هەڵیکرد نە لە ئاسمان، بەڵکو لەزەوی، تەواوی ژووریچکەکانی دڵی مرۆڤ کەوتە لەرزەوە بێ دەنگ دادوەرانو پادشایان رێو رەسمی مەزهەبیو فەریسیو سەدوقیو ئەو بەردانەی کە بانگی مرۆڤەکانو



ئورشەلیمی خۆی دەکرد، شەقیان برد، کەوتنە جریوەو دەستیان کرد بەدارمان سەرەتا ناخی دڵ، پاشان ناخی زەین، لەلایەکی تر، بەسەر خودی زەویەوە، یەهوەی بەرز جارێکی دی قاییشی چەرمینی وەستاکاری خۆی بەستا، تەرازوو خەتکێشی خۆی گرتە دەست، دابەزیە سەرزەوی، خودی خۆی بۆ کۆمەك کردنی وێرانی رابردوو دروستکردنی ئاییندە وێرای مرۆڤەکان بۆ پێشەوە کەوتەڕێ، بەڵام بەر لە هەموو شتێ دەستی بەپەرستگای یەهودیان کرد لەئورشەلیم.

کریست هەموو رۆژێ بەسەر بەردڕێژکراوە خوێناویەکاندا دەوەستاو بەگرانباری سەیری ئەو پەرستگایەی دەکردو هەستی دەکرد کە ئارەزوو دەکا وەك تەور بکەوێتە رەگوڕیشەی ئەو پەرستگایەو وێرانی بکات، بەم بوونەوە پەرستگا هێشتا بەسەرپێوە بوو، لەژێر نووری خۆرەتاودا وەك گایێکی زێڕینو قۆچی ئەڵقە گوڵ بەسەرەوە دەدرەوشایەوە، دیوارەکان تا ساپیتە، بەمەڕمەری سپیو دەماری شینباو جەلاکرابوون، وابەدیاردەکەوت کە پەرستگا بەسەر رووی ئۆقیانووسێکی شەپۆلاوی مەلەدەکات.
لەپێش رووی ئەودا سێ ریز ژوور یەك بەسەر ئەوی دیکەوە هەڵواسرابوون لە خوارترینو جێدارترینی ئەو ژوورانە تایبەت بوو بەبت پەرستەکان، ناوەندی تایبەتی خەڵکی سراییلو بەرزترین حوجرە لە بەردەستی خزمەتکارانی پەرستگابوو، ژمارەیان بیست هەزار نەفەربوو، شەوو رۆژ بەحەوت شێوە بخوریان تێدا دەسووتێنرا، دووکەڵ وا چڕ بوو، کە بزنان لە حەوت فەرسەخ رێوە دەپژمین، کەشتیەکی بچووك کە قەڵای عاسێی رێبازی مووسا بوو، هەمان ئەو کەشتییەی باوو باپیرانی قەومی بەنی سراییل کە پێشینیانی چادرنشین لەگەڵ خۆیاندا لە بیابانەوە هێنابوویان بەسەر ئەم ترۆپکەی سەهیۆنە لەنگەری گرتبوو لەخاکدا رەگاژۆ بووبوو، بەداری سەرونیازو زێڕو مەڕمەڕ خۆی رازاندبۆوەو بووبوو بە پەرستگایێ، خوداوەندی کێوی بیابان ئارەزووی هەڵبژاردنی بێدەنگی نەبوو لەماڵ، بەڵام وا لە بۆنی درەختی سەرونیازو بخورو گۆشتی قوربانی بەکەیف بووبوو تا رۆژێکیان پێی هەڵگرتو چووە ناویەوە.

ئێستا دوو مانگ بەسەر رۆژی کۆچی کریست لە کفرناحومدا بەسەردەچێ، هەموو رۆژێ دەچوو رووبەڕووی پەرستگا دەوەستاو سەیری دەکرد، هەموو رۆژێ بۆ ئەو

تازەبوو، وەك بڵێی بۆ یەکەمین جارە دەیبینی، گوایە هەموو ڕۆژی چاوەڕوان دەکات تا بە دارماوی بەسەر خاکەوەی ببینێ، تا بتوانێ لەم سەر بۆ ئەو سەر لەقەکوتی بکات، ئیدی ئارەزووی دیتنی نەبوو، ترسێکی لێ لە دڵدانەبوو، پێشترێ لەناو دڵیاندا وێران بووبوو، ڕۆژێکیان کە خاخامی پیر ویستی بزانێ هۆی چییە زیارەتی ناکات، بەسەر ڕاوەشاندنێکەوە گوتی: ((ساڵەهای ساڵە بەدەوری ئەم پەرستگایە سووڕامەتەوە، ئێستاکە پەرستگا بەدەوری مندا دەسووڕێتەوە)). خاخام بەشێوەییێکی پەلێپ ئامێزەوە گوتی ((کریست ئەم وشانە کفرئامێزن تۆ ناترسی؟))

کریست وەڵامی دایەوە ((کاتێ کە دەڵێم - من - قسە لەو جەستەیە ناکەم کە خاکە یا کوڕی مێرێ، کە ئەویش هەرخاکەو پشکۆییێکی زۆر وردی لەگەڵ تێکەڵە... خاخام -من-ی دەمم یانی خودا)).

خاخام بەداپۆشینی ڕووخساری خۆی هاواری کرد ((ئەوەشیان کوفرێکی وەحشەتناکە)).

کریست بە خەندەییێکەوە وەڵامی دایەوە ((لەبیرت بێ کە من کوفر گوییێکی پیرۆزم))

ڕۆژێکیان کە یاوەرەکانی بەدەمی کراوەو ستایشەوە لەڕووبەڕووی پەرستگادا ئەویان دی تووڕەبوو، بە خەنینێکی تاڵ بەوانی گوت: ((وادیارە پەرستگا مایەی سەرسامی ئێوەیە؟ بۆ دروستکردنی ئەو پەرستگایە چەندین ساڵ پێویست بوو. بیست ساڵو دەهەزار کارگەر؟ لەماوەی سێ ڕۆژدا وێرانی دەکەم، بۆ دواجار بەتێری تەماشای بکەنو مالاوایی لێ بکەن، چونکە بەردێکی لەسەر بەردێکی نامێنێ. یاوەران بەترسەوە پاشەکشەیان کرد، نەکا ئوستاد عەقڵی لە دەست دابێ؟ بەم دواییە زۆر توندخوو بووە، سەیرو سەرسەخت بووە، باییێکی غەریب پڕ لە جریوە بەسەر بەرزایی سەری ئەو هەڵێدەکرد جارجارە ڕووخساری وەکو خۆرەتاو دەدرەوشایەوە هەموو شتێ لە دەوروبەری ئەودا دەپشکوت. جاری واش هەبوو نیگای تیروتار بوو چاوەکانی نائومێد.

یۆحەننا زاتی دایە بەرخۆو گوتی ((مەولای من ئەدی حەیف نییە؟))



- لە چی؟

- پەرستگا، بۆ دەتەوێ وێرانی بکەی؟

- تا بتوانم پەرستگایێکی نوێ دروست بکەم، پەرستگاییێکی تازە لەماوەی سێ ڕۆژ دروست دەکەم، بەڵام بەر لە هەموو شتێ دەبێ ئەم پەرستگایە جێ چۆڵ بکات. کریست گۆچانی شوانی خۆی بەتوندی کوتایە سەر بەردڕێژەکانەوە، باییێکی تووڕە ئێستاکە بەسەر سەریەوە هەڵێدەکرد، سەیری فەریسیانی کرد کە دەکەوتنە ئەولاو ئەملاوەو خۆیان بەدیوار دەگرتەوەو بریندار دەبوون، لەڕوودا لەگەورەیی زۆربووی حەدی خوداوەند نابینا بووبوون، بانگی کردن ((ئەی ریاکاران ئەگەر خودا چەقۆییێکی هەڵگرتبا دڵتانی شەق دەکرد، مارو دوپشكو پیسایی لێدەهاتە دەرەوە)) فەریسیەکان بیستیان شێتو هاربوون لەتووڕەییان بەدزی بڕیاریاندا تا ئەم دەمە نەترسە لغاو بکەن.

خاخامی پیر دەستی لەسەر لێوەکانی کریست دانا تا بێدەنگی کات ((مەگەر لەگیانی خۆت تێربووی؟)) ڕۆژێکیشیان لەکاتێکا ئەشك لەچاوەکانیا ئەڵقەی بەستابوو پرسی: ((مەگەر نازانی کاتبانو فەریسیان دەماودەم دەچنە دەربارو داوای مەرگی تۆ دەکەن؟))

کریست وەڵامی دایەوە ((دەزانم باوکە زیاتر لەوەش دەزانم)). لەکاتێکا دەستووری دەدایە پەترۆس کە هەڵکاتە کەڕەناکەیەوە بەسەر سەکۆی هەمیشەیی خۆیدا لە ((بارەگای سولەیمان)) قەرارای دەگرتو جارێکی دی ڕایگەیاند ((کاتی هاتووە، ڕۆژی خودا گەیشتووە)) هەموو ڕۆژێ لەسەربانەوە تاشامگاهان هاواری دەکرد، تا ئاسمان ناچار بکات کە ببێتەوەو مەشخەڵەکانی داڕژێنێ، بۆیە ئەو ئێستاکە دەیزانی دەنگی مرۆڤ جادووی هەموو تواناییێکە، بەسەر ئاگرەوە یا شەونم، دۆزەخ یا بەهەشت، هاواری دەکرد ((وەرە))و دەهات، بەهەمان ئەم شێوەیە ئەو ئاگری بانگ دەکرد، ئاگر زەوی دەڕازاندەوە ڕێگەی بۆ عەشق تەخت دەکرد، عەشقیش هەمیشە حەزی لێ بوو تا بەسەر خۆڵەمێشەوە هەنگاو هەڵێنێ. ڕۆێکیان ئاندریاس لێی پرسی ((مەولای من بۆچی ئیدی پێناکەنی؟ بۆ وەکو پێشان شادنیت؟ بۆ دەمبەدەم تووڕەتر دەبی؟))

بەلاّم کریست وەلاّمی نەدایەوە، دەیتوانی چیّ بلّیّ، دلّی پاکی ئاندریاس دەیتوانی چی بدۆزێتەوە؟ لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشە ((ئەگەر بڕیارە کە دونیاییێکی تازە بچێندرێ، دەبیّ ئەو دونیایە لەڕەگەوە خرا بکریّو شیرازەی ڕێبازی کۆن لێکبپچڕدرێت، ئەوە منم کە دەبیّ ئەو شیرازەیە بپچڕێنم.

ڕێبازێکی تازە دەبیّ بەسەر لەوحی دلّ بتاشریّو ئەوە منم دەبیّ بیتاشم، دەبیّ ڕێبازی موسا فراوان بکەم تا دۆستو دوژمنو یەهوەو بت پەرستان بگرێتەخۆ: ((دەفەرمان)) شکۆفە دەدا! هەر بۆ ئەمەیە کە هاتوومەتە ئورشەلیم، لەهەمان ئەو جێیەی کە ئاسمان دەکرێتەوە، ئەوەیکە ئاسمان پەرجوویێکی گەورە یا مەرگ دابەزێنیّ ئەوە بەدەست ویستی خودایە ، من ئامادەم تا بۆ ئاسمان سەرکەوم یا فڕێدرێمە بنەبنی دۆزەخەوە، ئەی پەروەردگار بڕیار بدە))

جەژنی خواردن نزیك دەبوو، تەراتییێکی چاوەڕواننەکراوی بەهاری بەسەر رووخساری سەختی یەهودیە دەپشکوت... ڕێگاکانی دەشتاییو ئاو کرابوونەوەو زیارەتکەران لە چوارگۆشەی دونیای یەهودیەت دەگەیشتن، سیّ ڕیزی حوجرەی پەرستگا بۆنی گەنیوی مرۆڤو ئاژەلّی سەربڕاوو سەرگینی لێدەهات. ئەمڕۆ ژمارەییێکی زۆر کۆنەپۆشو شەلّ لەدەرەوەی ((بارەگای سولەیمان)) گردبوونەوە، بەرووخساری رەنگ پەڕیوو برسیو چاوانی سووتاو بە شەرارەتی — سەدوکیان- ی خۆش خۆراكو شارنشینانی دەولّەمەندو سەرخۆش لەگەلّ ژنەکانیان، کە بەروبازنی زێڕ دەستی گران دەکردن.

یەکیّ لەوان بەبنی لێویەوە گوتی ((خەیالّ دەکەی تا کەی بەردەوامی بە پێکەنین دەدەی؟ بەم زوانە گەروتان دەبڕین ئوستاد خۆی گوتی ((هەژارو دەولّەمەندەکان دەکوژی سەروسامانیان دابەش دەکات)).

پیاوێکی رەنگ پەڕیو بەخۆیو چاوانو موی بزن ئاسایەوە هاتەبەرو گوتی ((ماناسیس)) تۆ دروستت نەبیستوە، هەژارو دەولّەمەند ئیدی نامێنن هەمووی دەبنە یەك، مانای دەسەلاّتی ئاسمان ئەوەیە. پیاوێکی ریقنە تاوی دایە ناو قسەکانیو گوتی ((دەسەلاّتی ئاسمانی مانای ئەوەیە کە ڕۆمیەکان دەرکەین، دەسەلاّتی ئاسمانو ڕۆمیەکان بەیەکەوە نابن)). پیاوێکی بەڕێز، بەلێوانی وەك کەروێشك وەلاّمی دایەوە





(( هارون تۆ ئەسلّەن یەك وشە لەقسەکانی ئوستاد تێنەگەیشتووی، سراییلیو ڕۆمیەکان، یونانیو کلدانی، بوونیان نییە هەموو براین!)) ئەویتر هاواری کرد ((ئێمە هەموو خۆلّەمێشین بەگوێی خۆم بیستم ئوستاد گوتی ((ئاسمان دەبێتەوە، یەکەمین تۆفان لە ئاوبوو، ئەو یەکەیان لە ئاگر دەبیّ، هەمووان لە هەژارو دەولّەمەند بگرە تا سراییلیو ڕۆمیەکان.. دەبنە خۆلّەمێش))

پیاوێك کە رەنگی پێستی وەك سوفالّ کورەگڕ کراوو چاوانی خڕو لەگلێنە دەرپەڕیو بوو چاوی بڕیبووە ڕێگای سپیو پڕتۆزو خاکی ((بیث ئنیا))وە گوتی ((زەیتونەکان لە درەختدا دەتەکێنو دەکەون، بەلاّم دوو یا سیّ دەنکە زەیتون لەو بەرزییەوە دەمێننەوەو سیّ چوار ژمارەش بەسەر لقە بەرزەکانەوە دەمێننەوە ئەوە ئەشعیای پەیامبەر گوتویەتی.. کوڕینە ئازابن ئێمە هەمان ئەو زەیتونەین کە بەسەر درەختەوە دەمێنینەوە.

تەنها کاریّ کە دەبیّ بیکەین ئەوەیە کە ئوستاد راگرینو نەهێلّین لە دەستمان بچیّ، ئەمڕۆ دواکەوتووە، کوڕینە ئاگادارین لێنەگەڕێن، لە دەستمان بچیّ، پیرەمێردیّ لێو کەروێشکی پرسی ((دەتوانیّ بچێتە کویّ؟ خوداوەند بەوی گوتوە کە لەسراییلدا کارزاری بکات، لەهەمان ئێرەیە کە ئەو جەنگی خۆی دەست پێدەکات)).

خۆرەتاو لە ناوەندی ئاسمان بوو، رووی بەردرێژ هەلّمی دەکرد، بۆنی گەنیو لەبەر کاریگەرێتی ئاگراویدا زیاتر دەبوو، یاکوبی فەریسی بە بازووی پڕ لە نوشتەوە بەدیارکەوت، لەناو چاکەو کەراماتی ئەو نوشتانەوە هاتوهاواری بوو قسەی دەکرد: هەندیّ چارەبەخشی گەمژەو قۆلّبغو بای سوور، هەندیّ هەرماسیان دەردەکردو بەهێزترینو گرانبەهاترین نوشتە دەبووە هۆی دوورخستنەوەی شەڕی دوژمن، ئەو دەمی ژەهراوی بەخەباسەت کردەوە ((نەفرەت لە هەرماس) سیّ جار بۆ رەتکرنەوەی شەڕی ئەوان تفی رووەکرد، لەهەمان حالّدا کە کۆنەپۆشان خەریکی دەمەقالّی بوون لەگەلّ یەك، هەریەکەیان بەلەباری خواستی دلیّ خۆی قسەی ئوستادی راڤە دەکرد، پیاوێکی زەبەلاحی بەڕێز بە گۆچانی درێژ، بە ئارەقە هەلّڕشتنەوەو تۆزاوی لەبەردەم ئەواندا قیت بۆوە، رووخساری پانو چروکاوی بریقەی دەدایەوە. پیرەمێردی لێو

کەروێشکی هاواری کرد ((مەلەك یەسدوق، چ خەبەرێکی خۆشت لە (بیث ئنیا) بۆ هێناوین))؟ ریش سپی هاواری کرد ((چەپڵە لێدەنو سەما بکەن)) لەکاتێکا بەردەوام دەگریا یەك یەکی لەباوەش کردن ((مردووێك زیندوو بۆتەوە، بە چاوانی خۆم دیتم، لە گۆڕ هاتەدەرەوەو کەوتەڕێ، ئاویان دایێو خواردیەوە، نانیان دایێو قسەی کرد)). کۆنەپۆشەکان لەکاتێکا هەڵڕژابوونە سەر ریش سپی گوتیان: کەی ؟ چ کەسێ دووبارە زیندوو بۆتەوە؟)) خەڵك لەژێڕ رواقەکانی دەوروبەر بیستیان بەڕاکەڕاك هاتن، چەند نەفەرێ لەخزمەتکارانی پەرستگاو فەریسی نزیك کەوتنەوە، باراباس کە بەوێدا تێدەپەڕی، لەم هەراوزەنایە وەئاگاهاتو هاتەلای ئاپۆڕەکەوە.

مەلەك یەسدوق لەوەی کە دەیبینی ئاپۆڕەیێکی گەورە چاویان بڕیوەتەوە دەمی ئەوەوەو سەگ ساحێبی خۆی نەدەناسی، خۆی هاوێشتە سەر گۆچانەکەیو بەفیزەوە وای دەست پێکرد ((ئیلیازری کوڕی ئەلیاکیم- کەسێ ئەو دەناسێ؟ چەند رۆژی پێشتر مردوو لە گۆڕمان نا رۆژێكو دووانو سێ رۆژ رابرد لەبیرمان کرد لە پڕێکا رۆژی چوارەم هاوارێکمان لە کوچە بیست من چوومە پێش کریستی کوڕی مێریێ ناصیرەییم بینی کە دوو خوشکی ئیلیازر کەوتبوونە سەرپێیو هاواریان دەکرد مەولای ئێمە، ئەگەر تۆ لەگەڵیان بوای نەدەمردن، دەبێ ئەو لەدونیای مردوان بێتەوە، بانگی کە ئەو دێت؟)) کریست دەستی ئەوانی گرت لەزەوی قیتی کردنەوەو گوتی ((یاڵلاّ بابڕۆین!)) هەموو بەدوای کەوتینو گەیشتینە گۆڕەکە، کریست لە شوێنی خۆی وەستا، خوێن هێرشی کردە سەر مێشکیو چاوی سووڕاو ون بوو تەنها سپێنەیان مابوو، هاوارێکی وای لەدڵ سەردا دەتگوت گایێ لەناخیایە، لەکاتێکا سەراپای دەلەرزی هاوارێکی ترسناك، هاوارێکی سەمەرە لە دونیای دیکەدا سەردا، هەڵبەت فریشتەکانیش کاتێ تووڕەدەبن بەهەمان شێوە هاوار دەکەن. هاواری کرد ((ئیلیازر.. وەرە دەرەوە!)) یەکسەر دیتم کە خۆڵی سەر گۆڕ جولاو شەقی برد، بەردی گۆڕ جولا نەفەرێ هێدی هێدی پاڵی دەدا، بەوەحشەتو لەرزەوە، هیچ کاتێ لەتەمەنم وەکو ئەو رابوونە نەترساوم، سوێند دەخۆم کە ئەگەر لەمن دەپرسی، زۆرتر مەیلت لێیە چی ببینی شێر یا رابوون، دەڵێم شێر خەڵکی لەکاتێکا دەگریان هاواریان کرد ((خودایە رەحمان پێ بکە! قسە بکە باوکە مەلەك یەسدوق قسە بکە)).



ژنان کەوتنە قیژەوە، زۆر لەپیاوان خۆیان لەپشت پەردەوە حەشاردا، ئێمە کە لە جێوە مابووین، دەلەرزین، بەردی گۆڕ وردە وردە بەرزبۆوە، یەکەم جار دوو بازووی زەردمان بینی پاشان سەرێکی تەواو سەوز، قاش قاشو تۆزاوی، پاشان لەشی ئێسقان ئاسا وەکو کفنپۆشێ، هەنگاوێکی هەڵێنا، پاشان هەنگاوێکی دی هاتە دەرەوە ئیلیازر بوو.

ڕیش سپی دێ لە قسەکردن وەستا تا ئارەقەی بە قوڵی کراوەی پاك کاتەوە، بەدەوری ئەودا خەڵکی کەوتبوونە شورو خرۆشەوە، هەندێ دەگریانو هەندێ پێدەکەنین. باراباس دەستی زەبەللاحی موویینی بەرزکردەوەو هاواری کرد ((درۆیە، درۆیە، ئەو لەلایەن رۆمیەکانەوە بەکرێ گیراوە ئەو داستانەی دەربارەی ئیلیازر دروست کردووە مەرگ بۆ ناپاکان!))

دەنگێکی کێوی لەدوای ئەوەوە هاواری کرد ((دەمی پیست داخە، کام رۆمیەکان)) هەموو گەڕانەوەو یەکسەر پاشەکشەیان کرد، روفوسی یوزباشی بەقامچی خۆی بەرەو باراباس هات بازووی کچێکی رەنگ پەڕیوی گرتبوو کە قژێکی بۆری هەبوو کچیژگە لە تەواوی ئەم ماوەیەدا وەستابوو، لەکاتێکا فرمێسك لەچاوانی سەوزو درشتی دەهاتە خوارەوە گوێی دابووە قسەکانی مەلەك یەسدوق، باراباس خۆی هاوێشتە ناو خەڵکە گردبووەکەوە ون بوو، لەدوای ئەودا یاکوبی فەریسی رایکرد، لەپشت ستوونێکەوەگەیشتە ئەو، لەوێ هەردووکیان سەریان لەبن سەری یەکتر نابوو چەنەبازیان دەکرد، راهزەنو فەریس بوونە برا.

سەرەتا باراباس کەوتە قسە بەنیگەرانیەوە گوتی ((خەیاڵ دەکەی راست بێت؟))

- چی

- هەمان کە دەڵێن مردەی زیندوو کردۆتەوە؟

- شتێ کە دەمەوێ بەتۆی بڵێم، باش گوێ بگرە، من فەریسییێکمو تۆش گیانباز، تا ئێستا بەخۆمم دەگوت کە سراییل تەنها بەهۆی نوێژو رۆژوو رێبازی پیرۆز، رزگاری دەبێ، بەلاّم ئێستا....

باراباس کە چاوەکانی بریقەی دەدایەوە پرسی ((و ئێستا....؟))

- ئەی گیانباز، ئێستا خەریکم دونیا لە پەنجەرەی چاوی تۆوە دەبینم، نوێژو رۆژو بەس نییە، لێرە خەنجەر، بەکاردێت، تێدەگەی دەڵێم چی؟ باراباس پێکەنی ((خەریکی لە من دەپرسی؟ نوێژ باشتر نییە لە خەنجەر، باشە؟))

- باشترە یەکەمجار لەو دەست پێبکەین

- کەی؟ روونتر قسە بکە؟

- ئیلیازر...، .. ئەم بابەتە بایەخی پلە یەکەمی هەیە کە دەبێ دووبارە درێژەی پێبدەین، مادامەکێ خەڵکی کە ئەو ببینن دەڵێین ((ئەو مردبوو کوڕی مێرێ زیندووی کردەوە، ناوودەنگی ئەو پەیامبەرە درۆزنە جیهان دەگرێتەوە... هەق بە تۆیە باراباس، رۆمیەکان ئەویان بەکرێگرتووە کە هاوار بکات ((بایەخ بە مەلەکوتی زەوی مەدەن... چاوتان لەئاسمان بێ)). بەمجۆرە، لەکاتێکا ئێمە بەسەیرکردنی ئاسمان کاتی خۆمان لە بەین دەبەین‌و رۆمیەکان بەسەر ملی ئێمەوە دادەنیشن.. تێگەیشتی؟))

- باشە؟ لەئێمەی دەوێ کە فڕوفێڵی ئەویش هەڵکەنین؟ هەرچەند برات بێ؟

فەریسی لەکاتێکا وای بەدیاردەخست کە جلی دڕاوە هاواری کرد ((ئەو برای من نییەو دەیدەم بەتۆ)). بەگوتنی ئەو وشانە لەستوونەکەدا خۆی وەلاناو دووبارە دەستی بەجاڕدانی تەڵسمەکانی خۆی کرد، باراباس کەیفخۆش‌و رازی بوو، ئاپۆڕەی دەرۆزەکەران لە دەرەوەی (بارەگای سولەیمان))دا ئومێدی دووبارە هاتنەوەی کریستیان لەدەستداو پەرش‌و بلاوبوونەوە، مەلەك یەسدوقی پیر کەوتە دوای دوو کۆتری سپی تا ئەوان بە ناونیشان قوربانی بکات‌و دیاری‌و سوپاسی خودای سراییل بکات بەخاتری رەحم بەوان کردن‌و ناردنی پەیامبەری تازە دوای ئەو هەموو ساڵە، تاوێرەبەرد دەکات ئاگریان گرتبوو، رووخساری خەڵك لەنوورێکی زۆر ون بووبوو، لەپڕێکا لە جادەی -بیث ئنیا- تۆزوبایێ بەرزبۆوە، هاواری شادی بەرزی ئاسمان بۆوە، تەواوی خەڵکی دێیەکان دوکانەکانی خۆیان داخستبوو دەهاتن، بەڵام یەکەمین دەستە کە دیارکەوتن دەستەی منالاْن بوو، بەخۆیان‌و لقەدارخورماو لقە هەرمێی کێوی بەدوای لقە دارخورمای کریستەوە دەهاتن‌و رووخساریان دەدرەوشایەوە، لە دوورترێکەوە، یاوەران بەرووسووری‌و ئارەقە هەلڕشتنەوە، وەك بڵێی هەریەك لەوان مرۆڤێکی زیندوو کردۆتەوەو لەدوای هەموانەوە خەڵکی (بیث ئنیا) بەهاوارکردنەوە سەرەوژێر بووبوونەوە،



ئەوان بەدوای پەرستگا رایاندەکرد، کریست هەر دوو پەیژەی دەکردە یەك، یەکەم ریزی حوجرەیان رەت داو گەیشتە ریزی دووەم، نوورێکی کێوی لە دەست‌و رووخساری دەتکایە دەرەوە، کەس توانای ئەوەی نەبوو لەو نزیك ببێتەوە، خاخامی پیر کە وەکو ئەوانی دیکە بە هەناسەی بێ ئەژمار لەدوای ئەو رایدەکرد، بۆ ساتێ هەوڵیدا تا بچێتە حەوشەی نادیارەوە کە بە دەوری ئوستادەوە بوو. بەڵام هەر زوو پاشەکشەی کرد، وەك بڵێی مەشخەڵەکان هێرشیان بۆ کردبوو، کریست تازە لە تەنووری خودا هاتبووە دەرەوەو خوێنی بەتووڕەییێکی تەواوەوە جۆشی دەدا، هێشتا نەیدەتوانی باوەڕ بکات کە قودرەت‌و رۆح ئەوەندە گەورەیە، بەڕاستیش حەزی نەدەکرد باوەڕ بکات کە ئایا رۆح دەتوانێ فەرمان بداتە کێوەکان‌و بیانخولقێنێ؟ ئایا دەتوانێ زەوی شەق کات‌و مردوو بەزیندوو بهێنێتە دەرەوە، لەماوەی سێ رۆژ دونیا خرا بکات‌و دووبارە بینای کاتەوە؟

بەم حسابەوە، ئەگەر رۆح ئەوەندە هێزی هەبووا ئەوکاتە بەتەواوی باری لەناوچوون یا رزگاری دەکەوتە سەر شانی مرۆڤەوە، سنووری نێوان مرۆڤ‌و خودا یەکیان دەگرت، ئەندێشەییێکی وا سەرسوورمێن‌و ترسناك بوو، لاجانگەکانی کریست وەکو دەهۆڵ لێی دەداو دەنگی دەهات.

ئیلیازر بەکفنی خۆی بەسەر گۆڕەوە رەهاکردبوو بەخێراییەکی نائاسایی چووبووە پەرستگای ئورشەلیمەوە، یەکەمین جار بوو کە ناشکستەنییێکی وای هەست پێدەکرد کە ئەم دونیایە دەبێ بینەری پایانی خۆی بێ‌و ئورشەلیمی تازە لە گۆڕ بێتە دەرەوە، ئەو ساتە گەیشتبوو، ئەو نیشانەییێك بوو کە ماوەییێك بوو لە چاوەڕوانیا وەستابوو، دونیای رزی ئیلیازرێ بوو، کاتی ئەوە هاتبوو بۆ ئەو هاوار بکات ((ڕابە دونیا)) ئەو دەبووایە ئەم کارە بکات ترسناکتر لە هەمووی کە ئێستا لێی وەئاگا هاتبوو ئەوەبوو هێزی ئەنجامدانیشی هەیە، ئیدی بۆ ئەو ناکردەنی بوو کە بە وەدیارخستنی ناتوانایی جێ چۆڵ کات، ئەو تواناداربوو، جا لە بەرئەوەی دونیا رزگاری نەدەبوو، تەواوی باری گوناهان دەکەوتە سەرشانی ئەو. خوێن هێرشی کردە سەر مێشکی، لە هەموو لایەکدا روانیە مەزلووم‌و کۆنەپۆشەکان کە تەواوی ئومێدیان بەوەوە بەستابۆوە، بەهاوارکردنێکی کێوی بەسەر سەکۆوە هەڵبەزیەوە خەڵکی وەکو مێروولەو کلۆ دەوریان گرت دەولەمەندە خۆش خۆراکەکانیش بەتیزەبزەوە وەستان تا گوێ بگرن، کریست گەڕایەوە، ئەوانی بینی‌و مشتی خۆی بەرزکردەوەو هاواری کرد: ((ئەی ئێوە

دەوڵەمەندەکان گوێ بگرن، ئەربابانی ئەم دونیایە گوێ بگرن، ستەم، نەنگی، برسیەتی ئیدی ناتوانن بەردەوام بن، خوداوەند پشکۆی داناوەتە سەر لێوەکانی منو هاواردەکەم: تاکەی بەسەر تەختەخەوی عاجو سەرینی نەرم دەگەوزن؟ تا کەی گۆشتی هەژاران دەخۆن، ئارەقەو خوێنو ئەشکیان دەخۆنەوە؟))

خودای ئێمە هاوار دەکات ((ئیدی ناتوانم بەرگە بگرم)) ئاگر وانزیك دەبێتەوە، مردووەکان لەگۆڕ هەڵساونەتەوە کۆتایی دونیا هاتووە!)) دوو کۆنەپۆشی زەبەللاح ئەویان نایە سەردەست، ئاپۆرەکە هاتنە باریەكو لقە دارخورمایان خستە راتەکاندنەوە، سەری ئاگرینی پەیامبەر هەڵمی لێ هەڵدەستا,

- من بۆ هێنانی ئاشتی نەهاتوومەتە دونیاوە، بەڵکو بۆ هێنانی شمشێر هاتووم، من تۆوێکی ناسازگار لەمیانیماڵەکان دەچێنم، بەخاتری من کوڕ دەست لە باوکی بەرزدەکاتەوە کچ دەست بەسەر دایکیو بووك بەسەر خەسوی بەرز دەکاتەوە، ئەوەی کە دوای من دەکەوێ هەموو شتێ رەها دەکات، هەر کەسێ کە لەم سەرزەویەدا بەدوای رزگاری خۆی بگەڕێ رزگاری دەبێو ئەو کەسەی کە بەخاتری من ژیانێکی زوو ڕابردوو لەدەست بدات ژیانی ئەبەدی وەدەست دەهێنێ، دەنگێکی وەحشی هاواری کرد ((ئەی یاخی، ڕێبازی موسا چی دەڵێ؟ ئەی لوسیڤەر کتێبی پیرۆز چی دەڵێت؟))

کریست بە چاوانی درەوشاوە وەڵامی دایەوە ((ئەرمیا، ئزگیل، دوو پەیامبەری گەورەن چی دەڵێن؟ من ڕێبازی نووسراوی ستوونەکانی موسا لەکاردەخەمو ڕێبازێکی تازە بەسەر دڵی مرۆڤ دەنەخشێنم، دڵی بەردی مرۆڤ دەردەهێنمو دڵێکی لە گۆشتیان پێدەدەمو لەو دڵەدا ئومێدێکی تازە چرۆ پێدەکەم، ئەوەی کە ڕێبازی نوێ بەسەر دڵەکانەوە دەتاشێ منمو ئومێدی نوێ منم، من ئەشق رادەخەم چوار دەروازەی گەورەی خودا لە رۆژهەڵاتو رۆژاواو باکوورو باشووردەکەمەوە تا تەواوی میللەتانی دونیا بچنە ناویەوە، باوەشی خودا تەنها شوێنی کەلیمیەکان نییە، بەڵکو تەواوی دونیا دەگرێتە خۆ! خودا سراییلیەك نییە تەنها، ئەو رۆحێکی جاویدانییە)).

خاخامی پیر رووخساری خۆی لەناو دەستەکانیدا پەنهان کرد، گەرەکی بوو هاوار بکات ((کریست بێدەنگ بە ئەمە کوفرێکی گەورەیە))، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، هاوارە



کێوی‌و زەوق‌و شەوقەکان دەنگیان دایەوە، هەژاران لە خۆشیان هاواریان دەکرد، خزمەتکارانی پەرستگا، هۆیهایان دەکرد، یاکوبی فەریسی بەدڕاندنی جلی لە هەوادا تفی دەکرد، خاخامی پیر تووشی سەرەخۆری بوو، لەکاتێکا دەگریا ئەوێی جێهێشت لەکاتێ کەبەڕێدا دەڕۆیشت بەبنی لێویەوە گوتی: ((کاری ئەو تەواوبوو، ئەوە چ هەرماسێکە، چ خودایێکە لە دەروونیا هاوار دەکات؟)) خاخام ڕێی دەبڕیو ئەوەندە ماندوو کوترابوو خۆی لەسەر پێیەکانی رانەدەگرت، بەدرێژایی ئەو رۆژانو هەفتان کە بەدوای کریستدا رایکردبوو، تەواوی هەوڵی ئەوەبوو، تێبگات ئەو کێیە، جەستەی لاوازی تاوابۆوە، ئێستاکێ هیچ شتی لە لەشی نەمابوو، جگە لە پێستی هەتاوەسووتی کە ئێسقانەکانی داپۆشی بوو رۆحی پیا هەڵواسرابوو لە چاوەڕوانیدا مابۆوە، ئایا ئەم پیاوە، ئەو کریستەبوو کە خودا مۆژدەی بەو دابوو یا نا؟ تەواوی ئەو پەرجووانەی لەودا سەری دەدا لە دەستی هەرماسیش دەهات، هەرماسیش دەیتوانی مردوو زیندوو کاتەوە لەبەر ئەمە پەرجووەکان بەڵگەی تەواویان نەدەدایە دەست خاخام تا بەم هۆیەوە قەزاوەت بکات، پێشبینیەکانیش. هەرماس فریشتەیێکی زیانبەخشی لەڕادەبەدەر بەهێز بوو، بۆ فریودانی مرۆڤ توانای هەبوو کە گوفتارو کرداری خودا برازێنێتە بەرجەستەی پێشبینیە پیرۆزەکان، بەخاتری هەمان ئەو بەڵگانە خاخام شەوانە لەناو جێگادا رادەکشاو نەیدەتوانی بچێتە خەوەوە. لە خودای تەمەننابوو کە بەزەیی بۆ بهێنێ، نیشانەیێکی ئاسوودەبەخش بدا بەو... چ نیشانەیێك خاخام وەئاگاهات، مەرگ، مەرگی خودی ئەو، بەبانگهێشتی ئەم نیشانە لەرزی، لەناو تۆزو خۆڵدا بۆ پێشەوە چوو، (بیث ئنیا) غەرقی هەتاو بوو، بەسەر گردەوە بەدیار کەوت، بەهەناسە بڕکێوە دەستی بەسەر هەڵگەڕان کرد. دەرگای ماڵی ئیلیازر کرابۆوە، لادێییەکان وەکو مێروولە لەماڵی ئەودا لە هاتوچۆدا بوون، ئەوان بۆ دیتنو دەست لێدانی ئەم پیاوە لە گۆڕهەڵساوەیە دەچوونو بەدیقەت گوێیان لە هەناسەی ئەو دەگرت، تا بۆیان بەدیار کەوێ کە ئایا دەتوانێ قسە بکات ئایا لەڕاستیدا زیندوو بوو، یا شایەد یەك تارمایی بوو، ئیلیازر ماندوو لێوی خۆی داخستبوو لە تاریکترین سووچی ژووردا دانیشتبوو، چونکە رووناهی ئازاری دەدا،

پیێو بازوو سگی وەکو جەستەی چوار رۆژە، هەڵمسابوو سەوز بوو، رووخساری پفکردووی قاش قاش بوو، شلەیێکی مەیلەو زەرد لەکفنی دەهاتە دەرەوە، کە لەبەری نەدەکردەوە،

دەچکایەوە، کفن بەجەستەی وەنووسابوو، نەدەهاتە دەرەوە، سەرەتا بۆنی گەنیوویکی وەحشەتناك جەستەی داگرتبوو، ئەوانەی کە نزیك دەبوونەوە لووتی خۆیان دەگرت، بەلاّم کەم کەم بۆنی گەنیوەکە کەم دەبوو، تا ئەوەی کە تەنها بۆنی خاكو بخوری دەدا، جارناجار دەستی بەرزدەکردەوە، ئەو گیایەی کە بە پرچی یا ردێنی وەنووسابوو لێی دەکردەوە، خوشکەکانی مارتاو مێری، گلّو کرمی خاکی بچووکیان کە بەوەوە وەنووسابوو لەجەستەیەك پاك دەکردەوە، هاوسێیەك لە رووی هاودڵیەوە مریشکی هێنابوو، سالومەی پیر کە لە کەنار سۆپا دەستەوئەژنۆ دانیشتبوو، دەیکولاّند تا پیاوە لەگۆڕهەڵساوەکە چەلاوەکەی بخواو دووبارە گیانی وەبەربێتەوە. گوندییەکان دەهاتنو تەنها چەند ساتێ دەمانەوە تا بەدیقەت ئەزمونی بکەنو قسەی لەگەڵدا بکەن، ئەویش پرسیاری ئەوانی بە نابەدڵی وەلاّم دەدایەوە، ئەوکاتە ئەوانی دیکە لەدێ یا شارەکانی دەوروبەری دەهاتن، ئەمرۆکەش ریش سپییە نابیناکەی دێکەش هاتبوو، دەستی درێژکردو بە مکوڕیو تاسوقەوە دەستی لێدا، لەکاتێدا پێدەکەنی پرسی ((خۆشت رابوارد لەدونیای مردوان؟ ئیلیازر تۆ مرۆڤێکی بە بەختی، ئێستا تەواوی رازەکانی دونیای مردوان دەزانی، بەلاّم ئەو رازانەمان بۆ ئاشکرا مەکە دەنا هەموویان دەنێریتە ولاّتی شێتی)) ئەوکاتە چرپاندیە گوێیو بەنیوە سوحبەتو نیوە ترس پرسی ((هەمووی، کرم، بەڵێ؟ هیچ شتێ جگە لەکرم نییە؟)) ماوەیێ لە چاوەڕوانیدا مایەوە، بەلاّم ئیلیازر وەلاّمی نەدایەوە، پیاوە نابیناکە تووڕەبوو دەستی دایە گۆچانەکەیو رۆیشت؟ مەجدەلیە لەکەنار دەرگادا وەستابوو کەوتبووە روانینی ئەو جادەیەی کە بە ئورشەلیم کۆتایی دەهات، دڵی وەکو منداڵێکی بچووك دەگریا، تەواوی ئەم شەوانە خەوی خراپی بینی بوو لەخەودا دەیبینی کە کریست زەماوەندی کردووە ئەوەش بەمانای مەرگ بوو، شەوی پێشتر لەخەودا بینی بووی کە ئەو ببووە ماسییێکی باڵدارو باڵەکانی خۆی کردەوە لە ئاو هاتە ناو وشکاییەوە بەسەر تاوێرەبەردێکی کەناردا باڵی لێکدەداو بێهودە هەولێدەدا تا باڵەکانی خۆی دووبارە بکاتەوە، لەکاتێکا لە هەناسە کەوتبوو، چاوەکانی دەستی کرد بەتاری بوون، گەڕایەوەو سەیری مەجدەلیەی کردو مەجدەلیە لە گیانەللاّ بوو کە هەڵیگرێ دووبارە بیهاوێتەوە ناو ئۆقیانوس، کاتێ کە لاربۆوە ئەوی گرتە دەست مردبوو، بەلاّم لە تەواوی ئەو ماوەیەدا کە رایگرتبوو شیوەنی دەکردو ئەشکی بەسەرا هەڵدەڕشت، گەورە بوو تەواوی باوەشی داگرتو بوو بە مرۆڤێکی مردوو.



- ناهێڵم بگەڕێتەوە ئورشەلیم.... ناهێڵم....

ئاخێکی هەڵکێشا چاوی بڕیە جادەی سپی تا شایەد بدۆزێتەوە، بەلاّم ئەو کریست نەبوو کە دۆزیەوە، لەباتی ئەمەو مەجدەلیە پیرە باوکی بینی کە چەماوەتەوە بەهانکە هانکەوە دێت، لەبەرخۆ گوتی: ((پیرەمێردی بێچارە تولّخاوەتەوە، بەم وەزعە لە دەستچووی نازانم چۆن وەك سەگی بەوەفا بەدوای مەولای ئێمە کەوتووە، شەوانە گوێم لەدەنگی هەڵسانەوەی دەبێ، دەچێتە حەوشەوەو دەکەوێتە سوژدە، بۆلای خودا بانگ رادێرێ ((کۆمەکم بکە نیشانەیێکم پێ بەخشە)) بەلاّم خودا لێی دەگەڕێ کە ئەو خۆی ئەشکەنجە بدات، لەڕوودا بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەیەتی، چونکە خۆشی دەوێ، بەم رێگەوە پیاوە بێچارەکە ئاسوودە دەبێ.

ئێستا سەیری ئەو دەکات خۆی هاوێشتۆتە سەر گۆچانەکەیو سەرهەڵدەگەڕێ، بەردەوام دەوەستێ، روو لە ئورشەلیم دەکاتو بازووەکانی درێژ دەکات تا هەناسە تازەکاتەوە، بەدرێژایی ئەو رۆژانە کە باوكو کچە لە (بیت ئنیا) بوون رابردوویان سپاردبووە دەست فەرامۆشیو دووبارە لەگەڵ یەك بەقسە دادەنیشتن، خاخام کە لەوە بە ئاگاهات کچەکەی لە رێگایەکی بێ ئەدەب هاتۆتە دەرەوە، لەوی بورد دەیزانی کە تەواوی گوناهەکانی بەئەشك دەشۆردرێت، مەجدەلیە فرمێسکێکی زۆر هەڵڕشتوە.

پیرەمێرد کە لەهەناسە کەوتبوو، گەیشت، مەجدەلیە لە کەنارێکەوە وەستا تاڕەت بێ، بەلاّم ئەو لەجێی خۆی مایەوەو بەپاڕانەوە دەستی کچی خۆی گرت ((مەجدەلیە رۆڵەم تۆ ژنی، ئەشكو نەوازشی تۆ هێزێکی زۆریان هەیە، بکەوە سەرپێیەکانی، لێی بپاڕێوە داوای لێ بکە نەگەڕێتەوە ئورشەلیم، کاتیبانو فەریسیەکان ئەمڕۆ زیاتر لەجاران تووڕەبووینە، ئەوانم بینی بەدزیەوە لەمیانی خۆیان گفتو گۆیان دەکردو ژەهریان لەلێو دەباری، ئەوان نەخشەی کوشتنی ئەو دەکێشن.

مەجدەلیە رونی کردەوە ((کوشتنی ئەو))و دڵی داڕما ((باوکە بەلاّم مەگەر مەرگ دەتوانێ کار لەو بکات.؟))

خاخامی پیر سەیری کردە کچەکەیو بەگرژیەوە بزەییێکی کردو بەبنی لێویەوە گوتی ((هەموو ئێمەمانان، ئەوانەی کە خۆشمان دەوێن وا دەڵێین)) ئەوکاتە بێدەنگ بوو.

مەجدەلیە بەنائومێدیەوە گوتی ((بەڵام مەولای من مرۆڤێکە وەکومرۆڤەکانی دیکە نییە، نە، ئەونیە.. ئەونیە!)) دووبارە ئەو قسەیەی خۆی دووپات دەکرد تا جادو لەترسی خۆی بکات. پیرەمێرد پرسی ((چۆن دەزانی؟)) دڵی لەخۆشیان داخورپا، چونکە باوەڕی بەپێشبینی ژنان هەبوو. مەجدەلیە وەڵامی دایەوە ((من دەزانم لەمن مەپرسە کە چۆن، من لەوە دەڵنیام باوکە، هەراسان مەبە، ئێستا کە ئیلیازری لەگۆڕ هەڵخزاند، کێ دەتوانی دەست لەو بدات؟

ئێستاکە ئیلیازری لەگۆڕ هەڵخزاندو خەڵك زیاتر لە جاران تووشی شڵەژان بووینە، پێشتر گوێیان لە پەندی ئەو رادەگرت‌و شانیان هەڵدەتەکان، بەڵام ئێستا پەرجووکە چۆتە ناو خەڵك خەڵکی ئازایەتیان وەدەست هێناوەو هاوار دەکەن ((ئەو کریستیانویە، ئەو مردوو زیندوو دەکاتەوە، هێزی ئەو لەلایەن خوداوەیە- باشتروایە بچین‌و پەیوەندی بەوەوە بکەین، ئەمڕۆکە پیاوان‌و ژنان لقەدارخورمایان گرتۆتە دەست، هەژاران سەرکێشی دەکەن، کاتیبان‌و فەریسیان هەموو ئەوان دەبینن‌و خوێنی خۆیان دەخۆنەوە لە تووڕەییان شێت بووینە.

***

قسەیان ئەوەیە کە ((ئەگەر بەر لەو نەگرین، کارەکانمان زار دەبێ،))و بۆ یەکجاری دەچنە لای یۆحەننا، لە یۆحەننا لای کیافا لە قیاقا لای پیلات-و گۆڕی هەڵدەکەنن,,, فەرزەندەم مەجدەلیە پێیەکانی توند بگرە، نەهێڵیت هیچکاتێ دووبارە بچێتە ناو ئورشەلیمەوە، ئێمە دەبێ هەمووومان بگەڕێینەوە جەلیل.

رووخسارێکی ئاوەڵاوی لە زەینیان نەخشی بەستاو بەردەوام بوو، ((مەجدەلیە لەسەر رێگام بۆ ئێرە باراباسم بینی بە رووخساریێ لەنەفرەت ئەنگیزی کە لە رووخساری مەرگ دەچوو، لەم دەوروبەرەدا دەهاتودەچوو، بەبیستنی دەنگی پێی من خۆی لەناو تەراشێ شاردەوە، ئەوەیان نیشانەییێکی بەدە)) لەشی لاوازی خاخام لە برست کەوت، کچەکەی دەستی گرت‌و بردیە ناو ماڵەوە، کورسییەکی بۆ دانیشتن بۆ هێناو خۆشی لەکەناریا لەسەر زەوی دانیشت، پرسی ((ئەو ئێستا لەکوێیە؟ باوکە، لەکێ لەو جیابوویەوە؟)) لە پەرستگادا هاواری دەکردو بڵێسەی لەچاوان دەهاتە دەرەوە، ئاگر لە تەلاری پیرۆز بەردەدا! وای خودای من چ قسەیێکی کوفرئامێزی لەدەم دەهاتە دەرەوە، دەڵێت رێبازی موسای لەکارخستووە، رێبازێکی دیکەی،



هێناوە، بۆ دیتنی خودا ناچێتە کێوی توور، دیداری خوا لەدڵی خۆیدا دەکات. پیرەمێرد ئاهەنگی دەنگی خۆی دابەزاندو لەکاتێکا دەلەرزی گوتی ((فرزەندم جارجارە ترسی ئەوەم هەیە کە ئەقڵم لەدەست بدەم.. یا رەنگە لوسیڤەر، مەجدەلیە بەفەرامانداناەوە گوتی ((بێدەنگ!)) هەردوو دەستی خۆی لەسەر لێوەکانی ئەو دانا، ئەوان هێشتا لەگفتوگۆ بوون کە یاوەران یەك لەدوای ئەویتر وەدیارکەوتن، مەجدەلیە لە جێوە هەڵساو سەیری کرد، بەڵام کریست لەنێو ئەواندا نەبوو، بەدەنگێکی خەمگینەوە پرسی ((ئەی کوا مەولا))؟ پەترۆس بەسەروپۆتەلاکێکی تێکچڕژاو وەڵامی دایەوە گوتی ((هەر ئێستا دێت)) مێریێش لە جێوە هەڵسایەوە، برای خۆی بەرەلا کردو نزیکی یاوەران کەوتەوە، رووخساریان تیروتارو شپرزە بوو بوو چاوانیان کزبووبوو مێریێ پشتی بەدیواردا بەدەنگێکی لاواز بەبنی لێو قسەی کرد: ((ئەی کوا مەولا))

یۆحەننا وەڵامی دایەوە ((مێریێ هەر ئێستا دێت، وا خەیاڵ دەکەی ئەگەر رووداوێکی بەسەر هاتبێ جێمان دەهێشت؟))

یاوەرە رووخسار تێکچڕاوەکان لەناو ژوورا پەرش‌و بڵاوبوونەوە، مەتی کاغەزەکانی لەبن کراسی هێنایە دەرەوەو ئامادەی نووسین بوو. خاخامی پیر گوتی ((مەتی قەسە بکە، شتێ بڵێ، تا دووعای خێرت بۆ بکەم))

مەتی وەڵامی دایەوەو گوتی ((باوکە هەر ئێستا کە هەموومان بەیەکەوە گەڕاینەوە، روفوسی یوزباشی لەدەم دەروازەی ئورشەلیمدا بەری لەئێمە گرت‌و هاواری کرد ((بووەستن فەرمانێکم بۆ ئێوە پێیە)) هەموو لەترسان زەندەقمان چوو، بەڵام ئوستاد بەئارامی دەستی بۆلای ئەو درێژ کردو گوتی ((ئەی دۆست بەخێر بێی چیت دەوێ؟))

ڕوفوس وەڵامی دایەوە ((ئەوە من نیم ئەوەی دەربارەی تۆ دەدوێت، لووتف بکە لەگەڵم وەرە)).

کریست بە ئارامی گوتی ((وادێم)). رووی لە ئورشەلیم کرد هەموو کەوتینە سەرپێی ئەوو هاوارمان کرد ((مەولای ئێمە بۆ کوێ دەچیت؟ ئێمە رەهات ناکەین؟))

یوزباشی کەوتە میانی ئێمەو گوتی ((مەترسن قەولتان پێدەدەم کە ئەو نیازێکی باشی هەیە)).

ئوستاد فەرمانی بەئێمەدا ((بڕۆن مەترسن، هێشتا کاتی موژدەهێن نەهاتووە)) بەلاَم یەهودا قسەی ئوستادی بڕی و گوتی ((ئوستاد منیش لەگەڵ تۆ دێم، تۆ جێناهێڵم))

ئوستاد وەلاَمی دایەوە ((وەرە منیش تۆ جێناهێڵم)) لەگەڵ یەك بەرەو ئورشەلیم گەڕانەوە، روفوس و ئوستاد لە پێشەوەبوون، یەهودا وەك سەگی مێگەل لەدواوە)) لەهەمان کاتدا کە مەتی قسەی دەکرد، یاوەران بێ ئەوەی قسەیێ بکەن نزیك بوونەوە دانیشتن.

خاخام گوتی ((رووخساری تۆ شلەژاوە، شتێکمان لێ دەشاریەوە)) پەترۆس بە زەمزەمەکردنەوە گوتی ((ئێمە نیگەرانی دیکەمان هەیە باوکە، نیگەرانی دیکە)). جارێکی دی لێویان داخست.

راستیەکەی هەمان ئێستا لەسەر رێگادا هەرماسی شەڕ چووبووە ناو لەشیان هەڵسانەوەی مردوو دەستی پێکردبوو، رۆژی خودا بە ئاشکرا وەنزیك دەکەوتەوە، ئوستاد بەسەر تەختەوە دادەنیشت لەبەر ئەمە بۆ ئەوان زەمانەکە هاتبوو، کە دەستکەوتەکانی دابەش بکەن، لەهەمان جێدا، لەکاتی دابەشکردن بوو کە یاوەران کەوتبوونە دەمەقاڵێ لەمیانی یەکتریدا.

یەکێکیان گوتی ((من لەلای راستی دادەنیشم، ئەو منی زیاتر لە هەمووتان خۆشدەوێ)) ئەوان بۆ پێشەوە هەڵبەزینەوەو هاواریان کرد ((نەخێر، من، من))

- من

- من

ئاندریاس گوتی ((یەکەمین کەس بووم کە ئەوم بە ((مەولای من، بانگ کردووە)). پەترۆس پەلپی گرت و گوتی ((ئەو دەهاتە خەونی من تا خەونی تۆ)) یۆحەننا گوتی ((ئەو من بە ئازیز بانگ دەکا))

- من

- من



خوێنی پەترۆس کەوتبووە جۆشەوەو هاواری کرد ((هەمووتان داپۆشن، مەگەر هەمان رۆژانی پێشتر نەبوو بەمنی گوت ((پەترۆس، تۆ بەردی و من بەسەر تۆوە ئورشەلیمی تازە بینا دەکەم)) دروستە؟

مەتی لەکاتێکدا دەفتەری خۆی لەژێر هەنگڵ دەناو دەریخست و گوتی ((ئورشەلیمی تازە)) من لێرەو گوفتاری ئەوم نووسیوە.

پەترۆس بەتووڕەیی گوتی ((بەدوو نووسەر، پێم بڵێ چی بە من گوت؟ من وام بیست))

- ئەو گوتی ((تۆ بەردی و من بەسەر ئەو بەردەوە کڵێسای خۆم دروست دەکەم)) کڵێسا نەك ئورشەلیم- لەمیانی ئەو دووە جیاوازی زۆرە.

پەترۆس هاواری کرد (مژدەی چی تری بەمندا؟ بۆ لە قسە وەستای؟ هەڵبەت لە بەرژەوەندی تۆدا نییە... ها؟ دەربارەی کلیلەکانی گوت. یاڵلاّ قسە بکە))

مەتی بە کەم مەیلیەوە دەفتەری دەرهێناو کردیەوەو خوێندیەوە ((من کلیلەکانی مەلەکوتی ئاسمان دەدەم بە تۆ)).

پەترۆس پیرۆزمەندانە هاواری کرد ((بەردەوام بە... بەردەوام بە)) مەتی ئاوی دەمی قورتداوەو دووبارە لاربۆوە سەر دەفتەرەکەی ((هەر شتێك تۆ بەسەر زەویەوە پەیوەندی دەدەی لە ئاسمان پەیوەست دەبێ، هەرچییەك تۆ بەسەر زەویەوە لێکی بپچڕێنی لە ئاسمان دەپچڕێت..و هەمان!))

- ئەوە بەڕای تۆ بێهودەیە؟ هەموو گوێ بگرن، من کلیلم هەیە، ئەوە منم کە دەروازەی بەهەشت دەکەمەوەو دادەخەم، ئەگەر بمەوێ مۆڵەتتان پێدەدەم بچنە ناویەوە، ئەگەر نەمەوێ، رێتان نادەم لەهەمان جێ بوو کە یاوەران کەوتنە سەریەوەو ئەگەر لە (بیث ئنیا) نزیك نەکەوتبانەوە، ئەوە یەکتریان لەت و پەت دەکرد، بەلاَم لەبەرامبەر دێهاتیەکان شەرمەزاربوون رقی خۆیان خواردەوەو لەگەڵ ئەمەشدا رووخساریان هێشتا بەتەواوی گرژو مۆن بوو.

## بەشی بیستو شەشەم

له هەمان ئەم سەینو بەینەدا کریست لەگەڵ یوزباشی ڕێی تەی دەکردو یەهودا، سەگی مێگەل لەدوای ئەوانەوە چوونە ناو بوارە باریكو پڕ پێچو پەنای ئورشەلیمەوە، لەڕێگای پەرستگا، بەرەو بورجێ کە تەلاری — پونس پیلات- بوو بۆ پێشەوە ڕۆیشتن.

سەرەتا یوزباشی کەوتە قسە، بەدەنگێکی تێکەڵ بە هەڵچوون گوتی: ((خاخام، کچەکەم تەواو سەلامەتی خۆی بەدەست هێناوەتەوە، هەمیشە لەبیری تۆیە، هەرکات کە خەبەرداری ئەوە دەبێ کە تۆ بۆ خەڵك قسە دەکەی، بەدزیەوە ماڵ جێدەهێڵێ، بەپەلە ئامادەی شوێنی قسەکردنی تۆ دەبێ، ئەمڕۆ دەستی ئەوم توند گرتبوو، بە یەکەوە بووین لە پەرستگا گوێمان لەقسەی تۆ ڕاگرتبوو، دەیەویست بێو پێی تۆ ماچ بکات)). کریست پرسی: ((باشە بۆ نەتهێشت؟ بۆ نەجاتی ڕۆحی مرۆڤ ساتێکیش بەسە، بۆ ئەم ساتەت بەبادا ؟)).

ڕەفوس بەشەرمەزاریەوە بەخۆی گوت: ((کچێکی ڕۆمی پێی یەهوودیێ ماچ بکات!))، بەڵام قسەی نەکرد، بەو قامچیە کورتەی لەدەستی دابوو، ئاپۆڕەی پڕ هەراو هۆریای لاداو ڕێی بۆ خۆی کردەوە، هەوا ئەوەندە گەرم بوو، کە مرۆڤی دووچاری غەش دەکرد، مێشو مەگەز کوچەو بانی داپۆشیبوو، هەناسەدان لە فەزای یەهودیدا یوزباشی دووچاری هێڵنج دەکرد، ساڵەهای ساڵ بوو لە فەلەستین بوو، بەڵام هێشتا عادەتی بە یەهودییەت نەگرتبوو، ئەوان ئێستاکە لە مەیدانی بازاڕ کە بەحەسیر داپۆشرابوو، تێدەپەڕین ئەوێ فێنکتر بوو، هەنگاوەکانیان سست کرد،



یوزباشی پرسی: ((چۆن دەتوانی لەگەڵ ئەو حەمکە سەگە قسە بکەیت؟ کریست سوور هەڵگەڕاو وەڵامی دایەوە: ((ئەوانە سەگ نین ڕۆحن، تەلەزمێکن لەوجودی خودا، خوداوەند ئاگرێکی سەرسووڕهێنەرە، هەموو ڕوحێکی تەڵەزمی دەبێ حورمەتی بگیردرێت.)).

ڕوفوس گوتی: من ڕۆمییێکمو خودای من ڕۆمیە، جادەکانی دەکردەوە، قەڵای دروست دەکرد، ئاوی دەبردە شارەکان، خۆی چەکدار دەکاو دەچێتە جەنگ، فەرماندەیی لەشکری دەگرێتە دەست، ئێمە بەدوای دەکەوین، ئەو جەستەو ڕۆحەی تۆ دەربارەی ئەوان قسە دەکەیت، بۆ ئێمە یەکە، بەسەر بەرزایی ئەوەوە مۆری ڕۆمی لێیە، ئەوکاتە کە دەمرین ڕۆحو جەستە لەگەڵ یەك لەبەین دەچن، بەڵام ڕۆڵەکانمان جێمان دەگرنەوە، مەبەستی ئێمە لەجاویدانی هەر ئەوەیە، بەداخەوەم، بەڵام ئەوەی تۆ دەیڵێی دەربارەی مەلەکوتی ئاسمان بە ڕای ئێمە جگە لە ئەفسانە هیچی دیکە نییە)) دوای وەستانێکی کورت بەردەوام بوو گوتی: ((ئێمەی ڕۆمی بۆ فەرمانڕەوایێتی مرۆڤ دروست بووین)) ناکرێ بەعیشق فەرمانڕەوایەتی مرۆڤ بکرێ))

کریست لەکاتێکا دەیڕوانییە چاوانی شینو ساردو ڕووخساری تازە تیرهاویشتەو دەستی خەپڵەو ئەنگوستی کورتی یوزباشی، گوتی ((ئەشق بێ چەك نییە، عەشقیش جەنگ دادەگیرسێنێو هێرش دەکات))

یوزباشی هاتەبەرو گوتی: ((لەم حاڵەتەدا ئیدی ئەشق نییە))

کریست سەری دابەزاندو لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشە (( شەرابی نوێ دەبێ خەمی نوێی هەبێو قسەی نوێو مانای نوێ)).

ئەوان لە ئەنجامدا گەیشتن، بورجو یاری تەلاری پونس پیلاتی والی ڕۆح زلی ڕۆمی لە بەرەو رووی ئەوان قەدی بەرز کردبۆوە، پیلات نەفرەتی لە نەژادی یەهود دەکرد هەرکاتێ بەکوچەکانی ئورشەلیمدا ڕەتدەبوو، یا ناچاری قسەکردن دەبوو لەگەڵ یەهودیەکان، دەسماڵێکی بۆنداری لەبەر لووتی خۆیا دەگرت، ئەو نەباوەڕی بە خوداکانو نە بەمرۆڤ هەبوو، نەبە پونس پیلاتو نە بە شتێکی دیکە، تیغێکی

تیژی بەزنجیرێکی زێڕینی بەهادار بە گەردەن هەڵواسی بوو، هیچ کاتێ لەخۆی بەدوور نەدەگرت. تا ئەگەر زەمانێ لەخواردنو خواردنەوەو والیگری بێزار بێت یا لەلایەن قەیسەری رۆم دوورخرێتەوە، دەماری دەستی خۆی ببڕێت، زۆربەی هاوارو پاڕانەوە ئامێزەکانی یەهودیانی دەبیست کە هاتنی کریستیان بۆ نەجاتی خۆیان داوا دەکردو دەیدایە پێکەنین، لەکاتێکا هێمای بۆ تیغی تیژی گەردەنی دەکرد بەژنەکەی دەگوت (سەیرکە کریستیانوی من، نەجات بەخشی من لێرەیە))، بەلاّم ژنەکەی بێ ئەوەی وەلاّمی بداتەوە، سەری وەردەسووڕاند.

کریست لەدەرەوەی دەرگای گەورەی تەلار وەستاو گوتی: ((یوزباشی قەرزی خۆت سەبارەت بەمن لەبیر نەکردووە؟ ئێستا زەمانی جێبەجێکردنی هاتووە)). روفوس وەلاّمی دایەوە: ((کریستی ناصیرەیی من لەتەواوی لەززەتی ژیانم قەرزداری تۆم بلّێ چ خزمەتێکت لەمن دەوێ؟))

-ئەگەر دەستگیریان کردمو منیان خستە زیندانەوە، یا منیان کوشت بۆ نەجاتدانی من کارێ ئەنجام مەدە، وادەم پێدەدەی؟

-ئەوان ئێستا چوونەتە ناو دەرگای گەورەی تەلارەوە، پاسەوانان دەستەکانی خۆیان بەناونیشانی سلاّوی نیزامی بۆ یوزباشی بەرز دەکردەوە، روفوس بەسەرسامیەوە پرسی ((تۆ ناوی ئەمە دەنێی داوا؟ من لە ئێوەی یەهودی ناگەم)). دوو پاسەوانی رەشپێستی زەبەللاح لە دەرەوەی دەرگای ژووری پیلات بۆ پاسەوانیکردن وەستابوون: کریست گوتی ((بەڵێ یوزباشی ئەمەیان داوایە وادەم پێدەدەی؟ روفوس بەهێمای سەر دەستووری بە پاسەواناندا کە دەرگا بکەنەوە، پیلات شۆخو شەنگ ریش تاشراو بەسەر تەختی بەرزی رازاوە بەبازی گەورەوە دانیشتبوو دەیخوێندەوە، توێڵی کورت بوو چاوانی خۆڵەمێشی بوو لێوێکی ناسکی هەبوو، سەری هەڵبڕی تا سەیری کریست بکات، کە لە بەرەو رووی وەستابوو، لەکاتێکا دەسماڵی عەتراوی خۆی نا بە سەرلووتی، بەتیزئامێزەوە گوتی ((کریستی ناصیرەیی پاشای یەهود تۆی؟))

- کریست وەلاّمی دایەوە ((من پاشا نیم))



-ئەی چیی؟ مەگەر تۆ کریستیانو نیت؟ مەگەر کریستیانو هەمان کەسێ نییە کە هاونیشتمانیەکانت، نەتەوەی ئیبراهیم، نەوە لەدوای نەوە لە چاوەڕوانیدا بوون کە بێتو ئازادیان بکاتو بەسەر تەختی سراییل دانیشێو ئێمەی رۆمی دەرەپەڕێنێ؟ کەواتە بۆ دەڵێی پاشا نیت؟

- مەلەکوتی من لەسەر زەوی نییە.

-پیلات قاقا پێکەنی گوتی: ((ئەی بەسەر ئاوەوەیە یا بەسەر هەواوەیە؟)) کریست بەئارامی وەلاّمی دایەوە ((لە ئاسمان دایە))

- پیلات گوتی ((زۆرباشە تۆ دەتوانی ئاسمان بەناونیشانی خەلاّت بۆ خۆت هەڵگری بەلاّم پەیوەندیت بەزەویەوە نەبێ)) ئەوکاتە ئەڵقەیێکی قەبەی لەدەستدا بوو لەنووری چرادا گرتو روانیە رەنگی قورمزی ئەوەوە، بەسەر نقێمی کەللەسەرێکەوە داتاشرابوو لەدەوریەوە ئەم وشانە نووسرا بوو ((بخۆ، بنۆشەو شاد بژیت، چونکە بەیانی دەمریت))

- یەهودیەکان وەزع وحاڵی ئێمە تێکدەچڕژێنن، هیچ کاتێ خاوێن نابنو خودای ئەوان لە رووخسارياندایە: پرچ درێژ، پۆخڵ، سەرسەخت، ستایشی خۆیان دەکەن، رقی حوشتریان هەیە.

-کریست دیسان بەئارامی گوتی ((بزانە ئەو خودایە پێشتر مشتی خۆی بەڕووی رۆمدا بەرزکردۆتەوە)). پیلات بەباوێشك کێشانەوە وەلاّمی دایەوە ((رۆم جاویدانییە))

- رۆم هەمان ئەو پەیکەرە زەبەللاحەیە کە دانیالی پەیامبەر لەخەونی خۆیدا بینی بووی.

- پەیکەر؟ کام پەیکەر؟ ئەوەی ئێوەی یەهودیەکان لەبێداریدا حەسرەتی بۆ هەڵدەکێشنو خەوی پێوە دەبینن، ئێوە بە خەون دەژینو بەخەون دەمرن.

- بەخەونەکانەوەیە کە مرۆڤ خەباتی خۆی دەست پێدەکات کەم کەم سێبەرەکە چڕتر دەبێو بەرجەستە دەبێ، رۆح ئاراستەی لەش دەبێ بۆ زەوی دادەبەزێو دەگەڕێ،

لەبەر ئەمە خەونی دانیال پێغەمبەر دێتەدی، رۆح ئاراستەی تەن دەبێو دادەبەزێتە زەوی‌و دەگەڕێو رۆمیەکان لەناودەبات.

- کریستی ناصیرەیی من ستایشی بێباکی تۆ دەکەم، لەوانەیە هی گەمژەڵێشت، وابەدیار دەکەوێ کە باکت بەمەرگ نییە لەبەر هەندێیە کەوا ئازاد قسە دەکەیت. تۆم خۆشدەوێ، باشە باسی خەونی دانیالم بۆ بکە.

-شەوێکیان دانیالی پەیامبەر پەیکەرێکی گەورەو زلی بینی، سەری پەیکەرەکە لە زێڕ بوو سینەو بازووەکانی لە زیو، ورگو رانی لە برونز، قاچەکانی لەئاسن، ژێر پێکانی لەگڵی رس، لەپڕێکا دەستێکی نادیار بەردێکی هاویشتە پێیە گڵیەکانی وردی کردو یەکسەر تەواوی پەیکەرەکە- زێڕو زیوو برۆنزو ئاسن- لەزەوی خلۆربوونەوە.. پونس پیلات، ئەو دەستە نادیارە خودای سراییلەو ئەو بەردەش منم، ئەو پەیکەرەش رۆم دەبێ. پیلات جارێکی دیکەش باویشکی هاتی‌و بە دڵگرانی گوتی ((ئەی پاشای یەهود دەزانم دەتەوێ سواری چ فیڵێ بیت، کرێتی بە رۆم دەکەیت تا تووڕەیی من بجۆشێنی‌و تۆ لە خاچ بدەم‌و ئەو کاتە ببیتە قارەمان، زیرەکانە هەموو شتێکت رێکداوەتەوە، ئاگام لێیە هەتا تۆ دەستت کردووە بەزیندووکردنەوەی مردووان، بەڵێ تۆ لەحاڵەتی هەمووارکردنی رێگەی، بەهەمان جۆر یاوەرانت پەرشی دونیا دەکەی کە تۆ نامریت، بەڵکو رابویت‌و بۆ ئاسمان هەڵگەڕاویت، بەلاّم هەی فێڵبازی ئازیز بزانە کە زۆر لێ دووری، فێڵەکانی تۆ کۆن بووە، باشتر وایە فێڵی تازە بدۆزێتەوە، من تۆ ناکوژم، ئارەزووم نییە بتکەم بە قارەمان، تۆ نابیتە خوداش، لەبەر ئەمە ئەم نەخشەیە لەسەرت دەرکە)) کریست قسەیێکی نەکرد لەمیانی پەنجەرەی کراوەدا روانیە پەرستگای گەورەی یەهود کە وەك مرۆڤخۆرێکی بێ جولە لەنووری هەتاودا بریقەی دەدایەوە، پۆل پۆ مرۆڤی رەنگاوڕەنگ دەچوونە ناو گەرووی رەشی کراوەی، پیلات یاری بە زنجیرەی بەهاداری زێڕین دەکرد ئەویش قسەیێکی نەکرد، پێی نەنگ بوو داوایەك لە یەهودییێك بکات، بەلاّم قەولی بەژنی دابوو، داوایەك لە یەهودییێك بکات، بەلاّم قەولی بەژنی دابوو چارەی نەبوو. کریست پرسی ((تەواو بوو؟)) بەرەو لای دەرگا گەڕایەوە. پیلات هەڵسایەوەو گوتی ((سەبرکە قسەم لەگەڵت



هەیە لەبەر ئەمە بوو کە تۆم داواکردووە، ژنەکەم دەڵێت کە هەموو شەوێ خەو بە تۆوە دەبینێ، لەبەرخاتری تۆ زات ناکات چاو باوێتە سەریەك، دەڵێت کە هەموو شەوێ تۆ لەدەست هاونیشتمانیەکانت، حەناو کانا کەبەدوای مەرگی تۆدا دەگەڕێن، شکایەت لەو دەکەی‌و بە دەستەپاچەیی‌و ناگوزوری داوا لەو دەکەی کە قسە لەگەڵ من بکات‌و من قانیع بکات کە دەست لە کوشتنی تۆ هەڵگرێ، دوێنێ شەو ژنەکەم بەقیژەقیژەوە لەخەو راپەڕی‌و دەستی بەگریان کرد، وادیاربوو دڵی بەتۆ دەسووتا، (نازانم بۆ، من کارم بە پڕوپوچیەکانی ژنانەوە نییە) جارێ کەوتە سەرپێیەکانم تا ناچارم بکات تۆ داواکەمە ئێرەوە بەتۆ بڵێم لێرە بڕۆیت‌و خۆت نەجات بدەیت.

❊❊❊

-کریستی ناصیرەیی هەوای ئورشەلیم بۆسەلامەتی تۆ زیانبەخشە، بگەڕێوە جەلیل، نامەوێ زۆریت لەگەڵ بەکاربهێنم، ئەوەیان بەنیازی دۆستێ بەتۆ دەڵێم بگەڕێوە جەلیل.

- کریست بەهەمان شێوە لەڕووی هەمیشەیی وەلاّمی دایەوە: ((ژیان جەنگە تۆش ئەوە دەزانی، چونکە سەربازێکی رۆمیت، بەلاّم ئەوەی کە نازانی ئەوەیە: فەرماندە خودایەو ئێمە سەربازی ئەوین، لەهەمان ساتی کە مرۆڤ لە دایك دەبێ خوداوەند زەوی بەو نیشان دەدات، بەسەر زەویەوە شارێ، گوندێ، کێوێ، دەریایێ یا بیابانێ، پێی دەڵێ: ((تۆ لێرەوە دەجەنگی)) ئەی والی یەهودی، شەوێکیان خودا چنگی لەپرچم گیرکردو هەڵیگرتم‌و هێنامیە ئورشەلیم رووبەڕووی پەرستگا لەسەر زەوی دانیام‌و گوتی ((تۆ لێرە جەنگ بەرپا دەکەی)) ئەی والی یەهودیە من پەیمان شکێن نیم هەر لێرەوەیە کە جەنگ بەرپا دەکەم))

- پیلات شانەکانی راتەکاند، بەداخەوەی ئەوەبوو، کە تکای کردبوو یەك رازی خانەوادەی بۆ یەهودیەك ئاشکرا کردبوو، وەك چۆن عادەتی بوو دەستی لێکخشاندو گوتی ((من دەست لەوکارە وەرنادەم بڕۆ)) کریست دەستەکانی بەرزکردەوەو مۆڵەتی وەرگرت، بەلاّم کە لە ئاستانەی دەرگادا رادەبرد، پیلات بەشێوەیەکی تیزئامێزەوە

بانگی کرد ((ئاهای کریست ئەو خەبەرە ترسناکەی کە بیستوومە بۆ جیهانت هێناوە چییە؟))

-کریست وەڵامی دایەوە ((ئاگر... ئاگر بۆ پاککردنەوەی زەوی))

- لەڕۆمیەکان.....؟

- نە لە گاور وزاڵمو ناپاکو تێرەکان

- پاشان؟

- پاشان بەسەر زەوی داتاشراودا ئورشەلیمی تازە دروست دەکەینەوە.

- کێ ئورشەلیمی تازە دروست دەکاتەوە؟

- من

- پیلات قاقا پێکەنی ((باشە، باشە کەواتە هەق لای من بوو کە بە ژنەکەی خۆم گوت تۆ شێتی، تۆ دەبێ جارجارە بێیتە دیداری منەوە کارێکی وابکەی کە کات بەسەربەرم، باشە ئیدی ئێستا بڕۆ، ماندووت کردم)) دەستەکانی لێکداو دوو نێرە زەبەلاحی رەش هاتنە ژوورەوەو کریستیان بردە دەرەوە,

- یەهودا لە دەرەوەی قەسردا لە چاوەڕوانی دابوو، ئاگای لە خۆ نەمابوو، لەم دواییانەدا، خورشتێکی پەنهانی کەوتبووە گیانی ئوستادەوەو ئەوی دەخوارد هەموو رۆژێ چینەکانی رووخساری وردترو زرتر دەبوو، قسەکانی غەمگینترو ترسناکتر دەبوو، هەموو جارێ دەچووە- گەلگەتا- ئەو گردۆلکەیەی کە دەکەوێتە دەرەوەی ئورشەلیمو رۆمیەکان گیانبازانیان لەوێ لەخاچدەدا، دەڕۆیشتو تاكو تەنها چەندین سەعات لەوێ دادەنیشت، بە ئەندازەی دیتنی کاهینەکانو کاهینە گەورەکان لەدەوری خۆی تووڕە دەبوو، گۆڕی خۆی هەڵدەکەند، بەهەمان رێژە، بەڵکو زیاتر هێرشی دەکردنە سەرو خوتبەی بۆ مارە ژەهراویو درۆزنەکان دەدا، هەموو رۆژێ لەبەیانییەوە تا سپێدە لە دەرەوەی پەرستگا دەوەستا قسەی توندی دەخستە بەر زمان وەك بڵێی



بەدوای مەرگی خۆیدا دەگەڕا، رۆژێکیان کە یەهودا لێی پرسی کە چ کاتێ جلی بەرخ لە خۆی دادەکەلێنێ تا شێر بە تەواویو گەورەییو جەبەرووتی خۆیەوە دەرکەوێت؟

- کریست سەری راتەکاندو بزەیێکی کرد کە یەهودا هیچ کاتێ لە عومری خۆی بزەیێکی واناهەمواری بەسەر لێوەکانی هیچ مرۆڤێ نەبینی بوو، لەو زەمانەوە بەدوا یەهودا لەو بەدوور نەکەوتبۆوە، هەتا لەو کاتانەی کە دەچووە گەلگەتا، یەهودا بەدزیەوە بەدوای ئەودا دەچوو تا نەبادا دوژمنێ کەمینێکی لێ دانابێتەوەو ئارەزووی گیانی ئەو بکاتو بیکوژێت.

- یەهودا لە دەرەوەی تەلاری نەفرەتی بۆ سەرەوەو خوارەوە دەچوو، بە رقو کینەوە دەیڕوانیە پاسەوانە بێ جولەکانی رۆمی کەبەچەکی مسینو رووخساری گرژیانەوە بوون، هەروەها دەیڕوانیە ئەو ئالآیە کوفرەی بازنیشان کە لە پشتی ئەوانەوە لەبەرزایی بەیرەقێکی بەرزەوە دەشەکایەوە. لەخۆی پرسی ((پیلات چ کارێکی بەو هەبوو؟ بۆ بانگی کردووە؟)) گیانبازانی ئورشەلیم یەهودایان ئاگادارکردبۆوە سەبارەت بەم بابەتەوە، کە حنناو کیافا هەمیشە لەهاتوچۆی تەلار بوون کریستیان بەوە تاوانبار دەکرد کە خەریکی شۆڕشێکە بۆ دەرکردنی رۆمیەکان تا خۆی ببێتە پادشا. بەڵام پیلات قبوڵی نەدەکردو دەیگوت ((ئەو شێتێکی تەواو عەیارە دەست دەخاتە کاری رۆمیەکانەوە)).

- من جارێکیان بەتایبەت خەڵکم نارد تا لێی بپرسن کە ئایا خودای سراییل داوا لە ئێمە دەکات کە سەرانە بدەینە رۆمیەکان، ئەلهەق وەڵامی دایەوە ((کاری قەیسەر بۆ قەیسەرو کاری خودا بسپێرە دەست خوداوە)) ئەوکاتە پیلات لە خەندە بەردەوام بوو گوتی ((ئەو بەدیوانەیی مرۆڤێکی پیرۆز نییە، خۆپیرۆز نواندن شێتی کردووە، ئەگەر دەخالەت لە ئایینی ئێوە دەکات، سزای بدەن، من دەخالەت لەو کارە ناکەم، ئەو لەکاری من دەخالەت ناکات)) قسەی پیلات بۆ ئەوان هەمیشە ئەوە بووە، بەڵام ئێستا نەکا باوەڕی خۆی گۆڕی بێت.

- یەهود وەستاو پشتی بەدیواری بەرابەر تەلارداو بەحاڵەتێکی تووڕە، مشتی خۆی کردە گرێو دووبارەی کردەوە، چوار نەفەر لەخزمەتچییانی پەرستگا هاتن، تەختێکی

ڕەوانی رازاوە بەزێریان لەبەر دەرگای تەلار بەئارامی لەسەر زەوی دانا، پەردەی ئاوریشمینی بەرکەنار بوو کیافا لە جلێکی ئاوریشمینی ئاوزێڕکراودا لەسەرخۆ پێی نایە سەر زەوی، ئەوەندە قەڵەو بوو کە بەزی دەوروبەری چاوانی لەلیکاو دەچوو، دەرگای دوودەری سەنگینی تەلاردروست لەهەمان ساتێ کە کریست دەهاتە دەرەوە کرایەوەو هەردوو نەفەر لە ئاستانەی دەرگادا رووبەڕوی یەکتربوونەوە، کریست لە جێوە وەستا بەپێی پەتیو کراسی سپی پڕ لە پینەیەوە بەبێ بزاوتێکی تەواوەوە چاوی لە چاوی کاهینی گەورەنا، کاهین پێڵوە سەنگینەکانی بۆ سەرەوە بردو ئەوی ناسیەوەو بەسەری کردەوە، لێوە بەز ئاساکانی لێك کردەوە: ((ئەی یاخی لێرە چیت دەوێ؟))، بەڵام کریست هێشتان بێ جولەو بەچاوانی درشتو بەئازارێکەوە لەوی روانیو وەڵامی دایەوە.

- ((ئەی کاهینی گەورەی هەرماسی من ترسم لە تۆ نییە))

- کیافا هاواری کردە سەر کەژاوەدارەکانی ((فڕێی دەنە دەرەوە)) خۆشی بۆ ناو حەوشە کەوتەڕێ: مەیموون رووخسارێکی قەڵەوو پێ چەماوە لەژێر قەڵەوێتی خۆیەوە باری سەر زەوی بوو.

- خزمەتکاران کریستیان لەناو میانەدا گرت، بەڵام یەهودا تاوی دایە پێشەوەو هاواری کرد ((دەستتان بەرز کەنەوە!)) لەکاتێکا ئەوانی وەلاوەنا دەستی کریستی گرت ((یاڵڵا دەبێ قوتاربین))

- یەهودا خۆی بەنێو وشترو خەڵكو بزن دادەدا بۆ پەڕاندنەوەی کریست رێگەی دەکردەوە، ئەوان لەژێر دەروازەی بارداری شاردا رابردنو بەدابەزین بۆ دۆڵی- کەدرون- سەر هەڵگەڕان بۆ لای بەرامبەر، رێی بیث ئنیایان گرتەبەر.

- یەهودا لەکاتێکا قۆڵی ئوستادی دەکوشی پرسی ((چکاری بەتۆ بوو))

- کریست دوای بێدەنگییێکی قووڵ وەڵامی دایەوە ((یەهودا دەمەوێ رازێکی ترسناك لەگەڵ باس بکەم)).

- یەهودای سەری قژ سووری خۆی لارکردەوەو بە دەمو گوێی کراوە وەستا.



- تۆ بەهێزترین تاکی نێوان یاوەرانی، وا خەیاڵ دەکەم تەنها تۆ دەتوانی ئەوە ببیستی لەبارەی ئەم بابەتەوە، شتێکم بەوانی دیکە نەوتووەو پێشیان، ناڵێم چونکە بەرگەی بیستنی ناگرن.

- یەهودا لە خۆشحاڵیان سوور هەڵگەڕاو گوتی ((مەولای من بەو متمانەیەی بەمنت کردووە سوپاسگوزارم، بڵێو دڵنیابە کە پەشیمان نابیتەوە)). یەهودا دەزانی بۆ جەلیلی خۆشەویستم جێهێشتو هاتووم بۆ سراییل؟

- یەهودا وەڵامی دایەوە: ((بەڵێ چونکە لەهەمانجێ یە ئەوەی کە دەبێ روبدا روودەدات)).

- تەواو دروستە، مەشخەڵەکانی خوداوەند لێرە دەست پێدەکەن، ئیدی خەو لەمن، رفێنراوە، نیوەشەوان لەخەو رادەپەڕمو سەیری ئاسمان دەکەم، تا ببینم کە هێشتا نەکراوەتەوەو مەشخەڵەکان دانابەزن بەهەلاتنی سپێدە دەمان پەلە دەکەم بەگوفتار هەڕەشە لە ئاسمان هێما دەکەمو بە فەرمانو پاڕانەوە داوای ئاگر دەکەم بێتە خوارەوە، بەڵام دەنگم هەمیشە ون دەبێ، ئاسمان لەبەرزایی سەرمەوە داخراوە، بەخامۆشیو ئارامەوە دەمێنێتەوە، ئەوکاتە لەپڕێکا رۆژی... دەنگی شکستی خوارد، یەهودا گوێی بردە نزیك دەمیەوە تا ببیستێ بەڵام تەنیا توانی گوێی لە هەناسەی بڕاوو بەیەك کەوتنی ددانی ببێ، بەهەناسە بڕکێوە گوتی ((بەردەوام بە... بەردەوام بە... کریست هەناسەی تازەکردەوەو بەردەوام بوو ((ڕۆژی لەکاتێکا تەنهاو تەنها بەسەر گەلگەتاو راکشابووم، نەبێ ئەشعیا لەزەینمدا نەخشی بەستا، کەشێوەی تەواوی ئەو لەبەرامبەر دیدەکانمدا بەسەر بەردەکانی گەلگەتاوە بەدیارکەوت، پێستە بزنێکی باکردووی لەدەست دابوو، دروست لە هەمان ئەو نێرە بزنە دەچوو کە لەبیاباندا بینی بووم، بەسەر پێستەوە چەند وشەیێ نووسرابوو، لەکاتێکا پێستی بزنی لەبەرچاوەکانم داگرتبوو فەرمانداندەرانە گوتی ((بخوێنەوە))، بەڵام تا ئەو دەنگەم بیست پەیامبەرو بزنەکە ون بوون تەنها وشە لە فەزا مایەوە، کە پیتێکی درشتو رەشو قورمزی بوو، کریست سەری بۆلای نوورەکە هەڵگرتو رەنگی پەڕی بوو، قۆڵی یەهودای گرتو

کوشیو خۆی بەوەوە هەڵواسی، ترساو زەمزەمەی کرد ((ها ئەوەتانێ فەزایان پڕکردووە. یەهودا کە دەلەرزی گوتی ((بخوێنەوە))

***

کریست بەهەناسەبڕکێوە دەستی کرد بە هجی کردنی وشەکان

پیتی وشەکان لە جانەوەری زیندوو دەچوون کە ئەو بەدوایان کەوتبوو ئەوانیش بەرگرییان دەکرد، لەکاتێکا دەم نا دەم ئارەقەی رووخساری خۆی دەسڕیەوە بانگی کرد ((ئەو گوناهەکانی ئێمەی گرتۆتە گەردەنی خۆیەوە، لەبەرخاتری هەڵخزینی ئێمە بریندرابوو بەهۆی گوناهەکانی ئێمەوە کوتراوە.. ئەو موبتەلابووە، بەڵام دەمی خۆی نەکردەوە، تەکفیر کراوەو رادراوە، وەك چۆن بەرخێ کە بۆ سەربڕین دەبردرێ، بەبێ بەرگری بۆ پێشەوە دەچوو،))

کریست دیسان لەقسەی خۆی وەستا، رەنگی وەکو مردوو سپی بوو بوو، یەهودا کە بەئارامی وەستابوو بە ئەنگوستی گەورەی پێی تلیشە بەردەکانی لێکدەداو گوتی ((من تێناگەم ئەو بەرخەی کە بۆ سەربڕین دەبردرێ کێیە؟ چ کەسێ بۆ قوربانگا دەچێت؟))

کریست وەڵامی دایەوەو گوتی ((برام یەهودا من دەبردرێمە قوربانگا!)) یەهودا کە پاشەکشەی دەکرد گوتی ((تۆ؟ بەم جۆرە تۆ کریستیانو نیت؟))

- بۆ؟ هەوم.

- یەهودا دووبارە گوتی ((من تێناگەم)) ئەنگوستی پێی خۆی بەتلیشە بەرد بریندارکرد.

- یەهودا هاوارمەکە، رێگای ئەوەیە، بۆ ئەوەی دونیا رزگاربێ من بەمەیلو رەزای خۆم دەبێ بمرم سەرەتا خۆشم تێنەگەیشتم، هەموو ئەو نیشانانەی کە خوداوەند دەینارد، بێهودە دەڕۆیی، هەموو ئەو نیشانانە، جارێ بەوێنەی خەونێ لەهەوا جارێ بەوێنەی خەو یا بەوێنەی جەستەی ئەو بزنە لە بیابان کە گوناهی تەواوی خەڵکی



بەگەردەن بوو، لەو رۆژەوەی کە ماڵی دایکم جێهێشتووە، سێبەرێکی وەك سەگ کەوتۆتە دوامەوە جارجار دەکەوتە پێشەوە تا رێم پیشان بدا ئەو رێگایە چییە- خاچ!

کریست نیگاییێکی لەڕووی تێڕامانەوە کردە دەوروبەر، کەواتە دوای ئەو ئورشەلیم بوو، کێوێ بە چەند گومەزێکی سپی درەوشاوەو لەپێش روویا بەردو تاكو توکی درەختی زەیتونی گەڵا نوقرەییو سەرونیازی رەش.

خۆرەتاوی پڕخوێن لە ئاوابووندا بوو، یەهودا ریشی ردێنی خۆی هەڵکەند دووری فڕێدەدا، چاوەڕوانی کریستیانوی دیکەبوو، کریستیانویێ بەخۆیو شمشێرەوە کە بە هاواری ئەو مردووەکانی دۆڵی- یەهو شافات- بێنە دەرەوەو پەیوەندی بەزیندووان بکەن، بەهاتنەدەرەوەی مردووان لەگۆڕ ئەسپو وشتری قەومی یەهود ئەوانیش زیندوو ببنەوە، پیادەو سوارە هەموو بەیەکەوە بۆ کوشتاری رۆم هێرش ببەن، کریستیانو بەسەر تەختی پاشایی داود دانیشێ جیهان لەژێر نقێمی دابێت، ئەو کریستیانویێ بوو کە یەهودا ئەسخەریوتی چاوەڕوانی کردبوو...و ئێستا بەدڕەندەخویی سەیری کریستی دەکردو لێوەکانی خۆی گەستنەوە تا قسەیێکی ناشیرین لەدەمی نەیەتە دەرەوە دووبارە دەستی کرد بە لێکدانی تلیشە بەردەکان، بەڵام ئەمجارە بەئەژنۆکانی کریست ئاگاداربۆوە، دڵی پێ سووتا، لەکاتێکا شێوەی قسەکردنی خۆی شیرین کرد گوتی ((برام یەهودا ئازابە، هیچ رێگاییێکی دیکە نییە.. رێ هەر ئەوەیە))

- یەهودا کە چاوی بڕیبووە تاوێرەکانەوە گوتی ((دوای ئەمە؟))

- بەتەواوی شکۆو گەورەیی خۆم دەگەڕێمەوە تا بۆ دادوەریکردنی مردوو زیندووان دانیشم.

- کەی؟

- زۆرانێ لە ئەندامانی نەوەی نوێ بۆ دیتنی من بەزیندوویی دەمێننەوە، یەهودا گوتی ((یاڵڵا با بڕۆین)) هەنگاوەکانی توند کرد، کریست لەدوای ئەوەوە بەهەناسەبڕکێوە دەڕۆیشتو هەوڵیدەدا پێ بەپێی ئەو بڕوات، عاقیبەت خۆرەتاو لەدابەزیندا کەوتە پشت کێوەکانی یەهودیە. لە ئەوان دەوراندا لەدەریاری مردوودا

دەنگی چەقەلە تازە بێدارەکان دەبیسترا، یەهودا بەخەشم و خرۆشەوە بۆ پێشەوە گلۆردەبۆوە، لەناخیا زەلزەلەیێ بەرپابووبوو، هەموو شتێکی وێران دەکرد، ئیلیازر هەڵسابۆوە جیلیوەییێکی مردووتر و پۆخڵتر لەخودی مردووانی هەبوو، مرۆڤی تووشی هێڵنج دەکردو خودی کریستیانو چۆن دەیتوانی لەم جەنگەدا دەگەڵ سراییل بێتە کەنارەوە؟

نا، نا، یەهودا ئەو وەك ڕێبازێك باوەڕی بەمەرگ نەبوو، گەڕایەوە، دەیویست پەلپ بگریێ و چەند وشەییێکی گازاندە بدرکێنێ کە بە سەر زمانیەوە لە حاڵەتی سوتان دابوو، ڕەنگە ئەم وشانە، کریست ناچار بەگۆڕینی ڕێگا بکات و سەرفی نەزەر بکات لە ڕۆیشتن بەرەو مەرگ، بەلاّم لەکاتێکا دەگەڕایەوە، هاوارێکی پڕ لە وەحشەتی سەردا سێبەرێکی گەورە لەجەستەی کریست کەوتە سەرزەویەوە، ئەم سێبەرە، سێبەری مەرگ نەبوو، بەڵکو سێبەری خاچێکی گەورە بوو، دەستی کریستی گرت و لەکاتێکا هێمای دەکرد گوتی ((سەیرکە)) کریست لەبەرخۆ لەرزی ((بێدەنگ بە، برام یەهودا شتێ مەلێ)) بەمجۆرە ئەوان بازوو بە بازووی یەکتری لەسەرخۆ لەو گردۆلکەیەی کە بە (بیث ئنیا)دا کۆتایی دەهات سەرهەڵگەڕان، ئەژنۆکانی کریست چەمایەوەو یەهودا بەرزی کردەوە، ئەوان قسەیان نەدەکرد، یەکسەر کریست لاربۆوە، بەردێکی گەرمی لەسەر زەوی هەڵگرت بۆ ماوەییێك توند گرتیە ناو دەستەکانی، ئایا ئەوە بەردێ بوو یا دەستی مرۆڤێکی ئازیز؟ سەیری دەوروبەری کرد، واه، لەتەواوی خاکی مردووی زستاندا ئێستا کە سەوزایی هاتۆتە دەرەوەو بۆتە گوڵ...!

- برام یەهودا خەمگین مەبە، سەیرکە چۆن گەنم دەڕوێ، چۆن خوداوەند باران دەنێریێ و زەوی زگی پڕدەبیێ و گوڵەگەنم سەر لەخاك دەردێنن تا ببێتە مایەی هێزو بڕستی مرۆڤ، ئەگەر دەنکە گەنم نەمرێ یا هێشووەکانی زیندوو دەبوونەوە؟ هەمان بابەت دەربارەی کوڕی ئینسان ڕاست دەردەچێ.

بەلاّم یەهودا دانەدەسەکناو بێ ئەوەی قسەیێ بکات، بەردەوامی دەدا بەسەر هەڵگەڕان بەسەر گردۆلکەوە, خۆرەتاو چووە پشت کێوەکانەوە، شەو بەسەر خاکەوە هەڵسایەوە، لەبەرزایی گردۆلکەوە، جریوەجریوی یەکەمین مەشخەڵ بەرچاو دەکەوت.



کریست گوتی ((ئیلیازر وەبیرخۆت بهێنەوە)). بەلاّم یەهود دووچاری هێڵنج بوو بەپەلە لەحاڵێکا کە تفی ڕوودەکرد بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن.

***

مارتا مەشخەڵی داگیرساند ئیلیازر دەستی دانایە سەر چاوەکانی، کە ڕووناهی هێشتاکە ئازاری دەدا، پەترۆس بازووی مەتی گرت و دووتایی لەژێر نووری مەشخەڵدا دانیشتن، سالومەی پیر بەستەیەك خوری ڕەشی پەیداکردو ڕستیێ و بیری لە کوڕەکانی دەکردەوە، ئاخ خودای من یانی ڕۆژێکی وادێ کە ئەوان لەشکۆو گەورەیی خۆیان، بەنەوارێکی زێڕ بەسەرو ماڵێکی بێ لە باتی دەریاچەی گنسارت ببینن؟

مەجدەلیە ڕێی جادەی گرتەبەر، ئوستاد دواکەوتبوو، ڕەنج و ئازاری وا گەورە بووبوو کە ئیدی روحی ئەو لە ماڵدا جێی نەدەبۆوە، چووبۆوە لای جادە بەو ئومێدەی کە دیداری مەعبودی خۆی بکات، یاوەران لەحەوشەدا دەستەوئەژنۆ دانیشتبوون، بەتیلەی چاو سەیری دەرگایان دەکردو چیان نەدەگوت، تووڕەیی هێشتا لەدەروونیاندا دەکولاّ، تەواوی ماڵێ سوتو کوێر بوو دەنگی هەناسەشی لێنەدەهات، پەترۆس ئەو ڕۆژانەی هێنابۆوە سەر کە ئارەزووی زانستی ئەو شتانە بوو کە باجگر لە دەفتەریا دەینووسی، ئیستاکێ ساتێکی لەبار گەیشتووبوو، دوای ململانێ لەگەڵ ئەوانی دیکە، ئیدی نەیتوانی چیتر تاقەتی هەبێ، دەبا تێبگات کە مەتی دەربارەی ئەو چی دەڵێت، ئەو میرزایانە مرۆڤی بێ شەرم بوون لەبەر ئەمە پەترۆس دەبوایە ئاگاداربووایە کە نەبێتە پەنجەنومای نەوەکانی ئایندە، مەگەر مەتی زاتی دەکرد کارێکی وابکات؟ هەموو شتێکی لەدەستی ئەودا دەگرت دەیخستە ناو ئاگرەوە، بەڵێ هەمان ئەمشەو دەبێ بزانێ، .... بە چاپلوسی بازووی باجگری گرت و دوو نەفەری لەژێر نووری مەشخەڵدا دانیشتن.

– مەتی لووتف بکە بۆم بخوێنەوە، ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە دەمەوێ بزانم دەربارەی ئوستاد چی دەنووسی؟

- مەتی بەبیستنی ئەو قسەیە شادومان بوون لەسەرخۆ دەفتەرەکەی دەرهێنا، جێگەی دەفتەرەکەی بەسەر دڵیەوەبوو، لەچەفیەیێکی چنراوەوە دەیپێچایەوە کە لەلایەن مێریۆی خوشکی ئیلیازر کرابووە دیاری بۆ ئەو، ئێستاکی بەدیقەتەوە لە وەرپێچەکەی دەرهێنااو وەك بلێی بوونەوەرێکی زیندووی زامداربوو، دەیکردەوە، لەکاتێکا بە دیقەت لەشی خۆی بۆ پێشو پاش دەبرد، بەئاوازێ کە تێکەڵ بەخوێندنەوەو سروود بوو دەستی پێکرد:

- کتێبی درەختنامەی کریستی کوڕی داودی کوڕی ئیبراهیم ئیسحاقی هێنابەرو ئیسحاق یاکوبو یاکوبیش یەهوداو براکانی، یەهوداش فارصو زارحی هێنابەر پەترۆس چاوانی داخستبوو گوێی قولاغ کردبوو! تەواوی نەوەکانی یەهود لەبەر چاوەکانیدا دەهاتنە ژووروە، لە ئیبراهیمەوە تا داود چواردە نەوە، لەداودەوە تا ئەسارەتی بابل چوارد ەنەوە، لەئەسارەتی بابلەوە تا کریست چواردە نەسل.

.........چ نەتەوەییێ، چ سوپایەکی بێ شومارو جاویدانە! یەهودی بوون چ لەززەتێکی فیزخولقێنەرە! پەترۆس سەری بەدیوار دابوو، گوێی راگرت، چەندین نەوەی یەك لەدوای یەك دەهاتنە پێشو دەگەیشتنە کریستەوە پەترۆس گوێی دەدایێ، چ پەرجوویێکی زۆر لە یادی ئەودا روویدابوو، پرتەوێ لەو پەرجووانە بەسەر ئەودا هەلاتبوو! باشە، کریست لە (بیث لەحم) لەدایك بووەو باوکی یوسفی نەجاڕ نەبوو بەڵکو رۆحی پیرۆز بوو سرمۆغ هایتون ئەویان دەپەرست، بەڕاستی لەکاتی ئاوەمۆرکردنی ئەودا ئەو وشانە چ بوو کە لەئاسمان بەهۆی کۆترەوە هەڵدەڕژا؟ پەترۆس ئیدی قسەی نەدەبیست، باشە چ کەسێ ئەم قسانەی بە مەتی گوتوە کە ئەسڵەن لەوێ نەبوو؟ پەترۆس وشەکانی نەدەبیست تەنها مۆسیقای یەك نەواو خەمگین لەگوێچکەیدا لایلایەی دەچڕی.

هەر قسەیێ لەبەرچاوی ئەودا وەکو هەنار وابوو، وەکو هەمان ئەو هەنارانەی کە ساڵی پێشوو لە ئەریحادا خواردبووی، هەنارەکان لە فەزادا شەقیان دەبردو لەمیانی ئەوان جارێ وەکو مەشخەڵو زەمانێکیش وەکو فریشتە بەباڵو شەپیورەوە دەهاتن.



لەپڕێکا لەمیانی خەودا خواردنەوەی چەند هاوارێکی شادی ئەنگیزی هاتە بەر گوێ لەخەو رابوو، لەبەرەوڕووی خۆیدا مەتێی بینی کە دەفتەری بەسەر ئەژنۆوە بوو هێشتاکە هەر دەیخوێندەوە، وەبیری هاتەوە، لەبەر ئەوەی چووبووە خەوەوە هەستی بەشەرم کرد، مەتی لەباوەشی کردو لێوەکانی ماچکرد.

- برام مەتی دەبووری، بەڵام لەهەمان کاتدا کە گوێم راگرتبوو چوومە بەهەشت، کریست لە لای دەرگادا بەدیارکەوتو مەجدەلیە بەدوای ئەوەوە، رووخساری مەجدەلیە لەشادیان بریقەی دەدایەوە، لە لێوو چاوو گەردەنی رووتیدا مەشخەڵ دەهاتە دەرەوە، کریست بەدیتنی پەترۆس کە مەتی لەباوەش گرتووە ئەوی ماچکرد، پۆتەلاکی کرایەوە، بەهێما بەوانی گوت ((مەلەکوتی ئاسمان ئەوەیە ئەوکاتە نزیك ئیلیازر کەوتەوە کە خەریك بوو بەرزبێتەوە، بانگی کوڕەکانی پشتی ئیلیازری کردو نیگەرانی ئەوە بوو کە نەباد بشکێن، دووبارە دانیشتەوە، دەستی خۆی درێژکردو بەنووکی پەنجەکانی خۆی دەستی لەدەستی کریستدا، کریست لەرزی، دەستی ئیلیازر لەڕادەبەدەر ساردبوو بۆنی خاکی لێدەهات.

کریست لەژووره هاتە دەرەوە، دووبارە چووە حەوشەوە تا هەناسە هەڵکێشێ، لەمیانی مەرگو ژیاندا لنگی دەکوتا، هێشتا خوداوەند توانای ئەوەی نەبوو کە بەسەر رزینی دەروونی ئەودا سەرکەوێت، هیچ کات مەرگ قودرەتی حەقیقی خۆی وەك چۆن لەو پیاوەی پیشاندەدا وەدیارنەخستبوو، کریست ترسو خەمێکی زۆر دایگرت.

سالومەی پیر بەتەشیو خوری ژێر هەنگڵی لێی نزیك بۆوەو بەسەر پەنجەی پێیا وەستا تا بەدزی شتێ بەکریست بڵێ ((مەولای من))

کریست بۆ بیستنی قسەکانی ئەو لاربۆوە ((بڵێ سالومە))

- مەولای من، کە بۆئاسمان دەڕۆی، تکاییێکم لەتۆیە، خۆ دیتت کە ئێمە بۆ تۆ چیمان کرد.

دڵی کریست لەناکاو تێکپەسترایەوە ((قسەبکە، سالومە)) لەخۆت پرسیوە ((چ کاتێ مرۆڤەکان پەی بەم خاڵە دەبەن کە کرداری باش تا ئاستی پاداشت دانابەزێ))

– ڕۆڵەم، ئێستا کە مەبەستی ئەوەت هەیە لە سەر تەختی خۆت دانیشی کوڕەکانم یاکوب‌و یۆحەننا لەدەستی چەپ‌و راستی خۆت دانێ.

کریست لەکاتێکا لێوەکانی خۆی دەگەستەوە تا قسەیێ نەخاتە سەر زمان، چاوی بڕیە زەویەوە.

– بیستت رۆڵەم؟ یۆحەننا

کریست هەنگاوێکی بەرزی هەڵێناو چووە ژوورەوە، مەتی بینی کە هێشتا دەفتەری کراوەی بەسەر ئەژنۆکانی خۆی راگرتووە، چاوەکانی داخستبوو هێشتا غەرقی ئەو وشانە بووبوو کە خوێندبوویەوە.

کریست گوتی ((مەتی دەفتەرت بهێنە ئێرەوە، چی دەنووسی؟ مەتی هەڵسایەوەو نووسینەکەی سپاردە دەستی کریستەوە، زۆر شادومان بوو گوتی ((مەولای من لێرە زیندەگی‌و کرداری تۆم بۆ نەوەکانی ئایندە نووسیوەتەوە)).

کریست لەژێر نووری مەشخەڵدا دانیشت‌و کەوتە خوێندنەوە، لەهەمان وشەکانی سەرەتادا راجفری، بەزبریەوە دەستی بە وەرگێڕانی کاغەزکردو بەپەلە خوێندیەوە رووخساری سووربۆوەو تووڕەبوو.

مەتی لەبینینی بزاوت‌و رووخساری ئەو بەترس‌و لەرزەوە خزیە سوچێکەوە، لەچاوەڕوانیدا مایەوە، کریست دوای ئەوەی چاوێکی خێرای بەدەفتەرەکەدا گێڕا نەیتوانی خۆی راگرێ، هەڵسایەوەو بەخەشم‌و نەفرەتەوە ئینجیلی مەتی هاویشتە سەرزەوی، هاواری کرد، ((هەموو ئەوانە درۆیە، کریستیانو پێویستی بە پەرجوو نییە، بوونی خۆی پەرجووە، پێویست بەپەرجووێکی دیکە نییە من لە ناصیرە لەدایك بووم، نەك بیت لەحم، هەرگیز پێم نەچۆتە- بیت لەحم هیچ موغێکم لەبیر نییەو هیچ کات لەژیانمدا پێم نەناوەتە خاکی میسرەوە ئەوەی کە لە کاتی ئاوەمۆرکردنی من دەربارەی گوفتاری کۆترەکەوە نووسیوتە.



– ئەو کوڕی خۆشەویستی منە ((کێ ئەوەی بەتۆ گوتووە. من خۆم کە بە ڕۆشنی نەمبیست، تۆ کە لەوێ نەبووی چۆن پەییت بەم کارە بردووە؟)) مەتی بەترس‌و لەرزەوە وەڵامی دایەوە ((فریشتە بۆ منی ئاشکرا کرد))

– فریشتە! کام فریشتە؟

– هەمان ئەو فریشتەیەی کە هەر شەوی قەڵەم دەگرمە دەست دێت، سەر لەبن گوێم دەنێ، مەشقم پێدەکا.

کریست بەشڵەژانەوە گوتی ((فریشتەیێ؟ فریشتە سەرمەشقت بۆ دەنووسێ تۆش دەنووسی؟)) مەتی زاتی دا بەر خۆی‌و گوتی ((بەڵێ فریشتەیێ، هەندێ جار هەتا دەشیبینم هەمیشە دەنگی دەگاتە گوێم، لێوەکانی بەگوێی راستم دەکەوێ، هەست دەکەم پەڕوباڵی بەدەوری مندا وەرپێچاوە، من لەکاتێکا وەك ساوایێ لەناو پەڕوباڵی فریشتەدا پێچراومەتەوە، دەنووسم، هەرچیەك دەڵێم ئەوەیە کە ئەو دەیڵێ، دەینووسمەوە، کەواتە تۆ وات خەیاڵ کردووە کە دەتوانم ئەم هەموو پەرجوویە بەتەنها بنووسمەوە))

کریست دووبارە بەبنی لێویەوە گوتی (فریشتەیێ؟)) لەدەریای ئاشکراکردندا غەرق بوو، بیث لەحم، موغان، میسر ((کوڕی خۆشەویستی من)) ئەگەر ئەوانە راستیترین راستی بن.. ئەگەر ئەوە بەرزترین ئاستی راستی بێ کە تەنها لە قەڵەمڕەوی خودادایە... ئەگەر ئەوەی کە ئێمە ناوی دەنێین حەقیقەت، خودا بەدرۆ بانگەشەی بکات..؟!

کریست لێوی بەقسە کەوتەوە، لاربۆوەو بەدیقەت تەواوی نووسینەکانی کە بەسەر زەویدا پەرش‌و بڵاوی کردبۆوە کۆکردەوەو دای بە مەتی، مەتی دووبارە ئەوانی لە چەفیە چنراوەکە پێچایەوەو نایە ژێر کراسیەوە کریست گوتی ((هەرچییەك فریشتە سەرمەشقت پێدەدا بینووسەوە، بۆمن ئیدی درەنگە)). بەڵام گوفتاری خۆی تەواو نەکرد لەهەمان کاتدا یاوەرانی یەهودیا وەك نقێمی ئەنگوستیلە گرتەخۆو لە بارەوەی گفتوگۆی (پیلات)و ئوستادی خۆیان پرسیاریان کرد، بەڵام یەهودا بێ ئەوەی نیگاهێ

بکاته ئەوان خۆی لە ئەڵقەی ئابلۆقەدراو دەرکێشاو چووە دەمی دەرگاوە، لەبەر بچمو دەنگیان حاڵو وەزعی تێکچوو، ئێستا دەیتوانی بەتەنها قسە لەگەڵ ئوستاد بکات، رازێکی وەحشەتناك ئەو دووەی بەیەکەوە پەیوەنددداوەو لەوانی دیکەی جیاکردونەتەوە، یەهودا سەیری رووخساری ئەوی کرد کە چۆن جیهان ئەوی لەکامی خۆیدا بردۆتە خوارەوە، سەیری یەکەمین ئەستێرەی بەربالاًی سەری کرد کە وەك قەندیلۆکەیەك جریوە جریوی بوو بەبنی لێویەوە گوتی: ((پەروەردگاری سراییل کۆمەگم بکە دەنا شێت دەبم)) مەجدەلیە دووچاری شڵەژان هات، چوو لە کەناری ئەودا وەستا یەهودا ویستی بچێتە دەرەوە، بەلاًم مەجدەلیە خۆی بەدامەنی جلی ئەودا چەسپاند.

– یەهودا دەتوانی بەبێ ترس رازت بۆ من ئاشکراکەی، تۆ من دەناسی

– کام راز؟ پیلات ئەوی بانگ کردبوو تا بلێت ئاگات لەخۆت بی ... کیافا..

– ئەوە نالیێم، رازێکی دیکە.

– کام رازی دیکە، مەجدەلیە دووبارە ئاگرت کەوتۆتە گیانەوە، چاوەکانت لەدوو رەژووی داگیرساو دەچێت، بگری، فرمیسکەکانت خامۆشیان دەکاتەوە.

بەلاًم مەجدەلیە ددانی لە چەفیەی خۆی بردە خوارەوەو پارەی کرد، بەزەمزەمە کردنەوە: ((بۆ دەبێ تۆ هەڵبژێری، تۆ یەهودای ئەسخەریوتی؟))

ریش سوور تووڕەبوو، بازووی مەجدەلیەی گوشیو گوتی ((مێرێی مەجدەلی ئەی چاوەڕێت دەکرد کێ هەڵبژێری! ئەو پەترۆسە ئاشەوانە یا ئەو یۆحەننا گەمژەڵە؟ نەکا چاوەڕوانی ئەوەت کردبێ تۆی ژنیژگە هەڵبژێرێ من دەبینی کە لەبەردی چەخماخی بیابان رسکاوم، لە بەرابەر هەر ناجۆریەکدا دەوەستم، هەر لەبەر ئەمەبوو کە منی هەڵبژارد)).

چاوانی مەجدەلیە پڕ لە فرمێسك بوو زەمزەمەی کرد ((هەق بە تۆیە، من ژنێکم، بوونەوەرێکی نەخۆشو زامار)). پاشان چووە ژوورەوەو لەکەنار ئاگردا هەڵکورما...



مارتا سفرەی نانی ئێوارەی ئامادە کرد، یاوەرانی لەحەوشەوە هاتنو بەسەر سفرەوە دانیشتن- ئیلیازر، بەهەڵقوڕاندنی چەلاو هێزی وەبەر هاتبۆوە سەیری ناوحەوشەی دەکرد، لەشی شەقارشەقار بووی هێدی هێدی بەهەواو نوورو خۆراك یەکتریان دەگرتەوەو بڕستیان وەبەردەهاتەوە.

دەرگای ژوور کرایەوەو خاخامی پیر بەڕەنگی پەڕیوو سێبەراوی وەك چۆن تارماییێ بەدیارکەوت، بەتوندی خۆی دایە سەر گۆچانەکەی، چونکە ئەژنۆکانی هێزی راکێشانی باری لەشی ئەویان نەبوو، هەرکە کریستی بینی بەهێما تێیگەیاند کە قسەی لەگەڵ ئەو هەیە، کریست هەڵسایەوە.. دەستی پیرەمێردی گرتو داینیشاندە سەر زەوی، ئەوکاتە خۆی لەتەك ئیلیازر دانیشتو گوتی ((باوکە منیش دەمەوێ قسە لەگەڵ تۆ بکەم)) خاخامی پیر بەنیگاییێکی جمك بەقەهرو لووتف گوتی ((کوڕم گلەییم لەتۆ هەیە، لەبەر چاوی هەمووان دەیگێڕمەوە، لێگەڕێ هەموو ژنو پیاوەکان ببیستنو ئیلیازریش کە لە گۆڕدا هاتۆتە دەرەوەو دانای نهێنییێکی زۆرە لێگەڕێ هەموو بابیبیستن)).

کریست وەلاًمی دایەوە ((مرۆڤەکان چی دەڵێن؟ لەمەتی بپرسە فریشتەیێ لە ناو ئەمماڵەدا هەڵدەفڕێو گوێ رادەگرێ، لێگەرێ با ئەو فریشتەیە یاوەری بکات، باشە باوکە، ئازاری تۆ چییە؟))

– تۆ بۆ دەتەوێ رێبازی پیرۆز لەکارخەیت؟ دروست وەکو کوڕێ کە رێزی لە باوکی پیری خۆی دەگرێ، ئێمەش تا ئێستا رێزی ئەوانمان گرتووە، بەلاًم ئەمڕۆ لەبەرابەر پەرستگادا تۆ ئالاًی خۆت هەڵکردووە، نشینگەی ئەو یاخیبوونەی دەروونی دڵی تۆ لەکوێیە؟

– باوکە، عەشق، لەکەنار پێی خوداوە، ئا لەوێ دڵم پارێزەری خوێ دەدۆزیتەوەو ئارام دەگرێ.

– مەگەر ناتوانی لەگەڵ رێبازی پیرۆزدا تا ئەو رادەیە بچی؟ مەگەر نازانی کە کتێبە پیرۆزەکان دەڵێن. رێباز، نۆ سەدو چواردە نەوە بەر لەوەی کە خوداوەند جیهان

بخولقێنیێ نووسراوەتەوە، بەلاّم بەسەر پێستەوە کە لەو زەمانەدا ئاژەڵێ نەبوو تا سوود لە پێستی وەرگرن، نە بەسەر دارەوە، چونکە درەختێ نەبوو، نەبەسەر بەردەوە، چونکە بەردێ نەبوو، رێبار بەسەر بازووی چەپی خوداوەندا بەمەشخەڵێکی رەشی سەر ئاگری سپی نووسراوەتەوە، دیقەت بکە بەپێی هەمان ئەو رێبازە پیرۆزە بوو، کە خوداوەند جیهانی خوڵقاند.

(( کریست کەئیدی خۆی پێ نەگیرا هاواری کرد نا....نا....نا))

❊❊❊

خاخامی پیر بەمیهرەبانییەوە دەستی ئەوی گرت ((کوڕم بۆ وا هاوار دەکەی؟)) کریست هەستی بەشەرمەزاری کردو سوور هەڵگەڕا، رێشمەی رۆحی لە دەست چووبوو ئیدی نەیدەتوانی مەهاری کاتەوە، وەك بڵێی لەسەرەوە تا ژێر پێی بریندار بووە، بە چاوێکی چووکەلە لە تاو ئازار هاواری دەکرد.

ئەمجارەش هاواری کردبوو ئارامی گرتەوە، دەستی خاخامی پیری گرتو ئاوازی دەنگی خۆی نزم کردەوە ((باوکە، گەلاّکانی دڵی من کتێبی پیرۆزن، هەموو لاپەڕەکانی دڵم پارچە پارچە کردووەو فڕێم داوەتە دوور))، بەلاّم کە قسەی دەکرد، باوەڕی خۆی گۆڕی ((من نا، من نا، بەڵکو خوداوەندێ کە منی ناردووە، هەستی کرد هێزێکی ئاگرین و بەرگەنەگرتنی لە لەشی کریستدا دێتە دەرەوە، لەو کاتەی کە لەپەنجەرەی کراوەدا بایێکی توند لەهەڵکردندا بوو مەشخەڵی کوژاندەوە، خاخام کریستی بینی کە لەناو تاریکیدا، بەجیلوەو جەلالێکی ستوونی لەئاگر لە ناو حەوشەدا وەستاوە، سەیری راستو چەپی دەکرد تا، بەڵکو ئاگاداری ئامادەبوونی موساو ئەلیاس بێ، بەلاّم هیچ یەك لەم دووانەی نەدیت، کریست بەگەورەیی خۆی تەنهابوو سەری دەگەیشتە قسپی بنمیچەوەو لەنووری هەڵدەکێشا، دروست لەهەمان کاتدا خاخام لەکاری هاوارکردن بوو کریست قۆڵی خۆی کردەوە، ئێستاکێ ئەو بووبوو بەخاچێ بڵێسەی نێڵەی لێهەڵدەستا. مارتا هەڵسایەوە مەشخەڵی دووبارە داگیرساندەوە، هەموو شتێ گەڕایەوە سەر رەوشی جارانی، کریست هێشتا بەسەری لارو بەسەرسووڕمانەوە دانیشتبوو، خاخام سەیری دەوروبەری کرد، هیچ کەس لە تاریکی ئاگای لەشتێ



نەبووبوو، ئەوانی دیکە بە دەوری سفرەوە خۆیان ئامادەی خواردنی نانی ئێوارە دەکرد.

خاخام لەبەرخۆ گوتی ((خوداوەند منی گرتۆتە ناو دەستی خۆیەوەو یاریم پێدەکا)) حەقیقەت حەوت رەهەندی هەیە، لەلاییێکا ئیدی بۆ سەرەوەو خوارەوەم دەباتو دووچاری سەرگێژیم دەکات))

کریست برسی نەبوو لەسەر سفرە دانەنیشت، خاخامی پیریش، ئەوان لەکەنار ئیلیازر مابوونەوە کە چاوەکانی داخستبوو وادەهاتە بەرچاو چووبێتە خەوەوە، بەلاّم ئیلیازر نەچووبووە خەوەوە، بەڵکو لەئەندێشەدا بوو، ئەوە چ خەونێ بوو کە بینیبووی؟ ئایا لەڕاستیدا ئەو مردبوو چووبووە ژێر خاکەوە، ئەو کاتە لەهیکەوە دەنگێکی بەهەیبەتی بیستبوو کە ((ئیلیازر وەرە دەرەوە)) ئەویش بەکفنی خۆی لەجێوە هەڵبەزیەوەو بێداربۆوە تا خۆی لەناو پۆششی هەمان ئەو کفنەی کە لەخەون دابینی بوو ببینێ؟ شایەد ئەوەش خەون نەبێ، نەکا بەڕاستی چووبێتە دونیای مردووانەوە کریست بەئارامی وەلاّمی دایەوە ((باوە من نەمدەزانی، کاتێ کە ئەوم بینی بەردی گۆڕ بەرزدەکاتەوەو تووشی وەحشەت بووم، دەمویست راکەم، بەلاّم شەرمەزابووم لەوێ وەستامو لەرزیم))

خاخام گوتی ((من بەرگەی هەموو شتێ دەگرم تەنها بۆنی گەنیوی لەش نەبێ لەڕزیندا، من لەشی ترسناکی دیکەم دیووە، ئەو لەشەی کە هێشتا دەیخواردو دەینۆشیو قسەی دەکردو ئاخی هەڵدەکێشاو لەبێن دەچوو، هرودیس پاشا دەڵێم: رۆحێکی زل کە مەحکوم بە مەشخەڵی دۆزەخ بوو، ئەو ماریانی جوانی کوشت ئەو ژنەی کە خۆشیدەویست، کوڕانو ئەفسەرانو دۆستانی خۆشی، کیشوەری فراوان کرد، بورجو تەلارو شارو پەرستگای پیرۆزی ئورشەلیم هەتا بەهادارتر لە پەرستگای کۆنی سلێمانی دروست کرد، لەوەی کە تێنوی جاویدانی بوو ناوی خۆی بەبڕونزو زێڕ بەسەر بەردەکانەوە هەڵدەکۆڵی، ئەوکاتە لەهیکەوە لەوپەڕی گەورەیی خۆی ئەنگوستی خوداوەند بەو کەوتو یەکسەر دەستی بە ڕزی بوون کرد، ئەو هەمیشە برسی بوو، بێ پچڕانەوە دەیخواردو تێر نەدەبوو، هەناوو ورگی ئەو برینێکی گەنیوی هەبوو چارەی

نەبوو، برسیەتیێکی وای هەبوو چەقەڵەکان هاواری شەوانەی ئەویان دەبیستو دەلەرزین، ورگو پێو بن هەنگڵی هەڵمسابوون، سەرەتا هێلکە گونەکانی رزینو کرمیان لێدەهاتە دەرەوە، گەنیوەکە هێندە بەهێز بوو کە هیچ کەس نەیدەتوانی نزیکی بێتەوە، غولامەکانی بێهۆش بوون، ئەویان بردە سەر کانیاوە گەرمەکانی کالیروا لەنزیك ئوردن، بەلاّم خراتر بوو، لەناو رۆندا چەوریان کردو گەرمیان کردەوە بەلاّم خراتربوو))

– لەچارەسەرکردنی نەخۆشی ناوبانگم هەبوو، پاشایان لەوە ئاگادارکردەوەو ناردیە سۆراغمەوە، لەو کاتەی کە لەئەریحا لەناو باغەکانیان دادەناو بۆنی گەنیوی لەئورشەلیمەوە تا ئوردن دەچوو.

یەکەمین جار کە نزیکی کەوتمەوە بێهۆش بووم، مەرهەمم دروست کردو لە لە لەشیم هەڵسووی، بەدزیەوە سەرم لاردەکردەوەو دەرشامەوە، لەخۆم پرسی ((ئایا ئەوە پاشایە؟ ئایا ئەوە مرۆڤە؟)) پۆخڵیو گەنیوی. کەواتە کوا ئەو رۆحەی کە هەموو شتێ بخاتە نەزمەوە؟

خاخام زۆر لەسەرەخۆ قسەی دەکرد، دروست نەبوو کە ئەوانی دیکە لەکاتی نان خوارد قسەی وایان گوێ لێ بێ، کریست سەری لەیەخەی نائومێدیدا بردبووە خوارەوەو گوێی دەدایێ، ئەمڕۆ عەسر دەیویست هەمان ئەم داوایە لە خاخام بکات، یانی داوای لێ بکات دەربارەی مەرگ قسە بکا تا برستی وەبەربێ، کاتی ئەوە بوو کە هەمیشە مەرگ لە بەرەو رووی خۆیا ببینێ تا خووی پێوە بگرێ، بەلاّم ئێستا گەرەکی بوو بەدەستپێشخەری خاخام بگرێو هاوار کاتە سەری ((ئیدی بەسە!))

بەلاّم لەم بڕگەیە کێ دەیتوانی پیرەمێرد لە قسەکردندا راگرێ؟ خاخام دەبووا ئەو هەموو پۆخڵیە لەیادی خۆی هەڵڕژێتە دەرەوەو خۆی پاك بکاتەوە.

– مەرهەمەکانی من بێ سوود بوون، کرم دەیخواردن، بەلاّم هێشتا هەرماسێ بەسەر ئەم پۆخڵییە دانیشتبوو فەرمانی دەدا، ئەمری کرد تەواوی دەوڵەمەندو قودرەتمەندانی سراییل کۆببنەوە لەحەوشەی تەلاری خۆی زیندانی کردن، لە سەرەمەرگدا سالومەی



خوشکی بانگ کردە سەرینی خۆیو گوتی ((هەرکە خەریك بوو بمرم هەموویان بکوژە با شاد نەبن بەمردنی من)) بەڵێ هیرودیس گەورە دوا پاشای یەهودا رزی، لەپشت درەختەکانەوە خۆم شاردەوە کەوتمە هەڵپەڕینەوە دوا پاشای – گیوداە- لە بەین چوو.

کاتە پیرۆزەکە گەیشتبوو، هەمان کاتێ کە مووسا دوو وەسیتنامەی خۆی پێشبینی کردبوو: ((لە کۆتاییدا پاشاییێکی هەرزەو عەیاش دێت، کوڕەکانی ناشایستەن، لەلای خۆراوا لەشکری کێویو پاشایانێ بۆ دەست بەسەراگرتنی سەرزەوی پیرۆز دێن.. ئەوکاتە کۆتایی دونیا دێت))

کریست راجفری یەکەمین جار بوو کە ئەو پێشبینییەی دەبیست هاواری کرد ((لە کوێ نووسراوە؟ ئەو پەیامبەرە کێیە؟ یەکەمین جارە کە ئەوە دەبیستم؟))

– سالاّنێك نە چەندان دوور لە ناو ئەشکەوتێکی بیابانی یەهودیەدا رەبەنێ لەناو گۆزەییێکی گڵینەوە، پێستێکی کۆنینە دەدۆزێتەوە، دەیکاتەوە بەسەریەوە بەچەند وشەییێکی قورمزی ئەو نووسینە دەبینێ: ((وەسیەتەکانی موسا)) گەورە سالاری هۆز بەر لە وەفاتی خۆی جێنشینی خۆی – یوشەع کوڕی نون- بانگ دەکاتو رووداوی ئایندەی فێرکردبوو، ئێستە ئێمە گەیشتینە ئەو سالاّنەی کە ئەو پێشبینی کردبوو، پاشای هەرزە هرودیس بوو لەشکرە کێویەکانی رۆمیەکان، بەلاّم سەبارەت بە کۆتایی دونیا، ئەگەر سەرت بەرزکەیتەوە دەبینی کەوا لە دەرگادا دێتە ژوورەوە. بەسەرسامیەوە سەیری مانگی کرد، وەك بڵێی بۆ یەکەم جارە دەبینی، لەخۆی پرسی ((ئەو مانگە چییە، هەمان ئەو مانگەی کە لە کێوەکان سەرهەڵدەگەڕا، سەگەکان ناچاری ترس دەکاو کلکییان لەناو گەڵیان دەنێنو پێی دەحەپن؟ لە بێدەنگی وەحشەتناك بەئارامی سەرهەڵدەگەڕاو ژەهری دەڕشت، دڵی مرۆڤی دەکردە چاڵێكو پڕ لە ژەهری دەکرد)) هەستی بە زمانێکی ژەهراوی کرد بەسەر گۆناو گەردەنو بازووەکانیەوە، زمانێ کە ئەوی دەلستەوەو رووخسارو لەشی ئەوی لەنوورێکی سپیو کفنێکی سپیدا دەپۆشی.

هەوڵو ئازاری ئوستاد کەوتە دڵی یۆحەنناوە، هاتە حەوشەو ئەوی بینی کە تەواوی لەشی لەنووری مانگدا غەرق بووە، لەسەرخۆ بەشێوەییێك کە هەراسانی نەکات گوتی (مەولای من) هێدی هێدی نزیك بۆوە.

کریست گەڕایەوەو یۆحەننای دیت، ئەو نەواجەونێکی موو لێ نەهاتوو بوو، نەماو لەجیاتی ئەو پیرەمێردێ لە حەوشە لە ژێر مانگدا بەدیارکەوت.

❊❊❊

کتێبی کراوەی سپی لەدەستێکداو قەڵەمێکی درێژیش کە لە ڕمێکی نووك مس دەچوو لەدەستەکەی دیکەیدا بوو، ردێنی تەواو سپی ئەو کەوتبووە سەر ئەژنۆکانیەوە، کریست لە نەشئەییێکی لەخۆڕاییدا هاواری کرد((ئەی کوڕی گەواڵە بنووسە: منم ئەلفبای وجود ئەوەی کە هەبوو، ئەوەیش کە دەبێ، یەهوەی سەبایوت ئایا گوێت لە دەنگی شەیپوریان بووە؟))

یۆحەننا تووشی وەحشەت بوو ئوستاد ئەفسوونی مانگ بووبوو، ئەودەیزانی کە مانگ مرۆڤ تووشی ئەفسوون دەکات، لەبەر هەندێ بوو کە هاتبووە حەوشەوە تا کریست بباتە ژوورەوە، بەڵام ئەفسوون کە درەنگ گەیشتبوو، گوتی ((مەولای من، بێدەنگ بە منم یۆحەننای ئازیزی تۆ وەرە با بچینە ژوورەوە، ئێرە ماڵی ئیلیازرە)).

کریست دووبارە فەرمانیدا ((بنووسە! حەوت فریشتە لەدەورانـدەوری تەختی خودا هەن کە هەریەکەیان شەیپورێکیان لەدەم دایە، ئەی کوڕی گەواڵە ئەوان دەبینی؟ بنووسە: یەکەمین فریشتە شەیپووری خۆی لێدا، تەرزەو ئاگر بەیەکەوە لەگەڵ خوێن هەڵڕژانە سەرزەوی، سێ چارەگی زەوی‌و درەخت‌و گیای سەوز لەکامی ئاگردا چوونە خوارەوە، فریشتەی دووەم شەیپوری خۆی ژەنی کێوێ لە ئاگری هەڵڕشتە ناو دەریاو سێ چارەگی دەریا بووە خوێن‌و سێ چارەگی ماسییەکانی کوشت‌و کەشتییەکان غەرق بوون، فریشتەی سێیەم شەیپووری خۆی لێدا ئەستێرەیەکی گەورە لە ئاسمان بەربۆوە سێ چارەکی رووبارو دەریاچەو کانیاوەکان ژەهراوی بوون، فریشتەی چوارەم شەیپوری خۆی لێدا سێ چارەگی خۆرەتاوو مانگ‌و ئەستێرەکان کەوتنە بەرسێبەرو تاریك



هەڵگەڕان، فریشتەی پێنجەم شەیپوری خۆی لێدا ئەستێرەییێکی دیکە کەوتە خوارەوە، گەرداوێکی مەرموز دەمی کردەوەو لەناو ئەو دووکەڵە گەورەیە هاتە دەرەوەو لەناو دووکەڵدا کلۆ کەوتنە هەڵفڕینەوە، بەڵام نەك بەسەر درەخت‌و گیاکانەوە بەڵکو بەسەر مرۆڤەکانەوە، پرچێکی درێژی وەکو پرچی ژنانیان هەبوو ددانەکانیان لەددانی شێر دەچوون، ئەوان زێڕیان پۆشیبوو شەقەشەقی باڵەکانیان لە شەقەشەقی ئەو پەیتونانە دەچوو، کە بۆ جەنگ دەچوون... فریشتەی شەشەم شەیپوری خۆی لێدا)).

یۆحەننا ئیدی نەیتوانی بەرگە بگرێ، کەوتە گریەوە، کەوتە سەرپێیەکانی کریست‌و هاواری کرد ((مەولای من بێدەنگ بە... بێدەنگ بە، کریست گوێی لەدەنگی گریە بوو لەبەرخۆ لەرزی‌و لاربۆوە، یاوەری خۆشەویستی خۆی بەسەرپێیەکانی بینی گوتی ((یۆحەننا بۆ دەگریت))

یۆحەننا شەرمی لەخۆی کردەوە کە بلێت بۆ ساتێ زەینی ئوستاد لەژێر نووری مانگدا جادووی لێکراوە. گوتی ((مەولای من وەرە بابچینە ژوورەوە، پیرەمێرد نیگەرانی حاڵی تۆیەو یاوەران دەیانەوێ بتبینن))

- کەواتە یۆحەننای ئازیز لەبەر ئەمەیە کە دەگریت؟... بڕۆین... کریست چووە ژوورەوەو جارێکی دی لەکەنار خاخامی پیر دانیشت، لەڕادەبەدەر ماندوو بوو، ئارەقەی لەدەستەکانی هەڵدەڕژا، تەواوی بەدەنی لە ئاگردا دەسووتاو بەم حاڵەوەش دەلەرزی.

خاخامی پیر بەوەحشەت پێکراویەوە دەکەوتە رامانی ئەوەوە، لەکاتێکا دەستە ئارەقاویەکانی کریستی گرتبووە دەست، گوتی ((کوڕم سەیری مانگ مەکە دەڵێن مانگ گۆی مەمکی شەوە عەشقی گەورەی هەرماسە...و...،))

بەڵام زەینی کریست لەمەرگ بوو گوتی ((باوکە وا خەیاڵ دەکەم کە تۆ دەربارەی مەرگ خراپ قسەت کرد، مەرگ بچمی هیرودیس ناگرێتە خۆ مەلیکێکی گەورەیەو کلیلداری خودایەو دەرگا دەکاتەوە، باوکە هەوڵدە مەرگەکانی دیکە وەبیرخۆت بهێنیتەوەو ئارامیم پێ ببەخشە))

یاوەرەکان شامی خۆیان تەواو کردبوو، دەستیان لەچەنەبازی هەڵگرتبوو، تا گوێ رابگرن، مارتا سفرەی کۆکردەوە، دوو مێرێ کەوتنە سەر پێیەکانی کریست، جارناجار هەریەکەیان سەیری باسكو مەمكو چاوو دەمو رووخساری خۆیان دەکرد تا بزانن کامیان جوانترن پیرەمێرد گوتی ((کورِم هەق بەتۆیە، من دەربارەی فریشتەی رەشی خودا بەشێوەییێکی خراپ قسەم کرد، ئەو هەمیشە رووخساری مرۆڤێکی مردوو دەگرێتە خۆی، ئەگەر هیرودیس بمرێت.. دەبێتە هیرودیس، بەلاّم ئەگەر مرۆڤێکی پیرۆز بمرێت، رووخساری مەرگ وەکو هەفت خۆرەتاو دەدرەوشێتەوە ئەو مەلیکە گەورەیە بەپەیتونی خۆی دەهاتو مرۆڤی پیرۆزی لە زەوی هەڵدەگرتو دەیبردە ئاسمان، ئەگەر مرۆڤ دەیەوێ بزانێ کە لە رۆژی مەحشەر چ رووخسارێ دەگرێتە خۆ، دەبێ دانیشێو تەماشای وەدیارکەوتنی مەرگی خۆی بکات، لەساتەکانی دوای تەمەنی خۆی)).

هەموو بەدەمی بەشەوە گوێیان راگرتبوو، هەریەکەیان لەزەینی خۆیان رۆحی خۆی هەڵدەسەنگاند، ماوەییێکی درێژ بێدەنگی باڵی بەسەر ئەواندا کێشابوو، وەك بڵێی لە هەوڵی دیتنی رووخساری مەرگی خۆیان بوون.

عاقیبەت کریست لێوی کردەوەو قسەی کر ((باوکە زەمانێ کەدە دوازدە ساڵ بووم جارێکیان چوومە کەلێساو داستانی شەهادەتو مەرگی ئەشعیای پەیامبەرم لە زمانی تۆ بیست کەبۆ خەڵکی ناصیرەت قسەت دەکرد، بەلاّم ئەم بابەتە پەیوەستە بەسالاّنێکی زۆری لەمەوبەرو فەرامۆشم کردووە، ئەمشەو زۆر بەتاسوقەوەم کە جارێکی دی ئەو داستانەی مەرگی ئەو ببیستم تا رۆحم ئارام بگرێتو بتوانم لەگەڵ مەرگدا وەلابێم، باوکە، قسەکانی تۆ دەربارەی هرودیس، رۆحی منی لەرِادەبەدەر توورِە کردووە.

– کورِم، بۆچی ئەمشەو گەرەکتە بەتەنها دەربارەی مەرگ قسەت بۆ بکەم؟ ئایا داوای تۆ لە من هەر ئەوەیە؟

– تەواو هەر ئەوەیە، شتێ لە مردن گەورەتر هەیە؟



کریست ئەوکاتە رووی لە یاوەران کرد: تکایە لەمەرگ نەترسن خوداوەند پیرۆزی بکات، ئەگەر مەرگ نەبووایە چۆن دەمانتوانی بگەین بەخوداو تا ئەبەد لەگەڵ ئەودا بمێنینەوە؟ ئەو حەقیقەتەت لەمن بوێ کە مەرگ کلیل دارەو دەرگا دەکاتەوە)).

خاخامی پیر بەسەرسامیەوە، سەیری ئەوی کرد ((کریست چۆن دەتوانی بەو هەموو ئەشقو دڵنیاییەوە دەربارەی مەرگ قسە بکەی؟ چەندین ماوە بوو کە دەنگی میهرەبانییێکی وام لەدەنگی تۆ نەبینیوە؟))

– سەبارەت بەمەرگی ئەشعیا قسەمان بۆ بکە تا ببینین کە هەق بە منە. خاخامی پیر بەمەبەستی ئەوەی کە بەر لە وێککەوتن بەئیلیازر بگرێ قەراری گرتو گوتی:

پاشای — مەنەسی- ی تاوانکار فەرمانی باوکی حزقیای لەخودا ترسی فەرامۆش کرد، هەرماس چووە ناخیەوە سەرپشکێتی ئەوی گرتە دەست، مەنەسی ئیدی بەرگەی قسەی ((دەنگی خودا)) ئەشعیای نەگرت، لەبەر ئەمە پیاوکوژانی ناردە سەراسەری سراییلو یەهودیە تا بیدۆزنەوەو لەگەردەنی بدەنو ئیدی نەتوانێ قسە بکات، بەلاّم، ئەشعیا لەبیت لەحم بوو لەناو قەدی درەختی سەرونیازێکی زلدا پەنهان بوو، خوداپەرستی دەکردو رۆژووی دەگرت.

تا خوداوەند میهرەبانی بۆ سراییل هێناو نەجاتیدا، رۆژێکیان سامیراییەك کە پەیرِەوو رێبازی نەبوو بەکەنار درەختەکەدا دەرِواتو بە رێکەوت دەستی پەیامبەر لەحالّەتی خوداپەرستی بەدیاردەکەوێ، ئەو سامیراییەی دەستەکە دەبینێو بەپەلە بۆلای پاشا دەچێ، خەبەری لێ دەدات، ئەشعیا دەستگیر دەکرێو بۆ لای پاشا رەوانە دەکرێ، پاشای نەفرەتی دەستوور دەدات، تا مشارێ بێنن بیکەن بەدوو پارچەوە، ئەو دەخەوێنن دوو نەفەر هەردوو لای مشار دەگرنو دەست بەبرِینی دارەکە دەکەن، پاشان هاوار دەکات، بەلاّم ئەشعیا پێشتر چووە بەهەشت ئیدی دەنگی ئەو سەرزمینەی نەدەبیست، پاشا دووبارە هاواری لێ هەڵسا ((نکوڵی لە پەیامبەریت بکە تا رزگارت بێ)) ((ئینکاری خودا بکە تا مەملەکەتی خۆم ناچار بکەم بکەونە سەر پێیەکانتو ستایشت بکەن)) ئەشعیا ئەو کاتە وەلاّمی دەداتەوە: (( تۆ جگە لە کوشتنی

جەستەی من قودرەتی هیچت نییە، تۆ ناتوانی دەست لەڕۆحم بدەی تا دەنگم خامۆش کەی رۆح‌و دەنگی من جاویدانییەو هەرگیز نافەوتیٚ))

بەکۆتا هاتنی قسەکەی، مەرگ لە پەیتوانێکی ئاگرو تاجێکی گوڵدار دادەبەزێتە سەر درەختی سەرونیازی نازو دەیبات))

کریست لەکاتێکا چاوانی بریقەی دەدایەوە، هەڵسایەوە، پەیتوانێکی لە ئاگر بەسەریەوە بوو، بەسەیرکردنی یەك یەکی یاوەران گوتی ((دۆستان هاوسەفەرانی ئازیز ئەگەر منتان خۆش دەویٚ گویٚ بدەنە قسەکانی ئەم شەوم ئێوە دەبیٚ هەمیشە ئامادەبن: ئەوا ئەوانەی کە سۆڵیان هەیە بە سۆڵی خۆیان، ئەوانەی کە گۆچانیان هەیە خۆیان‌و گۆچانیان ... بەڵیٚ ئامادەی سەفەرێکی گەورەبن.. لەش چییە.؟

دەرگاوان گیان، هەر ساتیٚ دەبیٚ بەخۆت بڵێی ((ئێمە دەرگاوان دەرەدەهێنین‌و دەڕۆین‌و دەگەڕێینەوە نیشتمانی خۆمان: ئاسمان!))

دۆستان ئەوە دوا وشەکانە کە ئەم شەو دەمەویٚ بۆ ئێوەی بڵێم. لەو کاتە کە خۆت لەبەرابەر گۆڕی ئازیزێکی لەدەستچوودا دەبیننەوە فرمێسك دەڕێژن، هەمیشە با ئەو بێخەمیە گەورەیە بەسەر ستوونی یادەوەریتان بیٚ کە مەرگ دەرگاییێکە بەرەو جاویدانی دەکرێتەوە، دەرگاییێکی دیکە نییە ئازیزی ئێوە نەمردووە جاویدانەیە)).



## بەشی بیست‌و حەوتەم

لە دەرکەوتنی سپێدەوە هەتا لەکاتی شەودا، دوور لە چاوی مرۆڤ بەهار وردە وردە بەردو خاك لادەداو بەسەر زەوی سراییلەوە هاتبووە دەرەوە، لەماوەی یەکشەودا دەشتایی شارۆن لە سامیرەو ئەشدەرلون لە جەلیل پڕ بووبوون لە گوڵە مرواریە زەردەکان گوڵە زەنبەقەکانی کێوی‌و کولێکە سووری تەمەن کورت، لەشێوەی دڵۆپەی درشتی خوێندا، لەمیانی بەردە عەبوسەکانی یەهودیەدا سەریان دەرهێنابوو، بەسەردارمێوەکانەوە چاوی خڕو قرژاڵ ئاسا وەدەر کەوتبوو، لەهەریەك لەو چرۆ سەوزانەوە، هێشووی هێشتا پەسیرەو پێگەیشتووی تریٚ‌و شەرابی نوێیان بۆ خۆ وەدیارخستن کۆکردەوە... (چی دەڵێم!) لەناو دڵی هەموو چرۆیەکی ئاهەنگی مرۆدا شاردرابۆوە، لەکەنار هەر گەلاییێکی وردا فریشتەییێکی پاسەوانی وەستابوو یارمەتی رسکانی دەدا، وەك بڵێی یەکەمین رۆژی خولقاندنی گەڕابۆوە، رۆژانیٚ کە هەر قسەییێکی خودا دەکەوتە سەر زەوی تازەکێلراودا پڕ لە درەخت‌و گوڵە کێویەکان‌و سەوزەزاردەبوو.

ئەمڕۆ سپێدە لە دامێنی کێوی پیرۆزی (گیرزیم) ئەو ژنە سامیراییە سەرلەنویٚ دیسان گۆزەکەی لەبیری ئاوی یاکوبدا پڕ دەکردو بەرەو جادەی جەلیل چاوەکانی هەڵخستبوو، دەتگوت هێشتا بەتاسووقی دیداری ئەو گەنجە رەنگ پەڕیوەیە کە جارێکیان دەربارەی ئاوی جاویدانی قسەی بۆ ئەو کردبوو، ئەو ئێستاکیٚ کە بەهار لە گردەرێوە گەیشتبوو، ئەو بێوە عەشرەت کۆشە، لە جاران زیاتر لیمۆی مەمکە شەلال ئارەقەکانی خۆی رووتکردبۆوە، لەم شەوە بەهارییەدا رۆحی جاویدانەی سراییل

لەقالبی هەزار دەستەدا هاتە بەرو لەناو پەنجەرە کراوەکانیماڵی کچانی یەهودی دانیشتەوەو تا دەمەدەمی سەحەر بەنەغمەی خۆی بێداری دەکردنەوە، بەچەهچەهەی خۆی، تیزئامێزانە دەیگوت: ((بۆ بەتەنها دەچیتە ناو جێگاوە؟ بیرناکەیتەوە کە پرچی درێژو مەمكو کەفەلێکی خڕو پانم بەئێوە داوە؟ راپەڕن زێڕو زیوتان بەخۆ هەڵواسن‌و لەپەنجەرەوە بۆ دەرەوە لاربنەوە، لە گزنگی سپێدەدا لە ئاستانەی دەرگادا بوەستن، گۆزە بخەرە سەر شانتان‌و بەرەو بیرە ئاوەکە وەڕێکەون، بۆ کوڕانی عازەبی سراییل کە لەسەراوێ دەیبینن، بکەونە عیشوەگەری‌و لەگەڵ ئەواندا بۆ من مناڵ وەبەربهێنن، ئێمەی یەهودیان دوژمنانی زۆرمان هەیە، بەڵام مادامەکێ کچەکانم مناڵ بۆ من وەبەردێنن من جاویدانیم، من بێزم لە مەزرای نەکێلراوو درەختە هەقنەناسەکانی سەر زەوی سراییل‌و پاکیزەکان دەبێتەوە.

لەبیابانی — ئەدومیەدا- بناری کێوی خواپەنای —ئەبەرون- لە دەوروبەری گۆڕستانی برایمدا، مناڵە یەهودیەکان سپێدە زوو لە خەو رابوون، رۆڵی مەسحیان دەگێڕا، لە پاشماوەی داربیدا کەوان‌و لە قامیش تیریان دروست دەکردو لەژێی کەماندا تیریان بۆ ئاسمان دەهاوێشت هاواری کریستیانوی پادشای سراییلیان دەکرد تا بەخۆی‌و شمشێرێکی درێژو زرێپۆشی لەزێڕ دابەزێتە خوارەوە، بەپان کردنەوەی پێستی بەرخ بەسەر گۆڕی برایمدا تەختێ بۆ دانیشتنی ئەو چێ کەن، ئاهەنگێکی تایبەتیان بۆ ئەو چڕی دەستەکانیان بۆ وەدیارکەوتنی ئەو لێکداو کەوتنە چەپڵەوە.

لە پڕێکا لە پشتی گۆڕەوە، هاوارەکانی خۆشحاڵی‌و دەنگی تەپڵ بەرزبۆوە، کریستیانو بەڕیش‌و سمێڵێ لە کاکۆڵی گەنمەشامی‌و بەرووخسارێکی رەنگ پەڕیوەو بەهاوار هاوارو وەلاداهاتن بەدیارکەوت، شمشێرێکی درێژی لە گەڵای دارخورما لەدەست بوو بەدەمی تیغەی ئەو شمشێرە گەردەنی یەکەیەکەی مناڵانی هەڵپاچی‌و مناڵان قەتل‌و عام کران‌و کەوتنە سەر زەویەوە.

لە بیث ئنیاو لەماڵی ئیلیازریشدا رۆژ لە هەڵاتندا بوو، بەڵام کریست هێشتا چاوی لەسەریەك دانەنابوو، شڵەژانی دانەمرکابۆوە، تەنها یەك رێگ لەبەردەمیا بوو: مەرگ لەبەرخۆ دەیگوت ((پێشبینییەکانی پەیامبەران بۆمن دەگەڕێتەوە من ئەوبەرخەم کە



گوناهانی تەواوی دونیا دەگرمە ئەستۆی خۆمەوە، لەم جەژنەی قوربانەدا دەبمە قوربانی کەواتە لێگەڕێ ئەو بەرخە قوربانیە زووتر بنێردرێتە قوربانگا. لەش بێ هێزەو باوەڕم پێی نییە، لەدوا ساتدا لەوانەیە بترسێ‌و زاتی نەمێنێ، لێگەڕێ کە ئێستا هەست دەکەم رۆحم پڕ بڕست وەستاوە با مەرگ بێت.

ئاخ، چ کاتێ ئەم خۆرەتاوە هەڵدێ تابتوانم بچمە پەرستگاوە! دەبێ خاڵی دیماهی بۆ هەموو شتێ دابنێم.. هەمان ئەمڕۆکە.

بەم بڕیارەوە زەینی تا ڕادەیێ ئارام بۆوە، چاوی نایە سەریەك‌و خەوت لە خەووا بینی کە ئاسمان لەباغێ دەچێ‌و بە پەیژەیێکی ئاسنین ئابڵۆقەدراوەو پڕیەتی لە ئاژەڵی کێوی ئەویش ئاژەڵێکی کێوی بوو کە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لەباغدا بەولاو بەولادا دەچێ، لەم هاتووچوونەدا بەسەر پەیژەوە بەربۆوەو کەوتە سەرزەوی، خەڵکی بەدیتنی ئەو کەوتنە وەحشەتەوە، ژنان بەقیژەو دادەوە مناڵانی خۆیان لەکوچەو کۆڵانانەدا کۆکردەوە تا نەبادا ئەم ئاژەڵە بیانخوات، پیاوان دەستیان برد بۆ رم‌و شمشێرو بەردو کەوتنە دوایەوە.

لەکاتێکا لەپڕێکا بووە نەخشی سەرزەوی، خوێن، لەتەواوی لەشیدا هەڵڕژا، ئەوکاتە وابەدیارکەوت کە دادوەران بەدەوری ئەودا کۆبوونەوە تا دادگایی بکەن، بەڵام ئەم دادوەرانە مرۆڤ نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێ لە رێوی‌و سەگ‌و هرس‌و گورگ بوون، فتوای کوشتنی ئەویاندا، بەڵام لەهەمان کاتێ کە ئەویان بۆ کوشتارگا دەبرد بەبیری هاتەوە مەرگ کار لەو ناکات ئەو ئاژەڵێکی ئاسمانی جاویدانەبوو، بە وەبیرهێنانەوەی ئەم بابەتە، ژنێ دەستی گرت.... مەجدەلیە بوو

***

ئەوی لەشار دەرهێناو بردیە مەزراوە، پێی گوت ((مەچووە ئاسمان بەهار گەیشتووە، لەگەڵ ئێمەدا بمێنەوە) لەگەڵ یەك تا سنووری سامیرە رێیان تەی کرد، لەوێ ژنێکی سامیرەیی خۆی‌و گۆزە ئاوی سەرشانی بەدیارکەوت، گۆزەکەی بەودا تا ئاو بخواتەوە، دوای ئەمە ئەو ژنەش دەستی ئەوی گرت‌و بێ ئەوەی کە قەسەیێ بکات، تا سنووری

جەلیل ئەوی هێنا، لەوێ دایکی لەژێر پیرە درەختەکان کە شکۆفەیان کردبوو زەیتونیان دەردابوو، چەفیەییێکی رەشی لەسەردابوو دەگریا، دایکە بەبینینی بریقەکانی خوێنی لەش‌و قاچی‌و دڕکی سەر سەری دەستی بەرزکردەوەو گوتی (( وەك چۆن دڵی منت سووتاند ئومێدەوارم خودا دڵی تۆش بسووتێنیێ، تۆ ناوی منت خستە سەرزمان‌و هەموو جیهان پەنجەنومای من دەکات، دەستت بەرزکردەوە بەرووی رێبازو خودای سراییل، مەگەر ترست لەخودا نەبوو هەستت بەشەرم نەدەکرد؟ ئەسڵەن لەبیری دایك‌و باوكت نەبووی، هیوادارم نەفرینبار بیت)) بەم گوتەوە ون بوو.

کریست کە تەڕی ئارەقە بوو لەخەو ڕابوو، لەدەوروبەریا یاوەران خەوتبوون، پرخەیان دەهات، لەحەوشەدا کەلەشێر دەیخوێند، پەترۆس دەنگی کەلەشێری بیست‌و چاوی نیوە کردەوە، کریستی بینی کە بەسەر پێوە وەستاوە گوتی ((مەولای من کاتی بانگی کەلەشێر خەریك بوو خەونم دەبینی وابەدیارکەوت کە دوو داری خاچ ئاسات لەدەست دابوو، دارەکان لەدەستی تۆدا بوونە تەمبورو عودو تۆ دەتژەنی‌و گۆرانیت دەگوت، جانەوەرە کێویەکان لەسەرتاسەری زەوی بۆ گوێ گرتن کۆبوونەوە، مانای ئەم خەونە چییە. لەخاخامی پیر دەپرسم؟

کریست وەڵامی دایەوە ((خەونەکە لەهەمان جێدا تەواو نابێ، پەترۆس، بۆ ئەو هەموو پەلەپەلەت لەبێداربوونەوە بەخەرج داوە؟ خەون بەردەوام دەبێ))

– تێناگەم مەولای من، رەنگە تۆش خەونێکی وات بینیبێ؟

– جانەوەرەکان دوای بیستنی گۆرانی هێرشیان کردو گۆرانیبێژەکانیان هەڵدڕی؟

چاوەکانی پەترۆس لەگلێنە هاتنە دەرەوە، دڵی بەخەبەربوو لە مانای خەونەکە، بەڵام زەینی هێزی تێگەیشتنی ئەو خەونەی نەبوو گوتی – تێناگەم- کریست وەڵامی دایەوە (( بەبیستنی بانگی کەلەشێر لەسپێدەییێکی دیکە تێدەگەی؟))

کریست ئەوکاتە یاوەرەکانی یەك یەك بەلەقە بێدارکردەوەو گوتی ((بێدار بنەوە تەوەزەلینە، ئەمڕۆ کارێکی زۆرمان هەیە. فیلیپ بەهەڵپشافتنی چاوەکانی خۆی پرسی ((دەڕۆین؟ من دەڵێم باشتر وایە بگەڕێینەوە جەلیل ئەوێ سەلامەتە))



یەهودا ددانەکانی داقرمساندە سەریەك، بەڵام هیچی نەگوت لەژووری نێواندا، ژنان بێداربوونەوە دەستیان کرد بە چەنەبازی سالومەی پیر بۆ کردنەوەی ئاگر هاتە دەرەوە یاوەران لەحەوشە کۆبوونەوە چاوەڕوانی کریست بوون کەبەسەر خاخامەوە لاربۆوەو بە دەنگێکی کپ قسەی لەگەڵ ئەو کرد، پیرەمێرد کە زۆر بێ حاڵ بوو، لەسوچێکی دواوەی ناو نوێن کەوتبوو.

خاخام پرسی ((ڕۆڵە ئێستا بۆ کوێ دەڕۆی؟ لەشکری خۆت بۆ کوێ رابەرایەتی دەکەی؟، جارێکی دی بۆ ئورشەلیم؟ ئایا دووبارە دەتەوێ دەست بەرزکەیتەوەو پەرستگا سەرەوژێرەکەی؟ کاتێ کە گوفتار لە رۆحێکی گەورە دەردەچێ دەبێتە کردار، رۆحی تۆ گەورەیە تۆ بەرپرسی گوفتاری، ئەگەر دەریخەیت کە دەبێ پەرستگا وێران بێ لەڕاستیدا رۆژێ وێران دەبێ، وشەکانی خۆت بەپێوانەوە بڵێ)).

– باوکە هەمان ئەو کارەش دەکەم کاتێ کە قسە دەکەم تەواوی دونیام لەسەردایە، هەموو ئەوەی کە لە دونیا دەمێنێتەوە هەڵدەبژێرم‌و بەرپرسێتی دەگرمە ئەستۆمەوە.

– چ دەبوو کە تەمەنم بایی ئەوەندەی دەکرد تا بزانم کە تۆ چ کەسێکی، بەڵام پیرو پەککەوتەم دونیا بۆتە تارماییەك بەدەوری سەرمدا دەسووڕێ‌و دەیەوێ بچێتە ناو سەرمەوە، بەڵام تەواوی دەرگاکان داخراوە

– باوکە هەوڵدە چەند رۆژێکی دیکە بەردەوام بیت بۆ ئەوەی تا رۆژی جەژن زیندوو بمێنیتەوە، خۆت بەتەمەنی ئازیزی راکردووت بچەسپێنەو دەبینی کە من چ کەسێکم، هێشتا ساتی موژدەهێن نەهاتووە.

خاخام سەری راتەکاندو بەشکاتکردنەوە گوتی

((کەواتە ئەو ساتە کەی دەگات؟ ئایا خودا منی فریو داوە؟ ئەی کوا ئەو وادەیەی بەمنی داوە؟ من لە حاڵی مردن دام، کریستیانو لەکوێ یە؟)) بە تەواوی هێزی خۆیەوە خۆی چەسپاندە شانی کریستەوە.

– باوکە تا جەژن بەردەوام بە، دەبینی کە خوداوەند وادەی خۆی ناگۆڕێ! کریست ئەو کاتە خۆی لەچەنگی پیرەمێرد رەهاکردو چووە حەوشەوە، گوتی ((ناتانیل‌و تۆش

فیلیپ بڕۆنە ئەولای دێوە کە دوا ماڵتان بینی لەوێ کەرێك دەدۆزنەوە هەوساری بە زنجیری دەرگاوە بەستراوەتەوە، هەوساری بکەنەوەو بیهێننە ئێرەوە، ئەگەر کەسێ لە ئێوەی پرسی کە بۆ کوێی دەبەن وەڵام دەنەوە کە (ئوستاد پێویستی پێیەتی دووبارە دەیهێنینەوە)).

ناتانیل بەدۆستی خۆی گوت (خۆمان دەخەینە دەردەسەریەوە) فیلیپ گوتی ((با بڕۆین گوێڕایەڵی فەرمان بین‌و لێگەڕێ هەرچییەك دێتە پێش بەخێر بی))

مەتی قەڵەمی خۆی گرتە دەست‌و هەموو لەشی گوێ‌و چاو بوو، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((خودای سراییل سەیرکە چۆن قامەتی ئەو دروست بەهەمان ئەو شێوەیەی کە پەیامبەران لەرێی سروشەوە دروستیان کردووە! مەگەر زەکەریا پەیامبەر نییە، کە دەڵێت:

– ئەی کچی سەهیون شادومان بە دێیتە وەژدەوە، ئەی کچی ئورشەلیم هاواری شادی سەربدە ئێستا پاشای تۆ دێ تا تۆ بدۆزیتەوە، هەرچەندە سەرکەوتووە، بەڵام بە خاکەڕاییەوە سواری کەرێ بوو))

مەتی ویستی ئوستاد تاقی بکاتەوە گوتی ((مەولای من وادێتە بەرچاو کە ماندووی‌و ناتوانی بە پیادە بچیتە ئورشەلیمەوە)

کریست وەڵامی دایەوە (نە من ماندوو نیم، بۆ دەپرسی؟ لەپڕێکا ئەو مەیلە لەمن پەیدابوو کە بەسواری بڕۆم))

پەترۆس قسەی ئەوی بڕی، تۆ سواری ئەسپێکی سپی دەبیت، مەگەر پاشای سراییل نیت؟ لەبەر ئەمە دەبێ بەسواری ئەسپ بچیتە ناو پایتەختەوە))

کریست سەیرێکی پەلەئامێزی کردە یەهوداو هیچی نەگوت.

لەهەمان ئەم کەین‌و بەینەدا، مەجدەلیە هاتە دەرەوەو لەلایەك وەستا، ژێر چاوەکانی هەڵمسابوو، چونکە بەدرێژایی شەو چاوی لەسەریەك نەنابوو، لەکاتێکا پشتی بە چوارچێوەی دەرگادابوو، سەیری کریستی دەکرد، وای چ نیگاییێکی نائەجماو بوو! وەك



بڵێی بۆ هەمیشە مالاوایی لەو دەکرد، گەرەکی بوو داوای لێ بکات نەڕوات، بەڵام رێی گەرووی داخرابوو. مەتی ئەوی بینی کە زەینی خۆی دەکاتەوەو دادەخا ناتوانی چەند وشەیێ بخاتە سەرزمان تێگەیشت لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((پەیامبەران ناهێڵن ئەو قسە بکات ناهێڵن ئوستاد پێشبینییەکانی ئەوان جێبەجێ بکات، سەرەی مەجدەلیەو خۆشی سواری کەردەبێ‌و دەچێتە ئورشەلیم ئەوە نووسراوە)).

لەهەمان کاتدا فیلیپ‌و ناتانیل گەیشتن‌و بەشادیەوە ماچەکەرێ بەدوای خۆیاندا رادەکێشن، فیلیپیش بەدیاریخست‌و گوتی مەولای من، رووداوەکی ئاوەها بوو، کە گوتت، ئێستا سواربەو بابڕۆین، کریست گەڕایەوە تا سەیرێ بکاتە ماڵەکەوە، ژنان بەدەستی خاچواریان خەمگین‌و خامۆش بوون، سالومەی پیرو دوو خوشك لەگەڵ مەجدەلیە لەپێشەوە بوون، گوتی ((مارتا قامچیەك لەماڵەوە هەیە))

مارتا وەڵامی دایەوە ((نەخێر تەنها سیخورمەی براکەم هەیە))

– بیدە من

یاوەران جلەکانی خۆیان نایە سەرپشتی ئاژەڵی گوێڕایەڵ تا کورتانێکی نەرم بۆ ئوستاد دروست بکەن‌و بەسەر جلەکانەوە جلێکی قورمزی کە مەجدەلیە خۆی بەدەستی خۆی چنی، دانایە سەرو شیرازەکانی بەسەرووی نازی رەش رازاندبۆوە.

کریست پرسی ((هەموو حازرن؟ خۆ ورەکانیش بەرزن؟))

پەترۆس لە کاتێکا هەوساری ئاژەڵی لەدەستدا بوو لە پێشەوە دەڕۆیشت گوتی ((بەڵێ)).

خەڵکی بیث ئنیا گوێیان لە دەنگی رەت بوونی گروپەکە بوو دەرگایان کردەوە.

– کوڕینە، ئۆغربەخێر- بۆ ئەمرۆکە پەیامبەر بەسواری کەوتۆتە رێ.

یاوەران لاربوونەوە رازیان خستە میانەوە ((ئەمڕۆ دەڕوات تابەسەر تەختەوە دانیشێ))

– کام تەخت؟

– قسه مەکە ئەو رازێکە، ئەو پیاوەی کە بەرەو رووی خۆتە دەبینی پاشای سراییلە.

ژنە جحێلەکان هاواریان کرد ((نەبابە؟ یالّلاّ با لەگەڵیا بڕۆین!)) خەڵکێکی زۆرتر کۆبوونەوە.

منالاّن لق و پۆپی دارخورمان هەڵکەندو کەوتنە پێش، سروودی خۆزگە بەحاڵی ئەو کەسەی کە بەناو خوداوە دێت)) یان سەردەدا. پیاوان کۆتەکانی خۆیان دەردەهێناو بەدرێژایی جادە رایاندەخست تا ئەو بەسەریانا تێپەڕی، وای چۆن ناویان دەدا!

وای کە چۆن بەهاریّ بوو، گوڵەکان ئەمساڵ چ رەوتێکیان هەبوو، باڵدارەکان بە ئاوازەوە لەدوای رێزەکەوە بۆلای ئورشەلیم هەڵدەفڕین!

یاکوب سەری لە گوێی براکەی نا ((دوێنێ دایە قسەی لەگەڵ کردو پێی گوت ئەو ئێستاکە دەیەوێ بچێتە سەر تەختی گەورەیی خۆی دەبێ ئێمە لە چەپو راستی خۆی دانێ))، بەلاّم ئەو وەلاّمی نەدایەوە، لەوانەیە تووڕە بووبێ، دایە دەیگوت رووخساری تاریك هەڵگەڕا، یۆحەننا وەلاّمی دایەوە: هەڵبەتە کە تووڕەبووە دایە نەدەبوایە قسەییێکی وابکات))

– کەواتە چارە چییە؟ ئایا ئێمە وا رەها کاتو ئەو مافە بدات بە یەهودای ئەسخەریوتی؟ چۆن دیارە کە کارێکی واناکات؟ قەت وردبوویتەوە لەو رۆژانە چۆن چۆنی بە جووتە بەدزیەوە قسە دەکەن؟ وادێتە بەرچاو کە قەت جیا نابنەوە، یۆحەننا ئاگاداربە، خۆت قسەی لەگەڵ بکە تا زەرەرمان پێ نەگات، زەمان بۆ دابەشکردنی شانازییەکان هاتۆتە پێش. بەلاّم یۆحەننا سەری خۆی هەڵتەکاند گوتی ((برام سەیرکە چەند بەئازارە، وەك بڵێی دەچێتە پێشوازی مەرگی خۆیەوە)).

مەتی لەوکاتەی کە لەدوای ئەوانی دیکەدا رێی دەبڕی، دەیگوت ((دەمەوێ بزانم ئێستا موقەددەر چییە؟ پەیامبەران بەچاکی روونی ناکەنەوە، هەندێ دەڵێن تەختو هەندێکیش دەڵێن مەرگ، کام یەك لەو پێشبینییانە روودەدات؟ هیچ کەس ناتوانێ بەراقەکردنی پێشبینی بکەوێتە پێش روودانی رووداو، تەنها دوای روودانی رووداوەکە تێدەگەین مەبەستی پەیامبەر چی بووە.



لەبەر ئەمە چاکتر وایە سەبر بگرینو لەدڵنیاییدا ببینین چ روودەدات، ئەمە شەو لەکاتی گەڕانەوە، هەموو شێ دەنووسمەوە، لەم کاتەدا خەبەرێکی خۆش پەڕوباڵی دەرکرد گەیشتبووە دێهاتە نزیکەکانو خانووە پەرشو بلاّوەکان سەرانسەری زەیتونستانو رەزەکانی مێو، جووتیاران لەهەموو لایەك رایاندەکرد کەپەنەك یا دەسماڵی خۆیان دەهاویشتە سەر زەوی تا پەیامبەر بەسەریا رەت بێت، ئیفلیجو نەحۆشەکانو کۆنەپۆش زۆر بوون، جارناجار کریست ئاوڕی دەدایەوەو سەیری لەشکری خۆی دەکرد.

لەپڕێکا هەستی بەتەنهاییێکی مەزن کرد، گەڕایەوە هاواری کرد ((یەهودا)) بەلاّم ئەم یاوەرە لەخەڵك هەلاّتووە لەدوا رێزدابوو نەیبیست، کریست بەنائومێدی دووبارە هاواری کرد ((یەهودا))

ڕیش سوور وەلاّمی دایەوە (لێرەم) یاوەرەکانی دیکەی وەلاداو رەت بوو..

– مەولای من چیت دەوێ؟

– یەهودا لەکەناری مندا بمێنەوە، لەگەڵم بە

– مەولای من نیگەران مەبە جێت ناهێڵم.

یەهودا گوریسەکەی لەدەستی پەترۆس وەرگرتو کەوتە ئەندێشەوە.. کریست جارێکی دیکە گوتی (برام یەهودا بەتەنیام جێمەهێڵە))

– مەولای من چۆن بەتەنها جێت بهێڵم؟ مەگەر پێشتر سەبارەت بەمە بڕیارمان نەداوە. ئەوان عاقیبەت لە ئورشەلیم، ئەو شارە پیرۆزەی کە بەسەر کێوی سەهیونەوەو لەژێرهەتاوی بێ ئامانەدا نزیك بوونەوە، لەسێتی بەفردا رووبەڕووی ئەوان بالاّی هەڵبڕی بوو، بەناو گوندێکی بچووکدا چوون لەملا تا ئەولای گوند گوێیان لە سەردولکەی پرسە بوو کە لە بارانی فێنکی بەهاران دەچوو.

❋❋❋

کریست بەلەرزینێکەوە کە کەوتبووە جەستەی‌و پرسی ((شیوەن بۆ کێ دەکەن؟ کێ مردووە؟))

بەلاّم دێهاتیەکان کە لە پشت ئەوەوە تاویاندەدا کەوتنە خەندەوە ئوستاد مەشڵەژێ کەسێ نەمردووە، کچانی دێ بەسووڕاندنی دەستارِ سەردولکە دەڵێن)).

– ئاخر بۆ؟

– بۆ ئەوەی کە خووی پێوە بگرن، تا لەکاتی خۆیدا بزانن چۆن چۆنی دەبێ شیوەن بکەن، لە کووچەی بەردرێژکراودا سەرهەڵگەڕان‌و چوونە ناو شاری مرۆڤخۆرەوە.

– پۆل پۆل مرۆڤ کە لە تەواوی مەملەکەتی کەلیمی نشینی دونیاداو هەریەکەو بەبۆن‌و پۆخڵی تایبەتی خۆیانەوە ئامادە بووبوون، لەحاڵی لەباوەشکردن‌و ماچ کردنی یەکتردا بوون، مەگەر ئەوە نییە دووسبەی رۆژی جەژنی جاویدانییەو کەلیمیان برای یەکتربوون؟ بەدیتنی کریست کە سواری کەرێکی بچووك بووبوو بەدیتنی ئەو ئاپۆڕەی کە کەوتبوونە دوای ئەوەوەو لقە دارخورمایان تەکاندەدا کەوتنە خەندەوە.

– پەنا بەخوا ئیدی ئەوە کێیە؟

– بەلاّم ئیفلیج‌و نەخۆشی‌و کۆنەپۆشەکان مشتی خۆیان بەهەڕەشە بەرزدەکردەوە ((بەم زووانە تێدەگەی کە ئەوە کریستی ناصیرەییە دەبێتە پاشای یەهودیان))

کریست دابەزی‌و بەپەلە لەپەیژەکانی پەرستگا چووە سەرەوە گەیشتە بارەگای سلێمان‌و سەیری دەوروبەری کرد.

تەختە کورسییەکان بەرپابووبوون، هەزاران نەفەر لەبازرگان‌و سەڕاف‌و مەیخانەچی‌و بەدکار خەریکی کڕین‌و فرۆشتن بوون، خەریکی چەنە لێدان‌و جاز لێدان بوون بۆ کەلوپەلی خۆیان، خوێن بەری چاوی کریستی گرت، تووڕەییێکی پیرۆز بەسەریا زاڵ بوو، سیخورمەکەی خۆی بەرز کردەوەو کەوتە گیانی سفرەی شەراب‌و خواردەمەنییەوە، تەخت‌و کورسیەکانی پێك دادەداو فرۆشیارەکانی دەخستە بەرکوتەکەوە ((یالّلاّ بڕۆن ون بن!)) لە دەروونی ئەودا تەمەننایێکی ئارام، بەلاّم



ناخۆش هەبوو ((خودایا، خوداوەندا لەڕوودانی هەر شتێ کە ئیرادەت لەسەرە پەلە بکە، جگە لەو تەمەننایە هیچی دیکەم نییە، تەنها داواکارم لەتۆ مادامەکێ هێشتا راست‌و راستەقانیم هەیە، پەلە بکە)).

ئاپۆڕەی خەڵك لەدوای ئەودا تاویاندا ئەوانیش بە هەڵچوونەوە هاواریان کرد یالّلاّ بڕۆن ون بن))و سفرەیان تێکچڕژاند، کریست لەکەنار هەیوانێکی شاهیدا بەسەر بەرزایی دۆڵی — کە دەروون- وە وەستا، هەڵم لەتەواوی بەدەنی هەڵدەستا، پرچی درێژو رەشی بەسەر شانەکانیان پەرش‌و بڵاو بووبۆوە، لە چاوەکانیا مەشخەڵ دەهاتە دەرەوە هاواری کرد ((من هاتووم تا ئاگر لە دونیا بەردەم یەحیای پاکشۆر لەبیاباندا بانگەشە دەکات (تۆبە بکەن تۆبە بکەن رۆژی خودا نزیك کەوتۆتەوە))، بەلاّم من بەئێوەی دەڵێم کە ئیدی هەلی تۆبەکردنتان نییە، ئەو رۆژە گەیشتووە من رۆژی خودام، یەحیای پاکشۆر لەبیاباندا بە ئاو ئاوەمۆر دەکات‌و من بەئاگر ئاوەمۆرتان دەکەم، من مرۆڤ‌و کێوو شارو قایغەکان ئاوەمۆر دەکەم من ئاگر دەبینم، کە لەحاڵی داگرتنی چوارگۆشەی دونیاو چوارگۆشەی رۆحەو شادی دەکەم رۆژی خودا رۆژی منەو گەیشتووە، ئاپۆڕەکە هاواریان کرد ((ئاگر ئاگر بهێنەو دونیا بسوتێنە خزمەتکارانی پەرستگا، نێزەو شمشێریان گرتە دەست، یاکوبی برای کریست خۆی‌و نوشتە هەڵواسراوەکانی گەردەنی سەردەستەبوو، بۆ دەستگیرکردنی کریست هێرشیان هێنا، بەلاّم خەڵکی تووڕەبوون یاوەرەکان زاتیان وەبەرهات‌و بەهاوارکردنەوە بەپەلە بۆ پێشەوە چوون تا پەیوەست بن بە ئەوانی دیکەوە.

***

پەترۆس مەشخەڵێکی بەسەر سفرەییێکەوە هەڵگرت‌و هاواری کرد ((برایان یالّلاّ هێرش بکەن، زەمانی موژدەبەخش بۆ ئاگرتێبەردان هاتووە)) لەبەرئەوەی کە لە تەلاری پیلاتدا شەیپورەکان دەنگیان نەدەدایەوە، خوێنێکی زۆر لە حەوشەی خوداوەند بەسەر زەوی هەڵڕژا، کیافای کاهینی گەورە، لەپەرستگا هاتە دەرەوەو دەستووری دایە خزمەتکار کە چەکی خۆی دانێتە سەر زەوی، ئەو خۆی بەکارامەیێکی زۆرەوە داوێکی نابۆوە کە یاخیبووان بێ بگرەو بەردەو بەبێ هەراو هۆریا دەکەوتنە ناویەوە.

یاوەرکان بەدەوری کریستەوە ئەڵقەیان بەستو بەشڵەژانەوە سەیری ئەویان دەکرد، ئایا ئەو هێمای دەدا یانا؟ ئەی چاوەڕوانی چی بوو؟ دەبووا تا چەند سەبر بگرێ؟ بۆ دوا دەکەوتو بۆ لەجیاتی دەستی بۆلای ئاسمان هەڵبڕی چاوی بڕیبووە زەویەوە؟ باشە خۆشی پێویستی بەپەلە نەبوو، بەلاّم ئەوان بوون کە پەلەیان بوو، ئاخر ئەوان ئەو هەژارانە بوون کە هەموو شتی خۆیان کردبووە فیداو ئێستا زەمانی تەلەف بوون گەیشتبوو.

پەترۆس سوور بووبۆوەو ئارەقاوی گوتی ((مەولای من بڕیار بدە.. هێماییێکمان پێبدە)) کریست بێ جوولە لە شوێنێ وەستابوو چاوەکانی داخستبوو، دڵۆپی درشتی ئارەقەی لەنێوچەواندا هەڵدەڕشت، دەم نادەم بەخۆی دەگوت (خوداوەندا ڕۆژی تۆ لەحاڵی نزیکبوونەوەدایە، کۆتایی دونیا گەیشتووە، دەزانم کە ئەو ڕۆژە دەهێنم، بەلاّم بە مەرگی خۆمان)). بە دووبارەکردنەوەی دەمنادەمی ئەوگفتوگۆیە دەروونیە تووشی شەهامەت دەبوو.

یۆ حەنناش بۆلای ئەو هات، شانی گرتو رایتەکاند تا چاوانی بکاتەوە، گوتی ((ئەگەر ئێستا هێمامان پێ نەدەی، کارمان تەواوە، ئەوەی کە ئەمڕۆکە کردوتە مانای مەرگە، توماس قسەی بوحەنناى بەڕاست زانی گوتی ((بەڵێ کاری تۆ مانای مەرگە، هەر بۆ زانینی بەڕێزتان ئێمە نامانەوێ بمرین))

فیلیپو ناتانیل بەهەراسانییەوە هاواریان کرد ((بمرین؟ وەلێ ئێمە هاتووینەتە ئێرەوە تا حوکمرانییێتی بکەین)).

یۆحەننا سەری لەبنگوێی کریستناو پرسی ((مەولای من بیر لە چی دەکەیتەوە؟ بەلاّم کریست ئەوی لەخۆی بەدوورخستەوە، بەیەهودای گوت ((وەرە ئێرەتەك من))

پشتی بە بازووی بەهێزی ئەودا.

یەهودا بەبنی لێویەوە گوتی ((مەولای من ئازابە، زەمانی موژدەبەخش گەیشتووەو ئێمە نابێ لەپێش ئەوان سەربەرەو ژێر بین))



یاکوب نیگاییێکی نەفرەتباری کردە یەهودا، ئوستاد پێشترێ هەتا ئاوڕی نەدەدایەوە سەیرێکی بکات، ئێستا ئەم دۆستیو قسانە چ مانایاییێکی هەیە بەگوێیا دەچرپێنی؟))

(خەریکن لەگەڵ یەك تەبایی دەکەن، مەتی تۆ شتێ بڵێ))

– من شتێ ناڵێم، گوێ لە کردارو گوفتاری ئێوە دەگرمو دەنووسم، کاری من ئەوەیە. کریست لەپڕێکا هەستی کرد سەری گێژبووەو بازووی یەهودای کوشی، یەهودا ژێر قۆڵی گرتو پرسی (مەولای من ماندووی؟))

– بەڵی ماندووم.

– ڕدێن سوور وەلاّمی دایەوە (بیر لە خودا بکەوە تا شادی خۆت وەدەست بهێنیەوە) کریست پارسەنگی خۆی وەدەست هێنایەوەو رووی لەلای یاوەران کردو گوتی ((باشتر وایە بگەڕێینەوە))

بەلاّم یاوەرەکان لە شوێنی خۆیاندا مانەوە، نەیاندەویست بڕۆن؟ بۆ کوێ؟ دووبارە بۆ بیث ئنیا؟ بۆ چەند کاتێکی دیکە؟ ئەوان ئیدی لەو هاتوچوونەدا کەشەنگ بووبوون.ناتانیل لەسەرەخۆ بەدۆستەکەی خۆی گوت ((وا خەیاڵ دەکەم دەست لە ئێمە دەدات، من یەکێکم کە لە جێوە تەکان ناخۆم))، بەلاّم دوای گوتنی ئەم وشانەی ئێمە بەدوای یاوەرەکانی دیکەوە کەوتەڕێ، چونکە ئەوان بە نابەدڵیەوە بەرەو بیث ئنیا وەڕێکەوتن.

لەدوای ئەوانەوە خزمەتچیەکانی پەرستگاو فەریسیەکان پێدەکەنین، یەکێ لە خزمەتچیە گەنجەکان رووخسارێکی زبرو شانێکی خڕکەڵەی هەبوو پەلکە لیموییێکی تێگرتنو بەرووخساری پەترۆس کەوت.

پەترۆس ویستی بەرپەرچی بداتەوە، بەلاّم ئاندریاس لێنەگەڕاو گوتی (برام سەبرت هەبێ نۆبەتی ئێمەش دێت)

– کەواتە کەی؟ نابینی کەوتووینەتە چ ڕۆژێکەوە؟ یاوەرەکان سەر بەرەوژێر کەوتنە ڕێگاوە، ئاپۆرەکە لەدوای ئەوانەوە، بەجوێن دانەوە، پەرش‌و بڵاوبوونەوە، ئیدی کەسێ بەدوای ئەوانەوە نەبوو کەسێ جلی دڕاوی خۆی لەژێر پێی ئوستاد دانەدەنا.

فیلیپ ئێستاکێ کەرەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا ناتانیلیش کلکی گرتبوو، هەردووکیان بۆ گەڕاندنەوەی ئاژەڵەکە بۆ خاوەنەکەی لە پەلەدابوون تا نەکەونە دەردەسەریەوە، ئاگر لە ئاسمان دەباری‌و باییەکی گەرم هەڵیدەکرد، تۆزو گەردێکی چڕ هەڵدەستاو لەگەروویان دەنیشتەوە. کە گەیشتنە نزیك بیث ئنیا، باراباسیان لەگەڵ دوو کەس لە یارانی کێوی‌و سمێڵی ئەستووری ئەو لەبەرابەر خۆیاندا بینی.

باراباس هاواری کرد ((ئوستادی خۆت بۆ کوێ دەبەی؟ ئەو کە لە ترسان خۆی پیس کردووە)).

هاوڕێکانی ئەو لەحاڵێکدا کەوتبوونە خەندەوە وەڵامیان دایەوە:

((دەیبەین بۆ زیندووکردنەوە ئیلیازر))

بە گەیشتنیان بەبیث ئنیاو چوونە ناو ماڵ، خاخامی پیریان لەسەرەمەرگدا بینی، ژنان لە دەوریا بە ئارامی‌و بێ جوولە دانیشتبوون‌و سەیری گیاندانی ئەویان دەکرد، ئەوان دەیانزانی کە بۆ زیندووکردنەوەی ئەو هیچیان لەدەست نایێ.

کریست نزیك کەوتەوەو دەستی لەسەر توێڵی پیرەمێرد دانا، خاخام بزەییەکی هاتێ، بەڵام چاوی نەکردەوە.

یاوەران لەناو حەوشەدا بە دەمی تاڵیانەوە دەستەوئەژنۆ دانیشتبوون، هیچیان نەدەگوت.

کریست چاوی بڕیە یەهودا سەری بەنیشانەی بەڕاست زانین تەکاندا.

– یەهودا برام... ساتی موژدەدەبەخش هاتووە ئامادەی؟

– مەولای من دووبارە دەپرسم... بۆمنت هەڵبژاردووە؟



– تۆ دەزانی کە لە هەموویان بەهێزتری، ئەوانی دیکە بەرگە ناگرن، ....

لەگەڵ کیافای کاهینی گەورە قسەت کرد؟

– بەڵێ، دەیەوێ بەکات‌و شوێنەکە بکەوێ.

– پێی بڵێ، شەوی جەژن دوای شامی پوسح، لە- گتسمان- برام یەهود هەوڵدە ئازابە منیش هەوڵدەدەم..

یەهودا سەری تەکانداو بێ ئەوەی قسەیێ بکات، چووە جادەوە تا چاوەڕوانی سەردەرهێنانی مانگ بکات.

سالومەی پیر لە کوڕەکانی پرسی ((لە ئورشەلیم چی روویدا وا بێدەنگن؟))

یاکوب وەڵامی دایەوە ((دایە ئێمە ماڵی خۆمان خستۆتە بەر لافاوەوە)).

–مەولای ئێمە، گەورەیی، ئاوریشمی زێڕچین، تەختی پاشایی، بەڵام ئەو فریوی داین؟

– خانمی پیر سەیری کوڕەکانی کردو دەستی بەیەکدادا، بەڵام هیچ یەك لەوان وەڵامی نەدایەوە.

– مانگ لە قورسی تەواوی خۆی لەپشت پڕ ڕەزەکانەوە خەمگینانە هاتە دەرەوە، دوودڵ، بۆ ساتێ لەپشت- کێوە بڵندەکانەوە- وەستا، سەیری دونیای کرد ئەوکاتە یەکسەر بڕیاری خۆیدا، خۆی هێنایە دەرەوەو دەستی کرد بەسەر هەڵگەڕان، ماڵی ئیلیازر لەگەڵ تەواوی گوند کە وەك بلێیی لە پڕێکا بە دۆی قسل سپی کرابوو درەوشانەوەیێکی سپی گرتەخۆ.

بەدەرکەوتنی سپێدە یاوەرەکان بە دەوری ئوستاد کۆبوونەوە، ئەو قسەیێکی نەکرد، بەڵام سەیری یەك یەکی ئەوانی کرد، بۆ یەکەمجارو دواجار بوو کە دەبینین دەمەدەمی نیوەڕۆ لێوی بەقسە کەوتەوە.

((دۆستان مەیلم لێیە ڕۆژی جەژنی پیرۆز لەگەڵ ئێوە بگێڕم لەڕۆژێکی وادا باوانمان کوچیان کرد، ئەوان کویلەتیان لەدوای خۆیان جێهێشتو چوونە بیابانی ئازادییەوە،

بۆیەکەمین جار لەم جەژنەدا لە کۆیلەتی دێینە دەرەوەو دەچینە نێو ئازادییێکی دیکەوە، ئەوانەی کە گوێی بیستنیان هەیە لێ گەڕێ با ببیستن))

هیچ کەسێ قسەی نەکرد ئەم وشانە نادیاربوون، کۆیلەتی نوێو ئازادی نوێ چ مانایەکیان هەیە؟ ئەوان تێنەدەگەیشتن، دوای چەند ساتێ پەترۆس گوتی ((مەولای من هیچ شتێ تێناگەم. جەژن بەبێ بەرخ ناکرێ، بەرخ لەکێ پەیدا کەین؟))

بزەییێکی تاڵ بەسەر لێوی کریستدا نەخشی بەستا:

((پەترۆس بەرخ ئامادەییە، لەهەمان ئەوساتەدا بەپێی خۆی دەچێتە قوربانگا تا هەژارانی جیهان بتوانن جەژنی نوێ بگێڕن، لەبەر ئەمە دەربارەی بەرخ نیگەران مەبە))

ئیلیازر کە بێدەنگ لەسوچێکەوە دانیشتبوو هەڵسایەوە دەستی ئێسقان ئاسای لەسەر سینە داناو گوتی (مەولای من من بەژیانم قەرزاری تۆم، هەرچییەك بێ دیسان لەتاریکی گۆڕ باشترە لەبەر ئەو من بەرخی جەژنتان بەدیاری بۆ دەهێنم، یەکێ لە دۆستەکانم لەبەرزایی کێودا شوانی دەکات دەچمە سۆراغی ئەوەوە خودا حافیز)) یاوەرەکان بەسەر سامی چاویان بڕیە ئەوەئەوە، ئەو مردووە جولەدارە لەکێ قودرەتی هەڵسانەوەی هەیە لەجێی خۆی بچێ بۆ لای دەرگا؟ هەردوو خوشك بۆلای ئەو رایانکرد تا لێنەگەڕێن بڕوات، بەلاّم ئەوانی وەلاناو گۆچانی گرتە دەستو رۆیشت ئیلیازر بەنێو کۆلاّنەکاندا بۆ پێشەوە دەچوو، لەڕێ ئەودا دەرگاکان دەبوونەوە، ژنان بەوەحشەتو سەرسامیەوە دەهاتنە دەرەوە، کەوتبوونە حیرەتەوە کە ئەو چۆن خۆی بەسەر ئەو پێیە تێرۆگانە پەلکێش دەکاو کەمەری وردنابێ، هەرچەند ئازاری دەکێشا دڵی خۆی دەدایەوەو جارناجار هەوڵیدەدا فیکە لێدا تا نیشانی دات کە لە رابوونەوەی ئەودا هیچ گومانێك لەئارادا نییە، بەلاّم لێوەکانی بەدروستی نەدەگەیشتە یەکتریەوە، لەبەر ئەوە دەستی لەفیکەلێدان هەڵگرت بەسەرو پۆتەلاّکێکی جیدی دەستی کرد بەسەر هەڵگەڕان بەدامێنی کێوەوەو رووی کردە ئاخوڕی مەڕەکانی دۆستی خۆی.



بەلاّم هێشتاکە رێگەی تەی نەکردبوو کە لە پشت پنچکێکی تژی کەسك گوڵدا باراباس هەڵبەزیە دەرەوەو رێی لێ گرت، چەندین رۆژ بوو باراباس چاوەڕوانی ساتێکی وای دەکرد تا ئەو زیندوو بۆوە ئەو نەفرەتیە پێ لە ماڵ دەربهێنێو تەمێی بکات، دەبوایە خەڵك لەدیتنی ئەو بەخاتری هێنانی پەرجوو رابگرێ، کوڕی مێرێ هەر لەو رۆژەوەی کە ئەوی زیندوو کردۆتەوە پەیڕەوانێکی زۆری پەیدا کردووە، لەبەر ئەمە دەبوایە ئیلیازر بگەڕێنێتەوە بۆ گۆڕ تا بۆ هەمیشە رزگار بێ لەشەڕی ئەو، باراباس هاواری کرد (ئاهای راکردووی دۆزەخ خۆشحاڵم کەدەتبینم لەوێ خۆشت رابوارد؟ کامیان باشترە ژیان یا مەرگ؟ ئیلیازر وەلاّمی دایەوە ((شەش لەیەك، نیوەی دوازدە لەوی دی))و دەستی کرد بە سەرهەڵگەڕان بەلاّم باراباس رێی لێگرت)).

– تارمایی ئازیزی من دەبووری، جەژن وادێت من بەرخێکم نییە تا جەژن بگێڕم، ئەمڕۆ سبەینی سوێندم بە خودا خوارد کە لەجێی بەرخ یەکەمین بوونەوەری زیندوو کە لە سەڕێگا دابنێم بیکەم بە قوربانی، باشە ئەوە شانس رووی لەتۆ کردووە، گەردەنت بهێنە پێشەوە، چونکە بۆ خودا سەردەبڕییێت.

ئیلیازر دەستی کردبە هەراو هۆریا، باراباس گەرووی گرت، بەلاّم یەکسەر دووچاری ترس بوو، ئەو شتێکی لەڕادەبەدەر نەرمی کەوتبووە دەست وەکو پەمۆ وابوو، لە پەمۆش نەرمتر وەکو هەوا نینۆکەکانی دەچووە خوارەوەو دەهاتە دەرەوە، بێ ئەوەی دڵۆپێ خوێن ببینێ، لەبەرخۆ گوتی ((لەوانەیە تارمایی بێ رەنگ لەرووخساری خوریکە ئاسای پەڕی، پرسی ((ئازاری هەیە؟ ئیلیازر لەکاتێکا حۆی لە چنگی دەردەهێنا تا راکات وەلاّمی دایەوە: ((نەخێر))

باراباس بە نەڕاندنەوە گوتی ((تەکان مەخۆ)) پرچی سەری گرت، بەلاّم پرچی سەری لەگەڵ پێست لەناو دەستیدا دەمایەوە، کەللەسەری ئیلیازر لە نووری خۆرەتاودا بەڕەنگی سپی مەیلەو زەرد بریقەی دەدایەوە.

باراباس لە کاتێکا دەلەرزی بەزەمزەمەکردنەوە گوتی (نەفرەتت لێ بێ تۆ تارمایی؟))

قۆڵی راستەی ئیلیازری گرتو بە توندی رایتەکاند ((بڵێ من تارماییێکم تا بەرهەڵاڵت کەم)).

بەڵام لەکاتێ کە بازووی راتەکاند، لەبنڕا هاتە دەرەوە، وەحشەت دایگرت، بازووی رزیوی ئەوی هاوێشتە ناو پنچکی گەسك، حاڵی تێکچڕژاو تفی دەکرد، ترس دایگرتبوو مووی لەشی زیت بووبۆوە. دەستی بۆ کێردەکەی برد، دەیویست هەرچەند زووتربێ جێ بەجێی بکاتو رزگاری بێ لەشەڕی ئەو، بەدیقەتەوە پشتی ملی گرتو گەرووی نایە سەر بەردێکەوە، دەستی بەبڕین کرد، هەرچەند کێردی پیا دەکێشا نەدەچووە خوارەوە، وەك بڵێی خوری دەبڕێتەوە، پەنجەی ترس تاویدایە گیانیەوە، لەخۆی پرسی ((واخەریکم سەری جەستەیەك دەبڕم؟)) رەهای کرد دەستی کرد بە شۆڕبوونەوە تا رابکات، بەڵام بینی ئیلیازر هەروا بەڕێدا دەڕوا، لەترسی ئەوەی کە نەبادا هاوڕێی نەفرەتی ئەو دووبارە زیندووی کاتەوە، زاڵ بوو بەسەر ترسی خۆیاو دووبارە ئەوی گرتەوە، بەدەستێکی گەردەنو بەدەستەکەی دیکە پێی ئەوی گرت دەق وەکو ئەو جلە شوراوەی کەبەر لە هەڵواسینی دەیکوشن ئەوی کوشیو بایدا، بەم کارە ئیلیازر بەندبەند لەیەك ترازا لە ناوەندێ بووە دوو نیوە، باراباس هەردوو نیوەی لە پەناپشتی پنچکە گەسکدا شاردەوەو تێی تەقاندو رایکرد، لەژیانی خۆیدا یەکەمین جاربوو ترسابوو، زاتی ئاوڕدانەوەی نەبوو بۆداوە، لەبەرەخۆ کەوتە زەمزەمەوە، ((چەند باش بوو کە دەمتوانی لەکاتی خۆی بگەمە ئورشەلیمو یاکوب بدۆزمەوە، بۆ دەربەندکردنی دێ، تەڵسمێکی بەمن دەدا.

لە هەمان کاتی ئەم سەینو بەینەدا کریست لەماڵی ئیلیازر بەسەر یاوەرانەوە لاربووبۆوە، لە هەوڵی ئەوە دابوو کە پرتەوێك بخاتە زەینی ئەوانەوە تا بە بینینی ئەوەی کە هەرزوو روودەدات هەراسانیان نەکاتو نەبێتە هۆی پەراگەندەییو لێکترازانی ئەوانەوە، بەوانی دەگوت ((من جادەمو مەبەستیش هەم رێنمامو هەم دیدارکار، دەبێ ئێوە هەمووتان باوەڕتان بە من هەبێ هەرچییەك کە دەیبینن هەراسان نەبن، چونکە مەرگ لەمندا رێیەك نییە، دەیبیستن؟)) یەهودا لە حەوشەدا



بەتەنها مابۆوە، کریست دەم نا دەم دەگەڕایەوە تا سەیری بکات، خەمێ کە نادیار بوو بەسەر رووخساریا فراوان دەبوو...

یۆحەننا بەشکاتەوە گوتی ((مەولای من بۆ هەمیشە داوا لەو دەکەی کە لەنزیك تۆدا بوەستێ؟ کەسەیری گلێنەی چاوانی دەکەی چەقۆییێ دەبینی؟)).

کریست وەڵامی دایەوە ((یۆحەننای ئازیز چەقۆ نا... یەك خاچ.. یاوەران بەشڵەژانەوە سەیری یەکتریان کرد)).

یۆحەننا خۆی هاویشتە باوەشی کریستو گوتی ((خاچ؟ مەولای من، چ کەسێ لە خاچ دەدرێ؟)).

-هەرکەسێ بەسەر ئەو چاوانە لاربێتەوە رووخساری خۆی بەسەر خاچەوە دەبینێ.. من سەیرم کردو رووخساری خۆم بینی!)) بەڵام یاوەران تێنەگەیشتن، ژمارەییێ لەوان کەوتنە پێکەنینەوە توماس گوتی ((باش بوو بە ئێمەت گوت تا ئەو جێیەی کە پەیوەستە بەمن تا زیندووم هیچ کاتێ سەیری چاوەکانی ردێن سوور ناکەم)).

کریست گوتی ((تۆماس منالۆ نەوەکانت سەیری دەکەن)) لەپەنجەرەوە چاوی بڕیە یەهودا کە هێشتا لەکەنار دەرگاوە وەستابوو سەیری ئورشەلیمی دەکرد، مەتی بەشکاتەوە گوتی ((مەولای من گوفتاری تۆ ئاڵۆزە چۆن چاوەڕوان دەکەی کە لەکتێبدا بیاننوسمەوە..؟)) ئەو قەڵەمی خۆی لەهەوادا گرتبوو، توانای تێگەیشتنو نووسینی نەبوو.

کریست بە تفتو تاڵیەوە گوتی ((مەتی من بۆ خاتری نووسینی تۆ قسە ناکەم، چەند باشیان گوتووە کەئێوەی نووسەران لە کەلەشێر دەچن، واخەیاڵ دەکەن ئەگەر بانگ نەدەن هەتاو نایەتە دەرەوە، دڵم دەخوازێ کە قەڵەمو کاغەزی تۆ بگرمو بیانهاوێمە ناو ئاگرەوە)) مەتی بەخێرایی نووسینەکانی کۆکردەوەو دوورکەوتەوە تووڕەیی کریست نەنیشتەوە ((من یەك شت دەڵێمو تۆ شتێکی دیکە دەنووسی))

تازە ئەوانەی کە نووسینی تۆ دەخوێننەوە تێدەگەن، من دەڵێم، خاچ، مەرگ، مەلەکوتی ئاسمان، خودا، .. ئێوە چی وەردەگرن؟ هەریەك لە ئێوە رەنجو سوودو

هیوای خۆی بەهەریەك لەو وشە پیرۆزانەوە دەچەسپێنیّو وشەکانی من ون دەبنو رۆحم گومو گۆڕ دەکەن، ئیدی بەرگەی ناگرم)). بەحاڵەتێکی داخورپانەوە هەڵسایەوە، لەپڕێکا هەستی کرد کە دڵو مێشکی پڕ لە وردە بەرد بووە. یاوەرەکان لە ترسان دوولا بوونەوە، وەك بڵێی ئوستاد هێشتا سیخورمەی لە دەستدایەو لەوانی دەباتە خوارەوە، وەك چەند گایێکی تەمبەڵ وابوون کە غەزری بوون، دونیا گاسنێك بوو کە پێیەوە شەتەك درابوونو کریست سیخورمەی لیّ دەژەنین تا لەژێر کۆپەلاّندا جێبەجیّ دەبوون، بەلاّم بۆ پێشەوە نەدەڕۆیشتن، کریست بەسەیرکردنی ئەوانەوە، هەستی کرد سەرچاوەی پایەداری وشك بووەو ڕێی نێوان زەویو ئاسمان ڕێگایێکی درێژ بوو ئەوان بەبیّ جولە لە جێوە وەستابوون.

هاواری کرد ((مەگەر تاکەی ئێوە من لەکەنار خۆتان دەهێڵنەوە؟ لەئێوە، ئەوانەی کە پرسیاری بەڕاستیان لە ئەنباری سینەدا پەلەکەن بپرسن وا کە قسەی میهر ئامێزتان بۆ گوتن بەمن هەیە، هەرچەند زووترە پێم بڵێنو دڵشادم بکەن، تا ئەوکاتە کەلەمیانی ئێوەدا ڕۆیشتم، حەسرەتی لەدەستدانی هەلی زیاترە گوتنی میهرئامێز بەمن نەخۆنو خۆتان سەرزەنشت نەکەن کە نەتانتوانی پلەی خۆشەویستی خۆتان سەبارەت بەمن ئاشکرا بکەن، ئەوکاتە زۆرو درەنگ دەبیّ، کار لە کار ترازاوە)).

ژنان کە لەگۆشەیەکا مات بوو بوونو چەنەگەیان خستبووە ئەژنۆ، گوێیان قولاّغ کردبوو، جارناجار ئاخیان هەڵدەکێشا، لە هەموو شت تێدەگەیشتن، بەلاّم نەیاندەتوانی شتێك بڵێن، لە پڕێکا مەجدەلیە هاوارێکی لیّ هەڵسا، یەکەمین کەسیّ بوو کە روودانی مەرگی مەعبودی خۆی بەڕانی دڵی بووبوو، لە جێوە هەستایەوەو چووە ژووری نێوانەوە، ژێر سەرینی خۆی گەڕا، عەتردانێکی کەلەگەتیّ خۆی هێنابوو، دۆزیەوە، عەتردان پڕ لە عەتری عەرەبی بوو کەیەکیّ لە بەدکارەکانی پێشوو بەوی دابوو، بۆ هەر شوێنیّ کە بەدوای کریستدا دەڕۆیشت.. لەگەڵ خۆیا دەیبردو لەبەرخۆ دەیگوت: ((خودا گەورەیە خەڵکی چ دەزانن رەنگە رۆژیّ بێت کە پرچی سەری مەعبودی خۆم بەم عەترە گرانبەهایە بشۆم کە رەنگە ئەو رۆژە بیّ کە ئەو بەناونیشانی زاوا لە کەنارما قەرار بگریّ)). ئارەزووی شاردراوەی دڵی وابوو، بەلاّم



ئێستاکیّ لەپشت جەستەی مەعبودی مەرگی دەبینی، نەك ئەشق، بەڵکو مەرگ، مەرگیش وەکو زەماوەند پێویستی بە عەتریات هەیە، عەتردانی لەژێر سەرین هێنایە دەرەوەو نایە ناو سینەیەوەو دەستی بەگریان کرد، لەکاتێکدا عەتردانی نابووە سەر مەمکەکانیو وەك مندالّی ناو لانك رایدەژاند لەسەر خۆ دەگریا تا ئەوانی دیکە گوییان لە دەنگی نەبیّ، ئەوکاتە ئەشکی چاوەکانی سڕیەوە، هاتە دەرەوەو کەوتە سەر پێی کریست بەر لەوەی کە کریست بتوانیّ بەسەر پێیەکانیەوە بەرزی کاتەوە مەجدەلیە عەتردانی شکاندو عەتری گرانبەهای رژایە سەر پێیەکانی کریست پاشان لەکاتێکا دەگریا، کەزیەکانی کردەوە پێیەکانی بەعەتر شوشتو پاك کردەوە، بەو عەترەی کەمابوو سەری مەعبودی خۆی شوشت بەبیّ درەنگ دووبارە کەوتە سەر پێیەکانیو کەوتە ماچ کردنیان، یاوەرەکان هەڵدەقرچان.

تۆماسی دێوەرە گوتی ((حەرامکردنی ئەم هەموو عەترە مایەی شەرمە، ئەگەر بفرۆشتایە دەمتوانی هەژاران تێر بکەمو خۆراکیان پیّ بدەم)).

ناتانیل گوتی ((دەمانتوانی بۆ کچانی بیّ باوك جیهاز بکڕین)).

فیلیپ گوتی ((دەمانتوانی مەڕ بکڕین)).

یۆحەننا بەو ئاخ هەڵکێشانەوە زەمزەمەی کرد ((ئەوا نیشانەیێکی بەدە بە عەترێکی وا جەستەی دەوڵەمەندان چەور دەکریّ، مێریّ تۆ نەدەبوایە ئەم کارە بکەی، ئەگەر مەرگ عەتری دڵخوازی خۆی بۆنبکاو بیّ)).

کریست بزەییێکی کردو گوتی ((ئێوە هەمیشە هەژارانتان لەگەڵ دەبیّ، بەلاّم من هەمیشە لەگەڵتان نابم...لەبەر ئەمە باکی نییە ئەگەر شوشە عەتریّ بەخاتری من حەرام بێت، جارجار روودەدا کە هەتا- زێدە مەسرەفەکانیش دەچنە ئاسمانو لەکەنار خوشکی (نەجابەت) دادەنیشیّ، بەس تۆ یۆحەننای ئازیز دڵگران مەبە مەرگ هەمیشە دێت کەواتە باشتر وایە لەکاتی عەتراوی بوونی قژی سەر بێت)).

مال بۆنی عەتراوی ئارامگای مرۆڤێکی دەوڵەمەندی لێدەهات، یەهودا بەدیارکەوتو سەیری ئوستادی کرد، نەکا رازەکەی بۆ یاوەران ئاشکرا کردبێ؟ ئایا کەی سەرپەرشتیاری مەرگ بەکافور چەور دەکەن؟

بەلاّم کریست بزەییێکی کردو گوتی ((برام یەهودا هەلّفڕینی پەرەسێلکە لە هەوادا خێراترە لەڕاکردنی مامز لەزەویدا، خێراتر لە پەرسێلکە هەلّفڕینی زەینی مرۆڤە، خێراتر لەزەینی مرۆڤ هەلّفڕینی دلّی ژنە)) بەتەواوکردنی قسەی خۆی بە جولەی چاو مەجدەلیەی پیشاندا.

پەترۆس لێوی بەقسە کردەوە ((ئێمە دەربارەی زۆر شت قسەمان کرد، بەلاّم لە هەمووی گرینگترمان لەبیرچوو، مەولای من، رێوڕەسمی جەژن لە کێندەرێی ئورشەلیم بەجێ دەگەیەنین؟ من دەلّێم بچینە مەیخانەی سیمونەوە))

کریست گوتی ((خوداوەند شتێکی دیکەی بۆ ئەمە داناوە، پەترۆس هەلّسەوەو لەگەلّ یۆحەننا بڕۆنە ئورشەلیم لەوێ پیاوێکی گۆزەبەشان دەبینن لەدوای بڕۆن دەچێتە مالّێکەوە ئێوە بچنە ژوورەوەو بلّێن ((ئوستاد سەلامی هەیەو داوا لە ئێوە دەکات کە بلّێن سفرەی رێوڕەسمی جەژن لەکوێ راخستراوە)) تا من لەگەلّ یاوەرانی خۆم شامێ بخۆین؟)) ئەویش وەلاّم دەداتەوە کە —سەلاّوی من بە ئوستاد بگەیەنن، هەموو شتێ ئامادەیە لە چاوەڕوانی دیداری ئەوین)).

یاوەران وەکو منالاّن بەشەوقو سەرسامی سەیری یەکتریان کرد.

پەترۆس پرسی ((مەولای من بەڕاستیتە؟ یانی هەموو شتێ ئامادەیە؟ بەرخو شیشەو شەرابو هەموو شتێ؟))

کریست وەلاّمی دایەوە ((هەموو شتێ، بڕۆنو باوەڕتان هەبێ، وا لێرە دانیشتووینو قسە دەکەین، بەلاّم خوداوەند نەدادەنیشێو نەقسە دەکا ئەو بۆمرۆڤ کاردەکات. لەهەمان ساتدا دەنگی نالّەییێکی کز لە گۆشەی پشتەوەی ژووردا گەیشتە گوێیان، هەموویان شەرمناك ئاوڕیان دایەوە، لەتەواوی ئەو ماوەیەدا خاخامی پیریان لە



ئازاری مەرگی خۆی فەرامۆش کردبوو، مەجدەلیە لەگەلّ سێ ژن بەپەلە ئامادەی سەرینی ئەوبوون.

یاوەرانیش چوونە سەرینیەوە، کریست دووبارە دەستی نایە سەر دەمی ساردی پیرەمێرد، پیرەمێرد چاوی کردەوەو بەدیتنی ئەو بزەییێکی کرد، ئەوکاتە بەهێمای دەست داوای لەژنانو پیاوان کرد تا ئەوو کریست بەتەنها جێ بهێلّن کاتی تەنها بوون، کریست لاربۆوە دەمو توێلّو چاوی ئەوی ماچ کرد.

پیرەمێردی بەرووخسارێکی دەروشاوە دیتو چاوی بڕیە چاوی کریستەوە.

- من ئەلیاسو موساو تۆم دووبارە دیت، ئێستە دلّنیام.. من وادەڕۆم

- باوکە خوداوەند لەتۆ رازی بێ، ئایا رازیت؟

- بەلّێ لێگەڕێ دەستت ماچ کەم.

دەستی کریستی گرتو ماوەییێکی درێژ لێوی ساردی خۆی بەسەریا چەسپاند لەحالّی جەزبەدا بەخامۆشی سەیری ئەوی کردو مالاّوایی کرد، بەلاّم، یەکسەر لێوی بەقسە کردەوە

- تۆ کەی دەچیە ئەو بالاّیەوە؟.

- بەیانی.. لەڕۆژی جەژن باوکە بە ئومێدی دیدار تا سبەی.

خاخامی پیر دەستەکانی خۆی خاچ ئاسا بەسەر یەکەوە دانا، بەژێر لێویەوە گوتی ((خودایە، گیانی ئەو بەندەی خۆت بسەنەوە چاوەکانم بەدیداری رزگارکەری خۆم رووناك بۆوە)).

# بیستو هەشتەم

خۆرەتاو گەیشتبووە ئاسۆ، بەتیشکی درەوشاوەی سوور خەریکی ئاوابوون بوو، لەخۆرهەلاتی ئاسمان، نوورێکی سیم ئاسا بەدیارکەوت، هەرزوو مانگی گەورەو خامۆشی جەژن دەهاتە دەرەوە، تیشکی کەم ڕەنگی خۆرەتاو هێشتا لەناو مالەوەی دەدا، دەکەوتە سەر رووخساری ناسکی کریستەوەو لەوێ توێلو لووتو دەستەکانی یاوەرانی دەگرتە خۆ، ئەوکاتە بەرەو پێشەوەچوونی بۆ سووچی ژوور رووخساری ئارامو شادومانو ئێستای جاویدانی خاخامی پیری دەلاوانەوە. مێرێ لەکەنار کارگەی رستندا دانیشتبوو لە سێبەری قوولی کەسێ کە فرمێسکەکانی ئەوی هێدی هێدی لە گوێو چەنەگەی سەرەوژێر دەبۆوەو دەکەوتە سەر پارچە نیوە ڕێستراوەکەدا، مالێ هێشتا بۆنی عەتری دەداو عەتر لە پەنجەکانی کریستدا دەچکایەوە.

لەپڕێکا لە هەمانکاتدا کە ئەوان لە بێدەنگیدا دانیشتبوونو هەریەك لەوان بەهاتنی شەو دڵ پەرێشانتردەبوون، پەرەسێلکەیێ، وەك چۆن وەشانی توندی شمشێری لە پەنجەرە هاتە ژوورەوەو سێ جاران بەدەوری سەریاندا سووڕاو بەشادومانی جیکەجیکی کرد، سەرلەنوێ بەرەو خۆرەتاو گەڕایەوەو وەکو تیر چووە دەرەوە، ئەوان هەتا هەلی دیتنی سگی سپیو بالی ددانەیی ئەویان نەبینی.

کریست وەك بلێی لە چاوەڕوانی هەمان نیشانەی سیمبولئامێزدا دانیشتبوو هەلسایەوەو گوتی ((زەمانی موژدەبەخش هاتووە)) سەیرێکی درەنگاوی کردە ژوورو کەلوپەلی کارو مالو مەشخەلو گۆزەی ئاوو سنتەکی رستن. ئەوکاتە هەر چوار



ژنیش، دواجار پیرەمێرد، کە ئەوسا پەیوەندی بەژیانی جاویدانەوە کردبوو، لەکاتێکا دەستەکانی رادەتەکاند گوتی : ((خوا ئاگادارت بێ))

هەرسێ ژنی جحێل قودرەتی وەلامدانەوەیان نەبوو، بەلام سالومەی پیر گوتی ((کوڕم بەمجۆرە سەیری ئێمە مەکە، بەشێوەیێ خوداحافیزی دەکەی وەك بلێی بۆ هەمیشە تۆ نابینینەوە))

کریست دووبارە گوتی خودا ئاگادارتان بێ، چووە نزیك ژنەکانەوە سەرەتا دەستی بەکەزی مەجدەلیەدا هێناو ئینجا مارتا، مێرێیش هاتە پێشەوەو سەری لارکردەوە هەستیان دەکرد وەك بلێی پیرۆزی دەکردنو لەباوەشی دەگرتن، هەرسێ نەفەریان بۆ ئەبەد لەگەل خۆیاندا دەبرد، وەلێ هەرسێ نەفەر لەپڕێکا کەوتنە چرپینی سەردولکەی پرسەوە، چوونە حەوشەوە، یاوەرەکانیش بە دوای کریستدا چوونە حەوشەوە، لەشیرازەی حەوشەکەدا لەبەرزایی بیرە ئاودا گولە لاولاوێ شکۆفەی کردبوو، ئێستا بە بوونەوەی بالی ئەو بۆنی عەتری ئەم گولە لە هەوادا پێچی دەخواردەوە، کریست دەستی بۆ پێش بردو گولێکی چنیو نایە نێو ددانەکانیەوە، لە دلی خۆیدا دوعاییێکی ئاوای کرد ((ئومێدەوارم لە خوداوە پایەداری بەمن ببەخشێ، ئومێدەوارم لە خودا توانابیم پێ ببەخشێ تا ئەم گولە نەرمە لەکاتی ئازاری گەورەی لە خاچدان لەمیانی ددانەکانم راگرمو بەددانم نەیکوشم!)) جارێکی دی لە ئاستانەی دەرگادا وەستا، دەستی بەرزکردەوەو بەدەنگێکی قوول هاواری کرد ((ژنان، خوداحافیز)) هیچ یەك لە ژنەکان وەلامیان نەدایەوە، لەگەل یەك جادەی ئورشەلیمیان گرتەبەر، قورسی تەواوی مانگ لە کێوەکانی (موئاب)دا سەرهەلگەڕاو خۆرەتاو لە پشت کێوەکانی (یەهودیە) نیشتەوە. بۆ ساتێ ئەو دوو گەوهەرە مەزنەی ئاسمان وەستانو سەیری یەکتریان کرد ئەو کاتە یەکێکیان دابەزیو ئەویدیکە رۆچوو.

کریست بەسەری خۆی هێمای بۆ یەهودا کرد، یەهودا هاتو لە کەناریا دەستی بە پێشڕەوی کرد، دەبێ چەند رازێکیان لەگەل یەك گۆڕیبێتەوە، چونکە لەسەرخۆ قسەیان دەکرد، جارێ کریست سەری لاردەکردەوەو جارێ یەهودا هەر یەکێکیان ئەو وشانەیان بۆ وەلام دانەوە بەدیقەت هەلدەسەنگاند، وەك بلێی هەر وشەیێ پارچە زێڕێ بێ.

کریست گوتی ((برام یەهودا، بەداخەوە، بەلاّم ئەوکارە پێوستە))

–مەولای من پێشتریش لەتۆم پرسیوە، ئایا ڕێگاییێکی دیکە هەیە!؟.

–نا برام یەهودا من تائێستا دلّم بەهاتنی کریستیانو بەستاوەتەوەو لە چاوەڕوانی ئەودام، بەلاّم بێهودە بوو، نا هیچ ڕێگاییێکی دیکە نییە، کۆتایی دونیا هاتووە، ئەم دونیایە مەلەکوتی ئیبلیسە، لەبێن دەچێت‌و مەلەکوتی ئاسمان بەدیاردەکەوێ، من دەیهێنم، چۆن؟ بەمردن، هیچ ڕێگەییێکی دیکە نییە برام یەهودا، مەلەرزە لەماوەی سێ ڕۆژدا دووبارە زیندوو دەبمەوە.

–ئەوە لەبەر ئەمە دەلّێی نا تا دلّی من بدەیتەوەو نا چارم بکەی تا ئاشکرات بکەم بێ ئەوەی لەدلّی خۆمدا رازی بم، تۆ دەلّێی بەرگە دەگری تا پایەداری بەمن ببەخشی، نا بەنزیکتر کەوتنەوەی ئەم ساتە سەرسامە.. نە مەولای من بەرگەی ئەم شتە ناگرم.

برام یەهودا، بەرگە دەگریت، خوداوەند لەبەرابەر توانابییت پایەداریت پێ دەبەخشێ، چونکە پێویستە، بەلێ ئەوە بۆ من پێویستە کە بمرم، بۆ تۆش پێویستە کە من ئاشکرا بکەی ئێمە دوو نەفەر دونیا رزگار دەکەین... کۆمەکم بکە. یەهودا سەری لەبەرخۆنا، دوای ساتێ پرسی ((ئەگەر تۆ لە جێی من بای کە دەبێ مامۆستای خۆت ئاشکرا بکەی ئەم کارەت دەکرد؟))

کریست بۆ ماوەییێکی درێژ لە ئەندێشەدا رووچوو، لە ئەنجامدا گوتی (خەیالّ ناکەم هێزی ئەم کارەم هەبێ لەبەر ئەمە بوو خوداوەند دلۆڤانی بەمن کرد، وەزیفەییێکی سادەتر واتە لەخاچدانمی بەمن بەخشی)) ئەوکاتە بازووی یەهودای گرت‌و بەئارام‌و تاسوقەوە لەگەلّیا قسەی کردو گوتی ((بەتەنها جێم مەهێلّە یارمەتیم بدە لەگەلّ کیافای کاینی گەورە قسەت نەکرد؟ غولاّمانی پەرستگا کە دەستگیرم دەکەن مەگەر ئامادەو چەکدار نین؟ مەگەر تەواوی ئەوەی کە نەخەشەمان بۆ دانا روونەداوە؟ لەبەر ئەمە باشتر وایە هەموو بەیەکەوە ئەمشەو جەژن بگێڕین، من هێما بە تۆ دەدەم کە بڕۆیت بیانهێنی، ڕۆژانی تاریم تەنها سێ ڕۆژە، ئەم سێ ڕۆژە بەخێرایی بروسك رەت دەبێ‌و لە ڕۆژی سێیەم لەکاتی رابواردندا هەموو دەکەوینە سەماو هەلّپەڕکێوە))



یەهودا بەهێمای دەست بەگروپی یاوەران کە لەدواوە دەهاتن پرسی ((ئایا ئەوانیش لەم بابەتە ئاگادار دەکرێنەوە؟))

– ئەم شەو بەوان دەلّێم، کاتێ سەربازو خزمەتچییەکانی پەرستگا دەستگیرم دەکەن نامەوێ هیچ جۆرە بەرگرییەك پیشان بدەن یەهودا بەنەفرەتەوە بڕۆی تێکهەلّکشاند ((ئەوان بەرگری دەکەن! بەڕاستی تۆ ئەوانەت لە کوێ هێناوە؟ یەکیان لەوی تر بەدترە.)

کریست سەری لەبەرخۆ ناو وەلاّمی نەدایەوە.

مانگ هەلّپڕژایە سەر زەوی‌و لەشی بەردو درەخت‌و مرۆڤەکانی چەورکرد، سێبەری شینی تاریك کەوتە سەرخاك، یاوەران لەدواوەڕا دەهاتن، گفتوگۆیان دەکردو ژمارەیێ بە یادەوەری میوندارێتی شام لچ‌و لێوی خۆیان دەلستەوە، هەندێکیان دەربارەی وشە تیژەکانی کریست قسەیان دەکردو تۆماس کەوتە یادی خاخامی پیری بێچارە ((ئەو کاری تەواو بوو ئێستا نۆبەتی ئێمەیە))

ناتانیل بەسەر سامیەوە گوتی ((مەگەر ئێمەش دەمرین. مەگەر نەمانگوت بەرەو جاویدانەیی دەڕۆین؟))

پەترۆس بۆ ئەو بەمجۆرە روونی کردەوە ((دروستە، بەلاّم وادێتە بەرچاو کە سەرەتا دەبێ بەڕێگای مەرگدا بڕۆین، ناتانیل سەری تەکانداو بەزەمزەمەکردنەوە گوتی: ڕێگاییێکی خراپمان بۆ جاویدانەیی گرتووە، ئەوەت لەمنەوە لا بێ کە لەم خوارەوە لە دۆزەخ حیسابی گرفتار دەبین))

ئورشەلیم سپی‌و ڕۆشن وەك چۆن تارماییێ، ئێستاکێ غەرق لەنووری مانگ لەبەر رووی ئەوانەوە سەری قیت کردۆتەوە، وا بەدیار دەکەوت کەلەژێر نووری مانگدا مالّەکان لەیەك بوونەتەوەو بەهەلّواسراوی بەسەر زەویەوە قەراریان گرتووە، هەوێرێ لە هاواری سروودچڕینی مرۆڤەکان‌و سەدای ئاژەلاّن لەکاتی قوربانی، ئێستاکێ لە دەروونی شەودا دەنگی دەدایەوە.

پەترۆسو یۆحەننا لە دەروازەی خۆرهەڵاتدا لە چاوەڕوانی دا وەستابوون، رووخساریان لەژێر نووری مانگدا بریقەیان دەدایەوە. بەخۆشحاڵیەوە پەلەیان کردە پێشوازی ئوستادەوە

– ئوستاد هەموو شتێك وەکو قسەی تۆ هاتە ئاراوە، سفرە راخستراوەو شام ئامادەیە، یۆحەننا بەخەندەوە پێداچوو گوتی ((لەحاڵی خاوەن ماڵیش دڵنیابە هەموو شتێکی ئامادەکردووەو ون بووە))

– کریست بە بزەوە گوتی ((ئەوپەڕی میواندارییێتی ئا وەهایە کە خاوەن مێوان ئامادەنەبێ))

بەم گفتوگۆیەوە هەموو پێیان توندتر هەڵهێنا، بوارەکان پڕ لە مرۆڤو فانۆسی روونـاکو سەوزبوو، سروودی جەژنی پیرۆزمەندانە لەپشت دەرگا داخراوەکاندا دەنگی دەدایەوە:

لەوکاتەدا کە سراییلیەکان لە میسر هاتنە دەرەوە
لەوکاتە کە ماڵی یاکوب لە چنگی وەحشیان رزگاری بوو
دەریا ئەوەی دیتو رایکرد
ڕووباری ئوردن پاشەکشەی کرد
کێوەکان بەران ئاسا رایانکرد
گرۆدلکەکان هەروەك بەرخ
ئەی دەریا ... چی ئازاری دای کە بترسی؟
ئەی ئوردن چیت بەسەرهات کە پاشەکشەت کرد ؟
ئەی کێوەکان تۆ بە سەر چی وەك مەڕ رمای
ئەی زەوی لەبەرابەر خوداوەند، خوداوەندی سراییل بلەرزە
هەموان کە بەهێمای سەری ئەنگوست
تاوێرەبەردی لە دەریاچە تاواندەوە
بەردی غاراش کانی فێنك.



یاوەران لەکاتی تێپەڕین سروودی جەژنیان دەچڕی، پەترۆسو یۆحەننا بۆ پێش دەچوون، ئەوانیان رێنمایی دەکرد، لەڕێگادا هەوڵیانداو چوونە ژوورەوە، کریستو دەستە برسیەکە لەدوای یەك ڕەت بوون لەحەوشە بەسەر پەیژە بەردینەکانەوە بۆ ماڵەکە سەرکەوتن، سفرە راخسترابوو، سێ دانە قەندیلۆکەی حەوت سەرە بەسەر بوو، شەراب، نانی تیریو هەتا ئەو گۆچانانەی کە لەکاتی نان خواردندا دەبووا لە دەست بگرن هەمووی لێ بوو، روناهی هەڵدەپڕژا وەك بلێی ئەوان ئامادەی چوون بن بەرەو سفرەی درێژەوە.

کریست گوتی ((بەدیداری ئێوە خۆشحاڵم))و دەستی هەڵگرتو خاوەن میوانی نادیاری پیرۆز کرد.

یاوەرەکان کەوتنە خەندەوە ((مەولا لەگەڵ کێ قسەو هەواڵپرسی دەکەی؟)) کریست وەڵامی دایەوە ((لەگەڵ نادیارێ)) نیگاییێکی توندی کردە ئەوانەوە، ئەوکاتە کەمەربەندێکی گەورەی لەپشت کردوو ئاوی گرتە دەست ئەژنۆی داو دەستی کرد بە شوشتنی پێی یاوەرەکانی.

پەترۆس هاواری کرد ((مەولای من، ئەو مۆڵەتە هەرگیز بەخۆم نادەم کە تۆ پێم بشۆیت)).

– پەترۆس، ئەگەر من پێت نەشۆم لەمەلەکوتی ئاسمان ناگەیتە من.

– کەواتە لەم حاڵەتەوە نەتەنها پێ، بەڵکو دەستو سەریشم بشۆ.

پاشان هەموویان چوونە سەر سفرە، لەبرسان خەریك بوو وێران دەبوون، بەڵام هیچ یەك لەوان زاتی نەدەکرد بۆ خۆراکەکە دەست درێژ بکات.

– ئەم شەو رووخساری ئوستاد گیرابوو لێوەکانی تەڵخ بوون، سەیری رووخساری یەکەیەکەی یارو یاوەرانی خۆی کردو گوتی ((سەرەتا دەبێ خێواو بخۆینەوە تا ئەو گریانەمان بەبیربهێنیتەوە کەباوانمان هەڵیانپڕژاندە سەر زەوی))

– کریست تونگە ئاوی خوێی گرت، سەرەتا پیاڵەی یەهودای پڕ کرد، ئەوکاتە چەند قومێکی دیکەی هەڵڕشتە پیاڵەکانی یاوەرانو لەکۆتاییدا پیاڵەی خۆی پڕکردو گوتی ((بەیادی فرمێسکەکان، بەیادی ئەو دەردو ڕەنجەی کە مرۆڤ لە پێناوی ئازادیدا بەرگەی دەگرێ)) بەیەکجار پیاڵەی خۆیان هەڵقوڕاند بەرووخساری تێکچڕژاو بەشی خۆیان خواردەوە، یەهودا وەکو کریست پیاڵەی خۆی بەیەکجار هەڵقوڕاند، بە ئوستادی نیشانی داو سەرەو بنی دانایە سەرزەوی، هەتا یەك قەترەشی نەمایەوە.

– کریست بەبزەییێکەوە گوتی ((تۆ جەنگاوەرێکی بێ باکی، هەتا دەتوانی بەرگەی گەزەندەترین تفتو تاڵی بگری)). ئەوکاتە نانی تیری گرتو دابەشی کرد، پاشان کەوتە دابەشکردنی بەرخەکە، هەموویان بەشی خۆیان لەسەوزەی وشکەبووە توندو تیژەکانی لە جۆری نەعناعو پونگی کێوی کە ڕێباز داینابوو وەرگرت. ئەوکاتە کایەی قورمزی خۆراکیان بەیادی ئەو خشتە قورمزیانەی کە باوانیان لەکاتی دیلیەتیدا دروستیان کردبوو هەڵڕشتە سەر خۆراکەوە، بەپێی دەستووری ڕێباز بەپەلە خۆراکیان خواردو هەریەکەیان بە دەستێکەوە بە سەر گۆچانو بەرزکردنەوەی پێیەکیان لەهەوا ئامادەی ڕۆیشتن بوون.

– کریست خۆی نەیدەخواردو سەیری خۆراكو خواردنی ئەوانی دەکرد، ئەویش دەستی دانایە سەر گۆچانو ئامادەی سەفەری گەورەبوو، هیچ کەس قسەی نەدەکرد، دەنگێ جگە لە وێککەوتنی گەرووەکانو زرینگەی پیاڵەو تەقەتەقی زمان لەکاتی ددان هەڵکێشانی ئێسقانەکان هیچی دیکە نەبوو.

– مانگ لە کلاوڕۆژنەی بنمیچەوە درەوشایەوە، نیوەی سفرە نوقمی ڕۆشنایی بوو نیوەکەی دیکە لەتاریکی بنەوشەیی رووچوو بوو.

– دوای بێدەنگییێکی قووڵ کریست لێوی بەقسە کردەوە ((هاوسەفەرانی بەوەفای من جەژنی فیتر واتە رەت بوون، رەت بوون لەتاریکی، لەتاریکی بەرەو نوور، لەکۆیلەتی بۆ ئازادی، بەلاّم جەژنێ کە ئەمشەو گێڕامان، لەوەش زیاتر دەڕوات، جەژنی ئەمشەو بەمانای رەت بوون لەمەرگ بەرەو ژیانی ئەبەدییە، یاران، من لە پێشدا دەڕۆمو ڕێگە بۆ ئێوە خۆشدەکەم)) پەترۆس بەلەرزینی ئەندامەکانیەوە گوتی ((مەولای من دووبارە



دەربارەی مەرگ قسە دەکەی، وشەکانت لەتیغی دوو دەم دەچێ، وەکو ئەوەی کە قەرارە موسیبەتێکت بەسەربێ ئازادانە بڵێ ئێمە مەردین)) یۆحەننا گوتی ((دروستە، مەولای من وشەکانت تاڵترە لەسەوزە تالاّنەوە دلۆڤانیمان پێ ببەخشەو ڕۆشنتر قسە بکە))

– کریست بەشە نانی خۆی دابەش کردە سەر ژمارەی یاوەرەکانو پێی دانو گوتی: ((ئەوە بگرنو بخۆن ئەوە خوێنی منە. هەریەکەیان بەشە نانو شەرابی خۆی خواردو خواردەوە، زەینیان کەوتە گێژەنەوە، شەرابەکە لەبەرچاویان توندو شوور بوو وەکو خوێن دەهاتە بەرچاو نانەکەش وەك رەژوویێکی سووتێنەر بۆ ناو گەدەیان دەچووە خوارەوە. لەپڕێکا بەوەحشەتەوە هەستیان کرد کریست لە دەروونی ئەواندا رەگاژۆ دەبێ دەستی کرد بە خواردنی گەدەو هەناوی ئەوان، پەترۆس قۆڵنجی نایە سەر سفرەو دەستی بەگریان کرد. یۆحەننا سەری بەسینەی کریست کرد ((مەولای من تۆ دەتەوێ کۆچ بکەیت تۆ دەتەوێ بڕۆیت... بڕۆیت)) ئەو چەند وشەیەی دووبارە دەکردەوە زیاتر لەوە نەیدەتوانی قسە بکات.

– ئاندریاس هاواری کرد ((تۆ بۆ هیچ شوێنێ ناڕۆی چەند رۆژی پێشتر خۆت گوتت کە ((ئەوەی چەکی نییە باشتر وایە جلی خۆی بفرۆشێو چەکێ بکڕێ)) ئێمە جلمان دەفرۆشینو خۆمان چەکدار دەکەینو ئەوکاتە ئەگەر مەرگ زاتی هەیە بابێو دەست لەتۆ دات.

– کریست بە ئاوازێکی نابەڵەوە گوتی ((هەموو ئێوە من بەتەنها جێدەهێڵن... هەموو)). پەترۆس بە بەسڕینەوەی فرمێسکەکانی خۆی هاواری کرد ((من هیچ کاتێ تۆ بەتەنها جێناهێڵم))

– پەترۆس بەر لەوەی کەلەشێر بانگ بدا سێ جاران ئینکاری من دەکەی.

– پەترۆس لەحاڵێکا بەمشت لەسینەی خۆی دەدا هاواری کرد ((من؟ من؟ من؟ منو ئینکاری تۆ؟ من تا دەمی مەرگ لەگەڵ تۆم))

– یاوەران بەئاهو فیغانو نهێنییەوە هەڵسانەوە سەرپێ (( تا دەمی مەرگ لەگەڵ تۆین))، کریست بەئارامی گوتی ((دانیشن هێشتا ساتی موژدەبەش نەهاتووە لەم جەژنەدا دەمەوێ رازێکی گەورە لەگەڵ ئێوەدا بخەمە میانەوە، زەینی خۆتان بکەنەوە، دەرگۆڵەی دڵتان بکەنەوە لێنەگەڕێن، ترس زاڵ بێت بەسەرتان)). یۆحەننا کەدڵی وەك داربی دەلەرزی بەزەمزەمە کردنەوە گوتی ((مەولای من بڵێ))

– خواردنتان تەواو کردووە؟ ئیدی برسیتان نیە؟ جەستەتان تێر بووە؟ سەرەنجام ئایا لەشی ئێوە ئەن ئاخیری لەڕۆحتان دەگەڕێ کە لە ئارامیدا گوێ بگرن؟

– هەموو بەترسو لەرزەوە چاویان بڕیە لێوی کریستەوە، ئەویش هاواری کرد ((یارو یاوەرانی ئازیز، خوا ئاگادارتان بێ من دەڕۆم)). ئەوان هاواریان کرد، کەوتنە سەریەوە تا نەهێڵن بڕوات، زۆریان فرمێسکیان هەڵدەڕشت، بەڵام کریست بەئارامی رووی لەمەتی کرد.

– تۆ کتێبی پەیامهێنەکانت لەبەرە، بەدەنگێکی بەرزو شایستە وشە پێشبینییەکانی ئەشعیایان بۆ بخوێنەوە تا دڵنیابن، ئەم وشانەت لەبیرە: ((ئەو لەدیمەنی چاوانی خوادا وەك درەختێکی بچووكو شکاو وابوو....؟)) مەتی بەشادمانیەوە هەڵسایەوە سەرپێ ئەو بالآ چەماوەو پێ چەماوە بوو، ئەنگوستی درێژو ناسکی پڕ لەکەو پۆخڵی هەبوو، بەڵام لەپڕێکا شەقو رەق وەستا، گۆناکانی گڕیان گرت، گەرووشی هەڵمسا.

– وشەکانی ئەشعیای پەیامهێن، بەپڕیو بەتەڵخیو توندوتۆڵیەوە لەژووری بنمیچی بەرزدا دەنگی دایەوە..

– ئەو لە دیمەنی چاوانی خودادا
– وەك درەختێکی بچووكو شکاودا روا
– درەختێ کە لە زەویی بێ ئاودا سەردەردەهێنێ
– ئەو نەجوانییێکی هەبوو نەجیلوەیێ
– تا چاومان وەرسووڕێنینو بیبینین.
– نەخشی رووخساری ئەو رازیمان ناکات



– ئەو کە پەروەردەی رەنجو راز بوو
– ئاشنای ئازارەکان بوو..
– رووومان لەو وەردەگێڕین و
– قەدری نازانین..

***

– بەڵام ئەو تەواوی ئازارەکانمان دەخاتە سەرشان
– لەپێناوی هەڵخزینی ئێمە زامدار بوو..
– بەهۆی شەڕەکانانی ئێمەوە کەشەنگ بوو
–بەقایشی قامچی دابەزیو بە سەر پشتیا
– ئێمە چاك بووینەوە..

***

– وەشانی قامچی پەریشانی کرد
– بەڵام لێوی نەکردەوە
– وەك بەرخێکی رێگەی دەباغخانە
– لێوی نەکردەوە..

– کریست ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی (ئیدی بەسە) ئەو کاتە رووی لەلای یاوەران کردو گوتی ((ئەو کەسەی کە ئەشعیای پەیامهێن دەربارەی قسە دەکات، منم، بەرخی رێگەی قوربانگا منمو لێوم ناکەمەوە)) بۆ ساتێ لە قسەکردن وەستاو بەردەوام بوو ((هەر لە رۆژی لەدیك بوونمەوە بە ملا بەرەو قوربانگا راکێشراوم))

–یارو یاوەرەکان بەسەرسامیو حیرەتو دەمی کراوەوە چاویان بڕیبووە ئەوەوە، دەربارەی قسەکانی ئەو قووڵ دەبوونەوە تا تێبگەن، لەپڕێکا هەموو لەگەڵ یەك رووخساریان داپۆشیو سروودی پرسەیان سەردا، بۆ ساتێ دڵی خۆی لەدەستدا، ئاخر چۆن چۆن دەیتوانی ئەو یاوەرە شێوەنگێڕانە جێبهێڵێ؟ سەری بەرز کردەوەو سەیری یەهودای کرد، بەڵام زەمانێکی درێژ بوو کە یەهودا چاوی شینی خۆی بڕیبوە کریستەوە، ئەو هەستی دەکرد کە چ هەراو زەنایێ لە دەروونی ئوستاددا بەرپابووەو ئەشق چەند بە ئاسانی دەتوانێ دەست بەسەر بەرگری ئەودا بگرێ، دوو نیگا

لێکیاندایەوە بۆ ساتێ گوزە لە هەوادا بەگفتوگۆ لەگەڵ یەکەوە هەڵسانەوە: یەکێکیان عەبوس‌و بێ بەزەیی، ئەویتر بەئازارو پاڕانەوە ئامێز، بەلاّم تەنها بۆ ساتێك گوزەرا، هەر زوو کریست سەری راتەکاند، بزەییێکی تەڵخی کردە یەهوداو دووبارە رووی لە یاوەران کردەوە. لەوانی پرسی ((بۆ دەگرین؟ بۆ لەمەرگ دەترسن؟ ئەو میهرەبانترین فریشتەی خودایەو ئەشقێکی گەورەی بۆ مرۆڤ هەیە، شەهادەت‌و لەخاچ دان‌و کەوتنی من بۆ ناو دۆزەخ پێویستە، بەلاّم لەماوەی سێ رۆژ لە گۆڕ دێمە دەرەوەو دەچمە ئاسمان‌و لەکەنار باوك دادەنیشم)).

– یۆحەننا بگریانەوە هاواری کرد((دووبارە دەتەوێ تەنهامان جێبهێڵی؟ مەولای من ئێمەش لەگەڵ خۆت بۆ دۆزەخ‌و بەهەشت ببە)).

– یۆحەننای ئازیز بەگریانەوە هاواری کرد ((دووبارە دەتەوێ تەنهامان جێبهێڵی؟ مەولای من ئێمەش لەگەڵ خۆت بۆ دۆزەخ‌و بەهەشت ببە)).

– یۆحەننای ئازیز وەزیفەی من کە لە سەر زەمین بەسەر شانمەوەیە وەزەیفەییێکی سەنگینە ئێوە دەبێ لە هەمان جێدا بەسەر خاکەوە بمێننەوەو کاربکەن، لێرە لەسەر زەوی بجەنگن‌و ئەشقێنی بکەن... چاوەڕوانی بکەن، من دەگەڕێمەوە.

– یاکوب پێشتر رازی بوونی خۆی بەمەرگی ئوستاد دابوو، لەزەینی خۆیدا شەن‌و کەوی دەکرد تا ببینێ وەزیفەیئ ەوان بەبێ ئەو لەسەر زەوی چیە.

–ئێمە ناتوانین سەرپێچی ئیرادەی خوداوەندو ئیرادەی ئوستادمان بکەین، ئەوەی کە پەیامهێنەکان بە ئێمەی دەڵێن، وەزیفەی تۆ مردنەو وەزیفەی ئێمەش بەردەوامدان بەژیان، تا گوفتاری تۆ لەبێن نەچێ.

– ئێمە گوفتارەکانی تۆ دەکەینە بەردی بناغەی کتێبی پیرۆز، یاسا دادەنێین‌و کلێسای تایبەت بە خۆمان دروست دەکەین‌و کاهینانی گەورەو فەریسیانی تایبەت بە خۆمان هەڵدەبژێرین.

– کریست بەوەحشەتەوە هاواری کرد ((یاکوب تۆ رۆح لە خاچ دەدەی، نا، من ئەوەم ناوێ))



– یاکوب سەرپێچی کرد ((ئەوە تەنها رێگایە کە بتوانین بەم هۆیەوە پشتگیری لەوە بکەین کە رۆح ببێتە هەوا))

– بەلاّم ئیدی ئازاد نابێ، ئیدی نابێت بەرۆح.

– گرفتەکە لێرە نییە، بەرۆح دەچێت، مەولای من بۆ کاری ئێمە هەمان ئەوە بەسە.

– ئارەقەییێکی سارد هەڵنیشتە سەر لەشی کریست، سەیرێکی خێرای کردە یاوەرەکان، هیچ کەس بۆ نارازی بوون سەری هەڵنەبڕی، پەترۆس لەڕووی بەچاك زانینەوە سەیری کوڕی زوبەدی کرد، کە عەجەب زەینێکی خەللاقە، تەواوی تایبەتمەندییە دیارەکانی باوکی بەمیرات وەرگرتووەو ئێستا دەبینی کە هەموو کارەکان بۆ ئوستاد رێکدەخات.

– کریست بەنائومێدیەوە دەستی خۆی بەرز کردەوە، وابەدیاردەکەوت کە داوای کۆمەگ دەکات.

– ((من، دڵدەرەوە، رۆحی حەقیقەت بۆ ئێوە دەنێرم، ئەو رێنمایی ئێوە دەکات))

– یۆحەننا هاواری کرد ((دڵدەرەوە، زووتر بنێرە تا ئێمە گومڕا نەبین‌و دووبارە نەتوانین تۆ بدۆزینەوە)) یاکوب سەری سەرسەختی خۆی تەکاندا ((ئەو رۆحە حەقیقیەی کە تۆ دەیڵێی ئەویش لەخاچ دەدرێ. مەولای من، ئاگاداربە مادامەکێ مرۆڤەکان هەن رۆح لەخاچ دەدرێ، بەلاّم گرفتێ نییە، لەدیماهیدا شتێ هەمیشە لەشوێنی خۆی دەمێنێتەوەو ئەم شتەش بۆ ئێمە بەسە))

– کریست لە ڕووی نائومێدیەوە هاواری لێ هەڵسا (بۆ من بەس نییە!))

– یاکوب بەبیستنی هاواری دەرداوی ئەو کەوتە شڵەژانەوە، هاتە پێش دەستی ئوستادی گرت‌و گوتی ((مەولای من دروستە بۆ تۆ بەس نییە، لەبەر ئەمەیە کە لەخاچ دەدرێن لەوەی کە لەگەڵ رای تۆ نەبووم داوای لێبوردن دەکەم))

– کریست دەستی لەسەر سەری ئەو دانا: ((ئەگەر ویستی خوداوەند وا گرێبەست بووبێ، لێگەڕێ رۆحی جاویدانە بەسەر زەویدا لەخاچ بدرێ‌و پیرۆزبێ لێنەگەڕێ

بەئەشق و سەبرو باوەڕەوە بەرگەی بگرین، رۆژێ بەسەر شانەکانی ئێمەوە دەبێتە باڵ)). یاوەرەکان شتێکیان نەگوت، مانگ ئێستاکە بۆ ئاسمان سەرهەڵگەڕابوو، رووناکی تەواوی سفرەکەی داپۆشی بوو، کریست نیشانەی خاچی کێشاو گوتی ((کاری ئەمرۆکە تەواوبووە، ئەوەی کە دەبو بڵێم، گوتم، وا خەیاڵ دەکەم وەزیفەی خۆم ئەنجامداوە، ئێستا نیشانەی خاچ دەکێشمو وێنە دەکەم)). ئەوکاتە هێمای بۆ یەهودا کرد، یەهودا هەڵسایەوە، کەمەربەندی خۆی توند کردو گۆچانی کەچی خۆی گرتە دەست، کریست بۆ ئەو دەستی راتەکاند، وەك بڵێی خواحافیزی لەو دەکرد گوتی ((ئەمشەو لەژێر دار زەیتونەکانەوە لە ((گیتسمان))دا لەوبەری دۆڵی — کەدرون- دەکەوینە دوعاوە.

– یەهودا برام بە ئەمانی خودا برۆ خوداوەند هەمڕاهی تۆ بێت)).

– یەهودا لێوەکانی کردەوە، دەیویست شتێ بڵێ، بەلاّم باوەڕی خۆی گۆڕی، دەرگا کراوەبوو، بەپەلە چووە دەرەوەو دەنگی پێیە سەنگینەکانی ئەو بەسەر پەیژەکانەوە دەنگی دایەوە. پەترۆس کەوتە شڵەژانەوەو پرسی ((ئەوە بۆ کوێ دەڕوات؟)) هەڵسایەوە تا دوای کەوێ، بەلاّم کریست لێ نەگەڕا.

– پەترۆس چەرخی خوداوەند کەوتۆتە گەردشەوە، لەسەر رێگادا قەرار مەگرە.

– شنەیێ هەڵیکردبوو، مەشخەڵی قەندیلۆکەکان کەوتبوونە جریوە.. لەپڕێکا بایێکی سەخت کەوتە هەڵکردنەوەو مەشخەڵەکان خامۆش بوون، مانگ لە هەیئەتی تەواوی خۆی هاتە ژوورەوە.

– ناتانیل هەراسان بوو بەدۆستی خۆی گوت ((فیلیپ، ئەوە بانەبوو، نەفەرێ هاتە ژوورەوە، ئاه خودای من واخەیاڵ دەکەیتەوە کە مەرگاغالوو؟))

– شوانە وەلاّمی دایەوە ((تازە ئەگەر مەرگیش بێت چ پەیوەندییێکی بە تۆ هەیە، ئەو بەدوای ئێمەدا ناگەڕێ)) بەدەست لەپشتی دۆستی خۆیدا کە هێشتا پارسەنگی بەدەست نەهێنابوو ((کەشتیە گەورەکان، تۆفانە گەورەکان، سوپاس بۆ خودا ئێمە تەنها قایغو پەلکە گوێزین)).



– مانگ کەوتبووە سەر رووخساری کریستەوەو دەیخوارد شتێ جگە لە دوو چاوی رەش لە جێی خۆی نەمابوو، یۆحەننا تووشی وەحشەت بوو، بەدزیەوە دەستی گرتە رووخساری ئوستاد تا دڵنیا بێ کە هێشتا هەیە، بەبنی لێویەوە گوتی ((مەولای من لەکوێی؟))

کریست وەلاّمی دایەوە ((یۆحەننای ئازیزی من هێشتا تۆم جێنەهێشتووە، بۆ ساتێ غەرقی چەند وشەیێ بووم کە جارێکیان زاهیدێك لەکێوی پیرۆزی کەرمولدا بە منی گوت، قسەی ئەو ئەمەبوو ((من وەکو بەرازێ لە پێنج شوێنی لەشمدا غەرق بوویمە)). لێم پرسی ((باوە گەورە چۆن نەجاتت بوو؟ نەبەردێکی سەخت بوو؟ وەلاّمی دایەوە ((رۆژێکیان سپێدە درەختێکی بادەمم دیت کە شکۆفەی کردبوو رزگارم بوو)). یۆحەننای ئازیز هەمان ئێستاکە مەرگ بۆ ساتێ بەمجۆرە لەبەرچاوم بەرجەستەبوو: ((درەختێکی بادەمی پڕ لە شکۆفە)) لەجێوە هەڵسایەوەو گوتی ((باشتر وایە بڕۆم، کاتی مژدەهێن هاتووە)). کەوتە پێشەوەو گوتی ((یاوەران کە نقوومی ئەندێشە بووبوون)) لەدوای ئەوەوە، ناتانیل لەناو بێخی گوێی دۆستەکەی کەوتە زەمزەمەوە ((چاکتروایە دەرپەڕین، بابەتەکە بەم سادەییەوە نییە، فیلیپ وەلاّمی دایەوە ((منیش لە ناو هەمان فیکرم، وەلێ وەرە تۆماس لەگەڵ خۆمان ببەین))

((دوو دۆست لە رۆشنایی مانگەشەودا کەوتنە گەڕانو سووڕان بەدوای پەترۆس بەلاّم ئەو ون بووبوو، لەبەر ئەمە لە پشتەوەی گروپەکە تەنها خۆیان لەجێوە مانەوە، هەرکە گەیشتنە دۆڵی- کەدرون- لێگەڕان کە لەگەڵ ئەوانی دیکە مەودایەکیان هەبێو گیانی خۆیان نەجات بدەن)).

کریست لەگەڵ ئەوانەی کە لە شوێنی خۆیان مابوونەوە، شۆڕبوونەوە ناو دۆڵی (کەدرون) لەلای بەرامبەر بۆ سەرەوە چوو، ئەو رێیەی گرتەپێش کە کۆتایی بە زەیتونستانی (گتسمان) هێنا، چەندین شەو لەژێر ئەو پیرە درەختانەی زەیتون بەبێداری ماوەتەوەو دەربارەی دلۆڤانی خوداو شەڕی مرۆڤ قسەی کردبوو!

گروپەکە وەستان، یاوەران ئەمشەو لە خواردنو خواردنەوە زێدەڕۆییان کردبوو خەوالۆبوون، بەردەکانیان لاداو خۆیان ئامادەی راکشان کرد، ئوستاد بەگەڕانو سووران بەدەوروبەر گوتی ((سێ نەفەر دیارنین چیان بەسەر هاتووە؟))

ئاندریاس بەتووڕەییەوە گوتی ((تێیان تەقاندووە))

کریست بەبزەوە گوتی ((ئاندریاس مەحکومیان مەکە رۆژێ دەبینی کە هەر سێ نەفەر دەگەڕێنەوەو هەریەکێکیان تاجێکی لەدڕکو داڵ کە شاهانەترین تاجو هەرگیز سیس نابێ بەسەرسەریانەوە دادەنێن)) بەم گوفتەوە پشتی بەقەدی درەختی زەیتون دا، چونکە لەپڕێکا هەستی بە ماندووبوونێکی مەزن کرد.

یاوەران بەردی گەورەیان کردە سەرینو نایانە ژێر سەریانەوەو راکشان.

پەترۆس بە باوێشکدانەوە گوتی ((مەولای من وەرە لەگەڵ ئێمە راکشێ، ئاندریاس پاسەوانی دەکات)).

کریست لە درەخت بۆوەو گوتی ((پەترۆس، یاکوب، یۆحەننا لەگەڵ من وەرن))

دەنگی فەرماندەرانەو پڕ لەئازاربوو، پەترۆس وای نیشاندا نەیبیستووەو بەسەر زەوی راکشاو دووبارە باوێشکی هاتێ، بەلاّم دوو کوڕی زوبەدی دەستەکانی ئەویان گرتو بەرزیان کردەوە ((یالّلاّ قیت بەوە بابڕۆین، شەرم ناکەی؟))

پەترۆس لەبرای نزیك کەوتەوە ((ئاندریاس خۆ ئێمە ناولەپی خۆمان بۆن نەکردووە کەبزانین چی دێتە پێش، چەقۆکەت بەمن بدە)).

کریست بۆ پێشەوە دەچوو، زەیتونستانیان لەدوای خۆیانەوە بەجێهێشتو گەیشتنە زەوییێکی کراوە، لەڕووبەڕووی ئەواندا ئورشەلیم لە پۆششێکی سپی مانگەشەودا دەدرەوشایەوە، ئاسمان تێرڕەنگو بێ ئەستێرەبوو، قورسی تەواوی مانگ کە هەڵسانەوەیان وا بەپەلە بینی بوو ئێستاکێ بێ جووڵە لە ناوەندی ئاسماندا هەڵواسرابوو.



کریست بەبنی لێویەوە گوتی ((باوکە ئەی باوکە کەلە ئاسمانیت، ئەی باوکێ لە زەویت دونیای خولّقێنراوی تۆ جوانەو زەوی بۆنی سەمغو هەنگوین دەدا، هەندێ خاكو خۆڵی لەگۆناو گەردەنو لێوەکانی هەڵسویو کەوتە زەمزەمەوە ((چ عەترێ چ گەرماییێ برایێکی؟)) پاشان دەستی بەگریان کرد، خاکی لەناو مشتیدا گرتبوو دڵی نەیدەخوازی دووری کاتەوە لە خۆی، کەوتە زەمزەمەوە (( برام لەگەڵ یەك دەمرین، من هەمرێگاییێکی دیکەم نییە)). پەترۆس بە ئەندازەی ئەو بەسەر پێوە وەستابوو، گوتی ((من ماندووم، نازانم ئێمە بۆ کوێ دەبات؟ من بۆ پێشتر نایەمو هەر لێرە رادەکێشم))، بەلاّم کە سەیری دەوروبەری دەکرد تا شوێنێکی رەحەت بۆ راکشان بدۆزێتەوە. کریستی بینی لەسەرخۆ بەرەو ئەوانەوە دێت بەبێ چەندوچوون هێزی وەبەرهاتەوەو بەر لەوانی دیکە بۆ پێشوازی چوو.

– مەولای من نزیکی نیوەشەوە، هەمان ئەو جێیە، شوێنێکی چاکە.

کریست گوتی ((منالاّنی من، رۆحم زۆر توندە، ئێوە بڕۆن لەژێر درەختەکانەوە راکشێن، من هەر لێرە دەمێنمەوەو لەخوا دەپاڕێمەوەو لەگەڵ من بپاڕێنەوە، منالاّنی من کۆمەکم بکەن تا ئەو چەند ساتە سەختە لەدوای خۆماندا جێبهێڵێن)) رووی لە ئورشەلیم کرد ((ئێستا بڕۆنو بەتەنهام جێبهێڵن)).

یاوەران گەڕانەوەو لەژێر درەختەکانی زەیتوندا راکشان، بەلاّم کریست بە سەر رووخساریەوە کەوتە سەرخاك، زەینو دڵو لێوەکانی لەزەوی جیانەدەبۆوە، بوو بوون بەخاك بەژێر لێویەوە گوتی ((باوکە هەمان ئێرە باشە، خاك بەخاك رەهام کە جامێ کە بۆ نۆشین بەمنت دابوو، تالّە من بەرگەی ناگرم، باوکە ئەگەر دەکرێ، ئەو جامە لەلێوم هەڵگرە. بە ئارامی لەشوێنی خۆیدا مایەوە، لەوانەیە بتوانێ لەتاریکیدا دەنگی باوکی ببیستێ، چاوەکانی داخست، خوداوەند میهرەبان بوو، لەکوێ دیاربوو کە باوکە لە دەروونی ئەودا بەدیار نەدەکەوتو لەڕووی بەزەییەوە شەفەقەت بەو پێناکەنیو هێمای بۆ ئەو نەدەکرد؟ بەلەرزینێکەوە لە ئەندامانی، لە چاوەڕوانیدا وەستا، چاوەڕوانی کرد، هیچی نەبیست تەنهاو تەنها سەیری دەوروبەری کرد تووشی وەحشەت بوو، بەهەراسانیەوە چووە سۆراغ یاوەرانی خۆی تا هێزی دڵی وەبەربێت،

هەرسێکیانی بەخەوتوویی دۆزیەوە، یەکەمجار لە پەترۆسدا پاشان یۆحەنناو دوایش یاکوب، بەتووڕەییەوە بەوانی گوت ((شەرم ناکەن؟ نەتاندەتوانی تۆزێکی دیکە بەرگەبگرنو لەگەڵ من دوعا بکەن))؟

پەترۆس کە نەیدەتوانی پێڵوەکانی لەکەوتنە سەریەکەوە راگرێ گوتی ((مەولای من رۆح ئامادەو بەتاسووقە، بەڵام جەستەم لاوازە.. لێمان ببوورە))

کریست گەڕایەوەو بەئەژنۆکانیەوە کەوتە سەر بەردەکان، دووبارە هاواری کرد : باوکە ئەو جامەی کە بەمن دا لەڕادەبەدەر تاڵە، لەسەر لێوەکانمی هەڵگرە))

لەکاتێکا قسەی دەکرد لەبەرزایی سەری خۆیەوە دوو رۆشنایی فریشتەی بینی کە بە عەبوسیو رەنگ پەڕیوی دادەبەزین، باڵەکانیان لە مانگ سروشتە بووبوون، میوانی ئاسمانی هاتە خوارترو دەستی دایە جامی نوقرەیی سەرلێوی، کریست رووخسار خۆی لەمیانی دەستەکانیدا پەنهان کردو کەوتە سەر زەوی.

– باوکە وەڵامی تۆ ئەوەیە؟ مەگەر تۆ بەزەییت نییە؟

بۆ ماوەیێکی کورت لە چاوەڕوانیدا مایەوە، هێدی هێدیو بەترسو لەرز ئەنگوستەکانی دەستی خۆی لەیەك کردەوە هاوارێکی کردو بازووەکانی کردەوە کەوتە سەرخاك، کاتێ هاتەوە هۆش مانگ بەپانایی یەکدەست لە ئاسمان تێپەڕی بوو فریشتە لەناو مانگەشەودا حەل بووبوو، لەوان دەوران لە ژینگەی ئورشەلیم، رۆشناییێکی پەڕاگەندەو بەجولەی بینی، لەڕوودا نوورێکی داگیرساو بوو، ئایا بۆلای ئەو دەهات؟ لەو بەدوور دەکەوتنەوە؟ جارێکی دیکەش ترس وجودی ئەوی داگرت، تاسووقی بینینی خەڵك بیستنی دەنگی مرۆیی، دەست لێدانی وەك بڵێی خۆشی دەویست، دیسان بە راکەراکەوە بۆ سۆراغی هەر سێ یاوەرەکەی چوو.

دیسان هەر سێکیان لەخەودابوونو رووخساری ئارامیان لەسەر دەریاچەی مانگەشەو مەلەی دەکرد، یۆحەننا سەری بەشانی پەترۆس کردبوو، پەترۆسیش بەسینەی یاکوب، یاکوب سەری پرچ رەشی خۆی بەبەردێ کردبوو، بازووەکانی یاکوب کراوەبوو، وەك بڵێی ئاسمانی لەباوەش کردبوو، ددانە بریقەدارەکانی لەمیانی شەبەقی مووی سمێڵو



ریش دەدرەوشایەوە، کریست سگی پێ سووتانو بێداری کردنەوە، هێدی هێدی پاشەکشەی کردو بۆ پاش رۆیشت ئەوکاتە جارێکی دی بەسەر رووخساریا کەوتە سەر زەویو دەستی بەگریان کرد.

بەئارامی بەشێوەیێ وەك بڵێی دەیویست خودا نەیبیستێ گوتی ((باوکە، خواست خواستی تۆیە نەخواستی من، باوکە خواستی تۆیە)) هەڵسایەوەو دووبارە کەوتە سەیرکردنی رێگەی ئۆرەشەلیم.

رۆشناییەکان نزیکتر کەوتبوونەوە، دەیتوانی ئێستاکە سێبەرە لەرزیوو بریقەدارەکانی چەکی برۆنزی لەدەوروبەر ببینێ، کەوتە زەمزەمەوە ((وادێن...وادێن)). ئەژنۆکانی سست بوو، دروست لە هەمان ساتدا بولبولێ بەدیارکەوتو بەسەر درەختی سەرونیازی نازی نەونیهاڵدا نیشتەوە، بای کردە گەروویو کەوتە چڕینەوە، مانگی گەورە، عەتری بەهارییو شەونمی نمناك ئەویان سەرمەست کردبوو، لەدەروونی ئەم بولبولە، خودای گەورە بوو، هەمان ئەو خودایە کە ئاسمانو زەوییو رۆحی مرۆڤی خەڵق کردبوو، کریست سەری هەڵبڕیو بەدیقەت گوێی دایێ، ئایا ئەو خودایەی کە خاكو سینەی چووکی ئەو پەرندەگانەی خۆش دەویست دەیتوانی خودای بەڕاستی مرۆڤەکان بێ؟

لەپڕێکا لە وەڵامی داوەتی پەرەندەدا بولبول ئیدی لەقووڵایی رۆحی کریستدا سەری دەرهێناو دەستی کرد بە چڕینی ئازارو شادومانی جاویدانی خودا، ئەشق، ئومێد..بولبول بەڕۆحی نەغمەی دەچڕی ئەویش دەلەرزی، تا ئێستا ئاگادارنەبوو کە گۆرانی وا لەدەروونی ئەودایە، ئەو هەموو شادیو رۆحی خۆی بەلقە شکۆفەدارەکانەوە هەڵواسیبوو، ئیدی نەیدەویست لەوێ بفڕێت، ئاخر بۆ کوێ دەچوو؟ بۆچی دەڕۆیشت؟ ئەو زەمینە بەهەشت بوو.. بەڵام کاتێ کریست بە پەیگیری نەوای ئەو دوو بولبولە چووە ناو بەهەشت گوێی لە دەنگێکی زبر بوو، مەشخەڵەکانی رۆشنو چەکە بڕونزییەکان نزیك بووبوونەوەو لەمیانی مەشخەڵو دووکەڵدا وای هاتە بەرچاو کە سەرو پۆتەلاکی یەهودای دەستنیشان کردووە: دووبازووی بەهێز کە چەسپاندبوویانو ریشێکی سوور کە لەرووخساریا رۆچووبوو، هاواری کردو بۆساتێ وا هاتە بەرچاوی

کەبێهۆش بووە، بەڵام بەر لەم کارە هەستی کرد کەدەمی یەهود لەبەردەمی ئەو چەسپاو دەنگێکی دڕو نائومێد گەیشتە گوێیو گوتی ((درود مەولای من)).

مانگ ئێستاکێ لەکاری لاوانەوەی کێوە سیمشیۆەکانی یەهودیەدا بوو، باییێکی شێدارو سارد هەڵساو ئەنگوستو لێوەکانی کریست شین هەڵگەڕان، ئورشەلیم لەژێر نووری مانگی نابیناو رەنگ پەڕیودا قەدی خۆی بەرزکردەوە، کریست گەڕایەوە، سەیری سەربازو خزمەتکارەکانی دەکردو گوتی ((نێردراوەکانی خودای من بەخێربێن یاڵڵا بابڕۆین)) لە پڕێکا لەمیانی گەڕەلاوژەدا کریست ئاگاداربوو کە پەترۆس چەقۆی خۆی لەکێلان دەرهێنایە دەرەوە تا گوێی یەکێ لەخزمەتکارەکان ببڕێو فەرمانی پێدا ((چەقۆکەت لە کیفك بنێوە، ئەگەر وەڵامی چەقۆ بەچەقۆ بدەیتەوە کەواتە کەی دونیا رزگاری دەبێ لەشەڕی چەقۆدا؟))



## بەشی بیستو نۆیەم

کریستیان دەستگیر کرد، لەکاتێکا هۆیهایان لێدەکرد، بەسەر بەردو کۆتەرە درەختەکانی سەرونیازو زەیتونی ناو دۆڵی —کەدرون- لەمیانی ئورشەلیمو لەکۆتاییدا تا تەلاری کیافا پەلکێشیان دەکرد، شورا لە تەلاری کیافا پێکهێنراو چاوەڕوانی دادگایی کردنی یاخیێ بوو.

هەوا سارد بوو غولامەکان لەبەردەم ئاگردا کە لەحەوشەدا دایانگیرساندبوو خۆیان گەرم دەکردەوە، خزمەتچی دەم بەدەم بەخۆو بە هەواڵەوە لەتەلار دەهاتە دەرەوە، ئەو بەڵگانەی کەدژی کریست بەرز دەکرایەوە بەس بوو بۆ ئەوەی مووی لەشی مرۆڤ زیت کاتەوە، ئەو نەفرەتیە خوداوەندیە کوفری کەزایی لەبارەی خودای سراییلو رێبازنامەی موسای هێنابووە سەرزمانو گوتبووی مەبەستی ئەوەی هەیە پەرستگای پیرۆز وێران کاتو تۆوی خۆی بەسەر وێرانەدا بپرژێنێ، پەترۆس کە سەرو رووی بەتەواوی بەسترابۆوە، خزیە ناوحەوشەوە، لەکاتێکا سەری هێنابووە خوارەوە، دەستی گرتەپێش ئاگر، خۆی گەرم کردەوەو بەترسو لەرزەوە گوێی دەدایە هەواڵەکان.

کارگوزارێ هاتە پێشو بەدیتنی ئەو وەستاو گوتی ((ئاهای پیرەمێرد بۆ خۆت لەئێمە شاردۆتەوە؟ سەرت بەرزکەوە تا تۆ ببینین وا خەیاڵ دەکەم تۆ لەگەڵ ئەوا بووی)

چەند نەفەرێ گوێیان لەقسەی ئەو بوو نزیك بوونەوە.

پەترۆس هەراسان بوو، سەری بەرزکردەوە ((سوێند دەخۆم کە ئەو پیاوە ناناسم)) چووە بەلای دەرگاوە.

کارگوزارێکی دیکە هاتە نزیک، چونکە ئەوی لەحاڵی ڕۆیشتنندا دیت دەستی درێژکرد (ئاهای پیرەمێرد، بۆ کوێ دەچی؟ تۆ لەگەڵ ئەو بووی خۆم تۆم دیت)) پەترۆس جارێکی دی دەنگی هەڵبڕی ((من ئەو پیاوە ناناسم)) کچیژگەی وەلاناو بەردەوام بوو لە ڕێی خۆی، بەڵام دوو نەفەر لە خزمەتکارەکان ئەویان وەستاند، شانەکانی ئەویان گرت بە زبریەوە رایانتەکاندو هاواریان کرد ((لەشێوەی قسەکردنت دیارە تۆ خەڵکی جەلیلیو یەکێکی لەیارو یاوەرانی کریست))

پەترۆس سوێندی خواردو دەستی بەجوێن دان کردو هاواری کرد ((من ئەو پیاوە ناناسم)) لەهەمان ساتدا کەلەشێرێ لەناو حەوشە بانگی دا، پەترۆس ناڵەیێکی سەردا، کەوتەوە یادی قسەکانی ئوستادەوە ((پەترۆس بەر لەوەی کەلەشێر بخوێنێ تۆ سێ جار ئینکاری من دەکەی)) چووە کۆلانەوە، کەوتە سەر زەوی دەستی بەگریان کرد. ڕۆژ لەحاڵی هەلاتن دابوو، ئاسمان ڕەنگی خوێنی گرتبوو، خزمەتچییێکی ڕەنگ پەڕیو بەدادو هاوارەوە لە تەلار هاتە دەرەوە ((کاهینی گەورە یەخەی خۆی چاك دەکردەوە وا خەیاڵ دەکەیت کە تاوانبار چی گوتبێ؟ ((من کریستم، کوڕی خودا!)) تەواوی ریش سپیەکان هەڵسانەوە سەرپێ، ئەوان یەخەیان ڕێکدەدایەوەو هاواریان کرد ((مەرگ! مەرگ))

خزمەتچیەکی دیکە بەدیارکەوت ((ئێستاکێ دەیبەنە لای- پیلات- پیلات تەنها کەسێکە هەقی کوشتنی ئەوی هەیە، ڕێگایان بۆ بکەنەوە تا ڕەت بن وادەرگاکان خەریکە دەبنەوە)). دەرگاکان کرانەوە نەجیب زادەکانی سراییل هاتنە دەرەوە لە پێشیانەوە کیافای کاهینی گەورەبوو کە لەسەرخۆ ڕێی تەی دەکرد، لەدوای ئەوەوە ریش سپییەکان، ئاپۆڕەیێ لەڕیش، چاوانی لارو خێڵی، دەمی بێ دانو چەند زمانێکی هەرماسی، لەبەر تووڕەییان بەملاو بەولادا دەهاتن هەڵم لە لەشیان هەڵستابوو، لەدوای ئەوانەوە کریست ئارامو خەمگین بۆ پێشەوە دەهات، خوێن لەسەری بارزقەی بوو لێیاندابوو، پێکەنینو جوێن لەناو حەوشە بەرزبۆوە، پەترۆس



هەڵسایەوە پشتی بەچوارچێوەی دەرگادا، ئەشك لەچاوەکانی هەڵدەڕژا لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((پەترۆس ئەی پەترۆسی ترسنۆك، درۆزنی خایەن، هەڵسەوەو هاوارکە ((من لەگەڵ ئەوم، هەرچەند کە بشتکوژن)) ڕۆحی خۆی وروژاند، بەڵام جەستەی بێ جوولە بوو، پشتی بەدەرگاداو لەرزی، لە ئاستانەی دەرگادا کریست ساتمەیێکی کرد بۆ پێشەوە گلۆربۆوە، دەستی درێژ کرد تا دەستی بەشتێ بگرێت، شانی پەترۆسی دۆزیەوە، پەترۆس لە جێی خۆی وشك هەڵگەڕا، نە قسەییێکی کردو نە تەکانی خوارد، دەستی ئوستادی دیت کە بە سەرشانی ئەودا قفڵ درا، دەرەوە هێشتا تەواو ڕۆشن نەبووبۆوە، لەتاریکی مس ڕەنگدا کریست هەر ئاوڕی نەدایەوە تا بزانێ بۆ ئەوەی ڕێی بەرنەبێتەوە دەستی بەچی گرتووە، پارسەنگی خۆی دۆزیەوە، لەدوای ریش سپیەکانو لەئابلۆقەی سەربازان جارێکی دیکە پێشەوەی خۆی بۆلای تەلاری پیلات گرتەبەر پیلات بێدار بووبۆوە، دەمو چاوی شوشتبوو، بەڕۆنی عەتراوی خۆی چەوکردبوو، لەسالۆنێکی هەتاوی دا بەسەربەرزایی تەلاریەوە بۆسەرەوەو خوارەوە هاتوچۆی دەکرد، ئەو قەت کەیفی بەڕۆژی جەژن نەهاتبوو، یەهودیانی سەرمەست لەخودای خۆیان ڕێی شێتانەیان دەگرتەبەرو لەگەڵ سەربازانی ڕۆمیدا دەکەوتنە لێدانو کوتانەوە، ئەمسالێش لەوانەبوو کوشتارێکی دیکە بێتە ڕێ، کەبەهیچ جۆرێ لەگەڵ بەرژەوەندی ڕۆم نەدەگونجا. جەژنی فیتر ئەمساڵ نیگەڕانییێکی دیکەشی هەبوو، یەهودیەکان دەیانەویست ئەم ناصیرەییە بێنەوایە بکوژن، دێوانە بێ ئابڕووەکان .. پیلات مشتی خۆی کردبووە گرێ، مەیلی سەرکێشی سەراپای وجودی ئەو بۆ نەجاتدانی گیانی ئەو گەمژەڵە داگرتبوو، نەك لەبەر ئەوەی کە ئەو بێگوناه بوو ((ئەسڵەن بێ گوناهی چ مانایێکی هەیە؟)) یاخود دڵی بەو سووتابێ ((پیلاتو دڵسووتان بەحاڵی یەهودیان، کوجا مەرحەبا!)) بەڵکو بەخاتری ئەوەی کە نەژادی بێ ئابڕوی یەهوود تووڕە بکات.

قیلو قالێکی گەورە لە پەنجەرەکانی تەلاردا گەیشتە پیلات، لاربۆوەدەرەوەحەوشەی تەلاری پڕ لەیەهودیەکانی بینی، ئەو دەیتوانی ئاپۆڕەی پڕجۆشو خرۆشی یەهودیەکان ببینێ کە هەیوانو حوجرەکانی تەلاریان پڕکردبوو، کریستیان لەژێر پاسەوانێتی سەربازانی ڕۆمیدا بۆلای دەرگای گەورەی تەلار رادەدرا، ئاپۆڕەکە بەدارو خوترمەو قۆچەقانێ کەوتبوونە دوایو ئەویان بەردەدایەوە سەر زەویو لەقەیان لێدەداو

هۆیهایان لێدەکرد، پیلات بۆلای تەختی خۆی رۆیشتو دانیشت، دەرگا کرایەوە، دوو غولامی رەشی زلو زەبەلاح کریستیان پاڵنایە ژوورەوە، جلەکانی پارچە پارچە بوون وخوێن تەواوی رووخساری داگرتبوو، بەم هەمووەش سەری بەرزکردبۆوە، لەچاوەکانیدا نوورێکی ئارام گەش بووبۆوە، کە بەرەو دونیای مرۆڤ هەڵدەکشا، پیلات بزەیێکی هاتێ ((کریستی ناصیرەیی پاشای یەهود، ئەوا جارێکی دیش تۆم لەبەرامبەری خۆم بینی، وەك دەڵێن قەرارە تۆ بکوژن)) کریست لەناو پەنجەرەوە سەیری ئاسمانی کرد، زەینو جەستەی پێشتر کۆچیان کردبوو قسەیێکی نەکرد. پیلات تووڕەبوو هاواری کرد ((ئاسمان فەرامۆش بکە چاکتر وایە سەیری من بکەی مەگەر نازانی کە بڕیاری رەهابوون یا لە خاچ دانی تۆ لەدەست من دایە، کریست بەئارامی وەڵامی دایەوە ((تۆهیچ بڕیارێکت بەسەر مندا نیە، هیچ کەس جگە لە خودا ئەو سەرپشکیەی نییە)).

لەخوارەوە هاواری تووڕە ئامێزی ((مەرگ، مەرگ)) دەگەیشتە گوێ

پیلات پرسی ((ئەوان بۆ وا تووڕەن؟ مەگەر چیت لێکردون؟

کریست وەڵامی دایەوە ((من حەقیقەتم بەوان گوتوە.

پیلات بەبزەیێکەوە پرسی ((کام حەقیقەت؟ ئیدی حەقیقەت چ دەستەواژەیێکە))؟

دڵێ کریست لەبەر ئازار کوشرا دەبوایە چ بکا دونیا هەمان ئەوەیەو فەرمانڕەوایەکانیشی ئەم مرۆڤانەن کەفشە بەڕاستی دەکەن.

پیلات رووبەڕووی پەنجەرە وەستا، کەوتە یادی ئەوەی کە دوێنێ باراباسیان بەخاتری کوشتنی ئیلیازر دەستگیر کردووە، رەسمەکە وابوو رۆژی فیتر زیندانیەك ئازاد دەکرا، هاواری کرد ((لە منەت دەوێ چ کەسێ بۆ تۆ ئازاد کەم: کریست پاشای یەهود یا باراباسی دز؟))

خەڵك هاواریان کرد ((باراباس، باراباس))

پیلات پاسەوانی بانگ کردو بەهێما بۆ کریست فەرمانی بەو دا ((قامچی کوتی کەنو تاجێکی لە دڕك بەسەر سەریەوە دانێنو پارچەیێکی سووری لێ بپۆشنو



قامیشێکی درێژیشی بدەنە دەست ئەو پاشایە، وەکو پادشا جلی لەبەرکەن)). بەم نەخشەوە پیلات ئومێدەواربوو کەکاتێ خەڵکی کریست بەم وەزعە بەزەییبارە ببینن رەحمی پێ بکەنو داوای ئازادی بۆ بکەن، پاسەوانان ئەویان لەستوونێ بەستایەوەو دەستیان کرد بە قامچی کوتینو تف لەڕووکردنیەوە.

ئەوکاتە تاجێکیان لەدڕك دروست کردو لەسەر سەریان داناو خوێن لەتوێڵو لاجانگەکانی بازرقەی دەدا، پارچەیێکی قورمزی رەنگیشیان بەسەرشانەوە داناو قامیشێکی درێژیان نایە ناو ئەنگوستەکانی ئەوکاتە بردیانەوە لای پیلات، پیلات بەدیتنیەوە نەیتوانی لە پێکەنین بکەوێ، گوتی ((پاشای گەورە بەخێربێی! بفەرموو تا بەردەستانت نیشان بدەم))

دەستی ئەوی گرتو بردیە هەیوانی تەلار هاواری کرد ((ئێستا ئەم پیاوە))!

خەڵکی هاواریان کرد ((لە خاچی بدەن.. لەخاچی بدەن!))

پیلات فەرمانیدا کە لەگەنێکی بۆ بهێنن، لاربۆوەو دەستی خۆی لەبەردەم ئاپۆرەکەدا شوشت ((من دەستەکانم بەئاو دەشۆم، ئەوە من نیم کە خوێنی ئەو دەرێژم، من بێگوناهم، گوناه لەگەردەنی ئێوەدایە))

خەڵکی هاواریان کرد ((خوێنی ئەو لەگەردەنی ئێمەو گەردەنی منالانی ئێمەبێ))

پیلات گوتی ((بیگرن تاچیتر بێزارم نەکات))

گرتیانو خاچیان لەپشت بەستایەوە، لەکاتێکا بەملاوبەملادا دەهات، سەیری دەوروبەری خۆی کرد، رەنگە یەکێ لە یاوەرانی ببینێ هێمای بۆ بکات کە بەزەیی پیابێتەوە بەم کۆڵەبارەوە، بەلام هەرچەند سەیری کرد کەسێکی نەدیت ئاخێکی هەڵکێشاو کەوتە زەمزەمەوە ((خۆزگە بەمەرگ سوپاس بۆ خوداوەند!)) یاوەران لەهەمان ئەم کەینو بەینەدا خۆیان لە مەیخانەی سیمۆنی قەیرەوانی شاردەوە، ئەوان چاوەڕوانی تەواوبوونی لەخاچ دانو کەوتنی شەوبوون تابتوانن دوور لە چاوی ئەوانی دیکە رابکەن، لە حاڵێکا لەپشت جەلیکانەکانی شەراب دەستەوئەژنۆ دانیشتبوون بەگوێی قولاغ کردویان گوێیان دەدایە هەڵهەلەی ئەو خەڵکەی کە رادەبردن، تەواوی

ئاپۆڕەی شارلەژن و پیاو بەرەو گەلگەتا تاویانەدا، ئەوان جەژنێکی خۆشیان لەدوای خۆیانەوە جێهێشتبوو، لەخواردنی گۆشت و خواردنەوەی شەراب زێدەڕۆییان کردبوو، ئێستاکێ هەر بۆ بەسەربردنی کات دەچوونە –گەلگەتا-

خەڵکی پەلەیان کرد، یاوەران گوێیان دەدا وەلوەلەی ئەون و دەلەرزین، جارناجار گریانی نهێنی ئامێزی یۆحەننا دەبیسترا، ئاندریاس هەرچەند جاری هەڵدەستایەوەو بۆ سەرەوخوار چوونی بەدووری مەیخانەدا وشەی هەڕەشە ئامێزی دەخستە سەرزمان. پەترۆس جوێن و نەفرەتی لەخۆی دەکرد، کە بۆ خاتری ترسنۆکی و نەبوونی شەهامەت نەدەچووە دەرەوە تا لەگەڵ ئوستاد بکوژرێ.

چەندی سوێند خواردبوو کە تادەمی مەرگ لەگەڵ ئەو دەبێ، بەڵام ئێستا مەرگ رووخساری خۆی نیشاندا بوو لەپشت جەلیکانەکانی شەراب خۆی شاردبۆوە.

یاکوب تووڕەبوو گوتی ((یۆحەننا نا نا من غەریبم واز لە فشە بهێنن تۆ ناسەلامەت پیادی، تۆ ئاندریاسی جەنگاوەر، سمێڵی خۆت بامەدە، وەرە دانیشەو وەرە بابگەینە بڕیارێ، گریمان کە ئەو بەڕاستی کریستیانویە، لەم حاڵەتەدا بە چ روویێ لەبەرابەریا بەدیار دەکەوێ ئەگەر دوای سێ رۆژ رابێتەوە؟ قەت بیرت لێ کردۆتەوە؟ پەترۆس رای تۆ چییە؟))

پەترۆس لەڕووی نائومێدیەوە گوتی ((ئەگەر ئەو کریستیانو بێت، کاری ئێمە گریەو زارە، رای من ئەوەیە کە بەئێوەم گوت من سێ جار ئینکاری ئەوم کرد)).

یاکوب گوتی ((ئەگەر کریستیانوش نەبێت دیسان هەر حاڵمان شڕە ناتانیل تۆ چ دەڵێی؟

- من دەڵێم دەبێ لێرە بڕۆین، ئەو چ کریستیانو بێ یا نەبێت کارمان خراپە! ئاندریاس کە خۆی ئامادەدەکرد تا بۆ لای دەرگا بڕوات گوتی ((واتە دەفەرموون بەهەمان شێوە بێ پەنا جێی بهێڵین و بەڕەڵلای کەین؟ چۆن دڵتان دێت؟ بەڵام پەترۆس گۆشەی کراسی ئەوی گرت ((تا پارچە پارچەم نەکردوی، دانیشە، باشتروایە رێگەچارەیێ بدۆزینەوە))



تۆماس بەمنەمنەوە گوتی ((ئەی ریاکاران و فەریسیان کام رێگەچارە؟ وەرن بەبێ پەردە قسان بکەین، ئێمە مامەڵەمان کردو لەم مامەڵەیە تەواوی سەرمایەی خۆمان لەدەستدا، مامەلەیێ کە قۆچ و کلکی نییە، بەلاش خۆ کەر مەکەن، من کەلوپەلی خۆم واتە شانەو بەکرەو ئاوێنەی باخەڵم بەمەلەکوتی ئاسمان گۆڕیەوە، هەموو ئێوە هەمان کارتان کردووە، یەکێ قایغی خۆی دا، ئەویتر مەڕەکان و سێهەمیش ئارامی خەیاڵی خۆی، ئێستا هەموو شتێ بەباچوو، ئێمە داڕماین و سەرمایەمان بەباچوو، ئاگاداربن کە لەم مامەڵەیەدا گیانمان لەدەست نەدەین، لەبەر ئەمە من ئامۆژگاریتان دەکەم کە هەل ماوە بابڕۆین)). فیلیپ و ناتانیل هاواریان کرد ((ئێمە رازین)

پەترۆس لەڕووی نیگەرانیەوە رووی لەمەتی کرد کە گوێی تیژ کردبوو لێوی لەلێوی نەکردبۆوەو گوتی ((مەتی توخودا هەموو ئەوانە مەنووسە، خۆت لەکەڕی بدە، تا ئەبەد مەمانکە جێ فشەو گاڵتەی خەڵك)).

مەتی وەڵامی دایەوە ((نیگەران مەبە، زۆر شتتان دەبیستم و دەبیستم وەلێ هەڵیدەبژێرم، بەڵام لێگەڕێ بۆ خاتری بەرژەوەندی خۆتان بگەنە بڕیارێکی والا دلاوەری خۆتان پیشان بدەن تابتوانم دەربارەی ئەوان بنووسم و ئێوەی خەڵکی بێچارە پایە پەیاکەن، ئێوە نوێنەرن ئەوە کارێکی بچووك نییە)).

لەهەمان کاتدا سیمۆنی قەیرەوان بەلەقە دەرگەی کردەوەو هاتە ژوورەوە، جلی پارچە پارچەو رووخسارو سینەی پڕ لە خوێن بوو، چاوی راستی هەڵمسابوو ئاوی لێ دەچکایەوە، لەکاتێکا جوێنی بە زەوی و زەمان دەدا، جلی لەبەر کردەوە سەری نایە ناو تەشتێ کە تایبەت بوو بە شوشتنی پیاڵەی شەراب و سینەو پشتی خۆی پاك کردەوە، پاشان دەمی نابە لێوی جەلیکانی شەراب و خواردیەوە، لەتووڕەییان شێت بووبوو بەسەریانا هاواری کرد کە:

- یاڵلا لەبەر چاوم دوورکەونەوە، سەگی پۆخڵینە، رێ و رەسمی لەگەڵ ئوستادبوونتان وادەبینن کە لەشەڕ راکەن؟ ئەی جەلیلیە ئەکبیریەکان، سامیرەییە پۆخڵە حەرامزادەکان))

پەترۆس زاتی دا بەر خۆیو گوتی ((خوا خۆی دەزانێ کە رۆحی ئێمە بەتاسووقەوە بوو بەلاّم جەستەمان نا.

- ئەو دەمە پیسەت داخە، ئەگەر رۆح حەزی لیّ بیّ، جەستە مانای نابیّ، هەموو شتیّ دەبێتە رۆح، هەتا ئەو گۆچانەی لەدەستت دایە، ئەو پاڵتۆیەی کە لەبەری دەکەیت، ئەو بەردەی پێی لەسەر دادەنێی، ترسنۆك سەیری من مەکە، ببینە جلم پارچە پارچە بووەو کەم مابوو چاوانم لەکاسە بێتە دەرەوە، هەی یاوەرانی پیسو پۆخڵی نەفرەتی، دەزانن لەبەرچی، چونکە بەرگریم لەمامۆستای ئێوە کرد، بەڵیّ منی مەیخانەچیو منی پۆخڵ، لەگەڵ هەموویان رووبەڕووبوومەوە، باشە ناپرسن بۆ؟ چونکە وام خەیاڵ کرد کە ئەو کریستیانویە، بەیانی دەگەمە هەزاران هەزار شت؟ نەخێر بەڵکو بۆ ئەوەبوو کە عیزەت نەفسم زاڵ بوو بەسەرما لەوەش پەشیمان نیم! سیمۆن بۆ سەرەوەو خوارەوە دەچوو، مێزەکانی بەملاو بەولادادەداو جوێنی دەداو تفی رووەدەکرد، مەتی جۆشی دەخواردو دەیەویست بزانی کە لەتەلاری کیافا چی روویداوە، هەرواش لەتەلاری پیلات، ئوستاد چی گوت، خەڵکی هاواری چییان دەکرد؟ تا ئەو بتوانی هەمووی لە کتێبی خۆی بنووسیّ، گوتی ((برام سیمون ئەگەر باوەڕت بەخودا هەیە ئارام بگرەو رووداوەکان بۆ ئێمە بگێڕەوە، بڵیّ چۆنو کەیو لەکویّ ئوستاد قسەی کرد؟)).

سیمون وەلاّمی دایەوە ((هەڵبەتە کە قسەی کرد، یاڵلا بنووسە گوتی ئەی یاوەران سەگ بتانخوا، باشە بۆ سەیری من دەکەی؟ ئەو قەڵەمەت بهێنە دەرەوەو بنووسە ((هەی سەگ هەمووتان بخوا))

سەدای شیوەن لەپشت جەلیلەکان هەڵسایەوە، یۆحەننا خۆی بەزەوی دادابوو قیژەقیژی دەکردو پەترۆس سەری لەدیوار دەکوتا.

مەتی دووبارە کەوتە تکاوە، ((سیمون ئەگەر باوەڕت بەخودا هەیە راستی بڵیّ تا بنووسم، مەگەرنازانی کە لەم ساتەدا چارەنووسی ئایندە بەم شتەوە بەندە کە دەیڵێی.

پەترۆس هێشتا سەری لەدیوار دەکوتا



مەیخانەچی پێی گوت ((پەترۆس نائومێد مەبە گویّ بگرە من پێت دەڵێم بۆ لەباوەش گرتنی شکۆو گەورەیی ئەبەدی دەبیّ چی بکەی؟))

هەر زوو ئەو بێرەدا رەت دەکەن، سەرو سەداکان دەبیستم قیت بەوە وەکو پیاویّ دەرگا بکەوە، بڕۆ پێشەوە خاچەکەی لێوەرگرەو بیخەرە سەرشانت، ئەوخاچە نەفرەتیە سەنگینەو خوداوەندی ئێوە ناسكو نارنجیو ماندووە)) لەکاتێکا پێدەکەنی بەپیّ لەپەترۆسی داو پێداچوو: ((ئەم کارە دەکەیت؟ یاڵلا بزانم تۆ چ پیاوێکی))

پەترۆس بە گریەکردنەوە گوتی ((ئەگەر ترسنۆك نەبووام سوێندم دەخوارد ئەم کارەم نەدەکرد، بەلاّم ئەوان پارچە پارچەیان دەکردم))

مەیخانەچی بەتووڕەییەوە تفی روکردو هاواری کرد ((هەمووتان چارەتان ونکەن هیچ یەك لەو کارانە ناکەن؟ ئەی تۆ ناتانیلی لەندەهۆر؟ تۆ ئەندریاسی بکوژ، هیچ یەك لەئێوە ئامادەنین؟ نەفرەتتان لیّ بیّ، ئاخ ئەی کریستیانوی بیّ چارەی من! سەیرکە چ فەرماندەییێکی بیّ غەلو غەشت بۆ فەتحی دونیا هەڵبژاردووە؟

ئەگەر منت هەڵدەبژارد، کاروبارت باشتر دەبوو، لەوانەیە موستەحەق بم کە لەدارم بدەنو بەسەر دەرگای شاردا هەڵمواسن، بەلاّم بەو هەموو عیزەت نەفسەی کە هەمەو کەسیّ عیزەت نەفسی هەبیّ پیاوە، هەرچەند ئارەق بخواتەوەو دزی بکاو درۆش بکات بەلاّم ئێوە کە عیزەت نەفستان نییە)) لەکاتێکا دووبارە تفی دەهاویشت، دەرگای کردەوەو بەتووڕەیی هاواری کرد: ((هۆ وادێت پاشای یەهود وادێت))

یاوەرەکان دووبارە لەپشت جەلیکانەکانەوە خۆیان شاردەوە، سیمون بەدەوری خۆیدا دەسووڕا ((مەگەر ئێوە عیزەت نەفستان نییە؟ نایەنە دەرەوەش کە بیبینن ها؟ دڵی ئەو بێچارەیە بە نیگایەك نادەنەوە؟ زۆر چاکە مادامەکیّ وەهایە خۆم دەڕۆم، دەستی بۆ رادەتەکێنمو دەڵێم، ((منم سیمونی قەیرەوانی ئامادەم)) بەیەك هەڵبەزینەوە خۆی گەیاندە جادەوە.

خەڵکە پۆل پۆل تێدەپەڕین، لە پێشیانەوە سوارەی نیزامی بوو لە دواشیانەوە کریست خاچی بە کۆڵەوە بوو خوێن لە سەرو ریشی سەرەو ژێر دەبۆوەو جلەکانی پارچە پارچە

بووبوون، ئیدی هێزی هەنگاو هەڵێنانی نەبوو، سەری تا دەهات زیاتر بۆ پێشەوە لار دەبۆوە، هەمیشە هەڵدەخزی. تا دەهات بەزەوی بکەوێ دووبارە بەسەر پێیەکانیەوە قەراری دەگرت، بەلەقە بۆ پێشەوەیان رادەدا، لەدوایەوە ئیفلیجو نابیناو عەیبدارەکان رایان دەکرد، لەدەستیا تووشی کفربووبوون، چونکە شفای بەوان نەبەخشی بوو، جوێنیان پێدەدا، گۆچانو داری ژێر هەنگڵیان حەوالە دەکرد، ناوە ناوە سەیری دەوروبەری دەکرد تا یاوەران ببینێ، ئاخ چییان بەسەر هاتبوو؟

لەدەرەوەی مەیخانە، مەیخانەچی بینی، کە دەستی بۆ رادەتەکێنێ دڵی شادبوو تا هات کەبەهێمای سەر مالاوایی لێ بکات، پێی بەبەردێ کەوتو کەوتە سەر زەمینەوەو غلۆربۆوەو خاچ کەوتە سەریەوە، نالاندنی قەیرەوانی رایکردو بەرزی کردەوە، خاچەکەی گرتو لەسەر کۆڵی خۆی دانا ئەو کاتە گەڕایەوە، بزەییێکی کردە کریستو گوتی ((ئازابە، مەترسە من لێرەم)) لەکەنار دەروازەی داود دا رەتبوون، لەکوێرە رێگایێ کە کۆتایی بە گەلگەتا دەهات دەستیان کرد بەسەر هەڵگەڕان. گەلگەتا هەمووی جەستەو بەردو دڕكو ئێسقان بوو، یاخیبووەکان لەم شوێنە لەخاچ دەدرانو جەستەیان دەبووە خۆراکی گۆشتخۆرەکان. هەوا بۆنی گەنیوی لاشەی لێدەهات قەیرەوانی خاچی بەسەر زەویەوە داناو دوو سەرباز دەستیان کرد بە هەڵکەندنی زەویو خاچیان لەمیانی بەردەکان بردە خوارەوە کریست بەسەر بەردێکەوە دانیشتو لە چاوەڕوانیدا مایەوە، خۆرەتاو بەسەر سەریەوە هەڵواسرابوو، ئاسمان سپیو ئاگرناكو داخراو بوو، نەمە شخەڵێ بوو نەفریشتەیێ نە هەتا نیشانەییکی بچووك، تا بەدەربخات کە کەسێ لەو سەرەوە سەیری رووداوەکان دەکات بەسەر زەویەوە، لەهەمان حاڵدا کلوخێکی بچووکی لەناو ئەنگوستەکاندا دەکوشی هەستی کردە کەسێ کە لە بەرابەری ئەو وەستاوە تەماشای دەکات، سەری بەئارامیو بێپەلە هەڵگرت، دیتیو ناسیەوە. بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((هاوسەفەری بەوەفام بەخێربێی، لێرەوە سەفەر کۆتایی دێت، ئەوەی کە تۆ دەتخوازی ئەوەیش کەمن دەمویست بەئەنجام گەیشت، بەدرێژایی ژیانم گەرەکم بوو نەفرین بکەم بە پاڕانەوە، ئەو کارەش گەیشتە ئەنجامو ئێستاکێ ئێمە دۆستی یەکترین، دایە، خوا ئاگادارت بێ))، دەستی بە بێحاڵیەوە بۆ



سێبەرێکی وەحشی راتەکاند. سەربازان شانیان گرت وهاواریان کردو پێیان گوت ((پاشای گەورە! رابەو بەسەر تەختی خۆت دانیشە)).

جلیان لەبەر کردەوەو رووتو قووتیان کردەوە جەستەی بەخوێن داپۆشرابوو، گەرما دادوبێدادی بوو، خەڵکی کە بە هاوارکردن خۆیان هیلاك کردبوو، بەخامۆشی سەیریان دەکرد سەربازێ پێشنیاری کرد ((باشتر وایە کەمێ شەراب بخواتەوە تاهێزی وەبەر بێتەوە،)) بەلام کریست پیالەکەی وەپاشداو بازووەکانی بەرەو خاچ درێژ کرد، بەزەمزەمەوە گوتی ((باوکە رازیم بە رازیی بوونی تۆ)) نابینایانو جوزامیانو عەیبدارەکان ئێستاکێ سەدایان بەرزکردەوە ((ئەی درۆزن، فێڵباز هەڵخەڵەتێنەری خەڵك)).

کۆنەپۆشەکان هاواریان کرد ((ئەی کوا مەلەکوتی ئاسمان؟ تەنوورە پڕنانەکان کوا؟)) بەڵکە لیمۆو بەردیان بۆ هاوێشت.

کریست قۆڵەکانی کردەوەودەمی کردەوە تابڵێ..

((برایان))، بەلام سەربازەکان گرتیانو دایاننایە سەرخاچ، ئەوکاتە —قەرەجەکان بزمار بەدەستەکانیان بانگکرد، بەلام لەوکاتەی کە چەکووش بۆ هەوا چوو یەکەمین دەنگی وەشانی چەکووشی گەیشە گوێ، ئاسمان رووخساری داپۆشی، بە بەرگوێ کەوتنی وەشانی چەکووشی دووەم ئاسمان تاریك هەڵگەڕاو ئەستێرەکان ون بوون، چی دەڵێم، ئەوە ئەستێرە نەبوون ون دەبوون، بەڵکو دڵۆپە درشتی خوێن بوو دەکەوتە سەر خاکەوە. وەحشەت زاڵ بوو بەسەر ئاپۆڕەکەوە، ئەو ئەسپانەی کە رۆمیەکان سواریان بووبوون رایان کرد لەکاتێکا پاشەکشەیان دەکرد بە رمبازیەوە یەهودیەکان لەژێر سمیاندا تولخاتەوە، ئەوکاتە زەویو ئاسمانو فەزا وەك چۆن زەمین لەرزەیێ لەپڕێکا خامۆش هەڵگەڕا سەری هەڵبڕیو سەیری دەوروبەری کرد وابەدیارکەوت کە بێهۆش بووە لەسپێتی رووخساری مردوێکەوە ئێستاکی لەمیانی تاریکی شیندا بەزەحمەت دەبیندرا. سەری خەڵك نەمان تەنها چاویان نەبێ وەکو چاڵە رەشەکان دیاربوون، فەوج فەوج ئاپۆڕەی قەلان دەهاتن کە بۆنی خوێنیان کردبوو. نالەییێکی شکایەتئامێزی کز لە خاچەوە دەبیسترا سیمون کە مۆری نابووە سەر داخی دڵەوە تا فرمێسك هەڵنەڕێژێ

سەری هەڵبڕیو سەیری کرد، لەپڕێکا هاوارێکی کرد، ئەوە پیلات نەبوون کە کریستیان میجکۆب دەکرد، نە، کۆمەڵێ لە فریشتەکانی ئاسمان بوو هاتنە خوارەوە، چەکووشو مێخیان لە دەست بوو، بەدەوروبەری کریستدا هەڵدەفڕینو بەشادومانی چەکووشیان بەرز دەکردەوەو بزماریان لەدەستو پێی دەدا ژمارەیێ لە فریشتەکان ئەویان بەگوریس توند بەستایەوە تا نەکەوێتە سەر زەوی، فریشتەییێکی وەك گوڵو کەزی زێڕین رمێکی لەدەست گرتبوو دڵی کریستی شەق دەکرد.

قەیرەوانی لەکاتێکا دەلەرزی کەوتە زەمزەمەوە ((ئەو چییە دەبینم؟ خودا خۆشی ئەو لە خاچ دەدات!))

ئەوکاتە هاوارێکی مەزنو دڵتەزێنو گلەیی ئامێز هەوای شەق کردو باڵی کێشا بەئاسماندا- خودایە- خودایە.

ئەو میحنەت کێشە نەیتوانی بەردەوامبێ، دەیەویستو نەبدەتوانی.. هەناسەی گیرابوو.. لەخاچدراو سەری شۆڕبۆوەو .. بێهۆش بوو.



## بەشی سییەم

پێڵووەکانی بەشادیو سەرسامییەوە بەسەریەك دا، ئەو یەك خاچ نەبوو، درەختێکی مەزن بوو، کە رەگو ریشەی لە زەویو لقو پۆپی لە ئاسمان بوو، بەهار تەواو گەیشتبوو، درەخت غەرقی شکۆفە بووبوو، بەسەر هەر لقێکەوە مەلێ هەڵنیشتبوو بالۆرەی دەچڕی، ئەو کە بەتەواوی قامەتەوە پشتی بەدرەختەوە دابوو، سەری بەرزکردەوەو ژماردی. یەك دوو، سێ،

لەبەرخۆ کەوتە زەمزەمەوە ((سیو سێ، دروست بەژمارەی ساڵانی عومرم سیو سێ مەل هەموویان نەغمە خوێن))..

چاوەکانی فراوان بوونەوە، لەقاڵبی خۆیان دەرپەڕین، تەواوی رووخساریان داپۆشی، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە دەیتوانی لەهەر لایەکی دونیا شکۆفە ببینێ، کە لە سەدەفی درزبردوو دەچوون، کوفرو گریانو هۆیها دونیایان دەگرتو دەیانکردە نەغمە، لەدڵی بەنێزە شەق بوویەوە خوێن بازرقەی دەکرد. باییێك هەڵینەدەکرد، بەڵام درەختی میهرەبان شکۆفەکانی خۆی یەك یەك بەسەر مێوی دڕكو دەستە خوێناویەکانیدا دەهاویشت، وەك چۆن لە نێو چڕی چەهچەهەکاندا هەولێدەدا تا وەبیر خۆی بهێنێتەوە کە بوو بوو لە کوێ بوو، لە پڕێکا هەوا بەشێوەی تۆزوبایێ پێچی خواردو قاڵبی گرتو فریشتەیێ لە بەرابەردا وەستا. لە هەمان ساتدا سپێدە هاتەدەر، ئەو چ لە حاڵەتی خەوو چ لەحاڵەتی بێداریدا، فریشتەییێکی زۆری بینی بوو، بەڵام هەرگیز فریشتەییێکی وەك ئەو فریشتەیەی نەبینی بوو، وای چەند جوانو گەرمو مرۆیی بوو دەزووی مووی گلۆازی سمێڵو ردێنی! چاوانی چەند پڕ لە بەزەیی، دەزووی مووی شینو رەشی قاچی تا سمتی خڕی ئەوی داپۆشی بوو، ژێر هەنگڵەکانی بۆنی ئارەقەییێکی

لێدەهات کە مرۆڤ حەزی لێ بوو، کریست لەڕووی سەرسامیەوە، لەحاڵێکدا دڵی دادەخورپا پرسی ((تۆ کێی؟)) فریشتەکە بزەیێکی هاتیۆ تەواوی رووخساری وەکو رووخساری مرۆڤێکی دڵڕفێن وابوو، دوو باڵی سەوزو پانی کۆکردەوەو نەیدەویست کریست زۆر هەراسان بکات. وەڵامی دایەوە ((من وەك تۆم، فریشتەی پاسەوانی تۆ، دڵنیابە)) دەنگی ئەو وەك دەنگی مرۆڤ قووڵو پڕ لاوانەوەو میهرەبانو ئاشنابوو، سەدای ئەو فریشتانەی تا ئێستا کریست بیستبووی زبربوونو هەمیشە ئەویان سەرزەنشت دەکرد، بەشادومانیو پاڕانەوە ئامێز سەیری فریشتەکانی کردو لەچاوەڕوانیدا مایەوە، تا دووبارە لێوی بۆ قسە بکاتەوە.

فریشتە ئارەزووی دڵی ئەوی دۆزیەوەو بەبزەوە تەسلیمی خواستەکانی ئەو بوو، ((خوادوەند منی ناردووە تا شەهد بۆ لێوەکانت بهێنم، مرۆڤەکان تاڵییێکی زۆریان هەڵڕژتۆتە ناو دەمی تۆوەو هەروا ئاسمانەکانیش، تۆ ئازارت چەشتووەو نەبەردیت کردووە، لەتەواوی عومری خۆت رۆژێك خۆشیت بەخۆوەنەدیووە. دایك، برا، یاوەران، هەژاران، ئیفلیجەکانو زوڵملێکراوان لە دوا ساتی ترسناکدا تۆیان بەتەنها جێهێشت بەسەر تاشەبەردەوە لەتاریکیدا تەنهاو بێ بەرگری مایتەوە، ئەو کاتە باوك بەزەیی بەتۆ هاتەوەو منی بانگ کرد کە ((ئاهای تۆ، بۆ رۆیشتبووی؟ مەگەر فریشتەی پاسەوانی ئەو نیت؟ باشە دابەزەو رزگاری کە من نامەوێ ئەو لە خاچ بدرێ، ئیدی بەسە)).

بەلەرزینەوە وەڵامم دایەوەو گوتم ((ئەی یەهوەی سەبایوت مەگەر ئەوت بۆ زەوی نەناردووە تا بۆ رزگاری مرۆڤایەتی لەخاچ بدرێ؟ لەبەر ئەمەیە بێ شڵەژان لێرە دانیشتووم وام خەیاڵ کرد کە خواستی تۆ بوو)).

خوداوەند وەڵامی دایەوە ((لێگەڕێ با لەخەون لەخاچ بدرێ، لێ گەڕێ مەزەی هەمان ترسو دەرد بچێژێ))

کریست لە کاتێکا سەری فریشتەی بە دوو دەست گرتبوو تا لە دەستی نەدات هاواری کرد ((ئەی فریشتەی پاسەوان من سەرسامم مەگەر لەخاچ نەدراوم؟ فریشتە دەستی تەواوی سپی خۆی دانایە سەر دڵی پڕ لە هەڵچوونی کریستەوە تا ئارامی کاتەوە ((ئازیزی من ئارام بگرە، مەشڵەژێ، نە، تۆ لەخاچ نەدراوی))



- کەواتە خاچ خەونێك بوو، بزمارەکانو ئازارو خۆرەتاو تاریك بوون؟

- بەڵی خەونێ بوو تۆ تەواوی رێو رەسمی پرسەی خۆت لە خەوندا جێبەجێ کردووە. بە بەرزایی خاچدا هەڵگەڕاوی لەخەوندا پێیەوە بزمارکوت کرای، ئەو پێنج برینەی دەستو پێیەکانو دڵت لەخەوندا کەوتوونەتە تۆوە، بەڵام سەیر کە بەهێزێکی وایە کە هێشتا خوێن بازرقە دەکات. کریست لە حاڵەتی بێهۆشیدا سەیری دەوروبەری کرد، ئەو لە کوێ بوو؟ ئەو مەزرا سەوزەو ئەو درەختە شکۆفەدارو ئاوانە چی بوون؟ ئورشەلیم؟ رۆحی؟ بەرەو لای فریشتە گەڕایەوە دەستی دایە قۆڵی، وای کە گۆشتی لەش چەند فێنكو توند بوو! گوتی ((ئەی فریشتەی پاسەوانی من کە قسە دەکەی، گۆشتی لەشم ئارام دەبێتەوە، خاچ دەبێتە سێبەری خاچو بزمار دەبێتە سێبەری بزمارو رێو رەسمی لەخاچ دان لەبەرزایی سەرمەوە لە ئاسمان وەك چۆن هەوری مەلەوانی لێدێ)) فریشتە گوتی ((وەرە بابڕۆین)) بەسەر مەزرای شکۆفەدارەوە بەنازو فیزەوە کەوتە پیاسەوە.

((کریستی ناصیرەیی لەززەتە گەورەکان چاوەڕوانیت دەکوژن، خوداوەند منی ئازادکردووە لەوەی کە چەشەی تەواوی ئەو لەززەتانەی کە تۆ بەدزیەوە ئارەزووت کردووە بیچێژمە تۆوە، ئازیزی من زەوی چاك دەیبینی، شەراب، خەندە، لێوانی ژنێك، وەسوەسەی یەکەمین مناڵ بەسەر ئەژنۆتەوە، هەموویان چاکن، ئێمەی فریشتە باوەڕ دەکەین؟ هەموومان لە ئاسمان لاردەبووینەوە زەویو سەیرمان دەکردو ئاخمان هەڵدەکێشا)).

باڵە سەوزو گەورەکانی کەوتنە تەکانەوەو کریستیان لەباوەش گرت، گوتی ((سەرت وەڕسووڕێنەو سەیری دواوەت بکە)).

کریست سەری وەرسووڕاندو گوتی وای خودای من، چی بینی! ئەوان دەوران، گردۆڵکەی ناصیرە لەنێو خۆرەتاودا هەڵکشابوو دەدرەوشایەوە، دەرگاکانی قەڵا کرابوونەوە، کۆمەڵێ لە هەزار نەفەر لە پیاوماقووڵو خانمانی گەورە دەهاتنە دەرەوە، جلی زێڕیان لەبەرابوو، سواری ئەسپێ بووبوون، پەرچەمی سپی نوقرەیی کە بە جیوەی زێڕین رازابۆوە، لەهەوادا دەشەکایەوە، دەستەیەك بەناو کێوەکانەوە کە بە گوڵ

داپۆشرابوون دابەزین، لەکەنار تەلارەکانی شاهی دا بەشە کەم قوولەکانی رووبار رابردن، هەراو زەناییێکی تێکەڵ بەخەندە، گفتوگۆو ئاهی دڵنەواز کە لە پشت قەدی زلی درەختانەوە دەهاتو بەرگوێی دەکەوت..

کریست بەسەرسامیەوە پرسی ((ئەی فریشتەی پاسەوان، ئەو کۆمەڵە پیاوماقووڵو ئەشرافانە کێن؟ ئەو پاشاو شاژنانە چ کەسێکن؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟ فریشتە بەبزەییێکەوە وەڵامی دایەوە ((ئەوە دەستەی زەماوەندی شاهانەیە دەچنە جەژنی زەماوەندەوە))

- کێ دەیەوێ زەماوەند بکات؟

- تۆ، ئەوە یەکەمین لەززەتێکە کە هەڵیدەڕێژمە دەمی تۆوە.

خوێن هێرشی کردە مێشکی کریستەوە، لەپڕێکا وای بۆ هات کە دەبێ بووك کێ بێ، لەشی غەرقی شادومانی بوو.

ئێستاکێ ئەو بەپەلە بوو گوتی ((بڕۆین))

یەکسەر هەستی کرد کە ئەویش سواری ئەسپێکی سپییە بەلغاوی بریقەداری زێڕینەوە سواربووە، سەیری خۆی دەکرد.

پەڕێکی شین بەسەر سەریەوە تەکانی دەخوارد، کراسی بچووکو هەزار پینەی مەخمەلی ئەو ببووە زێڕ، پرسی ((ئایا ئەوە هەمان مەلەکوتی ئاسمانە کە بە مرۆڤەکانم راگەیاندبوو؟))

فریشتە بە خەندەکردنەوە وەڵامی دایەوە ((نا... نا.. ئەوە زەویە))

- ئەی بۆ ئەوەندە گۆڕاوە؟

- زەوی نەگۆڕاوە، تۆ گۆڕاوی، زەمانێ دڵی تۆ زەوی گەرەك نەبوو، کە بەدژی خواستی بوو، ئێستاکێ دەیەوێتو تەواوی رازەکەی لێی شاردراوەتەوە، کریستی ناصیرەیی هاوئاهەنگی نێوان زەویو دڵ، مەلەکوتی ئاسمان وایە.... بەڵام بۆ کاتی خۆمان بەقسە بەسەر ببەین؟



- وەرە بووك چاوەڕوانە.

فریشتە ئێستاکێ سواری ئەسپی سپی بوو، لەگەڵ یەك رۆیشتن لەکێوەکانی دوای ئەوەوە ئەسپەکان دەیانحیلاند، خەندەی ژنان زۆر بوو بوو، مەلەکان باڵیان لێکدەداو هەموو شتێکیان بەرەو باشوور رادەکێشاو نەغمەیان سەر دابوو ((ئەو وادێت .. ئەو وا دێت.. ئەو وادێت..))

دڵی ئێستاش مەلێك بوو بەسەر سەریان هێلانەی کردبوو.. چەهچەهەی بوو ((من وادێم من وادێم... من وادێم))، بەڵام کاتێ کە ئەسپەکەی چوار ناڵە تەواوی دەدا، لەپڕێکا لەمیانی شورو شادمانی گەورەی خۆی کەوتەوە یادی یاوەرەکانی خۆی، سەیری دواوەی کرد لەمیانی پیاوماقووڵو خانماندا کەوتە گەڕانو سووڕان بەدوای ئەوانەوە، بەڵام ئەوانی نەدۆزیەوە، بەسەرسامی سەیری هاوەڵەکانی خۆی کرد ((یاوەرانی خۆم نابینم لەکوێن؟ ئەوان نابینم))

بەخەندییێکی تیز ئامێزەوە وەڵامی بیست کە ((پەرشو بڵاوبوونەتەوە))

- بۆ؟

- بەخاتری ترس.

- هەتا یەهوداش؟

- هەموو هەموو، ئەوان گەڕانەوە کەشتیەکانی خۆیان، یا لە کوختەکانی خۆیان خۆیان شاردۆتەوە، سوێندیان دەخوارد کە قەت تۆیان نەدیتووەو نەناسیوە، ئیدی ئاوڕمەدە دواوە، لەبیریان کە، سەیری پێشەوە بکە.

عەتری جاویدانەی درەختەکانی لیمۆی گوڵ کردوو هەوای داگرتبوو.

فرشتە لەکاتێکدا لەئەسپ دانەدەبەزی گوتی ((گەیشتن، ئەسپی ئەو بوو بەبروسكو ون بوو..

دەنگی رمبەییێکی شکۆدارو پڕ لە حیرمانو شەوق لەناو زەیتونستاندا دەنگی دایەوە، کریست دووچاری شڵەژان بوو، وەك بڵێی ئەو دەنگە لەدەروونی خۆی هەڵدەستا،

سەیری کرد گاییێکی بریقەدارو کەفەڵ درشتی دیت کە لەقەدی دارزەیتونیێ بەسترابۆوە، نێوچەوانی گایەکە رەش‌و سپی بوو، کلکی قیت کردەوەو تاجێکی بووکێنی بەسەر شاخەکانیەوە بوو، کریست هیچ کاتێ هێزێکی واو درەوشانەوەییێکی واو بازووییێکی وا توندو چاوێکی وا رەش‌و پڕ هێزی نەبینی بوو، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((ئەوە گا نییە، بەڵکو یەکێ لە رووخسارە رەشەکان‌و بی مەرگی خوداوەندی گەورەیە))

فریشتە لە کەناریا وەستاو بە مەکرەوە بزەییێکی کرد: ((کریستی ناصیرەیی هەراسان مەبە ئەو گۆڵکێکە، گوڵکێکی نێر، سەیرکە چۆن زمانی هەڵدەسووڕێنیێو لووتی دەلێستەوە، سەری هێنایە خوارەوەو قۆچی لەدار زەیتون دەدا، دەیەوێ لەگەڵیا بجەنگێ کە چۆن خۆی رادەتەکاند تا گوریسەکە پارچە پارچە بکات‌و رابکات، ئەوکاتە سەیری چەمەنزار بکە چی دەبینی؟))

- گۆلکە مێ، مێنگینەکان وا دەلەوەڕێن

- ئەوان نالەوەڕێن، بەڵکو لە چاوەڕوانی گۆلکە نێرن تا کندرِ پارچە پارچە بکا، گوێ بگرە چۆن دەبۆڕێنیێ، چەند نەرم‌و نیان، چ پاڕانەوەییێ، چ قودرەتیێ! دروست وەکو خودایی رەش‌و بریندار، کریستی ناصیرەیی بۆ رووخسارەت تووڕە ئامێزە؟ بۆ بەوان چاوانی رەش‌و رووت لە خەندە ئاوا سەیری دەکەی؟

کریست بە ئارامی هاواری کرد: ((بڕۆین)) دەنگی تژی لە نەرم‌و نیانی‌و پاڕانەوەو قودرەت بوو، فریشتە بەپێکەنینەوە وەلامی دایەوە ((سەرەتا گۆلکەکە رەها دەکەین، دڵت پێی ناسووتیێ؟)) نزیك کەوتەوەو کندرەکەی کردەوە، بۆ ساتێ ئاژەڵی نێر تەکانی نەخوارد، بەلاّم لەپڕێکا تێگەیشت کە ئازاد بووە، بەهەڵبەزینێکەوە بەرەو لای چەمەنزار کەوتە راکردنەوە.

دروست لە هەمان کاتدا کریست دەنگی زرینگە زرینگی بازن‌و گەردەنبەندەکانی لەناو باغی لیمۆ بیست، ئاه کە چ سالأنێکە لە چاوەڕوانی ساتێکی وام بەسەربردووە! چ کەسێ کەوتە نێوانمان‌و نەیهێشت ئازاد بین- خودا؟ بۆ دەگریت؟))

- مەعبودم لەشەوقان دەگریم.... تاسووقێکی زۆرم هەیە.. وەرە!



- بڕۆین رێنماییم بکە.

کریست گەڕایەوە تا خواحافیزی لە هاوسەفەری بکات، بەلاّم لەهەوادا ون بوون، لەدوای ئەوانەوە، دارو دەستەی پیاوماقوولاّن‌و خانمان‌و شاو ئەسپەسپیەکان‌و جیوەی سپیش ون بوون، لەخوارەوە لە چەمەنزاردا نێرەگوڵك کەوتبووە سەرپشتی مێینگینەکان‌و دەپەڕی.

- مەعبودم بەدوای کێ دەگەڕێی؟ بۆ سەیری دواوە دەکەی؟ ئێمە تەنها دوو نەفەر لە جیهان ماوین پێنج برینی دەست‌و پێ‌و دڵت ماچ دەکەم، وای کە چ لەززەتێکەو چ جەژنێکی شکۆدارە، تەواوی جیهان رابووە وەرە.

- بۆ کوێ؟ دەستت بێنەو رێنماییم بکە.. پشتم بەتۆ بەستاوە.

- تۆ دەبەمە باغێکی چڕ، تاقیبیان کردوویت‌و دەیانەوێت دەستگیرت بکەن- هەموو شتێ ئامادەبوو، خاچ، بزمار، ئاپۆڕەی خەڵك، پیلات- بەلاّم لەپڕێکا فریشتە هات‌و تۆی رفاند، تاخۆرەتاو سەر هەڵنەگەڕاوە تۆیان نەدیوە، ئەوان تووڕەبووینە.. مەرگی تۆیان گەرەکە.

- مەگەر چیم لێ کردوون؟

- تۆ چاکەی ئەوان‌و رزگاری ئەوانت دەویست، چۆن چاوەڕوان دەکەی کە بۆخاتری ئەوان بتبەخشن؟ مەعبودی من دەستت بدە من، بەدوای ژن کەوە، ئەو بەدڵنیایی هەمیشەییەوە رێ دەدۆزێتەوە.

دەستی کریستی گرت، پەردەی ئاگرینی ئەوی لەکاتێکا بەپەلە لەژێردرەختەکانی لیمۆی پڕگوڵدا رێی دەبڕی فوو کرد.

ئەنگوستی خۆی بەدەوری ئەنگوستەکانی پیاوەکە ئەڵقەکردبوو، لەبەرتوندی گەرمایی دەسووتا دەمی بۆنی پەلکە لیمۆی دەدا، بەهەناسەبڕکێوە، بۆ ساتێ وەستاو سەیری کریستی کرد، کریست دەلەرزی، چونکە چاوانی مەجدەلیە، وەکو فریشتە، فریودەرو مەکربازانە هەڵدەزۆقیەوە، بەلاّم مەجدەلیە بۆی پێکەنی.

- مەعبودم هەراسان مەبە، ساڵەهای ساڵە قسەیێکم لەسەری زمانە، بەڵام هەرگیز زاتی ئاشکرا کردنیم بۆ تۆ نەبووە، ئێستا ئەو کارە دەکەم.

- چییە؟ خۆشەویستم بێ ترس بڵێ.

- چونکە لە ئاسمانی حەوتەمیو ڕێبوارێ داوای کاسەیێ ئاوی تۆ بکات، لەئاسمان بێتە خوارەوەو داوای ئەو جێبەجێ بکرێ، چونکە مرۆڤێکی پیرۆزی ژنێ ماچی لەتۆ داوا بکات، لەعەرشی پیرۆز وەرە خوارێو درێغی بۆ مەکە لەغەیری ئەمە ناتوانی رزگاربێت.

- کریست ئەوی گرتو سەری لار کردووەو لێوەکانی ماچ کرد.

ڕەنگ لە رووخساری پەڕی، ئەژنۆکانی شل بوون ئیدی نەیتوانی هەنگاوێکی تر بڕوات لەژێر درەختی پڕگوڵی لیمۆدا ڕاکشان، دەستیان کرد بە گەوزین بەسەر زەویدا، خۆرەتاو هاتو بەسەر بەرزایی سەریانەوە وەستا، شنەیێ دەستی بەهەڵکرن کردو چەند شکۆفەیێ لە لێو بەسەر ئەو دوو جەستە رووتەدا کەوتە خوارەوە، مارمیلاکێ لەبەرامبەریان خۆی چەسپاندە سەربەردێکەوە بەچاوانی خڕیەوە بێ جووڵە، سەیری ئەوانی دەکرد، جارناجار دەنگی گایێ کە ئێستاکێ تێر بووبوو لەدوورەوە دەبیسترا، بارانێکی وردونەرمو نیان دوو جەستەی ئاگراوی فێنك کردەوەو بۆنی خاکی لەهەوادا پەرشو بلاوکردووەوە.

ئیدی پیاوەی لەباوەش کردو جەستەی ئەوی بەجەستەی خۆیەوە دەنووساند، وەکو پشیلە دەمیاواند.

- تا ئێستا هیچ پیاوێك منی ماچ نەکردووە، هیچ کات هەستم بە لاوانەوەی ریشی پیاوێ بەسەر لێوو گۆناو ئەژنۆکانی لەمیانی ئەژنۆکانم نەکردووە، ئەمڕۆ رۆژی لەدایك بوونی منە.!...

کۆرپەلەم دەگریت؟



- ژنی خۆشەویستم هیچ کات نەمدەزانی کە دونیا وا جوانو لەش ئاوا پیرۆزە لەشیش کچی خودایە، خوشکە بەناوی رۆح، هیچ کاتێ نەمدەزانی لەززەتی لەش گوناهی وای نییە.

- بۆ دەستت کرد بەفەتحی ئاسمانو ئاخت هەڵکێشا بەدوای ئاوی پەرجووئاسای ژیان کەوتی؟ ئاوی حەیات منم، تۆ لاربوویتەوەو ئەم ئاوەت نۆشیو ئارام بوویتەوە- رۆڵەم هێشتاش ئاخ هەڵدەکێشیێ؟ بیر لە چی دەکەیتەوە؟

- دڵم گوڵی پەژموردەی ئەریحایە ئەگەر لەناو ئاوی دانێیت دووبارە گیانی وەبەردێتەوەو گوڵو گەڵاکانی دەبنەوە، ژن سەرچاوەی ئاوی حەیاتە... ئێستا تێدەگەم.

- کۆڕەکەم لەچی؟

- کە ڕێگە هەر ئەوەیە.

- ڕێگە. کریستی ئازیزم کام ڕێگە.

- هەمان ڕێگایێ کە ئەوەی چوو ئاووئاودەچێ، هەمان ڕێگایێ کە لەڕێیەوە خوداوەند لەشێوەی مرۆڤ دادەبەزێتە سەر زەوی، من کەوتوومەتە بێ ڕێگایی، چونکە کەوتمە دوای ڕێگایێ لەدەرەوەی لەش، دەمویست لەڕێگەی هەورەکانەوە، بەڕێگەی ئەندێشەی مەزنەوە دابڕۆم، ئەی ژنی هاوکارو بەنرخی خودا، لێم ببوورە، من ئەی دایکە خودا لەبەرابەر تۆدا دەچەمێمەوەو ستایشت دەکەم، ناوی ئەو کوڕە چ بنێین کە دەمانبێ؟

- ئەو ببە ئوردنو لەبەرابەر دڵویستی خۆت ئاوەمۆری کە... ئەو کوڕی تۆیە

- وەرە تا ئەو بە پاراکلیت بانگ بکەین واتە.. دڵدەرەوە

- هس، دەنگی پێیەك لەناو درەختەکانەوە دەبیستم، دەبێ غولامی چوکەڵەی بەوەفای خۆم بێ، پێم ڕاسپاردبوو کە ئاگاداربێ کەسێ نزیك نەکەوێتەوە.. ئەوەتانێ..

- خانم شاوول

چاوە سپیو درەوشاوەکانی کوڕە سەمای دەکرد، لەشی خەپڵەی ئەو وەکو لەشی ئەسپێك دوای تاودان شەلاڵی ئارەقەبوو، مەجدەلیە هەڵسایەوە سەرپێو دەستی لەسەردەمی ئەو دانا ((بێدەنگ بە)) ئەوکاتە رووی لە کریست کردو گوتی ((مێردی ئازیزم، تۆماندووی، بخەوە، هەرزو دەگەڕێمەوە))

بەڵام کریست پێشتر چاوی نابووە سەریەك، خەوی خواردنەوە باڵی بەسەر پێڵووەکانیدا کێشابوو، مەجدەلیەی نەبینی کە لەژێر درەختی نارنجدا رابردوو لە ڕێگەجادەی خەڵوەتەوە ونبوو، بەڵام زەینی هەڵسایەوە.

لەکاتێکا لەشی خۆی خێواندە سەر زەوی، بەدوای مەجدەلیەدا کەوتە رێ، مەجدەلیە بۆ کوێ دەچوو؟ بۆ لەپڕێکا چاوانی پڕ لە ئەشك بوو دونیا تاریك هەڵگەڕا؟

زەینی کریست وەك شاهینێ لەبەرزایی ئەو چاوانەوە کەوتە هەڵفڕینو مۆڵەتی راکردنی پێنەدا.

غولامچەکە تووشی وەحشەت بوو، بەهەڵبەزینو دابەزینەوە بۆ پێشەوەدەچوو، لەزەیتونستانەکاندا رەت بوون، خۆرەتاو هێشتا ئاوانەبووبوو، چوونە ناو چەمەنزارێکەوە، گۆلکە مێ بەسەر گیاو گۆڵەوە راکشابوو، کاوێژی دەکرد لەدۆڵی تەنگی سێبەراویو بەردەلانْدا کە دەنگی حەپەی سەگانو دەنگی هەناسەی مرۆ دەگەیشتە گوێ چوونە خوارەوە، غولامچەکە تووشی وەحشەت بوو گوتی ((من دەڕۆم)و رایکرد.

مەجدەلیە تەنهاو تەنها لەشوێنی خۆی مایەوە سەیری دەوروبەری خۆی کرد، هەمووی بەردو تاوێری چەخماخو ژمارەیێ تووترك بوو، دار هەنجیری جەنگەڵیو وشتر بەسەر تاوێرەوە بەشێوەییێکی ئاسۆیی سەریان بۆ پێش هێنابوو، دوو قەل کە بەسەر بەرزترین خاڵی گاشەبەردێکەوە سەریان بۆ پێشەوە هێنابوو چاوەدێریان دەکرد، تا چاویان بەمەجدەلیە بکەوێ، دەستیان کرد بە قاڕەقاڕو لە گوێی جووتی خۆیان دەخوێند.



مەجدەلیە گوێی لەوێککەوتنی بەردەکان بوو، مرۆکان بەسەر تەختە تاوێرەکانەوە هەڵدەگەڕان، سەگێکی رەشو خاڵ خاڵی قورمزی بەهانکەهانکەوە بەدیارکەوت، دۆڵی تەنگ وەکو گۆڕستانێکی پڕ لە درەختی سەرونیازی لێهات.

- بانگێکی ئارامو هێمنو زاری بیسترا ((بەخێر بێی))

مەجدەلیە سەیری دەوروبەری کردو گەڕایەوە ((کێ بوو قسەی کرد؟ کێ لە هەواڵی منی پرسی؟

- من

- تۆ کێی

- خودا...

- خودایە! ئێ مۆڵەتم بدە با کەزبەکانم داپۆشمو مەمکەکانم بشارمەوە، خوداوەند. رووخساری خۆی وەرگێرا، نەبادا بەڕووتی بمبینی، شەرم دەکەم، بۆمنت کێشایە ئەم بیابانە کێویە؟ من لەکوێم؟

شتێ جگە لە درەختەکانی سەروینازو دارخورما نابینم.

- دروستە! مەرگو جاویدانی.. ئەی شەهیدی گەورە، تۆم دەق بۆ ئەو شوێنەی کە دەمویست هێناوە، مەجدەلیە خۆت ئامادەی مەرگ بکە تا جاویدان بیت.

- من نامەوێ بمرم... من نامەوێ جاویدانی بم، لێگەڕێ با ژیانی خۆم لەسەر زەوی بەسەر بەرم، ئەوکاتە بمکە بەخۆڵەمێش.

- مەرگ کاروانێکە کە بارەکەی عەترو- کافورە، مەجدەلیە هەراسان مەبە سواری وشتری رەش بەو بچۆرە بیابانی بەهەشتەوە.

- ئاه ئەو رێبوارە شێتانە کە لە پشت ئەو درەختانەوە سەریان هێناوەتەدەر کێن؟

- مەجدەلیە، هەراسان مەبە، ئەوانە وشترەوانی منن، دەست بخەرە سەر چاوەکانت مەگەر ئەم وشترە رەشە خۆیو جیازی مەحمەلی کە سواری دەبیت، نابینی؟ پیلە مەکە.

- خودایە من لە مەرگ ناترسم، بەلاّم گلەییم هەیە هەر ئێستا بۆ یەکەمین جار رۆحو جەستەم شایستەی هەبوونی دەمێکیان پەیدا کردووە، بۆ یەکەمین جار جەستەو رۆحم بە یەکەوە کەوتنە کەنارەوە، من دەبێ بمرم.

- مەجدەلیە ئەم ساتە بۆ مردنی تۆ ساتێکی شکۆدارە، باشتر لەم ساتە نادۆزیەوە، پیلەمەکە.

- ئاخ ئەو هاوارو هەڕەشانەو ئەو قاقای خەندەیە چییە؟ خوداوەند بەتەنها، جێم مەهێڵە، ئەوانە بۆ کوشتنم دێن.

هاوارێکی ئارامو رازیبوونێ .. ئێستاکێ دووبارە لەو دەوروبەرانەی بیست ((مەجدەلیە تۆ گەیشتیە بەرزترین خاڵی لەززەتی ژیان، ناتوانی زیاتر لەمە بڕۆی، مەرگ میهرەبانە.. مالاّوا تا دیداری ئایندە، ئەی یەکەمین شەهید)) بانگەکە نەما، لەپێچی دۆڵی تەنگدا، ئاپۆڕەی شێتانەی خزمەتکارانی کلێساو کۆیلە خوێنخۆرەکانی کیافا بەتیغو تەورەوە هاتنە دەرەوە، مەجدەلیەیان بینی، سەگ ومرۆڤ کەوتنە گیانیەوە.

بەقاقاو خەندەوە هاواریان کرد ((مێرێی مەجدەلیی)).

هەورێکی رەش خۆرەتاوی داپۆشیو زەوی تاریك هەڵگەڕا.

ژنە بێ نەواکە هاواری کرد ((من ... بووم... بەلاّم ئێستا هەو نیم، من ئەمڕۆکە لە دایك بووم)).

- کێی .....

- وابووم، بەلاّم، نا سوێند دەخۆم، بەزەییتان بەمن بێتەوە مەمکوژن، ئێوە کەچەڵو ورگنو پێ گۆجەکان ئێوە کێن؟ تۆ قەمبوور دەست لەمن مەدە.



- ......، من شاوولم خودای سراییل منی ناردووەو سەرپشکی کوشتنی تۆی بەمن داوە.

- کوشتنی چ کەسێ؟

- ئاشقەکەت

- شاوول گەڕایەوە لای گروپی خۆی ((کوڕینە هێرش کەنە سەری، شوێنی ئاشقەکەی لەبن زمانی دەربهێنن، جندەخانم ئەوت لەکوێ شاردۆتەوە؟

- من نالێم

- تۆ دەکوژم

- لە بیث ئنیا.

- درۆزن، من هەر ئێستا لەوێ دێم ئەوت لە هەمان جێ شاردۆتەوە یاڵلاّ راست بڵێ.

- کەزیەکانم بەردە! بۆ دەتەوێ ئەو بکوژی؟ مەگەر چی لە ئێوە کردووە؟

- هەرکەسێ دەست لە رێبازی پیرۆز هەڵگرێ، سزاکەی مەرگە.

قەمبوور، لەهەمان کاتدا کە قسەی دەکرد، نیگاییێکی شەهوەت ئامێزی کردە مەجدەلیە، نزیكو نزیکتر کەوتەوە، ئاگر لەهەناسەی دەرپەڕی، مەجدەلیە پێڵووەکانی لێکداو گوتی ((شاوول سەیری مەمكو بازوو گەردەنم بکە، بەڕاستی حەیف نییە کە بچنە ژێر خاکەوە، مەیانکوژە!)) شاوول دیسان هاتە پێشەوە، دەنگی دڕو نووساو بوو ((دانی پیا بنێ کە ئەو لەکوێیە تا تۆ نەکوژم، من حەزم لەمەمكو بازوو گەردەنی تۆیە، رەحم بەجوانی خۆت بکەو دانی پیابنێ، بۆ وا سەیرم دەکەی؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟

- شاوول لەکاتی هەڵکێشانی ئاخ، بیرم دەکردەوە، ئەگەر خوداوەند لەپڕێکا دڵت رۆشن بکاتەوەو حەقیقەت ببینی، چ پەرجوویێ لەتۆ سەرنادا! بۆ فەتحی دونیا، ئاشقی

من پێویستی بەیاوەرانی وەکو تۆ هەیە نە ماسیگرو دێوەرەو شوانەکان، بەڵێ ئەو پێویستی بەمەشخەڵەکانی تۆ هەیە شاوول.

- فەتحی دونیا! مەگەر ئەو دەیەوێت فەتحی دونیا بکات؟ چۆن؟ مەجدەلیە قسە بکە چونکە ئەوە هەمان کارە کەمن دەمەوێ بیکەم

- بەئیشق

- بەئیشق؟

- شاوول گوێ بگرە لە قسەکانم ئەوانی دیکە بنێرەوە بابڕۆن، نامەوێ ئەوان گوێیان لێ بێ، ئەو پیاوەی کە تۆ بە دوایدا دەگەڕێیو دەتەوێ بیکوژی کوڕی خودایە، رزگار بەخشی دونیایە، کریستیانو بەڵێ کریستیانو! بەڵێ بەو رۆحەی کە دەیسپێرمە ئاستانەی خوارەوە سوێند دەخۆم.

خزمەتکارێکی ریقنەی سیلدار بە ردێنێکی خۆڵەمێشی کەم پشت بە هیسە هیسەوە گوتی: شاوول ... شاوول بازووەکانی داوی مەرگە ئاگاداربە.

- دوورکەوە...

شاوول دووبارە رووی لەمەجدەلیە کرد ((بەئیشق؟ منیش دەمەوێ دونیا فەتح بکەم، دەچمە بەندەرکانەوەو سەیری رۆیشتنی کەشتیەکان دەکەمو دڵم ئاگر دەگرێ، دەمەوێ بگەمە کۆتایی دونیا، بەڵام نەك وەك یەهودییێکی کۆیلەو نەوەکو پاشاییێکی شمشێردار بەڵکو ... چۆن؟ ناکرێ، واهەست بەبچووکی دەکەم کە دەمەوێ خۆم بکوژم لەم گێروگرفتەدا بەکوشتنی ئەوانی دیکە ئارام دەبمەوە))

بۆ ساتێ بێدەنگ مایەوە ئەوکاتە دیسانەوە لەژنە نزیك کەوتەوە، بەشێوەییێکی ئارام گوتی ((مەجدەلیە، ئاغات لەکوێیە؟ بەمن بڵێ تا بەدوای بگەڕێمو قسەی لەگەڵ بکەم، داوای لێدەکەم تا چۆنیەتی ئەشقو ئەو جۆرە ئەشقەی کە فەتحی دونیای پێدەکات بۆمن باس بکات... بۆ دەگریت؟



- چونکە نامەوێ جێی ئەوت بۆ ئاشکرا بکەم، دەمەوێ ئێوە دوو نەفەر لەگەڵ یەك دیدار بکەن، ئەو تەواو میهرەبانەو تۆ ئاگری، دەتوانن لەگەڵ یەك فەتحی دونیا بکەن، بەلاّم متمانەم بە تۆ نییە، نا شاوول متمانەم بە تۆ نییە، لەبەر ئەمەیە دەگریم مەجدەلیە هێشتا قسەی دەکرد ((برایان بەناوی خودای ئیبراهیمو ئیسحاقو یاکوب بیهاوێژن)). ئەمەبوو کە یەکەمین بەردی هەڵگرتو نیشانەی لە شەویلاکی گرت.....

یەکێ لە کۆیلەکان هاواری کیافای کرد ((ئەم بەردەش بۆ دەمی هەزار جار ماچکراوی!)) ددانەکانی مەجدەلیە پەرشو بلاّوی زەوی بۆوە..

- ئەمەش بۆ سکی

- ئەمەش بۆ دڵی

- ئەمەش بۆ لووتی

مەجدەلیە سەری لەناو مەمکەکانی شاردەوە تا بەردی پێنەکەوێ، خوێن، لە دەمو مەمكو سکی هەڵدەڕژا..کەوتە گیانەللاّوە.

شاهین باڵەکانی لێکدا، چاوە خڕکەڵەکانی ئەو هەموو شتێکی دەبینی، بەهاوار کردنێکی دڵتەزێنەوە جەستەی خۆی کە هێشتا لەژێر دار لیمۆکاندا خەوتبوو، بینیو چووە ژوورەوە، پیلوەکانی کریست لێکیان دا دڵۆپە بارانێکی درشت کەوتە سەر لێوەکانی، بێداربۆوەو غەرقی ئەندێشەبوو بەسەر خاکی تاتەشۆری ماڵەوە دانیشت، ئەوە چ خەونێك بوو بینی بووی؟ نەیدەتوانی وەبیرخۆی بهێنێتەوە، شتێ جگە لە بەردەکانو ژنێكو خوێن هیچی دیکەی لەبیر نەمابوو، ئایا ئەو ژنە دەکرا ...... بێت؟ رووخساری ژنە وەکو ئاو هەڵدەڕژاو دەچۆوە ناو یەكو لەشوێنێك نەدەمایەوە تابتوانێ ببینێ، هەروا کە لە هەوڵی دەست نیشانکردنی ئەو رووخسارە بوو، وای هاتە بەرچاو کەبەردەکانو خوێن دەبن بە دەستگای چنینو ئەویش لەبەردەم دەستگاکەوە رونیشتبوو گۆرانی دەڵێ، نەواکەی دڵنەوازو پڕ شکۆبوو.

بەسەر سەری کریستەوە لیمۆکانی لەنێوان گەلاّکانی تاریکی درەختەوە درەوشانەوییێکی زێڕینی هەبوو، ناو لەپی دەستەکاتی کوشینە سەرخاکی نماکەوەو

هەستی بەگەرمای بەهاریی خاکەکە کرد، نیگاییێکی خێرای کردە دەوروبەری، سەیری هیچ کەسی نەدەکرد، لاربووەوە زەوی ماچ کرد، بەئارامی گوتی ((دایە بەتوندی لەباوەشم بگرەو منیش توند لەباوەشت دەگرم، دایە چۆن ناتوانی خودای من بی؟))

گەلاَی دارلیموکان کەوتنە جۆشو خرۆشەوە، دەنگی چەند هەنگاوێکی سوکەڵە بەسەر زەویەوە بیسترا، رەشیشە نادیارەکان فیکاندیان کریست سەری هەڵبڕیو فریشتەی پاسەوانی باڵ سەوزی بینیو لەبەرابەری وەستا، رازیو سەرمەست بوو، ئالۆزی لەشی ئەو لەتیشکی خۆرەتاودا لەحالێ ئاوابووندا دەدرەوشانەوە.

کریست گوتی ((سەلام، رووخسات دەبریقێتەوە، چ هەواڵێکی خۆشت بۆ من هەیە؟، من متمانەم بەتۆ هەیە، سەوزی باڵەکانت لەسەوزی گیای زەوی دەچێت)). فریشتە پێکەنیو باڵەکانی کۆکردەوە، لەکاتێکا لەکەنار کریستدا دەستەوئەژنۆ دانیشت، گوڵێکی لیمۆی هەڵپرۆکاندو بۆنی کرد، ئەوکاتە چاوی بڕیە ئاسمانی رۆژاوا کە لەڕەنگی ئالوبالو بوو، شنەبێکی نەرمو نیان بەسەر زەویەوەهەڵساو گەلاَی درەختی لیمۆ بەشادیەوە کەوتە سەماوە.

- ئێوەی مرۆڤەکان چەند خۆشبەختن، لە ئاوو خاك دروست بووینەو هەموو شتێ بەسەر زەویەوە لەئاوو خاك رسکاوە، لەبەر ئەمەیە کە هەموو بەیەکەوە جۆردەبن، پیاوو ژن، گۆشت، سەوزە، میوە، ...نەکا هەمووتان لەیەك ئاوو خاك رسکابن؟ هەموو شتێ دەیەوێ تێکەڵ بەیەك بێت، هەمان ئێستا لەسەر رێگامان گوێم لەدەنگی ژنێ بوو کەبانگی دەکردی.

- بۆ بانگی دەکردم؟ چی دەوێت؟

فریشتە پێکەنی ((ئاوو خاکو ئەو، ئاوو خاك داوای تۆ دەکەن، لەکەنار دەستگای چنین دانشتووە، دەچنیو گۆرانی دەڵێت، ئاوازی ئەو کێوەکان شەق دەکات، بەسەر دەشتاییەکاندا پەرشو بلاَودەبێتەوەو بەدوای تۆدا دەگەرێ، گوێ قولاَغ کە، ساتێکی دی گۆرانی دەگاتە ئێرەو نێو دارلیمۆکانەوە، بێدەنگ بە ئەوەتانێ، دەبیستی؟



واخەیاڵ دەکەم گۆرانی دەچرێ.. بەلاَم ناشیوەن دەکات، بەدیقەت گوێ بگرە چیت گوێ لێ دەبێ؟))

- دەنگی مەلەکان دەبیستم کە بۆ هێلانەی خۆیان دەگەرێنەوە، چونکە دەمەدەمی تاریك بوونی هەوایە.

- شتێکی دیکە دەبیستی؟ بەتەواوی هێزی خۆت هەوڵدە، لێگەرێ با رۆح لەبەدەنت رابکات تابتوانی ببیستی.

- بەڵێ.. بەڵێ دەنگی ژنێ لە دووردەستەوە دەبیستم، واشیوەن دەکات بەلاَم ناتوانم وشەکانی دەرك پێ بکەم.

- من بەتەواوی گوێم لێیانە، گوێبگرە، بزانە شێوەنی لەپای چییە؟

کریست هەڵسایەوە، تەواوی هێزی خۆی خستەگەڕ، رۆحی هەڵفڕیو گەیشتە دێ، چووە ماڵو لەحەوشە وەستا، کریست لەکاتێکا ئەنگوستی بەسەر لێوەوە دادەنا، گوتی دەبیستم)).

- بەڵێ:

گۆڕێکی نوقرەیی، گۆڕێکی زێرین... گۆڕێکی تاجە گوڵێن...

لێوانی قورمزی نەیخۆی... چاوانی رەش نەیخۆی..

زمانی وردی بولبول ئاواز نەیخۆی..

- کریستی ناصیرەیی .. گۆرانیبێژەکە دەناسی؟

- بەڵی

- مێرێ، خوشکی ئیلیازر، ئەو هێشتا جلی بووکێنی خۆی دەدورێ، وا خەیاڵ دەکات تۆ مردوویو گریە دەکات، گەرووی سپی بەفراوی ئەو رووتە، گەردەنبەندی کەوتۆتە سەر مەمکەکانی، تەواوی لەشی شەلالی ئارەقەیە، بۆنی نانی ئارەزوو بۆنی بەهێی گەییوو خاکو باران دەدات، هەڵسەوە، دڵی بدەوە.

کریست کەوتە وەحشەتەوەو هاواری کرد ((ئەی چی لە...... بکەم؟))

فریشتە بازووی گرتو جارێکی دی داینیشاندەوە سەرزەوی، بە ئارامی گوتی ((مەجدەلیە؟ ئاها، بەڵێ لەبیرم چوو، پێت بڵێم، ئەو مردووە))

- مردووە؟

- کوژرا، ئاهای کریستی ناصیرەیی، بەو مشتە گرێ کردووانەت بۆ کوێ دەچی؟

مەبەستی کوشتنی کێت هەیە؟ خودا؟ ئەوە خودابوو کە ئەوی کوشت، بگرەو دانیشە.

پیرۆزی پیرۆزان تیرێکی رەها کردو دڵی لەوپەڕی خۆشبەختیدا شەق کرد، ئێستاکێ، ئەو بەجاویدانەیی لە ئاسماندا دەمێنێتەوە. ئایا لەززەتێ بەرزتر لەوە بۆ ژنێ هەیە؟، ئەو ئیدی فەنابوونی ئەوینو ترسنۆك بوونی دڵو رزینی لەش بەخۆوە نابینی، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە خودا ئەوی دەکوشت لەوێ بووم شاهێدی تەواوی رووداوەکە بووم، دەستەکانی بۆ ئاسمان هەڵبڕیو هاواری کرد ((خوداوەند سوپاسی تۆ دەکەم هەمان ئەوەم دەویست)).

بەڵام کریست وەکو گڕگرتوویێ هەڵبەزیەوە هەوا ((تەنها سەگەکان تاسووقێکی وایان هەیە بۆ خۆبەدەستەوەدان، سەگو فریشتەکان! من نەسەگو نەفریشتەم، من مرۆڤمو هاواردەکەمو دەڵێم ئەم کارە زاڵمانەیە)) ئەی خوداوەندی گەورە، دوور بوو لە عەدالەت کە ئەو بکوژی، هەتا کێویترین دارشکێنەکان لەبەر داوەنەوەی درەختی شکۆفەدار دەلەرزن، مەجدەلیە لەڕەگو ریشەوە تا بەرزترین لقەکانی شکۆفەی کردبوو)).

فریشتە ئەوی لەباوەش گرتو پرچو شانی دەلاواندەوە، بەئارامو نەرمو نیانیەوە قسەی لەگەڵ دەکرد، عاقیبەت هەوا تاریك بوو، بایێ کەوتە هەڵکردنەوە، هەورەکان پەرشو بڵاوبوونەوەو ئەستێرەیەکی گەورە بەدیارکەوت، هەڵبەت ئەستێرەی ئاوابوون بوو، فریشتەکە گوتی ((بەسەبوری سەراپا خۆی بەدەستەوەدابوو سوپاسگوزاربوو، لەدونیا تەنها یەك ژن هەیە، یەك ژن بەچەندین رووخسارەوە، ئەو یەکەش دەکەوێ، ئەویدی رادەبێ، ...... مرد، بەڵام مێریەی خوشکی ئیلیازر زیندووەو چاوەڕوانت دەکات، ئەو



خودی مەجدەلیەیە، بەڵام بەرووخسارێکی دی.. گوێ بگرە... دووبارە ئاهی هەڵکێشا وەرە بابڕۆین دڵی بدەوە، بۆ تۆ کریستی ناصیرەیی لەناو رەحمی خۆیدا گەورەترین لەززەتی بۆ تۆ هەڵگرتووە.. کوڕێك کوڕی تۆ یاڵلا بابڕۆین)) فریشتە بەنەرمی دۆستی خۆی لاواندەوەو ئارام ئارام بەسەر زەویەوە بەرزی کردەوە، ئێستاکێ دوو نەفەری لەگەڵ یەك لەژێر دارلیمۆکاندا وەستابوون، بەسەر بەرزایی سەریانەوە، ئەستێرەی خۆراوا بەپێکەنینەوە دادەبەزیەخوارەوە...

دڵی کریست لەسەرەخۆو هێدی هێدی، نەرم بوو، لەهەوای نیوەتاریکی نمناکدا رووخسارەکانی ......و مێریەی خوشکی ئیلیازر تێکەڵ بەیەك دەبوون، شەو بەعەترێکی تەواوەوە هاتو بەسەریانا دامەنی خۆی کردەوە. فریشتە لەکاتێکا قۆڵە خڕو موویینی خۆی بەدەوری کەمەری کریستدا دادەنا، گوتی ((وەرە، هەناسەی ئەو بۆنی دارگوێزو خاکی نمناك دەدا، کریست سەری بەودا، چاوانی داخستو هەناسەیێکی قووڵی هەڵکێشا، دەیخوازی کە هەناسەی فریشتەی پاسەوان لە قوڵایی بوونی خۆیدا هەڵبخات. فریشتە بەبزەییێکەوە، یەکێ لەباڵەکانی خۆی کردەوە، ساردە شەوێکی ژاڵەیی سەنگین بوو، باڵە سەوزە زلەکانی خۆی بەدەوری کریست داپێچایەوە تا سەرمای نەبێ، دەنگی شیوەنی ژن وەك بارانی بەهار لەمیانی هەوای نمناکدا دەگەیشتە گوێ: گۆڕێکی نوقرەیی، گۆڕێکی زێڕین)).

کریست گوتی ((بڕۆین))و بزەییێکی هاتێ.

## بەشی سیو یەکەم

شەو تەواوی شەو، پێچراو لەناو باڵە سەوزەکانی فریشتەو لەحاڵێکدا دەستەکانی خۆی بەدەوری کەمەری فریشتە ئەڵقەڕێز کردبوو، کریست لەبەرزایی زەویەوە گوزەری دەکرد، مانگێکی گەورە لە ئاسمان سەر هەڵگەڕابوو، ئەمشەوە شەوێکی عەجیبو سەرسەخت بوو، لەسەریەوە لەجیاتی ئەوەی کە دیمەنی کوشتنی هابیل بەدەستی قابیل ببینێ، دەمێکی کراوەو پێکەنیناویو دووچاوی ئارامو دوو گۆنای پڕ مەلەت لەنوور دەدەیت: رووخساری خڕکەڵەی ژنێکی تەواو عەیاری شەوگەروو ئاشق، درەختەکان بەپەلە رایاندەکرد، مەلە شەوگەڕەکان وەکو مرۆڤ گفتوگۆیان دەکرد، کێوەکان دەمیان دەکردەوەو ئەو دوو سەرگەردانەی شەویان هەڵدەکشاندە ناو دەمو دووبارە لەدوای ئەوانەوە دادەخران.

وای کە هەڵفڕینو رابردن بەسەر بەرزایی زەویەوە، وەك ئەوەی لەخەوندا گوزەر دەکەین، چەند بەختەوەری بەخشە! ژیان بۆتە خەون ئایا مانای بەهەشت دەکرێ ئەوەبێ؟ دەیویست لەفریشتە بپرسێ، بەلاّم بێدەنگ مایەوە، چونکە دەترسا کە بەقسەگوتن بێدار بێتەوە سەیری دەوروبەری کرد، وای کە رۆح، بەردەکان هەواو کێو چەند سووك هەڵگەڕابوون! دروست وەکو ئەو زەمانەی کە لەگەڵ دۆستان دادەنیشیو دڵێکی گرانبارت هەیە، شەرابی فێنك دێو دەیخۆیتەوە، هێدی هێدی زەینت سووك دەبێ، پیاسە دەکات، بەسەر سەرتەوە مەلەدەکات، هەورێ وەك گوڵی لێدێو دونیا هەموو زێڕینو هەوا ئاسا بەسەر هەورەوە پێچەوانە دەبێتەوە. کریست جارێکی دیکە ویستی بگەڕێتەوە، تا لەگەڵ فریشتە گفتوگۆ بکات، بەلاّم فریشتە ئەنگوستی لەسەر



لێو داناو بزەیێکی بۆکردو بەئارامی گوتی بێدەنگ بە. لەوانەیە لەدێیەك نزیك بووبنەتەوە، چونکە کەلەشێرەکان بانگەشەی سپێدەیان دەکرد. ئێستاکێ مانگ لەپشتی کێوەکانەوە گلۆربووبۆوەو سەحەر بەئارامی دونیای رۆشن دەکردەوە، زەوی کەوتەوە هۆشو زەمان دووبارە کەوتەوە بەرهەست، کێو، دێو زەیتونستان پاشەکشەیان کردو جارێکی دی لە هەمان ئەو جێیەی کە خوداوەند قەراری دابوون، تا کۆتایی دونیا لەچاوەڕوانیدا دابنیشن، وەستان هەمان جادەی ئازیز بوو، گوندە میهرەبانەکەی بیث ئنیا لەنێوان زەیتونو هەنجیرو رەزەکانو مالّی پڕ لە چالاکی دۆستیش بەدەزگای چنینی پیرۆزیەوەو ئاگری داگیرساوی دوو خوشك دوو مەشخەڵی بێخەوبوون...

فریشتە گوتی ((گەیشتین))

دووکەڵ لە دووکەڵدانی بان بەرزبۆوە ئاسمان، هەڵبەت دوو خوشکەکە بێداربوونو ئاگریان هەڵدەگیرساند.

فریشتە لەکاتێکا باڵەکانی بەدەوری کەمەری ئەودا دەکردەوە، گوتی ((کریستی ناصیرەیی دووخوشك ئاگریان رۆشن کردۆتەوەو سەرەتای سپێدە شیریان دۆشیوەو ئێستا بۆ تۆ شیر ئامادە دەکەن، لەسەر رێگامان مەگەر نەتدەویست لە مانای بەهەشت بپرسی؟ بەهەشت کۆی هەزاران لەززەتی بچووکە، ئەڵقەی دەرگاییێگیان کوتایەوە، دەرگا کرایەوە بۆ تۆ لەلای ژن دانیشتنو لەبەرابەر ئاگردا سەیری ژن کردن کە سفرەت بۆ رادەخا، تاریکی تەواوی هەوا، کەوتنە ناو بازووەکانی ئەو، بەڵێ، هاتنی رزگاریبەخشی ئاوایە: هێدی هێدی، لەباوەش بۆ باوەشێکی دیکە، کوڕێ بۆ کوڕێکی دیکە رێگا ئەوەیە)).

کریست گوتی ((تێدەگەم)) لەبەرامبەر دەرگا وەستاو ئەڵقەی دەرگای گرتە دەست، بەلاّم فریشتە ئەوی بەرکەنار کردو گوتی ((پەلە بە خەرج مەدە، گوێ بگرە، باشتر وایە کە ئیدی لەیەك جیا نەبینەوە، دەترسێم بەتەنهاو بێ بەرگری جێتبهێڵم، لەبەر ئەمە لەگەڵتا دێمو خۆم وەکو غولاّمێکی بچووك پیشان دەدەم، هەمان ئەو غولاّمەی لەژێر دارلیمۆدا بینیت، دەتوانی بڵێی من کۆیلەییێکی گەنجمو فەرمانبەری تۆمە،

نامەوێ دووبارە رێگاییێکی هەڵە بگریتو گومڕا ببیت)). کەقسەی تەواوبوو، غولامێکی منالکارە لەبەردەم کریست وەستا، سەری دەگەیشتە ئەژنۆی کریستەوە، ددانێکی پانو سپی هەبوو دوو گوارەی زێڕینی لەگوێ بوو، سەبەتێکی پڕیشی لە دەستا بوو. بەبزەییێکەوە گوتی ((بفەرموو، ئەرباب، ئەوە دیارین بۆ دوو خوشك: جلی ئاوریشمین، گوارە، بازن، باوەشێنی دروستکراو لەپەڕی بەنرخ، بەکورتی تەواوی کەلوپەلی ژنانە، ئێستا دەتوانی لەدەرگا بدەی)). کریست لەدەرگایدا، گوێی لە دەنگی چەند پێیەك بوو لە حەوشە ئەو کاتە دەنگێکی دڵنشین گوتی: کێیە؟

کریست سوور هەڵگەڕا، دەنگەکەی ناسیەوە، دەنگی مێرێ بوو، دەرگا کرایەوە دوو خوشك کەوتنە سەرپێ.

– مەولا ((پرسە))ی تۆ ستایش دەکەینو دروود بۆ رابوونی پیرۆزی تۆ دەنێرین، بەخێربێی.

مێرێ گوتی ((مەولای من مۆڵەتم بدە دەست لە سینەت بدەم، تا دڵنیابم کە تۆیت)).

مارتا روونی کردەوە ((مێرێ ئەو جەستەی هەیە وەکو ئێمە، مەگەر نابینی؟ سەیرکە، سێبەریشی کەوتۆتە سەر دەرگاوە...

کریست گوێی رادەگرتو بزەی دەهاتێ، هەستی کرد کە دوو خوشك بە دەست لەودانو بۆنکردنی لەخۆشیان شاگەشکەبووبوون

– مارتاو مێرێ، ئەی دوو مەشخەڵی جمك من بەدیتنی ئێوە خۆشحاڵمو تۆش ئەی ماڵی ئارامو بچووك میوان دۆستی مرۆیان بەدیدارتان خۆشحاڵم. ئێمە هێشتا زیندووین، هێشتا هەست بە برسیەتی دەکەین، کار دەکەینو دەگرین، سوپاس بۆ خوداوەند.

لەهەمان حاڵدا کە هێشتا گفتوگۆیان دەکردو لەگەڵ دوو خوشك سەلامو ئەحواڵپرسی دەکرد چووە ناو ماڵەوە.



– ئەی سۆپەو دەسگای چنینو ترارو مێزو شەربەو مەشخەڵی ئازیز بەدیتنی ئێوە خۆشحاڵم، لەبەرابەر ئێوەدا، ئەی خزمەت گوزارانی بەوەفای من، سەری رێزو نەوازش دادەنوێنمو گەورەیی ئێوە ستایش دەکەم.

لەوکاتەی کە ژن دەچێتە بەهەشت دەوەستیو پرسیار دەکات

– پەروەردگارا ئایا ئەوانەی لەگەڵ منن ئەوانیش دێنە ژوورەوە؟

خوداوەند دەپرسێ

– کام هاوڕێیانت؟

– گاجووت، جۆلانە، مەشخەڵ، شەربە، دەزگای چنین بەبێ هاتنە ژوورەوەی ئەوانە منیش نایەمە ژوورەوە.

خودای میهرەبان بەخەندەوە دەڵێت:

– مەگەر دەتوانین سەر بۆ داوای ژنان بادەین؟ هەمووتان وەرنە ژوورەوە، ئەوەندە لانكو جۆلانەو دەزگای چنین لەبەهەشت عەمبار کراوە کە ئیدی شوێن بۆ پیرۆزمەندییەکانم نییە.

دوو خوشکەکە پێکەنین، گەڕانەوەو غولامەکەیان بەخۆیو سەبەتەی پڕەوە بینی.

مێرێ پرسی ((مەولای من ئەو منالکارەیە کێیە؟ ددانەکانیم خۆشدەوێ؟))

کریست لەبەرابەر سۆپا دانیشت، شیرو هەنگوینو نانی گەنمیان بۆ هێنا، چاوانی پڕ بوو لە ئەشك، گوتی ((حەوت ئاسمانو حەوت چاکەی گەورەو حەوت- هۆکاری- گەورە بۆمن بەس نەبوو، ئێستاکێ خوشکانم، چ بڵێم کەماڵی بچووكو لوقمەی ناو وشەی سادەی ژن بۆ من بەسە)) بەناونیشانی خاوەن ماڵ بۆ سەرەوەو خوارەوە دەهاتودەچوو، باوەشێ لقو پۆپی مێوی هێناو هەڵیڕشتە سەر ئاگرەوە، لاربۆوە سەر بیرە ئاوەوەکە، ئاوی هەڵکێشاو خۆشی دەستی درێژ کردو داینایە سەر شانی مێرێو مارتاو خۆی رەگەڵدان، گوتی ((مارتاو مێرێی ئازیزم، ناوی دەگۆڕم، براتان کە منی لەگۆڕ هەڵساندەوە کوشتیان من لەجێی ئەو لەهەمان ئەو سووچە دادەنیشم،

سیخورمەی ئەو دەگرمە دەست، ئەمیرێکم، زەوی تۆ دەدەمو دروێنە دەکەم عەسران دەگەڕێمەوە، خوشکانم پێیە ماندووەکانم دەشۆنو سفرەم بۆ پان دەکەنەوە، ئەوکاتە لەکەنار ئاگر، بەسەر کۆرسییەوە دادەنیشم، ناوی من ئیلیازرە.

غولامچەکە، لەهەمان کاتدا کە کریست قسەی دەکرد، بەچاوانی درشتی خۆی، کەوتە ئەفسوونەوە، هەرچەند زیاتر سەیری ئەوی کرد، رووخساری کریست زیاتر گۆڕابوو، هەرواش تەواوی لەشی وەکو ئیلیازری لێهاتبوو، ئیلیازری ساغو پڕ برستو گەردەن بەرزو سینەی هەتاوەسوتو دەستە پینەبەستەکانی، دووخوشک لەنیوە رەنگی رۆشنایی مەشخەڵدا سەیری ئەو گۆڕانەیان دەکردو لەبەرخۆ دەلەرزین.

– جەستەو رۆح گۆڕاوە، ئێستا دژی هەژاریو بەرۆژوبوون جەنگ رادەگەیەنم، رۆح، ئاژەڵێکی سەر زیندەیەو پێویستی بە خۆراك بوو، ئەم دەمە لەژێر ریشو سمێڵی من، دەمی رۆحە، تەنها دەمێ کە رۆحی هەیە، دژی پاکیزەیی دەجەنگم، لەرەحمی هەر ژنێ منالێکی خامۆشو بێ هەست دانیشتووە، دەرگای رەحم بکەنەوەو مۆڵەتی هاتنە دەرەوەی بدەن. ئەو کەسەی کە نەزێو منالی نەبێ، دەکوژرێ، مێرێ بۆ دەگری؟

– مەولای من چ وەلامێکی دیکەت لەمن دەوێ؟ ئێمەی ژنان وەلامێکی دیکەمان نییە.

مارتا باوەشی کردبۆوە گوتی ((ئێمەی ژنان دوو بازووی هەمیشەیی کراوەین، مەولای من بچۆ ژوورەوە دانیشە، فەرمان بدە، خاوەنی ئەم ماڵە تۆی)).

رووخساری کریست کەوتە درەوشانەوەو گوتی ((من گریەو زاری خۆم لەگەڵ خوادا بەکۆتا هێناوە، لەگەڵ یەك بووینە دۆست، ئیدی خاچ دروست ناکەم، گاجوتو لانكو تەختی خەو دروست دەکەم، رادەسپێرم کە کەلوپەلی دارتاشیم لەناصیرەوە بۆ بهێنن دایکی – دلێریشم- دەهێنم تا نەوەکانی گەورە بکاتو هەست بەشەهدو گەوارایی سەر لێوانی بکات)). یەکێ لەژنەکان مەمکەکانی دانایە سەر ئەژنۆکانی، ئەویتر دەستی توند گرت، غولامچەکە رووبەڕووی ئاگر چەنەگەی هاوێشتبوە سەر ئەژنۆی خۆی والێ لێکردبوو کە خەوی لێکەوتووە، بەلام لەنێوان پیلوە درێژەکانیدا بە چاوانی



رەشی خۆی کریستو دوو ژنەکەی خستبووە ژێر روانینی خۆیەوەو بزەییێکی لە رووی رازیبوونەوە بەسەرلێوەوە بوو.

مەریم گوتی ((مەولای من، لەکەنار دەستگای چنین دانیشتبوومو لە رێو رەسمی پرسەی تۆ

– خاچێكو هەزاران هەزار پەرەسێلکە بەدەوریەوە بوون- نەقشی بەتانییێکی گەورەم دەکرد، بەنی رەشو سوورم لەبەریەك دەنا و سروودی پرسەم دەچری، تۆ گوێت لە دەنگم بوو بەزەییت بە من هاتەوە)).

مارتا بە ئارامی تا کۆتا هاتنی قسەی خوشکی لەچاوەڕوانیدا مایەوە، ئەوکاتە بەمجۆرە دەستی پێکرد: ((من شتێ جگە لە هەویرکاریو شوشتنی قاپو قاچاغ و بەڵێ گوتن نازانم، مەولای من هونەری من ئەوانەن، دڵم گەواهی دەدات کە خوشکی من بەژنی خۆت هەڵدەبژێری، بەلام مۆڵەت بدە تا منیش لەگەڵ تۆدا دەم لەهەوای ژیانی هاوسەرییێتی وەردەم، مۆڵەت بدە تا بۆ تۆ نوێنی خەوتن راخەم وکاری ماڵێ بگرمە ئەستۆ)) لەگوتن وەستا ئاخێکی هەڵکێشاو بەردەوام بوو گوتی بۆ کچانی گوندی تۆ گۆرانی دەچرن، ئەو گۆرانیەی کە سۆزناکە، لەکاتی بەهار، رۆژانێ کە مەلەکان بەسەر هێلکەی خۆیانەوە هەڵدەکورمێن، گۆرانی دەڵێن، باشتروایە کە منیش ئەو گۆرانییە بە تاو بچرم، چونکە سۆزناکی ئەم گۆرانیە لە ئاهەنگەکە شاردراوەتەوە.

– ئاهای ئێوە، بڕۆنە سەر بەرزایی بێ ریش...
لەفرۆشتنی خۆم ... و
پەیدانەکردنی کڕیار ماندووبووم
کە یەکەم هات، یەکەم قبوڵ دەکرێ

***

هەرکەسێ هێلکەی پەرەسێلکەیێ بدا بەمن
لێوەکانم دەخەمە بەردەستی...
هەرکەسێ هێلکەی بازێ بدا بەمن

مەمکی خۆمی دەخەمە بەردەست
هەرکەسێ خەنجەرێ بەمن بدا
دڵم دەخەمە بەردەستی

چاوەکانی مارتا پڕبوو لەئەشك، مێرێ بازووەکانی بەدەوری کەمەری کریستدا ئەڵقەڕێز کرد، وەك بڵێی ترسی ئەوەی هەبوو کە لەچنگی ئەوی بڕفێنن، رەفتاری مێرێ وەك چەقوێ بێ بەسەر دڵی مارتادا هاتە خوارەوە، بەڵام بەسەر خۆی نەهێناو دووبارە کەوتە قسەوە: ((مەولای من تەنها یەك شتی دیکە هەیە دەمەوێ بەتۆ بڵێمو پاشان لەگەڵ مێرێ بەتەنها جێت دەهێڵم، جارێکیان زەمینداریکی. بڕۆ گورزدار بەناوی- بۆئز- لەنزیك هەمان ئەو جێیەدا لە بیث لەحم دەژیا، هاوین بوو، کۆیلەکانی دروێنەیان دەکرد، خەرمانیان کوتابۆوەو گەنمیان شەنەبا کردبوو، لەجۆخیندا دوو کۆمەڵە ئەمبار کرابوون، لەلایەکدا گەنمو لە لایەکەی تر کاو پوش، بوئز لەمیانی دوو قۆمەتەکەدا راکشاو چووە خەوەوە، نیوەشەو بوو، ژنێکی هەژار بەناوی —روپ- لەسەرخۆ هاتە پێشو بۆ ئەوەی بێداری کاتەوە، لەکەنار پێیەکانیدا وەستا، ئەو ژنە هەژارو بێوەژنێکی بێ منداڵ بوو ئازارێکی زۆری کێشابوو، ئەو پیاوە هەستی بەگەرمای لەشی کرد لەتەك پێیەکانی خۆیدا، دەستی درێژ کردو ئەوی هاویشتە سەرسینەی خۆی... مەولای من، ئاگات لێیە؟

—بەڵێ ئیدی بەردەوام نەبوو...

مارتا گوتی ((ئێوە بەتەنها جێ دەهێڵم))و لەجێوە هەڵسایەوە.

ئەم دووە بەتەنها مانەوە، حەسیرو پەتۆیەکیان کەنەخشو نیگاری خاچو پەڕەسێلکەی بەسەرەوە بوو هەڵگرتو چوونە سەربان، هەورێکی میهرەبان رووی خۆرەتاوی داپۆشی، چوونە ژێر پەتۆ تا خوا نەیانبینێو دەستیان کرد بە لاواندنەوەی یەکتری، جارێ کە پەتۆ لەسەریان لاکەوتبوو، کریست چاوی کردەوە، منداڵەکەی بینی لە کەناریان دانیشتووە، شمشاڵێکی شوانانی لەدەست بوو شمشاڵی دەژەنی، چاوەکانی بڕیبووە لای ئورشەلیمەوە. رۆژی دوایی، تەواوی دێ هاتنە تەماشای ئیلیازر، غولامچەکە بەردەستی دەکرد، ئاوی لە بیر هەڵدەکێشا، گامێشەکانی دەدۆشی،



یارمەتی مارتای دەدا لەئاگر کردنەوە، پاشان لەبەر دەرگادا هەڵدەکورماو شمشاڵی دەژەنی، گوندینیەکان بە خۆیانو دیارییەکانی گەنمەشامیو شیرو خورماو هەنگوینەوە دەهاتن. تا دیداری ئەو بێگانە سەیرو سەمەرەیە بکەن کە زۆر بەئیلیازر دەچوو، ئەوان منالکارەکەیان لەبەر دەرگا دەدیت، سەریان لەبەر سەری دەناو پێدەکەنینو گێچەڵیان پێدەکرد، ئەویش پێدەکەنی...

ڕیش سپیە نابیناکەی دێ چووە ژوورەوە، دەستی بۆ پێشەوە بردو ئەژنۆو رانو شانی کریستی بەسەر کردەوە، ئەو کاتە سەری تەکانداو قاقا پێکەنی.

هاواری کردە سەر گوندینیەکانی کە حەوشەیان پڕکردبوو گوتی ((مەگەر ئێوە کوێرن؟ ئەوە ئیلیازر نییە، هەناسەی ئەو بۆنی هەناسەی ئیلیازر نادا، ساختومانی لەشیان جیاوازە، ئێسقانەکانی ئەو گۆشتێکی زۆرو توندیان هەبوو، تەورداسیش نەیدەتوانی لێکیان جیا بکاتەوە)).

کریست لەحەوشەدا دانیشتبوو راستیو درۆی لێکدەچنیو پێدەکەنی ((کوڕینە نەترسن، من ئیلیازر نیم، فاتیحەی ئەو خوێندراوەتەوە، تەنها ناوم ئیلیازرە، ئوستاد ئیلیازری نەجاڕ، فریشتەیێ بەباڵە سەوزەکانی رێنمایی منی کردووە بۆ ئەمماڵەو هاتمە ژوورەوە)) سەیری غولامچەکەی کرد کە لەبەر زۆر پێکەنین پێچرابۆوە ناویەك. زەمان وەکو ئاوی حەیات لە هەڵڕژان دابوو دونیای ئاودەدا، گەنم پێگەیی بوو، هێشووە ترێکان دەستیان کردبوو بە درەوشانەوە، زەیتون پڕ بووبوون لەڕۆن، هەنارە گوڵ کردووەکان پڕبووبوون، پاییز هاتو پاشان زستان هاتە سۆراغیانو کوڕەکەیان لەدایك بوو، مێرێی جۆلا، کەدوای دانانی منداڵەکە راکشابوو بەسەیرو سەمەرەی بێ دیماهییەوە سەیری منداڵەکەی دەکرد.

ستایشی دەکرد بەبزەوە دەیگوت ((خودای منو ئەم پەڕجوویە چۆن پەیوەست بوو بەڕەحمی من، من لەئاوی حەیاتم خواردۆتەوەو من نامرم))

شەوەو باران دەبارێ، زەوی پێیەکانی خۆی کردەوەو بەخێراتنی ئاسمانی دەکرد بۆ چوونە ناو رەحمی خۆیو دەیکرد بەگوڵ، ئوستاد ئیلیازر لەماڵێکدا لەقوولایی شەودا

لە میانی لانكو ئەشقدا، بەسەر ئاردەدارەوە لەكارگەی خۆیدا رادەكشا، گوێی لەگەواڵە دەگرتو ئەندێشە منالەكەی خۆیو خودای دەكرد، رازی بوو، یەكەمین جارە كە خودا لە شێوەی منال چووبووە ناو زەینی ئەوەوە، لەژووری تەكیا، دەنگی گریەو خەندەی دەبیسترا، گوێی لە دەنگی پێكوتەی ئەو دەگرت بەسەر ئەژنۆكانی دایكیدا، دەستی بەریشی رەشی دادەهێناو لەبەرخۆ دەیگوت ((كەواتە خودا ئەوەندە نزیكە، یانی بن پای ئەو ئەوەندە هەستیارە ختوكەی دەبێتەوە؟ یانی ئەو خودا گەوریە ئەوەندە سادیە بەخەندەی غولامچەوە باوێشك دەدا، لەكەنار دەرگادا خۆی والێكردبوو كە خەوی لێكەوتووە، بەبیستنی دەنگی نازو نەوازشی دایك، بزەییێك لەرازی بوون بەسەر لێوەكانیەوە نەخشی بەستا، ئێستا كێ شەوانە كە كەسێ نەیدەبینی، دووبارە بۆوە فریشتەو بەكردنەوەی باڵەكانی خۆی بەسەر ئاردەدارەكانەوە دانیشتبوو، لەتاریكی دا بەزەمزەمەكردنەوە گوتی ((كریست بێداری؟))

كریست خۆی لە كەڕی دا، بێدەنگ مانەوەو لەبێدەنگی شەودا گوێگرتنی لەدەنگی نەوزادەكە دڵنیاو رازی دەكرد، بەلام بزەییێكی هاتێ ، ئەم غولامە زیاتر لەئەندازە ئازیز بوو لای، غولام بەدرێژایی رۆژ، فەرمانەكانی جێبەجێ دەكرد لەكاری داتاشیندا كۆمەكی دەكرد، ئەو كاتە عەسران، بەكۆتایی هاتنی كاری رۆژانە، لەكەنار دەرگا دادەنیشتو شمشاڵی لێدەدا، كریست بەگوێگرتن لەنەوای نەی ماندوویی لە لەشی دەچووە دەرەوە بە وەدەركەوتنی یەكەمین ئەستێرە، هەموو لەگەڵ یەك لەكەنار سفرەوە دادەنیشتنو غولامچەكە بێ برانەوە پێدەكەنیو گاڵتەی دەكرد، سەری لەبەر سەری مارتای بێچارە دەناو لەبارەی كچێنییەوە دەستەپاچەی دەكرد، بەپێكەنینەوە لەحالێكا بەعیشوەوە سەیری مارتای دەكرد ((دەیگوت لە ولاتی من، لە حەبەشە بەپێچەوانەی ئێوەی یەهودییەكان، هەوەسەكانی ناوەوەی خۆمان داناپۆشین، ركو راست لەبارەی هەوەسەكانی ناوەوەی خۆمان قسە دەكەینو پیادەی دەكەین، ئەگەر هەوەسی خواردنی مۆزمان هەبێ بەبێ ئەوەی بیر لەوە بكەمەوە كە پەیوەستە بە من یا یەكێكی دیكە دەیخۆم، ئەگەر هەوەسی مەلە لەسەرم بدات دەچمە مەلە هەوەسی ماچی كچێكم هەبێ ماچی دەكەم، خودای ئێمەش سەرزەنشتمان ناكات، ئەو رەشەو رەشەكانی



خۆشدەوێ، گوارەییێكی زێڕین لەگوێ دەكاو هەرچیەك هەوەسی لێ بێ ئەنجامی دەدا، ئەو برای گەورەتری ئێمەیە، هەردووك یەك دایكمان هەیە: ئەویش شەوە))

مارتا رۆژێكیان عەسر، بۆ ئەوەی سەر لەبەر سەری بنێ پرسی ((ئایا خودای ئێوە دەمرێ؟ غولام لەحالێكا دەستی بۆ پێشەوە بردبوو تا ختوكەی مارتا بدات وەلامی دایەوە ((مادەمەكێ هەتا غولامێكی رەش زیندووبێ، خودای ئێمە نامرێت)) هەموو شەوێ هەركە مەشخەڵ خامۆش دەبوو، فریشتەی پاسەوان لەتاریكیدا باڵەكان دەكردەوەو لەكەنار هەمڕاهی خۆی رادەكشا، بەڕازەوە قسەیان دەكرد تاكەسێ گوێی لە دەنگیان نەبێ، فریشتە رێنمایی پێویستی لەبارەی رۆژی دوایی دەكرد، ئەوكاتە دووبارە دەبۆوە غولامچەكە لەسەر جێی خۆی بەسەر ئاردەدارەوە هەڵدەخزیو دەچووە خەوەوە.

بەلام ئەمشەو نەیتوانی چاوی لەسەریەك دانێ دەنگی بەرزكردەوەو گوتی ((كریست بێداری؟)) كە وەلامی نەبیست، لەجێوە هەڵبەزیەوە هاتە نزیكی كریستەوەو رایتەكاند.

– ئاهای ئوستاد ئیلیازر، دەزانم كە نەخەوتووی، بۆ وەلام نادەیتەوە؟ كریست لەحالێكدا چاوی لەسەریەك دادەنا، وەلامی دایەوە ((نامەوێ قسە بكەم من خۆشحاڵم))

فریشتە بە غروورەوە پرسی: ((لە من رازیت؟ گلەییت نییە؟))

- هیچ گلەییێكم نییە.

دڵێ گەرم بوو هەڵسایەوە، بەزەمزەمە كردنەوە گوتی ((بۆ دۆزینەوەی خودا چ رێگاییێكی شەڕانیم گرتووەبەر؟ چ پەستو بەرزایی، چ تەلانو بەردەلانێكی كاولم بانگ دەكرد؟ لەكێوە چۆڵو پەژموردەكان)) دەنگی خۆم دەبیستەوەو وامدەزانی وەلامم وەرگرتۆتەوە))

فریشتە پێكەنی ((ناتوانی بەتەنها بەدوای خودادا بگەڕێی، دوو نەفەر پێویستە، پیاوێكو ژنێك، تۆ ئەوەت نەدەزانی، فێرم كردی، دوای ساڵەهای ساڵ لەگەڕان، بەدوای خودا، بەپەیوەندی كردن بەمێرێوە لە ئەنجامدا دۆزیتەوە، ئێستاكێ لە تاریكیدا دادەنیشیو دەنگی خەندەو گریەی ئەوت گوێ لێ دەبێو شادومان دەبی))

کریست بەزەمزەمەکردنەوە: ((مانای خودا هەمانە، مانای مرۆڤیش، ڕێگەش هەر ئەوە)) دووبارە چاوی لەسەریەك ناوە.

ژیان لەبەردەمی ئەودا وەکو بروسك لەزەینیدا ڕەت بوو ئاهی هەڵکێشا، بازووەکانی کردووەو بەدوای دەستی فریشتە گەڕاو بەنەرمو نیانی گوتی ((فریشتەی پاسەوانی من ئەگەر تۆ نەهاتبای، گومو گۆڕ دەبووم، هەمیشە لەلام بمێنەوە))

– مەترسە دەمێنم، بەجێت ناهێڵم، تۆم خۆش دەوێ,

– ئەو خۆشبەختیە تاکەی بەردەوام دەبێ؟

– کریستی ناصیرەیی، مادامەکێ کە تۆ لەگەڵ منی من لەگەڵ تۆم. تا ئەبەد؟

– فریشتە بەپێکەنینەوە گوتی ((ئەبەد یانی چی؟ تۆ هێشتا نەتتوانیوە خۆت لە وشەی گەنیوو وەکو گەنیو، مەلەکوتی ئاسمان ڕزگاربکەی؟ یانی کوڕەکەشت نەیتوانیوە تۆ شەفا بدات؟)) لەکاتێکا بەمست لەزەوی دەکوتا، بەردەوام بوو: ((مەلەکوتی ئاسمان هەمان ئێرەیە، هەمان ئەم زەویە، خودا هەمان جێیە: کوڕی تۆ، ئەبەد هەمان جێیە: هەرساتێ کریستی ناصیرەی هەر ساتێ کە ڕەت دەبێ، ئەبەدیەتە، ساتەکان بۆ تۆ بەس نییە, ئەگەر وایە دەبێ بزانی کە ئەبەدیەتی نابێت))

فریشتە بێدەنگ بوو، دەنگی چەند پێیەکی سووك لەحەوشە بیسترا، پێی پەتی نزیك بوونەوە)).

کریست هەڵسایەوەو پرسی ((کێیە؟))

فریشتە بەبزەییێکەوە گوتی ((ژنێك))و بۆ پێشەوە دەچوو دەرگەی دوودەری کردووە.

– کام ژن

فریشتە وەك بڵێی بەنیشانەی سەرزەنشت کردن، ئەنگوستی خۆی ڕاتەکاند: ((جارێ بە تۆم گوت، مەگەر لەبیرت چوو؟ لە دونیادا تەنها یەك ژن بەچەند رووخسارێکی بێ ژمار هەیە، یەکێ لەو رووخسارانە وادێت، بڕۆ پێشوازی ئەوەوە، من لێرە دەڕۆم))

وەك مار خزیە ناو ئاردەدارو ون بوو. پێیە پەتیەکان لە دەرەوەی دەرگا وەستان،



کریست لە حاڵێکدا بەرەو دیوار دەگەڕایەوە، چاوی لەسەریەك دانا، خۆی والێکرد کە لە خەودایە، دەستێ دەرگای کردەوە، ژنێك بەحەپس کردنی هەناسە لەسینەیدا خزیە ژوورەوە، لەسەرەخۆ بۆ پێشەوە دەچوو، گەیشتە گۆشەیێ کە کریست لێی دانیشتبوو، بێ ئەوەی کە قسەیێ بکات یا سەروسەداییێ بکات لە کەنار پێیەکانی ئەودا ڕاکشا.

کریست هەستی کرد کە گەرمایی لەژێر پێیدا هەڵدەستیو نیلە دەکاتە ئەژنۆو ڕانو دڵو گەردەنیەوە، سەیری خوارەوەی پێی کرد، رووخسارو مەمکی ژنێکی لەتاریکی بەسەر کردەوە، ژن دەستەوەستان بوو لاربۆوە، قسەیێکی نەختە سەر زمان، بەلاّم لەشی دەلەرزی، ئارەقەی سارد تەواوی لەشی داگرتبوو.

پیاوەکە بەئارامو پڕ سۆزو میهرەوە کەوتە قسە ((تۆ کێی؟ ژنە هیچی نەگوتو دەلەرزی، کریست لە گوفتی خۆی پەشیمان بۆوە، چونکە جارێکی دی قسەی فریشتەی لەبیر کردەوە، ناوی ژن، شوێنی، شێوەی، ڕەنگو جوانیو زبرو رووخساری چ بایەخێکیان هەیە؟ ئەم رووخساری ژنانەی زەوی بوو، ڕەحمی ئەوی ئازاردەدا، کچو کوڕانێکی زۆر لەناو ڕەحمی ئەودابوو کە تووشی هەناسەبڕکێ بووبوون نەیاندەتوانی بێنە دەرەوە، ئەویش هاتبووە سۆراغی پیاوێ تا بۆ دەرهاتنی ئەو منالاَنە ڕەحمی بکاتەوە، دڵی کریست پڕ لەمیهر بوو.. ژنە لەحاڵێکدا دەلەرزی بەزەمزەکردنەوە گوتی

– من رووخساری تۆم!

– رووخسار؟ کام رووخسار؟

– مارتا...

## بەشی سیو دووەم

ڕۆژو مانگو ساڵەکان یەك لەدوای یەك رادەبردن، لەماڵی ئوستا ئیلیازر ژمارەی کچانو کوڕان لە زیادبووندابوون، مارتاو مێریَ بۆ زایینو منداڵ زیاتر ململاتێی یەکتریان دەکرد، پیاوەکە جارجارە لەکارگەکەی خۆیدا بە دارکاژو بەڕوو هەروەها درەختی سەرونیازو پەنجەی خۆم نەرم دەکرد، دەیخستنە سەر زەویەوەو بۆ خەڵکی کەلوپەلی دروست دەکرد، هەندێ جاریش لەمەزرادا بەباو بەردو دارگەزەوە عەسران ماندوو مردوو دەبوو دەگەڕایەوە، لەحەوشە دادەنیشتەوە تا ژنەکانی خۆی بێنو پێیەکانی بشۆنو ئاگر داگیرسێننو سفرەی بۆ راخەن ئەوکاتە باوەشیان بۆ بکەنەوەو لەباوەشی بگرن، پاشان دروست بەو شێوەیەی کە بەسەر دارو زەویەوە کاری دەکرد، لە دەروونی دارەکاندا لانکی ئازاد دەکردو لەناو دڵی زەویشدا تریَو گوڵەگەنم، بەهەمان شێوە لەسەر ژنان کاری دەکردو لەدەروونیانا خودای ئازاد دەکرد.

کریست لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە ((واھ کە چ بەختەوەرییێکە ئەو هەماهەنگیەی نێوان رۆح و جەستە، زەمینو مرۆڤ..!)) مارتاو مێریَ دەستیان بەسەری ئەو پیاوە دادەهێنا کە خۆشیاندەویست هەروەها بەسەری ئەو منالانەی کە لەڕەحمی ئەواندا دەهاتنە دەرەوەو بەو دەچوون، تا دڵنیابن لەو هەموو لەززەتو شیرینیە.. لەو هەموو خۆشبەختیە دەترسان.



شەوێکیان مێریَ خەونێکی وەحشەتناکی بینیو لەجێوە هەڵسایەوە، چووە حەوشەوە کریستی بینی کە خۆی دەشواو بەناو لەپی بەسەر خاکەوە، بەرِازیبوونەوە لەسەر زەوی دانیشتووە، نزیك کەوتەوەو لەکەناریا دانیشت، بەئارامی پرسی ((مەولای من، خەونەکان چین؟ ماهیەتیان چییەو چ کەسیَ دەیاننێریَ؟)) کریست وەڵامی دایەوە ((ئەوان نە فریشتەو نە هەرماسن، لەوکاتەی کە لوسیفر دژی خودا دەستی بە ئاسیَ بوون کرد، خەونەکان مابوون کە لایەنی کام یەك بگرن، لەمیانی فریشتەو مانەوەو خودا ئەوانی هاوێشتەناو دۆزەخ... بۆ دەپرسی؟ مەگەر خەونت دیوە؟))

بەلاّم مێریَ دەستی کرد بە گریانو وەلاّمی نەدایەوە، کریست دەستەکانی ئەوی لاواندەوەوگوتی ((مادەمەکیَ خەونی خۆت لەدەروونندا دێلیتەوە وەکو خوریکە دەکەوێتە گیانتەوە، ئاشکرای کەو خۆت لەچنکی رزگارکە)).

مێریَ ویستی دەست پێبکات، بەلاّم ئەوەندە ترسناك بوو کە بە سەختی دەیتوانی هەناسە هەڵبکێشیَ، کریست نەوازشی کردو هێزی وەبەردڵیدا.

- بەدرێژایی شەو مانگ ئەوەندە درەوشاوەبوو کەنەمدەتوانی چاو لەسەریەك دابنێم، بەلاّم وەك ئەوەی کە لەکاتی سپێدەدا خەو منی فڕاند، چونکە باڵدارێکم بینی بوو..نا، باڵدار نەبوو، شەش باڵی ئاگرینی هەبوو، رەنگە یەکیَ لەسەرافیمەکانی(*) دەوروبەری تەختی خودا بوویَ، هات، بەئارامی بەسەر گردی سەرمەوە باڵەکانی لێکدا، بەلاّم لەپڕێکا دابەزیو باڵەکانی بەدەوری سەرمدا پێچا، دەندوکی خۆی دانایە سەر گوێمو قسەی لەگەڵم کرد، مەولای من لەپێشگاهی تۆدا سوژدە دەبەم، پێیەکانت ماچ دەکەم، فەرمانم پیَ بدە کە بێدەنگ بم.

- مێریَ ئازابە، من لەگەڵ تۆم، بۆ دەترسی... باشە، قسەی لەگەڵ تۆکرد، چی گوت.

- کە ئەم هەموو...

* سەرافیم: فریشتەی شەش باڵی پاسەوانی تەختی خوداو سیمبولی سروشتە.

جارێکی دی لەهەناسە کەوت، ئەژنۆکانی کریستی گرتو لەمیانی بازووەکانی خۆیدا کوشی.

- مێرێی ئازیز...کە ئەم هەمووە چییە؟

- مێرێ کەوتە گریانەوە ((خەونێکە)) کریست لەرزی، خەونێك؟

- مەولای من بەڵێ.. ئەو هەمووە خەونێکە.

- مەبەستت لەم هەمووە چییە؟

تۆ، من، مارتا، هاوباوەشی شەوانە، منالان، هەر هەموویان زیاترە لە درۆیەك هیچی دیکە نییە، درۆیێ کە هەرماس بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئێمە دروستی کردووە، هەرماس، خەوو مەرگ هەواری گرتیتەخۆ مەولای من کۆمەکم بکە.

مێرێ بەسەر زەویەوە گلۆربۆوە، بۆساتێ کەوتە تەزوێکەوەو لەپڕێکا لەشی وەکو دار وشك هەڵگەڕا، مارتا بەسەراسیمەوە خۆیو بڕێ سرکە قرمزی هێناو رایکرد، لە لاجانگەکانیدا هەڵیسوی، مێرێ هاتەوە خۆی، چاوانی خۆی کردەوە بەبینینی کریست پێیەکانی چەسپا، مارتا گوتی: مەولای من، لێوەکانی خۆی خستە جولە، لاربۆوە، دەیەوێ شتێ بەتۆ بلێ)).

کریست لاربۆوەو لەزەوی بەرزی کردەوە، مێرێ لێوەکانی جولاندەوە

- مێرێ خۆشەویستم چیت گوت؟ نەمبیست.

- مێرێ، بەوەبەهێنانەوەی تەواوی هیزی خۆی، کەوتە زەمزەمەوە((و ئەوەی کە تۆ، مەولای من)).

- و ...من چی؟ قسەبکە!

- لەخاچ درای؟

مەرەیەم بە وتنی ئەو وشانە دووبارە بەبێهۆشیەوە بەسەر زەوی کەوتە سوورەوە. ئەویان بردە سەرجێو مارتا لەکەناریا مایەوەو کریست دەرگای کردەوەو چووە مەزرا، خەریك بوو بخنکێ، دەنگی چەند هەنگاوێکی لەدوای خۆیەوە بیست، گەڕایەوەو غولامچەکەی بینی، بەتووڕەییەوە بەسەر سەریەوە هاواری کرد ((چیت دەوێ؟ بەتەنهام بەجێ بهێڵە)) غولامەکە لەکاتێکا چاوەکانی دەبریقایەوە وەلامی دایەوە ((کریستی ناصیرەیی دەترسم بەتەنها جێتبهێڵم، ئەم ساتە دژوارە، لەوانەیە تووشی ئەفسوونت بکات)).

- ئەز قەزا هەمان ئەوەم دەوێ، چەند کاتێك هەیە کەزەینی داخراوم پێش چاوی من دەگرێت.

غولامەکە بەپێکەنینەوە گوتی ((مەگەر تۆ ژنیت؟ نەکا باوەڕت بەخەون هەبێ؟ لێگەڕێ با ژنەکانمان بگرین، ئەوان بەرگەی لەززەتی گەورە ناگرن، لەبەر ئەمە دەگرین، بەلام ئێمە بەرگەی دەگرین، وانییە؟))

- بەڵێ بێدەنگ بە...

ئەوان بەخێرایی بۆ پێشەوە چوونو چوونە بەرزایی گردۆلکە سەوزەکەوە، کولیلکە سوورەکانو مرواری زەرد بەسەر گیاکانەوە پەرشو بلاوبووبوونەوە، زەوی بۆنی زڕەهەنجیری دەدا، کریست لەنێوان دارزەیتونەکاندا ماڵی خۆی دەدیت، دووکەڵێکی هێمن لەبانی هەڵدەستا، رۆحی کریست ئارام بۆوە لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە: ((ژنان هێزی خۆیان وەدەست هێنابۆوە، لەکەنار سۆپادا ئەژنۆیان دابوو، ئاگریان کردبۆوە)). گوتی ((باشتر وایە بگەڕێمەوەو لێوم لەلێو نەکەمەوە، ئەوان ژنن، خوا رەحمیان پێ بکات)). رۆژان لە دوایی یەك رادەبردن، رۆژێکیان عەسر رێبوارێکی عەجیبو نیوە مەست پەیدابوو، رۆژی شەممە بوو، کریست کاری نەدەکرد، لەکەنار دەرگا دانیشتبوو، کوڕو کچە بچووکەکانی بەسەر ئەژنۆوە دانیشاندبوو، یاری لەگەڵ دەکردن، لەکاتی سپێدەدا باران باری بوو، دوای نیوەڕۆ هەوا ساف بووبوو ئێستاکێ هەورێکی بۆر لە ئاسماندا بەرەو رۆژاوا مەلەی دەکرد، ئاسمان لەنێو هەورەکان وەکو چەمەنێکی سەوز وابوو، رێبوار وەستاو سەیرێکی لەڕووی شەڕانگێزییەوە کردە کریستو پێکەنی.

- ئاهای ئوستاد ئیلیازر، خۆمانین، تۆ شانسێکی باشت هەیە، سالاًن دێن‌و سالاًن دەڕۆن، وەکو یاکوب بەخۆی‌و دوو ژنیەوە، لیا، راکیل، لەکەنار دەرگا دادەنیشی خۆشت هەم دوو ژنت هەیە- مارتاو مێریۆ، هەوالّم هەیە کە یەکێکیش کاری مالّەوەت بۆ دەکاو ئەوی دیکە کاری خۆتە، تۆش هەموو کارەکان دەکەیت، هەموو شتێك: دار، زەوی، خواو باشە، کەمیۆ لەو قالّبە وەرە دەرەوەو ببینە لەدونیادا چ هەیە، تائێستا ناوی پیلاتت کەوتۆتە بەرگوێ؟ پونس پیلات کە ئومێدەوارم ئەم تون بەتونە لە ئاگری دۆزەخ دا هەلّبقرچێ!

- کریست ئەو رێبوارە نیوە مەستەی ناسیەوەو بزەیێکی هاتێ ((سیمۆنی قەیرەوانی، پیاوی خوداو شەراب، بەخێر بێی، وەرەدانیشە، مارتا زوو پیالّە شەرابێك بۆ دۆستی دێرینەی من بهێنە)).

- ڕێبوار دانیشت‌و پیالّە شەرابی گرتە دەست بەغرورەوە گوتی ((لەدونیادا من دەناسن، هەموو دەهاتنە مەیخانەی منەوە، ئوستاد ئیلیازر خۆت لە من نەبان مەکە، گرۆ دەکەم کە تۆش سەرت لەمەیخانەی من داوە، دەمویست بپرسم کەتا ئێستا گوێت لە پیلات بووە، ئایا هیچ کاتێ ئەوت دیوە؟))

سەرو کەللەی غولاًمچەکە بەدیارکەوت، پشتی بەدەرگاداو بەگوێگرتنەوە وەستا، کریست لەحالێکدا هەولێدەدا وەبیرخۆی بهێنێتەوە، وەلاًمی دایەوە ((وەلیّ شتێك دێتەوە زەینم: دوو چاوی خۆلّەمێشی بێ بەزەیی، وەکو چاوانی شاهین، خەندەیێکی گالّتەئامێزو ئەنگوستیلەیێکی زێڕ.. هیچی ترم وەبیرنایێتەوە. ئاها وەبیرم دێت، لەگەنێکیان بۆ هێنا نوقرەیی بوو تا دەستەکانی بشوات، هەمانەو بەس، واخەیالّ دەکەم کە لەخەونێ زیاتر نەبوو بەهاتنی رۆژان نەما... بەلاًم ئێستا کە بیرم نوێ بۆوە، بەبیرم دێ کە لە خەودا زۆری ئازار دام)).

- نەفرەتی خودای لێ بێ، بیستم کە لەبەر چاوی خودا خەون زیاتر لە ڕاستی رۆژو نرخی هەیە خودا پاداشتی پیلاتی کرد.... ئەو لەخاچ دراوە)).

کریست هاواری سەردا ((لەخاچ دراوە))



- سەرسامی ناویۆ، مستەهەقی بوو، دوێنێ لەکاتی سپێدە ئەویان بە لەخاچدراوی بینی، وەك دەلّێن شێت بووبوو، نەیدەتوانی بخەوێ، لەناو جێ دەهاتە دەرەوە، بەدوای لەگەن دەگەڕا، بەدرێژایی شەو دەستی دەشوشت‌و هاواری دەکرد:

((من دەستەکانم دەشۆم، من بێگوناهم)) لەگەلّ ئەوەش خوێن بەسەر دەستیەوە مابوو هەمیشە دەستی دەشوشت، پاشان دەچووە دەرەوە لە گەلّگەتا پیاسەی دەکرد، ئارام‌و قەراری لێ بڕابوو، هەموو شەوێ دەستووری دەدایە غولاًمە بەوەفاکانی کە بەقامچی لێی بدەن، دڕکی کۆ دەکردەوە تاجی لێ دروست دەکرد، تاجەکەی لەسەر دەناو خوێن بازرقەی دەکرد.

کریست بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((وەبیرم دێت...وەبیرم دێت)) جارجار بەدزیەوە سەیرێکی دەکردە غولاًمچەکەوە کە پشتی بە دەرگا دابوو بەدیقەت گوێ راگرتبوو.

- پاشان پەنای بردە بەرمەستی‌و تەواوی مەیخانەکانی تەی دەکرد، هاتە مەیخانەی منیش خۆی مەست دەکرد، ژنەکەی لەبەر رەفتاری ئەوا هەراسان ببوو، لە داخان شەقی دەبرد، لەکۆتاییدا، لەڕۆمادا دەستووری لابردنی هات... ئوستاد ئیلیازر..گوێت لێیە؟ بۆ ئاخ هەلّدەکێشی؟

کریست چاوی بڕیبووە زەوی‌و وەلاًمی دایەوە، غولاًمچەکە پیالّەی سیمونی پڕکردەوە لەسەرخۆ چرپاندیە گوێی ((بێدەنگ بەو یالّلاً لێرە بڕۆ))

بەلاًم سیمون تووڕەبوو ((بۆ بێدەنگ بم؟ داستانەکەم تەواو نەکردووە، دوێنێ لەکاتی سپێدە دۆستەکانتان پیلاتیان لەگەلّگەتا لەخاچ دا))

وەك بلّێی لەپڕێکا خەنجەرێ بەسەر دلّێ کریست دابێتە خوارەوەو چوار نیشانەی شینی سەردەست‌و پێیەکانی هەلّمساو سوور هەلّگەڕا، رەنگی پەڕی‌و مێرێ ئاگاداربۆوە، دەستی بەسەر ئەژنۆی ئەو داهێناو گوتی ((ئازیزم تۆ ماندووی وەرە ژووەوە رابکشێ))

خۆرەتاو ئاوابوو هەوا فێنك دەبوو، ئێستا تەواو مەست بوو ئیدی قسەی بۆ نەدەهات‌و چووە خەوەوە، غولامەكە بازووی گرت‌و لەدێكەدا دەری پەڕاند، بەتووڕەییەوە پێی گوت ((زۆرت هەلەق‌و پەلەق گوت)).

لەحاڵێكدا هێمای بەو جادەیە دەكرد كە بە ئورشەلیم كۆتایی دەهات‌و گوتی ((ئێستا ون بە!))

كوڕە بەنیگەرانییەوە گەڕایەوە ماڵ، كریست لەكارگەكەی راكشابوو، چاوی بڕیبووە كلاوڕۆژنەی بنمیچەوە، مارتا خۆراكی ئامادەدەكرد، مێریێ شیری دەدایە مناڵەكەی‌و سەیری كریستی دەكرد، غولامچەكە بەچاوانێ كە لەبەر زۆر تووڕەبوون بریقەی دەدایەوە چووە ژوورەوە كریست گەڕایەوەو سەیری ئەوی كرد، لێوی خۆی گەستەوە نەبادا قسەیێكی لەدەم بێتە دەرەوە، جارێكی دیكەش رووی لەو كرد وای بەدیارخست كە داوای كۆمەگی لێ بكات. بەڵام منداڵكارەكە ئەنگوستی دانایە سەر لێوەكانی خۆی‌و بەبزەوە گوتی ((بخەوە)) كریست چاوی لەسەریەك دانا‌و لێوەكانی ئارامیان گرت، چینەكانی تویڵی نەماو چووە خەوەوە، رۆژی دوایی لەكاتی سپێدەی سەحەران كە بێداربۆوە، هەستی بەشادومانی‌و ئارامی دەكرد، وەك بڵێی گیانی لەدەست مەترسییێكی گەورە رزگاربوو، غولامەكەش بێداربۆوە، لەكاتێكا پێدەكەنی، كارگەكەی رێكدەخست.

كریست لەحاڵێكدا چاوی بۆ هەڵدەتەكاند پرسی ((بەچی پێدەكەنی))

بەدەنگێكی لەسەرخۆ كە ژنان نەبیستن وەلامی دایەوە ((كریستی ناصیرەیی بە مرۆڤایەتی پێدەكەنم، زەینی بەدبەختی ئێوەی مرۆڤ هەموو ساتێ دەبێ لە مەترسی بپەڕێتەوە؟، ئەملا تەك‌و ئەولا تەك، لەدوای تەلان جگە لە گوزەرگایێ لەڕووبەڕودا هیچ شتێكی دیكە نییە، ئەویش رووبەڕووی گەرداو پردێ بەباریكی موو درێژ بۆتەوە))

كریست بەخەندەوە گوتی بۆ ساتێ زەینم بەسەر پردی تۆوە خزی، بەلام گیانم بەساغ‌و سەلامەتی قورتاركرد))



ژنەكان هاتنە ژوورەوەو بابەتی قسەی گۆڕا، ئاگرداگیرسابوو رۆژ دەستی پێكردبوو، یەك فەوج مناڵ بەپێكەنینەوە هەلڕژانە حەوشەوەو دەستیان كرد بەچاوشاركێ)).

كریست بەخەندەوە گوتی ((مێریێ یانی ئەم هەموو منالانەمان هەیە مارتا حەوشە پڕ مناڵە، دەبێ ماڵ گەورەتر بكەین‌و مناڵ راگرین)).

مارتا گوتی ((مالێ گەورەتر دەكەین))

- هیچی نەماوە كە وەكو مشكی بیابان‌و سمۆرە لەدەرو دیوارو درەختەوە سەرهەڵگەڕێن. مێریێ، ئێمە جەنگمان راگەیاندووە دژی مەرگ، پیرۆز بێت رەحمی ژنان كە وەكو سگی ماسی پڕە لە هێلكەو هەریەكەو مرۆڤێ، ئیدی مەرگ ناتوانێ بەسەر ئێمەدا زاڵ بێت.

- مێریێ وەلامی دایەوە ((ئازیزم بەهەمان شێوە مەرگ ناتوانی بەسەر ئێمەدا زاڵ بێت، تۆ تەنها ئاگات لەخۆبێ‌و بەسەلامەتی بمێنەوە)).

كریست كەیفی خۆش بوو دەیویست سەر لەبەر سەری مێریێ بنێت ((مێریێ، وەرە بزانم تۆ هیچ كاتێ بیر لەمردن ناكەیتەوە؟ تۆ هیچ كاتێ داوای بەزەیی‌و لووتفت لە خودا كردووە؟ ئایا تۆ تا ئێستا بۆ رۆژی پەسلانێ[*] نیگەران بوویت؟))

مێریێ كەزیە درێژەكانی راتەكاندو پێكەنی ((ئەم جۆرە كارانە پەیوەندی بەپیاوانەوە هەیە، نەك من داواكاری لووتف‌و بەزەیی خودا بم، من ژنم‌و لەمێردم داوای لووتف‌و بەزەیی دەكەم هیچ كاتێ لەدەرگای خودا نادەم، تا گەدایی بۆ بەختەوەری ئەبەدی بەهەشت بكەم، ئەو پیاوەی كەخۆشم دەوێ، دەیكوشمە باوەش‌و هیچ داوایەكی دیكەم بۆ بەهەشتی دیكە نییە، بەختەوەری ئەبەدی پێشكەش بەپیاوان بێت))

كریست لەحاڵێكدا شانی رووتی ئەوی دەلاواندەوە گوتی ((بەختەوەری ئەبەدی پێشكەش بەپیاوان بێت؟ ژنی خۆشەویستم، زەمین جوخینێكی تەنگە، چۆن دەتوانی لەو فەزایە تەنگە خۆت زیندانی بكەی‌و مەیلی راكردنت نەبێ؟))

---

[*] پەسلانێ: رۆژی قیامەت

- ژنیێ تەنها لەناو دیاریکراوەکاندا خۆشبەختە مەولای من، خۆت ئەوە دەزانی کە ژن ئەمبارێکە نە کانییێ.

مارتا بەپەلە هاتە ژوورەوە گوتی ((نەفەرێ سۆراغی ماڵی ئێمە دەکات، پیاوێکی کورتەبالاو قەڵەوە، قەمبور کەچەڵە، بەپێیە گۆجەکانی بەخێرایی رێ تەی دەکاو ئەوەندە نەماوە بگاتە ئێرە)).

غولامچەکە بەپەلەو هەناسەبڕکێوە هاتە ژوورەوە ((حەز لە چەهرەی ناکەم، دەرگای لەڕوودادەخەم، ئەو یەکێ لەوانەیە کە ژیانمان ناخۆش دەکات)).

کریست بەتووڕەییەوە سەیری ئەوی کردو پرسی ((لەچی هەراسانی؟ مەگەر ئەو کێیە کە دەبێ تۆ هەراسان بکا؟ دەرگا بکەوە)).

غولامچەکە چاوی هەڵتەکاندو بەئارامی گوتی ((لەکۆڵ خۆتی کەوەو دەقی کە))

- بۆ مەگەر ئەو کێیە؟

- لەکۆڵ خۆتی کەوە زیاتر لەوە مەپرسە.

- کریست تووڕەبوو ((مەگەر من ئازاد نیم کە بەپێی مەیلی خۆم رەفتار نەکەم؟ دەرگا بکەوە))

دەنگی پێیێ لەدەرەوە بیستراو ئەڵقەی دەرگا کوترایەوە، کریست لە حاڵێکدا رایدەکردە حەوشە پرسی ((کێیە؟))

دەنگێکی بەهەیبەت وەڵامی دایەوە ((من نێردراوی خودام، بکەوە))

دەرگا کرایەوە، قەمبورێکی خەپڵەو قەڵەوو گەنج، بەلام سەرکەچەڵ، لەئاستانەی دەرگا وەستابوو، لەچاوەکانیدا ئاگر دەهاتە دەرەوە، مێرێو مارتا کە بە پەلە بۆ دیتنی ئەو هاتبوون، پاشەکشەیان کرد.

میوان لەحاڵێکدا بازووەکانی دەکردەوە گوتی ((برایان شادی بکەنو بکەونە وەژدەوە، خەبەرێکی خۆشم بۆ ئێوە پێیە)).



کریست سەیری ئەوی کرد، زەینی خۆی کوشی تا وەبیری بێتەوە کە ئەوی لەکوێ بینیوە، ئارەقەییێکی ساردی بەلەشدا هات ((تۆ کێی؟ وا خەیاڵ دەکەم تۆم لەشوێنێ بینیوە لە تەلاری کیافا؟ لەڕێو ڕەسمی لەخاچدان؟))

غولامچەکە لەگۆشەی حەوشە خۆی مات کردبوو وتی ((شاوولە، شاوولی خوێنخۆر)).

کریست تووشی وەحشەت بوو پرسی ((تۆ شاوولی؟))

- کاتێك هەو بووم، ئێستا ئەو شاوولە خوێنخۆرەنیم، من نووری راستیم دیوە، من پاولم سوپاس بۆ خودا کە نەجاتم بوو، ئێستا بۆ رزگارکردنی دونیا رێگەم گرتۆتەبەر، نەك یەهودیە، نە فەلەستین، بەڵکو تەواوی دونیا! ئەو موژدەیەی کە پێمە پانتایی بە فراوانی ئۆقیانووسەکانو سەرزەویە دوورەکانی دەوێ، ئوستاد ئیلیازر سەرت رامەتەکێنە، تیزم پێ مەکە، بەڵێ دونیا نەجات دەدەم.

کریست وەڵامی دایەوە ((بەقوربانی رووخساری مانگت بم، من لەو کارەی کە تۆ گرتووتەبەر من گەڕاومەتەوە، لەبیرمە کە وەك تۆ گەنجێتی تەمەنو ساڵی تۆم هەبوو کە حەزم بە رزگارکردنی دونیا بەستا، باشە مانای گەنجێتی هەر ئەوەیە، بەپێی پیادەو بەجلی دڕاوو کەمەربەندی بزمار نیشان، لە شێوەی پەیامبەرە کۆنەکان دەچوومە ئەملاو ئەملا، پەلکە لیمۆیان تێدەگرتم، لێیان دەدام، یەك پێ دوور بووم لە لەخاچدانم هەمان شتیش بەسەر تۆ دێت)).

کریست کەوتبووە هەڵچوونەوەو بە لە بیرکردنی رۆڵی ئوستاد ئیلیازر رازی بۆ غەریبەکە ئاشکرا دەکرد، غولامچەکە تووشی وەحشەت بوو.. کەوتە میانیانەوە تا بەر لە قسەی ئەوان بگرێت ((ئوستاد قسەی لەگەڵ مەکە، لێگەڕێ من باقسە لەگەڵ ئەو بکەم)) رووی لە غەریبەکە کرد ((ئەی دێوی دۆزەخ مەگەر ئەوە تۆ نەبووی کە بە ستەمگەری .......ت کوشت؟ خوێن لەدەستت دەچکێتەوە یاڵلا برۆ بچمت ون کە)).

کریست لە کاتێکدا دەلەرزی گوتی ((تۆ؟ تۆ؟)) پاول بەئاخێکی قووڵەوە وەڵامی دایەوە ((بەڵێ من، لەسینەی خۆم دەدەم جلی بەرم دەدڕێنم، هاوار دەکەم: گوناهم کرد.. گوناهم کرد)) من مەئموری کوشتنی خەڵکانێ بووم کە رێبازنامەی موسایان

لەژێر پێ نابوو، هەر کەسێ کە دەمتوانی کوشتبوومو کە دەگەڕامەوە بۆ شام لە پڕێکا هەورەتریشقەیێ ئاسمانی گرتو منی هاویشتە سەر زەوی، نوورێکی مەزن منی نابینا کردو شتێکم نەدیت، بەلاّم دەنگێکی سەرزەنشت ئامێزم لەسەر سەری خۆمەوە بیست ((شاوول... شاوول، بۆ تاقیبم دەکەی؟ مەگەر چیم لەتۆ کردووە؟

هاوارم کرد ((خوداوەندا... تۆ کێیێ؟)) ئەو وەلاّمی دایەوە من هەمان کریستم کەبەدوایدا دەگەڕێی، هەلّسەوە بڕۆ شام لەوی یاوەرانی من فێرت دەکەن کەچی بکەی)) بەترسو لەرزەوە هەلّسامەوە، چاوانم کراوەبوو، بەلاّم نەمدەدی هاوڕێکانم دەستیان گرتمو منیان گەیاندە شام، یەکێ لەیاوەرانی کریست بەناوی — حەتانیا-خوا خێری بنووسێ هاتە ئەو کوختەیەی کە لەوێ مابوومەوە دەستی بەسەر سەرمدا هێناو دوعای کرد ((ئەی کریست بینایی بۆ بگەڕێنەوە تا بۆ تەواوی دونیا سەفەر بکاتو بانگەشە بۆ ئینجیل بکات))

لەوکاتەی کە ئەو دوعای دەکرد، بینایی خۆم بۆ هاتەوەو خۆم ئاوەمۆر کرد، ناوم بوو بەپاول: پەیامبەری میللەتان، لەدەریاو وشکاییدا پەند دەدەم ((خەبەری خۆش)) وەغەر دەکەم، بۆ وا بەچاوی دەرپەڕیو تەماشام دەکەی؟ ئوستاد ئیلیازر بۆ وا تەنگاوی؟))

کریست بەمستی گرێکردووی‌و دەمی کەف کردوویەوە لەحەوشەدا پیاسەی دەکرد ژنەکانی بینی کە ڕەنگو ڕوویان پەڕی بوو لەگۆشەیێکا وەستابوون، منالاّنی دیت کە بەقیژاندنەوە خۆیان بەدامەنی دایکیانەوە هەلّواسی بوو، بە ئەمرکردنەوە پێی گوت ((بڕۆ بەتەنها جێمان بهێلّە))

غولاّمەکە هاتە لای کریست تا قسە بکات، بەلاّم بەتووڕەیی وەلای ناو گوتی ((مەگەر ئازاد نیم؟ زۆرم سەیرکرد، ئیدی تاقەتم نەماوەو دەمەوێ قسە بکەم،)) گەڕایەوە لای پاولو بەدەنگێکی لەرزانەوە هاواری کرد ((کام خەبەری خۆش))؟

- کریستی ناصیرەیی کە هەلّبەت ناوت بیستووە، کوڕی یوسفو مێریێ نەبوو، کوڕی خودابوو، ئەو لە ئاسمان هاتو وەك مرۆڤی لێهات تا مرۆڤایەتی رزگار بکات، کاهینەکانو فەریسیە پیسەکان دەستگیریان کرد بردیانە لای پیلات لەخاچیدا. بەلاّم لەڕۆژی سێیەم رابۆوەو چۆوە ئاسمان، برایان، مەرگ زالّ بوو، گوناهەکان بووردرانو دەروازەکانی بەهەشت کرانەوە.



کریست هاواری کرد گوتی ((تۆ ئەو کریستی ناصیرەییت کە بە چاوی خۆت بینیت رابۆوە؟ چ شکلێکی هەبوو؟))

- تیشکی هەورەتریشقە، تیشکی هەورە تریشقە کە قسەی دەکرد.

- ئەی درۆزن.

- یاوەرەکانی ئەویان دیت، دوای لەخاچدانی ئەو لەبالّەخانەیێ لە دەوری یەك کۆبوونەوە. دەرگایان داخستبوو، لەپڕێکا ئەو هاتبوو لەمیانیانا وەستاو گوتی : ((سەلام لە ئێوە بێ)) بەدیتنی ئەو سەریان سووڕما، بەلاّم تۆماس باوەڕی نەکرد کە خودی کریست بێ، ئەنگوستی لەناو برینەکانی داناو بڕێ ماسی بەودا، ماسییەکەی گرتو خواردی.

- ئەی درۆزن...

بەلاّم پاول کەوتبووە هەلّچوونەوە، چاوەکانی بریقەی دەدایەوە، لەشی دووقەدی خۆی قیت راگرت ((ئەو لەمرۆڤ بوو دایکی پاکیزە بوو، جوبریل لە ئاسمان دابەزیو گوتی ((مێریێ، درود لەتۆ)) قسەی ئەو وەکو تۆو کەوتە ناو رەحمیەوە، لەدایك بوونی ئەو وابوو

- ئەی درۆزن، ئەی درۆزن!

پاول سەرسامو بێ جولّە لەجێی خۆی مایەوە، غولاّم هەلّسایەوە دەرگەی دوو دەری لێکدا، هاوسێکانی بەبیستنی ئەمە کەوتە دادو فەریادەوە، دەرگاکانیان نیوە کردبۆوە، گوێکانی خۆیان تیژ کردبوو، دوو ژن بەوەحشەتەوە دووبارە لەحەوشە بەدیارکەوتنەوە، بەلاّم غولاّمەکە ئەوانی ناردەوە ژوورەوە، کریست لە تووڕەییان دەکولاّ، ئیدی نەیدەتوانی دلّی ئارام بێتەوە هاتە نزیك پاولەوە شانەکانی ئەوی گرتو توند رایتەکاندو هاواری کرد ((هەی درۆزن، کریستی ناصیرەیی منم قەت لە خاچ نەدراومو قەت رانەبوویمەوە، من کوڕی مێریێو یوسفی نەجاڕی ناصیرەییم، من کوڕی خودا نیم، وەکو هەموو خەلّکێکی دیکە، کوڕی مرۆڤم، ئەوە وشەیێکی کوفرو بە زاتانە بوو هێناتە سەرزمان! ئەوە چ درۆیەکی شاخدارە! ئەی فیلّباز، بەدرۆیێکی ئاوا دەتەوێ دونیا رزگار بکەی؟)).

پاول بەسەرسامییەوە کەوتەزەمزەمە ((تۆ؟.......؟))

لەوکاتە کە ئوستاد ئیلیازر دەستی لەسەر لێوی دانابوو قسەی دەکرد، پاول کەوتبووە ئاگاهی لەو نیشانە شینانەی کە وەك برینو بزمار بەسەر دەستو پێیەکانو دڵیەوە بوو..

کریست هاواری کرد ((بۆ چاوت دەسوورێنی؟ بۆ وا لە دەستو پێم مورِ بوویتەوە؟ ئەو نیشانانە دەبینی لەکاتی خەودا خودا نەقشی کرد، راستیت دەوێ هێشتا نازانم، ئایا خودا لەگەڵ هەرماس ئەو نیشانانەی نایە سەر لەشم، خەونم دیت کە بەسەر خاچەوەمو ئازار دەکێشم، بەلاّم بە هاوارەوە لەخەو بێداربوومەوەو ئازارم نەما، ئازارێ کە دەبوا لە بێداریدا بەرگەم گرتبا لەخەو یەخەی گرتمو رامکرد. پاول کە لاجانگەکانی لەترسی شەق بوون توند گرتبوو، هاواری کرد ((وسبە.. بێدەنگ بە!))...

بەلاّم ئایا کریست دەیتوانی ئارام بگرێت! هەستی دەکرد ئەو وشانە ساڵەهایە لە سینەیدا زیندون، ئێستاکێ دەرگای دڵی خۆی کردۆتەوەو ئەم قسانە دەکات، غولاّمەکە خۆی بەبازووی هەڵواسی بوو پێی گوت ((بێدەنگ بە)) بەلاّم کریست بەتەکانێ ئەوی بەزەویدا داو رووی لە پاول کرد.

- بێدەنگ نابم، هەموو شتێ دەڵێم، دەبێ ئارامی وەدەست بهێنمەوە، بەڵێ رامکردو لە ژێر ناوو لەشێکی دیکە هاتمە ئەم گوندە بچووکە؟ لێرە وەکو مرۆڤێ رۆژگار بەسەردەبەمو دەخۆمو دەخۆمەوە، کاردەکەمو دەبمە خاوەنی منالّ، ئاگرێکی سەرسامکەر هەڵساو منیش بووم بە ئاگرێکی میهرەبانو ئارام بوومەوە، لەناو سۆپادا خۆم مات کرد تا ژنم خۆراکی منالّەکانی لەسەردا بکولێنێ، بۆ فەتح کردنی دونیا، باوەشێنێکم بەرز کردەوە، بەلاّم لەنێو ئەم تەشتە بچووکەی مالێدا لەنگەرم گرت، شکۆو شکایەتیشم نییە، من کوڕی مرۆڤم نە کوڕی خودا، بێهوودەیە درۆ بە خەڵك مەڵێ کە گوایە قەدعەلەم دەکەیو بانگەشەی حەقیقەت دەکەی.

- ئێستا نۆبەتی تەقینەوەی پاول بوو، لەکاتێکا هێرشی دەکردە سەر ئەو، هاواری کرد: ئەم دەمە بێ شەرمەت داخە! بێدەنگ بە، دەنا مرۆڤ گوێیان لە دەنگت دەبێو لەترسان زەندەقیان دەڕژێ، لەناو ورگی رزینو زوڵمو هەژاری ئەم دونیایە، کریستی لەخاچ دراو رابۆتەوەو دڵدەرەوەیێکی بەنرخە بۆ مرۆڤی شەریفو مرۆڤی



زولّم لێکراو، ئێستا راست بێ یا درۆ، بایەخی پێ نادەم بۆ ڕزگارکردنی دونیا ئەمە بەسە.

- وێران بوونی دونیا لەبەر کاریگەرێتی راستی باشترە لەڕزگاربوون لەناو درۆدا، بۆ؟ چونکە لەناو ورگی رابوونەوەیێکی وەهادا ئەو کرمە گەورەیە خۆی شاردەوە.

- ڕووی ناوی راستیو درۆ چییە؟ هەر شتێ باڵی فڕین بداتە مرۆڤ دەبێتە مایەی خەلّقکردنی کاری گەورەو رۆحی بلیمەتو ئێمە بە ئەندازەی قامەتی مرۆڤ لەزەمین هەڵدەکێشێ، حەقیقەتە، هەر شتێ پەڕوباڵی فڕین هەڵپاچێ درۆیە.

کوڕی هەرماس وەکو ئەوە وایە کە زۆر لەبلەبانی، ئەو بالاّنەی کە باسیان لێوە دەکەی باڵەکانی لۆسیمفۆرن، بۆ دەخەنی؟

- هەڵبەتە وەکو بولبول قسەدەکەم، من دەربارەی حەقیقەتو درۆو ئەوەی کە ئەوم دیتوە یا نا، لە خاچ دراوە یا نەدراوە، نرخی فلسەکی لای من نییە، راستی خەڵق دەکەم، لەڕێگەی سەرسەختی تاسووقو یاوەری ئەوان خەڵق دەکەم، هەولّیان بۆ نادەم تا بیاندۆزمەوە.

ڕێگە پایەی مرۆڤ دروست دەکەم، بەمجۆرە دەبمە مایەی سەرهەڵدانی مرۆڤ، باش گوێکانت مووت کەوە، بۆ رزگاربوونی دونیا لەخاچدانی تۆ پێویستە من سەرەڕای مەیلی تۆ لەخاچت دەدەم، رابوونەوەی تۆش پێویستە، دیسان سەرەڕای مەیلی تۆ زیندووت دەکەمەوە، تۆ دەتوانی لەم گوندە کۆڵەوارە دانیشی لانك دروست بکەی بۆ منالاّن، هەر بۆ ئاگاداری جەنابتان دەبێ بڵێم کە من هەوا ناچار دەکەم شێوەی تۆ وەرگرێ: لەش، تاجێ لە دڕك، بزمار، خوێن، هەموو ئەوانە زرورین، هەریەکەیان بەشێکە لە دەستگای رزگارکردن لە هەر سوچێکی ئەم دونیایە چاوانێکی زۆر سەیری بەرزایی دەکەن تۆ بە لە خاچ دراوی لە هەوا دەبینن، ئەوان دەگرینو فرمێسك رۆحیان لە گوناه دەشواتەوە، بەلاّم لەڕۆژی سێیەم تۆ لە گۆڕ هەڵدەتەکێنم چونکە رزگاربوون بێ رابوونەوە نییە، دوا دوژمنو ترسناکترین دوژمن مەرگە، من مەرگ بەناونیشانی رابوونەوەی کریستی کوڕی خودا دەتارێنم.

- ئەوە حەقیقەتی نییە، من هەڵدەستمەوەو هاواری لەخاچ نەدانی تۆو رانەبوونەوەو خودا نەبوونی خۆم دەکەم.

- هەرچەند دڵت دەخوازێ، هاوارکە، من لەتۆ ناترسم، ئەسڵەن پێویست بە تۆ نییە، ئەو چەرخەی هەڵیدەسووڕێنی، ئێستا خێرابوو، مەهار کردنی کارێکی بێهودەیە، راستیت بوێ، هەمان ئێستا کەقسە دەکەی، بۆ ساتێ هاتمە سەر ئەوەی هێرشت بکەمە سەرو بەرلەوەی پێناسەی خۆت ئاشکرا بکەی بە مرۆڤایەتی بێچارە بڵێی کە لەخاچ نەدراوی تۆ بێدەنگ دەکەم، بەڵام یەکسەر تووڕەیی خۆم خواردەوەو بەخۆمم گوت:

- من تەنها قسەیێکم کردووە، تەنهایەك پەیامم هێناوە (ئەشق، هەمانو بەس).

- بەگوتنی (ئەشق) تەوقی سەر گەردەنی تەواوی فریشتەو هەرماسەکانی هەڵگرت کە لەناو دەروونی مرۆڤدا هەڵتروکابوون، بەم شێوەیەی کە خەیاڵ دەکەی —ئیشق- وشەیێکی سادەو ئارام نییە: تەواوی لەشکر قەتلو عام کراون شارەکان ئاگریان تێبەربووە، خوێنێکی بێ حسێبی لە دەروونی خۆی شاردۆتەوە. رووباری خوێن ئەشكو رووخساری دونیای گۆڕیوە، ئێستا هەرچەند دڵت دەیەوێ دەتوانی هاوار بکەی کە ((من مەبەستم ئەوە نەبوو، ئەوە ئەشق نییە، یەکتر مەکوشن، ئێمەش براین، بەسکەن)) بەڵام ئێستا ئەی فەلەکزەدە چۆن دەتوانێ بەسکات؟ مەگەر نازانی کە (تیر لە کەوان دەرچووە ناگەڕێتەوە؟))

- وەکو هەرماسێ پێدەکەنی.

نەخێر، بەڵکو وەك پەیامبەرێ بتەوێ ونەتەوێ، من دەبمە پەیامبەری تۆ. بەپێی مەیلی خۆمو دڵخواستی خۆم داستانی ژیانو رێنماییو لەخاچدانو رابوونەوەی تۆ دروست دەکەمەوە، یوسفی نەجاڕی ناصیرەیی تۆی نەهێناوەتە بوون، من تۆم خولقاندووە، من پاولی نووسەر، خەڵکی کەلکلیلیە.

- نا.....نا



- کێ لە تۆی پرسی؟ من پێویستم بە تۆ نییە، بۆخۆت لەکاری من وەردەدەی؟ کریست کەوتە سەرسەکۆی حەوشەو نائومێدانە سەری نایە ناو ئەژنۆکانی: چۆن لەگەڵ ئەم دێوە دەستو پەنجە نەرم بکاتو ڕووبەڕوو بێتەوە؟

- پاول بەسەر سەری کریست وەستابوو کە کەوتبووە سەرخاك بە سەرزەنشتەوە قسەی بۆ دەکرد: ((ئوستاد ئیلیازر، دونیا چۆن دەتوانێ بەهۆی تۆ رزگاری بێت؟ بەهێنانی کام نموونەی باڵا دەتوانێ دونیا ناچاری پەیڕەوی کردنی خۆت بکەیت؟

- ئایا بەکەسێ وەکوتۆ دونیا دەتوانێ لەخۆی بەولاتر بڕواتو رۆحی پەڕوباڵ دەرکات؟ دونیا بۆ نەجاتی خۆی دەبێ گوێ لە من راگرێت....

- کریست سەیری دەوروبەری خۆی کرد حەوشە خاڵی بووبوو، غولاّم لەحاڵێکا لە گۆشەیێکا هەڵتروشکابوو چاوە سپیەکانی دەسووڕا، وەکو سەگی مێگەڵ لە زنجیردا دەیلوراند، ژنان خۆیان شاردبۆوە.

هاوسێکان رایانکردبوو، بەڵام پاول وەك بڵێی کە حەوشە مەیدانێکی زۆر فراوانەو پڕ لە ئاپۆڕە، بە هەڵبەزینەوەیێك پەڕیە سەربەرزایی سەکۆوە دەستی کرد بە وەعزدان بۆ کۆمەڵێکی نادیار.

- برایان، سەرتان بەرزکەنەوە سەیرکەن لەلایەك ئوستاد ئیلیازر لەلایەکی دی پاولی بەندەی کریست هەڵبژێرن، ئەگەر لەگەڵ ئوستاد ئیلیازر بڕۆن، ئەوا دەکەونە ژێر کۆتو ژیانێکی تێکەڵ بە هەژاریتان دەبێت، ژیانو مەرگی ئێوە دەبێتە مەڕ، کەمێك خوریو باعەباعو بڕێکی زۆر سەرگین جێدەهێڵن، بەڵام ئەگەر لەگەڵ من بن ئەو ئەشقو هەولّو جەنگ هەرزانی ئێوە دەبێت، ئێمە دونیا فەتح دەکەین، ئێستا هەڵبژێرن، لەلایەك کریستی کوڕی خودا، نەجاتی دونیا، لەلایەکی دی بزربوونی ئوستاد ئیلیازر، دەنگێ لە فەزاوە بیسترا.

- ئەی پەیامبەری میللەتان، ئەی رۆحی گەورە کە بە خوێنو ئەشکی خۆت درۆ دەچنیو دەیکەی بەحەقیقەت، بکەوە پێشەوەو رێنماییمان بکە.. تا کوێ دەچین؟ پاول بازووەکانی خۆی کردەوە، بە لەباوەش گرتنی تەواوی دونیا هاواری کرد:

تا نیگای خاکەسووری مرۆڤ هەتا زیاتر تا دڵی خاکەسووری مرۆڤ، سوپاس خوداوەند کە دونیا فراوانە، ئەوپەڕی سرائیل، مەملەکەتی میسر، سووریە حەبەشە، ئاسیای بچووك، یۆنانو جەزایری پڕ بەرەکەتی قوبرس، ردزو کریت هەن، دوورتر رۆم، دیسان دوورتر، بەربەرەکان خۆیانو کەزی درێژو بۆرو تەورداسی دەستیان، وای چ بەختەوەریەك رۆیشتن لە کاتی سپێدە، بەبای دەریا یاکێو لە رووخسارمان، گرتنی خاچو دانانی لەمیانی سینەو دڵمان، دونیا بەدەست هێنان، وای کە چ بەختەوەریەکە بچووك بوونەوەو کوتك خواردن، کەوتنە ناو- گۆشە دوورەکانو کوژران بەخاتری کریست!))

پاول هاتەوە سەرخۆیو ئارام بۆوە، ئەو کۆمەڵە نادیارە لە فەزا ون بوون، گەڕایەوەو کریستی دیت کە ماتو مەبهوت پشتی بە دیوار دابوو گوێی لەو رادەگرت.

- گوتم بەخاتری کریست نەبەخاتری تو ئوستاد ئیلیازر، بەڵکو بەخاتری کریستی بەڕاستی، کریستی من.

- کریست کە ئیدی نەیتوانی بەرگە بگرێ، هۆڕ هۆڕ کەوتە گریانەوە.

غولامچە لێی نزیك بۆوەو گوتی ((کریستی ناصیرەیی بۆ دەگری؟)) کریست بە زەمزەمەکردنەوە گوتی ((ئەی هاوڕێی غەیبی، مرۆڤ چۆن دەتوانێ بەدیتنی تاکە ڕێگایێ، بۆ نەجاتی دونیا بەگریان خۆی بپارێزێ؟)) پاول ئێستاکێ لەسەکۆ دابەزیوە، سەری ئارەقەی کردبوو، نەعلەکانی لەپێ کردبۆوە، لێکی دان تا تۆزیان لێ بتەکێنێ ئەوکاتە بەرەو لای دەرگا کەوتەڕێ بە کریستی گوت کە بەشەرمەوە لەناوەندی حەوشەوە وەستابوو گوتی ((تۆزی ماڵەکەتم لەنەعلەکانم تەپاند، خودا حافیز، ئوستاد ئیلیازر، خۆراکی باشو شەرابی باشو ماچی داغت پیرۆزبێ، بەڵام سەرلە بەر سەری من مەنێ ئەگەر ئەو کارەبکەی؟، فاتیحەت خوێندراوەتەوە، هەر لەبەر ئەوەی نیگەرانیش نەبیت دەبێ بڵێم کە دیداری تۆ بۆ من خۆشحاڵکەر بوو، خۆم لە چەنگی تۆ رزگار کردووە هەمان ئەوەم دەویست، ئێستا ئازادمو خۆم ئاغای خۆمم خوا حافیز)).

دوای وتنی ئەو قسانە، جووت دەرگای کردەوە بەهەڵبەزینەوەیەك خۆی گەیاندە ئەو ڕێگایەی کە بە ئورشەلیم کۆتایی دێت.



غولام کە لە دەرگا چووبووە دەرەوەو سەیری تووڕەبوونی پاولی دەکرد، گوتی ((چ پەلەیەکی هەیە، قۆڵی هەڵبڕیوەو وەکو گورگی برسی رادەکا تا دونیا لەدەمی بباتە خوارەوە))

ئەوکاتە گەڕایەوە، تاسەری کریست بە دەستی خۆی گەرم بکات، رۆحی ترسناکی ئەو کە ئاسمان بۆ لێڵکردنی هاتبوو تەلیسماوی بکات، بەڵام کریست لە ئاستانەی دەرگا رەت بوو لەناوەندی جادەوە وەستابوو، بەئازارو تاسووقەوە چاوی بڕیبووە ئەو پەیامبەرە وەحشیە کە لەوان دەوروبەردا بەپەلە دەرۆیشت ئەو یادو بیقراریەی کە بەتەواوی سپاردبوویە دەستی لەبیرکردنەوە ئیستا لە دەروونیا سەری دەرهێنابوو.

غولام بەوەحشەتەوە بازووی کریستی گرت، بەئارامیو لەهەمان کاتدا فەرماندەرانە گوتی ((کریستی ناصیرەیی تۆ ئەفسون بوی سەیری چی دەکەی؟ یالا برۆین))

کریست کە چاوەکانی بڕیبووە پاول کە لەکۆتایی ڕێگادا خەریك بوو ون دەبێ، نەڕاندی ((بەتەنهام جێ بهێڵە))..

نەکا بتەوێ بە دوای کەوی؟

کریست جارێکی دیکە بە هاوارکردنەوە گوتی ((بەتەنهام بهێڵە)) ددانەکانی دەکەوێت، لەپڕێکا هەستی بەسەرما کرد.

غولام، مێریۆ مارتای بانگ کردو بەتوندی کریستیان گرتبوو تا نەچێتە دەرەوە.

مەریەمو مارتا، خۆیانو یەك حەمکە منال بە دوایانەوە، راکەڕاکە هاتن، دەرگاکانی دەوروبەر بوونەوە هاوسێکانی هاتنەدەرەوە، بەدەوری کریستدا ئەڵقەیان بەستا، کریست لە ناوەندی جادەدا وەستا رەنگی وەکو گەچی دیوار لێهاتبوو، لەپڕێکا پیڵوەکانی کەوت، لەسەرخۆ گەوزیە سەرزەوی، هەستی کرد کە ئەویان هەڵگرتو دایاننایە ناو جێ، ، پاشان گوڵاویان بە لاجانگیدا هەڵسویو سرکەیێکی سووریان نابووە بەرلووتی، چاوانی کردەوە، ژنەکانی خۆی دیتو بزەیێکی کرد، کە چاوی بە غولامچەکە کەوت بەتوندی دەستی ئەوی گرتو گوتی

- من توند بگرە، لێنەگەڕێی برۆم لەهەمان جێ کە هەم باشە.

## بەشی سیو سێیەم

کریست لەژێر چەفیە مێوی دێرینەی حەوشەی خۆی دانیشتبوو، ریشە سپییەکەی بەسەر سینەی رووتی ئەوا پەرشو بڵاوبووبۆوە، رۆژی جەژن بوو، خۆی شوشتبوو، عەتری لەمووی سەرو ریشو ژێر هەنگڵ دابوو، جلی تازەی لەبەرکردبوو، دەرگا داخرابوو کەسێ لەتەنیشت ئەو نەبوو، ژنو منداڵو نەوەکان پێدەکەنینو لەبەشی پشتەوەی ماڵدا یاریان دەکرد، غولامەکە کە هەر لە دەرکەوتنی سەحەرەوە لە بان دابەزی بوو، بەئارامیو لەهەمان کاتدا توورە چاوی بڕیبووە ئورشەلیمەوە.

کریست سەیری دەستەکانی کرد، چەند پیربوویمە، نەتەنها خۆم، بەڵکو ژنو درەختو حەوشەی ماڵو دەرگاو پەنجەرەو بەردەکان کە پێیان لەسەر دادەنێم ئەوانیش پیربووینە.

تووشی وەحشەت بوو، چاوەکانی داخستو هەستی کرد—زەمان- وەك چۆن ئاو لە کانی خۆی، لە زەینی ئەو، دێتە خوارێو هەڵدەڕژێتە سەر گەردەنو سینەو کەمەرو رانەکانیەوەو لە ئەنجامدا لەژێر پێیەکانیدا دێتە دەرەوە.

بەبیستنی دەنگی چەند پێیەك لەحەوشەدا کە مێرێ بوو ئەوی لە دەریای ئەندێشەدا بینیو هاتو لە کەنار پێیەکانی ئەوا دانیشت، کریست دەستی دانایە سەر کەزیەکانی مێرێوە، بەفری پیری باریبووە سەر کەزیە شەبەق رەنگەکانی ئەویشەوە، دڵۆڤانییێکی لەوەسف بەدەر سەراسەری بوونی کریستی داگرت، لەبەرخۆ کەوتە ئەندێشەوە (( من ئەوم پیرکرد، من ئەوم پیرکرد)) لاربۆوەو لەگەڵیا قسەی کرد ((مێرێی خۆشەویست لەو رۆژە پیرۆزەوە کەپێم ناوەتە ناو ماڵتو بوومەتە خاوەنیو



بووم بە هاوسەری تۆ، لەبیرتە کە چەندینو چەندین پەڕەسێلکە هاتن، کە چەندینو چەندین جار لەگەڵ یەك تۆومان داوەو دروێنەمان کردووە، ترێمان چاندووەو زەیتونمان کۆکردۆتەوە؟ مێرێی ئازیزم، کەزیەکانت سپی بوونو کەزی مارتای ئازاش))

مێرێ وەلامی دایەوە ((بەڵێ دروستە، ئیدی پیربووین، ئەودار مێوە کە ئێستا لەژێریا دانیشتبووین، هەمان ئەوسالە کە ئەو قەمبورە نەفرەتیە هات وەبیرت دێ؟ جادووی لێ کردیو تۆی بێهۆش کرد، خودا دەزانێ کە چەندینو چەندین ساڵ ترێی ئەومێوەمان خواردوە.

غولامە بێ سەروسەدای لەبان دابەزیو رووبەڕووی کریست وەستا، مێرێ هەڵسایەوەو رۆیشت، حەزی لەو زڕکوڕە نەدەکرد، ئەو نەگەورە دەبوو نەتێپەڕینی رۆژان کاری لەو دەکرد، مرۆڤـــــــ نەبوو، بەڵکو رۆح بوو، رۆحێکی شەڕانگێز کە هاتۆتە ئەو ماڵەو جێی نەدەهێشت، حەزی لە چاوە کرتەكو سەیرو گاڵتەئامێزو قسە بەدزیەکانی لەگەڵ کریست نەدەکرد، غولام بەنیگای گاڵتەئامێزی نزیك کەوتەوە، ددانە تیژو سپییەکانی بریقەی دەدایەوە، بەئارامی گوتی ((کریستی ناصیرەیی دیماهی نزیك دەبێتەوە))

کریست بەسەرسامیەوە گەڕایەوە ((کام دیماهی))

غولام ئەنگوستی نایە سەرلێوو قسەی خۆی دووبارە کردەوە، رووبەڕووی کریست وەستاو بەخەندەوە سەیری ئەوی کرد.

کریست پرسی ((نەکا بتەوێ جێم بهێڵی؟)) لەپڕێکا هەستی بەشادیو ئارامییێکی سەرسام کرد.

- بەڵێ کۆتایی گەیشتووە، کریستی ناصیرەیی، بۆ بزەت دێتێ؟

- هیوادارم سەفەرێکی باشت هەبێ، ئەوەی کە دەمویست لەتۆ بەدەستم هێنا، ئیدی پێویستیم بەتۆ نییە.

- ڕێورەسمی مالاوایی ئەمەیە؟ ئەو هەموو ناسوپاسیەم لە تۆ پێشبینی نەدەکرد، واتە ئەو هەموو ڕەنجەی کە بۆ تۆم کێشاوە، ئەو هەموو هەوڵەی کە لە ڕێی بەدیهێنانی مەیلەکانی تۆم ئەنجام داوە بێ بەرهەم بوو؟

- ئەگەر مەبەستی تۆ ئەوە بووبێ کە وەکو هەنگ من لە هەنگوین بخنکێنی، ئەوە ڕەنجت بەباچوو، ئەو هەنگوینەی کە جێی نیاز بوو خواردم باڵەکانم تێ نەنان.

- کام باڵ، هەپەڕوتی؟

- باڵەکانی ڕۆحم

غولامچەکە بە شەرارەتەوە پێکەنی ((بەدبەختی بێنەوا، وا خەیاڵ دەکەی ڕۆحت هەیە؟))

- هەڵبەتە هەیتم، ڕۆحم پێویستی بە فریشتەو پاسەوانو غولام نیە، ئازارە.

- فریشتەی پاسەوان لەتووڕەییان شێت بوو ((هەی یاخی!)) بەردێکی لەبەردڕێژی حەوشە هەڵکەندو لەمیانی مشتەکانی خۆیدا وردی کردو تۆزەکەی بەبادا، گوتی ((زۆر باشە دەبینین))و بەجوێنەوە بەرەو دەرگا چوو.

دەنگی هاوارێکی وشكو زاریو شیوەن لەهەوادا باگۆی کرد، ئەسپەکان حیلاندیان، ئاپۆڕەی خەڵك بەڕاکردنو هاوارکرنەوە هەڵڕژانە جادەوە ((ئورشەلیم وا دەسووتێ، ئورشەلیمیان گرت..بەدبەخت بووین))

چەند مانگێ بوو لە ئابلۆقەی ڕۆمیەکاندا بوو، بەلام سراییلیەکان چاوی ئومێدیان بڕیبووە یەهودا، ئەوان لە ئەماندا بوون، شاری پیرۆز نەیدەتوانی بسووتێ، شاری پیرۆز ترسی نەبوو، فریشتەیێ بەخۆیو شمێرەوە لەکەناری هەر دەرگاییێکەوە وەستابوو، ئێستاکێ ژنان بەقیژەوە هەڵڕژانە کوچەکانەوە، پیاوان جلو بەرگیان دڕاندو هاواری دەرکەوتنی خودایان دەکرد، کریست هەڵسایەوە، دەستی مێریۆ مارتای گرت، ئەوانی بردە ژوورەوەو دەرگای جوت کلۆم دا.



بەمیهرەبانیەوە بەوانی گوت ((بۆ دەگرین؟)) بۆ لەبەرابەر ئیرادەی خوا دەوەستن. گوێ بگرن لەقسەکانم مەترسن، ژنە خۆشەویستەکەم زەمان ئاگرێکەو خواوەندیشی لەدەست گرتووەو هەموو ساڵێ بەرخی -پسح- لەشیش دەداو بەسەر ئاگریدا دەنێت، ئەمساڵ ئەم بەرخە ئورشەلیمو ساڵێکی دیکە ڕۆمو ساڵی دوایی....)).

مێریێ هاواری کرد((مەولای من بێدەنگ بە)) لەبیرت چوو کە ئێمە ژنین، بێ دەسەلاتین))

کریست گوتی ((مێریێ لەمن ببوورە، لەبیرم چو کاتێ کە دڵ لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەگرن، هەموو شتێ لەبیر دەکرێو بێ ڕەحم دەبێ)) لەهەمان حاڵدا کە قسەی دەکرد، دەنگی پێیەکی سەنگین لەدەرەوە بیسترا، پاشان دەنگی هەناسەی گیراو بەرگوێی کەوت، دەرگا بە گاشەبەردی گەورە کوترایەوە. غولام لەجێوە هەڵسایەوە، بەری دەرگای گرت بەبزەییێکی گاڵتەئامێز سەیری کریستی کرد، پرسی ((مۆڵەت دەفەرمووی دەرگا بکەمەوە؟ جەنابی کریستی ناصیرەیی؟ هاوڕێیە کۆنەکانتن))

- هاوڕێیە کۆنەکانی من؟

غولامەکە گوتی ((هەر ئێستا بەزیارەتی جوانی ئەوان شاد دەبیت)) دەرگای کردەوە، زنجیرەیێ لە پیرەمێردانی وردیلە بەدیارکەوتن، بەسەرو پۆتەلاکی تێکشکاو کە دەست نیشان نەدەکرا، لەکاتێکا پشتیان بەیەك دابوو، هەڵخزینە حەوشەوە، وەك بڵێی لەشیان بەیەکەوە جۆشی خواردبێ جیاکردنەوەیان مەحاڵ بوو.

کریست هەنگاوێ بۆ پێش چوو وەستا، ویستی دەستی درێژ کاتو بەخێرهاتنیان بکات، بەلام لەپڕێکا هەستی کرد کە لەژێر هاوارێکی تاڵو نەفرەتو بەزەیی وردو خاش بووە، مشتی خۆی کردە گرێو لەچاوەڕوانیدا مایەوە، بۆنی بۆگەنیوێکی سەنگین لە گۆچانی درزبردوو پرچی بۆنگرتوو برینی دەم کراوەیان هەڵدەستا، بۆنی گەنیو فەزای پڕکرد، غولام چووبووە سەر سەکۆوە، تەماشای دەکردنو پێدەکەنین. کریست هەنگاوێکی دیکەی هەڵێنا رووی قسەی کردە پیرەمێردێ کە لەپێش گروپەکەدا بوو ((وەرە ئێرە بزانم، تۆزی زەمانە پەردەی ناوەتە سەرچاوەکانم، شتێ

مەڵێ تا ئەو تۆزە پاك کەمەوەو تۆ بناسم، دڵم دادەخورپێ، بەڵام ئەم لەشە شکاوەو ئەو چاوە بێ بڕستانەم توانای ناسینەوەیان نییە

- مەولای من نامناسیتەوە

- پەترۆس تۆ هەمان ئەو بەردەی کە جارێکیان لەسەردەمی گەمژەڵی جحێڵیم دەمویست کڵێسای لەسەر بوونیات بنێم؟ کوڕی پونس، چەند داشکاوی! ئیدی بەرد نیت، بەڵکو ئەسفەنجێکی پڕ چاڵو چۆڵیت.

- مەولای من زەمانە!

- کام زەمان؟ زەمان قابیلی سەرزەنشت نییە مادامەکێ رۆح بەهێزەوە بمینێتەوە، لەشیش بەهێز دەهێڵێتەوە، دەستە درێژکاریەکانی زەمانیش کورت دەکاتەوە ((پەترۆس رۆحی تۆ دووچاری نابوودی بووە..ڕۆحی تۆ....؟))

- گرفتاریەکانی دونیا منی خستۆتە ئەم حاڵەوە، ژنم هێناوە، بومەتە خاوەن مناڵو برینداربووم، سووتانی ئورشەلیم ببینن، ئاخر من مرۆڤم هەموو ئەو شتانە منی داشکاند. کریست بەهاودڵیەوە دەکەوتە زەمزەمەوە: ((بەڵێ دروستە تۆ مرۆڤی ئەو هەمووە دایڕماندووی، پەترۆس بێچارە، لەباری هەنووکەی دونیا مرۆڤ دەبێ هەم هەرماسو هەم خودا بێت تابتوانێ بەرگە بگرێ، ئەو کاتە کریست رووی لە نەفەری دووەم کردو گوتی ((وا....تۆ؟ لووتیان بڕیوی، رووخسارت وەکو کەللەسەرت پڕ چاڵ بووە، بەم وەسفەوە، چۆن چاوەڕوان دەکەی بتناسمەوە، هاوڕێ دێرینەکەم، قسە بکە)) ((مەولای من)) تاشایە تۆم وەبیردێتەوە بەلەرزینەوە، بەبانگێکی بەهێز بانگی کرد ((مەولای من)) ئەوکاتە سەری لەبەرخۆ ناو بێدەنگ بوو..

- یاکوب، کوڕی گەورەی زوبەدی! ئەی زەبەلاح کە شەشدانگ هەموو حەواست لای خۆت بوو، ئەوە تۆی؟

یاکوب لەحاڵێکا لووتی هەڵکشاندو گوتی ((مەولای من تەنها ئێسقانم ماوە تۆفانێکی سەخت منی لەپێ خست، لەبنی کەشتی درزبردوودا، بەدەنی کون کون بوو ستوونەکەی کەوتو کەشتی شکاو گەڕامەوە بەندەر)).



- کام بەندەرگا؟

- مەولای من...تۆ

- من ناتوانم کارێکت بۆ بکەم، تامیرگای کەشتی نیم کە بتوانم لە ناویا تامیر بکرێیتەوە، ئەوەی کە دەمەوێ بیڵێم دڵت ئازار دەدا، بەڵام عەینی عەدالەتە، تەنها بەندەرگا بۆ تۆ بنی دەریایە.. دوو دوودانە... چواردانە.

لەپڕێکا نەفرەتو خەمێکی مەزن زاڵ بوو بەسەر کریست، رووی لە سێ نەفەری دوایی کرد ((ئێوە سێ نەفەر؟ ئاهای تۆی لەندەهۆری گەمژەڵ کە رۆژگارێ ناوت ناتانیل بوو، بۆ وا داڕژاوی؟ توخودا سەیری ئەو کەفەڵە هەڵمساوەتو ورگ غەبغەبە دوو چینەت بکە! ئەوە بۆ ئەو بازووە ئاسنینەت وای بەسەر هاتووە؟))

ئێستا شتێ نیت، جگە لە تەلارێکی سێ تەبەقەیی، بەڵام خەم مەخۆ بۆچوونە بەهەشت ئەمە بەسە))

بەڵام ناتانیل تووڕەبوو ((کام بەهەشت؟ خراپ ناگوزەرێ، کە من گوێکانو ئەنگوستەکانو چاوێکم لەدەست دا! لەوەش بترازێ، تەواوی ئەو شتانەی لەگوێی ئێمەت ئاخنی بوو، تەنها مەستی بوو ئێستاکێ مەستی لەسەری ئێمەدا پەڕیوە، فیلیپ بەڕای تۆ دروست ناڵێم؟))

پیرەمێردی ریقنەیی کە لەم نێوەندەدا ون بووبوو، گوتی ((ناتانیل چی بڵێم؟ ئەوە من بووم کە بوومە هۆی ئەوەی پەیوەندی بە ئێمەوە بکەی، لەبەر ئەمە من شایانی سەرزەنشتم)).

کریست بە هاودڵیەوە سەری راتەکاندو دەستی ئەو پیرەمێردە ریقنەییەی گرت کە پێیان دەگوت فیلیپ ((ئەی فیلیپ من عاشقی زارینەوەی تۆم تۆ باشترین شوان بووی بۆ مەڕت نەبوو، ئەوەی کە هەتبوو نەتبوو گۆچان بوو شوانکارەیی هەوات دەکرد، شەوانە بات لە ئاخوڕەوە دەبرد بۆ لەوەڕاندن، لە خەیاڵی خۆت ئاگرت دادەگیرساندو مەنجەڵی گەورەت لەسەر دادەناو شیرت لەمەنجەڵەکان دەکولاند لەبەرزایی کێوەوە

هەڵتدەڕشتە دەشتەکانەوە تا هەژاران بیخۆنەوە، تەواوی سەرو سامانی تۆ لە ناو دڵ بوو، دەرەوەشی هەمووی هەژاریو هاوارو تەنهاییو برسیەتی بوو.

بوونە یاوەریی هەمان ئەو مانایەی هەیە! ئێستا فیلیپ ئەی باشترینی شوانان، وا لە پێ کەوتی ئەفسوس کە تۆ تاسووقی مەڕی بەڕاستی بووی، مەڕانێ کە تۆ بتوانی خوریو گۆشتیان بەدەست بگری...و نابودبووی.

فیلیپ پرسی ((کە برسی دەبم چاوەڕوانی چی بکەم؟

کریست وەڵامی دایەوە ((بیر لە خودا بکەوە تێر بیت)) ئەو کاتە دووبارە تووشی دڵڕەقی بوو، رووی لە پیرەمێردی قەد چەمیوە کرد کە لەناو مەنجەڵی گەورەی ئاودا کەوتبووە لەرزینەوە لە جێی خۆی دا مابۆوە، جلی کۆنینەی خۆی وەلانا چاوەکانی ئەوی لێککردەوە، بەڵام نەیتوانی بیناسێتەوە، لەو کاتەی کە سەیری پشت گوێی کرد قەڵەمێکی شکاوو تۆزو غوباریساڵەهای ساڵ نیشتووی بینیو پێکەنی.

- بەخێربێی ئەی کەروێشك کە گوێیە پانو تیژو پڕ مووەکانت لە ترسان دەلەرزیۆ لەهەمان کاتدا بزۆزو تێنووی بیستن بوون، بەو قەڵەمەی خۆت کە وەکو ئەنگوست لەمەرەکەبی دڵت دەبردە خوارەوە، هێشتاش کاغەزەکان خەت خەت دەکەی؟ بەڵێ مەتی نووسەریمن؟

قەڵەمی شکاو هێشتاش هەر لەبەر گوێتە، نەکا جەنگت راگەیاندبێو وەکو رم سوودت لێ وەرگرتبێ؟

- بۆ چاپلوسی دەکەی؟ دەتەوێ کەی دەست لە گاڵتە پێکردنی ئێمە هەڵگری؟ ئۆخ کە بەچ شکۆو گەورەییەك دەستم کردە تۆمارکردنی ژیانو زەمان! خۆشم وێڕای تۆ جاویدانی دەبووم، ئەو هەموو ماندووبوونە بەباچوو...

- کریست لە پڕێکا هەستی کرد ئەژنۆکانی شل بوون، سەری نایە بەرخۆ، بەڵام بەخێراییو تووڕەییەوە، سەری بەرزکردەوە، بەهێماییێکی هەڕەشەئامێز پەنجەی بۆلای مەتی درێژ کردو گوتی ((بێدەنگ بە بەچ زاتێکەوە ئەم قسەیە دەکەی؟))



- پیرەمێردی لاوازو لۆچ لەنێوان پێیەکانی ناتانیل بەدیارکەوتو بناغەی پێکەنینی داناو کریست گەڕایەوەو بێ چەندو چوون ئەوی ناسیەوە.

- تۆماس، منالی حەوت مانگەم، بەخێر بێی، ئەوە چیت بەسەر ددانەکانت هێناوە؟ ئەو دوو بەنەمووەی سەرت چی لێهات؟ ئەو ریشە چەورەی کە بەچەنەگەت هەڵواسرابوو لەکام بزنت بە ئەمانەت وەرگرتبوو، من کە باوەڕ ناکەم تۆ هەمان تۆماسی دوو رووی حەوت چاوی ژێر کا بیت.

- باوەڕ بکەن، کە بەبێ هەڵوەرینی ددانو دوو بەنەمووی سەر هەموو شتێ میزان میزانە!

- وەکو کەلەشێر وایە هەموو رۆژێ لەکاتی کەلەشێر خوێندندا لەبەرزایی سەرگینەوە قوقە قوقی بوو لەگەڵ ئەوەش دەیزانی کە هەڵاتنی خۆرەتاو لە هێزی ئەودا نییە، بەڵام دەخوێنێو خۆرەتاو دەردەهێنێ، چونکە کەلەشێر بێ جێو بەلاش نییە.

-ئەی قارەمانی قارەمانان، بڵێ بزانم ئایا تۆش بۆ رزگاری ئورشەلیم جەنگیوی؟

- ئەدای پەیامبەری؟ مەگەر خودا رۆحی بڤ کردۆتە تۆوە...؟

- خودا چ کارێکی بەم بابەتەوە هەیە؟ ئەقڵم بەکارهێناو رازەکەم دۆزیەوە.

- چ رازێ.

- ڕازی ئەوەی کە بوون بە پەیامبەر چ مانا دەدا، خودی خوای گەورەش زمانی ئەم رازە دەزانێ، وەك دەڵێن فەرامۆشت کردووە؟

- ئەڤین بفەرموو، وەبیرم بهێنەوە: پەیامبەر کێیە؟

- پەیامبەر کەسێکە کاتێ هەموو نائومێد دەبن ئەو ئومێدەوارە، هەرکاتێ کە هەموو ئومێدەوارن، ئەو نائومێدە، هەڵبەت دەتەوێ پەی بە بەڵگەکە ببەی، باشە، باشە بۆ ئەوەی مانای ئەو رازە ((ڕازی گەورە)) کە ((چەرخی زەمانە دەسووڕێ)) باش پەی پێ ببەی؟

- کریست لەکاتێکدا چاوی لەو هەڵدەتەکاند گوتی ((تۆماس، کە لەگەڵ تۆ ببێتە لایەنی قسەکردن مەترسیە، لەناو ئەو چاوە وردانەی تۆ کلکێکو دوو قۆچو تریشقە نوورێکی سوتێنەر دەبینم))

- مەولای من، نووری بەڕاستی دەسووتێنی، خۆشت ئەوە باش دەزانی، بەلاّم دڵت بەمرۆڤایەتی دەسووتێ، دڵی مرۆڤ، دەسوتێو بەزەیی دێتەوە، چونکە دونیا لە تاریکی دایە، بەلاّم ئەقڵی مرۆڤ رەحمی بەسەرنایەتەوە، لەبەر ئەمەیە دونیا دەسوتێو رۆشن دەبێ.. بە هێمای سەر منت دەوێ بێدەنگ بم باشە بێدەنگ دەبم، مرۆڤ نابێ رازی وا لەلای مرۆڤی سادەدڵ ئاشکرا بکات.

- ئەو نەفەرە کێیە؟

تۆماس خۆی تادەمی دەرگا هێنا، هێمای بۆ مرۆڤێکی زلو زەبەللاح کرد کە وەکو درەختێکی پەژموردەو بریقەدار لە ئاستانەی دەرگادا وەستابوو، رەگی مووی سەرو ڕیشی هێشتا سووربوو.

- ئەوە دەڵێم، یەهودا، تەنها نەفەرێکە هێشتا خۆی بەسەر پێوە راگرتووە. مەولای من ئاگاداربە، ئەو پڕ قودرەتەو هەرگیز خۆی نادا بەدەستەوە، بەنەرمیو لووتفەوە قسەی لەگەڵ بکە، ببینە لەبەر تووڕەیی کەللەی دووکەڵی لێ هەڵدەستێ.

-لەبەر ئەمە، بۆ ساغو سەلامەت مانەوە لە چنگو ددانی ئەم شێرە کێویە باشترە شێرێکی ئەهلی بەدوای ئەوا بنێرینو دەستگیری بکەین...

- کریست ئەو کاتە دەنگی بەرزکردەوەو گوتی ((برام یەهودا زەمانی پڵنگ مرۆڤخۆرێکە، متمانە بە مرۆڤەکان ناکاتو شارو قەڵەمڕەوو هەتا ((خودایە لێم ببورە)) خوداکانیش دەخوات، بەلاّم تۆ رزگارت بوو، جۆشو تووڕەیی تۆ هێشتا نەنیشتۆتەوەو ناتوانی لەگەڵ دونیا بگونجێی، من هێشتا ئەو خەنجەرەی کە هەرگیز خۆی بەدەستەوە نادات لەتەنگەی باخەڵت دەبینم، هێشتا نەفرەتو تووڕەییو ئومێد کە ئاگری گەنجێتین لە چاوتایە... بەخێربێی؟)).



یۆحەننا کە لەکەنار پێی کریستدا کەوتبوو، بە ردێنی سپیو دوو برینی قووڵ بەسەر گۆناکانو گەردەنیەوە دەست نیشان نەدەکران، بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((یەهودا مەگەر کەڕی؟ ئوستاد بەخێراتنت دەکات، سەلامو ئەحواڵپرسی لەگەڵ بکە))

پەترۆس گوتی ((ئەو وەکو هەرزەیێ سەرکێشو کەللەشەق، گەز لە لێوەکانی دەدا تا بەر لە قسەکردنی خۆی بگرێت))

بەلاّم کریست چاوی بڕیبوە یاوەری کێوی خۆیو بەلووتفەوە قسەی لەگەڵ کرد: ((یەهودا مەلە قاسیدەکانی هەواڵ کارە گەورەکانی تۆیان گەیاندۆتە من، تۆ لە کێوت دایەو دژی ستەمگەرانی ناوەوەو دەرەوە کارزاریت کردووە، ئێستا لە کێو سەرەوژوور بوویتەوەو چوویتە لای ئورشەلیمەوە، سەدووقیە خیانەتکارەکانت دەستگیر کردووە، نەواری قورمزیت لە گەردەنیانا بەستاوەو وەکو کۆیلە لە کوشتارگای خودای سراییلدا سەرت بڕیون. یەهودا تۆ مرۆڤێکی گەورەو مەلولو نائومێدی، لەو رۆژەوە کە لە یەکتری جیابووینەوە رۆژێ خۆشبەختیم نەدیوە، برام یەهودا دڵم زۆر بۆ تۆ تەنگ بووە، .. بەخێر بێی))

یۆحەننا چاوە زەندەق چووەکانی خۆی بڕیبووە یەهودا کە هێشتا بۆ قسەکردن لێوی خۆی دەگەست. بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((هێشتا لە کەللەی دووکەڵ هەڵدەستێ))

بەخێشە خێش خۆی گەیاندە ئەوانی دیکە.

پەترۆس گوتی ((مەولای من ئاگاداربە، ئەو تەواو تۆی خستۆتە ژێر نیگای خۆیەوەو خەریکی هێرش کردنە)).

کریست بەردەوامی بە قسەکانی خۆی دا ((یەهودا برام، خەریکم قسە لەگەڵ تۆ دەکەم، مەگەر نابیستی؟ بەخێر هاتنت دەکەم، بەلاّم تۆ دەست لەسەر سینەت دانانێو سەلام ناکەی، نەکا ئازاری سراییل تۆی دووچاری لالّی کردبێ، لێوەکانت دەکرۆژی تۆ پیاوی، بڕستت هەبێ، مەکەوە پرسەوە، تۆ ئازایەتی وەزیفەت ئەنجام داوە، بەلاّم مرۆڤ، بەرابەر سەرپێچی کردنی خودا دەتوانێ چی بکات؟ جەنگینی تۆ بۆ سراییل جەنگ بووە لەگەڵ خودا لەزەینی ئەو، ئەو شارە پیرۆزە چەند ساڵ بوو

ببووه خۆڵەمێش)) فیلیپ لەڕوی ترسەوە کەوتە زەمزەمە ((سەیرکە، پێیەك هاتۆتە پێشتر، سەری وەکو گا هێناوەتە خوارەوە هەر ئێستا هێرش دەکات)).

ناتانیل گوتی ((کوڕینە باشتر وایە بچینە کەنارێکەوە وا خەریکە مشتی بەرز دەکاتەوە)).

مارتاو مێریٚ هاتنە پێشو گوتیان: ((مەولای من، ئاگاداربە))

بەلاّم کریست بەدڵنیاییەوە بەردەوامی بەقسەکانی خۆی دەدا، لێوەکانی بەشێوەیێکی هەست پێکراو دەستیان بەلەرزین کردبوو.

برام یەهودا، منیش بە پێی توانای خۆم جەنگیوم، لەکاتی جحێڵی دا، دەمویست دونیا رزگاربکەم، بەلاّم پاشان کە ئەقڵم رسکاو پوختە بوو، دەستم لە هەوەسی جحێڵی کێشایەوە، پێم نایە رێیٚ پیاوانەوە، چوومە دوای کارەوە، زەویم کێلاّ، بیرم لیٚ دا دارمێوو زەیتونم چاند، لەگەڵ ژندا هاوباوەش بوومو مرۆڤم خەڵق کرد، بەمجۆرە زاڵ بووم بەسەر مەرگ، مەگەر قسەی هەمیشەییم ئەوە نەبوو؟ باشە بەسەر قسەمەوە وەستام، زاڵ بووم بەسەر مەرگ.

یەهودا لە پڕێکا وەکو تیریٚ لە کەوان رەهابوو بە وەپاشدانی پەترۆسو ژنەکان کە لە میانی ئەوو کریست بوون بە دەنگێکی بەرزو وەحشی هاواری کرد ((ئەی خائین))

هەموویان لە شوێنی خۆیان هێدمەیان گرت، رەنگ لە رووخساری کریست پەڕی دەستی نایە سەر دڵیو بەزەمزەمە کردنەوە گوتی: ((یەهودا منو خیانەت؟ قسەیێکی ناشایستەت هاویشتە سەر زمان، قسەی خۆت بکێشەوە.

- ئەی خائین .. ئەی پەیمان شکێن!

پیرەمێردە وردیلەکان لە ترسان خۆیان خراپ کردو ئامادەی راکردن بوون، تۆماس پێشتر خۆی گەیاندە کوچەوە، مێریٚو مارتا پێشیان لەوان گرت، مێریٚ هاواری کرد ((برایان توخودا مەڕۆن، هەرماس دەستی لەمەولای ئێمە قیت کردۆتەوە، دەیەویٚ



لێی بدات)). مارتا دەستی پەترۆسی گرت کە خەریك بوو رایدەکردو گوتی ((بۆ کویٚ دەڕۆیی؟ دەتەویٚ دووبارە خۆتی لیٚ نەبان بکەی؟))

فیلیپ گوتی ((وەڵلاّهی من خۆم لەم بابەتە نادەم، ئەسخەریوتی بازووێکی قودرەتمەندی هەیەو من پیرم، ناتانیل باشتر وایە دەرپەڕین)). یەهوداو کریست رووبەڕووی یەکتری وەستابوون، هەڵم لە لەشی یەهودا هەڵدەستا، بۆنی ئارەقەو برینێکی هەوکردووی دەدا، دووبارە هاواری کرد ((ئەی خائین ئەی پەیمان شکێن! جێگەی تۆ سەر خاچ بوو، خوداوەندی سراییل تۆی لەویٚ دانا تا بجەنگی، بەلاّم بۆ ساتیٚ کە ئیزرائیل سەری بەرزکردەوە، تۆ لەجێوە هەڵقەلاّی، رات کردو خۆت لەژێر دامەنی مێریٚو مارتا شاردەوە، هەی ترسنۆك! لەژێر ناوی کرێتی ئیلیازرو ناوو پۆتەلاّکی خۆت گۆڕی تا خۆت نەجات بدەی)).

پەترۆس لەپەنای ئەو زاتەی کە ژنەکان بەویان بەخشی بوو، قسەی یەهودای بڕیو گوتی: ((یەهودای ئەسخەریوتی ریٚو رەسمی قسەکردن لەگەڵ مەولا وایە؟ تۆ مەگەر ریزی سەری خۆت ناگری؟))

ئەسخەریوتی کە مشتی خۆی لە هەوادا راتەکاند بە هاوارکردنەوە گوتی ((کام مەولا؟ تۆ ناو لەو پیاوە دەنێی مەولا؟ مەگەر چاوێکت بۆ دیتنو ئەقڵێکت بۆ قەزاوەت کردن نییە؟ مەگەر وادەو وادەکاریەکانی ئەوت لەبیر چووە؟ ئەی کوا لەشکری ئەو فریشتانەی کە قەرابوو بۆ رزگارکردنی سراییل دابەزن؟ کوا ئەو خاچەی بۆ ئاسمان هەڵدەچوو تا ببێتە پەیژەی ئێمە؟ بەلاّم ئەو کریستیانویە قولابیە لەکاتی رووبەڕووبوون لەگەڵ خاچ سەری گێژبوو بێهۆش بوو، ئەو کاتە ژنان ئەویان گل دایەوە تا منالّیان بۆ وەبەربێنیٚ..

ئەو کریستیانویە کرێتە دەڵێی شەڕی کردووەو بە ئازایەتیش شەڕی کردووە، بەڵیٚ دروستە، ئەو وەکو کەلەشێری ماڵ بەخۆ گیفکردنو ستایش کردنەوە بۆ ئەملاو ئەملا دەڕوات، بەلاّم ئەی پەیمانشکێن جێیٚ تۆ سەر خاچ بوو خۆشت ئەوە دەزانی، ئەوانی دیکە دەتوانن زەوی بەیار ئاوەدان کەنەوەو ژنە بەنازەکان باردار کەن، بەلاّم قسەی من ئەوەیە کە وەزیفەی تۆ سەر هەڵگەڕانی خاچە، لافی زاڵ بوون بەسەر مەرگ لێدەدەی،

وای لەتۆ کەناوی لە منداڵ وەبەر هێنان دەنێیێ زاڵ بوون بەسەر مەرگ! لێگەڕێ با پێت بڵێم کە هەر منالێ لوقمەییێکی بەتامە بۆ ئیزرایيل، تۆ خۆت کردۆتە بازاڕی گۆشت فرۆشی بۆ ئیزرائیلو لوقمەی بۆ ئامادە دەکەی.....ئەی خائین ئەی پەیمان شکێن، ئەی ترسنۆك!)) کریست کە ئێستاکێ لەرزی کەوتبووە تەواوی بەدەنییەوە بەزەمزەکردنەوە گوتی ((برام یەهودا، بە نەرمی قسە بکە))

یەهودا هاواری کرد ((ئەی کوڕی نەجارِ تۆ دڵت شکاندم چۆن چاوەڕوانی ئەوە لەمن دەکەی بەنەرمی قسەت لەگەڵ بکەم، جار جارە دەمەوێ وەکو بێوەژنێ دادو شیوەن بخەمە ئاراوەو سەرم لەبەرد بکوتم، ئاخ نەفرەت لەو رۆژەی کە تۆ لە دایك بوویو لەو رۆژەی کە من لەدایك بووم، لەو سەعاتەی کە تۆم دیتو دڵمت پڕ لە ئومێد کرد! ئەو کاتە کە لەپێش ئێمەدا هەنگاوت دەناو دەربارەی ئاسمانو زەوی قسەت بۆ دەکردین، چەند لەززەت بەخشو پڕ بەرهەم بوو، مژدەی ئازادی دەدا، هێشووە ترێ وەك منالێ دوازدە ساڵە بەدیاردەکەوت.

بەدانەی گەنم تێردەبووین، رۆژێ کە تەنها پێنج نانمان هەبوو ئاپۆڕەییێکی هەزار نەفەریمان نان داو دوازدە سەبەت نانیش مایەوە، چ بەئەستێرە بڵێم کە لە شکۆوە لەئاسمان نووری هەڵدەپڕژاند، ئەوان ئەستێرە نەبوون فریشتەبوون، نەفریشتە نەبوون ئێمە بووین: یاوەرانی تۆ، هەڵدەهاتینو ئاوادەبووینو تۆش لە میاندا وەك ئەستێرەی قوتبی چەسپاویو ئێمەش بەسەماوە بەدەوری تۆ تەوافمان دەکرد. لەبیرتە منت لەباوەش گرتو بەدەستەپاچەیی گوتت کە ((من ئاشکرا بکە دەبێ لە خاچ بدرێمو رابىمەوە تا بتوانم رزگاری بەدەست بهێنم)).

یەهودا بۆ ساتێ لە قسەکردن وەستاو ئاخێکی هەڵکێشا، برینەکانی سەر لەنوێ کراوەو کێمی لێ هات، پیرەمێردە وردیلەکان بەسەری شۆڕەوەبوویان لە هەولێ وەبیرهێنانەوەی رووداوەکانو گەڕاندنەوەی خۆیان بوون بۆ ژیان، دڵۆپە فرمێسکێ، لەچاوی کریستدا ئەڵقەڕێز، لەکاتێکا بەتووڕەیی دڵۆپە فرمێسکی دەسڕیەوە، دەستی بەهاوار کردەوە، گرێی دڵی هێشتا خاڵی نەبوو، باعە باعت دەکرد ((من بەرخی خودام، دەچمە قوربانگا تا دونیا رزگار کەم، برام یەهودا هەراسان مەبە، مەرگ دەرگاییێکە کەبە جاویدانی دەبێتەوە، ئیدی دەبێ بەنێوانی ئەم دەرگایەدا بچین یارمەتیم بدە))



((من کە دڵم لە گرەوی خۆشەویستیو متمانەی تۆدا دانابوو، خواستی تۆم بەجێهێناو تۆم ئاشکرا کرد ..بەلاّم تۆ ....تۆ)) یەهودا کەفی کردبووە سەرلێوان، لە حالێکدا شانی کریستی گرتو بەتووڕەیی رایدەتەکاند، ئەوی بەدیوارەوە چەسپاندو دەستی بەهاوارکرد ((چی دیارە کە تۆ لێرە چی دەکەی؟ بۆ لە خاچ نەدرای؟ هەی ترسنۆك، ئەی پەیمان شکێن، ئەی خائین! تەواوی وەزیفەی تۆ ئەوەبوو؟ مەگەر شەرم ناکەی؟ مشتم بەرزدەکەمەوەو لێت دەپرسم بۆ لە خاچ نەدرای؟)) کریست بەدەستەپاچەییەوە داوای لێکرد ئارام بگرێ، لە هەر پێنج برینی لەشی کریست بارزقەی خوێن دەستی پێکرد...پەترۆس دووبارە زاتی وەبەرهاتێ ((یەهودا تۆ مەگەر بەزەییت نییە؟ پێو دەستەکانی ئەو نابینی؟ خوێن لە دڵی هەڵدەڕژێ، ئەگەر باوەڕ ناکەی دەستی لێدە)). یەهودا لەڕووی ناچاریەوە پێکەنی، ئەو کاتە تفێکی کردە سەر زەوی هاواری کرد ((کوڕی نەجارِ ناتەوێ شتێ لەم بارەوە بڵێی، زۆر باشە، من خۆم دەڵێم، فریشتەی پاسەوانی تۆ شەوانە دێتە سۆراغت)) کریست بە لەرزینێکەوە گیانی کەوتە زەمزەمەوە ((فریشتەی پاسەوانی من ))

بەلێ فریشتەی پاسەوانی تۆ هەرماس، ئەو سەرخاڵە قورمزیەکانی دەستو پێو دڵی تۆی داپۆشی تابتوانی فریوی دونیا بدەیو خۆشت فریو بدەی، بۆ وا سەیری دەکەی؟ بۆ وەلاّم نادەیتەوە ئەی ترسنۆك، ئەی پەیمان شکێن، ئەی خائین!

کریست چاوەکانی خۆی داخست، سەرەڕای هەستی لاوازی خۆی بەسەر پێیەکانیەوە راگرت، لە کاتێکا دەنگی دەلەرزی گوتی ((یەهودا.. تۆ هەمیشە، کەللەڕەقێکی وەحشی بووی هیچ کات سنووری مرۆڤایەتیت قبوولّ نەکردووە، لەبیردەکەی کە رۆحی مرۆڤ تیرێکە کە لە کەمان دەرچوو تا ئەو شوێنەی دەتوانێ بەرەو ئاسمان پەڕ هەڵدەکێشێ، بەلاّم دووبارە بەردەبێتەوە سەر زەمین، ژیان بەسەرزەویەوە یانی هەڵڕژانی باڵەکانو دارِمانی)).

یەهودا بەبیستنی ئەم وشانەوە تا دەهات زیاتر تووڕە دەبوو لە پێستی خۆی دەچووە دەرەوەو هاواری کرد: شەرمەزاری بۆ تۆ کوڕی داود، کوڕی خودا ئەی کریست، لە ئەنجامدا تۆی راکێشایە ئێرەوە! ژیان بەسەر زەویەوە یانی خواردنی نانو کردنی بەباڵ، یانی خواردنەوەی ئاوو کردنی بەباڵ، ژیان بەسەر زەوی یانی چاندنی باڵ، خائین تۆ خۆت

ئەمەت بە ئێمە گوت، ئەمە هەمان وشەکانی تۆیە، هەر بۆ وەبیرهێنانەوە قسە لە بارەی زەینی فەرامۆشکارت دەکەم، مەتی لەکوێی؟ وەرە ئێرەوە ئەو دەفتەرچەیەت کە وەکو خەنجەری من لەتەنگەی دڵت دەپارێزی بکەوە، نووسینەکانت بخوێنەوە، رابردنی زەمانە لەلایەك مێروولەو ئارەقە لەلایەکی دیکە نووسینەکانی تۆیان لەبێن بردوە. بەڵام هێشتا چەند وشەیێ ماوە بخوێنیتەوە تا ئەو جەنابە بیبیستیێو وەبیری بێتەوە، شەوێکیان نەفەرێ لە ریش سپیەکانی ئورشەلیم بەناوی نیکوداموس بەنهێنییەوە هاتە لای ئەوو پرسی ((تۆ کێیو کارت چییە؟)) وەڵامی ئەوەبوو کە ((من کارم چاندنی باڵە)) لەبیرتە کوڕی نەجاڕ؟

کاتێ ئەمەت گوت، ئێمە هەستمان کرد کە خەریك بوو پەڕو باڵمان دەردەکرد، ئێستا کەوتوویتە چ رۆژێکەوە، ((ئەی کەلەشێری پەراگەندە! خەریکی نقەنقی)) ژیان لەسەر زەوی یانی هەڵڕژتنی پەڕوباڵ ئەی ترسنۆك؟ یاڵڵا ون بە ئیدی نەتبینم! ژیان ئەگەر سەرانسەر هەورەتریشقەو گەواڵە نەبێت بەکەڵکی چی من دێت؟ پەترۆسو ئاندریاس لە من نزیك نەکەونەوە، ژنان قیژە قیژ نەکەن، دەستی لێ بەرز ناکەمەوە ئەو مردووەو سەری لەخاك بردۆتە خوارەوە، کەس بەدار لەمردووان نادات، ئەو هێشتاکە بەسەر پێیەکانیەوە وەستاوە، قسە دەکاتو دەگریت، بەڵام مردووە، جگە لە جەستەیێ شتێکی دیکە نییە، مەگەر خودا بیبەخشێ، من ناتوانم، ئومێدەوارم کە خوێنو ئەشكو خۆڵەمێشی سراییل هەڵڕژێتە سەریەوە.

کاسەی سەبری پیرەمێردەکان پڕ بوو، هەموو بەیەکەوە کەوتنە سەرزەوی، دووبارە یادەوەریان زیندوو بووبۆوە، هەستیان دەکرد کە دووبارە زیندوو بوونەتەوە، یادی مەلەکوتی ئاسمانو تەختی پادشاهی گەورەیی لەزەینیان زیندوو بووبۆوە لەکاتێکا هاتو هاواریان بوو تەوێڵی خۆیان لەبەرد دەکوتا.

کریستش بەیەکجار هۆق هۆق کەوتە گریانەوە، هاواری کرد ((برام یەهودا لێم ببوورە)) دەیەویست خۆی باوێتە باوەشی یەهودا کە دەستی هێنا پێشو هاواری کرد ((نزیك مەکەوە، دەست لەمن مەدە، ئیدی باوەڕم بەهیچ نییە، باوەڕم بەهیچ کەس نیە تۆ دڵی منت شکاند)).



کریست ملتەییێکی کرد، گەڕایەوە تا تەکیەگاهێ بدۆزێتەوە، ژنان بە شیوەن کردنەوە، خۆیان هاویشتە سەرزەوی، یاوەران بەتووڕەییو نەفرەتەوە سەیریان دەکرد، غولامچەکە ون بووبوو، بەزەمزەمەکردنەوە گوتی ((من خائینو پەیمان شکێنو ترسنۆکم، ئێستا ئاگاداری ئابڕووی خۆم بووم بەڵێ، دەبوا لە خاچ بدرێم، بەڵام شەهامەتم لەدەست داو رامکرد، برایان لێم ببوورن ئێوەم فریودا، ئاخ، چ دەبوو کە دەمتوانی دووبارە ژیان دەست پێبکەمەوە!)) کریست لە هەمان حاڵدا کە قسەی دەکرد خۆی بەزەویدا دابوو، ئێستاکێ سەری لەگاشەبەردەکانی حەوشە دەکوتا.

- هاوڕێو دۆستانی دێرینی من، بەقسەییێکی ئەڤین ئامێز دڵم بدەنەوە،من وا لە ناودەچم، نابود دەبم، دەستم بۆ لای ئێوە درێژ دەکەم، ئایا لەنێوان ئێوەدا کەسێ هەیە کەڕ نەبێو دەستم بگرێتو قسەییێکی ئەڤین ئامێز بەمن بێژێ؟ هیچ کەس هیچ کەس؟ هەتا تۆش یۆحەننای خۆشەویستی من؟ هەتا تۆش پەترۆس؟

یاوەری خۆشەویست بەشێوەنەوە گوتی دەتوانم چی بڵێم؟ قسەیێ بۆ گوتن نییە کوڕی مێرێ ئەوە چ جادوییێك بوو لە ئێمەت کرد؟

پەترۆس لە حاڵێکدا فرمێسکی چاوی دەسڕیەوە گوتی تۆ فریوی ئێمەت دا، هەق بە یەهودایە، تۆ وادەی خۆت شکاند، ژیانی ئێمە بەباچوو.

یەکسەر لەئاپۆڕەی پیرەمێردانی وردیلە هاوارێکی یەك دەنگەو گریاناوی هەڵسا:

- ئەی ترسنۆك، پەیمان شکێن، ئەی خائین!

- ئەی ترسنۆك، پەیمان شکێن، ئەی خائین!

مەتی پرسەدارانە گوتی تەواوی رەنجی بەباچوو، ئاخ کە بە چ کارامەییێکەوە، پێشبینی پەیامبەرانم بەسەر قامەتو گوفتاری تۆوە دەڕازاندەوە، کارێکی دژواربوو، بەڵام خۆم خستە ژێر باریەوەو بەخۆمم دەگوت لە کلێساکانی ئایندە باوەڕداران کتێبی قەبەی زێڕین جلد دەکانەوەو دەڵێن وانەی ئەمڕۆکە لە ئینجیلی پیرۆز، لەگێڕانەوەی مەتیە، هەمان ئەو ئەندێشەیە پەڕوباڵی بەمن دەبەخشیو دەمنووسی، بەڵام ئێستاکێ هەمان ئەو شکۆو بلیمەتیە بەباچوو، تۆ مرۆڤێکی بێ ئەمەكو بێ سەوادی خائین شایستەی

سەرزەنشتی، تۆ دەبێ لەخاچ بدرێی، بەڵێ هەتا بەخاتری منیش بوایە، تۆ دەبووا لەخاچ درابای، تا ئەو نووسینانە لە ئافەتی زەماندا بەپارێزراوی بمێنێتەوە. جارێکی دیکە هاوارێکی یەك دەنگو گریاناوی پیرەمێردان هەڵسا:

- ئەی ترسنۆك، ئەی پەیمان شکێن، ئەی خائین

- ئەی ترسنۆك، ئەی پەیمانشکێن، ئەی خائین

- لەهەمان ساتدا تۆماس لەحاڵێکدا بەپەلە دەهاتە حەوشەوە، هاواری کرد مەولای من، ئێستا کە هەموو تۆیان بەجێهێشتو بەخائین بانگت دەکەن من تۆ جێ ناهێڵم، من، تۆماسی پەیامبەر، تۆ جێ ناهێڵم، گوتم زەمانە دەسووڕێ، لەبەر هەندێیە کە لەکەنارتا دەمێنمەوە، چاوەڕوانم کە زەمانە بسووڕێ.

- پەترۆس هەڵسایەوە سەرپێو هاواری کرد یاڵڵا بڕۆین، یەهودا بکەوە پێشەوە، ڕێنماییمان بکە، پیرەمێردەکان بەهەناسەبڕکێوە هەڵسانەوە، کریست رووخساری لەخاچ بوو، بەقۆڵی کراوە کەوتبوە سەرزەوی، تەواوی حەوشەی داپۆشی، ئەوان مشتی خۆیان لەسەری راگرتبوو، هاواریان دەکرد:

- ئەی ترسنۆك، پەیمان شکێن، ئەی خائین

- ئەی ترسنۆك، پەیمان شکێن، ئەی خائین

- ئەوکاتە یەك یەك هاواریان دەکرد: ((ئەی ترسنۆك، پەیمان شکێن، ئەی خائین!!)) ونبوون.

کریست لەڕووی دەردو ئازارەوە، چاوی سووڕاندو سەیری کرد تەنهایە، حەوشەوماڵو درەختەکان، دەرگاکانی دی، خودی دێ، ون بووینە، شتێ جگە لە بەردی خوێنین لە ژێر پێیەکانیداو خوارتر ئاپۆڕەیێ لە تاریکی زیاتر نییە، بەتەواوی توانای خۆی هەوڵێ دا، تا بزانێ لەکوێ بووە، کە لێی بوو بۆ ئازار دەکێشێ، گەرەکی بوو هاواری خۆی تەواو بکاتو بڵێت: بۆ بە تەنهات جێ هێشتم؟! هەوڵیدا تا لێوەکانی بجاتە جوولە، بەلاٚم نەیتوانی، سەری گێژ بوو دووبارە کەوتەوە بێهۆشی، وا بە دیاردەکەوت کە بۆ خوارەوە دەچێو فەنا دەبێت، بەلاٚم لەپڕێکا لە هەمان حاڵ کە رووەدچوو فەنا دەبوو، شمشاڵی پێش رووی ئەوی گرتووەو هەستی کرد ئیسفەنجێکی تێکەڵ بە سرکە کەوتۆتە سەر



لووتو لێوەکانیەوە، دەبێ کەسێ لەسەر زەمین بەزەیی بەحاڵی ئەو هاتبێتەوە، بۆنێکی تاڵی بە هەناسەیێکی قووڵ هەڵکێشا، دووبارە گیانی وەبەر هاتەوە، سینەی خۆی پڕ با کرد، سەیری ئاسمانی کرد، هاوارێکی دڵتەزێنی سەردا، بۆ بەتەنهات جێتهێشتم؟! ئەو کاتە یەکسەر بەماندووبوونێکی تەواوەوە سەری خۆی دابەزاند.

هەستی بەئازارێکی وەحشەتناك کرد لە دەستو پێیو دڵی، چاوەکانی رۆشن بۆوەو تاجی دڕكو خوێنو خاچی بینی، دوو گوارەو دوو ڕێز دانی سپیو تیژ لەناو خۆرەتاودا لەتاریکیدا کەوتنە درەوشانەوە، سەدای خەندەیێکی ساردو گاڵتەئامێزی بیست گوارەو ددانەکان ون بوون، کریست بەتوندو تۆڵی لەشوێنی خۆیدا مایەوە.

سەری کەوتە لەرزینەوە، لەپڕێکا بەبیری هاتەوە کە لە کوێ بوو، بۆ هەستی بە ئازار دەکرد، لەززەتێکی سەرکێشو وەحشی سەراسەری وجودی ئەوی داگرت، نە....نە ئەو ترسنۆكو پەیمان شکێنو خائین نەبوو، ئەو لە خاچی چوار مێخ درابوو، ئەو شەرەفمەندانە بەبەهای مەرگ لەسەر پەیمانی خۆیدا مابوو ساتێ کە هاواری کرد ((خودایە، خودایە)) بێهۆش بوو بۆ ساتێکی کورت وەسوەسەیێ هاتە سۆراغیەوەو گومڕاهی کرد، ئەو لەززەتو ژنهێنانو منالاٚنە هەمووی درۆ بوون، ئەو پیرەمێردە کوڕو مەخلۆقانە کە بە ترسنۆكو پەیمان شکێنو خائینیان لە قەڵەم دەدا زیاتر لە درۆیێ نەبوون، هەموو ئەوانە ئەو ئەندێشەو دوو دڵیانە بوون کە هەرماس ناردبوونی یاوەرەکانی ئەو زیندوو بوونو خەریکی کاری خۆیان بوون، ئەوان لە دەشتاییو لە دەریاکاندا ((خەبەری خۆش))یان رادەگەیاند، سوپاس بۆ خودا کە هەموو شتێ بە پێی بەرنامە بۆ پێشەوە چووبوو.

هاوارێکی پیرۆزمەندانەی سەردا ((وەزیفەی خۆم بە ئەنجام گەیاند))

وابوو وەك بڵێی گوتبووی ((هەموو شتێ دەستی پێکردووە)).

## سوپاس و پێزانین

لە وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەدا بە پێویستی دەزانم کە سوپاس و ڕێزی خۆم بۆ ئەو برادەرانەی خوارەوە دەربڕم کە هاندەرێکی باش بوون لە زۆر ڕووەوە یارمەتیان داوم و جێ پەنجەیان دیارە.

- ئازاد ئەرگوشی
- کەریم سۆفی
- سەید ئارام
- سامان عەبدولڕەحمان

کەریم دەشتی